# هەزار و یەك شەوە

بەرگی یەکەم

وەرگێرانی:
جەوهەر مەحمود داراغا



هەزار و یەك شەوە
بەرگی -١
وەرگێڕ: جەوهەر مەحموود داراغا
دیزاینی بەرگ :
( فەرهاد فایەق )
تایپ : جەوهەر مەحموود داراغا
تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانە
چاپی دووەم سلێمانی ٢٠١٣
لەسەر ئەرکی چاپخانەی ( چوارچرا ) چاپکراوە
ژمارەی سپاردنی ( ٧٠٢ )ی ساڵی ( ٢٠٠٧ ) وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# پێشەکی

وەرگێڕان لە خوێندا کارێکی سەختە و پشووی درێژو شارەزایی فرەو بەرامەیەکی ئەدەبیی ناسکی گەرەکە. لەگەڵ ڕۆشنبیری یەکی گشتیی بەر بڵاو. کوردانیش وەکو هەر نەتەوەیەکی بندەستە و بێ قەوالەو ئاڵایەکی شەکاوەو زمانێکی یەکگرتوو و داخراو بە رووی کلتوور و ڕۆشنبیریی وڵاتانی دوورو نزیکداو سەرقاڵ بە بەرگری کردن لە خۆ و خاك و کلتوورەکەی و بوونی نیشتمانەکەی بە گۆڕەپانی جەنگی سەرو مرو درێژخان و خاپوور بوونی ئابووری و بە دوادا هاتنی بژێویی خەڵکەکەی. فرە خراپ بە سەریدا، شکایەوەو تووشی دواکەوتن و چەقبەستوویی بوو و لە پێشکەوتن و پەرەی ئابووری و ئاوەدانی بێ بەری .

بۆیەیش بووینە نەتەوەیەکی تامەزرۆ بە تەکنۆلۆژیای ڕۆژئاواو کلتوور و ئەدەبی ئەو نەتەوە خوا پێ داوانە و ئەوە بوو، نووسەران و خاوەن خامەیانی بە بڕشت، بە پەرۆشەوە کەوتنە وەرگێڕانی شاکارە جیهانیە بە ناوبانگەکان و ئەو ڕۆمانە سنوور بەزێنانە و کتێبانێکی فرەی نەتەوە جیا جیاکانی جیهانیان وەرگێڕایە سەر زمانە شیرینەکەی کوردان! منیش بەختی ئەوەم بوو، کە دوو لە شاکارە سنوور بەزێنە جیهانیەکان وەر بگێڕمە سەر زمانی شیرینی خۆمان. یەکێکیان شاکارە بە ناوبانگەکەی (هەزارو یەك شەوە ــــ الف لیلە و لیلە) بوو و لە زمانی عەرەبیەوەو بە ماندوو بوونێکی (٤) ساڵانە بەرهەم هات و چاپخانەی شڤان لە ساڵی (٢٠٠٧)دا، ئەرکی لە چاپدانی هەر (٤) بەرگەکەی بە تیراژی (١٥٠٠) دانە، لە خۆ گرت و لێرەوە من سوپاسی خۆمیان بۆ دەر دەبڕم. ئەو (٤) بەرگە فرە بە قەشەنگی بەرگیان تێ گیرابوو. ئەوەی کە مایەی گلەیی بوو بەلای خۆمەوە: تایپ کردنەکەی بوو. ئەمەیش خستمیە سەر ئەو بیرۆکەیەی کە ماسی چۆن پێویستی بە ئاوە و گۆرانی بێژ پێویستی بە فێر بوونی میوزیك و شارەزا بوونە لە ژەنینی ئامێرێکی میوزیك. بە هەمان شێوە، وەرگێڕیش پێویستیی بە فێر بوونی کۆمپیوتەرە و وۆرد و تایپ کردن! بۆیە منیش چاکم لێ کرد بە لاداو خۆم کردە بەکاربەری کۆمپیوتەرو بوومە پیرە هاوڕێیەکی کارای! ئەوە بوو بۆ چاپی دووەمی ئەم شاکاری (هەزارو یەك شەوە)یە خۆم ماندوو کردو سەر لەبەری چوار بەرگەکەم، دوای دەستکاری کردن و بەراورد کردنی لەگەڵ چاپە هەرە کۆنەکەی (الف لیله و لیله)، کە بە چاپی (بۆلاق) ناسراوە، هەروەها چاپێکی تری کە لە چاپخانەیەکی (بەغداد) چاپ کرابوو، تایپ کردەوە. ئەمجا هەلی خوێندنەوەی (هەزارو یەك شەوە)م بۆ ڕەخسا لە ڕادیۆی (دەنگی کتێب)داو نزیکەی (٣) بەرگی ئەم شاکارەم، لە (١١٠) بەرنامەدا، خوێندەوە، کە ڕۆژانە کاتژمێر (یەك و نیو)ی دوا نیوەڕوان، پەخش دەکراو شەوانەیش کاتژمێر (١١) دووپات دەکرایەوە. بە نیازیش بووم کە کۆی ئەم بەرنامانە و دوای خوێندنەوەی هەر (٤) بەرگەکە و بە دەنگی خۆم وەکو وەرگێڕی

ڕۆمانەکە، کلیپی بکەم و بە سەر سەنتەری نابینایانی هەموو هەرێمدا بڵاوی بکەمەوە. بەڵام بە داخەوە، ئەو دەزگای ڕادیــۆ یە، نەیتوانی درێژە بە پرۆژەکەی بدات. منیش بە ناچاری ئەو ڕادیۆیەم جێ هێشت و دەستم لە پۆستی بەڕێوە بردنەکەی کێشایەوە.

شاکاری دووەمیش ڕۆمانی (شەڕو ئـاشتی ــ الحرب و السلم) بوو. ئەم ڕۆمانەیش (٤) بەرگ بوو و لە نووسینی کەڵە نووسەری بەناوبانگی ڕووسی (تـۆلستۆی) بوو. وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانەیش (٤) ساڵێکی پێچوو! (خـانەی وەرگێڕان) ـ کە سوپاسیان دەکەم ــ بە تیراژی (٧٥٠) دانە و لە ساڵی (٢٠١٢)دا، چاپی کرد. ئەم (٤) بەرگەیشم بە دەستی خۆم تایپ کردو لێرەوە فرە سوپاسگوزاری بەڕێز کاك شۆڕشی بەڕێوەبەری ئەو دەزگایەو بەڕیـــزان کاك زانـــاو نزار نـــووریی هەڵەبـــڕو دیزاینەری کتێبەکەم دەکەم، کە یارمەتیەکی باشیان دام لە چاپ کردنی ئەو شاکارە قەشەنگەدا.

چیرۆك و ڕازەکـانی،(هـــەزارو یـەك شـەوە) بـە لای ئـەدەب دۆستـانی جیهانـەوە، زۆر گـرنگن، چـونکە جێماوەیـەکی کـۆنی ئـەدەبی گەلانـــە. سەرچـاوەی فرەیـەك لـە کەڵـە نووسەرانی جیهان بووە! ئەوەتا ڤـۆڵتێری کەڵە نووسەر، دانی بەوەدا نـاوە کە دوای ئـەوەی (١٦) جاران سەر لەبەری شاکاری (هــەزارو یەك شەوە)ی خوێندووەتەوە بووەتە نووسەر!!

لە بـارەی ڕازەکانی (هـــەزارو یـەك شـەوە)وە، بیرو ڕاگـەلێکی جیاواز هـەن. تێیاندایـە ڕاستگۆیانە و بێلایەنانە، لە سەری دواوە و هەشیانە نادروست و بە مەبەست بووە.

لە جۆری دووەمیان وەکو (دی گۆیـە)ی هۆڵـەندی. کـە چیرۆك و ڕازەکـانی ئـەم هـەزارو یەك شەوەیە دەگێڕێتەوە بۆ سفری (ئەستێری تـەورات)! کەسانێکیش هەن دەڵێن: دانـەری ئەم شاکاری هەزارو یـەك شـەوەیە، جووەکان بووە! بـەڵام دواتـر بەڵگەی نوێ کەوتـە بـەر دەست ڕۆژئـاواییەکان. ئەوەیش بە هۆی ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنسی (ئـەنتوان گـالان ــ ١٦٤٦ ــ ١٧١٥)دوە بوو. ئەم پیاوە یەکەمین کەسێك بوو کە کتێبی (هەزارو یەك شەوە)ی وەرگێڕا بۆ زمانی فەڕەنسی و ساڵی (١٧٠٤) بە چاپی گەیاند.

تـا ئـەو دەمـەی کـە ئـەنتوان گـالانی نوێنـەری فەڕەنـسا، لـە ئەسـتەمبوڵ، دەستنووسـی (هـــەزارو یەك شەوە)ی، لە دوا ساڵەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، دەست نەکەوت. ئـەو شـاکارە قەشەنگ و نـــاوازەیە، کەوتبووە گۆشەی بیر چوونەوەوە!

دواتر بە هاندانی (کۆلبێرت)ی وەزیری فەڕەنسا، ئەنتوان گالان ئەو شاکارەی وەرگێڕایـە سەر زمـانی فەڕەنسی. بـەڵام دەستپاك نـەبوو لـە وەرگێڕانەکەیدا و بڕێکی ئـەو دەقانـەی پشتگوێ خـست و جارو باریش خـستنە سـەری بۆ دەقـەکان کردبوو! بـەڵام ئـەم (گـالان)ە بـەختی یـار بـوو و دەستنووسـێکی تـری (٤) بـەرگیی لـە وڵاتـی شـامەوە پـێ گەیـشت، کـە کۆنترینی دەستنووسەکانی ڕۆمانی (هـــەزارو یەك شەوە) بوو و تا ئێستایش (٣) بەرگی ئەو دەستنووسـە لـە (کتێبخانـەی میلیـی فەڕەنـسا)دا، هـەڵگیراوەو ماوەتـەوە! بـەڵام بـە داخـەوە

دەستنووسی بەرگی چوارەمی بزر بووە!

دواتر (ئـەنتوان گالان) پیاوێکی مارۆنی لە (حەڵەب) دەبینێت، بە ناوی (حەنا)وە، کە چیرۆك و رازێکی فرەی عەرەبی، لە بەر دەبێت و پێدەچێت کە ئەو پیاوە حیکایەتخوان بوو بێت. (گالان) گوێ بۆ حیکایەت و رازەکانی دەگرێت. دواتر هەر ئەو پیاوە حەڵەبی یە، چەندین چیرۆکی بۆ دەنووسێتەوەو پێی دەبەخشێت.

(گالان)یش لەو چیرۆکانەی ئەو پیاوە، بەرگی چوارەم پێك دێنێت و ئەم شاکاری (هـەزارو یـەك شـەوە)ی پـێ تـــەواو دەکات. بە دوای ئەم کارەدا، (٧) بەرگی تری لێ دەدۆزرێتەوە! بەرگی هەشتەمیشی ساڵی (١٧٠٩) پەیدا دەکات! بەرگی نـۆیەم و دەیەمیشی ساڵی (١٧١٢) دەست دەکەوێت. بەرگی یـازدەیەم و دوازدەیەمیشی، (٢) ساڵ دوای مردنی ئەم (ئـەنتوان گالان)ە، دەدۆزرێتەوە!!

ئەم پیاوە کارێکی باشی کرد کە بە هۆی وەرگێڕانی ئەم کتێبی هەزارو یەك شەوەیەوە، توانی پەنجەرەیـەکی نـوێ بـە رووی رۆژئـــاواییەکاندا بکاتـەوە بـۆ ناسـینی کەلەپـووری نەتەوەکانی رۆژهـەڵات و پاڵنـەرێکی باشیش بـوو بـۆ ئـەوەی کە سـەدەی هەژدەیـەم ببێتـە سەدەی لێکۆڵینەوە لە کلتوورو فۆلکلۆری گەلان. بۆ یەکەم جار (ئـاکوب) و (فێلهلم گـریم) کە هەردووکیان برا بوون، لە ساڵی( ١٨١٤)دا، بناغەی زانستی فۆلکلۆریان دامەزراند. ئەم دوو برایە کەوتنە کۆ کردنەوەی چیرۆك و رازە فۆلکلۆریە میلی یە کۆنەکانی ئەڵمان.

بە دوای ئەم دوانەیشدا، (یوسلاییف)ی رووسی کەوتە کار کردن لەم بوارەدا و ئیدی کاری کۆڵینەوە لە فۆلکلۆر، لە نێو نەتەوە جۆراو جۆرەکانی جیهاندا، تەشەنەی کرد. دواتر بەڵگەی نوێ کەوتە بەر دەستی رۆژئـاواییەکان. ئەمەیش بە هۆی ئەو (ئـەنتوان گالان)ەوە بوو. کە رۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسی بووەو لە نێوان ساڵانی (١٦٤٦ ــ ١٧١٥)دا ژیاوە.

ئەو رۆژهەڵاتناسە یەکەمین کەسێك بوو کە رۆمانی (هـەزارو یەك شەوە)ی وەر گێڕایە سەر زمانی فەرەنسی و لە ساڵی (١٧٠٤)ز دا بە چاپی گەیاند.

لە ژمارە (٧ ـ ٨)ی گۆڤاری (افاق عربیە)دا، وتارێك بـڵاو کراوەتـەوە، بـە نێـوی (ئـەنتوان گـالان و وەرگێڕانـی هـەزارو یـەك شـەوە، بـۆ زمـانی فەرەنـسی)، هـاتووە: (کۆبینـۆ)ی رۆژهەڵاتناسی فەرەنسی، کە ساڵانێکی زۆر لە رۆژهەڵاتدا، مـابووەوە. کتێبێکی نووسـیوە بـە ناوی (سێ ساڵان لە ئـاسیا). ئەم چەند دێڕەی تێدا نووسی بوو:

*لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا کە لە ئاسیادا ــ مەبەستی نیشتمانی عەرەبە ــ هەڵی دەنێین. هەست دەکەین کە: کامڵ ترین و راستگۆ ترین کتێبێك لەو بەشەی جیهاندا، کتێبی (هەزارو یەك شەوە)یە!*

ئەنتوان گالان بەو وەرگێڕانی رۆمانی هەزارو یەك شەوەیە کارێکی باشی کـرد. چـونکە پەنجەرەیەکی بە رووی کەلـەپوورو کلتووری نەتـەوەکانی رۆژهەڵاتـدا، بـۆ رۆژئـاوا کـردەوە!

سەدەی هەژدەیەمیش سەردەمی کۆڵینەوە لە فۆلکلۆری گەلانی هێنایە ئاراوە.

هەستیان بەوەمیش کرد کە لە دوو توێی ئەو چیرۆك و ڕازە کلتوورییە کۆنانەدا، باو و نەریت و شێوازی بیر کردنەوەو داهێنانە کۆنەکانی نەتەوەکانی جیهان وە دیار دەکەون و وێنای ژیانی کۆمەڵایەتیی نەتەوەکان دەکەن و ئەو شێوە ژیانەی کە مێژوو نووسان پشتگوێیان خست بوون. ئەوەتا (جەواهیر لال نەهرۆ) لە نامەیەکیدا بۆ کچەکەی نووسی بووی: ئەی تۆ بەغداد و هاروونە ڕەشیدو شەهرەزادت وە بیر نایەتەوە!؟

هەزاران کەس هەن، کە هەر هیچیشیان لە بارەی خەلیفەکانی عەباسیەوە نەبیستووە! کەچی لە بارەی بەغدادی شاری خۆشەویستی قەشەنگی و سەر کێشی یەوە فرەیان بیستووە! چونکە زۆر جاران ئەو دەوڵەتانەی لە دنیای ئەندێشەی مرۆڤدا دروست دەبن، فرە ڕاست و دروست ترن، لەو دەوڵەتانەی کە لە واقیعدا، بەرهەم دەهێنرێن!

کۆڵینەوەو بە دوادا چوونێکی فرە، لە بارەی شاکاری هەزارو یەك شەوەوە کراوەو زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناسانی ئەورووپا سەرقاڵی ئەو کارە بوون. دواتریش توێژەرانی عەرەب. بەڵام ئەو لێکۆڵینەوەو توێژینەوانە لە بارەی شوێن و سەرچاوەو نووسەری ڕۆمانی هەزارو یەك شەوەوە، شکستیان خواردووەو لێڵی و وێڵی یەکی فرەیان تێدا بووە!

سەیرە!! بۆچی دەبێت نووسەری ئەم شاکارە، ناوی خۆی بواردبێت و ئەو هەڵە مەزنەی بەسەردا، تێپەڕی بێت!!؟ لەبەرچی ناوی خۆی بە سەر دەستنووسەکەیەوە، تۆمار نەکردبووە!!؟

کەوابوو دۆزینەوەی ناسنامەی ئەم ڕۆمانی (هەزارو یەك شەوە)یەو شوێنی هاتنە ئاراوەی و ناوی نووسەرەکەی، هەروا سانا و بێ گرێ و گۆڵ نییە و بە تەقەلای تاکە کەس دەستەبەر نابێت.

بۆیە منیش ئەم شاکارە جیهانییەم وەر گێڕایە سەر زمانی شیرینی کوردی، تاکو کتێبخانەی کوردیش، بەم شاکارە ئاوەدانتر ببێتەوە.

ئەوەتا خاتوونە نووسەری ئەمەریکیش لە بارەی ئەم ڕۆمانی هەزارو یەك شەوەوە وتوویەتی: هەموو شتە قەشەنگ و جوانەکانی ئێمە ـ مەبەستی نەتەوە ڕۆژئاواییەکانە ـ لە ڕۆژهەڵاتەوە، سەرچاوەی گرتووە!

ئەوانەی کە هەڵە ناکەن، ئەو کەسانەن کە وەستاون و جووڵەیان نییەو بێ بەرهەمن! کەوابوو، ئەم کارەی منیش بێ خەوش نییەو لەگەڵ داوای لێ بووردنم لە خوێنەرانی ئەم شاکارە، خوازیاریشم دەستم بگرن و یارمەتی خۆم و خۆیان بدەن و هەڵەکانم بۆ ڕاست بکەنەوە و جارێکی دی سوپاستان دەکەم.

جەوهەر مەحمود داراغا
سلێمانی | بەکرەجۆ ١١ \ ٣ \ ٢٠١٣

چیرۆکی (شەهرەیار) و (شازەمان)
دەگێڕنـــەوە :

- خوا خۆی زانا و ڕەوا و گەورە و بەخشندە و نیان و بە بەزەییە. لە ساڵانی پێشین ، لە نێو سەربووردەی نەتەوەیانی دێرین ، لە یەکێ لە دوورگەکانی ( هێند ) و( چین ) لە هۆزی (ساسان). پاشایەك هەبوو . خاوەن سوپا و دەست و پێوەند.. دوو کوڕی بوون . گەورە و بچووك . شۆڕە سوارە و هەردوو چاپووك .گەورەکەیان ، زۆر سوارچاك بوو، لە دوژمنانی بێ باك بوو. لە وڵات بەڕێوە بردن دا. دادپەروەر و خۆشەویستی مەملەکەت بوو . زۆر سەلار بوو.. ناویشی (شەهرە یار) بوو.

برا بچووکەکەیش پاشای وڵاتی ( سەمەرقەند)ی عەجەم بوو. لە نێو ڕەمەکی خەڵکەکەدا خاترجەم بوو . لە دادی کۆمەڵایەتیدا، وێنەی کەم بوو.

بە درێژایی (٢٠) ساڵ هەر یەکە و لە مەملەکەتی خۆیدا حوکمڕان بوو .

ڕۆژێکیان .. پاشای گەورە تاسەی بینینی پاشا چکۆلەی برای کرد . بۆیە فەرمانی بە وەزیری دا، ڕێی بەرەو مەملەکەتی (سەمەرقەند) بگرێتە بەر... تا لە تەك خۆیدا بیهێنێتە میوانیی . ئەویش بێ باکانە ڕێی گرتەبەر، کە گەیشتە وڵاتی پاشا چکۆلەی بەختەوەر . چووە دیوەخانەکەی و سڵاوی پاشا گەورەی کاکی پێ ڕاگەیاند . تێی گەیاند کە کاکەی تاسەی دەکات و مەبەستێتی سەردانیی بکات . ئەمیش بە خۆشحاڵی یەوە پەسەندی بوو. گەورە وەزیرەکەی خۆی کردە جێگری خۆی ، تاکو تا دەگەڕێتەوە پاشایەتی بکات . دواتر ڕەشماڵ و دەوار و وشتر و بار و هێستر و دەست و پێوەند و دەورو بەرانی بەڕێ کەوتن .

دوای کەمێك دوورکەوتنەوە لە شار و لە نیوە شەودا ( شازەمان )ی برا بچووك .. ئەو ( گۆ )یەی بیر چوو بوو کە کاتی خۆی ، کاکەی بە دیاری ، پێی بەخشی بوو . بۆیە بە تەنیا گەڕایەوە تاکو گۆیەکە هەڵبگرێت و خۆی کرد بە کۆشکدا. کە سەیری کرد ژنەکەی لە نێو جێ و نوێنەکەی دا لەگەڵ گۆرانی بێژێکی عوود ژەن نووستووە و دەست لە ملانی بووە !

کە ئەمەی بینی دنیا لە بەرچاوی تاریك بوو، لە دڵی خۆیدا وتی:

هێشتا لە شار دوور نەکەوتوومەتەوە : ئەم قەحبەیە ئەمە حاڵەکەیەتی !! ئەی ئەگەر ماوەیەك لەلای کاکم بێمنمەوە ، چی ڕوو دەدات ..!؟

بۆیە شمشیری لێ هەڵکێشان و هەردووکیانی کوشت . بێدەنگ گەڕایەوە کن کاروانەکە و فەرمانی سەفەریدا . کە گەیشتنە مەملەکەتی پاشای گەورە : پاشا چکۆلە تەتەری ناردە کۆشکی کاکی کە مژدەی گەیشتن بگەیەنێت .

پاشای گەورە کە بەمەی زانی ، شاری ڕازاندەوە و بە خۆشحاڵی یەوە چووە پێشوازی

براكەی . كە بە كۆشك گەیشتن پێكەوە دانشتن . ( شازەمان ) كردەوەی نەشیاوی ژنەكەی بیر كەوتەوە . بۆیە زۆر خەمبار بوو.. رەنگی زەرد هەلگەڕا و لاواز بوو بوو. برا گەورەكەی هەستی بەمە كرد و پێی وابوو ، بە هۆی ماندوویەتی ڕێگاو دووركەوتنەوەیەتی لە مەملەكەتەكەی . بۆیە وازی لێ هێنا.

دوای چەند رۆژێك خۆی بۆ نەگیرا و لێی پرسی :

*براكەم .... لاواز و رەنگ زەرد دەتبینم !*

ئەمیش هەر ئەوەندەی وت :

لە ناخەوە بریندارم ..!!

پاشای برا گەورە وتی :

كەواتە ... دەچینە راو و شكار، كە رەنگە كەمێك دڵت پێی بكرێتەوە . بەلام شا چكۆلە پەسەندی نەبوو . بۆیە ( شەهرەیار) شا.. بە تەنیا خۆی لەگەڵ دەست و پێوەندانیدا چووە راو و شكار.

لە كۆشكی شادا .. بانیژەیەك هەبوو ، كە بە سەر رەزو باخەكەی كاكیدا دەیڕوانی . دوای گەشت كردنی برای گەورەو چوونە راو . پاشا چكۆلەی میوان لە دانیشتن بێزار دەبێت و خۆی دەكات بەو بانیژەیەدا و لەوێوە خەریكی رووانی ئەو رەز و باخە جوانە دەبێت. هێندەی زانی دەروازەی كۆشك كرایەوە و (٢٠ ) كەنیزەك و (٢٠) خزمەتكار هاتنە دەرەوە و براژنەكەیشی لە نێوانیاندا بوو . زۆرخان و مان بوو.. ناسك و جوان بوو.

چوونە سەر، حەوز و ئاوێك . خۆیان رووت كردەوە و لە سەر لێواری حەوزەكە دانیشتن و دەستیان كردە خواردنەوە و یاری كردن و شیعر خوێندنەوە و گۆرانی وتن .

( شازەمان ) لە دڵی خۆیدا وتی :

*( بەلا)یەكەی من ... لەم ( بەلا )یە.. سووك ترە !*

هەر لەوێدا.. خەم و پەژارەكەی خۆی لە بیر چوودەوە..!

دیسان لە دڵی خۆیدا وتی :

ئەمە زۆر گەورە و گران ترە لەوەی بە سەر من هاتووە !

ئێوارە پاشای گەورە گەڕایەوە و سەیری رەنگ و رووی ( شازەمان )ی برا بچووك و میوانی كرد ، سوور هەلگەڕاوەتەوە و لە سەر سفرەیش نانێكی باش دەخوات و وەكو جاران كەمخۆرنی یە!

بۆیە لێی پرسی :

*براكەم جوانەكەم ... ئەوسا رەنگ و رووت زەرد هەلگەڕا بوو. ئێستا رەنگ و رووت وەك جارانی لێ هاتووەتەوە ، ئەحوالی خۆتم پێ بڵێ !*

( شازەمان ) وتـــی :

گۆڕانی ڕەنگ و ڕووو و زەرد هەلگەڕانی خۆمت پێ دەڵێم .. بەڵام بۆ هۆیەکەی داوای لێبوردن دەکەم !

شا( شەهریار ) وتی :

*تۆ ... جارێ ، بــا.. هۆی ڕەنگ پەڕین و لاوازی یەکەی یەکەمجارت ببیستم .*

( شازەمان ) وتـــی :

کاکە ، کە وەزیرکەت ، ناردە شوێنم خۆم ئامادەی سەفەر کرد و لە شار دەرچووم . ( گۆ )یەکەی تۆم بیرکەوتەوە کە لە ( کۆشك ) بیرم چوو لەگەڵ خۆم بیهێنم . بۆیە گەڕامەوە و بە دزی یەوە .. خۆم بە کۆشکدا کرد . بینیم ژنەکەم لە تەك گۆرانی بێژێکدا بەو نیوە شەوە لێی نووستووە !! منیش هەر دووکیانم کوشت و بەرەو ئێرە هاتم . ئیدی بیرم هەر لەو کارە دەکردەوە . هەر ئەوەش بووە هۆی لاوازی و ڕەنگ زەردیم..!

بەڵام بۆچی ئێستا بە خۆدا هاتوومەتەوە و ڕەنگم جوان بۆتەوە؟ بم بەخشە : هۆیەکەیت پێت ناڵێم !

کە برای گەورە ئەمەی بیست پێی وت :

*سوێندت دەدەم بە یەزدان : دەبێت هۆی نەمانی ڕەنگ زەردی یەکەشتم پێ بڵێیت !*

ئیدی برا بچووك چاری نەما و لێرەش لە ماڵی برا گەورە ، چیی دیبوو، بۆی گێڕایەوە .

پاشای برا گەورە وتـــی :

ئێستا ئیدی منیش بە تاسەی ئەوەوەم ، بە چاوی خۆم ئەو کارەساتە ببینم !

ئەمجا( شازەمان ) بەکاکی وت :

کوا بوو بە قسەی من بکە و لە کۆشکدا بڵاوی بکەرەوە کە بۆ ( ڕاو و شکار) دەچیتە دەرەوەی شار . دواتر بەدزی یەوە لە ئەو شوێنەی من خۆم حەشاردابوو، خۆت دابگرە .. تاکو بە چاوانی خۆت ببینی!

شای گەورە ، فەرمانیدا بۆ ڕاو و شکار. پاسەوانان و دەست و پێوەندان ، ڕەشماڵ و دەواریان بردە دەرەوەی شار. شا( شاشەهرەیار) لە ڕەشماڵێکدا خۆی توند کرد و فەرمانیدا ، کە نەهێڵن کەس بێتە ڕەشماڵەکەیەوە . بەرگی شاهانەی لابرد و خۆی گۆڕی و بەرەو شار و کۆشك بووەوە و بە دزی یەوە خۆی کردەوە بە کۆشکەکەیدا. چووە ئەو بانیژەیەی کە برا بچووکەکەی چاوەڕوانی بوو و بە سەر ڕەز وباخەکەیدا دەڕوانی . دوای سەعاتێك بینی کۆیلەکانی کۆشك و کەنیزەکەکان و شاژن هاتن و ئەوەیان کرد کە براکەی بۆی گێڕابووەوە .

ئەم کارەیان تا دوا نیوەڕۆیەکی درەنگ درێژەی بوو .

ئەم کارە نالەبارە شا شەهرەیاری برا گەورەی زۆر خەمبار کرد و هۆشی لەسەردا نەما و چووە باخەکەوە و بە شمشێر ملی ( ژنەکەی ) و هەموو ( کەنیزەك ) و ( خزمەتکار )ەکانی پە ڕاند . ئەمجا ڕووی لە پاشای برا بچووك کرد و تێی گەیاند کە ئیدی ، پاشایەتی بە

کەڵکی ئەوان نایەت و وا باشە سەری خۆیان هەڵبگرن و وڵات بە جێ بهێڵن . دوای ئەوەی خۆیان گۆڕی ، لە دەرگای پشتەوەی کۆشك و بە نهێنی چوونە دەرەوە و دەشت و دەریان بە پێوە .

ماوەیەکی فرە ڕۆیشتن و دواتر ماندوو بوون و لە مێرگ و باخێکدا خۆیان بینییەوە ، دوور بە دوور درەختێکی مەزنیان بینی و لە ژێریدا کانیلەیەکی ئاوی سازگار و نزیك بە دەریا بوو . دوو برای پاشا خۆیان گەیاندە ئەو بن دارە سێبەر چڕە .

دوای خۆ تێر کردن ، ویستیان کەمێك بحەوێنەوە . کەچی لە ناکاو دەریاکە کەوتە شەپۆلدان و هەڵچوون و داچوون ! لە ناکاو ستوونی دووکەڵێکی ڕەش لە دەریاکەوە دەرچوو و دێوێکی کەڵەگەتی سنگ پان لە دەریاکە هاتە دەرەوە و سندووقێکی لە سەر نابوو ! بەرەو ئەو درەخت و کانی و ئاوە هات کە دوو برا پاشاکەی لێ دانیشت بوون .

دوو براکەیش زۆر ترسان و هەر هێندەیان بۆ کرا بە درەختەکەدا هەڵزنان و لە نێو لق و گەڵاکاندا و لە ترسی دێوە خۆیان شاردەوە . دێوەکەیش لە سێبەری دارەکەدا لێی دانیشت و سندووقەکەی خستە بەردەستی و کردیەوە و لە نێو ئەو سندووقەیشدا ، سندووقێکی بچووکتری دەرهێنا و قفڵی ئەو سندووقەیشی کردەوە و کچێکی ناسك و نازداری هێنایە دەرەوە ! کە دەتوت ئەم شیعرە بۆ ئەو وتراوە:

کە دەرکەت ، دڕی بە تاریکی دا        شەنگیی بە دنیای پڕ ناڕێکی دا
بە تیشکی لێوی خۆرەکان هەڵدێن        مانگی ئاسمانیش لە نشێوی دا
لەبەر دەمیدا کڕنووش بردنە        ئەودەمەی بزەی کە بە خێوی دا

دێـــوەکە ڕووی لەو کیژە نازدارە کرد و وتـــی :

ئەی کیژی قەشەنگ و جوان .. دەمەوێ سەر بخەمە سەر ڕانی نەرمت و سەر خەوێك بشکێنم.

کیژە جوانە سەری دێوەی خستە سەر ڕانی و دێوەی کردە خەو . دوای کەمێك ، بێزار بوو و کەوتە ڕوانین بە دەورو بەری خۆیدا و سەری بڵند کردەوە تاکو لەو درەختە مەزنە بڕوانێت و دوو برا پاشاکەی لە نێو لق و پۆپەکاندا بینی !

ئەویش ڕانی خۆی لە ژێر سەری دێوە دەرهێنا و بە ئارامی لە سەر زەویی دانا . ئەمجا لە بن درەختەکەدا وەستا و ئاماژەی پێدان کە هیچ ترسیان نەبێت و بێنە خوارەوە . ئەگەر بە قسەیشی نەکەن ئەوا دێوەکەیان لێ بە خەبەر دێنێ و هانیشی دەدا کە هەردووکیان بکوژێت !

دوو برای پاشایش لە ترسی دێوەکە هاتنە خوارەوە . ئەمجا کیژە قەشەنگەکە فەرمانی بە هەر دووکیان دا ، کە لەگەڵی جووت ببن ! ئەوانیش فرە پاڕانەوە کە کۆڵیان لێ بدات ! شتی وا ناکەن.

بەڵام کیژە سوور بوو لە سەر داواکەی . دوو برای پاشا تێگەیشتن کە نابێت لە قسەی کیژە دەربچن ناچار کەوتنە چاو لێك داگرتن و رازی بوون بەو کارە نەشیاوە .

کە کیژە پێی زانین ، پێی وتن کە گەر رازی نین وا دێوەکە بە خەبەر دێنم . ئەوانیش رێك کەوتن کە یەکەمجار برای گەورە بچێتە لای و بە دوایدا برا بچووك .

کە لەو کارە بوونەوە ، کیژە رووی کردە هەردووکیان و وتـی :

ئەم دێوە هێندە گێلە کە پێی وایە دەتوانێت بە سەر مەکر و فێڵبازیی ژناندا زاڵ بێت . ئەوەتا منی لەو سندووقەدا بەند کردووە و دەرگای لە سەر کڵۆم داوم . ئەم سندووقەیشی خستووەتە ئەو سندووقە گەورەترەوە و حەوت قفڵی لێ داوە و سندووقە گەورەکەیشی خستووەتە بنی زەریاوە و ژێر ئەو هەموو شەپۆلە بە سەر یەکدا شکاوانەدا . تاکو رێ لە ناپاکیی من بگرێت ! ئەمە لەو کاتەوەی کە شەوی بوکێنی یەکەم ، منی رفاند ! ئەمجا هەڵمەفەیەکی گەورەی لە ملی خۆی داماڵی و پێی وتن کە ئەمانە (٥٧٠) مۆستیلەن و خاوەنی هەر موستیلەیەك ، یەك جار لەگەڵیدا جووت بووە !

بە پێکەنینەوە بە دوو برا پاشاکەی وت :

دەی ئێوەیش هەر یەکەو موستیلەکەی خۆی بداتە دەستم ، تاکو بیخەمە ئەم هەڵمەفەیەوە و با بە ئێوەوە موستیلەکان ببنە (٥٧٢) . ئەی نەتان بیستووە لە بارەی ژنانەوە ، ئەمە وتـراوە :

| | |
|---|---|
| لە ژنان بێ خەم مەبن | پێیان خاترجەم مەبن |
| دڵسۆز خۆی پێت دەناسێ | غـەدریشی پڕ کراسێ |
| پەندی ( یوسف ) بزانە | چییان کرد ، فێڵبازانـە |
| باوکە ئادەمت .. بـــرا | لەبـەر ژن بوو، دەرکرا |

شەهرەیار و شازەمانیش بەم رووداوەی کە بە سەریان هات ، فرە سەرسام بوون ! خەم و پەژارەکەیان رەوی یەوە و روویان کرایەوە و بە یەکتریان وت :

جـا باشە: ئەمە دێوێکی فرە بە هێزو بە توانایە و ئێمە لە بەرامبەریدا زۆر بێ دەسەڵاتین ! ئـەم زەبەلاحە .. ناپاکیی لێ بکرێت ! ئیدی ئێمە بۆ خەم لە خۆمان بخۆین !؟

هـەر لەوێـدا گفتوگۆیـان کـرد و بڕیاریـان دا : هـەر یەکـەو بگەڕێتـەوە وڵاتـی خـۆی و پاشایەتیی خۆی بکات !

دایـان لـە ئـاوزەنگی و گەڕانـەوە بـۆ وڵاتـی شا شـەهرەیار و بـرای گـەورە و دواتـر بـرا چکۆلەش گەڕایەوە وڵاتی سەمەرقەند و چووەوە سەر کورسیی دەسەڵات .

لە ئەو رووداوە بەدواوە ( شاشەهرەیار ) هێندەی رق لە ژنان دەبووەوە کە هەر جارە و کچێکی مارە دەکرد ... *یەکەم شەو لەگەڵی دەنووست و رۆژی دواتر دەی کوشت .*

ئەو رەفتارە ناپەسەندەی شا شەهرەیار(٢) ساڵی خایاند و ئەمەیش بووە هۆی بێزار

بوونی ڕەمەکی خەڵکی مەملەکەتەکەی. تا وای لێهات خێزانەکان کچەکانیان لەگەڵ ...
دەبردو لە ترسی پاشاکەیان لە وڵات هەڵدەهاتن ..!

ڕۆژێکیـــان :

شا( شەهرەیار) داوای لە وەزیرەکەی کرد ، کە کچێکی بۆ بدۆزێتەوە و هەر وەکو ...
لێی مارە بکات . وەزیر کە چووە ناوشارەکە ، بینی شار : چۆڵ و هۆڵە ..! بە دڵێکی پڕ ...
و پەژارەوە و ترسێکی زۆرەوە .. گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی . ئەم وەزیرە (٢) کچی هەبوو
یەکێکیان ناوی (شەهرەزاد) و ئەویتر (دنیازاد) بوو . کچە گەورەکەی : کتێبانێکی ...
مێژوو سەربوردەی پاشایانی کۆن و هەواڵی نەتەوەیانی کۆنی خوێندبووەوە .
لێیان گێڕاوەتەوە کە (١٠٠٠) کتێبی لە کتێبخانەدا هەبووە. هەر لە کتێبی مێژوو ...
میللەتانی کۆن ، تا دەگاتە پاشایان و شاعیرانی دێرینی تێدابووە .

کچە گەورە کە باوکی گەورە وەزیری بەو خەمباریەوە بینی ، لێی پرسی :

*ئەرێ ئەوە بۆ ئەو هەموو پەژارەیەت بە کۆڵ خۆتدا داوە !؟ ئەوەتا شاعیرێك وتویەتی*

بە خەمبار بڵێن دۆش دانەمێنێ    خەم و پەژارە : یا نەی مرێنێ
چۆن خۆشی تاسەر نامێنێتەوە    ڕۆژان خەمیشت هەر دەڕەوێنێ

وەزیر .. هە رلە نووکەوە ، فەرمانەکەی شا ( شەهرەیار)ی بۆ گێڕایەوە .

کچە گەورە وتی :

*باشە ، بۆ نام دەیت بەو پاشازۆردارە ..!؟ یا منیش وەکو کچانی پێشوو دەکوژرێم ...*
*دەژیم و کیژانی موسڵمانان لە دەست ئەم پاشا زۆردارە : ڕزگار دەکەم!*

وەزیری باوکیشی وتی :

*بۆ خـــاتری خوا ... یاری بە چـــارەنووسی خۆت مەکە !*

کچەکەیشی وتی :

نەخێر .. ئەگەر تۆ ڕێم بدەیت : ئەم کارە هەر دەکەم ..!

باوکیشی وتی : دەترسم وەك ( کەر و گا )ی جوتیارەکەت لێ بە سەر بێت .

کچەکەیشی پرسیی : بابەگیان .. بە سەرهاتی ئەو ( کەر) و ( گا )یە چۆن بووە ..!؟

## چیرۆکی ( کەر ) و ( گا )

وەزیر دەستی کردە گێڕانەوەی سەربووردەی کەرو گاکە بۆ کچەکەی و وتی :

هەبـــوو .. نەبـــوو...

بازرگانێك بوو . بازرگانانیش خاوەن سامان و مەڕو ماڵاتن .. ئەو پیاوە ژن و منداڵی بوو ...
خوا بەهرەی زانینی زمانی ( باڵنـدە ) و ( ئـاژەڵان )ی پێ بەخشی بـوو. ئەم بازرگانە لە ...
نشین بـوو. ( کـەر ) و ( گـا ) یـەکی هـەبوو. ڕۆژێـك گایەکـە ، خـۆی کـرد بە (تەویلە)ی ...

کەرەکەدا و بینیی شوێنەکەی ئاوڕشێن کراوە ..
( ئاخووڕ)ەکەی گەسک دراوە .. (کا) و( جۆ )ی لە ( بێژنگ ) دراوی بۆ تێکراوە . ( کەر )ەش بێ خەم لێی ڕاکشاوە . سا.. مەگەر جارو بارێك خاوەنەکەی سواری پشتی ببوایە . بەرەو کێڵگەکەی ببردایە و دواتر پێی بگەڕایەتەوە .
ڕۆژێکیـــان ... بازرگانەکە گوێی لێبوو ، (گا)یەکە بە (کەر)ەی وت :
*نۆشی گیانت بێ . من ماندوو مردوو، تۆیش هەمیشە پشوو... لە (کا) و (جۆ)ی پوختە دەخۆیت و خاوەنت بەزێرایيت دەکات .. مەگەر جاروبارێك سواری پشتت ببێت ! ئێمەش هەمیشە : یان لە ئاشین ... یا زەوی دەکێڵین و بەرد دەتاشین !*
کەرەکە وتی :
ئاسانە ... کە بردیانیت بۆ سەر کێڵگە .. لە ملیان خستیت نێڵەکە . خۆت بدە بە زەویدا، لێیشت بدەن هەر هەڵ مەستە! کە زۆر ناچار بوویت بچۆ سەر چۆك . کە گەڕایتەوە مال . پاقلەت دەخەنە بەردەم .. مەیخۆ ! هەر وەکۆ ئەوەی زۆر لاواز بیت . ڕۆژێ یان دووان مان بگرە ، مەخۆ و مەخۆرەوە . ئیدی بۆ کارت نابەن و ماندوو نابیت و دەحەوێیتەوە !
وا کابرای بازرگانیش گوێی لە گفتوگۆیانە ! ڕۆژی دواتـر: جووتیـار هاتـە لای (گا) و (ئالیك)ی بۆ لە (ئاخووڕ) نا.. گایەش زۆر کەمی لێ خوارد . جووتیار گایەی بردە جووت . بینی زۆر بێ هێزە. ئەمیش برێ خەمی بۆ خوارد و لە دڵی خۆیدا وتی :
ئەمە بە هۆی ماندوو بوونی دوێنێ یەوە بووە!
ئیدی چووە لای ( بازرگان ) و وتی :
*گەورەم گایەکە کاری جارانی بۆ ناکرێت . ئەمشەویش ، شتێکی ئەوتۆی لە ئالیکەکەی نەخواردبوو.*
بازرگان کە لەو کەین و بەینە بەئاگا بوو وتی :
برۆ ، (کەر)ەکە ببە و بیخە شوێنی (گا )یەکەو تا ئێوارە جووتی پێ بکە .
جوتیـارەیش ئێـوارە ، دوای ئـەوەی بـە درێـژایی ئـەو ڕۆژە جووتی بـە کەرەکـە کـرد بـوو هێنایەوە مالْ . لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژە (گا)یەکە بێکار بوو و حەوابووەوە . کە کەرەکەی بینی سوپاسی کرد . (کەر)ەکەیش لە داخدا بێـدەنگ بـوو و پەشیمانی یەکی زۆری کێشا. ڕۆژی دواتریش جوتیار هاتەوە و ( کەر )ەی بردەوە بۆ جووت . کە ئێوارە گەڕایەوە پێستی ملی داماڵدرابوو ، ماندوو و نیوە مردوو بوو بوو.
(کەر)ەکە سەرنجی دایە ( گا )یەکە و لە دڵی خۆیدا وتی :
*خۆم بە خۆمم کرد ..!!*
ڕووی کردە (گا)یەکە و پێی وت :
ئەوە بزانە ئامۆژگاریت دەکەم .. بیستومە خاوەنەکەمان وتوویەتی : ئەگەر ئەمجارە

گایەکە هەڵئەستایەوە بۆ کارکردن . ئەوە بیدەنە دەست قە ساب ، با سەری ببڕێت و
پێستەکەی بگروویێت .

گایەکە کە ئەم ئامۆژگاری یەی بیست ، سوپاسی کرد و پێی وت :

لە سبەینێ زووتر نی یە ، دەچمەوە سەرکارەکەم جووت دەکەم بۆ خاوەنەکەم .
بۆیە دەستی کردە ئالیك خواردن ، ئاخوڕەکەشی بە زمان لستەوە . وا بازرگانە کوێ
لەم کەین و بەینەیشە و خۆی لە هەردووکیان داگرتووە .

بۆ رۆژی دواتر لەبەر دەرگای گەوڕەکەدا بوون کە جووتیار هات و گایەی هێنایە دەرەوە
گایەکە خاوەنەکەی بینی کەوتە کلکە لەقێ بۆی ! بازرگانەیش هێندە پێکەنی بە پشتدا
کەوت .

ژنەکەی کە لە دوورەوە دەیڕوانی ، هات و لە مێردەکەی پرسی :

ئەوە بە چی پێدەکەنیت ؟

مێردەی ( بازرگان ) وتی :

ناتوانم پێت بڵێم ، چونکە ئەم ( نهێنی )یە .. ئاشکرا بکەم .. پێی دەمرم..!

ژنەی بازرگان تووڕە بوو وتی :

گەر پێیشی بمریت ، هەردەبێ پێم بڵێی !

بازرگانە وتی :

ژنەکە نابێت ئەم نهێنی یەی خۆم بخەمە روو ، ئاخر.. سوور دەزانم دواتر پێی دەمرم!

ژنەکەیشی وتی :

کەوابوو ، بە من پێکەنیویت ..!!

ئیدی ئەمەندەی وت و وتەوە ، تا کۆڵی بە مێردەکەی دا و چاری نەما و ناردیە شوێن
( قازی )و شایەت ، بۆ ئەوەی وەسیەت بکات . ئەمجا نهێنی یەکە ئاشکرا بکات . لەبەر
ئەوەی کچە مامی خۆی بوو زۆری خۆش دەویست . ناردیشی یە شوێن کەس و کاری ژنە و
دەرو دراوسێ تاکو ئەوانیش ئاگادار بن . چونکە هەر بە باس کردنی نهێنی یەکە و
پێکەنینەکەی دەم ودەست دەمرد ..!!

هەر هەموو ئەوانەی کە بانگ کرابوون لە ژنە پاڕانەوە :

*کە بۆ خاتری خوا : واز بێنە لەم پیاوە خۆ... ئەو باوکی منداڵەکانتە .*

کەچی ژنە وەڵامی دانەوە و پێی وتن :

پەشیمان نابمەوە ، دەبێت ، هەر پێم بڵێت . لێی بگەڕێن ، با بمرێت ...!

ئیدی بازرگان لە نێو خەڵکەکە هاتە دەرو رووی کردە (گەووڕ)ەکەی خۆیان .. نەیدەزانی
چی بکات .

ئەم پیاوە کەڵەشێرێکی هەبوو کە (٥٠) مریشکی لە ژێر دەستا بوو . سەگێکیشی هەبوو!

ئاگای لە کارەساتەکە بوو . سەگەکە ..کەوتە جنێودان بە کەڵەشێر و شیڕاندی بە سەریدا :
ئەوە دڵت بە چی خۆشە !؟ خۆ.. وا خاوەنەکەمان دەمرێت !!
کەڵەشێرەکە پرسیی : چۆن .... چۆن ؟
ئیدی ... سەگەکە چی رووی دابوو ، بۆ کەڵەشێرەی گێڕایەوە .
کەڵەشێر وتی :
بەو خوایە ..خاوەنەکەمان زۆر گێلە..! ئاخر من (٥٠ ) ژنم هەیە! ئەمیان رازی دەکەم و ئەویان ئاشت دەکەمەوە. کەچی خاوەنەکەمان تەنیا یەك ژنی هەیە ، ناتوانێ رازیی بکات!
ئەوە بۆ( توولێ )ە توویەکی تەڕی لێ هەڵناگرێ و نایباتە ناو گەنجینەکەوە دارکاریەکی باشی بکات!؟ هێندەی لێ بدات : تا نیوە مردوو دەبێت و ( تۆبە ) و ئیستغفار دەکات ؟
ئەوا بازرگانەش کە لە زمانی ئەوان دەگەیشت ، گوێی لە کەڵەشێر بوو کە بۆ سەگەکە دەدوا...
لێرەدا وەزیرەکە بە ( شەهرەزاد )ی کچی وت :
تۆیش کارێك مەکە ، تاکو بازرگانەکە چی بە ژنەکەی کردووە.. منیش وات لێ بکەم !
کچەکەی پرسیی :
بۆچی بازرگانەکە .. چی لە ژنەکەی کرد؟
وەزیرەکە وتی :
دوای ئەوە بازرگانەکە لقێکی لە دارتووەکەی حەوشەی خۆیان کردەوەو لە گەنجینەکە شاردی یەوە .
ئەمجا هاتەوە لای ژنەکەی و وتی :
وەرە ، با بچینە گەورەکەو بە تەنیا (نهێنی)یەکمت پێ بڵێم..تووخوا با.. هەر لەوێ بمرم و کەس نەم بینێت !
بازرگانە ژنەکەی بردە گەورەکەوە و دەرگاکەی لە ناوەوە کلۆم داو بە تووڵە تەڕەکە کەوتە لێدانی .
تا لەهۆش خۆی چوو..کە بە ئاگا هاتەوە . دەستی بازرگانەی ماچ کردو تۆبەی کرد . ئیدی هەردووکیان بە پێکەنینەوە ، لە گەنجینەکە هاتنە دەرەوە . خەڵکەکە ئەمەیان بینی ، خۆشحال بوون .
کچە وەزیر کە ئەم چیرۆکەی بیست وتی :
دەبێ هەر وابێت .
وەزیرەکە کچەکەی رازاندەوە و بەرەو کۆشکی شا ( شەهرەیار) بوونەوە . لەو لایشەوە شەهرەزاد خوشکە بچووکەکەی خۆی ئامۆژگاری کردبوو. کە ناردی بە شوێنی.. دەبێت لەگەڵیدا بێت و چەند شەوێك لەکۆشکی شادا بمێنێتەوە . ئەمیش چیرۆك بگێڕێتەوە بۆیان

. تاكو... شەوی بێ بەسەربەرن .
وتبوویشی : خوا یار بێت قسە و باسێكتان بۆ دەگێڕمەوە . رزگاربوونی بە دوای بێت.
وەزیر كچەكەی خۆی برد و رۆیشت . كە گەیشتنە كۆشك..
شا شەهرەیار رووی لە وەزیر كرد و پرسیی :
كارەكەت بۆ جێ بەجێ كردم ؟
وەزیر وتی :
فەرموو ئامادەیە .. مارەی بكە .
شا ( شەهرەیار )یش بەو وەڵامە فرە خۆشحاڵ بوو .
بەڵام كە سەرنجی ( شەهرەزاد )ی دا، دەگری... لێی پرسی :
ئەوە چیتە و بۆ دەگریت ؟
شەهرەزاد وەڵامی دایەوە :
ئەی پاشا.. بیری خوشكە بچووكەكەم دەكەم و خواحافیزیم لێ نەكردووە !
شا .. ناردی بە شوێن خوشكەكەیدا .. كە ئێوارە هات و لێی دانیشتن . خوشكە
بچووكەكەی گەیشت باوەشیان بەیەكدا كرد .
دوای كەمێك خوشكە بچووكە ، رووی لەخوشكی گەورەی ناو وتی :
*تووخوا .. خوشكە گیان.. ئەگەر چیرۆكێكمان بۆ نەگێڕیتەوە ! با ئەمشەوی پێ بەسەر بەرین .*
شەهرەزاد لە وەڵامدا وتی :
*گەر پاشا رێم پێ بدات .. بەسەر چاوان .*
شا ( شەهرەیار) ، كە ئەمەی بیست خۆشحاڵ بوو رێی پێدا.

## شەوی ١

### چیرۆكی بازرگان و دێو

شەهرەزاد وتی :
بۆیان گێڕاومەتەوە .. ئەی پاشای دانا... بە ژیان زانا...
كە شا( شەهرەیار) ئەم قسە جوانانەی بیست . خۆیشی لە خەم و دڵەڕاوكەدا بوو. زۆر
خۆشحاڵ بوو. رێگەی پێدا .
شەهرەزاد وتی :
كە فەلەك دەگا، بە ئێمە دەستی    دەبێتە بەشمان پەژارە و پەستی
دەگێڕنەوە بازرگانێك هەبوو . سامانێكی فرەی بوو. مامەڵەی لە وڵاتدا بەرفراوان
بوو....

رۆژێکیان سواربوو بەرەو هەندێ لەو وڵاتانە . لە رێگا گەرما زۆری بۆ هێنا و چووە بن سێبەری درەختێك . دواتر دەستی کرد بە نانە بەرەکەیدا و هەندێ وردە نان و دەنکە خورمای دەرهێنا و دەستی کردە .. نان وخورما خواردن . دەنکێ خورمای فرێ دا.. سەیری کرد لەبەرامبەریدا (دێو)ێك پەیدابوو، تا بڵێی درێژ ، شمشێرێکی بە دەستەوە بوو .

نووشتایەوە بە سەر بازرگانەدا و وتی :

*هەستە ، با... چۆن کورەکەمت کوشت ، ئاوا بتکوژمەوە...!*

بازرگانە وتی :

*کوا من کوڕی تۆم کوشتووە؟*

دێوە وتی :

*کە خورماکەت خوارد و ناوکەکەیت فرێ دا. ناوکە دای بە سەرسنگی کوڕەکەمداو کتوپڕ مرد!*

بازرگان وتی :

انا لله وانا الیە راجعون . ئەگەر وابێت ... ئەوا خۆ من بە ئارەزووی خۆم ئەوم نەم کوشتووە . داوای لێبوردن دەکەم .

( دێو )ەکەیش وتی :

پێی ناوێت ، دەبێت بتکوژم .

بازرگانەی لە سەر زەوی راکێشا و شمشێری بڵند کردەوە کە بیکوژێت !

بازرگانەکە گریاو وتی : *خوایە ... واخۆم دایە دەست تۆ !!*

ئەم شیعرەیشی وت :

زەمانە ترسە و هەم ئاسوودە بوون — رۆژانی خۆشە و ترسانی تیا چوون
ئەوانەی شەقی زەمانە دەخۆن — لۆمە ناکرێن چۆنی خول دەخۆن
رەشەبای زۆری کاتی ئاوەختە — زیانی زۆری هەر بۆ درەختە
کە فەلەك دەگا بە ئێمە دەستی — دەبێتە بەشمان پەژارە و پەستی
ئەستێرەی ئاسمان هەزاران جۆرە — (گیران)یش تەنیا بۆ مانگ و خۆرە
خۆ.. زەوی پڕی دەرخەت و داوە — هاویشتنی بەرد هەر بۆ بەرداوە

کە لە خوێندنەوەی شیعرەکە بوویەوە جنۆکەکە وتی :

*زۆر مەڵێ .... هەر دەبێت ، بتکوژم !*

بازرگانەکەیش وتی :

لە لایەك هەرزارم ، سامانێکی زۆریشم هەیە ! ژن و منداڵیشم هەیە.. ئەمەندە مۆڵەتم بدە.. بگەڕێمەوە ماڵ و ئەرکەکانم بەجێ بگەیەنم . سەری ساڵ دەگەڕێمەوە لاتان . پەیمان بە خوا و تۆ دەدەم . خوا وەکیل دێمەوە لات و جیم لێ دەکەیت بیکە .

( دێو )ەیش دوای ئەم پەیمانە ، ئازادی کرد . بازرگانەش گەڕایەوە ماڵ و کارەکانی ڕاپەڕاند . ژن و منداڵی تێگەیاند و تا ساڵ تەواو بوو لایان مایەوە. ئیدی دەستنوێژی هەلگرت و کفنەکەی خۆی خستە بندەست و خواحافیزی لە خزم و خوێشان کرد و بە نابەدڵی ڕێگەی گرتەبەر.

دەوروبەرەکەی دەستیان کردە ناڵە و گریان و لاوانەوە بۆی . ڕۆیشت. تا گەیشتە باخ و بێستانێك ئەو ڕۆژە سەری ساڵی نوێ بوو. دانیشت بوو بۆ خۆی دەگریا. پیرێك کە ئاسکێکی پەت کردبوو .

بەرە ولای هات و سڵاوی لێکرد و پرسیی :

*ئەوە بۆ لەم شوێنە جنۆکانەدا لێی دانشتوویت !؟*

بازرگانەکە بە سەرهاتی خۆی و جنۆکەکەی بۆ گێڕایەوە .

پیرەی خاوەن ئاسك سەری سوڕما..!! وتی :

بەخوا برا قەرزەکەت گرانە و بەسەرهاتەکەت سەیرە..!! گەر بە خامە و ئاوی چاوان بنووسرێت خەڵکی پێ سودمەند دەبن .

لای دانیشت و وتی :

*بەوخوایە ... لێت نابمەوە : تا ... کەین و بەینەکەت لەگەڵ ئەو جنۆکەیە دەبڕێتەوە!*

ئەمیش غەم و پەژارە و بیر کردنەوەی زۆرتر بوو. دواتر پیرێکی دی بەرەو لایان هات و دوو تانجیی ڕەشی پێ بوو.

ئەویش دوای سڵاو کردن پرسیی :

بۆچی لەم شوێنە دانیشتوون؟ خۆ... ئێرە شوێنی جنۆکەکانە ..!

ئەوانیش چیرۆکەکەیان بۆ گێڕایەوەو ئەویش لایان مایەوە . هێندەی پێ نەچوو، پیری سێ یەم پەیدا بوو و ئەویش هێسترە زەردێکی پێ بوو .

سڵاوی کرد و پرسیی .. ئەوانیش لە نووکەوە چیرۆکەکەیان بۆ گێڕایەوە.

ئەویش لایان مایەوە . دوای کەمێك گوێیان لە گرمەیەك بوو . تەپ و تۆزێکی زۆری لەوچۆڵەوانیەدا بڵاو کردەوە .

کە تەپ و تۆز نیشتەوە دێوێکیان بینی شمشێرێکی بە دەستەوە بوو و چاوانی گڕی لێ دەبووەوە و بۆیان چوو .

بازرگانەکەی لە نێوانیاندا دەرهێنا و وتی :

هەستە .. با هەر وەکو چۆن کوڕەکەمت کوشت .. ئاوا بتکوژمەوە!

بازرگان دایە پرمەی گریان . هەر سێ پیرەکەش لە ترساندا هەستان و دەستیان کردە گریان .

پیرەی خاوەن ئاسك دەستی ( دێو )ەکەی ماچ کرد و وتی :

ئەی تاجی سەری ( جنۆکە )کان ... ئێستا بە سەرهاتێکی بێ وێنەی خۆمت لەگەڵ ئەم ئاسکە بۆدەگێڕمەوە.. بەو مەرجەی گەر بەلاتەوە سەیر بوو، لە پاداشتیدا ، سێ یەکی خوێنی ئەم بازرگانەم پێ ببەخشیت .

( دێو)ەکە وەڵامی دایەوە :

بەڵێ...باشە .. گەر بەسەرهاتەکەم پێ سەیر بوو سێ یەکی خوێنی ئەم بازرگانەت حەڵاڵ بێت .

## چیرۆکی یەکەم

### پیرەمێردی یەکەمی خاوەن ئاسک

پیرەمێردەکە وتی :

ئەی( دێو ) ئەوە بزانە ئەم ( ئاسك )ە کچە مامی خۆمە و لە گۆشت وخوێنمە .. زۆر مندال بوو مارەم کرد . نزیکەی (٣٠ ) ساڵ ژن و مێرد بووین . بەڵام منداڵمان نەدەبوو. بۆیە بێ ئەوەی ئەو بزانێت ( کەنیزەك )ێکم مارە کرد و کوڕێکم لێی بوو کە وەکو مانگ دەدرەوشایەوە . کوڕە گەشەی کرد و تەمەنی بووە (١٥) ساڵ .

ژنەکەم کاروانێکی بازرگانیی گەورەی بۆ ڕێکخستم و رووم کردە چەند شارێك . حەز دەکەم ئەوەیش بزانن کە ئەم کچە مامەم .. هەر لە منداڵیەوە خوی فێری ( سیحر) کرد بوو. بۆیە بە سیحر کەنیزەکەی ژنی منی کرد بووە ( مانگا) و کوڕەکەیشم بە ( گوێرەکە )کەی . ئیدی منیش دوەنگانێك لەو سەفەرەکەم گەڕامەوە .

کە لەکەنیزەکە وکوڕەکەمم پرسی یەوە ، پێیان وتم :

ژنەکەت مردو کوڕەکەیشت سەری خۆی هەلگرت . ئەوە بوو ساڵێك بە خەم و پەژارەیانەوە مامەوە.. دواتر جەژنی قوربان هات و منیش شوانەکەمم راسپارد (مانگا)یەکی قەڵەوم بۆ بنێرێت . مانگا قەڵەوەکەم پێ گەیشت . توومەز ئەو ( مانگا )یە کەنیزەکەکەی ژنمە و ئەم کچە ئامۆزایەی ژنم ، بە ( سیحر ) کردویەتی بە (مانگا) . چاکم بەلادا کرد و کێردم بە دەستەوە گرت ، تا سەری ببڕم .

مانگا .. دەستی کردە ناڵە و بۆڕە بۆڕ و گریان .. منیش سەرم سووڕماو بەزەییم پێیدا هاتەوە.

وتم :

کاکی گاوان .. ئەم مانگایە ببەوە ناو گاگەلەکە و دانەیەکی ترم بۆ بێنە .

کۆنە ژنەکەیشم ـ کە ئەم ئاسکەی بەردەممە ـ وتی :

سەری ببڕە .. چونکە گاو مانگای لەمە قەڵەوترمان نی یە .

منیش بە قسەم کرد و دەستم دایە تاکو سەری ببڕم . مانگاکە دەستی کردە بۆڕە بۆڕ وهاوار.

گەڕامە دواوە بە گاوانم وت :

ئادەی .. تۆ سەری ببڕە ! سەری بڕی و لەوێدا کەوڵی کرد . گۆشت و چەوریەکی ئەوتۆی نەبوو و هەر پێست و ئێسقان بوو.

بۆیە پەشیمان بووم لە سەر بڕینی و وتم :

بڕۆ گوێرەکەیەکی قەڵەویشم بۆ بێنە .

توومەز(مانگا)کە کەنیزەکەکەی ژنم بووەو ئەوگوێرەکەیەیش کە هەر ئەو بۆی هێنام کوڕەکەم بوو..! کە منی بینی پەتی ملی پچڕاند و هات و خۆی تێ هەڵسوییم و کەوتە گریان و لاوانەوە .

منیش بەزەییم پیاهاتەوە و وتم :

مانگایەکی دی بێنە .

ژنە کۆنەکەم کەکچە ماممە . واتە ئەم (ئاسکە)ی ئێستا پەتم کردووە وتی :

پیاوەکە سەری ببڕە .. ئەمڕۆ ڕۆژێکی پیرۆزە و دەبێت ، قوربانی جوان و چاکی تێدا بکرێت !

منیش وتم :

سەیرکە .. بە فەرمانی تۆ : مانگاکەمان سەر بڕی ، مایە پووچ دەرچووین و سوودمان لێ نەدی . ئەمجارە بە قسەت ناکەم .

ژنەکەیشم سوێندی لێم خوارد و وتی :

بە خوای ڕەحمان و ڕەحیم .. دەبێت هەر ئەم گوێرەکەیە .. لەم ڕۆژە پیرۆزەدا سەر ببڕی . گەر بە قسەیشم نەکەیت .. نە تۆ مێردی منیت و نە منیش ژنی تۆم .

کە ئەمەم لێ بیست.. لە مەبەستیشی بێ ئاگا بووم . بە کێردێکەوە چوومە پێشەوە.

دنیازادی خوشکە بچووکی ( *شەهرەزاد* ) وتی :

قسەکانت چەند بەتام و شیرین و خۆشن !

( *شەهرەزاد* )یش وتی :

هێشتا لە کوێتانە .. بە خوا گەر، تەمەن درێژ دەبێت و پاشا بم هێڵێتەوە ، شەوی داهاتوو، قسەی خۆشتر دەبیستن .

شا ( شەهرەیار )یش لە دڵی خۆیدا وتی :

بەو خوایە.. تاکو هەموو چیرۆکەکەم بۆ نەگێڕێتەوە .. دەستبەرداری نابم و نایکوژم !!

ئەو شەوەیشیان ڕۆژ کردەوە . بۆ سبەینێ شا چووە شوێنی حوکمڕانی . وەزیریش ، کە کفنێکی لە بن دەستدا بوو ، هات . ئەو ڕۆژە ، تا درەنگانێ پاشاحوکمڕانی خۆی کرد و هیچ

فەرمانێکی کوشتنی تازە بووکی ژنیی پاشای بۆ وەزیر دەرنەکرد و وەزیر سەری سوورما!
شەو هات و دیوەخانی پاشا کرایەوە . شا دانیشت و کۆڕ گەرم بوو.
(دنیازاد) بە ( *شەهرەزاد* )ی خوشکی وت :
خوشکە جوانەکەم ، بە قوربانت بم .. چیرۆکی ( *بازرگان و دێوەکە* )مان بۆ تەواوبکە .
( *شەهرەزاد* )یش کڕنووشی بۆ شا ( شەهرەیار ) برد و وتی :
ئەگەر پاشامان ڕێم بدات .
پاشارێی پێدا و( شەهرەزاد ) دەستی بە قسان کرد :
دەگێڕنــــەوە... *ئــەی شای دانا ... بە ژیــان زانا ...*
بازرگانەکە دڵی بە گوێرەکەکە سووتا و بە گاوانی وت : بیکەوە ناو گاگەلەکە .
ئەوا پیرە ... چیرۆکەکەی بۆ( دێو )ەکە دەگێڕێتەوە ، دێوەش بە سەرسوورمانەوە گوێی لێ گرتووە .
خاوەن ئاسکەکە وتی :
ئـەی شـای ( دێـو )ان ...ئەمانـە بـە بەرچـاوی کچە مامەمـەوە ــ کە ئـەم ئاسکەیە بە دەستمەوە ــ روو دەدەن و ئەویش خێرا.. خێرا دەیوت :
ئەم ( گوێرەکە )یە سەر ببڕە ، زۆر قەڵەوە . خۆیشی تێك نەدەدا ! کە پێم وت بیبەرەوە نێو گاگەلەکە ، بردی و ڕۆیشت . ڕۆژی دواتر کە لە ماڵەوە دانیشتبووم .
گاوان رووی تێکردم و وتی :
گەورەم ... شتێکت بۆ دەگێڕمەوە ، دڵت پێی خۆش دەبێت ... مژدانەیشم دەوێت .
منیش وتم : بڵێ .
ئەویش وتی :
ئــەی بازرگـان ، ئـەوە بزانـە کچێکم هەیـە . هـەر لـە منداڵیـەوە لای پیرەژنێك کە لە ماڵماندا بـوو، (سیحر) فێـر بـووە. دوێنـێ کەگوێرەکەکـەم بـردەوە . کچەکەم گوێرەکەکەی بینی ، سەری خۆی داپۆشی و دەستی کردە گریان .
دواتر دەستی کردە پێکەنین و وتی :
ئەمەندە بێ بەختم ... پیاوم بۆ بێنی !؟
منیش پرسیم :
پیاوی چی !؟ باشە ئەوە بۆ گریایت و کەچی دواتر پێکەنیت؟
کچەکەیشم وتی :
ئەم گوێرەکەیە کوڕی ئاغاکەمانە و سیحری لێکراوە . بـاوەژنەکەیشی ئەو سیحرەی لە خۆی و دایکی کردووە. بۆیە پێکەنینم هات. هۆی گریانەکەشم سەربڕینی دایکی کوڕەکە بوو.
منیش ئەو شەوە لە خۆشیدا خەوم لێ نەکەوت و خوا... خوای ئەوەم بوو ڕۆژ ببێتەوە .

تاکوو بێمە لات و ئەم هەواڵە خۆشەت پێت بڵێم .

ئــەی دێو.. منیش کە ئەمــەم بیست لــە خۆشیدا وەکو سەرخۆشم لێهات و بە پەل

لەگەڵ گاوانەدا چوومەوە بۆ ماڵ . کچە گاوان دەستی مـاچ کردم و بـە خێرهاتنی کردم

چوون گوێرەکەکەیان هێنا و گوێرەکە کەوتە خۆ تێ هەڵسوێنم .

منیش پرسیم :

ئەرێ بە سەرهاتی ئەم گوێرەکەیەم راستە؟

کچەکە وتی :

بــەڵێ قوربان ... ئەم گوێرەکەیە کوڕی خۆتە !

منیش وتم :

کەوابوو.. ئەوگوێرەکەیەم : بۆبکەوە بەمرۆڤ و گاگەلەکەی ژێر دەستی باوکت بۆ خۆت

کچەکەش بە پێکەنینەوە وتی :

هێندەش بۆ سامان نەمردووم . بەڵام بۆ ئەو کارە ، دوو مەرجم هەیە .

یەکەم : منی لێ مارە بکەیت .

دووەم : ئەوەی سیحری لەمان کردووە . منیش سیحری لێ بکەمەوە . تا ببەستێتەوە

و لە هەرەشەی بێخەم بم .

منیش وتم :

لــە ســەروو ئەوانەیــشە وە : چــی مــەڕ و مــاڵات و ســامانم هەیــە بــۆ تــۆ . لە باری

ئامۆزاکەیشمەوە .

خوێنی لە تۆ حەڵاڵ بێت . کچە گاوان .. قاپێکی هێنا و پڕی لە ئاو کرد و هەندێکی بەسەرا

خوێند و ئاوەکەی پرژاند بە سەر گوێرەکەکەداو وتی :

گەر خوا بە گوێرەکەیی دروستی کردویت ، هەر وەك خـۆت بمێنـەوە ! گەر بە ( سیحر

)یش بوویتـە گوێرەکـە.. بـە فـەرمانی خـوا بگـەڕێوە دۆخـی جارانـت . گوێرەکەکە خۆی

راوەشـاند و بـووەوە بـە ( مـرۆڤ ) . منـیش خـۆم دا بـە سـەریدا و سـوێندم دا . کە بۆم

بگێڕێتەوە ، تا بزانم ئامۆزاکەم چی بەسەر خۆی و دایکی هێناوە؟

ئەویش چییان بە سەر هاتبوو بۆی گێڕامەوە .

ئەمجا بە کوڕەم وت :

کوڕەکەم .. خوا ئەم کچەی کردە فریشتە و تۆی رزگار کرد .

ئیدی ، ئەی (دێـو).. کچە گاوانم لە کوڕەکەم مارە کرد . دواتر بووکەکەم ، ئامۆزاکەی

بە سیحر گۆڕی بۆ ئەم ( ئاسك )ەی بە دەستمەوەیە و پێی وتم :

ئامۆزاکەت ژن و کوڕەکەتی کرد بوو بە دوو ئاژەڵی بێزراو! وا من ئەوم کردووە : بە (

ئاسك )ێکی جوان . بووکەکەم رۆژانێکی زۆری لای ئێمە بەسەر برد . تاکو خوا بردی بەرەو

بۆ خۆی . کە بووکەکەم مرد . کوڕەکەیشم ، ڕووی لە ( هندستان ) کرد. وڵاتی ئەو پیاوەی کە ئەمەی لەگەڵ تۆدا بەسەرهات .

ئیدی ( ئاسك )ەی ئامۆزام بە دوای خۆمدا بەکێش کرد . ئەم وڵات بۆ ئەو وڵات . بە شوێن کوڕەکەمدا دەگەڕێم . تا قەزا و قەدەر منی هێنایە ئێرە و ئەم بازرگانەم بینی دانیشتووە و بۆ خۆی دەگری ... ئەمە بوو بەسەرهاتەکەم .

( دێو )ەکە وتی :

بەسەرهاتێکی عەجایب بوو..!

وا سێ یەکی خوێنی ئەم بازرگانەم پێ بوخشیت .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

## شەوی ٣

چیرۆکی پیری دووەم و تانجی یەکەی

دنیا زاد ڕووی لە شەهرەزادی خوشکی کرد و پێی وت :

خوشکێ خۆزگە بەسەرهاتی ( بازرگان و دێوەکە )ت بۆ تەواو دەکردین !

شەهرەزاد یش وتی :

ئەگەر پاشامان ڕێگام پێ بدات .

پاشایش بە ڕوویەکی خۆشەوە ڕێی پێدا .

شەهرەزاد دەستی بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە کرد و وتی :

ئەی پاشای بەختیار.... زیرەك و هۆشیار...

پیرەمێردی دووەم بەخۆی و دوو ( تانجی )یەکەیەوە چووە بەردەمی دێوەکە و وتی :

گەر ڕازی خۆم و ئەم دوو تانجی یەی برام بۆ گێڕایتەوەو سەرت پێی سووڕما . سێ یەکێکی تری خوێنی ئەم بازرگانەم پێ دەبەخشیت ؟

دێوەکەیش وتی :

گەر وابوو، ئەو سێ یەکەت پێشکەشت بێ !

پیرەمێردی دووەم وتی :

ئەی شای ( دێو )ان ... ئەم دوو تانجی یە برای منن و منیش برای سێیەمیانم .. باوکمان مرد و ( ٣٠٠٠) دیناری بۆ بە جێ هێشتین . هەر یەکەمان دوکانێکی بە بەشە میراتی یەکەی خۆی لە بازاڕدا کردەوە . هێندەی پێ نەچوو برا گەورەکەم ــ کە یەکێکە لەم تانجیانە ــ دووکانەکەی فرۆشتەوە بە (١٠٠٠ ) دینار و هەندێ شتی بازرگانیی کڕی و سەفەری کردو ساڵێك ون بوو.

رۆژێکیـــان .. سوالکەرێك هاتە بەر دوکانەکەم .
منیش پێم وت :
خوا بت داتێ !
ئــەویش بەگریانە وە لێی پرسیم : نام ناسیتەوە !؟
کە وردتر سەرنجمدا براکەی خۆم بوو..! بـاوەشم پێدا کردو ئێوارە بردمەوە بۆ ماڵ
کە لێم پرسی وتی :
*هەرمەپرسە ...! سامان رووی لێوەرگێڕام و ژیانی تێکدام..!!*
کردم بە ماڵی خۆمداو بردمە گەرماوی ماڵ و لە جلوبەرگی خۆمم پێدا .. دواتر بە سامان
و پارەکانم دا چوومەوە..
دوکانەکەیشم فرۆشت . کە سەیر دەکەم ( ٢٠٠٠) دینارم هەیە .
(١٠٠٠ ) دینارم دا بەم برایەم و پێم وت :
*بگرە .. هەر وایش بزانە سەفرت نەکردووە !*
کە پارەکەی وەرگرت ، زۆر دڵی خۆش بوو. دوکانێکی پێ کردەوە ، رۆژان هات و رۆژان
رۆیشت .
براکەی ترم کە ئەم تانجی یەی تریانە . دوکانی فرۆشت و ویستی ئەویش سەفەر بکات
خۆم و ئەم برایەم ، زۆرمان لەگەڵ وت ... بەڵام بێهوودە بوو . پارەکانی دایە کەلوپەلی
بازرگانی و لێیدا و رۆیشت . ئەویش ، ساڵێکی پێچوو و وەکو براکەی ترم ... بە هەژاری
گەڕایەوە .
منیش ، هەر هێندەم پێ کرا لێی بپرسم :
ئــەی ... ئامۆژگاریمان نەکردیت ، کە نەڕۆیت !؟
ئــەویش بە دەم گریانەوە وتی :
*قەدەری خوا بوو...! ئێستاش پوولێك شك نابەم ، رووت و رەجاڵم ...!*
ئەی شای دیوان : ئەویشم ناردە گەرماو و بە جلوبەرگی خۆم پۆشتەم کردەوە و دوای
نانخواردن لەگەڵ خۆم بردم بۆ دوکان و پێم وت :
بـرا گیان.. من ساڵە و ساڵ حسابی قازانج و سەرمایەی دوکانەکەم دەکەم . لێرە بە
دواوە قازانجی ئەم دوکانە بەسەر هەردووکماندا دابەش دەکەم .
کە حسابی دوکانەکەم کرد (٢٠٠٠ )دینارە . ( ١٠٠٠ ) دینارم دایە . ئەویش دوکانێکی
کردەوە و رۆژانێکمان بە سەر برد .
دوای ماوەیەك ، هەموو ساڵێك پێیان دەوتم :
لەگەڵمان وەرە ، با سەفەری بازرگانی بکەین ...
منیش بە گوێم نە دەکردن و دەم وت :

ئێوه ... چی سوودێکتان له سەفەری خۆتان بینی ؟

بەم شێوەیە ( ٦ ) ساڵمان بەڕێ کرد!

ڕۆژێکیـــان .. کەوتمە کەڵکەی سەفەرو پێم وتن :

ده ئێـستا بـا سـەفەرەکەمان بکـەین ! بـا.. بـه پـاره و پوولەکانمانـدا بچینەوه و بـزانین چەندمان هەیه!؟

کـه سـەیر دەکـەم ئـەوان سـەرمایەیان نییـه! ئـەو چـەند سـاڵەی کاریـان کـردووه ، هـەر چیەکیان پەیدا کردووه له خواردن و خواردنەوه و جێژەکانی ژیانیاندا خەرجیان کردووه .

که ئەمەم بۆ دەرکەوت بێدەنگ بووم !

دواتر دەستم کرد بە حسابی دوکان و هەمووم کردنەوه بە پاره . سەیر دەکەم ( ٦٠٠٠ ) دینارم سەرمایه هەیه . نیوەی پارەکەمم هەڵگرت .

نیوەکەی تریم نیشاندان و پێم وتن :

ئەمه ( ٣٠٠٠) دیناره و سەرمایەمانه . هەر یەکەمان (١٠٠٠ )دیناری ، دەدەمێ . (٣٠٠٠) دینارەکەی ترم ... شاردەوه .

لەدڵی خۆیشمدا وتم :

نەکو ئەمجارەش وەکو جارانی پێشووی براکانم زیـان بکـەین . بـا... بێ پـاره نـەبین و جـارێکی دی ئەگـەر خـوا نەکـەران ، دەستمایەکەما لـه دەست چـوو ، بـەو ( ٣٠٠٠ ) دینـاره شاردراوەیه ... بتوانین خۆمان دروست بکەینەوه .

کاڵای بازرگانیمان کڕی و خۆمان ئامادەی کاروان کردن کرد . یەك مانگ بەرێوه بووین ، دواتر خۆمان و کاڵامان کرده شارێکدا. کاڵامان فرۆشت و سەیر دەکەین هەر یەك دینار ( ١٠) دیناری قازانج کردووه.

ڕۆژێکیان له کەنار دەریا چاوەڕێی سەفەر بووین . کەنیزەکێکمان بینی .. جلو بەرگێکی شڕی لەبەردا بوو.

ئەو کەنیزەکه هاته بەردەمم و دەستەکانی ماچ کردم و پرسیی :

*ئاخۆ .. خاوەن چاکه و پیاوەتیت !؟ تاکو منیش دواتر پاداشتت بدەمەوه ؟*

منیش وتم :

بەڵێ ... حەزم له چاکه و پیاوەتی هەیه .. چـاوەڕێی پاداشتیش نیم !!

ئەویش وتی :

کەوابوو گەورەم .. مارەم بکه و بمبه بۆ وڵاتی خۆت . ئەگەر بـه قسەم بکـەیت .. ئـەوه چاکەم لەگەڵ دەکەیت ! منیش بەزەییم پێداهاتەوه و پۆشتەم کردەوه . راخەرم بۆ پەیدا کرد . کەشتی کەوته ڕێ .

سەرنج دەدەم ئەم دوو برایەم ئیرەییم پێ دەبەن . شەیتان چوو بووه بن کلێشەیانەوەو

بىريان لە كوشتنم دەكردەوە .

جارێكيان خۆم و ژنەكەم لە نێو كەشتى يەكەدا نووست بووين . فڕێيان داينە دەرياوە . ژنەكەم خۆى راوەشاند و بوو بە دێوێك !! هەڵى گرتم و بردمى بۆ دوورگەيەك و خۆى ون كرد و بەرەبەيان گەڕايەوە .

باوەشى پێدا كردم و وتى :

من ( دێو )م و ئەو كەنيزەكەم . پشت بەخوا لە مردن رزگارم كرديت ! كاتى خۆى هەر يەكەمجار تۆم بينى لەبەرخاترى خوا خۆشم ويستى . منيش بڕوام بەخوا و پێغەمبەر(د.خ) هەيە . بەو شێوەيە هاتمە بەردەمت . ئەوە بوو منت بينى و مارەت كردم . وا منيش لە خنكاندن رزگارم كردى . بەڵام زۆر تووڕەم لە دوو براكەت و دەبێت هەر بيانكوژم !

ئەى شاى دێوان .. منيش كە ئەم رووداوەم لێ بينى ... سەرم سووڕما..!!

سوپاسم كرد و پێم وت :

بەڵام بۆ براكانم : نە و ...!

ئيتر چيم لەگەڵ ئەم دوو برايەمدا لە بازرگانيەكەدا بەسەرهاتبوو، بۆم گێڕايەوە!

دێوەكە وتى :

ئێستا دەڕۆم و پاپۆڕەكەيان هەڵدەگێڕمەوەو بە هيلاكيان دەبەم !

منيش پێم وت :

بۆ خاترى خوا وازيان لێ بێنە ! پەندێكى پێشينان دەڵێت : *ئەى چاكەكار بەرامبەر ئەوانەى خراپەكارن ... واز بێنن لە خراپە كردن !* ئاخر هەر چۆنێك بێت .. ئەوان براى منن !

ديسان وتى :

بە خوا دەبێت : هەر بيانكوژم !!

زۆرى لێ پاڕامەوە . دواتر.. منى هەلگرت و فڕى. تا لە سەربانى ماڵى خۆمان نيشتەوە . ئيدى دەرگام كردەوە و چوومە ژوور. ( ٣٠٠٠) ديناەكەم دەرهێنا و بۆ بەيانى چوومەوە بازاڕ و سلاوم لە ناسياوانم كرد . دوكانێكم داناوكاڵام بۆكڕى . كە ئێوارە هات ... گەڕامەوە بۆ ماڵ .

دەڕوانم .. دوو ( تانجى ) لە حەوشەى ماڵەكەمدا ، بەستراونەتەوە . كە منيان بينى پێمدا هەڵزنان و گريان !

ژنەكەم وتى :

ئەمانە هەردوو براكەتن !

منيش پرسيم :

ئەی کێ ئەمەی بە سەر هێناون ؟

ژنـــەکەم وتی : من ..!!

کە (١٠ ) ساڵەکە تەواو بوو . منـیش هەردوو تـانجی یەکەم پـەت کـرد و کەوتمـە رێ و چووم بۆ لای ژن خوشکەکەم . تاکو سیحرەکەی بەتاڵ بکاتەوە و ئەم دوو برایەم بگەڕێنەوە دۆخی جارانیان . لە رێ ئەم بازرگان و پیرەمێردەم بینی . ئەوانیش بە سەرهاتی بـازرگان و تۆی ( دێو )یان بۆ گێڕامەوە .

منیش وتم :

تا بەسەرهاتی ئێوە نەبینم ... ناڕۆم . ئەمە بەسەرهاتی من بوو.. گەورەم .

( دێوە ) وتی :

ئەمەی تۆیش رازێکی سەرسووڕهێنەر بوو. ئەوا سێ یەکێکی تری خوێنی ئەم بازرگانەم پێ بەخشیت ..!

## چیرۆکی پیرەمێردی سێیەم و هێسترەکەی

پیرەمێردی خـاوەن ( هێستر ) وتی :

مـن چـیرۆکێکت بـۆ دەگێڕمـەوە ، لـە چـیرۆکی ئـەم دوانـە سەرسـوڕهێن تـر بێـت . خوازیاریشم : کە تۆیش ئەو بەشە خوێنەی لەم بازرگانەماوەتەوە : بە منی ببەخشیت .

( دێو )ەکەش لە وەڵامدا وتی : بەڵێ باشە .

پیرەمێردی سێ یەمیش وتی :

ئەی سوڵتان ، سەرۆکی دێوان ، ئا... ئەم ( هێستر )ە : ژنەکەمە ..!

سەفەرێکم کرد .... ساڵێکم پێچووا کە گەڕامـەوە . دەڕوانم : ئەم ژنـەم ، لەشفرۆشی دەکات . کە منی بینی بە پەلە ( گۆزە ) ئـاوێکی هەڵگرت و دەستی کـرد بـە ورتـە ورت بـە سەریدا و ئاوەکەی پیادا هەڵپرژاندم .

لەگەڵ ئەم کارەیدا وتی :

*لەسەر شێوەی خۆت بگۆڕرێ و ببە ... بە سەگ !*

دەم ودەست بوومە ( سەگ ) و لە ماڵ دەری کردم . منـیش رۆیـشتم و رۆیـشتم ، تـاکو لەبـەر دوکـانی قەسـابێکدا ، وەسـتام و دەسـتم کـرد بـە ئێـسقان کڕاندنـەوە ! ئێـوارەیش قەسابەکە منی لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ ماڵ .

کاتێ کچەی قەساب منی بینی سەرپۆشەکەی دایەوە بە سەریدا وپرسیی :

*ئەرێ ... ئەوە بۆچی پیاوی نامۆمان بۆ دێنیتە ژوورەوە ؟*

باوکیشی وتی :

پیاو...!! کوا پیاو !؟
کچەکە دەستی بۆ من ڕاکێشاو وتی :
ئەمە مرۆڤە و ژنەکەی سیحری لێ کردووە و کردوویەتی بە ( سەگ )..!
بـاوکی وتی :
کەوابوو ، لەبەر خوا ... ئەم سەگە ڕزگار بکە ..!
کچەکە گۆزەیەك ئاوی هێنا و برێکی بەسەردا خوێند .
ئەمجا پرژاندی بە سەرمدا و وتی :
*لەم شێوەیە دەربچۆ و بگەڕێوە : شێوەی جارانی خۆت .*
دەم ودەست بوومـەوە بـە مـرۆڤ . ئیـدی دەسـتـەکانیم مـاچ کـرد و لێـی پاڕامـەوە کە
سیحرێکم لە ژنەکەم بۆ بکات . تاکو ... تۆڵەی لێ بکەمەوە .
هەندێ لە ئاوەکەی پێدام و وتی :
دەبڕۆ ...کە ژنەکەت نوست بی پرژێنە بە سەریدا و بڵێ :
*لەم شێوەیە بگۆڕێ : بۆ شێوەیەك ـ کە خۆت دەتەوێت ـ ..!*
گۆزە ئاوم هەڵگرت و گەڕامەوە بۆ ماڵ . کە شەو هات و ژنەکەم نووست ، پێم دا پرژاند
و وتم : *لە ئەم ... شێوەیەت دەربچۆ.. ببە : بە ( هێستر ) ..!!*
دەم ودەست ژنـەکەم هەر لەوێدا بوو بە هێستر..!
ئەمەش ( هێستر )ەکەیە و بە چاوی خۆت ببینە..! ئەی سوڵتانی سەرۆکی دێوەکان !
دێوەکە ڕووی لە هێسترەکە کرد و پرسیی :
ئـەرێ ئەم پیرەمێردە .. ڕاست دەکات !؟
هێـسترەکە کەوتـە سـەر لەقانـدن . هـەر وەکو ئـەوەی بڵێـت : ئـەرێ بـە خـوا ، ئەوەیە
بەسەرهاتەکەم !
( دێو )ەکە دایە قاقای پێکەنین و سێ یەکی خوێنی بازرگانەکەی پێ بەخشی .
خوشکە بچووکەی ( شەهرەزاد )یش وتی :
قسەکانت ، چەندە شیرین و خۆشن ..!!
( *شەهرەزاد* )یش وتی :
ئەمە .. هەر هیچ نی یە : لە چاو... چیرۆکی سبەی شەودا ، ئەگەر: پاشا نـەمکوژێت و
نەمرم !
( پاشا )یش لە دڵی خۆیدا وتی :
نایکوژم ، تاکو هەموو قسەکانی دەبیستم ... بە ڕاستی چیرۆکەکانی سەرسوورهێنەرن..!
ئیدی ئەو شەوە نووستن . بەیانی پاشا چووە دیوانی حـوکمڕان . وەزیـران و ئەفـسەران
هاتن و چوون !

پاشا، تاکو ئێواره فەرمانی دەکرد و خەلکی دادەنا و خەلکی لا دەبرد . کە سەرای حوکمران چۆڵ بوو . پاشایش گەڕایەوە کۆشکی خۆی . شەو هات و دیسان پێکەوە دانیشتن .
( دنیازاد ) رووی لە ( شەهرەزاد )ی خوشکی و وتی :
دەی .... قسەمان بۆ بکە ..!
خوشکە گەورەیش وتی : بە سەرچـاوان .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو . بێدەنگ بوو

**شەوی ٣**

چیرۆکی راوچی و دێوەکە

شەهرەزاد وتی :
ئـــەی شای بە توانا... زیـــرەك و زانا...
پیرەمێـردی سێ یـەم کـە چـیرۆکەکەی .. لـە دوو چـیرۆکی دوو پیرەمێردەکـەی پێشوو سەرسوڕهێنەرتربوو... دێوە هێندە سەری سووڕما.. لە پێکەنیندا بە : پشتا ڕما...!
ئەمجا وتی : ئەوە دوا بەشی خوێنی ئەم بازرگانەم پێ بەخشیت و ئێستا ئازادە و لەگەڵ خۆتان ببیەن !
بازرگانەکە سوپاسی سێ پیرەمێردەکەی کرد . هەر یەکەو گەڕایەوە بۆ شوێن و جێی خۆی !
شەهرەزاد وتی :
جا.. ئەمە چی یە ؟ لە چاو چیرۆکی : ( راوچی )یەکەدا..!؟
( شەهرەیار ) شا ، پرسیی :
ئـــەو چیرۆکە چۆن بووە ؟
( شەهرەزاد ) وتـــی :
ئـــەی پاشای بەختیار... خـــاوەنی بڕیار...
دەگێڕنـــەوە ...
پیرێکی ( ماسـیگر )ی هـەژار هـەبوو. ( ٣ ) منـداڵی بـوو .. رۆژی (٤) جار تـۆڕی فڕێ دەدایە دەریاوە . بەڵام زۆر بەکەمی ماسیی بۆ دەگیراو رۆزیی سوار بوو ...
رۆژێکیان نیوەڕۆ لە کەناری دەریا بوو... تۆڕ و پێداویستی یەکانی لە کەنار دەریا دانا و کراسی لەبەرخۆ داکەندو تۆڕەکەی خستە نێو دەریاوە .
دواتـر تـۆڕەکەی کۆکردەوە ، تـا بیپێـچێتەوە و ماسی یـەکان بگرێـت .. بـەڵام سـەرنجیدا ، تۆڕەکەی فرە قورسە ! بۆیە سوچێکی تۆڕەکەی راکێشایە کـەناری ئـاو و سـنگێکی درێـژی داکوتا و تۆڕەکەی پێوە بەست زیاتر خۆی نقوومی ئاوەکە کرد و بە دڵێکی خۆش هاتە دەرەوە چونکە وایزانی تۆڕەکەی پڕە لە ماسی . دوای راکێشان ، تۆڕە دڕاو کەلاکی کەرێکی تۆپیو .

کەوتوەتەوە بنی ئاوەکە .

پیرەمێرد خەمێکی زۆری خواردو وتی :

لا حول و لاقوە الا بالله العلی العظیم ! ئەمە رۆژێکی سەرسووڕهێنەرە..!!

بە گۆرانیەوە ، ئەم هۆنراوەیەی وت :

| | |
|---|---|
| ئەی بە هەڵپەکەی بۆ رۆزیی ماندوو | کوا رۆزیی خوا ؛ بە تەقەلا بوو |
| ماسیگر هەیە : دەیگرێ و دەی خوا | هەیشە بۆ ئەهەنگ دەبێتە پاروو |
| هەندێك تێر دەکاو کەچی هەندێکیش | بەسکێ تێرە و بەسەدیش مردوو |

تۆڕەی کۆکردەوە و بردیە کەناری ئاو و گوشیی و هەڵی خست ! دیسان تۆڕەی بردەوە ناو ئاوەکە و بڵاوی کردەوە و ئارامی گرت .. تاکو تۆڕە جێی خۆی گرت ! رایکێشا تاکو کۆی بکاتەوە ، سەرنجیدا.. لە جاری پێشوو قورس تر بووە . بە هەمان شێوەی پێشووی کرد... بینی ئەمجارە گۆزەیەکی گەورەی تێدایە . پیرەی بەساڵاچوو... بە نقەنق هەڵیگرت و لە خۆشیاندا جێی بە خۆی نەدەگرت . چونکە پێی وابوو ، پڕە لە زێڕ و زیو . بەڵام کە سەری هەڵبچڕی ، پڕ بوو لە قوڕو لم .

کە ئەمەی بینی زۆر بۆخۆی گریاو ئەمەی وت :

| | |
|---|---|
| فەلەك: بەسە..بەس تۆ مەمسووتێنە | کۆڵم لێ بدە و وازم لێ بێنە |
| بۆ ( رۆزیی ) تۆڕم لە ئاوە .. کەچی | یا..لاکی کەرە .. یاخود( مەسینە )! |
| گێل و کاڵفامان : نوقمی سامانن ! | زانایش ژیانی: ژانە و غەمگینە! |

گۆزەی فڕێ دا و تۆڕەکەی هەڵخست ... بۆ وشك بوونەوە . لەبەرخۆیشیەوە دەیوت : (استغفرالله) .

دواتر بۆ جاری سێ یەم : تۆڕەکەی خستەوە نێو ئاوەکە و بڵاوی کردەوەو ئارامی گرت ! تاکو تۆڕەکە جێی خۆی گرت . رایکێشایەوە و شتەکانی ناوی دەرهێنا ... کە سەرنجیدا : هەندێ سواڵەت و پوولەك و ئێسکە! زۆر تووڕە بوو. دەستی کردە گریان و خۆ لاواندنەوە بەم شێوەیە :

| | |
|---|---|
| ( رۆزیی ) پەیوەندی بە تۆوە نییە | بە رەوتی راستی و درۆوە نییە |
| شەقی زەمانە پیاوچاکیش دەیخوا | ئانە پێشەنگەو گەورەو پێشەوا |
| ( رۆزی )ت دابینە هەتاکو دەمری | چۆن بوو رازی بە.. ئەکو بۆی بگری |
| (باز) لە نشێوەو بەرزە ( مراوی ) | ها گیانم ئەی مەرگ : تۆ وەرە راوی |

رووی کردە ئاسمان و وتی :

خوایە .. بۆ خۆت دەزانی کە من رۆژی (٤) جاران تۆڕ فڕێ دەدەمە دەریاوە . وا ئێستا(٣) جاران تۆڕم فڕێدا. ( رۆزیی ) منی تێدا نەبوو! خوایە.. ئەوە چوارەم جارە تۆڕ فڕێ دەدەم : رۆزیم بدە!

وتی : بسم الله الرحمن الرحیم و تۆڕەی فڕێدایە نێو دەریا! ئارامی گرت ، تا تۆڕە جێی خۆی گرت... رایکێشایەوە؛ هەر چەندی کرد تۆڕەکە لە زەوی نەبووەوە !

لەبەرخۆیەوە وتی :

لاحول و لاقوە الا بالله و ئەمەی وت :

ئاخ لەم دنیایەی بێزارم دەکا　　تووشی پەژارە و ئازارم دەکا

بەیانی مەیی شادیم؛ دەداتێ و　　دواتر لە گۆڕی شێدارم دەکا

دیسان خۆی رووت کردەوە و کەوتە راکێشانی تۆڕەکە ، تا هێنایە کەناری ئاو. تۆڕەی کردەوە، گۆزەیەکی بچووکی بینی کە سەری بە قورقوشم نرابووە و مۆری حەزرەتی سولەیمانی پێوە بوو!

پیرەمێردی راوچی ، ئەوەی بینی دڵی زۆر پێی خۆش بوو و بە خۆی وت :

لە گوزەری ( مسگە ر)ەکان ، ئەم ( گۆزە ) مسینە ، دەفرۆشم و ( ١٠ )دینارێك دەکات! گۆزەکەی جوڵاند ، هەستی کرد زۆر قورسە... سەریشی نراوەتەوە!

لە دڵی خۆیدا وتی :

ئاخۆ..ئەم ( گۆزە مسین)ە .. چی تێدایە؟ دەیکەمەوە سەیرێکی ناوەکەی دەکەم... دواتر دەیفرۆشم !

بە چەقۆکەی سەری گۆزەی هەڵپچڕی و سەرەوخواری کردەوەو رای وەشاند ، تاکو هەرچیەکی تیایە دا بکەوێت .

کەچی : هیچی تیا نەبوو . هەر زۆر سەری سووڕما! لە بەردەمی خۆیدا دایناو دوای کەمێ سەرنجیدا : دوکەڵێکی لێ بەرز بووەوەو درێژ بووەوە تاکو؛ خۆی لە هەور توند کرد..!! کە دوکەڵ کۆتایی هات. ناڵەی کرد و بوو بە ( دێو )ێکی هێندە درێژ سەری لە ئاسمان توند کردبوو پێ یەکانیشی لە زە ویدا بوو. سەری وەکو گوومەز بوو، لاقەکانی وەکو کۆڵەکەکانی ناوەراستی پاپۆڕ . دەمیشی وەکو مەسینە! چاوانی وێنەی چرا بوو. رووی تاڵ و نەگبەت !

پیرەمێردی ماسیگر ئەمەی بینی ، کەوتە لەرزین و چۆقەی دانی دەهات و بەر پێی خۆی نەدەبینی! تفی قوڕگە وشك بووەکەی خۆی قووت دایەوە .

( دێو )ەکەیش هاواری کرد :

{ لااله الا الله ، سلیمان نبی الله } . ئەی پێغەمبەری خوا مەمکوژە ، گوێڕایەڵت دەبم و لێت هەڵناگەڕێمەوە!

پیرەمێردی ( ماسیگر )یش وتی :

ئەی دێو .. تۆ دەڵێیت سولەیمان ..!! ئاخر حەزرەتی سولەیمان (١٨٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا مردووە! ئێستا ئێمە لە کۆتایی دنیاوە نزیك بووینەتەوە ! چیرۆکی تۆ چیە؟ چۆن چوویتە ناو ئەم گۆزە مسینەوە!؟

دێوەکە قسەکانی راوچیی بیست وتی :
لا الە الا اللە . مژدە بێت ئەی راوچی ..!!
راوچی وتی :
مژدەی چیم دەدەیتێ !
دێوەکە وتی : مژدەی .. کوشتنت !!
راوچیش وتی :
خوا لە ناوت بەرێ .. بۆ ئەم مژدەیە ! ئاخر بۆچی دەمکوژیت !؟
ئاخر .. لەبەرچی !؟ خۆ.. من لەو گۆزەیە رزگارم کردیت و لە بنی دەریا تۆم هێنایە دەرەوە!
دێوەکەیش وتی :
کەوابوو تەنیا بۆت هەیە . شێوەی کوشتنەکەت هەڵبژێریت !
راوچی وتی :
گوناهم چی یە : ئـاوا ... سزام دەدەیت ؟
دێوەکە وتی :
راوچی گوێ بگرە . لە بەسەرهاتەکەم !
راوچی وەڵامی دایەوە :
فەرموو... بەڵام بە کورتی ! چونکە رۆحم لەسەر کونە لووتمە..!
( دێو )ەکە وتی :
ئەی ماسیگر .. ئەوە بزانە من یەکێکم لە دێوە هەڵاتووەکان لە حەزرەتی سولەیمان. سڵاوی خوای لێ بێت - حەزرەتی سلێمان ( ئاسەف کوڕی بەرخیا)ی وەزیری بۆ ناردم و بە بەندکراوی منیان هێنایە بەردەستی . ئەویش منی بینی . داوای لێکردم کە موسڵمان ببم ... منیش پەسەندم نەکرد ! بۆیە خستمیە ئەم گۆزەیەوە و بە قورقوشم سەری نامەوە و مۆری خۆی لێدا... فەرمانی بە جنۆکەکان دا منیان هێنایە ئێرە و فڕێیان دامە دەریاوە! منیش لەدڵی خۆمدا بڕیارم دابوو : لە ( ۱۰۰ ) ساڵی یەکەمدا هەر کەسێ دەرم بێنێ و رزگارم بکات : هێندەی دەوڵەمەند بکەم . کە هەرگیز هەژار نەبێت ! کەس رزگاری نەکردم . بۆ (۱۰۰) ساڵی دووهەم بڕیارم دا :
هەر کەسێ رزگارم بکات ، هەرچی گەنجینەکانی ژێر زەوی هەیە : دەیخەمە بەردەستی ...!
بەڵام کەس رزگاری نەکردم .
(۱۰۰ ) ساڵی دواتر... بڕیارم دا هەر کەسێک رزگارم بکات سێ داخوازی بۆ جێبەجێ دەکەم .
دیسانیش کەس پەیدا نەبوو. ئیدی تووڕە بووم و بڕیارم دا :

هەرکەسێ رزگارم بکات ، بیکوژم ..!

ئەوەتا تۆ هاتیت ورزگارت کردم . منیش لەسەر پەیمانی خۆمم . ئێستایش چۆن پێت خۆشە وا دەتکوژم !

( ماسیگر) لە دڵی خۆیدا وتی :

چەند سەیرە ، کات نەمابوو، منیش بێم بۆ ئێرە ، ئەمرۆ نەبێت ..!!

ئەمجا بە دێوەی وت :

مەمکوژە . با... خوا نەت کوژێتەوە ! ماندووم مەکە .. با خوا ماندووت نەکات !

( دێو )ەکە وتی :

پێویستە بتکوژم .. جا... چۆنت پێ باشە ، با بەو شێوەیە بتکوژم ..!

ماسیگر راماو دواتر پرسیی : هەر دەمکوژیت ؟

دێوەکە وتی :

ئەگەر رزگارت نەکردمایە ... نەم دەکوشتیت..!

ماسیگر پرسیی :

پیرە ( دێو ) ... من چاکەم لەگەڵ کردی ..کەچی بە خراپ پاداشتم دەدەیتەوە!

پێشینان درۆیان نەکردووە کە وتویانە :

| | |
|---|---|
| چاکەمان کرد و خراپ شکاوە | کە ئەمە کاری پیاوی بەد ناوە |
| چاکەت بۆکەسێ: کە پێی بزانێ | نەك بۆسپڵەیەك :خوێری و نەزانێ |

ئەویش وتی :

درێژەی مەدەرێ ... دەبێت هەر بتکوژم !

( ماسیگر )ە بەخۆی وت :

ئەمە لە جنۆکەکانە ... منیش مرۆڤم ! خوایش ژیریی بە من بەخشیوە ! ئێستا پیلانێك دادەنێم، کە بە فێڵێك لە ناوی بەرم ! با .. ئەویش بە ناکامی پیسی خۆی بگات .

لە دێوەی پرسی :

هەر سووریت لە سەر کوشتنم ؟

( دێو )یش وتی : بەڵێ .. بەڵێ !!

لێی چووە پێش و وتی :

توو ناوی ئەو خوایەی کە لەسەر مۆری ( حەزرەتی سولەیمان )- سڵاوی خوای لێبێت- نووسراوە. پرسیارێکت لێدەکەم . بە راستی وەڵامم بدەرەوە .

( دێو )ە هەر کە گوێی لە ناوی ( حەزرەتی سولەیمان ) بوو گیانی هاتە لەرزین و وتی :

خێرا ، پرسیارەکەت بکە .

ماسیگرە پرسیی :

تۆ .. لەم گۆزە بچووکەدا بوویت . بەڵام ئێستا جێگای دەستێکی تۆی تیانابێتەوە..! باشە چۆن جێگات لەم گۆزەیەدا بووتەوە؟

دێوە پرسیی :

دەڵێی بڕوا ناکەیت ؟

ماسیگرەیش وتی :

نەخێر .. تاکو لە ناو گۆزەکەدا نەتبینم ..بڕوا ناکەم !

دێوەکە خۆی راوەشاندو بوو بە دووکەڵێکی سپی..! وردە وردە چڕ بووەوەو چووەوە ناو گۆزەکە .

هەر کە ( دووکەڵ )ەکە تەواو بوو. خێرا .. ( ماسیگر )ە سەرقاپی گۆزە مۆر کراوەکەی بە مۆری حەزرەتی سولەیمانی هێنا و سەری نایەوە و رووی کردە گۆزە و وتی :

ئێستا تۆ... خۆزگەی جۆری مردنت بخوازە ..!

فڕێت بدەمەوە بنی دەریا و ژوورێك لێرە دروست بکەم بۆ خۆم و لێرە بم . تاکو هەر ماسیگرێك بۆ راو هاتە ئێرە ، دووری بخەمەوە و بڵێم : ئێرە دێوی لێ یە !؟ گەر رزگاریشی بکەیت : لێت دەپرسێت .. چۆن بتکوژم ؟

( دێو )ەکە خۆی لە گۆزەکەدا بینی یەوە ، ویستی بێتە دەرەوە و مۆری (حەزرەتی سولەیمان) نەی هێشت ! بۆی دەرکەوت ( ماسیگر)ە فێڵی لێکردووەو وتی :

کوڕە .. سوعبەتم لەگەڵ کردیت !

ماسیگر وتی :

درۆم لەگەڵ دەکەیت ئەی فێزەونترین دێو ! بۆگەن !؟

ماسیگر گۆزەی هێنایە کەناری دەریاکە .

دێوەکەیش هاواری لێ هەستا : نا ... نا... نەکەیت !

ماسیگر وتی : بـا... بـا

دێوەکە کەوتە پاڕانەوەو پرسی : ڕاوچی... ئەوە چیم لێ دەکەیت ؟

ئەویش وتی :

فڕێت دەدەمەوە دەریاکە ! ئەگەر جاری پێشوو ( ١٨٠٠ ) ساڵ لە بنی دەریادا مایتەوە . ئەمجارە.. تاکو ( ڕۆژی دوایی ) هەر دەمێنێتەوە! ئـەی هاوارم نـەکرد .. بمهێڵەوە .. خـوا دەت هێڵێتەوە! مەمکوژە . با خوا نەتکوژێت !؟ ئەوە بوو بە قسمت نـەکردم و ویـستت لـە ناوم بەریت !

خوا تۆی زۆرداری خستەوە بەردەستم و منیش غەدرت لێ دەکەم !

دێوەکە وتی :

دەرم بهێنەوە : با.. پاداشتت بدەمەوە .

ماسیگر وتی : درۆ دەکەیت هەی نەفرەتی .
ئەم بەسەرهاتەی من و تۆ هەر وەکو بەسەرهاتەکەی : وەزیری ولاتی ( یۆنان ) و حەکیم دووبانە .
دێوە پرسیی : بەسەرهاتی ئەوان چۆن بووە؟
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٤**

چیرۆکی شا یۆنان و دکتۆر رویان
شەهرەزاد وتی :
ئـــەی پاشا دانـــا... زیرەك و زانـــا...
هەبوو... نەبوو : کەس لە خوا گەورەتر نەبوو..! کەسیش لە بەندە درۆزن تر نەبوو..!!
لە ولاتی فارسان .. زەوی رۆمان . پاشایەك بوو، پێیان دەوت شا( یۆنان ) دەوڵەمەند بوو وخاوەن سامان. برینێك بە پێستی یەوە بوو . چاك نەدەبووەوە . نە بە پزیشك و نە بە مەرهەم و نە بە دەرمان !
لە نێو شاریشدا پزیشکێك ناوبانگی بوو .. بە ناوی ( رۆیان ) .. پیرێك بوو لێزان .. ئەم پیرە کتێبێکی فرەی ( یونان ) و ( فارس) و ( رۆمان ) و (عەرەب) و (سریان)ی خوێند بووەوە . لە زانستی پزیشکی و ئەستێرەناسی و گەردوون و زانستی گژ و گیا و دروست کردنی دەرماندا .. زۆر شارەزابوو . بە گشتی شارەزای هەموو بوارەکانی سوود و زیانەکانی گژ وگیا بوو..
( رۆیان ) بیستی یەوە کە شا( یونان ) تووشی نەخۆشیی پێست بووە . پزیشکان دەستە وسانن لەچارەسەریدا .. بۆیە چاك کردنەوەی ئەو برینە بووە خولیای .
شەوێکیـــان : دوای بیر کردنەوەیەکی زۆر بڕیاریدا رۆژ بووەوە تەقەلا بدات و چاکی بکاتەوە..!
بۆ بەیانی ، جلوبەرگی جوانی پۆشی .. چووە بەردەم پاشای ( یۆنان ) و کڕنووشی بۆ برد . نزای سەروەر بوونی بۆ خواست و لە یەزدان پاڕایەوە تەندورست بێت !
خۆی پێ ناسان و وتی :
قوربان ، بیستوومە کە تووشی نەخۆشی یەك بوویت . کەس پەی بە چاککردنەوەی نەبردووە ! ئەوە من هاتوومەتە پەزێرایت و نە بە مەرهەم دەی هەنووم.. نە دەرمانێکیشت دەدەمێ : تاکو بیخۆیت ! چاکیشت دەکەمەوە ..!!
کە شا یـۆنان ئەمەی بیست سەری سوڕما و وتی :
بەو خوایە ... چاکم بکەیتەوە بە شێوەیەك دەوڵەمەندت دەکەم لە کوڕا و کوڕیشت

زیاد بێت ئاخوازی جی بکەیت بۆت جێ بەجێ دەکەم ! دەتکەمە هاوڕێ و هاونشینی خۆم.
ئەمجا هەستا و خۆی بۆ رووت کردەوە و برینەکەی نیشان دا و پرسیی :
ئـا... لەم برینە رزگارم دەکەیت . بێ مەرهەم و بێ دەرمان !؟
دوبانیش وتی : بەڵێ ... قوربـــان .
شایۆنان دیسان سەری سووڕمایەوە و وتی :
ئەمەی بە منت وت کەی و چ کاتێك دەستی پێ دەکەیت؟ کوڕم .. کەمێ پەلەی لێ بکە؟
( رۆیان)ی پزیشکیش وتی :
بە سەر چاوان .. لە سبەینێ زووتر نی یە دەست پێ دەکەم !
پزیشك گەڕایەوە ... خانوویەکی گرت و هەموو کتێب و تاقیگەکەی گواستەوە ئەوێ و دەستی کرد بە هەڵدانەوەی سەرچاوەکانی دروست کردنی دەرمان . ( صولجان ـ گۆچان) و ( تۆپ )ێکی بۆ دروست کرد . ناوی داردەستەکەی کلۆر کرد و دەرمانەکەی تێکرد .
کە ئەمانەی ئامادە کردو جووە بەردەم شا( یۆنان) و کڕنووشی بۆ برد و وتی :
فەرموو سواری یەکێك لەو ئەسپانە ببە . بچۆ بۆ یاریگای گەورە . ئەمەش (گۆچان) و ئەوەیش تۆپەکەی ... لەوێ یاری پێ بکە . وەزیر و گزیر ئامادەن و لە یاریگاکە چاوڕێتن .
کە پاشا گەیشتە یاریگا( رۆیـان )چووە لای و گۆچان و تۆپەکەی دایە دەست و پێی وت :
فەرموو... مشتووی ئەم ( گۆچان )ە توند بگووشە و بجۆرە مەیدان و لە تۆپەکەی پێ بدە ! یاری بکە .. تا ئـاو لەمپت ئـارەق دەکاتـەوە . ئیـدی دەرمانەکە لـە دەسـتتەوە دەچێتە لەشتەوە و بگـەڕێوە کۆشـك ... خـۆت بکە بـە گەرماوەکەدا و جـوان خـۆت بـشۆ... دواتـر دەبینیت چاك بویتەوە !
شا( یۆنـان ) گۆچـان و تۆپەکـەی بـردە گۆڕەپـان و سـواری ئەسـپ بـوو، کەوتـە لێدانی تۆپەکە بە گۆچانەکە و تونـد تونـد دەسـکی گۆچانەکەی گووشـی . کەوتـە غـاردان بـە دوای تۆپەکەدا . کـە ( رۆیـان )ی پزیـشك بـۆی دەرکـەوت عـارەقێکی زۆری کردووەتـەوە . پاشـای تێگەیانـد کـە ئیـدی بگـەڕێتـەوە کۆشـك . کـە گەڕایـەوە خزمـەتکار دەورەیـان دا و ئـەویش فەرمانی دا....
گەرماوێکی شاری بۆ ساز بـدەن و جلوبـەرگی بۆ بـەرن . جوان خـۆی شت و هـەر لـە گەرماوەکەدا. خـۆی پۆشـتە کـردەوە و سـوار بـوو بـەرەو مـاڵ و لێـی نووسـت . (رۆیـان )ی پزیشکیش بەرەو ماڵی خۆیان بووەوە . رۆژی دواتر هەر زوو بەرەو کۆشکی شا بووەوە . کە رێگەیان دا ، چووە بەردەم شا و کڕنووشی بۆ برد و ئەم هۆنراوەیەی وت :

| | |
|---|---|
| بەو رووە خـۆش و جوان و کراوە | غەمی هەزاران کێشمت لانـاوە |
| هەرکەس رووی خۆشی ئێوە ببینێ | لە دڵدا غەمی هەرگیز نـامێنێ |
| وەك هەورێك بوویت و بارانت باران | چاکە و پیاوەتیت بە سەرما رژان |

كه له خوێندنەوەی هۆنراوەكە بووەوە ، شا( یونان) باوەشی كرد بە پزیشكەدا و خۆی رووت كردەوە. پێستی وەكو زیوی بێگەردی لێهاتبوو. شا... هەر زۆر دڵشاد بوو. رۆژی دواتر چووەوە سەر تەختی حوكمڕانی خۆی . وەزیـران بـەخێریان هێنـا . كـە (رۆیـان)ی پزیشك هات . شا ( یۆنان ) لەبەری هەستا و لای خۆیەوە داینا . بۆ نیوەڕۆیش فەرمانیدا : سفرەیان بە خۆشترین خواردن رازانـدەوە و پێكـەوە نانیـان خـوارد . كـە ئێـوارە هـات شـا فەرمانیـدا: یەكێك لە ئەسپەكانی خۆی بێ بەخشی . لەگەڵ ( ٢٠٠٠ ) دینار . دەرەنگانێ هەر یەكەیان و بەرەو ماڵی خۆی چووەوە .

پاشایش بە دەورووبەری دەوت :

*پێم سەیرە ! بێ ئەوەی دەرمانێكم بـداتێ ، چاكی كردمـەوە ..!! مـەرج بێت بیكەمـە ؛ هاونشینی خۆم و دریغی لێ نەكەم .*

رۆژی دواتر ، خۆرهەڵات و دنیا روونـاك بـووەوە . شایۆنان هاتـە دەر و چووەوە سەر كورسی حوكم وەزیران و بەڕێوەبەران ئامادە بوون . پاشا داوای ( رۆیان )ی پزیشكی كرد ! ئـەویش هاتـە ژوورەوە و كڕنووشـی بـۆ بـرد . بـە هـەمان شـێوە كـە نیـوەڕۆ هـات نـاردی خۆشترین خواردنیان بۆ هێنان . هەندێ دیاری و ( ١٠٠٠) دیناری تریشی دایـە . ئیـدی هـەر یەكە چووەوە ماڵی خۆی . رۆژی دواتر. شا.. چووە سەرا و دیوەخان و لە سەر كورسی خۆی دانیشت . وەزیران و پیاوانی دەوڵەت دیسان دەورووبەریان دا.

پاشا وەزیرێكی هـەبوو زۆر حەسـوود بـوو . چـاو لـە دووی كەسـانی نزیـك بـە شـا بـوو! پیاوێكی تا بڵێی: نـاشیرین و كینە لە دڵ بـــوو. كە دەی بینی شا هێنـدە دیـاری دەدات بـە ( رۆیان )ی پزیشك و لە خۆی نزیك دەكاتەوە .. پێی ناخۆش بوو... هەر بۆیەیش رقـی لـێ هەلگرتبوو.

رۆژێك ئەم وەزیرە ، چووە بەردەم شا وكڕنووشی بۆ برد و پێی وت :

گەورەم.. گەر ئەوەی دەیزانم ، پێت نەڵێم ئەوا ناپاكیم لەگـەڵ كـردووی . گـەر بفـەرمووی بۆت دەگێڕمەوە .

شا وتی : ئـا دەی ... ئامۆژگاریەكەت بڵێ !

ئەویش وتی :

ئـەی پاشا پێـشینان وتوویانـە : *( گـەر بـیری ئـەنجامی كـارت نـەبوو ..ئـەوا زەمانـەیش هاوكـارت نـەبوو! )* ئـەوەتا مـن دەبیـنم پاداشت و چاكە لەگـەڵ كەسـانێك دەكـەیت ، كـە خواخوای لە ناوچونی تۆیانە !

پاشا هەر لەوێدا دڵی تەنگ بوو ..... زەرد و بێ رەنگ بوو .

پرسیی : مەبەستت چی یە ؟

وەزیرەكەش وتی :

ئەی شا گەر نووستوی ، بەئاگا بێرەوە ! مەبەستم ( رۆیـان )ی پزیشکە !
شا وتـــی :
موبارەك نەبیت ، ئەوە خۆشەویست تـرین هاوڕێمـە ! ئـاخر... ئـەو منی لە نەخۆشی
یەك رزگار كـردووە کـە بـە پزیـشکانی دی چارەسـەر نـەدەبوو ! ئـەویش بـە دارێك کە دەم
گوشی ..
پزیشکێکە لە وێنەی نی یە ! دنیـا بگـەڕێی زیرەکـی وەکـو ئـەوی تیـا نـی یە ! بەڕاستی
نیازمە مووچەیەکی (١٠٠٠ ) دیناریی مانگانەی بۆ ببڕمەوە . گەر نیوەی سامانەکەشم بدەم
پێی .. هێشتا کەمە ! لەوە دەچێت تۆیش ئیرەیی پێ ببەیت !
شەهرەزاد وتی :
ئـــەی شەهریار شا.... شای یۆنان بە وەزیرەکەی وت :
لە حەسوودیدا، دەتەوێت بە کوشتی بدەیت ! بەڵام کاتێك پەشیمان دەبیتەوە کە پەشیمانی
سوودی نامێنێت ! تۆیش وەکو ئەو ( سەندوباد )ەت لێ دێت . کە( هەڵۆ )کەی خۆی کوشت
و لە دوایدا زۆر پەشیمان بووەوە .
وەزیرەکە لێی پرسیی : ئەو بەسەرهاتەی ( سەندوباد و هەڵۆکەی ) چۆن بووە !؟
شەهرەزاد وتی :
ئـــەی پاشای دانـــا...بە هەموو شت زانـــا...
شا ( یۆنان ) بەم شێوەیە دەستی بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە کرد :
دەگێڕنـــــەوە : شایەکی فارس هەبوو ، زۆری حەز لە گەشت و گوزار و راو و شکار بوو.
ئەم شایە ( هەڵۆ )یەکی هەبوو، خۆی بە بەچکەیی گەورەی کردبوو.
شەو و رۆژ لای خۆی بوو، لێی دوور نەدەکەوتەوە . هێندەی خۆش دەویست قاپێکی
زێڕینی بۆ دروست کردبوو، هەڵۆکەی تێدا ئاو دەدا .. کە شا دەچووە گەشت و گوزار ، یان
راوو شکار لەگەڵ خۆی دەیبرد ..!
کاتێك شا دانیشتبوو ، میری بارخانە ، پێی وت :
ئـــەی شای سەردار ..کاتی رۆیشتنە بۆ راو و شکار.
ئیدی بار و بارخانە رێکخرا بۆ گەشت و چوونە دەشت . پاشا لە راوگـە ( تەڵـە
)ی راوی راخست . کاتێکیان زانی ( ئاسك )ێك کەوتە نێوان سوارەکانەوە . و ( داو
دەبێت ئەو ئاسکە بگیرێت . ئەو ئاسکە بە سەر هەر کەسێکدا بازی دا شا فەرمانیـدا ..
کەسە دەی کوژم ! و بۆی نـەگیرا... ئـەو
کە زۆریان بۆ ئاسکەکە هێنا بەرەو شا بووەوە ، لە بەردەمیدا هەردوو دەستی درێژ کرد و
سەری لە زەوی نا! شا خۆی دانەواندەوە بۆ ئاسکەکە ، ئاسکیش هەلی قۆستەوە و خۆی بـە
سـەریدا هەڵدا و بـە قەڵەمبازێك ، کەمینەکـەی شکاندن و بـۆی دەرچوو. پاشایش سەری

هەڵبڕی و سەیری سەرباز و دەست و پێوەندەکەی خۆی کرد . ئەوانی بینی سەیری یەکتر دەکەن و لێ هەڵدەقورچێنن !
ئەویش ڕووی کردە وەزیرەکەی و پرسیی :
ئەوە .. سەربازەکان چی دەڵێن ؟
وەزیریش وتی :
دەڵێن تۆ وتووتە: ئاسکەکە بەسەر هەر کەسێکدا بازی دا و نەیگرت ، دەبێت بکوژرێت !
پاشایش تەنگە گرتی و وتی :
بە سەری خۆم شوێنی دەکەوم تا دەیگرم !
پاشا شوێنی کەوت وگەیشتنە شاخ . ( ئاسك )ەکە خۆی کرد بە ئەشکەوتێکدا و پاشا بە دوایدا. پاشا هەڵۆکەی بە دوایدا هەڵدا. هەڵۆیش هێندە چنگ و باڵەکانی کێشا بە دەم و چاوی ئاسکەکەدا کوێری کرد . پاشایش گرتی و سەری بڕی و هەڵیواسی بە ( قەڵپووزی ) زینەکەیدا . دنیا گەرم بوو، شاخ چۆڵ و هۆڵ و بێ ئاو .. شا چاوی بۆ ئاو دەگێڕا . درەختێکی بینی ئاوی لێ دەتکا . خۆیشی دەستکێشی لە دەستا بوو، قاپە زێڕینەکەی لە ملی هەڵۆکە کردەوە و لەو ئاوەی پڕ کرد و لە بەردەم هەڵۆدا داینا ، تا لێی بخواتەوە . بەڵام ( هەڵۆ )کە دەنووکێکی لێدا و ئاوەکەی قلْپ کردەوە .
پاشایش دەیزانی هەڵۆکە زۆر تینووە. بۆیە قاپە زێڕینەکەی خستەوە بەر دڵۆپە ئاوی درەختەکە و کەپڕ بوو دیسان خستیەوە بەر هەڵۆکە! ئەمجارەیش هەڵۆکە باڵێکی لێدا و ڕژاندیەوە و نەی خواردەوە .
پاشا تووڕە بوو و وتی :
خوا لە ئاوت بەرێت باڵندە نەگبەتەکە . کە ئاوا .. خۆت و ئەسپەکەت ، لەم ئاوە بێ بەش کرد.
بە شمشێرەکەی هەردوو باڵی هەڵۆکەی قرتاند و فڕێی دایە ئەولاوە ، هەڵۆکە بە سەر لەقاندن ، پاشای تێگەیاند کە سەیری سەردارەکە بکات ... پاشا کە سەری بڵند کردەوە . مارێکی بینی ژەهر دەڕێژێت ئیدی .. لە بڕینی باڵی هەڵۆکەی زۆر پەشیمان بووەوە . سواری ئەسپەکەی بوو و ئاوزەنگی لێدا بەرەو لای هاوڕێکانی . کە گەیشتە لایان فەرمانیدا.. گۆشتی ئاسکەکە ببرژێنن ! هەڵۆکەیش کە بەسەر دەستیەوە بوو قیژەیەکی کرد وەردار بووەوە . پاشایش ئاهێکی خەماوی بۆ مردنی هەڵکێشا . چونکە ئەو هەڵۆیە لە مردن ڕزگاری کردبوو. ئەمە بەسەرهاتی سەندوباد بوو .
کە وەزیر.. قسەکانی شایۆنانی بیست پێی وت :
ئەی پاشای گەورە : جا... تۆ زیانی چیت داوە؟ کە خراپەیشی لێ ببینیت ڕەنگە بەزەییت پێیدا بێتەوە! نەگەرنا.. بە دەردەکەی ئەو ( وەزیر )ەت لێ دێت ، کە لەگەڵ

کوڕە پاشایەك کردبووی.

شا یۆنان پرسیی : باشە کەوابوو .. ئەو بەسەرهاتە چۆن بووە؟

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٥**

## بەسەرهاتی وەزیرە فێڵبازەکە

*شەهرەزاد وتی :*

پاشای بە توانــا.... بەهەموو شت زانــا...!

وەزیرەکەی شا یۆنان کەوتە گێڕانەوە ..

دەگێڕنـــەوە ...کوڕە پاشایەك هەبووە ، زۆر حەزی لە ڕاو بووە . لەبەر ئەوە پاشای باوکی فەرمانی بە وەزیرێکی دابوو کە هەمیشە لەگەڵی بێت و لە نزیکەوە ئاگای لێبێت .

ڕۆژێکیان کوڕە شا لە راو بوو . وەکو هەمیشە وەزیرەکەی باوکی لەتەکدا بوو . چاویان بە دڕندەیەك کەوت .

وەزیر بە شازادەی وت :

ئەوە تۆ و ئەوەش دڕندە . دەی شوێنی بکەوە و ڕاوی بکە..!

شازادە ، بە غار شوێن دڕندەکە کەوت . زۆر دوور کەوتنەوە و دواتر دڕندەکەی لێ ون بوو . سەیری چوار لای خۆی کردو کەسی نەبینی . تووەمەز ڕێی هەڵە کرد بوو. کە گەیشتە ئەو سەری ڕێگە کە ، کچێکی بینی سەری لە کۆشیدا بوو و دەگریا.

ئەمیش لێی پرسی : تۆ کێی ؟

کچە وەڵامی دایەوە :

من کچە شازادەی ( هندستان )م و جارێکیان بەسواریی لە شار چوومە دەرەوە.. بەسەر ئەسپەکەمەوە ، خەوم لێکەوتبوو... دواتر کەوتبوومە خوارەوە.. ئێستاش ڕێم هەڵە کردووە و نازانم ئێرە کوێیە و بەرەو کوێ دەڕۆم ..!؟

کوڕە شا بەزەیی پێدا هاتەوە و خستی یە پاشکۆی خۆی و کەوتنە ڕێ .

لەرێگا کەلاوەیەکیان بینی و کچە شازادە وتـــی :

ڕێم بدە لەم کەلاوەیەدا دەست بە ئاو بگەیەنم !!

کیژە وردە وردە چووە ناو کەلاوەکە . کوڕە شا بە دزی یەوە شوێنی کەوت و سەیری کرد کچەکە شێوەی گۆڕاو بوو بە ( دێو ) و چووەوە نێو منداڵەکانی و پێی وتن :

جوانکیلەکانم ..کوڕێکی قەڵەو و خرپنم بۆ هێناون .

منداڵەکانی پرسییان :

کوا ... دە .. بیهێنە !

شازادەیش کە لە پارێزیدا بوو ، لە دڵی خۆیدا وتی :
بەخوا ... تیا چووم !
هەموو گیانی کەوتە لەرزین ! بێدەنگ کشایەوە دواوە.. کیژەیش هاتە دەرەوەو کوڕە شای بە ترساوی بینی و لێی پرسی :
چی یە .. ئەوە بۆ هێندە دەترسیت؟
ئەمیش وتی :
دوژمندارم و دەترسم .
کیژەکە وتی :
دەی کەوابوو ، پارەیەکی باشیان بدەرێ . با رزگار ببیت .
کوڕە شا وتی :
ئاخر ... بە پارە قایل نابن و گیانی منیان دەوێت ! منیش کەسێکی بەستەزمانم !
کیژەکەیش وتی :
هەر وەکو خۆت دەڵێیت : بەستەزمانم . پەنا بۆ خوا بەرە .تاکو لە خراپە بتپارێزێت ! بەڵکو ئەم ترسەیشت برەوێتەوە .
شازادە سەری بڵند کردەوە و ئەم نزایەی کرد :
ئەی پشت و پەنای ئەوانەی هانات بۆ دێنن و لە خراپە دەیانپارێزیت . خوایە... سەرم بخە بە سەر دوژمنانم دا. دووریان بخەوە لێم ! خۆ تۆ.. هەر کاتێك ویستت.. تواناترینیت .
( دێو )ەکە ئەمەی لە کوڕەکە بیست خێرا دوور کەوتەوە . کە کوڕە پاشا گەڕایەوە کۆشك ئەو هاندانەی وەزیری بۆ باوکی گێڕایەوە . کە چۆن بووە هۆی ئەوەی کە شوێن دڕندەکە بکەوێت . لەجیاتی ئەوەی نەهێڵێت کە تووشی بەڵا ببێت . شا ناردی یە شوێن وەزیر و فەرمانیدا : بیکوژن .
ئەمجا وەزیرە ئیرەیی بەرەکە بە شای یۆنانی وت :
هێندە ئەم پزیشکەت.. لەخۆت نزیك کردووەتەوەو لێی بێ خەمیت : لە پڕێکدا .. دەبێتە مایەی لە ناو چوونت ! ئەو بتوانێت بە دەرمانێك چاکت بکاتەوە کە بە دەست بیگریت . دەتوانێت بە دەرمانێکیش بتکوژێت کە بۆنی بکەیت !!
وەرە پێم بڵێ : کێ دەڵێت : سیخوڕ نییە و نەیان ناردووە بۆ لە ناو بردنی تۆ؟
شا وتی :
ڕاست دەکەیت ، ئەی وەزیری ژیر و وریا ... باشە تۆ دەڵێی چی لێبکەم ؟
وەزیر وتی :
بنێرە بە شوێنیدا . هەر دەستگیرت کرد ، فەرمان بدە .. بدەن لە ملی!!
پاشایش ناردی یە شوێنی و پزیشك بە ڕوویەکی خۆشەوە هاتە لای..نەیزانی چارەی چیی لینووسراوە..

ئەی ترساوەکەی شەقی زەمانە     ئارام بە و پەنات بە ئەو یەزدانە
ئاسوودەت دەکا.دڵت بێگرێ     قەدەری خوایە : چاکی بزانە
پزیشکەکە چووە بەردەم پاشاو کڕنووشی بۆ برد و ئەمەی وت :
شوکری ڕەوایی ئێوەم لە سەرە     ئەگەرنا، بۆچی دەیڵێم ئەم شیعرە
پێش پرسینەوە.. نیعمەتی داوە     وەرە لە سایەی ئەوا خۆت گرە
بۆ حەقی خۆت بێ و پیتدا هەڵ نەدەم؟ چاکە و پیاوتیت : ئاشکراو سرە !
باسی کردەوەی چاکت هەردەکەم     هەرچەند بە خەمیش سەری من ورە
پاشا بە ( دوبان )ی پزیشکی وت :
ئەزانی بۆچی بانگم کردوویت !؟
ئەویش لە وەڵامیدا وتی :
لە خوا زیاتر.. کەس غەیب زان نی یە !!
پاشا پێی وت :
بۆ ئەوەم بانگ کردوویت : تا بتکوژم !
( دوبـان ) بە سەرسووڕمانەوە پرسیی :
تاوانم چی یە قوربان وا دەمکوژیت ؟
پاشا پێی وت :
پێیان وتوم تۆ سیخوڕیت ... جـا... پێش ئەوەی تۆ من بکوژیت : من تۆ دەکوژم !
پزیشکەکە وتی :
بمهێڵە و خوا دەت هێڵێت .... مەمکوژە با خوا نەتکوژێت !
ئـەمجا پـیرەی دانیـشتووی کـن بازرگانــەی بـەردەم دێوەکـە ، درێـژەی بـە گێڕانـەوەی چیرۆکەکە دا ...
ئەی ( دێو ) .. پزیشکە زۆری لەگەڵ وت . بەڵام ( پاشا ) نەی دەبیست و وتـی :
تا نەتکوژم ، ئاسوودە نابم ! تۆ بە شتێك کە بە بەری لەپم دەمگوشی .. منت لەو برینی پێستە چاك کردەوە . کێ دەڵێت بە شتێکیش کە بۆنی بکەم ... نامکوژیت !؟
پزیشکەکە وتی :
جـا.... پاداشتی چاکەی من ، ئاوا بە خراپە دەدەیتەوە !؟
پاشا وتی :
نەخێر ..... دەبێت مۆڵەتت نەدەم و بتکوژم !
پزیشکە داماوەکە بۆی دەرکەوت کە پاشا سوورە لە سەر کوشتنی..دەستی بە گریان کرد.. بە داخ بوو بۆ ئەو چاکەیەی کە بەرامبەرکەسێکی وا ناشایستە کردبووی . ئەم شیعرەی بیرکەوتەوە :

کەسێك لە عەقل و ژیری بێ بەش بێ — دەبێ وەکو من هەر چارەڕەش بێ

چاکەم بۆ کەسی نا شایستە بوو — ئیدی چاوانم چۆن دەبێ گەش بێ

جەلادی شمشێر بە دەست هات .. چـاوی پزیشکەی بەستەوە .. شمشێری لێ راکێشا..

پزیشکەیش بەدەم گریانەوە ، بە پاشای وت :

بم هێڵە خوا دەتهێڵێت . مەمکوژە .. با : خوا نەتکوژێت .

بە دەم خۆ لاوننەوە ئەمەی وت :

ترساو: رزگار بوو لەدەرد و بەڵا — منیش چاکەی خۆم لە ملم ئاڵا

مەرجە نەهێڵم چاکەی زۆر بکرێ — بە گشت زوبانێ : بیکەم بە هەڵا

( پزیشك )ەکە وتی :

ئەمە پاداشتەکەم بوو. کە وەکو پاداشتی ( تیمساح )ی لێ هات .

پاشا وتی : بەسەرهاتی ئەو (تیمساح )ە ، چۆن بووە؟

پزیشکەکە وتی :

بەم حاڵەوە ناتوانم بیگێڕمەوە ! بم بەخشە.خوایش دەتبەخشێت. ئەمجا بە کوڵ گریا .

هەندێ لە پیاوانی دەرباری شا وتیان :

خوێنی ئـەم پزیـشکە ببەخـشن بـە ئێمـە .. خـۆ خراپـەی لەگـەڵ نـەکردوویت ! ئێمـە ئەومندەمان لێ دیوە تۆی لە بـرین و ( دوومـەڵ )ێك رزگار کـردووە کـە هـەموو پزیـشکانی مەملەکەت لە ئاستیدادەستەو سان بوون..!!

پاشایش وتی :

لۆمەتان ناکەم !چونکە نازانن بۆچی دەیکوژم؟ ئەگەر من نەیکوژم ئەو من دەکوژێت ! ئەم پزیشکە دارێکی پێ گوشیم چاك بوومەوە . دوور نییە : بە ( بۆن )ێکیش بمکوژێت ..!! دەترسم بەرتیلی کوشتنی منی لە دوژمنێکم وەرگرتبێت و بمکوژێت ! ئەمە سیخوڕە و ناردوویانە من بکوژێت . کەوابوو پێویستە بیکوژم ... تاکو بێخەم و ئاسوودە ببم .

( پزیشك )ەکەیش دیسان وتی :

*بم هێڵە .... خوا دەتهێڵێت . مەمکوژە : با خوا نەتکوژێت !*

ئەی ( دێو ) کە ( پزیشك ) بۆی دەرکەوت ، هەر دەیکوژێت پێی وت :

گەر هەر سووری لە سەر کوشتنم ... هێندە مۆڵەتم بدە تا دەچمەوە ماڵ و کاروبارەکانم کۆتا دەکەم و پێیـان دەڵـێم چۆنی بمنێـژن و کتێبەکانیـشم دەبەخـشم . کتێبێکی تایبـەتم هەیە ئەوە دەبەخشمە ئێوە، تاکو بیخەنە ( گەنجینە )کەتانەوە .

پاشا وتـــی : ئەو کتێبە لە بارەی چی یەوەیە؟

ئەویش وتی :

هێندەی تیایە لە ژماردن نایەت ..نهێنی یەکی تیایـە . کە دوای سەربڕینم.. سەرەکەم

دێنی و لە بەرامبەریدا : (٣) پەڕە هەڵدەدیتەوەو لای چەپی دەخوێنیتەوە.. ( کەللە سەر)ەکەم وەڵامی هەموو پرسیارەکانت بەراستی دەداتەوە .

پاشا سەری سووڕماو پرسیی :

ئەی پزیشك دوای سەربڕینت ... کەللە سەرەکەت قسە دەکات ؟

ئەویش وتی : بەڵێ .... پاشا

پاشاش وتی : ئەمە سەرسووڕ هێنەرە !

ئیدی پاشا کەسێکی کردە یاوەری ... تا بڕواتەوە بۆ ماڵ ! ئەو ڕۆژە پزیشك کارەکانی ماڵی جێ بەجێ کرد و ڕۆژی دواتر چووە دیوەخانی پاشا.... هەموو وەزیر و میر و پیاوانی مەملەکەت ئامادە

بوون ... ئەمیش چووە بەردەم پاشا و کتێبێکی کۆنی پێ بوو....

دانیشت و وتی : سینی یەکم بۆ بێنن .

کە سینی یەکەیان بۆ هێنا : هەندێ تۆزی پێدا پژاند و وتی :

فەرموو بیگرە ..کتێبەکە مەکەرەوە .. تاکو سەرم دەبڕیت! کە سەرەکەمت هێنا بە سەر تۆزی ئەم سینی یەدا بیخولێنەوە . تاخوێنی دەوەستێت .ئەمجا کتێبەکە بکەرەوە و پەنجە بخە سەر یەکەم دێڕ.

شمشێر بە دەست هات و سەری پزیشکی پەڕاند و سەرەی هێنا و خستی یە ناو تۆزی سینی یەکەوە . کە خوێنی کەللە سەر وەستا.

( ڕۆیان )ی پزیشك ، چاوانی کردەوە و وتی :

ئەی پاشا کتێبەکە بکەرەوە . پاشایش: لەبەر ئەوەی پەڕەکانی بەگران هەڵ دەدرانەوە. ( ٣ ) جار بە زمانی پەنجەی تەڕ کرد و (٣) پەڕەی هەڵدایەوە . پەڕەکانیش هیچیان تیا نەنووسرابوو!

بۆیە لەکەللە سەرەی پرسی : بۆچی ؟

( ڕۆیان ) وتی : پەڕەی زۆر هەڵبدەرەوە .

( ٣ ) پەڕەی تری هەڵدایەوە ... هێندەی پێنەچوو ژەهر لە پەنجەیەوە بە ناو لەشیدا بڵاو بووەوە . چونکە کتێبەکە ژەهراوی بوو. بۆیە پاشا هاواری کرد... کە ژەهر خواردوو بووم .

ئەمجا " ڕۆیان"ی پزیشك ئەم هۆنراوەیەی وت :

ئەو هەموو ساڵە کە حوکمڕان بوو سوودی نەبوو بۆی وا بەستەزمان بوو

داد پەروەر نەبوو و ملهوڕی دەکرد ئێستاش ئەوەتا.. مەرگی میوان بوو

کە لە خوێندنەوەی هۆنراوەکە بووەوە .. پاشا کەوتە سەر زەوی و مرد. ئەڵبەتە شای یۆنان پزیشکەکەی نەکوشتایە خۆیشی نەدەکوژرایەوە! گوێی لە کەس نەگرت و کوشتی . تۆیش

ئەی دیۆ ( گەر نەمکوژیت خوا ... ناتکوژێتەوە .)

ماسیگرەکە بە دێوەکەی وت :

گەر تۆ منت نەکوشتایە و کۆڵت لێ بدامایە ... ئێستا منیش تۆم وا بەند نەدەکرد لەو گۆزەیەداو نەم دەخستیتەوە بنی دەریا!

دێوە هاواری کرد وتی :

بۆ خاتری خوا ماسیگر بمپارێزەو بە هەڵەی خۆمم لەگەڵ مەکە.ئەگەر من خراپ بووم تۆ بـاش بـە. پێـشینان وتویانـە : ئـەی پیـاو چاکان لەگەڵ کەسـانی خراپدا : پێیـان بڵێن.... خراپە نەکەن . ئەوە مەکەن کە ئومامە لەگەڵ عاتیکەی کرد!!

ماسیگرەکە وتی : ئومامە چی لەگەڵ عاتیکە کردووە؟

دێوەکەیش وتی :

جا ئێستا کە من بەندی ئەم گۆزەیەم . کوا جێی قسە کردنـە؟ بـەرەڵڵام بکە..با بۆت بگێڕمەوە !

ماسیگرەکە وتی :

ئەوە قسە نییە ! هەر ئێستا دەتخەمەوە بنی دەریاکە ! بـڕوا ناکەم جارێکی دی رزگارت ببێت و کەسێك وەکو من بەزەیی پێتدا بێتەوە! دەرت بێنێت و دواییش وەکو مـن پاداشتی بدەیتەوە! من تۆم رزگار کـرد..کەچی تۆ دەتویـست پێمـەوە بـدەیت و بمکوژیت ! کە مـن خراپەم لەگەڵ نەکردبوویت! ئەوسا... بۆم دەرکەوت کە تۆ ناکەس بەچەیت! با مـن فڕێت بدەمە بنی دەریا. دوای من.... هەر کەسێك رزگاری کردیت.... ئـەم بەسـەرهاتەی مـنی بۆ بگێڕەوە! بزانە.. ئەمجارە رزگاربوونت نابێت . تاکو رۆژی دوایی !

دێوە وتی :

ئـازادم بکە کاتی پیاوەتیە! پەیمانت دەدەمێ هەرگیز خراپەت بەرامبەر ناکەم . سوودیشت هەر پێ دەگەیەنم .

ئیدی ماسیگر بەزەیی پێدا هاتەوە و سوێندی دا. پەیمانی لێ وەرگرت . ئەمجا سەری مۆرکراوی گۆزەکەی هەڵ پچڕی...! دوکەڵێك هاتـە دەرەوە لـەولاوە بـووەوە بـە دێوێك دوو لاقی درێژی پێوە بوو کە لە دوو پایەی بەردە مەڕمەڕ دەچوون .

ئەمجا سەری نەوی کرد و هاواری کرد :

لە پەزێراییتدام ئەی حەزرەتی سولەیمانی پێغەمبەری خوا !

ماسیگر پێی وت : ئەوە دەڵێی چی نەفرەتی؟ حەزرەتی سولەیمان (١٨٠٠) ساڵە مردووە !

دێـوەکەیش شەقێکی لە گۆزەکە هەڵداو فڕێی داوە نێو دەریا.

شەهرەزاد هەستی کرد شەو وەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

## چیرۆکی ماسی یە رەنگینەکان

شەهرەزاد وتی :

ئـەی پاشای بەختیار... خـاوەنی بڕیار...

دەگێڕنـەوە : ( ماسیگر)ە کە بینی دێوە گۆزەکەی فڕێ دایـە دەریـاوە. تێگەیشت تووش بووە.. لە ترساندا میزی بە خۆیدا کرد و بەخۆی وت :

ئەو کارەی دێوە... خێری پێوە نی یە !

دواتر ورەی بە خۆیداو بەخۆی وت :

ئەی ( دێو ) خوا فەرموویەتی : *پەیمان بەجێ بێنن ... چونکە لێی بەرپرسن !*

تۆش پەیمانت دا، خراپەم لەگەڵ نەکەیت ! تـا خـوا سزای خراپـەت نەداتـەوە! منیش هەر ئەوەم پێ وتی :

کە ( دوبان )ی پزیشك بە شا ( یۆنان )ی وت : بم هێڵە .. با خوا بتهێڵێت !

دێوەکە پێکەنی و پێشی کەوت و وتی :

ماسیگر شوێنم بکەوە .

ماسیگرەیش هەچەند بڕوای بە خۆیشی نەبوو کە ڕزگـاری بـووە . شـوێنی کـەوت . بە شاخێدا هەڵگەڕان و بەو دیوی دا شۆڕ بوونەوە .سەیری کرد دەشتایی بوو . گەشتنە گۆمێك و چووە ناوەڕاستی گۆمەکە و بە ( ماسیگر )ەی وت :

شوێنم بکەوە .

دوای کەمێك فەرمانی بە ماسیگر دا :

تۆڕەکەت بخەرە ئاوەوە و ڕاو بکە . ماسیگر کە تۆڕەکەی لە ئاو دەرهێنا . سەری سوورما لەو ماسی یە سپی و سوورو شین و زەردانە! تۆڕەکەی دەرهێناو (٤) ماسی پێـوە بـوو بوو و هەر ماسییەك لە رەنگێك . ( ماسیگر) ئەمـەی بـینی زۆر دڵخۆش بـوو. دێوەکـە ئامۆژگاری کرد ، کە هەر(٤) ماسییەکە بباتە خزمەتی پاشاو ئەویش پارەیەکی زۆری دەداتێ .

ئەمیش وتی :

ببوورە من (١٨٠٠ ) ساڵە لە بنی ئەم ئاوەدام . ڕێگا نازانم : چونکە دەرەوەم نـەبینیوە ! ئێستا نەبێت.. ئامۆژگاریت دەکەم ڕۆژی تەنیا یەك جار تۆڕ فڕێ بدە ئەم گۆماوە !

خواحافیزیی لێکرد و پێ یەکی بە زەویدا دا ... زەویش درزی بـرد و ( دێـو )ەکـە خـۆی پێدا کرد . ماسیگرە ( ٤ ) ماسی یە رەنگاو رەنگەی خستە تەشتێك ئاوەوە و بە زینـدوویی گەیاندی یە کۆشك و بردی یە بەر دەستی پاشا . پاشایش ئەمەی پێ سـەیر بـوو..!! چونکە لە ژیانیدا ماسیی لـەو جـۆرەی نـەبینی بـوو! فەرمانیـدا : بیدەنـە ئـەو کەنیزەکـە چێـشت لێنـەرەی کـە (٣ ) ڕۆژ لەمـەوپێش پاشـای ڕۆم بـە دیـاری بـۆی نـاردبوو و هێـشتا چێـشتی

دەستیان نەخواردووە .
وەزیریش بۆ کەنیزەکەی برد تا بیان برژێنێت و وتی :
پاشا دەڵێت چۆن فرمێسکم بۆ تەنگانە هەڵگرتووە.. ئاواش چێشت لێنەرم بۆ ئەمڕۆ هەڵ گرتووە .
با دەست ڕەنگینی خۆی دەر بخات . چونکە ئەمە دیاری یە! کە گەڕایەوە پاشا فەرمانیدا( ٤٠٠ ) دینار بدەن بە ماسیگر... ماسیگرەش پارەکەی خستە باخەڵی و بە پەلە بەرەو ماڵ بووەوەو لەخۆشیدا هەر دەکەوت و هەڵدەستایەوە و پێی وابوو خەو دەبینێ !
ماسیگرە هەرچی پێداویستی ژن و منداڵەکانی هەبوو ، هەمووی کڕی و گەڕایەوە ماڵێ .
ئێمەیش ماسیگرە بەو بەختیاری یەوە جێ دەهێڵین و دەچینەوە سەروکاری ... ( کەنیزەك)ە چێشت لێنەرەکە...
کەنیزەکە ڕۆن و تاوەی ئامادە کرد و دەستی کردە پاك کردنی (٤ )ماسی یەکەو خستنی بە تاوەوە . هەر هێندەی خۆش بوو هەڵی گێڕانەوە ... کاتێکی زانی دیواری چێشتخانە درزی برد و یەك کیژۆڵەی جوان و ناسکی لێ هاتە دەر کڵاو زەرێکی لەسەردا بوو، ریشووی بە سەر ڕوومەتەکانیدا شۆڕ ببووەوە . کڵاو ئاوریشمی سپی و ریشوەکانی شین . لە گوێیەکانیدا گوارە و دوو تاك بازن لە مەچەکەکانیدا بوو. لە پەنجەکانیدا ( موستیلە )ی نقێم دار هەبوو.. دار حەیزەرانێکی بە دەستەوە بوو .
دارەکەی کرد بە تاوەکەدا و پرسیی :
*ئەی ماسی یەکان ... لە سەر پەیمانەکانتان ماون ؟*
(کەنیزەك )ەی چێشت لێنەر لەو لاوە لە ترسدا بوورایەوە . کیژۆڵەکەیش پرسیارەکەی دووبارە و سێ بارە دەکردەوە ...
ماسی یەکان سەریان لە تاوەکەدا بڵند کردەوە و وتیان : *بەڵێ..... بەڵێ* .
ئەمجا ئەم گۆرانیەیشیان وت :
***هاتیت د ێین و وەك تۆ بە پیشەین     خۆ گەر نەهاتیت ئەوا، هاوکێشەین***
کیژۆڵەکە تاوەکەی هەڵگێڕایەوە و چووەوە ئەو درزی دیوارەی لێی هاتبووە دەرەوە... کە کەنیزەکە چێشت لێنەرەکە بە ئاگا هاتەوەو سەیری تاوەی سەر ئاگرەکەی کرد ( ٤ ) ماسی یەکە هێندە سووتابوون .. ببوونە خەڵووزی رەش !
جارێکی دی لە ترسانا بورایەوە . لەم کاتەدا.. وەزیر خۆی کرد بە چێشتخانەکەدا .. کە ئەوەی بینی بە قاچی لەشی کەنیزەکەی پاڵ نا... کەنیزەکە بە ئاگا هاتەوە ... دەستی کردە گریان و بە دەم هەنسکە برکێوە چی دیبوو بۆ وەزیری گێڕایەوە...
ئەویش سەری سووڕماو وتی :
ئەمە شتێکی سەر سوڕهێنە!بۆیە ناردی بە شوێن ماسیگرەدا و فەرمانیدایە( ٤ ) ماسیی

دی لەو ماسی یانەی هێنابووی ، بهێنێتەوە بۆیان !

ماسیگرە ، چووەوە سەر گۆمەکە و تۆڕی تێدا بڵاو کردەوەو رای کێشایەوە . بینی (!)
ماسیی تێدایە .. گەڕایەوە و بە پەلە گەیاندەوە دەستی وەزیر . ئەویش بردیەوە چێشتخان
و فەرمانی بە هەمان کەنیزەك داکە بە هەمان شێوە.. بە بەرچاوی یەوە .. سووریان
بکاتەوە .کەنیزەکە دەستی کرد بە چاك کردنی ( ٤) ماسی یەکە و تاوەو رۆنی خستە سەر
ئاگر و ماسی یەکانی لە رۆنەکەدا راخست .

کاتێکیان زانی دیسان دیواری چێشتخانەکە قڵیشایەوە و کیژۆڵەیەك .. بە هەمان شێوە و
روخساری جاری پێشوو پەیدا بووەوەو دارەکەی دەستی چەقاندەوە بە تاوەکەدا و وتی :

ئەی ماسی یان .. ماسی یان .. لە سەر پەیمانی کۆن ماون ؟

ماسی یەکان .. سەریان بڵند کردەوە و ئەم شیعرەیان وتەوە :

هاتیت دێین و وەك تۆ بە پیشەین     خۆ.. گەر نەهاتیت : ئەوسا هاوکێشەین

شەهرەزاد هەستی کرد شەوەدەرنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٧**

شەهرەزاد وتی :

دەگێڕنــــەوە : ئــــەی پاشای بەختیار.. خـــــاوەنی بڕیار..

کە ماسی یەکان لە قسە بوونەوە. کیژۆڵە دار بە دەستەکە ، بە دارەکەی تاوەکەی قلپ
کردەوە و چووەوە درزی دیواری چێشتخانەکە و درزەکە هاتەوە یەك !

وەزیر سەری سوورما و وتی :

ئەمە رووداوێکی سەر سوورهێنە و پێویستە پاشامان لێی بە ئاگا بێت !
چووە بەردەم پاشا وچی دی بوو ، بۆی گێڕایەوە .

پاشایش وتی :

دەبێت .. منیش بە چاوی خۆم ببیبینم ! ناردیە دووی ماسیگرە و فەرمانی پێدا: لە
ماوەی ( ٣ ) رۆژدا (٤ ) ماسی تریان لە هەمان ماسی یەکانی پێشوو بۆ بێنێت ! دواتر
ماسیگرە( ٤ ) ماسییەکەی بۆ هێنان و پاشاش فەرمانیدا(٤٠٠ )دیناریان دایە . پاشا فەرمانیدا
کە وەزیر: خۆی ماسییەکان چاك بکات و لە بەر چاوی خۆی سووریان بکاتەوە .

وەزیر ماسی یەکانی چاك کرد و تاوە و رۆنی هێنا و خستی یە سەر ئاگر. ماسی یەکانی
تێدا درێژکرد . هێندەیان زانی دیوارەکە درزی برد و ئەمجارەیان کۆیلەیەکی رەشی لێ هاتە
دەرەوە . هەر دەتوت منارەیە و لە پاشماوەکانی نەتەوەی ( عاد )ە .

لقە درەختێك بە دەستی یەوە بوو و چووە سەر تاوە کە و وتی :

*ئەی ماسی یان ... ماسی یان . ئاخۆ : لەسەر پەیمانی کۆن ماون ؟*

ماسی یەکان ... سەریان بڵند کردەوە و وتیان :

*بەڵێ .... بەڵێ ئێمە لە سەر پەیمانی خۆمانین .*

کۆیلە رەشەکە لە تاوەکە نزیك بووەوە و دارەکەی دەستی لێداو قڵپی کردەوەو چووەوە درزی دیوارەکە و درزەکە و درزەکە هاتەوە یەك .. پاشا و وەزیر چوونە سەر تاوەکە .. بینیان ماسییەکان بوونەتە خەڵووز..!

پاشا سەری لەم کارە سوورِما و وتی :

*ئەمە کارێکە نابێت لێی بێدەنگ بین . ئەم ماسی یانە شتێکیان هەیە !*

فەرمانی دا... ماسیگرەکەی بۆ بێنن ... کە هێنایان ، پاشا لێی پرسی :

ئەم ماسی یانەت لە کوێ هێناوە ؟

ماسیگرە لە وەڵامدا وتی :

لە گۆمێك .. کە لە نێوان ( ٤ )کێو دایە و لە دامێنی چیایەکی شاردایە !

پاشا پرسی یەوە : چەند رۆژە رێگایە ؟

ماسیگرە وتی : پاشام ... نیو سەعات رێگایە !

پاشا سەری سوورِما! فەرمانیدا بە دەست و پێوەنـدەکانی ئامـادە بـن ، ماسیگرەشـیان - کە لە دڵی خۆیدا هەر جنێوی بە دێوەکە دەدا- دایە پێش! بە شاخەکەدا سەرکەوتن و چوونە پێدەشتێك کە لە ژیانیاندا نەیان بینی بوو ! لە نێو چوار شاخدا گۆمێك بوو . ماسی یەکانی نێوی (٤ ) رەنگ بوون . سور و سپی.... زەرد و شین .

پاشا سوپا و دەست و پێوەندانی بە لێواری گۆمەکەدا کۆکردەوە و لێی پرسین :

کێ لە ئێوە .. زووتر ئەم گۆمەی بینیوە !؟

ئەوانیش وتیان :

نەخێر... پاشا بە درێژیی تەمەنمان ، ئەم گۆمەمان لەم شوێنەدا نەدیوە !

پاشا سوێندی خوارد :

بەو خوایە لێرە نابزوێم و ناچمەوە سەر تەختی پاشایەتی ... تـاکو هـەواڵی ئـەم گۆم و ماسی یانە نەزانم ! فەرمانیدا... کە بەو ناوەدا بڵاو ببنەوە .

وەزیرەکەشی ـکە پیاوێکی دانابوو بەکێشەکانی ژیان ـ بانگ کردە لای خۆی و پێی وت: دەمویست ئەم شەو ، تاك ببمـەوە و بـچمە خەڵوەتـەوە بـۆ ئـەوەی هـەر بـیر لـەم گۆمـە بکەمەوە ! تۆیش لە دەور و بەری رەشماڵەکەم بە.. گەر ئەفسەران و پیاوانی دەوڵەت .. یـان هەر کەسێك ویستی بم بینێت ، بڵێ پاشا.. نەخۆشە.. فـەرمانی پـێم داوە کـە رێگـای کـەس نەدەم.. بچێتە رەشماڵەکەیە وە .

پاشا .. بەرگی جەنگی لەبەر کرد و شمشێرەکەی لە کەمەر خست و بە تاریکیی شەو لە رەشماڵ هاتە دەر و بە چیادا هەڵگەڕاو رۆیـشت تـاکو رۆژی لـێ هـەڵهات . بە درێـژایی ئـەو

ڕۆژمیش بەڕێوە بوو . شەوی دواتر هەر بەڕێوە بوو . ماندوو بوو و گەرما زۆری بۆ هێنا . تارماییەکی لە دوورەوە بینی و زۆر دڵی خۆش بوو .

لەبەر خۆیەوە وتی :

ڕەنگە نهێنی ئەم گۆم و ماسی یانەم پێ بڵێت !

کە نزیك تر بووەوە ، کۆشکێکی بینی . کە بە خڕە بەرد ، دروست کرابوو، بانەکەیشی تەخت و بە ئاسن کرابوو . دەروازەیەکی دوو تاکیی هەبوو و تاکێکی کرابووەوە ، پاشا دڵشاد بوو بەوە و بە ئارامی لە دەرگای دا... بەڵام وەڵامێکی نەبیست !

جاری دووەم لە دەرگای دایەوە.. نەخێر جاری سێ یەم لە دەرگای دایەوە... وەڵام نەبوو! زۆر بە توندی لە دەروازەکەی دا. دیسان ، کەس وەڵامی نەدایەوە!

ئەمجا لەبەر خۆیەوە وتی :

دیــارە ، ئەم کۆشکە چۆڵــە !

گوڕی بە خۆی دا و چووە ژوور!

کە چووە داڵان... هاواری کرد :

ئەی خاوەن ماڵ...! من ڕێبوارێکی برسی و نامۆم بە ئێرە ! هیچتان هەیە بیخۆم !؟

ئـەم قسانەی دووبـارە و سـێ بـارە کـردەوە . هـەر وەڵام نـەبوو. هـانی خۆیـدا و چووە ناوەڕاستی کۆشکەکەو کەسی نەدی . بەڵام ژوورەکان پڕ فەرش و نوێن بوون ... پەنجەرەکان بە پەردەی ئاوریشم پۆشتە بوو! لـە نێـو ئـەم کۆشـکەدا ( سـەکۆ )یـەکی پـان و پـۆڕ و (٤) بەرهەمیوان هەبوو- ڕاخەرێك ڕاخرا بوو و حەوزێك (٤) پەیکەری شـێری زێـڕینی سووری بە لێوارەوە بوو و ئاو لەدەمیانەوە دادەوەڕیە ناو حــەوزەکە!

بـە چـوار دەوری کۆشکەکەیـشدا باڵنـدە هـەبوو. تـۆڕێکی ئـاڵتونیش درابـوو بـە سـەر کۆشکەکەدا . ڕێگریی لە پیا هەڵزنانی ئاژەڵ و مرۆڤ بوو. پاشا کەسی لە نێو کۆشکدا نەبینی و زۆر سەری سووڕما! تاکو ئێستا کەسێك ئەم شاخ و پێدەشت و گۆمە و ئاو و ئەم کۆشکەی نەدی بوو!! بۆیە لە دەم دەرگای ژوورێکدا پاڵی دایەوە .

گوێی لە نرکە و ناڵەیەکی پڕ پەژارە بوو، کە ئەم هۆنراوەیەی دەوتەوە :

چێت پێکردبووم ، هەمووم شاردەوە      لە چاوان خەوت وا ڕەواندەوە

لە شنەی شەماڵ من تۆم دەپاراست      قەدەر هات دەستی خۆی وەشاندەوە

لەبەر دڵانی هۆز و خزم بووم .      هەژاری منی دابــەزاندەوە

سوڵتان گوێی لەم ناڵە و فیغانە بوو. هەستا بەرەو دەنگەکە چوو. پەردەیـەکی دادراوەی بینی .هەڵی دایەوە ... گەنجێکی بینی جوان و تەواو .. شیرین زمان و پاراو . لێوانی ئـاڵ و تەڕ. ڕووبە ورشەی وەك بەردە مەڕمەڕ ! دەتوت ئەم شیعرە بە جوانیی ئەودا هەڵدراوە :

جوانێکە خاوەن دوو لێوی تەڕە      ڕووی بە ورشەیە وەکو مەڕمەڕە

لەسەر رووی سپی ئەو مووە رەشە     دەتوت: یاقووت و زێڕ و گەوهەرە

پاشا بە روویەکی خۆشەوە ، سڵاوی لێکرد . لاوەش ، کە دانیشتبوو، سەرپۆشێکی بە زێڕ نەخشاوی بە سەردا دابوو، تاجی شاهانەی لە سەردا بوو . پەژارە بە روخساریەوە دیاربوو! وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە و وتی : *ببوورن ... ناتوانم لەبەرتـان هەستم !*

پاشایش وتی :

گوێ مەدەرێ ! ئێستا من میوانتم و کارێکم پێتە دەمەوێت ، هەواڵی ئەم گۆم و ماسی یە رەنگاو رەنگانە و ئەم کۆشکەم پێ بڵێیت و بۆچی تەنیایت و بۆ دەگریت !؟

لاوەکە ، بەم شێوەیە خۆی لاواندەوە :

پەژارە و خەمت لە دڵ لابـــەرە..     کارسازی ژیان : خوای بانی سەرە

هەرگیز مەپرسە چی بوو و چۆن روویدا؟   هەرچی روو دەدات : قەزا و قەدەرە

پاشا سەری پتر سوڕما و لێی پرسی :

بۆچی دەگریت ئەی لاو؟

ئەمیش وتی : چـــۆن نەگریم ، کە ئەمە حاڵم بێت ؟

پاشا وردتر سەرنجی لاوەکەی دا... بینی لە ناوکی بەرەو خوار بووە بە بـەرد ! لە نـاوکی یەوە تاکو قژی سەریشی مرۆڤە !

کە پاشا ئەوەی بینی پەژارە دایگرت و وتی :

ئەی لاو تۆ پەژارەی منت پتر کرد ! من عەودالی ... هەواڵی گۆم و ماسی یـەکان بووم ، ئێستا هەواڵی تۆیشی چووە بان !! خێراکە ... قسە بکە ..!!

لاوەکە وتـــی : کەوابوو... گوێم لێ بگرە .

پاشایش وتی : دڵم لاتـــە .

لاوەکە وتی :

من و ئەو ماسی یانە شتێکی عەجایەبین .گەر نوسرابا و لەبەر چاوان بگیرایە ... ئامۆژگاری بوو بۆ گوێ پێدەران !

پاشایش وتی : چـــۆن ؟

ئەمیش وتـــی :

گەورەم ... باوکم کە ناوی مەحموود بوو ، شای ئەم شارە بوو، خاوەنی دوورگە رەشەکان بوو . کە لە نێوان ئەو چوار شاخەدا بوو. (٧٠ ) ساڵ حوکمڕانی کرد . ئیدی کۆچی دوایی کردو من کورسیی دەسەڵاتم وەرگرت و ئامۆزایەکی خۆمم مـارە کـرد . کە هێنـدەی خـۆش دەویستم بە بێ من نان و ئاوی نەدەخوارد . ئەو کچە ئامۆزایەم (٥ ) ساڵ لام بوو .

رۆژێکیـان چـوو بـۆ گـەرماو وکەنیزەکە چێشت لێنەرەکەی راسپاردبوو.. خواردنم بـۆ ئامادە بکات و کە رایش کشام بۆ نووستن ، با دووکەنیزەك لە سەر و پێینم بوەستن .

منیش کە بێتاقەت بووم چوومە جێگاوە تا کەمێك بنووم.. هێشتا چاوم نەچوو بووە خەو گوێم  لێ بوو کەنیزەکی ژوور سەرم بە کەنیزەکی لای پێینمی وت :
کچێ مەسعودە .. ئای ئاغامان چەند رەنج بە خەسار و داماوە . داخی بە جەرگم بۆ گەنجیەکەی . کە بەم شێوەیە لەگەڵ ئەم ژنە (سیحرباز )ەدا بە سەری دەبات !
کەنیزەکی پێینم ، لە وەڵامدا وتی :
بەڵێ .. ( بەڵا )م دا لە ژنی ناپاك..! ئەم تەمەنی هەرزەکاری یە ، نابێت وا بەسەر ببات !
کەنیزەکی ژوور سەرم وتی :
گەورەمان ، هێڕ و گێلە...چونکە لێی ناپرسێتەوە....!
کەنیزەکی پێینی وتی :
( بەڵا ) لێت بدا.... جا.. بۆچی گەورەمان ئاگای لە خۆیەتی؟ هیچی بە دەست نەماوە... چونکە هەموو شەوێك (سیحر) دەخوێنێت بە سەر پیاڵەی مەیەکەیدا و ئەویش دەیخواتەوە ! سرکەرێك دەرخواردی دەدات... تاکو بەیانی ئاگای لە خۆی نامێنێت ! ئیدی نازانێت ژنەکەی بۆ کوێ دەڕوات و چی دەکات ؟ دەڕوات و تاکو دەمەو بەیان ناگەڕێتەوە . کە گەڕایەوە دووکەڵێك دەکات بە لووتیدا، ئەمجا لە خەو هەڵدەستێت !
منیش کە ئەمەم بیست دنیا لەبەرچاوم تاریك بوو . شەو هات و ئامۆزا لە گەرماو گەڕایەوە.
سفرە راخرا... خواردن خورا.. نزیکەی سەعاتێك دانیشتین و قسەمان کرد. دواتر لەو شەرابەی حەزم لێ بوو بانگ کرا.. منیش رشتم و وام دەرخست خواردوومەتەوە . کاتی چوونە سەرجێگا هات و چاوانم نووقاند . وەکو ئەوەی  نوستبم !
ئەویش بە سەرمدا شۆڕ بووەوە و وتی :
بنوو... یاخوا هەڵنەستیتەوە...!! خۆت و شێوەت لای من بێزراون ! تاقەتم لە دەست لەملانت چوو..! نازانم کەی خوا رۆحت دەکێشێت !؟
ئەمجا جوانترین بەرگی پۆشی و شمشێرەکەی منی لە کەمەر بەست و دووکەڵی بۆنێکی سوتاوی لە ژوورەکەدا بڵاو کردەوە .
دەرگای کۆشکی کردەوە و دەرچوو . منیش خێرا هەستام و خۆم گۆڕی و شوێنی کەوتم.... بەناو بازاڕی شاردا تێپەڕی و ئەمجا گەیشتە بەر دەرگای شارەکە ورتە ورتێکی کرد. کە من تێی نەگەیشتم... کێلونی کلۆم دراوی دەروازەی شار کرایەوە . ئیدی ئەو رۆیشت و من بە شوێنی دا تا گەیشتە دیوارێکی بڵند و گوومەزێك لە ناویدا بوو و دەروازەیەکی هەبوو کە پێیدا چووە ژوورەوە. منیش سەرکەوتم و بە سەربانەدا چوومە خوارەوە . کە سەیرم کرد ئامۆزاکەم ، چووە لای کوێلەیەکی رەشی دوو لێو ئەستور. کە تەڕ بوو و لە سەر کۆمەڵێك پووش راکشا بوو. کڕنووشی بۆ برد .

کۆیلەکەش سەری بڵند کردەوە و وتی :
( بەڵا )م لێ دایت ، بۆ هێندە دواکەوتیت ؟
ئامۆزاکەم وەڵامی دایـــەوە :
ئەی نازانیـت گـەورەم : مـن ژنم و ئـامۆزای خـۆم مێردمـە..کـە مـن رقمـە لێی وحـەز بـە هاوسەرێتیی ناکەم !؟
لەبەر خـاتری تـۆ نەبوایـە، هـەر ئەمـشەو شارەکەم ژێـر و ژوور دەکـرد وکارێکم دەکـرد ( بایـەقوش) تێیـدا بخوێنێـت ! چـەقەڵ و ڕێـوی و گـورگ تێیـدا بلوورێنێـت و خـــۆڵ و بـەردەکەشیم ، دەگەیاندە پشتی : ( قوللەی قاف) .
کۆیلەکە وتی :
درۆ دەکـەیت ، نـەفرەتی . وامەزانـە ئێمـەی رەش پێـست.. ویـژدانمان..ویـژدانی سپی یانـە! گـەرئاوا دوا بکـەویت هـاورێ یـەتیت ناکـەم ! هـەی نـەفرەتی..! یاریمـان پـێ دەکـەیت؟ هەی پیس ترینی سپی پێستان .
ئەوا .. ئامۆزاکەیشم بە پێوە وەستاوە و بە سەریدا دەگری .
پێی دەڵێت :
گەورەم گەر تۆ لێم توورە ببیت ، لە سایەی کێدا بژیم ؟ تـۆ دەرم بکـەیت ، پەنایـەکی دیکەم نییە .
هەر دەگریا و دەپاڕایەوە ... تاکو کۆیلەکە لێی خۆش بوو.
ئامۆزاکەیشم ژیر بووەوەو وتی : گەورەم ... چیت هەیە کەنیزەکەکەت بیخوات ؟
ئەویش وتی :
ئەو لەگەنە بێنە گۆشتی مشکە تۆپیوی برژاوی تیایە ... ئەو گۆزەیەش ، ئاوی پڕ لە قەوزەی تێدایە !
ژنەکەم تێر و پڕی خواردو خواردەوە و دەست و دەمی سڕی . منیش - کە دەم و لووتم هەڵ بەست بوو - ئەمەم بینی و بۆم دەرکەوت ناپاکیم لێدەکات ، لە داخدا .... بوورامەوە . کە بەئاگا هاتم ..دابەزیم و شمشێری قەدی ئامۆزاکەم ڕاکێشاو لـە ملی کۆیلـە رەشـەکەم داو پێم وابوو مردبێت! توومەز قوڕقوڕاکەم بڕیوە وهیچی تر! خۆم کێشایەوە و بەرەو کۆشک بوومەوە . بە بێدەنگی لەسەر جێگەکەم لێی ڕاکشام تاکو سبەینێ . بەیانی ئامۆزای ژنم بە ئاگای هێنام ... دەروانم قژی خۆی بڕیوە . بەرگی ڕەشی پۆشیوە..
پێی وتم :
ئامۆزا لێم مەگرە . هەواڵیان بۆ هێناوم کە : دایکم مردووە و باوکیشم کوژراوە . یەکێك لە براکانیشم مار پێوەی داوە . ئەوی تریان بووە بە ژێر خانووی رووخاوەوە ! ماڤی خۆمە ، تازیە بار بم .

منیش وتم : چی دەکەیت : ئازادیت و مافی خۆتە .

ئامۆزا ساڵێکی بەم حاڵە بردە سەر. داوای کرد گومەزێکی لە کۆشکدا بۆ دروست بکەم. وتیشـــی : تێیدا ، دەچمە خەڵوەتی خەمەوەو ناوی گومەزەکەیش دەنێم ( خەم خانە ) .

منیش وتم : بە سەر چاوان

خانوویەکم بۆ کرد و گۆڕیچەیەکم بۆ دروست کرد و گوومەزێك ، بە سەری یەوە. کەنیزەك و خزمەتکارم بۆ دانا...!

کۆیلە رەشەکەش ، لەو رۆژەوەی ئەو شمشێرەم لێدابوو. ئیدی قسەی بۆ نەدەکرا .. تەنیا دەیخوارد و دەیخواردەوە . ژنەکەیـشم رۆژی دوو جـاران ، بـە دیـواری ماڵەکەیـدا هەڵدەزنا و خواردن و خواردنەوەی دەدا پێی . منیش دانم بەخۆدا گرت و هەڵس و کەوتیم پشت گوێ خست .

رۆژێ لە رۆژان خۆم بە ژووری ئامۆزادا کرد .

گوێم لێی بوو دەگریا و لەبەر خۆیەوە دەیوت :

*ئەی رۆحی رەوان ، ون بووی لە چاوان . هاورێ بۆ نام دوێنی ؟*

ئەم شیعرەی وت :

ئێسك و پروسکم لەگەڵ خۆ ببەن  دواتر بمنێژن: لە هەرکوێ لادەن
خڕەی ئێسکانم : وڵامەبۆتان  لەسەرگۆڕەکەم گەر بانگم بکەن !
بــووژانەوەی من نزیکیتانە  دووریتان مەرگ و گریان و شیوەن

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٨**

شەهرەزاد وتی :

ئــەی پاشای بەختیار.. خــاوەنی بڕیار..

مێردە وتی :

کە لەگریان و ئەو قسانە بوومەوە ، پێم وت :

ئامۆزا هێندە مەگری .خۆ گریان سوودی نییە . وەڵامی دایەوە : ڕێگرم مەبە.. دەنا خۆم دەکوژم! بێدەنگیم لێکرد و لێی دوور کەوتمەوە . بۆ ساڵی دووەمیش هەر تەعزیەبار بوو. ڕۆژێکیان کە زۆر تووڕە بووم . خۆم کرد بە ( گوومەز )کەدا ، سەیر دەکەم ڕووی لە گۆڕیچەکەکە کردووە و دەڵێت : گەورەم بۆچی گوێم لە دەنگت نییە؟ یەك وشەیش ناڵێیت و وەڵامم نادەیتەوە؟

بەم شێوەیە لاواندی یەوە :

جوانی و شۆخێنیت پێ نەهێشت ئەی گۆڕ    تەڕ و پاراویت پێ نەهێشت بە زۆر
بۆ تـــۆ : ئاسمان و زەویت پێکەوە    لە خۆت گرتووە ئاوا : مانگ و خۆر؟

بۆ خۆم تووڕە بووم ، کە ئەمەشم بیست هێندەی دی تووڕە بووم و پرسیم :

ئەم خەمە تاکەی درێژە دەکێشێ ؟ منیش ، ئەم هۆنراوەیەم وت :

ئەی گۆڕ: برینی سارێژ بووەوە؟    یا رووناکیەکەی کز بوو..چووەوە؟
خۆ تۆ: نەناو و ، نە ( تیپانە )[1]یشی    پشکۆ وگڕ و تەڕ چۆن لێژ بووەوە؟

هەر کە ئەمەی بیست راست بووەو وتی :

(بەلا)م دا لێت ، کەوابوو : ئەمە کاری تۆ بووە؟ تۆ بریندارت کردووە . ئەوە سێ ساڵە : نە دەمرێت و نە چاك دەبێتەوە .

منیش پێم وت : بەڵێ ئەوە کاری منە!

شمشێرم لێ هەلکێشا کە سەری بپەڕێنم ! کە زانی : دەمەوێت بیکوژم . وتی : لاچۆ..

ئەوەی چوو..

چوو و ناگەڕێتەوە : ئەمە خوا لە چارەی نووسی بووم . ئاگری سینەم دانامرکێتەوە !

هەندێ ورتە ورتی کرد کە من تێی نەگەیشتم و وتی : *برۆ بەم سیحرە با نیوەت مرۆڤ بێت و نیوەت بەردی رەق بێت !!*

ئیدی ئاوام لێهات ، کە دەم بینی . نە دەتوانم هەستم نە دەتوانم دابنیشم ! نە زیندووم و نە مردووم !!

شارەکەشی بە سیحر... ئاوا لێکرد . کە ئەوسا .. پڕ بوو لە (نەسارا) و (موسلمان) و (جوولەکە) و (ئاگر پەرست) . هەمووی کردن بە ماسی .. سپی یەکانیان موسوڵمانەکانن.. سوورەکان مەجووسی ئاگرپەرستەکانن ! شینەکان نەساران! زەردەکانیان جوولەکەکانن.( ٤ ) دوورگەکەشی گۆڕیوە : بە( ٤) شاخ . رۆژی ( ١٠) تووڵم لێدەدات ! شان وپشتم شەقار شەقار دەکات . خوێن بە گیانمدا دێتە خوار و دواتر کەوڵێکم لەبەر دەکات و ئەم جلە جوانانەیش بە سەریدا ! ئاوایش خۆی لاوانەوە :

سەبووریم بدە کە حوکمت وایە    خۆ من هەر رازیم بە هەر قەزایە
زۆرداریان کرد، پۆزیشیان لێدا    بەڵکو تەعویزمان : وا لەو دنیایە
نەهامەتی هات: رۆژی تارکردم    پەنام بە خوا و بە مستەفایە

پاشا وتی :

باری پەژارەمت گرانتر کرد! بەڵام ئەی لاو.. ئەو گۆڕیچە و گوومەزە و ئامۆزایەت لە کوێن ؟

لاوەکە وتی :

لەقەلایەکدا، لەگۆڕیچەکەیدا راکشاوە. سەر لە بەیانی هەموو رۆژێك ئامۆزاکەم دێت وجلو

---

(١) ـ تیپانە : قابلەمە یان مەنجەڵ .

بەرگم دادەکەنێت و بە قامچی دەکەوێتە لێدانم . ئیدی منیش توانای بەرگری کردنم لەخۆم نیە ، کە لە پەل و پۆ کەوتم . خواردن و خواردنەوە دەبات و دەڕوات بۆ لای کۆیلە ڕەشەکە .

پاشایش وتی :

پەیمان بێت ئەی لاو : سبەینێ کارێکی پێ بکەم . تا ماویت بیگێڕیتەوە و مێژوویش بینووسێت. شەو تا درەنگ قسەیان پێکەوە کرد .کە ڕۆژ بووەوە . پاشا جلەکانی گۆڕی و شمشێری لە خۆی بەست و بەرەو قەڵاکە بووەوە . ناو ژوورەکانی گەڕا .. تاکو کۆیلە ڕەشەکەی دۆزیەوە ، بە شمشێرەکەی کوشتی و لاشەی برد و فڕێی دایە ناو بیری حەوشەکەوە . دوای ئەوەی بەرگی کۆیلەکەی پۆشی و لێی ڕاکشا و شمشێرەکەشی بە ڕووتی بە تەنیشت خۆیدا ڕاکێشا. دوای سەعاتێك ( ساحیر)ی نەفرەتی هات و جلوبەرگی لەبەر داکەندو کەوتە لێدانی کوڕە مامی .

لاوەکەش هاواری لێ هەستاو وتی :

هێندەم بەس نییە؟ دە ..بەزەیت پێمدا بێتەوە .

ژنەکەشی وتی :

ئەی نەدەبوو .. تۆیش بەزەییت بە مندا بهاتایەوە و دۆستەکەمت ئاوا لێ نەکردایە ؟ هێندەی لێدا : تا... خوێن لە نێو چاوانیەوە هاتە خوارێ . کەوڵەکەی لەبەرکرد و بەرگە جوانەکانیشی بە سەریدا لەبەر کرد . خواردن و خواردنەوەی بۆ کۆیلە ڕەشەکە برد و ڕۆیشت .

کە گەیشتە ئەوێ . کەوتە لاوانەوە و لە خۆدان و وتی :

گەورەم ، قسەم بۆ بکە .. بم دوێنە!

ئەم هۆنراوەیەیشی بۆ خوێندەوە :

| | |
|---|---|
| سەرچاوەی ئەشکم وا چۆڕایەوە | کەچی: بێ مەیلیت هەر نەبڕایەوە |
| دوورەپەرێزیت کە بە ئەنقەستە | بۆیە برینم : نوێ کرایەوە |

پاشایش کە لە شوێنی کۆیلە ڕەشەکە ڕاکشا بوو، بە دەنگێکی لەرزۆك و بە شێوە زمانی ڕەش پێستان وتی :

ئاخ .. ئاخ ..لاحول ولا قوة الا بالله العلي العظيم .

کە ژنە گوێی لە دەنگی بوو .. قیژەیەکی لەخۆشیدا کرد و بوورایەوە .

کە بەئاگا هاتەوە وتی :

گەورەم ... ئەوە قسەت لەگەڵ کردم ؟

پاشایش بە دەنگێکی لاواز وتی :

نەفرەتی ، هێندە بە سووکم دادەنێیت .. قسەی چیت لەگەڵ بکەم ؟

ژنـــەکە وتی : لەبـــەر چی ؟

ئەویش وتی :

مێردەکەت .. هێندە دەناڵێنێت و نزامان لێدەکات . ئیدی شەو تا ڕۆژ دەبێتەوە دێتە خەوم و ناهێڵێت بحەوێمەوە ! ئەگەر نا دەمێك بوو چاك بوو بوومەوە . هەر بۆیەش جاران وەڵامم نەدەدایتەوە .

ژنـــەکە وتی : ڕێم بدە ، بچم و چاکی بکەمەوە .

پاشاش کە لە گۆڕیچەکەدا ڕاکشابوو وتی :

*زووکە ... ڕزگاری بکە ... بـــا ئێمەش بحەوێینەوە .*

ژنە هەستا و بەرەو کۆشك بووەوە . کە گەیشتە لای ئامۆزای مێردی ... قاپێك ئاوی هێنا و بەسەریدا خوێند . ئاوەکە ..کەوتە : بڵقە بڵق و کوڵا.

ئەمجا پرژاندی بە سەری مێردەکەیداو وتی :

*لەبـەر خـاتری ئـەوەی خوێنـدم ، گـەر بـە سیحر و مـەکری مـن وات لێهـاتووە ، ئـەوا بگەڕێیەوە ، شێوەی ڕەسەنی خۆت !*

ئـامۆزا.... خـۆی ڕاوەشـاند و هەسـتایە سـەر پـێ و زۆر دڵخـۆش بـوو بـە ڕزگـار بـوونی . پەلاماری ژنەکەی دا .

ئەویش پێی وت : ون بە لەبەر چاوم ... جارێکی دی نەت بینمەوە! دەنا... دەتکوژم .

ژنە سیحربازەکە گەڕایەوە ناو قەڵاکە و چووەوە لای گۆڕیچەکەکەو وتی :

گەورەم ... ئیدی تۆیش لە گۆڕیچەکە وەرە دەرەوە ، تاکو بە چاك بوونەوەت شاد ببم !

بە هەمان شێوە پاشا وەڵامی دایەوە :

( بەڵا )م دا لێت : هەی نەفرەتی .. ئاخر ماسی یەکانی چوار دوورگەکەیش ..هەر کە نیوە شەویان لێ دێت سەر بڵند دەکەن و لە خوا دەپاڕێنەوە و نزای خراپمان لێ دەکەن . پێم وایە ، هەر ئەوەیشە ناهێڵێت زوو بە زوو چاك ببمەوە..خێراکە ، بـڕۆ ئـەوانیش ڕزگـار بکە..جا.. کە گەڕایتەوە دەستـم دەدەمـە دەسـتت و هەڵدەستمەوە و ئـەم کـارەت شـیفام بـۆ دێنێ !

ژنە کە هەر وای دەزانی ، ئەوەی ناو گۆڕیچەکە کۆیلە ڕەشە و خۆشەویستەکەیەتی وتی :

بە ناوی خوا و هەستایە سەر پێ و وتی : هەر ئێستا...

چوو، سیحرەکەی لە سـەر لا بـردن و هاوڵاتیـان ... کەوتنـەوە کار و شاخەکان بوونـەوە بـە دوورگەکان و بە پاشای وت : دەستەکانت بێنە و هە ستە !

پاشا بە دەنگێکی نزم وتی :

لێم نزیك ببەوە !

کە ژنە سیحربازەکە خۆی نزیك کردەوە . شمشێرەکەی چەقاندە سنگی و لە پشتی یەوە

دەرچوو.

هەستا و ژنەکەی کرد بە دوو بە شەوە و فرێی دایە سەر زەوی . کە هاتە نێو حەوشە لاوەکەی مێردی بینی ، بەرەو رووی هات و باوەشی پیا کرد و دەستی ماچ کرد و زۆر سوپاسی کرد .

پاشا لە لاوەکەی پرسی :

لە شارەکەی خۆت دەمێنیتەوە . یان شوێنم دەکەویت و دێی بۆ وڵاتی من ؟

لاوەکە وتی :

پاشاگیان : دەزانیت نێوان ئێرە و وڵاتی تۆ چەندە؟

پاشا وتی : دوو رۆژ و نیومان پێ دەچێت!

لاوەکە وتی :

ئەو رێگایە هی کاتی شارە سیحر لێکراوەکە بوو. هۆشت وەبەر خۆت بێنەوە..ئێستا ئەو رێگایە بە ساڵێك دەبڕیت ! منیش بۆ ساتێك لێت دوور ناکەومەوە .

پاشایش زۆر دڵخۆش بوو وتی :

سوپاس بۆ خوا ، کە بە تۆی گەیاندم ..چونکە من کوڕم نییە .

باوەشیان کرد بە یەکدا و بەرەو کۆشك بوونـەوە . لاوەکە فەرمانیدا کاروانی سەفەری ( ١٠) رۆژە رێ بار بکەن . بە رێکەوتن و خەیاڵیشی لای شارە جوانەکەی بوو.( ٥٠) کۆیلە و دیارییەکی زۆریان پێ بوو. ئیدی ساڵێکی رەبەق بەڕێوە بوون .

خوا پاراستنی تاکو گەیشتنەوە وڵاتی سوڵتان و نوێنەریان نارده شار، تاکو هەواڵی گەیشتنیان بگەیەنێت .

وەزیر و لەشکر دوای ئەوەی دەستیان لە پاشا شت بوو . بە خۆشحاڵی یەوە چوونە پێشوازیان . ئیدی پاشا چووەوە سەر تەختی پاشایەتی و وەزیران و سەرانی دەربار بە خێریان هێنایەوە و ئەویش بە سەرهاتی ئەم لاوەیشی بۆ گێڕانەوە .

دواتر فەرمانیدا ماسیگرەکەی بۆ بێنن . کە هێنایان هەواڵی پرسی و فەرمانیدا پاداشتی باشی بدەنەوە .

ماسیگرەکەیش پێی وتن : کە کوڕێك و دوو کچی هەن . پاشایش فەرمانیدا ئەوانیش بێنن . کچێکیانی لە لاوەکە مارە کرد و ئەوی دی بۆ خۆی . سوڵتانی نارده وڵاتی لاوەکە کە دوورگەی رەش پێستان بوو. ماسیگرەش بووە یەکێك لە هەرە دەوڵەمەندەکانی شار .

بەڵام ئەم بەسەرهاتە عەجایب تر نییە لە چیرۆکی حەماڵەکە .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

بەسەرهاتی حەمال و سێ کچەکە

**شەهرەزاد وتی :**

ئـــەی شا شەهریار... خـــاوەنی بڕیار...

دەگێڕنـــەوە : پیاوێکی ڕەبەن هەبوو، یەکێك بوو لە حەماڵە "بارهەڵگر"ەکانی شاری بەغدا. ڕۆژێکیان لەبەر بێکاری شانی لەسەر زەمیلەکەی دادابوو. کاتێکی زانی کیژێك کە بەرگێکی ئاوریشیمن و دامێن هێلێکی دووراوی موسڵی لەبەردابوو، بە زمانێکی شیرین بە حەماڵی وت :

*زەمیلەکەت بێنە و شوێنم بکەوە .*

ئەمیش کە بڕوای بە خۆی نەبوو، خێرا شوێنی کەوت و لەبەر خۆشیەوە وتی :

*ڕۆژێکی شادمانی یە . خوا بەخێری بگێڕێت...!*

تا گەیشتە بەر دەروازەیەك و کیژە لە دەرگای دا . پیاوێکی نە سرانی کردیەوە و کچەکە دینارێکی دایە و بڕێ زەیتونی لێ وەرگرت و کردی یە زەمیلەی حەماڵەکەوە .

ئەمجا وتی : هەڵی بگرە و وەرە ..

حەماڵەیش لە دڵی خۆیدا وتی :

ئەمڕۆ ڕۆژێکی پیرۆزە و پڕە لە بەختەوەری .

زەمیلەی هەڵگرت و شوێنی کەوت . لەبەر دوکانی میوەفرۆشێکدا وەستا. سێو و بەهێی عوسمانی و قۆخی عومانی و لیمۆی میسری و نارنجی سوڵتانی و هەندێك شتی تریشی کڕی و کردی یە زەمیلەی حەماڵەکەو وتی : هەڵی بگرە .

حەماڵەیش هەڵیگرت و شوێنی کەوت .

ئەمجا گەیشتنە لای ( قەساب )ێك بەویشی وت :

(١٠) کیلۆ گۆشتم بۆ بکێشە .

گورزەیەك مۆزیشی کڕی . هەندێ ناوکە فستق و کاکڵە گوێزو لوقمە قازییشی کڕی .

بە حەماڵەکەی وت : شوێنم بکەوە .

زەمیلەی حەماڵەکە زۆر قورس بوو بوو . بۆیە بەکیژە نازدارە جوانەکەی وت :

بمزانیبا ..... هێندە شت دەکڕێت گوێرێژم دەهێنا.

کچەکە پێکەنی و دەستێکی بە سەر شانیدا دا و وتی :

خێراکە وکەم بڵێ . خوا یار بێت بە پارەی خۆت دەگەیت . لای بۆن فرۆشێ وەستا وگوڵاو و مسك و کلۆ کژنیژ و داری عوود و عەنبەر و مۆمدانێکی ئەسکەندەرانی کڕی و کردی یە زەمیلەکەوەو وتی : شوێنم بکەوە .

ڕۆیشتن تا گەیشتنە بەر کۆشکێکی جوان ، بەردەم فراوان . دەرگای گەورەی دوو

دەروازە . لە دار ئەبەنوسی ناوازە . کیژە جوانەکە پەچەی لەسەر روو لادا.. لە دەروازە
دا. حەماڵیش سەرنجی ئەو نازەی دا .

دەروازە کرایەوە و کیژێکی باڵا ناوەندی زۆر جوان دەرگاوان بوو و وتی :

دەی .. ( خوشکاشە ) وەرە ژوورە و بارە گرانەکەی ئەو حەماڵە هەژارە ، دابگرە خوارەوە!

ئەمانیش رۆیشتن تا گەیشتنە هۆڵێکی پان و پۆڕ.. بە پەنجەرەکانیەوە.. پەردەی شۆڕ.
لە ناوەراستی دا گۆمێکی گەورەی مەلە و لە لێواریدا جۆلانەیەکی لە داری ( عەرعەر )،
نەخشاو بە سیمی زەردی وەك گەوهەر. بە سەریدا ، پەردەیەکی تەنکی ئەتلەسی رەنگ
سوور هاتبووە خوار! کیژۆڵەیەکی تێدا بوو ، هێندە جوان بوو، وەك ئەستێرەی ئاسمان بوو.
بزوێنەری هەستی شاعیران بوو.

کیژی سێ یەم ..لەسەر جۆلانەیەك دانیشت بوو.

بەرەو دوو خوشکەکەی چوو و پرسیی :

بۆ راوەستاون !؟ سەبەتەکە لەسەر ئەو حەماڵە داماوە دابگرن .

کیژەی کرپارو دەرگاوان لە دواوە سەبەتەکەیان لەسەر سەرداگرت . شتەکانیان دەرهێناو
هەریەکەیان خستە شوێنی خۆی .

(٢ ) دیناریشیان دایە حەماڵەکە و پێیان وت :

برۆ، بـــەلای کارتەوە .

ئەویش سەیری ئەم کیژەو خواردن و خواردنـەوە و بۆن و شیرینی یانـەی کـرد . سەری
سوورما وجووڵەی نەکرد .

کچێکیان پرسیی : ئەوە دەچیتە ؟ بۆ نارۆیت ؟ دەڵێی : کرێکەت کەمە ؟

ئەمجا رووی کردە خوشکەکەی و وتی : دینارێکی تری بدەرێ .

حەماڵەکەش وتی :

خانم ، کرێ یەکەم کەم نییە ! بەڵام ژیانی ئێوەم پێ سەیرە ! ئێوە هەر خۆتـانن و چۆن
کەس نییە.

دەمەتەقێی لەگەڵ بکەن؟ بۆ خۆتان دەزانن کە مێز لە سەر چوار کۆڵەکە نەبێت ناوەستێت!
ئێوە کۆڵەکەی چوارەمتان نییە ..!

ئەوەتا .. شاعیرێك وتویەتی :

بۆ کەیف وسەفا چوار شت دیارە — (چەنگ) و( عوود) ( قانون) ( زوورنا) لەبارە
بۆ شادی مرۆڤ تەنیا ئەم چوارە — (مەی ) و ( نەی) .( ئاواز) لەگەڵ (دینار)ە

ئێوەش سیانن ، چوارەمتان دەبێت ، پیاوێکی ژیر و بیرتیژ و نهێنی پارێز بێت .

سێ کیژەکە ئەمەیان بیست : سەریان سوورما و تێر پێکەنین وتیان :

ئەو پیاوە کێ بێت ؟ کە ئێمە دەترسین بە نهێنیمان بزانێت و ئاشکرای بکات..؟

پێشینان وتوویانە :

ئەگەر نهێنیت کەوتە سەر زاریَ دەچۆڕێتە گوێی دانیشتووی شاریَ

کە حەماڵەکە ئەمەی لیَ بیستن ، وتی :

بە سەری ئێوە : من پیاوێکی ژیر و جێی متمانەم . چەندین کتێبی زانستەکان و مێژووی پاشا و میرانم خوێندوومەتەوە . شاعیرێك وتویەتی :

نهێنی پارێز خاوەن متمانە هەڵ بژێرراوە و سرِی پەنهانە

ژووری نهێنی من داخراوە و شوێنی کلیلی کەس پیَ نەزانە

کە ئەوەیان لیَ بیست پێیان وت :

ناهێڵین لامان بمێنیتەوە ، مەگەر خاوەن رەوشتێکی رەسەن بیت و لە هیچ نەپرسیت !

ئەگەر وا دەرنەچوویت ، زۆر خراپ لێت دەدەین و دەریشت دەکەین !

حەماڵەکە وتی :

*بە دڵمە و لە ئێستا بە دواوە : زمان لە دەممدا نییە .*

(خوشکاشە) ناوقەدی خۆی بەست . مەی و میوە و سەوزە لە سەر لێواری حەوزەکە ریزکرابوو. هەر کە کەوتە سەما : لە دڵان خەمێك نەما ..! حەماڵیش ، وەکو ئەوان ( مەی )ی نۆش کرد .

مەی گێرِیش پێکێکی دیی دایە و وتی :

فەرموو پێکێکی تریش بنۆشە تا:بۆ نەخۆشیش کە شیفا بەخشە

ئەویش بە سوپاسەوە وەری گرت و بە ( خوشکاشە )ی وت :

لەگەڵ یەکێکدا بنۆشی چاکە کە وەك پەرِەی گوڵ خاوێن و پاکە

خوێنی هەر شتێك بخۆیت حەرامە تریَ یەك نەبیَ : دەردیَ لەم خاکە

پیاڵەی پرِ کردەوەو دایە دەستی خوشکە ناوەنجی یەکەی . ئەویش بە سوپاسەوە وەری گرت: بۆ خوشکی سەر جۆلانەشی تێکردەوە .

حەماڵەکەش کە نۆشی کرد وتـــی :

پێکێکی دیم بۆ بێنە لەو مەیەی دەڵێی خوێنە

نۆشی ژیـــانم ببیَ و لەم خەمە دە رم بێنە

حەماڵەکەش پیاڵەکەی پرِ کردەوە و دایە دەست کیژە خانەخویَ و وتی :

لەبەردەروازەت کۆیلەی تۆی لیَ یە بۆ کرِنووشی تۆ سەری لای پیَ یە

کیژەش بە حەماڵەکەی وت :

بەو خوایە .. کەسێك پێش تۆ نەبوو ، ئاوا : خەیاڵی خۆشی پیَ بەخشی بم و تەندروستی کردبم !!

حەماڵەکەش زیاتر لێی چووە پێش . کیژەیش هاتە نێو خۆشکەکانی و دەستیان کردە

خواردنـەوە و كـات بـە سـەربردن و گـۆرانی وتـن . كـە حەمالەكـەش خـەیالی خۆش بوو، پاڕایەوەو داوای لیّ كردن كە بە خزمەتكار وەری بگرن !

ئەوانیش وتیان :

هەر كەسێك لێرە بێت : دەچێتە ژێر ركێفی یاساكانی ئەم ماڵەوە و هەرچی یەكی بینی ، نابێت لە هۆیەكەی بپرسێت !

حەمالیش وتی : بە دڵمە ..

ئەوانیش پێیان وت :

هەستە ئەو نووسینی سەر ئەو دەرگایە بخوێنەوە .كە بە ئـاوی ئاڵتوون نوسراوە. هەڵمەقورتێنە كاری خەڵكەوە ... با نەبیت بە قسەی زۆر بێ كەڵكەوە .

حەماڵەكە وتی :

ئێوە بە شایەت بن ، كە هەرگیز خۆم هەڵناقورتێنمە كارێكەوە، پەیوەندی بە خۆمەوە نەبێت !

خوشكاشـە هەسـتا و سـفرە و خـوانی ئامـادە كـرد و نانیـان خـوارد . مۆمیـان داگیرسان و گوڵاویان پرژاند.

مێز و مەی و پیاڵەیان دانایەوە و بۆ ماوەی سەعاتێك كۆڕیان بەست . دواتر لە دەرگا درا. كیژێكیان هەستا ودەرگای كردەوە وتی :

ئەمشەو كۆڕەكەمان بێ خەوش بوو.

ئەوانیش وتیان : چۆن وا دەڵێیت ؟

ئەویش وتـــی :

( ٣ ) قولەرش قەلەندەری سەروسمێڵ و برۆ تاشراو هاتن! هەریەكەیان چاوی چەپی كوێرە موشەیە..! كە بە دەگمەن شتی وا رێدەكەوت..! لەوەیش دەچێت ئەوانە لە رێی دوورەوە هاتبن و ئێستا گەیشتوونەتە بەغداد. شوێنیان دەست نەكەوتووە بۆیە لە دەرگای ئێمەیان داوە! كە رێیان بدەین لە تەویلەی خۆیشماندا بێت : بنوون . ئەوانە ئـامۆن ، كەس زۆر لە خوشكەكانی تری پاڕایەوە بۆیان...

ئیدی ئەوانیش وتیان :

با بێنە ژوورەوە، بەڵام پێیشیان بڵێ : هەڵنەمەقورتێننە كاری خەڵكەوە..تا نەبن بە قسەی زۆر بێكەڵكەوە .

كچەكە زۆری پێ خـۆش بـوو. هـەر سێ ( لاركوێر)ەی دایـە پـێش بـەرەو كۆڕەكـەیان . سڵاویان كـرد و ئـەوانیش بـەخێریان هێنـان و دایـان نـان . ئـەوانیش سـەرنجیان دایـە ئـەم شوێنە پاكە... ئەم هەموو میوە ومەی و پیاڵە و خواردنە چاكە !.. ئا...ئەو( ٣ )كیـژە جوان

و بێ باکە...!!

قەلەندەر وتی : بەخوا چاکە .

سەرنجی حەماڵیان دا، ور و سەرخۆشە ، هەندێ خەریکی بوون .

پرسییان :

تۆیش وەکو ئێمە قەلەندەریت ، نامۆ و بیابان نشینی ؟

کە حەماڵ ئەمەی لێ بیستن . چاوی پێدا گێران و وتی :

بێدەنگ دانیشن و لووت وەر مەدەنە کاری کەسەوە ! وەکو میوانی ناوەختیشن : نووسراوی سەر دەرگاکەشتان نەخوێندووەتەوە؟ زمان درێژیش دەکەن .

ئەوانیش وتیان : تۆبــە...پەشیمانین ، سەرمان لەبەر دەستت دایە !

کچان دەستیان کردە پێکەنین پێیان . قەلەندەر و حەماڵیان ئاشت کردەوە و خواردنیان بۆ هێنان .

دواتر کیژەی دەرگاوان..( مەی ) و پیاڵە و ( شەراب)ی بۆ دانان . ئەوانیش دەستیان کرد بەخواردنەوە .

حەماڵ رووی تێکردن و پرسیی :

ئەرێ .. ئێوە چیرۆکێ . یان بەسەرهاتێکی سەیرتان لا نی یە بۆمان بگێرنەوە ؟

ئەوانیش سەریان گەرم و خەیاڵ بوون . داوای ( دەف ) و ( عوود) و (چەنگ )ی عەجەمیان کرد.قەلەندەر هەستا و ئامێرەکانی کۆك کرد . هەر یەکەیان ئامێرێکیان بە دەستەوە گرت و کەوتنە ژەنینی ئاواز. کیژەکان لە خۆشیدا دەیان قیژاند . هێندەی پێ نەچوو لە دەرگا درا.... دەرگاوان هەستا تا بزانێت ، کێ لە دەرگا دەدات ؟

شەهرەزاد وتی : پــاشاگیان ...هەی رۆحـــی رەوان ...

بـە رێکـەوت ، ئـەو شـەوە خەلیفـە هاروونـە رەشـید لەگـەڵ جەعفـەر و مەسـروری شمشێرباز بە شاردا دەگەڕا. تا لە نزیکەوە لە هەواڵی ژیانی هاوڵاتیان بەئاگا بێت .

خەلیفـە کردبـووی بـە خـوو هەنـدێ شـەو خـۆی دەگـۆڕی و دەگـەڕا . ئـەو شـەوە لـەو گوزەرەوە بوون . کە گوێیان لەو ئاواز و گۆرانیەی نێو ئەو کۆشکە بوو.

خەلیفە بە جەعفەری وت :

حەز دەکەم : بچینە ئەم ماڵە و لە کۆڕی ئەو ئاواز و گۆرانی یەدا بین .

جەعفەری وەزیریش وتی :

ئەی میری موسڵمانان ، ئەوانە خەڵکانێکن : سەرخۆش و بەدمەست ..دەترسم زیانمان پێ بگەیەنن !

خەلیفەیش وتی :

هەر دەچینە ژوورەوە ، جا وا باشە فێڵێك بۆ چوونە ژوورەوەمان بدۆزیتەوە .

جەعفەریش وتی : بەسەر چاوان .
چووە پێش و لە دەروازەی داو کیژە دەرگاوانەکە .. دەرگاکەی کردەوە .
ئەبو جەعفەری وەزیر دەستی پێکردو وتی :
خـانم .. ئێمـە چـەند کەسێکی بازرگانی شاری (تەبەریـە)یـن . ئـەوە ( ١٠ ) رۆژە لەم
بەغدایەین ، چی کالآیەکمان هێنـابوو، فرۆشتمان . لە خـانی بازرگانـان مابووینـەوە . ئەم
ئێوارەیە بازرگانێك بانگهێشتی ماڵی خۆی کردین و تێری کردین ، شەو هاتینە دەر . چونکە
نامۆین بەم شارە : رێی بەرەو خانەکەمان هەڵە کردووە و بە ئومێدی بەزەیی ئێوە لەم
دەرگایەمان دا . بەلکو ئەمشەو جێمان بکەنەوە . خوایش پاداشتتان بداتەوە .
دەرگاوان ، سەیری جلوبەرگی نایابی بازرگانانـەی کـردن . چووە ژوورەوە بۆ لای دوو
خوشکەکەی .
قسەکەی جەعفـەری بۆ گێڕانـەوە . ئـەوانیش زۆر بـەداخ بـوون بۆیـان و وتیـان : با بێنە
ژوورەوە .
خەلیفە وجەعفەر و مەسرور چوونە ژوورەوە ..
کیژان لەبەریان هەستان و بەخێریان هێنان و وتیان :
میوان ، وەبان چاوان .... تەنیا مەرجێکمان هەیە بۆتان .
ئەوانیش وتیان :
*مەرج هەر چۆن و چەندە ... لای هەمووومان پەسەندە !*
کیژانیش وتیان :
*خۆ هەڵمەقورتێننە کاری خەڵکەوە ... با نەبن بە تووش قسەی بێ کەڵکەوە .*
میوانە کانیش وتیان : بە چـــاوان .
تێکەڵ بەکۆڕی مەستان بوون . خەلیفە سەرنجی ( ٣ ) قەلەندەریەکەی دا . هەر سێکیان
چاوی چەپیان کوێر بوو . زۆری لاعەجایب بوو ! سەیری ئەو( ٣ ) کیژە شۆخ و شەنگەیشی
کرد دیسان سەری سوڕما! مەستان : فەرموویان لە خەلیفە کرد ، بۆ مەی نۆشین !
ئەویش وتی : نیازمە ، ئەمساڵ بچمە حەج و مەی ناخۆمەوە .
دەرگاوان سفرەی رەنگاو رەنگی خواردنی راخست . گۆزە ناوی خستە سەر و بەفری
تێکرد .
خەلیفە سوپاسی کرد و لە دڵی خۆیدا وتی :
*سبەینێ لە سەرا پاداشتی ئەم مەردایەتی یەی ئەمانە دەدەمەوە !*
خانمێ کە خزمەتیانی دەکرد ، کاری نەما و دەستی ( خوشکاشە )ی گرت و وتی :
خوشکە .. *با : بچین قەرزەکانمان بلحینەوە !*
دوو خوشکەکەی دی وتیان : بەڵێ بـــاشە .

دەرگاوان ..پێشیان کەوت و ڕۆیشتن . دوای ئەوەی سفرەو دەوروبەری لە پاشماوەی تونکڵ و خواردن پاك کردەوە . مۆم و بخووردی داگیرسان . قەلەنـدەرێکی بـردە بەرهەیوانێك و ئەبو جەعفەر و خەلیفە و مەسروریشی بردە بەر هەیوانێکی دی .

شیراندیشی بە سەر حەماڵەکەدا و وتی :

چەند بێ بـەزەییت ! خۆ تۆ نـامۆ نیـت و خانـەخوێی! حـەماڵ خۆی گورج کردەوەو پرسیی : چیت دەوێت ؟

کیژەیش وتی : لە شوێنی خۆت بوەستە .

خوشکاشە لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا کورسی یەکی داناو بە حەماڵەکەی وت :

یارمەتیم بدە .

ئەویش دوو دەڵە سەگی ڕەشی ڕست کراوی بینی .

ئەمجا پێی وت : بیان گرە !

ئەویش بۆی گرت و کیژەی خانەخوێ ، قامچی یەکی هێنا و وتی :

سەگێکیان بهێنە بەردەمم .

کە سەگەکەی بردە بەردەمی . سەگە دەگریا و سەری بۆ کیـژە دەلەرزاند . ئـەویش کەوتـە قامچی لێدانی تا هەموو سـەرو چاوی خوێنـاوی کـرد. هێنـدەی لێدا مەچـەکەکانی مانـدوو بوون . کیژە قامچی یەکەی فڕێدا و باوەشی بە سەگە ڕەشـەکەدا کـرد و بـە سـەریدا گریـا و سەری ماچ کرد .

بە حەماڵەکەیشی وت :

ئەمەیان بگرە و ئەوی دی بێنە بۆم .

کە حەماڵەکە ئەوی دی هێنایە بەردەست . ئەویشی بـە هـەمان شێوە ئەشکەنجە دا و بـۆی گریا و سەری ماچ کرد . ئیدی ( خەلیفە ) ئارامی لەبەر هەڵگیرا و دەیویـست ، هـەواڵی ئـەم دوو سەگە بزانێت .

چاوێکی لـە (جەعفـەر) داگـرت . جەعفـەریش مەرجەکەی بـیری خـستەوەو داوای لێ کـرد بێدەنگ بێت .

کیژە ، بە کچە دەرگاوانەکەی وت : هەستە و چیت لە سەرە : بیکە .

ئەویش وتی : بە چـــاوان .

هەستا و چووە سەر ئەو چرپایەی کە لە داری ( عەرعەر) دروست کرابوو. نەخشی زێڕینـی لێدرابوو. بە ( خوشکاشە ) و دەرگاوانیشی وت :

چیتان هەیە بیهێنن .

دەرگاوان لە سەر کورسی و لای خۆیەوە دانیشت . خوشکاشەش خۆی کرد بە گەنجینەدا و تووڕەکەیەکی ئەتلەسی هێنا کە هێڵەکانی سەوز و گرێچنی زێڕ بوو . ئامێرێکی (عوود)ی

دەرهێناو ژێ یەکانی کۆك کرد .. ئەمەی وت :

خــەو بۆ چاوانم بگێڕنەوە        ژیریی هەڵاتووم بۆ بێننەوە
پرسییان بۆچی دابڕاون لێت؟        وتم : تۆراون بیان هێننەوە

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٠**

شەهرەزاد وتی :

ئــەی پاشای بەختیار... خــاوەنی بڕیــار...

کە کیژە جوانەی خانەخوێ ئەو گۆرانی یەی بیست ( ٣ ) جاران وتی :

ئــاخ ... ئــاخ ... ئــاخ ..!!

بەرگی لەبەر خۆیدا دادڕی و لە هۆش خۆی چوو . ( خەلیفە ) لەشی رووتی بینی ... جێگای قامچی پێوە دیار بوو . زۆر عەجایەبی لێهات ! کیژە دەرگاوان ، ئاوی بە دەم و چاودا پرژاند و بەرگی تری بۆ هێنا و گۆڕیی . هەموویان خەریکی بوون و پەژارەیان بۆ خوارد . بێ ئەوەی چیرۆکی ئەم کیژە بزانن !

خەلیفە لەجەعفەری پرسی :

تۆ چ گومانێك لەم کیژە و لەو شوێن قامچی یانەی سەرپشتی دەکەیت ؟ من ئارام ناگرم تا هەواڵی ئەمە و ئەو سەگە رەشانە نەبیستم !

جەعفەر وەڵامی دایەوە :

مەرجیان بۆ داناوین کە هەڵنەقورتێنینە کاری خەڵکەوە.. با نەبین بە تووشی قسەی بێ کەڵکەوە .

کیژۆڵە ناسکەکە وتی : خوشکە گیان .. دەست پێ بکە .

خوشکاشە ( عوود )ی خستە سەر سینە ...کەوتە ئەم تێچرینە :

گلەیی دووریت کە ئاوا دەکەین        ئەدی پەنامان لە بۆ کوێ ببەین؟
بە تەتەرماندا سکاڵامان نارد        تاکو : بە تاسەی دڵی خۆ بگەین
وشك بووینەوە بەخەمت کەچی        نوقمی فرمێسکی سوێری دوو جۆگەین
ئەی نادیاری دوورە دەست ئەوا:        بۆ وێنەت دڵ و گیان دەڵێن جێگەین

کە گۆرانی یەکە دووبارە بووەوە ، کیژۆڵەکە هاواری کرد : بە خوا خۆشە ..! جارێکی دی کراسی بەری دادڕیەوە و بوورایەوە و کەوتە زەوی . دیسان خوشکاشە ئاوی بەدەم و چاویدا پرژاند . تاکو بە ئاگای هێنایەوەو کراسێکی دی لەبەر کردەوە .

کیژە چووەوە جێی خۆی و دیسان داوای لەخوشکەکەی کرد :

دەی .. گۆرانی یەکەم بۆ تەواوبکە .. چونکە هەر ئەمەم پێ دەبڕێت .

ئەویش ( عوود )ەکەی خستەوە سەر سنگ و بە هەمان ئاواز ، دەستی پێکردەوە :

سەرچاوەی ئەشکم: وا چۆڕایەوە کەچی بێ مەیلیت هەر نەبڕایەوە
دوورەپەرێزیت بە ویستی خۆتە بۆیــە برینم : نــوێ کرایەوە
ئەم هۆنراوەیـەی بیـست . بۆ جاری سێ یـەم یەخـەی خـۆی دادڕیـەوەو بوورایـەوە و کەوتە سەر زەوی .
قەلەندەر کە ئەمەی بینی وتی :
خۆزگە .. لە کەلاوەیەکدا بنووستینایەو ئەم دیمەنە جەرگ بڕەمان نەبینیایە !
خەلیفە ئاوڕی لێدانەوە و پرسیی : ئەمە بۆ وایە !؟
ئەوانیش وەڵامیان دایەوە : ئێمەش سەرگەرمی گەیشتنین بەم نهێنی یەین !
خەلیفە پرسیی یەوە :
ئەی .... ئێوە خەڵکی ئەمماڵە نین ؟
قەلەندەرەکانیش وتیان :
نــە ء ... نــە وەڵڵا ، ئێمەش کەمێك پێش ئێوە .. هاتووینە ئەم ماڵەوە !
خەلیفە بە سەر سووڕمانەوە وتی :
بێگومان ئەم پیاوە ، هەواڵیان دەزانێت !
ئەوانیش چــاویان لە ( حەماڵ )ەکە داگرت و ئەویش لە وەڵامدا وتی :
*هەموومان بێ ئاگاین ! من لە بەغدادا گەورە بووم ، ئەمڕۆ . ئەم ماڵەم بینیوە !*
ئەوانیش وتیان :
گەر لەگەڵ ئەوان بیت و ئەم نهێنیە نەزانیت ، ئەوا خوا بتگرێت .
خەلیفەیش وتی :
ئێمە (٧ ) پیاوین ، ئەوان (٣) کچن . لە خۆیـان بپرسـن . وەڵامیـان دایـەوە ئـەوە باشـە . ئەگەر نا... ئەوا بە زۆر لێیان دەردێنین !
ئیدی هەمووان لە سەر ئەو بڕیارە رێکەوتن .
جەعفەر وتی :
من لەگەڵتان نیم ، ئاخر ئێمـە میوانی ئـەوانین ! وازیـان لـێ بێـنن باشـە . کاتی خـۆی ئەوان مەرجیان بۆ ئێمە دانابوو ، ئێمەش پەسەندمان بوو . شەو هێندەی نەماوە ، با هەر یەکەمان بە لایەکدا بڵاوەی لێ بکەین !
چاوێکی لە خەلیفەش داگرت و پێی وت :
سەعاتێکی شەو ماوە ، سبەینێ ، بانگیان بکە بۆ سەرای حوکمڕان و چیرۆکەکەیان پێ بگێڕەوە .
خەلیفە شیڕاندی بە سەریانا :
ئــاخر .. ئارامم لەبەر هەڵگیراوە ! ئــاخر با قەلەندەر لێیان بپرسێ .

جەعفەریش وتی : ئەوە هەر قسە نی یە !
کەوتنە دان و سان و بڕیاریان دا کە حەماڵەکە لێیان بپرسێ .
کیژەی خانەخوێ لە کۆڕەکەی پرسیی :
خەڵکینە ئەوە بۆچی سەرتان لێ تێکچووە ؟
حەماڵەکە وتی :
خانمەکـــەم .. ئەمانـــە ، دەیانـــەوێت ، هـــەواڵی ئـــەو دوو ســـەگە ڕەشـــە بـــزانن و بەسەرهاتەکەیان ببیستن !
بشزانن بۆچی خوشکەکەت بە قامچی لێیان دەدات ؟ و بڕۆ بەخێر هاتی...
کیژەی خانەخوێ پرسیی : بەڕاستتانە؟
جەعفەر نەبێت ، هەموویان وتیان : بەڵێ .
کیژە پێیانی وت :
بەراستی ئەی میوانان ، ئازارێکی زۆرتان بە من گەیاند ! باشە ئەی ئێمە مەرجی هاتنە ژوورەوەمان بۆ دانەنان؟ پێمان نەگوتن :
*هەڵمەقورتێنە کاری خەڵکەوە... تا نەبن بە تووش قسەی بێ کەڵکەوە !*
ئەوەندە بەس بوو، بۆتان کە بـە میـوان رامـان گرتـوون . نـانی ئێمـەتان خـوارد و نەمەکتان کردین ! تاوانی ئێوە نی یە .. تاوانی ئەوانەیە کە ئێوەیان بە ئێمە گەیاند .
( ٣ ) جاران پێی بە زەویدا داو وتی : خێرا بکەن .
دەرگایەکی بەردینی ئەستوور کرایەوە و ( ٧ ) قولەرەشی دەست بە شمشێر هاتنە دەر . فەرمانی پێدان : ئەو چەنەبازانە : دوو دوو بە یەکەوە قۆڵبەست بکەن .
ئەوانیش کارەکەیان جێبەجێ کرد و وتیان :
خانم رێمان بدە : سەریان بپەڕێنین .
کیژۆڵەی خانەخوێیش وتی :
سەعاتێك مۆڵەتیان دەدەین ، بـا... خۆیان پێم بناسێنن . دواتر لە گەردنیان بدەن .
حەماڵەکە بانگی کرد :
خوا سایە پۆشت بێت خانم من کە هەڵەیەکم نەکردو ئەوان پرسیاریان کـردووە ، ئیـدی من بۆ بکوژرێم !؟ بەو خوایە ئەم قەلەندەرانە ، نەبوونایە میوانمان . ئەم شەوە خۆشـەمان لێ تێك نەدەچوو! ئەمانە بچنە هەر شارێکەوە : کاولی دەکەن ! ئەم هۆنراوەیەشی وت :
لێ بووردن خۆشە: لە بێ دەسەڵات تایبەت لە یەکێك کەس خەمی نەخوات
توو: ئەو پیرۆزییەی لە نێواندایە ڕفتان دۆ ودۆشاو: با تێکەڵ نەکات
کیژە دەستی کردە پێکەنین و هاتە لای کۆمەڵەکە و وتی :
هەواڵی خۆتانم پێ بڵێن . یەك سەعاتتان لە ژیاندا ماوە ! گەر ئێوە لـە دەوڵەمەنـدان و

سەرانی مەملەکەت نەبوونایە . ئەتان دەوێرا پرسیار بکەن .
خەلیفە بە جەعفەری وت :
بەڵا لێت بدا ، با زمانت شیرین بێت .. پێیشیان بڵێ : من کێم ! تا .. بە هەڵە نەیان کوشتووین .
جەعفەر بە لاقرتێوە وتـی :
لێ گەڕێ .. هەر ئەوە دەهێنێت !!
خەلیفە لێی تووڕە بوو پرسیی :
ئاخر ... ئێستا کاتی سوعبەتە ؟
کیژەش چووە لای قەلەندەرەکان و لێی پرسین : ئێوە بران ؟
ئەوانیش وتیان : نەخێر ..... ئێمە عەجەم و هەژارین .
لە یەکێکیانی پرسی : تۆ هەر بە ( لارکوێر )یی لە دایك بوویت ؟
ئەویش وتی :
نەخێر... بەسەرهاتی لە دەست دانی ئەو چاوەم : هێنـدە عەجایبـە کە گوڕ وایـە .. بە ئاوی ئاڵتوون بنووسرێ و بنەخشێ ... تا سوود بە هەمووان ببەخشێ !
یەکە ... یەکە لە دوانەکەی تری پرسی ... ئـەوانیش بـە هـەمان شێوە وەڵامیـان دایـەوە . هـەموویان تێیـان گەیانـد ، کـە هەریەکـەیان کـوڕە پاشـا و حـاکمێکن و لـە مەملەکەتێکەوە هاتوون .
کیژە پێی وتن :
هەر یەکەتان ، بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە : کە بۆچی گەیشتوونەتە ئێرە ؟ کە لێ بووەوە: هەر دوو دەستی بە سەریەوە ، دەگرێت و دەڕوات بە ڕێی خۆیەوە .
یەکەم کەس ، حەماڵەکە دەستی پێکرد :
من حەماڵیم دەکرد . ( خوشکاشە ) دوای خۆی خستم و لە ماڵی ( نباز) هێنامیـە دەر و بەرەو دوکانی ( قەساب ) و لەوێوە بۆ دوکانی میوەفرۆش ، ئەمجا بۆلای چەرەس فرۆش و شیرینی فرۆش. دوکانی بۆن فرۆش . دواتر بۆ ئـەم ماڵە ! ئیـدی ئەمـەم بـە سەرهات کە دەیبینی و السلام .
کیژۆڵەی خانەخوێ بە پێکەنینەوە وتی :
*دەست بخە : سەرسەرت و برۆ بەرێی خۆتەوە...*
حەماڵەکەیش وتی : بەخوای بانی سەر.. ناڕۆم : تا بە سەرهاتی ئەوانی دی نەبیستم ..!
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

## چیرۆکی قەلەندەری یەکەم

شەهرەزاد وتی :

دەگێڕنـــەوە : ئـــەی پاشای بەختیار.... خـــاوەنی بڕیار ...

قەلەندەری یەکەم ، چووە پێشەوە و وتی :

خانمەکەم .. باوکم و مامەم دوو پاشای ، دوو شاری جیاواز بوون . وا ڕێکەوت کە دایکم و ئامۆژنم لە یەك ڕۆژدا ... هەر یەکە و کوڕێکی بوو . سالان ڕۆیشت .. من و ئامۆزاکەم گەورە بووین . زوو زوو سەردانی ئامۆزاکەم دەکرد.. ئەویش ڕێزی دەگرتم و مەڕی بۆ سەردەبڕیم .

جارێکیان .. هەردووکمان دەمان خواردەوە و خەیاڵ بووین ...

پێی وتم :

ئـــامۆزا .. من پێویستی یەکی فرەم پێتە ، بۆ ئەو کارەی دەمەوێت بیکەم .

منیش وتم :

هەر چییەك بە من بکرێت .. بە بـــان چاو.

قورئانی دام .کە لە سوێندە گەورەکانە . بۆ یارمەتی دانەکەو هەستاو ڕۆیشت . هێندەم زانی ژنێکی دوای خۆی خست بوو و گەڕایەوە لام. سەرنجمدا ژنـە هێنـدەی خشڵ پێوە بوو کە بایی پارەیەکی فرە بوو.

ڕووی کردە من و وتی :

ئەم ژنە ببە بۆ فلان گۆڕستان ، بیخە گۆڕیچەیەکەوە و چاوەڕێم بکە ... تاکو دێم !

لەبەر ئەوەی سوێندی گەورەم خوارد بوو . نەمتوانی ئەو کارە نەکەم و قسەی بشکێنم . ژنەکەم لەگەڵ خۆم گەیاندە ئەو گۆڕستانەی ئەو بۆی وەسف کردبووم و پێکەوە لە گۆڕێکی هەڵکەندراودا دانیشتین .

هێندەی پێنەچوو: ئامۆزاکەشم پەیدا بوو . قاپێك ئاو و توورەکەیەك گەچ و پاچێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو . چووە ناوەڕاستی گۆڕستانەکەو گۆڕێکی هەڵدایەوە و بەردەکانی هێنایە لامان.

کەوتە هەڵ کەندنی گۆڕە هەڵکەندراوەکەی کە ئێمەی تێدا بووین . دەرگایەکی ئاسنینی دۆزیەوەو کردیەوە .... پەیژەیەکی پێوە بوو.

ڕووی کردە ژنەکە و وتی : بە دەست خۆت نییە هەڵبژێریت .

ژنەکە بە پەیژەکەدا چووە خوارەوە .

بە منیشی وت :

ئـامۆزا .... ئێستا منیش دەچمە خوارەوە . دوای مـن دەرگاکە دابخـەرەوەو گۆڕەکە

دابپۆشەوە ، ئەوە گەچیشم بۆ هێناویت . ئەومش تەشتێك ئاومو گەچەكە بە ئاوەكە بگرەوەو چوار دەوری گۆڕەكە بەو بەردانە هەڵبچنەوە . ئەوە ساڵێكە لێرەدا شەوانە كار دەكەم . ئەم هێشتووە كەس پێم بزانێت ! كە ئەومت كرد، بگەڕێوە . ئەمەیش بوو تەنیا ئیشەكەم بە تۆ..!!

منیش چۆنی پێ وتم وام كرد . لە كاتێكدا وەكو بەدمەستێك وڕ وكاس بووم . گەڕامەوە كۆشكی مامم . مامیشم لە ڕاو و شكار بوو ... ئەو شەوە لێی نووستم . كە ڕۆژ بووە كەوتمە بیر كردنەوە ، لە ئامۆزاكەم . پەشیمان بوومەوە ، لە یارمەتی دانی . پێم وابوو ، خەونم بینیوە . ڕۆیشتم و گۆڕستانەكەم دۆزی یەوە و گۆڕ بە گۆڕی گۆڕستانەكە گەڕام .

ئەو گۆڕەم نەدۆزیەوە كە گەڕامەوە هیچم نەخواردو هەر بیرم بەلای ئامۆزاكەمەوە بوو.

ئەو شەومیش بە خەفەتەوە سەرم نایەوە . ( ٧ ) ڕۆژ من گۆڕستانەكان گەڕام .. بەڵام بێ سوود بوو.

كە بێ ئومێد بووم ، گەڕامەوە ماڵی خۆمان . گەیشتمە شارەكەی خۆم . خێرا قۆڵبەستیان كردم . زۆرم پێ سەیر بوو! ئاخۆ.. چۆن دەبێت كە دەست و پێوەندەكانی باوكم من بگرن!؟ هەر چەند پرسیم ... وەڵامیان نەدامەوە .

دواتر یەكێك لە خزمەتكارەكانم، لەپەناوە پێی وتم :

زەمانە غەدری لە باوكت كرد و وەزیرەكەی ڕاپەڕینی دژی كرد و باوكتی كوشت و ئێستا لە جێی دانیشتووە و پاشایە . فەرمانی بە ئێمەش داوە ، كە تۆمان بینی بتگرین !

ئێمەش بە شوێنت دا دەگەڕاین .

كە منیان برد لە هۆش خۆم چوو بووم . لە كۆنەوە ڕقەبەرایەتیم لەگەڵ وەزیردا بوو . لەبەرئەوەی ئارەزووی ڕاو وشكارم هەبوو.. جارو بارێك دەچوومە سەر بانی كۆشك و بە تیرو كەوانەكەم ، ڕاوی باڵندەم دەكرد .

ڕۆژێكیان لە سەربان بووم باڵندەیەك بەسەر بانی كۆشكی ئەم وەزیرەوە نیشتەوە. منیش تیرێكم تێ گرت و نەم پێكا. قەزاو قەدەر وابوو چەقی بە چاوێكی وەزیردا و كوێری كرد. منیش ئەمەم وت :

هەڵەیەكمان كرد لەسەرمان نووسرا     بەسەریشماندا ڕۆیی و تێپەڕا
مرۆڤ نسیبی كام خاك و ئاو بوو     لەوێ مردووە و لە گۆڕیش نرا

چونكە لە كاتی ئەو ڕووداوەدا باوكم پاشای شار بوو. نەی دەتوانی تۆڵەم لێ بكاتەوە . بەڵام ئەو دوژمنایەتی یە هەر لە دڵدا مابووەوە . كە بە قۆڵبەستی منیان بردە بەردەمی یەكسەر. فەرمانیدا لە ملم بدەن !

منیش پرسیم : لەبەرچی دەمكوژیت !؟

وەزیریش لە وەڵامدا دەستی برد بۆ چاوە كوێرەكەی و وتی :

لەمە تاوانتر، هەیە !!؟

منیش وتم : ئـەوە ، هەڵەیە بوو ، رووی دا وبڕایەوە .

وەزیریش وتی :

ئەگەر تۆ بە هەڵە بەم دەردەت لێ کردم ... من بە ئەنقەست : تۆڵەت لێ دەکەمەوە .

فەرمانیدا : بی هێننە پێشەوە .

کە نزیکیان کردمەوە . وەزیرەکە پەنجەی درێژ کردوکردی بـە چاوی راستم دا .. تاکو دەری نەهێنا.. کۆڵی نەدا...!!

ئیدی لەو کاتەوە لارکوێرم ، وەکو دەم بینن .. فەرمانیدا : با شمشێردار بمخاتە سندوقێکەوە و بم باتە دەری شار و لەوێ لە سەرم بدات و لاشەکەم جێ بێڵێت بۆ باڵندەکان تاکو بمخۆن .

( شمـشێردار) بـەو شـێوەیە مـنی گەیانـدە دەرەوەی شـار و چـۆڵەوانی ... لـە سـندووقی دەرهێنام و چاوی بەستمەوە ، تاکو لە ملم بدات و بمکوژێت . ئیدی منیش هێنـدە بە کوڵ گریام ، ئەویش لەگەڵ مندا دەستی کردە گریان .

ئەم شیعرەیشم خوێندەوە :

زوو بۆ بەرگریم ئێوە قەڵا بوون ئێستاش بۆ گیانم ئێوە بەلابوون

نە لە نەیاران دەمان پـارێزن نە لەدوژمنان دەم بە هەڵا بوون

ئێوە هەر وەکو تیری ئاراستە تەنیا بۆ سنگی من بەرەڵا بوون

شمـشێردار کـە سـەردەمی باوکیـشم ( جـەلاد )ی مەملەکـەت بـوو. چـاکەی زۆرم بـە سەریەوە هەبوو.

بۆیە وتی :

با بەندەی فەرمان پێدراویش بم ... کاری وام بەرامبەر بە تۆ پێ ناکرێت ! پیاوی چاك بە ، وا ئازادم کردی. تۆیش سەری خۆت هەڵگرە و ئەم شارە جێ بێڵە . منیش و خۆیشت لە مردن رزگار بکە. ئەم شیعرە جێ بەجێ بکە :

کە تووش بوویت گیانی خۆت بکرەوە ماڵی وێران بووت لە بیر بەرەوە

خانووبەرەکەت : هەر دەبێتەوە گەر تیاچوویت ئاڵایت بەزەرمەرەوە

شێریش بێ و ملی ئەستوور بێت هیچە پاڵپشتی نەبوو ، گەر لە دەرەوە

دەستم ماچ کرد و رزگار بووم لە مل پەڕاندن و خەمی ( لارکوێر)ی یەکەمی ، لە بیر بردمەوە.

شارم جێ هێشت و بەرەو شاری مـامم بوومـەوە . باسـی تیاچوونی بـاوکمم و کوێر بوونی چاوی راستمم بۆ گێڕایەوە .

مامەم گریانێکی بە کوڵ گریاو پێی وتم :

مەلۆیەکی ترت ، خستە سەر خەرمانی خەمم . ئاخر .. ئامۆزاکەیشت ون بووە و نازانم چی لێ بەسەر هاتووە..؟ کەسێکیش هەواڵێکی ئەوی بۆ نەهێناوم .

هێندە گریا تاکو بوورایەوە ، ئیدی منیش سەرەڕای خەمی خۆم ، خەمێکی زۆریشم بۆ مامم خوارد . مامم ویستی چاوم تیمار بکات ، بەڵام تێیان گەیاند کە تیمار کردن سوودی نییە . منیش ئیدی نەمتوانی بێدەنگ بم ...بۆیە بەسەرهاتی کوڕەکەیم بۆ گێڕایەوە .

کە ئەم هەواڵەی بیست زۆری پێخۆش بوو، وتی :

هەستە ئەو گۆڕستانەم پێشان بدە .

منیش وتم :

مامە گیان منیش بۆم نادۆزرێتەوە ، چونکە چەندین جار بە تەنیا چووم و سوودی نەبووە .

پێکەوە چووین . سەیری ئەملا و ئەولام کردو دۆزیمەوەو زۆر دڵمان خۆش بوو. دەرگاکەمان دۆزیەوە و پلەیەك بە پەیژەکەدا چووینە خوار . هەر دابەزین دووکەڵێك پەیدا بوو.

مامم وتی : لا حول و لا قوة الا بالله العلي العظيم .

ڕۆیشتین ، ڕۆیشتین .. تاکو گەیشتینە هۆڵێك پڕ بوو لە ئارد و گەنم و خواردن و خواردنەوە . لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا(سەکۆ)یەکمان بینی . چرپایەکی لەسەر بوو .کە مامم سەیری چرپاکەی کرد. کوڕەکەی و ئەو ژنەی بینی کە کاتی خۆی لەگەڵیدا بوو. بەڵام ..دەتوت ، لە تەنووردا دانراون . بوو بوون بە خەڵووز .

مامەم تفێکی لە کوڕەکەی کرد وتی :

هەر ئەمە دەهێنیت. ئەمە سزای ئەم دنیاتە. سزای ئەو دنیات ماوە ، کە لەمە توندترە !

( قەلەندەر ) کەمێ بێدەنگ بوو و وتی :

مامم پێڵاوەکەی داکەند و کێشای بە کوڕەکەیدا .

منیش زۆرم پێ سەیر بوو! وتم :

*مامە گیان ، ئەو رقە لە دڵت دەربکە .. من خەریکە دڵم بتەقێت لە تاو ئامۆزاکەم و ئەم کیژە ، کە ئاوا : بوونەتە کۆی زووخاڵ . تۆیش پێڵاویان پێدا دەکێشیت !*

ئەویش وتی :

بـرازا .. ئەم کوڕەم هەر لە منالی یەوە ، ئالوودەی خوشکەکەی بوو . منیش ڕێگریم دەکرد.

لەدڵی خۆیشم دا دەم وت : ئەمانە منداڵن و مەترسی یان نی یە ! کە گەورە بوو بە توندی لێم دا و بەرهەڵستم کرد و پێم وت :

ئەم کارە ، تێپەڕێنە ، تاکو لە نێو پاشایاندا ، بەنزم و ناوازە: ناو نەبرێیت ! تا دنیا

دنیایە ، ناوت لە ناوانا نەبێت ! گەر واز نەهێنیت لە خوشکەکەت دەتکوژم .
لە یەکم دوور خستنەوە . تووەمز .. کچە خیانەتکارەکەشم ئەوی خۆش دەوێت ! ئیدی
دیارە ئەویش ئەم شوێنەی بۆ خۆی و خوشکەکەی بە دزی منەوە دروست کردووە . هەموو
پێداویستی بۆ بردووە و ئازوخەو خواردنی خستووە ! هەلی چوونە راو و شکاری مندی
قۆستۆتەوەو خوشکەکەی هێناوەتە ئێرە..!
ئیدی ڕقی خوایان بەسەردا رژاوە و ئاوا بوونەتە .. کۆی زووخاڵ ! سزای ئەو دنیای
یەزدانیش .. لەم سزایە توند و تیژترە !!
دەستی کردە گریانێکی بە کوڵ ، منیش لەگەڵیدا دەستم کردە گریان .
سەیرێکی کردم و وتی :
ئێستاش ، تۆ کوڕی منیت و دەتخەمە شوێنی ئەم کوڕەم . گۆڕە هەلکەندراوەکەمان پڕ
کردەوەو گەڕاینەوە . من هەر بیرم بەلای کوژرانی باوکم و لەدەست دانی کورسیی دەسەڵات
و جەرگ سووتاویی مامەمە وە بوو. گەیشتینەوە کۆشك و هێشتا ماندووییمان دەرنەچوو
بوو کە گوێمان لە دەنگی تەپڵ و بۆقی یە و گەرمنابوو . چاومان لە شمشێری هەلکێشراو و
رمێکی زۆری بێ کۆتابوو ، تەپ وتۆزێك بوو . چۆن بڵێیت وابوو!
هەر سواران بوون ئەسپیان : سمکۆڵان دەکەن ... دەست و یەخەن و واتا تاڵان دەکەن!
ئێمەش سەرا سیمە بووین ! ئەمان دەزانی چی بکەین !؟
کە هەواڵم پرسی وتیان :
سوپای وەزیـرە کۆنەکەی باوکتە و هێندە زۆرن لە ژمارە نایەن . گالیسکەگەلێکی
جەنگیی فرەو پیادەیەکی زۆری هێناوەتە سەر شارەکەمان . هێزیش نییە رێگەیان پێ
بگرێت ! لە پڕدا داویانە بە سەر شارەکەدا و دانیشتوانیش بەرگریان لە خۆیان پێنەکراوە و
شارەکەیان داوە بە دەستەوە ..! مامەم لە شاردا مایەوە و منیش لە ترساندا هەڵاتم بەرەو
کەناری شارو بە خۆم وت : بەردەستی بکەوم .. دەمکوژێت .
ئیدی پەژارەکەم گرانتر بوو ، تیاچوونی باوکم و ئامۆزاکەم و مامەم بیر کەوتەوە و
زانیم . گەر لە شاردا بمێنمەوە . سەربازانی وەزیر ، دەمناسنەوە و دەمگرن و تیادەچم . بە
بیرمدا هات : سەرو سمێڵم تاشی و جلوبەرگی هەژارانم لەبەرکرد و هاتمە ئەم شارە .. لە
کەسێك دەپارێمەوە بمگەیەنێتە دیوەخانی ( میری موسڵمانان ) . بۆ ئەوەی چیم بەسەر
هاتووە ، بۆی بگێڕمەوە .
ئەمشەو گەیشتمە ئەم شارە و ئەم کۆستەیەی ترم بینی و سڵاوم لێ کرد و وتم :
نـامۆم .. بەم شارە .
ئەویش وتی : منیش !
ئێمە لەم قسانەدا بووین ، کە ئەم کۆستەیەی دی سڵاوی لێ کردین و وتی :

من کەسێکی نامۆم بەم شارە .

شەو تاریکتر بوو . ئێمەش بە ڕێدا دەهاتین . تاکو قەدەری خوا بەرەو ئێوەی هێناین .

ئا بەو شێوەیە چاویان دەرهێنام و سەر و سمێڵم تاشرا..!

کیژەی خـــانەخوێ وتی :

*دەست بخە سەر سەرت و برۆ بەرێی خۆتەوە !!*

ئەمیش وتی : بە خوا نـــارۆم ... تاکو بەسەرهاتی ئەوانی دی ، نەبیستم !

ئیدی ئەوانی تر هەموویان سەریان لە قسەکانی سوڕمابوو.

خەلیفەش وتی :

بەو خوایە ، بە سەرهاتی وەکو ئەوەی کۆستەم نەبیستووە و نەبینیوە !

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٢**

چیرۆکی قەڵەندەری دووەم

شەهرەزاد وتی :

دەگێڕنـــەوە : ئـــەی پاشای بەختیار.... خـــاوەنی بڕیار...

(کۆستە )ی دووەم : هاتە پێش وکڕنووشی برد و وتی :

خـــانم ... مـن بـە ( لارکـوێر )ی لـە دایـك نـەبووم و بەسـەرهاتێکی سـەیرم هەیـە..!!

دەهێنـێ بـە ئـاوی ئـاڵتون بنووسـرێت . مـن کـوڕە پاشا بـووم و قورئـانم بـە هـەر( ٧) ریوایەتەکەیەوە خوێند بوو. چەندین کتێبم خوێنـد بوو! لەوانـە زانستی ئەستێرەناسی . کۆششم لە هەموو زانستەکاندا دەکرد . تاکو لە نێو زانایانی دەورووبەرمدا پێشەنگ بووم . دەست و خەتم لە هی هەمووان نایاب تر بوو . شیعری شاعیرانم خوێنـد بـوو. لە نێوەنـدی هەرێمەکاندا لەسەر زمانان بووم . ناوبانگم گەیشتە لای پاشای ( هیندستان) و دیاریی بۆ باوکم نارد و بانگهێشتی منی لێ کردبوو . باوکم ( ٦) پاپۆڕی بۆ ئامـادە کـردم و ڕەوانـەی کردم . مانگێك بەسەر دەریاوە بووین .

دواتر لە وشکانیدا کاروانمان خست . باری ( ١٠) وشتر دیاریمان پێ بوو . ماوەیەك کاروان بەرێدا ڕۆیشت .

ڕۆژێکیـان هێندەمان زانی تەپ و تۆز بـەری ڕۆژی گـرت . دوای نزیکـەی سـەعاتێك ئـەو تەپ و تۆزە ڕەوی یەوە . (٥٠) سوار دەرکـەوتن . مەچـەك وەك ئاسـن و زرێ پـۆش . بۆمـان دەرکەوت کە ئەمانە عەرەبی جەردە و ڕێگرن . ڕێبواران رووت دەکەنەوە. کە ئێمـەیان بـە (١٠) باری وشترەوە بینی و زانیان ژمارەمان کەمە پـەلاماریان دایـن و تـەورێکی دوو دەمیـان هاویشتە نێوانمانەوە . ئێمەش زمانیانمان نەدەزانی . بە ئیشارەت تێمان گەیاندن کە ئەمانە دیاری پاشای ( هیندستان )ن . ئازارمان مەدەن ! ئێمە نوێنەری ئەوین .

ئەوانیش وتیان :

ئێمە لە زەوی ئەودا نین ... تاکو لە سایەی حوکمڕانی ئەودا بین .

چەند خزمەتکارێکیان لێ کوشتین ! منیش بە برینداریەکی سەختەوە لەگەڵ ئەوانی تردا هەڵاتم ! ئەوان سەرقاڵی ئەو هەموو دیاری یە بە نرخەکان بوون و کۆڵیان لە ئێمەدا... ئەوە بوو بە سەنگینی و ڕێزەوە هاتم و بە ڕسوایی و سەرشۆڕیەوە ڕۆیشتم و خۆیشم نەمدەزانی بۆ کوێ بچم ..!!؟

هەر ڕۆیشتم ، تا گەیشتمە سەر کێوێکی بڵند . چوومە ئەشکەوتێکەوەو لێی نوستم تاکو بەیانی . بەرە بەیان دەستم بە ڕۆیشتن کردەوە ، تاکو گەیشتمە شارێکی ئارامی پارێزراو بە دیوارێکی بڵندی چواردەور گیراو . چوومە ناو شار ئاو و هەوایش فێنك بوو و وەرز بەهار بوو. دار و درەخت چرۆیان کرد بوو و دەشت و دەر بە گوڵ ڕازابووەوە . ئەو هەرێمە ئاوێکی فرەی بوو. بولبولان ئاوازیان دەچڕی ، هەر وەکو چۆن شاعیرێك دەڵێت :

هەوارچیی تیایە دیاری یەکە بۆ    نیشتەنی ناوی بە بێ گفتوگۆ
دەڵێی بەهەشتی ڕەنگینە ئێرە    هێندە پێی شادن : هەر مەپرسە تۆ

کە زۆر ماندوو بووم ، دڵخۆش بووم . خۆم کرد بە دوکانی بەرگدووریەکدا و سڵاوم لێکرد . بەخێری هێنام و زۆر ڕێزی گرتم و هۆی نامۆ بوونی لێ پرسیم . منیش لە نووکەوە بۆم گێڕایەوە . زۆری پەژارە بۆ خواردم و ئامۆژگاری کردم :

کوڕی لاو، هێندە بەسەرهاتی خۆت بۆ ئەم و ئەو مەگێڕەوە . چونکە پاشای ئەم شارە زۆر ڕقی لە باوکتە و تۆڵەی لای باوکتە . شەو بردمیەوە و تێری کردم و جێگایەکی لە سووچێکی دوکانەکەیدا بۆ سازکردم و( ٣ ) شەو تێیدا مامەوە .

دواتر لێی پرسیم :

ئەرێ ، هیچ پیشەیەك نازانیت ؟

منیش وتم : فەقێ و زانام ، خۆشنووس و ژمێریارم .

ئەویش وتی :

پیشەکەت لای ئێمە بازاڕی نییە ! خەڵکی ئەم شارە ، هەر پارە پەیدا کردن دەزانن .

منیش وتم : دە .. بە خوا ، لەوانە بەولاوە ، هیچ پیشەیەك نازانم .

ئەویش وتی :

کەواتە خۆت توند بکەرەوە و تەوراس و گوریسێك بەرەو بڕۆ بۆ شاخ و دار بکە .. تا خوا دەروویەکت لێ دەکاتەوە !! مەهێڵە کەس بتناسێت ، با نەتکوژن !

( تەور) و ( تەوراس ) و ( گوریس )ی بۆ کڕیم . دەستی دام بە دەست چەند دار فرۆشێکەوە . ئامۆژگاریشی کردن ، کە ئاگایان لێم بێت . ئەو ڕۆژە داری خۆم کرد و بە گوریس بەستم و دام بە کۆڵمدا و هێنامەوە شار و کۆڵە دارەکەم فرۆشت بە دینارێك و

نیوەیم خەرج کرد و نیوەیم هەلگرت .

ساڵێکی رەبەق ئەمە پیشەم بوو.

رۆژێکیـــان : وەکو جاران چوومە دەشت ، بۆ دار کردن . چاڵێکم بینی ،کە دارێکی زۆری تێدا بوو، منیش پێیدا گەڕام و بنـەدارێکی ئەستوورم بینی . دەوریـم دایـەوە ، تـاکو هـەڵی بکـەنم . لـە ناکـاو تەورەکـەم لـە هەڵقەفەیـەکی مـس گیـرا..! گڵەکـەم لەسـەر لادا و دەرگـا و دیوارێکی خشتم بینی ! دەرگاکەم کردەوە ، پەیژەیەکم بینی و پێیدا چوومە خوارەوە .

دەرگایەکی ترهاتە رێم و ئەویشم کـردەوە . دەروانم کۆشکێکە لەسـەر جوانترین شێوە دروست کراوە . کیژێکی تێدا بوو ، زۆر ناسك و نازدار و جوان بوو.

لەبەر خۆمەوە وتم : سوبحان الله بۆ دروستکەری .

ئەویش کە منی بینی پرسیی : تۆ مرۆڤیت .. یان جنۆکە؟

منیش وتم : مرۆڤم .

پرسی یەوە :

کێ تۆی گەیاندە ئێرە ؟ (٢٥ ) ساڵە لێرەم و کەسێکم نەبینیوە !

منیش بۆم گێڕایەوە :

چۆن .. چۆنی هاتوومەتە ئێرە . ئەمەی منی بە لاوە گران بوو.

وتی : منیش چیرۆکی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە .

دەستی پێکردو وتـــی :

ئەوە بزانە کچی شا ( ئەمیتامووس )م .. خاوەنی دوورگەی ( ئەبەنووس )م . باوکم لـە ئـامۆزای خـۆمی مـارە کـردم . شـەوی بـووکێنی ( دێـو )ێـك .. کـە (جـەرجیس)ی کـوڕی (رەخمۆس)ی خـاڵۆزای (شـەیتان) بـوو . فڕانـدمی و گەیانـدمی یـە ئێـرە..! هـەر چی یـەك پێویستی ژیان بێت بۆی دەستەبەر کردم .

هەر(١٠) رۆژ جارێك سەرم لێ دەدات . چیم پێویست بێت بۆم دێنێت ! دواترجێم دێڵێت .

پەیمانیشی داوە پێم هەر کاتێك پێویستم پێی بوو . دەست بهێنم بە ئەو دوو دێـڕە نووسینەدا، کە بە سەر ئەو گۆپکە بچووکەوەیەو دەستم هەڵناگرم کە لە بەر دەممدا ئـامادە دەبێت !! ئێستاش ( ٤ ) رۆژی رۆیشتووە و (٦) رۆژی تر پەیدابێت !

دەستی گرتم و لە بەرامبەر دەرگایـەکی کلۆلم دراو و لـە سـەر سەکۆیەك و لـە تەنیـشت خۆیـەوە داینـام ! دواتـر سفرەی بـە خـواردن رازانـدەوە . دوای نـان خـواردنیش سـەعاتێك دەمەتەقێمان کرد .

پێی وتم :

(٢٥ ) ساڵە ، کەسێکم نـەبینیوە . تـەنیا و تـەنیام لەم ژێـر زەوی یـەدا . بۆیـە گفتوگۆ نازانم ، تەنگە چیکەلانەم . ئێستاش سوپاس بۆ خوا کە تۆی بۆ ناردم !

لیی پرسیم : ئەری لەگەڵ خواردنەوەدا چۆنیت ؟
منیش وتم : بە دڵی خۆتم .
چووە گەنجینەکە و شەرابێکی کۆنی سەرمۆری هێنا .. بەدەم خواردنەوەوە ئەمەی وت :
گەر دەمانزانی بە ئێمە دۆستی    پێڵووی چاوانمان بۆ را دەخستی
لە نێو چاواندا هەڵمان دەگرتیت    تاکو بزانیت .. چەند خۆشەویستی
کە ئەمەی بە سەر مندا هەڵدا : سوپاسیم کرد . ئیدی دەمەتەقێمان کرد و پەژارەی بیر بردمەوە . هێندەم خواردەوە تا بەدمەست بووم ! بەم لاو ئەو لادا دەهاتم .
بەکیژەکەم وت :
هەستە با بتخەمەوە سەر زەوی و لەم ( دێو )ە ، رزگارت بکەم .
پێکەنی و وتی : سەیر دەبێت : بتوانیت ..!!
منیش ـ کە زۆر سەرخۆش بووم ـ وتم :
هەر ئێستا ئەم گۆپکەیە دەشکێنم . تۆیش دێوەکە بانگ بکە . چونکە من فێرە ( دێو ) کوشتنم ! کە ئەمەی بیست زەرد هەڵگەڕاو پـــاڕایەوە : شتی وا نەکەیت .
ئـــەم شیعرەی وت :
دەزانی فەلەك کە شەڕەنگێزە    بە قوربان : خۆتی لێ بپارێزە
ئارام بە بەخوا غەدری زەمانە    پشتت تێ دەکا و دەبی یە بێگانە
شەهرەزاد هەستی کرد شەو رەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٣**

شەهرەزاد وتی :
ئـــەی پاشای بەختیار .. خـــاوەنی بڕیار..
کوڕەی دارکەر لە سەری رۆیشت :
دوای شیعرەکە ، شەقێکم لە گۆپکەکە هەڵدا . کاتێکم زانی زەوی لـەری یـەوە و دنیا تاریك بوو . بریسکە پەیدا بوو . منیش سەرخۆشی یەکەم رەوی یەوە .
لێم پرسی : ئەمە چی یە ؟
ئەویش وتی :
دێوەکە گەیشتە سەرمان! منت تووش کرد. خێراکە بەکوێدا هاتوویت بگەڕێوە خۆت قوتار بکە .
منیش هێندە ترسام تەورەکە و تاکێك لە پێڵاوەکەم لێ بە جێما!
لە راکردنـدا و دوای ئـەوەی دوو پلیکانـەی بـەرەو سـەرم بـڕی ، لام کـردەوە ، بینمیم : زەوی قڵیشایەوە و ( دێو )ێك هاتە دەرەوە و پرسیی : چی روویداوە..؟

کیژەش وتـــی :

هیچ رووی نەداوە . دڵم تەنگ بووم و دەستم کردە خواردنـەوە و کەوتم بـە سەرنەم گۆپکە خڕەدا .

دێوەکەیش پێی وت : نـــاپاك ، ئەوە درۆم لەگەڵ دەکەیت !؟

کۆشك گەڕاو پێڵاو تەورەکەی منی بینی و پرسیی :

ئەمە هی مرۆڤە ! کێ هێناویێتی ؟

کیژەش وتی : منیش ئێستا ئەوە دەبینم .. کێ دەڵێت خۆت نەت هێناوە ؟

دێوەکە کەوتە ئەشکەنجەدانی کیژەکە . تا قسەی لێ دەربێنێت ! منـیش لە ترساندا گیانم کەوتە لەرزین . بە پەلە هاتمەوە سەر زەوی و دەروازەکەم داخستەوە و خۆڵمدایـەوە بە سەریدا . دڵیشم هەر لای هاوار و ناڵەی کیژەکە جوان و نازادارەکە بوو و پەشیمان بـووم لەوەی کردم . چۆن ئەم کیژە( ٢٥) ساڵ لە ژێر زەویدا بەرگەی گرتووە؟ ئێستاش بە هۆی منەوە چی بەسەرهات . بیریشم لە رەنجی ساڵێکی دارفرۆشیی خۆم کردەوە .

دەستم کرد بەگریان و وتم :

خۆشی هەتا سەر بۆ کەس نامێنێ          فەلەك گورزی خۆی هەر دەوەشێنێ .

بەرەو شار بوومەوە بۆ لای بەرگدرووو . دەڕوانم ئەویش لای خۆیەوە چاوەڕێمە .

پێی وتم :

دوێنێ شەو خەیاڵم لای تۆ بوو . سوپاس بۆ خوا کە بێوەی گەڕایتەوە .

منـیش سوپاسـیم کـرد و چـوومەوە شـوێنەکەی خـۆم کـە دوکانەکـە بـوو . کەوتمـەوە بیرکرنەوە لەو کیژە جوانە و شەق هەڵدانم لەو گۆپکە بچووکە .

من لەو سێ و دوودا بووم کە بەرگدوورەکە هاتە لام وتی :

پیاوێکی عەجەمی بە تەور و تاکە پێڵاوەکەتەوە چاوەڕێتە . پرسیاری ( تەور) و ( تاکە پـێڵاوە ) کـەی دەسـتی کـردووە کـە ئـەو شـتومەکانە هـی کـێ یـە ؟ دار فرۆشـەکانیش ناردوویانەتە ئێرە ! برۆ (تەور) و ( پێڵاوە )کەی لێ وەربگرە و سوپاسیشی بکە .

منیش کە ئەمەم بیست : زەرد هەڵگەڕام . هێندەی پێ نەچوو کە زەویەکە لە ژێـر پێم دا لەرزی و دێوەکەی لێ هاتە دەر .

توومەز دێوەکە کاتی خۆی توورە بووە و وتویەتی :

دەبێت ئەو مرۆڤە پەیدا بکەم . ئەگەرنا من جەرجیسی کوڕی ئیبلیس نیم ..!!

زۆر گەڕاوە تا چووەتە لای دارکەران و پێی وتوون : کە لە نوێژی بـەیانی بوومەتـەوە . ئەم (تەور) و تاکە ( پێڵاو )ەم دۆزیوەتەوە . نازانم هی کێن؟ ئێوە خاوەنەکەیم پێ بڵێن .

ئیـدی مۆڵـەتی قسە کردنـی نـەدام و پـەلاماری دام و لـە دوکـانی بردمـە دەرەوە . وا بـە خێرایی فڕی و کردمی بە ناخی زەویدا، کە هۆشم بـە خـۆم نـەمابوو . کە بەئاگاهاتمـەوە :

لای کچەکەدا بووم .

دەڕوانم ئەو کیژە جوانە بێ ئاگا کەوتووە و خوێنی لێ دەڕوات . چاوانم پڕ بوون لە فرمێسك . دێوە هێندە کچەی راوەشاند ، تاکو بەئاگا هاتەوە و لێی پرسی :

ئەمە نەبوو . هاتبوو بۆ ئێرە ؟

کچەش سەیرێکی کردم و وتی :

ئەمە یەکەم جارە.. ئەم هەرزەکارە دەبینم !

دوای ئەو هەموو سزایەش . هەر دانی پێدا نەنا..!!

لە سەری رۆیشت و وتی : گوناهە لە خۆمەوە تاوانباری بکەم .

دێوەکە رووی کردە کیژەکەو وتی :

ئەگەر نایناسیت : ئەوە شمشێر و ملی ببەڕێنە .

ئەویش شمشێرەکەی وەرگرت و هاتە ژوور سەرم و وتی :

ئەمە هەمووی بە هۆی تۆوە بوو .

بە شێوەیەك سەیرم کرد ، وەکو ئەوەی داوای لێبوردن بکەم . ئەی گەورەی دێـوان :

چاوێکم داگرت خێرا تێگەیی     نهێنی دڵمی هەر زوو پێ گەیی

فرمێسکی چاوی بە قەتیس ماوی     روومەتیش رەنگی بوو بە پەمەیی

کە ئەم شیعرەم تەواو کرد شمشێرەکەی فڕێ داو وتی :

چۆن سەری کەسێك دەپەڕێنم کە نە خراپەی بۆم بووە و نەدەیناسم؟ بـە هیـچ ئایـنێك راست نییە .

دێوەکەیش وتی :

نە دەستت تێی دەچێت و نە دانیشی پێیدا دەنێیت کە ئەو بووە .

دێوەکە رووی کردە منیش و پرسیی : ئەی مرۆڤ ، تۆ ئەمە ناناسیت ؟

منیش وتم : لە ژیانمدا ئەمەم نەدیوە ... ئێستا نەبێت .

ئەمجا پێی وتم :

کەواتە ... ئەوە شمشێرو تۆ سەری ئەو ببەڕێنە . تاکو منیش تۆ ئازاد بکەم .

منیش شمشێرەکەم بڵند کردەوە لـە کچەکە . کچەش ، وا سـەیری کـردم وەکو ئـەوەی بڵێت : من کەمتەرخەمیم نەکرد لەگەڵت . تۆیش ئاوا روو بە ڕووم دەبیتەوە ؟

منیش چاوم داگرت . وەکو ئەوەی بڵێم بە قوربانت بم . چونکە تۆیش بە قوربانی من بوویت و ئەو هەموو ئەشکەنجەیەت بەخۆت گەیاند :

هەرچەند بێدەنگ بووی چاوت درکانی     لەدڵدا هەرچیت،کردووە پەنهانی

بە برژانگ هەمووی بۆ نووسیمەوە     لە سەر ئاوێنەی هەر دوو چاوانی

فرمێسك لە چاوانم داوەری و شمشێرەم لە دەست کەوتە خوارەوەو وتم :

ئەی دێوەی قارەمان ، ئـازای پاڵـەوان . ئەگەر کچێکی کەم ژیریی و بێ ئـایین ، قایل نەبوو سەری من بپەڕێنێت .. چۆن من دەتوانم سەری ئەو بپەڕێنم !؟ کە نەدیوومـە و نـە دەیناسم ؟ گەر شەرابی مەرگیشم پێ بنۆشیت ، کاری وا ناکەم .

دێوەکە وتی :

نـەخێر ئێـوە یـەکتـرتان خـۆش دەوێـت . شمـشێرەکەی هەڵگرتـەوە و هـەر چـوار پـەلی کچەکەی پەڕاند .

منیش بێـچارە وەستابووم و وام دەزانـی مـردووم . کیژەکە چاوانی تێـبڕیم ، وەکو ئـەوەی ماڵئاواییم لێ بکات . دێوەکە شمشێرێکی لە ملی کچەدا و پەڕاندی .

رووی کردە منیش و وتی :

ئەی مرۆڤ ، دەبێت تۆیش بکوژم . پێم بڵێ ، چۆن چۆنی بتکوژم ؟

منیش وتم : من داوای هیچت لێ ناکەم !

دواتر وتی :

کەواتە بڵێ .. بە ( سیحر) بتکەم بەچی؟ بە ( سەگ ) یان ( مەیموون) ؟

منیش کە چاوەڕێی ئەوەم دەکرد لێم خۆش بێت ، وتم :

بە خوا گەر لێم خۆش ببیت خوا لە تۆیش خـۆش دەبێـت ، بـەوەی کە لـە موسڵمانێك خۆش بوویت .

هەر زۆر پـاڕامەوە و وتم :

ئەی ( دێو ) تۆ بە لێبووردەیی یەوە جوانیت ، هەر وەکو چۆن بە چاوەوە بوویەك : لە چاوپیسەکەی خۆش بوو..!

دێوەکە پرسیی : ئـا ... کەوابوو ئەو بەسەرهاتە چۆن بووە؟

لاوەکە وتی :

منیش کە چاوەڕێی لێبوردن بووم : ئـەی پاشای بەختیار..... خـاوەنی بڕیار ...

وتـــم :

ئەی دێو....دەڵێن دوو پیاو لە شارێکدا دەژیان . دیوارێك لە نێوان خانووەکانیانـدا بـوو . یەکێکیان هەمیشە بەغیلی بەوی دی دەبرد و ئەوی تریش زوو ، زوو بە چاوی ئەمەوە دەبوو . ئازارێکی زۆری بەدەستەوە چەشت بوو. تا کار گەیشتە ئەوەی ، لە خواردن و خەویش بوو. بۆیە بڕیاریدا سەری خۆی هەڵبگرێت و شارەکەی خۆی بەجێ بهێڵێت .

لە دڵی خۆیدا وتبووی :

*بەو خوایە .... دنیای بۆ چۆڵ دەکەم و لە داخی ئەو : هەر واز لە دنیاش دەهێنم .*

رەوی کرد بۆ شارێکی تر و پارچە زەویەکی کڕی. زەوی یەکە بیرێکی تێدا بوو کەرەسەی

خانووی بۆ هێنا و سووچێکی ئاوەدان کردەوە و تێیدا کەوتە خواپەرستی و پشتی کردە خۆشیەکانی دنیا .

خەڵکی بەم پیاوەیان زانی و بینییان خواپەرستەو بەخشندەیە . هەزاران روویان تێکرد و ئەم پیاوە چاکە ناوبانگی دەرکرد . هەواڵەکە گەیشتە دراوسێ چاوپیسەکەی . ئەویش هەندێ لە پیاو ماقووڵانی کۆکردەوە و لەگەڵ خۆی بەرەو شاری بە چاوەوەبوو بردنی. کە گەیشتن ، بەخێری هێنان و رێزی گرتن .

چـــاوپیس وتی :

دەمەوێت هەندێ قسەت بۆ بکەم و بۆ ئەوەش هاتووم . هەستە با بچینە گۆشەیەکەوە . خانە خوێی بە چاوەوە بوو ، هەستاو دەستی ( چاوپیس )ی گرت و چوونە کونجێکەوە . لە خەڵکەکە دوور کەوتنەوە . وردە وردە بردی تا گەیشتنە سەر بیرێك ... ( بەغیل )ی چاوپیس : هەلی لێ وەرگرت و بەچاوەوە بووی .. خستە بیرەکەوە .

ئیدی بە خۆی وت :

دەنـگ مەکە ، کوشتوومە . توومـەز بیرەکە ، چـەندین ( خێـو )ی تیـا بـوو. ئـەوانیش باوەشیان بۆ گرتەوە و نەیان هێشت بکەوێتە ئاوەکەوە و لەسەر بەردێك ، دایان نا .

یەکێکیان پرسیی : ئەزانن ئەمە کێ یە؟

ئەوانیش وتیان : نـــە ء !!

ئەویش وتی :

ئەمە بەغیلی پێ براوی : بەچاوەوە بووە..! لە دەست بـەغیل و چاوپیسێك رای کرد و هاتۆتـە شـارەکەی ئێمـەوە و لای ئێمـە نیـشتەجێ بـووە . کـە ئێمـەش بـە هـۆی قورئـان خوێنـدنی و چـاکەکانیەوە :حەواوینەتـەوە . بەغیلەکـەش لێـرە دۆزیویەتـەوە و بـە فێڵ هێناویەتە سە ر بیرەکەمان و ئەوەتا ئەوی خستووەتە خوارەوەو بۆ لای ئێمە . ئێستایش دەنگ و باسی ئەم پیاوچاکە گەیشتووەتەوە بـە سوڵتانی شـارەکەو لەسـەر ویـستی کچە نەخۆشەکەی ئەو سوڵتانە هاتووەتە سەردانی ئەم پیاوچاکە ، تاکو نەخۆشیی کچەکەی چاك بکاتەوە .

یەکێکیان پرسیی : بـۆچی .. کچەکەی سوڵتان چی یەتی ؟

ئەویتر وتـــی :

شێت بووە . ئەگەر دەرمانەکەی بزانیایە چاکی دەکردەوە. دەرمانەکەیشی ئەمەیە : ئەم خواپەرستە ( پشیلە )یەکی رەشی هەیە . پەڵەیەکی سپی بـە هێنـدەی لیرەیـەك بـە کلکی یەوەیە . ئەگەر(٧) تـاڵ لەو مووە سپی یـەی ئـەو پشیلەیە دەر بهێنێت و لای ئـەو کچە شێتەدا بی سووتێنێت .. ئـەوا ( جنۆکـە )کـەی نێو لەشی دەردەچێت و جارێکی دی ناگەڕێتەوە و دەم و دەست چاك دەبێتەوە !!

ئەی دێو.. ئەوان دەمەتەقێ یان بوو ، بەچاوەوە بوویش گوێی گرت بوو. بۆ سبەینێ بەیانیدا هەزاران روویان کردەوە ، تەکێی پیاو چاك . بینیان لە بیرەکە هاتۆتە دەرەوە . هێندەی تر خوا پەرستییان لا مەزن بوو..! ئەویش پشیلەکەی خۆی گرت و ( ٧ ) تاڵ مووی لە پەڵە سپی یەکەی کلکی کردەوە .

هێندەی پێ نەچوو، سوڵتان و چەکدارانی و پیاوانی دەوڵەت هاتنە ماڵی . فەرمان بە سوپا درا لە دوور بوەستن . پاشا چووە تەکیەی خواپەرست و خانەخوێ بەخێری هێنا.

بە پاشای وت :

بۆت دەربخەم ، کە بۆچی هاتوویتە لام ؟

پاشایش وتی : بـــەڵێ ..

ئەمیش وتی : بۆ ئەوە هاتوویت پرسیاری نەخۆشیی کچەکەتم لێ بکەیت !

پاشایش وتی : بەڵێ .. مەردی پیاو چاك .

ئەمیش وتی :

بنێرە ، با کچەکەت بهێنن و خوا یاربێت : هەر ئێستا چاك دەبێتەوە .

پاشا زۆر دڵی خۆش بوو و فەرمانیدا.. ئەوانیش بە پێوەند کراوی کچە شازادە نەخۆشیان بۆ هێنا . بە چاوەوەبوو ، شازادەی بەرامبەری خۆی دانا و( ٧ ) تاڵە مووە سپیەکەی لە بەردەمدا سووتاند . جنۆکەکەی ناو لەشی شازادە ، ناڵەیەکی کرد و دەرچوو .

کچەکە بە ئاگا هاتەوەو سەری خۆی داپۆشی و پرسیی :

ئەمە چی یە ؟ کێ منی هێناوەتە ئێرە ؟

ئەوەتەی پاشا هەبوو هێندە دڵی خۆش نەبوو بوو..! ناوچاوانی کچەکەی خـۆی ماچ کرد و دەستی ( بەچاوەوەبوو )یشی ماچ کرد و سەیرێکی پیاوانی دەوڵەتی کرد و پرسیی :

ئێوە دەڵێن چی ؟ ئەوەی کچەکەمی چاك کردەوە ، چی دەهێنێت بۆی بکەین ؟

ئەوانیش وتیان : گۆڕ وایـــە .... کچەکەتی لێ مارە بکەیت !

پـاشایش وتـــی : راست دەکەن .

دواتر کچەی خۆی لێ مارە کرد و ( بەچاوەوە بوو ) بووە زاوای پاشا. فرەی پێ نەچوو وەزیرێکی مرد .

پاشاش پیاوانی دەوڵەتی کۆکردەوە و لێی پرسین :

کێ بخەینە شوێنی وەزیری خوالێ خۆش بوو؟

هەموو وتیان : قوربان .... زاواکەت .

ئەوە بوو بەغیلی پێ براوی بە چاوەوە بوو، کرایە وەزیر.

رۆژێك لەرۆژان .. وەزیری نوێ و دەست و پێوەندی ، بە شاردا دەگەڕان و( چاوپیس )ی بینی فەرمانیدا : برۆن ئەو پیاوە بێنن و مەی ترسێنن !

پیاوەکانی کەمێك ون بوون و دواتر دراوسێکەیان بۆ هێنا و ئەویش وتی :
بڕۆن ، لە گەنجینەکەم ( ١٠٠٠) مسقاڵ زێڕ و(٢٠) باری کوتاڵ بدەنێ و لە چوونەوەیدا،
ئێشکچیی بن و بیپارێزن . تاکو دەیگەیەننەوە شارەکەی خۆی .
ئەملاو لای ماچ کرد و بەڕێی کرد . بێ ئەوەی تۆڵەی لێ بکاتەوە .
لاوەکە بزەیەك گرتی و وتی :
سەرنج بدە ئەی ( دێو ) .. بە چاوەوەبوو، چەندە لێبووردە بوو ، بەرامبەر کابرای
بەغیلی چاوپیسی دراوسێی ! ئاخر ئەو بەغیلە ، ئازاریشی دابوو. خستبوویە بیرەکەیشەوە و
ویستبووی بیکوژێت ! کەچی ئەم لێی خۆش بوو.
ئەمجا دەستی کردە گریانێکی زۆر بە کوڵ و وتی :

گوناهبار چاوی هەر لە بەخشینە — بەخشندە بوونیش دیارە ( نگینە)!
گوناهی خەڵکت بەسەرکردەوە — چاوی لێ پۆشە و وازی لێ بێنە
ئەوەی چاوەڕێی بەخشینی خوایە — بووردەیە بە رووی کەسی پێینە

دێوەکە ، سەرێکی بـاداو وتی :
لە سەری مەڕۆ ، نە لەمردن بترسە و نە چاوەڕێی لێبوردن بە ..!! چونکە ( سیحر )ت
لێ دەکەم .
پەلاماری دام و فڕاندمی بەرەو ئاسمان ، هێندەی بڵند کردمەوە . زەوی وەکو تەشتێکی
لێهات ، لە نێو دەریادا ، داهاتەوە و لەسەر لوتکەی شاخێك دایانم .
تۆزێ خۆڵی هەڵگرت و کەمێ پچەپچی بە سەردا کرد و پڕژاندی بە گیانمدا و وتی :
لەم شێوەیەوە بگۆڕێ بۆ ( مەیموون ) .
لەو کاتە بە دواوە بوومە مەیموونێکی سەد ساڵە . منیش کە خۆم بەو ناشیرینی یە
بینی زۆر خەمم خوارد. زەمانەیش تا سەر بۆ کەس نییـە . لە سـەر لوتکەی شاخەکەوە ،
هاتمە خوار. دوای ئەوەی مانگێك بەڕێوە بووم ، گەیشتمە کەناری دەریایەکی سوێراو. دوای
ئەوەی سەعاتێك حەوامەوە. پاپۆڕێکم بینی وچاوەڕێم کرد . تا گەیشتە کەنار دەریا. منیش
بێدەنگ چوومە پاپۆڕەکەوە .
یەکێك لە سەرنیشینان منی بینی وتی : ئەو شوومە دەر بکەن .
سەرۆکی کەشتی وانانیش وتی : هەر ئێستا .. دەی کوژین .
یەکێکی دی ، خێرا وتی : ئێستا خۆم بەم شمشێرە دەیکوژم .
دامێنی سەرۆکی پاپۆڕەکەم گرت و بەسەریدا گریام .
سەرۆکی کەشتیەوان سەیرێکی کردم و وتـی :
ئەی بازرگانان : *ئەم مەیموونە ، پەنای بۆ مـن هێنـاوەو منـیش پـەنام داوە . ئێستا لـە
سایەی بەزەیی مندایە و نابێت کەس لێی تێك بدات .*

سەرۆك زۆر بۆم باش بوو . هەر چی یەکی پێ بووتمایە ، تێی دەگەیشتم و بۆم جێ بەجێ دەکرد. هەر بۆیەش خۆشی دەویستم .

( بـا )ی دەریا ، لەبار بوو . (٥٠) رۆژ بە رێگاوە بووین . دواتر گەیشتینە شارێك زۆر گەورە بوو.

خەلکەکەی هێندە زۆر بوون ، لە ژمارە نەدەهاتن .

خەلکێکی زۆرمان لێ کۆ بووەوە. پیاوانی پاشا هاتن و بەخێریان هێناین و وتیان : پاشامان لەو رۆژەوە وەزیرە خۆشنووسەکەی نەماوە سوێندی خواردووە ، هەر کەسێك بخاتە شوێنی دەبێت وەك ئەو خۆشنووس بێت .

کاغەزێکی (١٠) بالْ درێژی پێدان و وتی :

لە نێوان خۆتانـدا ، بەشی بکەن و هـەر یەکە و بـە دەست و خـەتێکی جوان . شتێك بنووسێت . منیش پارچـەیەکم بـۆ خـۆم فڕانـد . وایـان زانـی دەیـدڕێنم و پـەلاماریان دام . منیش بە ئیشارەت تێم گەیاندن کە منیش دەمەوێ شتێك بە خەتێکی جوان بنووسم .

سەرۆکی پاپۆڕ وتی :

رێگەی بدەن ، ئەگەر شقلّی و بقلّیی نووسی ، ئـەوە دەری دەکـەین . ئەگـەر خۆشنووس بوو . ئەوا دەیکەم بە کوڕی خۆم ! چونکە تا ئێستا من مەیموونی ئـاوا : ژیرم نەبینیوە !

ئووچم لێ وەرگرتن و بە مەرەکەبم دا کرد و لێی پالْ کەوتم و ئەمەم بۆ نووسین :

| | |
|---|---|
| کاری پیاوچاکان کە لەبەر چاوە | کەچی چاکەی تۆ هەر نەنووسراوە |
| ئەوەی تۆ دەیکەیت شاراوە نییە | بۆ چاکە کردن : تۆی دایە و باوە |

بە ئووچی رێحان ، نووسیم :

| | |
|---|---|
| نووکی خامەکەت: دنیای گرتەوە | هەموو لە ( بەر )ی تۆیان بردەوە |
| ناوچەیەك نەما، نوقمی تۆ نەبێ | ئـامێزت لە بۆ هەموان کردەوە |

بە ئووچی : (پلپ)یش نووسیم :

| | |
|---|---|
| نووسەر دەمرێت و سەر دەنێتەوە | بەلام بەرهەمی : دەمێنێتەوە |
| بە پەنجەکانت : جۆرێ بنووسە | لەو دنیاش دلّی پێ بکرێتەوە |

بە خەتی ( نوسخە )ش نووسیم :

| | |
|---|---|
| بیستمان هەوالّی ئەو دابـــڕانە | وتمان رووداوی: دەور و زەمانە |
| سکالای دووریت کەوتە سەر زمان | چووە سەر کاغەز بەو نامە جوانە |

بە پێنوسی ( تۆمار )یش نووسیم :

| | |
|---|---|
| کورسیی دەسەلات بۆ کەس نامێنێ | خەلیفە کە مرد: کێ بۆمان دێنێ؟ |
| چاکەی خۆت بکە و بیدە بە ئاوا : | چاکە دەمێنێ و خۆیشت مالّ ئاوا |

بە پێنووسی ( محقق )یش نووسیم :

نووکی خامەکەت خێر داچۆڕێنێ        بەخشندە دەبێت : خۆشی بهێنێ
بە هێز بوویت : باشی بەکار بهێنە        با.. پێنووس تۆوی: چاکە بچێنێ

کاغەزەکەم دایەوە پێیان سەرۆکی پاپۆڕ لە نێو هەموویاندا دەست و خەتی منی بە دڵ بوو .
کاغەزەکانیان ناردەوە بۆ لای پاشا .

پاشایش لە نێویاندا دەست وخەتی منی بە دڵ بوو و فەرمانیدا :

بڕۆن خاوەنی ئەم خەتە جوانە ، بپۆشن وسواری ئەسپی بکەن و تیپی مۆسیقا ئاواز بژەنن و بۆم بهێنن !

ئەوانیش کە ئەمەیان بیست ، بزە گرتنی .

پاشا لێیان تووڕە بوو پرسیی :

*ئـــەفرەتتان لێ بێت ، ئەوە : بە فەرمانەکەم پێ دەکەنن ؟*

ئەوانیش وتیان : ئـــەی پاشا، پێکەنینمان بێ هۆ نی یە..!!

ئەویش پرسیی : کەوابوو ، هۆیەکەیم پێ بڵێن !!

هەموو وتیان :

تۆ دەڵێیت خاوەن ئەم دەست وخەتەم بـۆ بێـنن . لـە ڕاستیدا ، ئەمـە دەسـت وخـەتی ( مەیموون )ێکە ! خاوەنەکەی مرۆڤ نی یە ! مەیموونەکەش سەرۆکی پاپۆڕەکە خاوەنێتی !

ئەویش پرسیی : بە ڕاستتانە؟

ئەوانیش وتیان : ئـــەرێ ... بە نەمەکی ماڵت !

پاشا هەر زۆر سەری سووڕما و وتی :

دەمەوێت ، ئەو مەیموونە لە سەرۆك بکڕمەوە ! بڕۆن ، چۆنم پێ وتـن ، ئەسـپ و تیپی مۆسیقا و دەست و پێوەن بەرن و بە دەهۆڵ و زوڕناوە بۆم بێـنن . منیـان بـە شـاردا هێنـا و خەڵکێکی زۆر لێمان کۆ بوونەوە و سەریان سووڕما بوو !!

کە گەیاندمیانە بەردەم پاشا ، منیش (٣) جاران کڕنووشم بۆ بردو ئەویش فەرمانیدا کە دابنیشم . منیش لە سەر چۆك دانیـشتم . هـەر هـەموویان سـەریان لـە ڕێزگرتنەکەی مـن سووڕما و لە هەمووشیان پتر پاشا خۆی بوو..!!

پاشا فەرمانیدا : دەوری چۆڵ بکەن .

تەنیا من و کۆیلە خەساوەکە و خزمەتکارێکی مێردمنداڵ . لای پاشاماینەوە .

خوان ئامادە کرا... لە گۆشتی کەو و سوێسکەو گۆشتی ئاسك ، دانرا . ئیشارەتی بۆ کـردم . لەگەڵ ئەو بخۆم . کڕنووشم بۆ بردو بە قسەم کرد . کە سفرە و خـوان هـەڵگیرا. دەسـت و دەمم پاك کردەوە..

خامەم بە دەستەوە گرتەوە :

بۆ فڕوجاوێ چۆن دەبێت نەگریم؟        بێ ئەم سفرەیە ناتوانم بژیـــم

ئای لە خۆشیی ئەو دوو جۆرەی ماسی     لەگەڵ ئەو نانەی لەو سفرەیە دیم
چێژی برژاوێك كە زۆر بەتام بوو     نوقمی رۆنێك بوو، پێی هات سەبووریم
هەستام و چووم . لە دوورەوە دانیشتم .
پاشا سەیری ئەم نووسینەمی كرد و سەری سووڕما! وتی :
سەیرە ، مەیموونێك هێندە لە ڕێزماندا زانا بێت و دەست و خەتی هێندە خۆش بێت..!
بەو خوایە.... ئەمە زۆر عەجاییبە !
شەرابێكی تایبەت بە پاشایانیان بۆ هێنا. ئەویش پێشكەشی منی كرد . منیش كڕنووشم
بۆ برد...هەمیسان نووسیم :
گڕم تێ بەردەن جا بم دوێنن     تا بە ئارامیم باوەڕ بهێنن
بۆیەش باسكیان بۆ ڕادەخستم     كۆتا بە خەمی بێ فەڕ بهێنن
پاشا كە شیعرەكەی خوێندەوە وتی :
ئەم شیعر و ئەدەبیاتە ، هی هەركەسێك بوایە ، یەكەمی دنیا دەبوو!
پاشا تەختەی ( شەترەنج )ی هێنا و پێی وتم :
یاریم لەگەڵ دەكەیت ؟
منیش سەرم بۆ لەقاندو(٢) یاریمان كرد . هەردووكیانم لێ بردەوە . پاشا حەپەسا بوو..!
منیش ئەمەم بۆ نووسی :
جەنگی دوو سوپا زۆر دەخایەنێ     یەك بۆ ئەویتر شاتاوڵ دێنێ
تا تاریكیی شەو دایان دەپۆشێ     زۆرێكیان مەیی مەرگی دەنۆشێ!
پاشا ئەمەی خوێندەوە... دایە قاقای پێكەنین . زۆری پێ سەیر بوو!
فەرمانی دا:
بچن كچەكەمم بۆ بانگ بكەن . بابێت ئەم ( مەیموون )ە سەرسووڕهێنە ببینێت !
خزمەتكار ماوەیەك ون بوو . كە هاتەوە كچەكەی لەگەڵ بوو .
هەر كە سەیری كردم ، سەری داپۆشی و وتی :
*چۆن دڵت دێنێ ، بانگم بكەیت ، تاكو پیاوان بم بینن ؟*
پاشایش وتی :
كیژی جوان ، تەنیا خۆم و ئەم خزمەتكارە منداڵەو پیاوە خەساوەی لێ یە ، كە خۆی بە
خێوی كردووی !
ئیدی بۆ سەرت دادەپۆشیت ؟
كچە شازادەیش وتـــی :
ئەم مەیموونـە شـازادەیە و بـاوكی نـاوی ( ئـەفتیماروس )ە ، كە خـاوەنی دوورگەكانی (
ئەبەنووس )ە.. ئەمە دێو (جەرجیس كوڕی ئیبلیس) سیحری لێ كردووە و ژنەكەشی كە

کچی (ئەفتاموس) بوو، کوشتویەتی ! ئەمەی کە تۆ بە مەیموونی دەزانی ... پیاوێکی ژیر و
دانایە..!!

پاشا سەری لە کچەکەیشی سوڕما!!

لە منی پرسی : ڕاست دەکات ؟

بەسەر لەقاندن وتم : بەڵێ و دەستم بە گریان کرد .

لە کچەکەی پرسی : چۆن دەزانیت ... ئەمە سیحری لێ کراوە؟

کچەکیشی وتی : کە منداڵ بووم . پیرەژنێکی زۆرزانی ساحیرم لابوو. ئەو فێرە
سیحری کردم! منیش هەر چی پێ وتووم : لەبەرم کردووە . ( ١٧٠ ) بابەت لە سیحرم
لەبەرە . ئاسانەکەیان... دەتوانم ، بەردی شارەکەت بگەیەنمە ( قوللەی قاف ) ! دەتوانم ئەم
شارە بکەمە ، دەریایەك و دانیشتوانەکەی ببنە ( ماسی ) !

پاشا وتی : دە ...کچەکەم ، ئەم ( مەیموون )ە ، بگێڕەوە بە مرۆڤ ، با بیکەمە وەزیری
خۆم ! کچەکەی ناردی وچەقۆیەکیان بۆ هێنا. ئەویش بازنەیەکی لەبەردەمی خۆیدا کێشا.
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو...بێدەنگ بوو.

## شەوی ١٤

شەهرەزاد وتی :

ئـــەی پاشای بەختیار ... توانای وەفـــادار ...

کچەی ( ساحیر ) چەند ناوێك و چەند تەڵسەمێکی ، لە بازنەکەدا نووسی ، قەسەمێکی
بە سەریاندا خوێند . هەندێ لە وشەکان تێدەگەیشتین و لە هەندێکیشی نەدەگەیشتین !
دوای سەعاتێك : دنیا تاریك بوو. هێندەمان زانی ( دێو )ەکە پەیدا بوو، قاچەکانی هێندە
درێژ بوون ، دەتوت کۆڵەکەی پاپۆڕن! چاوانی دەتوت چراوگی ئاگرە ! ئێمەیش زۆری لێ
ترساین !

شازادە پێی وت : بەخێر نەیەیت !

( دێو )ەکە بوو بە شێر و بە شازادەی وت :

ناپاکی ، پەیمان شکێن ! سوێندت نەخوارد کە کەسمان ڕێگە بەوی ترمان نەگرین !؟

شازادەیش وتی : نەفرەتت لێ بێت ، بۆچی تۆ متمانەت پێ دەکرێت ؟

شێر وتی :

وا بۆت هاتم .. خۆت بگرە .. هەڵمەتی بۆ برد . شازادەیش پچە پچێکی بە سەر چەند
تاڵە موویەکی سەریدا کرد. هێندەمان زانی مووەکان بوونە شمشێرێك بە دەست کچەوە و
ئەویش شمشێرێکی لێداو، شێرە بوو بە دوو کەرتەوە . کاتێکمان زانی سەری شێرەکە بوو بە
( دووپشك )ێك و شازادەش خۆی کرد بە ( ئەژدیها )یەك و جەنگێکی زۆریان کرد .

کچی (ئەفتاموس) بوو، کوشتویەتی ! ئەمەی کە تۆ بە مەیموونی دەزانی ... پیاوێکی ژیر و دانایە..!!

پاشا سەری لە کچەکەیشی سوڕما!!

لە منی پرسی : راست دەکات ؟

بەسەر لەقاندن وتم : بەڵێ و دەستم بە گریان کرد .

لە کچەکەی پرسی : چۆن دەزانیت ... ئەمە سیحری لێ کراوە؟

کچەکیشی وتی : کە منداڵ بووم . پیرەژنێکی زۆرزانی ساحیرم لابوو. ئەو فێرە سیحری کردم! منیش هەر چی پێ وتووم : لەبەرم کردووە . ( ١٧٠ ) بابەت لە سیحرم لەبەرە . ئاسانەکەیان... دەتوانم ، بەردی شارەکەت بگەیەنمە ( قوللەی قاف ) ! دەتوانم ئەم شارە بکەمە ، دەریایەك و دانیشتوانەکەی ببنە ( ماسی ) !

پاشا وتی : دە ...کچەکەم ، ئەم ( مەیموون )ە ، بگێڕەوە بە مرۆڤ ، با بیکەمە وەزیری خۆم ! کچەکەی ناردی وچەقۆیەکیان بۆ هێنا. ئەویش بازنەیەکی لەبەردەمی خۆیدا کێشا.

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو...بێدەنگ بوو.

## شەوی ١٤

شەهرەزاد وتی :

ئـــەی پاشای بەختیار ... توانای وەفـــادار ...

کچەی ( ساحیر) چەند ناوێك و چەند تەڵسەمێکی ، لە بازنەکەدا نووسی ، قەسـەمێکی بە سەریاندا خوێند . هەندێ لە وشەکان تێدەگەیشتین و لە هەندێکیشی نەدەگەیشتین! دوای سەعاتێك : دنیا تاریك بوو. هێندەمان زانی ( دێو )ەکە پەیدا بوو، قاچەکانی هێندە درێژ بوون ، دەتوت کۆڵەکەی پاپۆڕن! چاوانی دەتوت چراوگی ئاگرە ! ئێمـەیش زۆری لێ ترساین !

شازادە پێی وت : بەخێر نەیەیت !

( دێو )ەکە بوو بە شێر و بە شازادەی وت :

ناپاکی ، پەیمان شکێن ! سوێندت نەخوارد کە کەسمان رێگە بەوی ترمان نەگرین !؟

شازادەیش وتی : نەفرەتت لێ بێت ، بۆچی تۆ متمانەت پێ دەکرێت ؟

شێر وتی :

وا بۆت هاتم .. خۆت بگرە .. هەڵمەتی بۆ برد . شازادەیش پچە پـچێکی بە سەر چەند تاڵە موویەکی سەریدا کرد. هێندەمان زانی مووەکان بوونە شمشێرێك بە دەست کچەوە و ئەویش شمشێرێکی لێداو، شێرە بوو بە دوو کەرتەوە . کاتێکمان زانی سەری شێرەکە بوو بە ( دووپشك )ێك و شازادەش خۆی کرد بـە ( ئـەژدیها )یـەك و جـەنگێکی زۆریان کرد.

دووپشکەکە بوو بە ( داڵ ) ! ئەژدیهاکەش بوو بە ( هەڵۆ ) ! دایان لە شەقەی باڵ و
دەرچوون بەرەو ئاسمان و هەروا سەعاتێکیان پێچوو . داڵەکە بوو بە ( پشیلە )یەکی ڕەش و
هەڵۆکەیش بە ( گورگـ )ێکی بەڵەك . نزیکەی سەعاتێك لە نێو کۆشکدا ، بە گز یەکدا
چوون . پشیلە بۆی دەرکەوت هیچی بۆ ناکرێت .. خۆی کرد بە ( هەنار)ێکی سووری
گەورە و خۆی فڕێ دایە . حەوزی کۆشکەوە .
گورگە ، لە حەوزەکە دەری هێنا و بردی بە ئاسمان و بەری دایەوە . هەنارە هەلا هەلا
بوو و هەر دەنکێکی رووی کردە شوێن و کەلەبەرێکی کۆشکەکە .
گورگە بەڵەك خۆی کردە ( کەڵەشێر ) و هەموو دەنکەکانی بە دەنووك هەڵچنی و
خواردی . باڵەکانی پێکدا دا و بە دەنوك ئاماژەی دەکردو ئێمە تێی نەدەگەیشتین !
قیژەیەکی کرد وامان زانی (کۆشك )ەکە بە سەرماندا رووخا ! گەرا...گەرا. توومەز
دەنکێك مابوو ، نەیخوارد بوو..!! دەنووکی بۆ برد .. دەنکەکە خۆی هەڵدایە حەوزەکەوە و
نقووم بوو. کەڵەشێرەش خۆی کردە نەهەنگێك و خۆی فڕێ دایە حەوزەکەوە . زۆری
پێچوو ، گوێمان لە ناڵە ونرکەیەك بوو . هێندەمان زانی دێوەکە دەربەری بە دەرەوە و لە
دەم و گوێ و چاوی یەوە ئاگر دەهاتە
دەرەوە ! باوەشێك گڕ بە دوایدا هاتەدەر و ئالا بە ( دێو )ەکەدا . کۆشك بوو بە دووکەڵ !
ئێمەش زۆر
ترساین کە بسووتێین و ویستمان خۆمان فڕێ بدەینە ئەو حەوزە گەورەیەوە .
پاشایش وتی :
لا حول ولا قوه الا بالله العلی العظیم انا لله و انا الیه راجعون .. خۆزگە هەر پێم نەوتایە
.. ئەم مەیموونە رزگار بکە تاکو .. ئاوا ئەم دێوە ماندووی نەکردایە ! ئەمە دێوێکە کە
دێوەکانی دنیا چاری ناکەن ! ئەفەرەت لەو کاتەی ئەم ( مەیموون )ەم تیا بینی ! ئێمە
ویستمان یارمەتی بدەین ..کەچی بەم شێوەیە تووش بووین !
بەڵام من زمانم بەسترابوو . نەمدەتوانی هیچی لەگەڵ بڵێم .. هێندەمان زانی دێوەکە
ناڵەیەکی کرد و لە هەیوانەکە لەبەر دەمماندا قوت بووەوە و شاڵاوی گڕی بەرەو روومان
کردەوە ، کیژۆڵەکەی لێ پەیدا
بوو. ئەویش گڕی فڕێ دا بۆی . لە هەردووکیانەوە ، گڕمان بۆ هات . گڕی کیژۆڵە زیانی پێ
نەگەیاندین . بەڵام گڕی ( دێو )ەکە بەر دەم و چاوم کەوت . بەو شێوە مەیموونی یەمەوە ،
چاوێکیشم سووتا ! گڕیش دەم و چاوی پاشای هەڵ کرووزاند و دەم و دەست ریشی سووتا
! ریزە دانەکانی خوارەوەی دەمی کەوتن . گڕەکە بەر ( کۆیلە ) خەساو کەوت و گوشتی و
دەستمان لە ژیانمان شت . هێندەی پێنەچوو.
گوێمان گرت یەکێك دەڵێت:

الله اكبر...الله اكبر . سەرکەوتن هەر بۆ خوایە .

کاتێکمان زانی شازادە پەیدا بوو . لەولایشەوە ، دێوەکە سووتاو دامرکایەوە .

بەرەو رووومان هات و وتی :

ئادەی .... تەشتێك ئـــاوم بۆ بێنن .

بۆیان هێناو ئەویش هەندێ ورتە ورتی بەسەر ئاوەکەدا کردو پێیدا پرژاندم و وتی :

بۆ خاتری حەق .. بۆ خاتری *ئاوە جوانەکانی الله* .. بگەڕێوە دۆخە رەسەنەکەی خۆت .

منیش خۆم راتەکاندو بینیم بوومەتەوە بە مرۆڤ بەڵام چاوە سووتاوەکەم بەکوێری مایەوە!

شازادە هاواری کرد :

ئاگرە ... ئاگر...!! رەنگە بمرم ! ئیدی شەڕی جنۆکە و شەیتانم بۆ ناکرێت . ئەگەر مرۆڤ بوایە هـەر زوو کوشـت بـووم ! هـیچ کاتێـك بـەو هێندەیـە مانـدوو نـەبووم . کـە دەنکە هەنارەکانم دەچنی یەوە! قـەدەری خـوا وابـوو. لـە ژێـر زەویـشدا لەگـەڵی بجەنگێم و لە ئاسمانیـشدا و لـە نـاو دەریـادا. مـن دەرگایـەکم بـۆ دەکـردەوە و ئـەویش دەرگایـەکی بۆ دەکردمەوە .. تاکو دەرگای ئاگری بۆ کردمەوە . قەزای خوا وابوو بە ئاگری من ئەو سوتا!! خۆ گومـانی تیـا نییـە کـە دەمـرم ! خـوا پـەنامان بـدات .. دەسـتی کـردە نرکـە و ناڵە و هاوار... کاتێکمان زانی بڵێسەیەکی رەش لە سنگیەوە دەرچوو و بەرەو دەم و چاوی .

شازادە وتی : اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله .

ئێمەش سەیرمان دەکرد . تا کڵوکۆی دامرکایەوە و بووە تەپۆڵکەیـەکی خـەڵووزین و بە تەنیشت تەپۆڵکە خەڵووزینەکەی دێوەوە هەڵدرایەوە..!

زۆرم خەفەت خوارد و خۆزگەم خواست من لە جێی بوومایە! هەرگیز حەزم بەوە نەدەکرد پارمەتی دەرەکەم ببێتە خەڵووز . بەڵام کاری خوا گەڕانەوەی نی یە . کە پاشا کچەکەی ئاوا بینی . فرمێسکەکانی ریشی تەڕ کرد . بەرگی لەبەر خۆیدا دڕی .. زۆری بۆ گریایین . خزمەتکاران و کەنیزەکانی کۆشك هاتن و ئەو دوو تەپۆڵکـە خـەلووزەیان بینی . کردیانە شین و شەپۆڕ . حەوت رۆژ تەعزیەیان گێڕا . مۆم و بخوورد داگیرسا. خێر و چاکە لە شاردا کرا..خۆڵەمێشی دێوەیان دا بە هەوادا. پاشا مانگێك لە جێگادا بە نەخۆشی کەوت.

کە چاك بووەوە ، ناردی یە شوێنم و وتی :

ئەی لاو تاکو تۆمان نەناسی بوو بێوەی و بە بـەختیاری دەژیـاین . خۆزگە هەر نەمان ناسیبای ! بە هۆی تۆوە کچێکم تێداچوو کە ( ١٠٠ ) پیـاوی دەهێنـا . ئـەوە خۆیشم ریزی خوارەوەی ددانەکانم لە دەست دا .. خزمـەتکارێکم لـە دەسـت دا. خێرمـان لە تۆ نەبینی بەڵام من و تۆ هیچمان بەدەست نەبوو ! سوپاس بۆ خوا . خوا تۆی رزگار کرد و کچەکەم مرد .. داوات لێ دەکەم : لەبەر چاوم ون بە و لەم شارەدا مەمێنە! چاوم بەرایی نایەت بت بینم و جارێکی دی بتبینمەوە : بڕوا بکە دەتکوژم . نەڕاندی بە سەرمداو منیش بە پەلە

هاتمە دەرەوە . مانگێك بەرێوە بووم و نامۆ و نەشارەزا بووم . تاكو بەو بەرگدرووە گەیشتم . دواتر چوومە ژێر زەوی و ئەو كیژە جوانەم بینی .

ئیدی بۆ خۆم و بۆ لەدەست دانی چاوم دەگریام . چوومە گەرماو و رەشم پۆشی و بەرەو حەج كردن بوومەوە . هەموو رۆژێك كە بیرم لە خۆم دەكردەوە . تێر دەگریام ئەم گۆرانی یەم دەوتەوە :

سەرم لەكاری دەوران سوڕماوە     بێناگا و دەورم بە خــەم گیراوە

كپ دەبم تاكو: سەبر بۆڕ بدەم     پەنام بە سایەی ( لامكان ) داوە

لە ئۆقرە گرتن ناخۆشتر نییە     یان بەوەی رەنجت بدرێ بە بــاوە

ئەوەی بە فەلەك پشتی دەبەستێ     هەردێ بە گورزێ پشتی شكاوە

گەڕام و گەڕام ، هەرێم بە هەرێم ، چوومە بەغـدای ئاشتەوا، تـاكو ( میری موسڵمانان) ببینم و چیم بە سەرهاتووە بـۆی بگێڕمـەوە . ئـەوە بوونەمشەو : گەیشتمە بەغدا . ئەم پیـاوەم بـینی سەراسـیمە بـووم .كەوتمـە دەمەتـەقێ لەگەڵیـدا . ئەوەنـدەی نـەبرد ، سێ یەمیشمان بینی . سڵاوی لێ كردین . پێی وتین كە نامۆیە بەم شارە .

ئێمـەش وتمـان : ئێمـەش نـامۆین ، وەرە لای ئێمـە و ئـەم شـەومان پیرۆز بكە. بە نـاو شەقام و كۆڵانەكاندا كەوتینە رێ و كـەسمان بـە سـەرهاتی ئـەوانی دی نـەدەزانی . قەدەری خوا وابوو، بووینە میوانی ئێوە ، ئا ئەمـە بـوو، هۆی ( لاركوێر)یـم و سـەرو ریشم وسمێڵ تاشینم .

كیژۆڵەی خانەخوێ وتی : بەسەرهاتەكەت . سەرسوورهێنەرە . دەست بخە سەر سەرت و برۆ بەرێی خۆتەوە .

ئەویش وتی : نــــارۆم .... تاكو بەسەرهاتی هاورێكانم نەبیستم ..!!

شەهرەزاد هەستی كرد شەو درەنگ بوو . بێدەنگ بوو.

شەوی 15

بەسەرهاتی قەلەندەری سێ یەم

شەهرەزاد وتی :

ئــەی پاشای بەختیار.. خــاوەنی بڕیار .. قـــەلەندەری سێیەم هاتە پێشەوە و وتی : خـادمەكەم.. بە سەرهاتی من وەكو ئەوەی ئەوان نی یە .. سەیر و عەجایب ترە!! هەر ئەوەش بووە هۆی كۆستەیی و لاركوێریم .. ئەوەی بە سەر ئەوان هات : بە قەزا و قەدەری خوا بوو ، بەڵام من خۆم قەدەرم بۆ خۆم هێنا.

ئــەگەرنا .. مــن شـازادە و كـوڕە پاشا بـووم . بـاوكم مـرد و بوومـە جێ نـشینی .. حوكمڕانییەكی دادپەروەرانەم كرد . شارەكەم لە سەر دەریا بوو... منیش ئارەزوویەكی فرەم لە گەشتی دەریا بوو.

( ٥٠ ) پاپۆڕی بازرگانیم بوو. (٥٠) بەلەمی بچووکیش . (١٥٠) پارچە پاپۆڕی جەنگیم بوو..
(١٠ ) بەلەمم برد و بە دەریادا رۆیشتین . دەمویست دوورگە بچووکەکان ببینم و خواردنی
مانگێکمان برد . (٢٠) رۆژ بەرێوە بووین . شەوێکیان با هەڵی کرد و شەپۆلەکان هێندە
خۆیان کێشا بە کەشتیەکەماندا . ژیانی لێ تاڵ کردین . دنیامان لەبەرچاو تاریک بوو.
روومان کردە خوا و پاڕاینەوە . بەڵام شەپۆلەکان هەر بەسەر یەکدا دەشکانەوە و ئەو شەوە
رەشە با سەروەر بوو تاکو رۆژ بووەوە .

دەریا هێور بووەوە و خۆر هەڵات و گەیشتینە دوورگەیەک و لامان دا . نان و چێشت
ئامادە کرا و خواردمان . دوو رۆژ حەواینەوە . دوای ( ٢٠ ) رۆژی دی گەشتەکەمان دەست
پێ کردەوە . بەڵام سەرۆکی پاپۆڕ رێگای دەریای لێ تێکچوو .

ئێمەیش بە کابرای چاودێرمان وت : سەیری دەریا بکە .

ئەویش سەرکەوتە سەرکۆڵەکەی ناوەڕاستی پاپۆڕ و سەیری ئەملا و ئەولای کرد. دوای
ماوەیەک هاواری بۆ کردین و وتی :

ئەی سەرۆکی پاپۆڕ .. سەیری لای راستم کرد . ماسیم بینی بەسەر ئاوەوە . سەیری
بەردەمم کرد تارماییەکی دوور بە دوورم بینی کە دەمێک رەش بوو.. دەمێکیش سپی..!

کە سەرۆکیش ئەو دیمەنەی بینی . کڵاوەکەی دا بە بەر پێی خۆیدا و وتی :

*مژدە بێت .. تاکمان لێ دەرناچێت..!!*

دەستی کردە گریان ... ئێمەش لەگەڵیدا بۆ خۆمان گریاین .

منیش بە گریانەوە وتم :

*سەرۆک گیان ، پێمان بڵێ : بە دووربینەکەت چیت دیوە؟*

ئـــەویش وتی :

گەورەم بزانە ، ئەو باو بۆڕفتە کە ئەم بەیانیە نیشتووەتەوە .. رێی لێ هەڵە کردووین..
ئەوەتا لە دەریادا ون بووین ... لەو شەوەوە ..ئەوە( ١١) شەوە ، بەسە ردەریاوەین . بایەکێش
، پاڵی بەرەودوا نی یە تاکو بگەڕێینەوە شوێنی خۆمان. ئەم ئێوارەش دەگەینە! شاخی
بەردە رەش !

ئیدی بمانەوێ و نەمانەوێ دەکەوینە نێوان ئەو شاخانەوە .. بزمار بە پاپۆڕەکەوە
نامێنێت و ئەو بەردانە رایان دەکێشێت و پاپۆڕ هەڵدەوەشێت . چونکە بەردەکان
موگناتیسن . چەندین پاپۆڕیان هەڵوەشاندووە ..

دوا بە دوای ئەو گوومەزێکی لە ( مس )ین بوو کە (١٠ ) کۆڵەکە راگیری کرد بوو. بە
سەر گرومەزەکەوە سوارەیەکی ئەسپە مسینە هەیە و ( رم )ێکی بە دەستەوەیە . لە سەر
سنگی سوارەکە پارچەیەک قورقوشمە ... کە هەندێ ناو و تەڵسەمی لێ هەڵکەندراوە.
ئەو ئەسپ سوارە رێبوارانێکی زۆری لەناو بردووە ! هیچ شتێک لە ناوی نابات.. تەنیا

ئەوە ئەبینێت کە شۆڕە سوارەکە لە سەر ئەو ئەسپە بکەوێتە خوارەوە و بگلێت .
خــاتوون گیان ... ئەوەندە بە کوڵ دەگریاو دەیوت : تیاچووین .
ئێـمەش دەستمان کردە گریان و گەردن ئازادیمان لە یەك کرد . چونکە ئومێدمان بڕی و زانیمان کە تیـا دەچین . ئـەو شـەوە نەنووستین و بۆ بەیانیـدا پاپۆڕەکـەمان بـەر کێشی چیاکان کەوت . هەر ئاسن بوو هاژەی دەهات ..بەرەو شاخ..!
بزمارێك چی یە... بـە پاپۆڕەکـەوە نـەما .. ئێمـەش بـە دەوری شاخدا دەسووڕاینەوە و پاپۆڕەکە لەبەر یەك هەڵوەشا... هەر کەسە و بە لایەکدا .. زۆریـەمان خنکاین ... ئەوانـەی کە مانەوە لەیەکتری ون بوون !! منـیش بـە سـەر پارچە تەختەیەکەوە مامـەوە و بایەکە پێچی دامـە دامێنـی شاخەکە . پلیکانەیـەکم بـینی بـەرەو سـەر.( بسم الله )م کـردو پێیـدا هەڵگەڕام . فرە دڵخۆشیش بووم بە رزگار بوونم.
گەیشتمە سەر گوومەزەکە . لەوێ دەستنوێژم هەڵگرت و دوو رکات نوێـژم کـرد . ئیـدی لە ژێر گوومەزەکەدا لێی نوستم .
گوێم لێ بوو لە خەوەمدا یەکێك پێی دەوتم :
ئەی کوڕی( حەسیب ) کە هەستایت ژێر پـێ یـەکانت هەڵبکەنـە ، کەوانێك و( ٣ ) تـیر دەدۆزیتەوە ، کە سەرە نێزەکانیان لە قورقوشمە و تەڵسەمی لێ نووسراوە .
کەوانەکە ببەو تیر بگرە ئەو شۆڕە سوارە مسینە ! سوارەکە دەکەوێتـە دەریـاوە . تیرەکـەش دەکەوێتـەوە بەردەستت . بیبـە لـە شوێنی سوارەکە بیـشارەوە . کە ئـەوەت کـرد . ئـاوی دەریاکە بڵند دەبێتەوە تـا دەگاتـەوە ئاستت ، کەشتی یـەك سـەر ئـاو دەکـەوێت و سوارێکی مسینی تێدایە و سوارەکەی پێشوو نی یە .. سەوڵێکی بە دەستـەوەیە و بـەرەو رووت دێـت . تۆیش سواری بەلەمەکەی ببە و (بسم الله) مەکە . ئیدی ماوەی (١٠) رۆژ سەوڵ لێ دەدات و بە دەریادا دەڕوات . تاکو دەتگەیەنێتە دەریای ئاشتی . لەوێشەوە دەتبەنەوە شارەکەی خۆت ، ئەمانەت بە سەر دێت گەر( بسم الله ) نەکەیت .
لـە خـەو راپـەڕیم . چییان لـە خـەودا پـێ وتبـووم : جێبـەجێم کـرد . ئەسـپ سـوارە مسینەکەم فڕێ دایـە دەریـاوە . تیرەکە کەوتـەوە بەردەسـتم . چـووم و شـاردمەوە . ئـاوی دەریا بڵند بوو. نزیکەی سەعاتێك چاوەڕێم کـرد. بەلەمەکـە پەیـدابوو و کەسـێکی مـسینی تێدا بوو بەسەر سنگی یەوە پارچەیەك قورقووشم بوو . کـە ( سـیحر) و ( تەڵـسەم )ی لـێ نووسرابوو . لەگەڵیدا سەرکەوتم بێ ئەوەی هیچ بڵـێم . رۆژی یەکـەم و دووەم و سـێ یـەم ، سەوڵی لێدا . تاکو (١٠) رۆژ بەڕێوە بووین . کە دەڕوانم ئەوە دوورگەی ئاشتەوایە . هەر زۆر دڵم خۆش بوو و خوام بیر خۆم هێناوە . دەستم کردە الله اکبر و بسم الله . هەر هێندەم زانی بەلەمەکە قڵپ بووەوە . رۆژێـك مـن هـەر مەلـەم کـرد . شـان و قۆڵم مانـدوو بـوو . ئـیتر شایەتمانم هێناو لە دڵی خۆمدا وتم : زیندوو نامێنم .

هێندەم زانی شەپۆلێکی بە هێز هەڵی دام . کاتێکم بەخۆ زانی : لەسەر زەوی و کەناری دەریام ..! کە بەئاگا هاتمەوە ، رووانیم تەڕم . جلەکانم گوشی و بە دیاریانەوە خەوم لێکەوت . کە خەبەرم بووەوە سەیر دەکەم .. جلەکانم نەماوە . بە کەناری دەریادا دەگەڕام و نەم دەزانی بۆ کوێ بچم ؟ بەلەمێکی بچکۆلەم لەو ناوەدا دۆزی یەوە . سواری بووم و بە دەوری دوورگەکەدا سووڕامەوە . بۆم دەرکەوت ئەم شوێنە دوورگەیەکی بچووکە و هەموو لایەکانی ئاوە .

لە دڵی خۆم دا وتم :

لە بەڵایەك رزگار دەبم ، بەڵایەکی لەو گەورەترم بۆ دەبێت ! لەکاتێکدا بیرم لە خۆم دەکردەوە . سەیرم کرد پاپۆڕێك پڕە لە سەرنیشین و بەرەو لام دێت ..!

لە بەلەمەکە دابەزیم و رام کرد و چوومە سەردارێك . پاپۆڕەکە گەیشت و لەنگەری خست . (١٠) کۆیلە دابەزین و هەر یەکە و فانۆسێکیان پێ بوو. رۆیشتن تاکو گەیشتنە ناوەڕاستی دوورگەکە. چاڵێکیان لە زەویدا هەڵکەند . دەرگایەکیان دۆزی یەوە و دەستیان کردە گواستنەوەی ئارد و نان و رۆن و هەنگوین و مەڕو ماڵات و ئەوەی ماڵ پێویستی بێت. کۆیلەکان هەر لە هات و چووندا بوون . تاکو هەر چی یەك لە پاپۆڕەکەدا بوو ، بردیانە ناو چاڵەکەوە . جلوبەرگی جوانتریان لەبەر کرد و پیرەمێردێك لە ناوەڕاستیاندا بوو. کە زەمانە ماندووی کردبوو.. هەر وەکو چۆن شاعیرێك وتوویەتی :

زەمانە زۆری توند را تەکاندووم زۆریش بە هێز بوو زۆر رای وەشاندووم

کە بێ ئاگا بووم رێگای پێ بڕیم ئێستا بە ئاگام ئەو دای چەقاندووم

دەستی هەرزەکارێکی فرە شۆخ بە دەستی پیرەمێردەوە بوو.. هەموویان خۆیان کرد بە دەروازەکەدا و بۆ چاڵەکە..! نزیکەی سەعاتێکیان پێچوو. هەر هەموویان هاتنەوە دەرەوە، هەرزەکارەکە نەبێت .

دەروازەکەیان داخستەوە و بەرەو پاپۆڕ چوون و لە چاوم ون بوون . منیش لە درەختەکە هاتمە خوارەوەو بەرەو گڵە داپۆشراوەکە چووم . ئەمەندەم گڵ هەڵدایەوە ، تاکو ماندوو بووم . ژێر زەمینەکە دەرکەوت . کە سەیر دەکەم تەختەیەك بە هێندەی بەردی بەرداشی دەستاڕی ئاشێك دەرکەوت . لام برد و پلیکانەیەکی بەردین دەرکەوت .

کە گەیشتمە خوارەوە . خانوویەکی پاك و خاوێنم بینی . کە فەرشێکی زۆری تیا راخرا بوو . بە قوماشی ئاوریشم رازا بووەوە . هەرزەکارەکە لەسەر ( سەکۆ )یەك شانی دادابوو . کە منی بینی رەنگی زەرد هەڵگەڕا .

سڵاوم لێ کرد و وتم :

مەترسە .. وەکو تۆ مرۆڤم . قەدەر منی بە تۆ گەیاندووە .. حەز دەکەم هۆگری یەکتری ببین و بێتاقەتیت دەربکەم ! ئیدی ئەویش رەنگی بووەوە بە گوڵ .

لە خۆی نزیك كردمەوەو وتی :

براكەم ، بەسەرهاتی من سەرسوورهێنەرە . باوكم زەرەنگەرە ..كۆیلە وخزمەتكاری هەیە! كەشتیگەلێكی زۆری هەیە ، كاڵا بازرگانیەكانی دەگەیەننە ، ئەوپەڕی دنیاو سامانێكی بەربڵاوی هەیە . بەڵام نەزۆكە و كوڕی نی یە .

لە خەویدا پێیان وتبوو :

كە كوڕێكت دەبێت ، بەڵام تەمەنی كورت دەبێت . باوكم كە خەبەری بوو بووەوە ، زۆر گریا بوو. دایكم سكی بە من پڕ بوو . كە دواتر ژان گرتی و مامان هاتە لای : منی بوو . باوكم خواردنێكی فرەی بۆ خەڵك كرد . هەژارانی تێر كرد ، لەبەر ئەوەی بە پیری خوا منداڵێكی پێ بەخشیوە ! ئەویش فەلەكی و ئەستێرە ناسان و فاڵچیانی كۆكردەوە و كەوتنە كۆڵینەوە ، لە ئەستێرە و رۆژی لە دایك بوونم و بە باوكمیان وت بوو :

كوڕەكەت تەنیا (١٥) ساڵ دەژی وكۆسپ و كێشە دێتە ڕێی . گەر توانیی چارە سەریان بكات ئەوە زۆر زۆر دەژی ! هۆی مردنیشی . دەریای ( تیاچوون ) و چیای ( موگناتیس )ە . كە ئەسپ سوارێكی مسینی پێوەیە و پارچەیەك قوڕقوشم بە سەر سنگی یەوەیە . هەر كاتێك سوارەكە لە ئەسپەكەی كەوتە خوارەوە ، ئەوا دوای (٥٠) رۆژ كوڕەكەت دەمرێت ! بكوژی كوڕەكەت ناوی (عەجیبی كوڕی خەسیبە) و هەر ئەویش سوارە مسینەكەی خستووەتە خوارەوە . باوكم خەمێكی زۆری خوارد . منی بە جوانی پەروەردە كرد . تاكو تەمەنم گەیشتە( ١٥) ساڵ.(١٠ ) رۆژ لەمەوپێش باوكم هەواڵی بۆ هات كە(سوارە مسین )ەكە كەوتووەتە دەریاوە . ئەوەشی خستویەتی یە دەریاوە ناوی : (عەجیبی كوڕی خەسیب )ە ! باوكم خەمی ئەوەی بوو : منیش بكوژێت و منی هێنایە ئێرە ، ئەمە بەسەرهاتەكەمە و ئەمەیە هۆی تەنیا باڵی یەكەم !

منیش فرەم پێ سەیر بوو! لە دڵی خۆمدا وتم :

ئەسانەی ئەم دەیڵێت : من هەموویم كردووە ، بەو خوایە هەرگیز ئەم كوڕە ناكوژم ..!!

رووم كردە لاوەكە و وتم :

گەورەم ، خوا لە بەڵاو ئەهامەتی بە دوورت بكات و هەرگیز پەژارە نەبینیت ! من لێرە پەرژێنیت دەكەم و ناهێڵم بە تەنیا بیت . دواتر تۆیش بمدە دەست پیاوەكانت . تاكو لەگەڵیان بگەڕێمەوە بۆ شارەكەی خۆم !

ئیدی دەمەتەقێمان كرد ، تا شەو داهات و مۆمەكانم داگیرساند . چراكانم هەڵواسیەوە و خواردنم ئامادە كرد . درەنگانێك دامپۆشی و خۆیشم نووستم . بەیانی هەندێك ئاوم گەرم كرد و لەسەرخۆ بە ئاگام هێنا و ئاوە گەرمەكەم بۆ برد و دەست و دەم و چاوی شت .

ئەمجا وتی :

خوا پاداشتت بداتەوە . ئەی لاو بەو خوایە ... هەر كاتێك لەم بەڵایەی ناوی ( عەجیبی

کوڕی خەسیب )ە رزگارم بوو ، کارێك دەکەم باوکم پاداشتت بداتەوە . مردیشم تۆ خۆش ..!

منیش وتم :

خوا یار بێت هیچ روو نادات و مەرگم پێش مەرگت بکەوێت .

خواردنم هێنا و دواتر گوڵاوم رشت . دوای کەمێك ( دامە)م هێنا و دەستمان کرد بە یاری کردن .

هەندێك شیرینیم هێنا و خواردمان . دەستمان کردەوە بە یاری کردن . تاکو شەو داهات .

ئەویش تاکو درەنگانێ دەمەتەقێ و دواتر نووست و منیش دامپۆشی و خۆیشم نووستم .

خاتــوون ... ئێمە چەندین شەو و رۆژمان بەو شێوەیە بەسەر برد ... خۆشەویستیی ئەو کوڕە چووە دڵمەوە .

بە خۆیشم دەوت :

( ساحیر) و ( ئەستێرەناسان ) ، درۆ دەکەن .. بەو خوایە نایکوژم .

(٣٩ ) شەو خزمەتم کرد .

شەوی (٤٠)ەمین ، کوڕەکە زۆر دڵخۆش بوو و وتی :

سوپاس بۆ خوا ، لە مردن رزگارم بوو. ئەمەش بێ و قەدەمی پیرۆزی تۆ بوو! لە خوا دەپاڕێمەوە تۆیش بە شار و مەملەکەتی خۆت شاد بیتەوە .

ئاوم بۆ گەرم بکە ، با خۆم بشۆم . منیش بە قسەم کردو تەنانەت پشتیشم شت و جلەکانی و نوێنەکانیم بۆ گۆڕی . دواتر لە سەری راکشا و نووست .

کە هەستایەوە وتی :

بەڵکو کاڵەکێکی شیرین ، بێنیت تاکو بیخۆین .

منیش چووم کاڵەکێکم هێناو پرسیم :

گەورەم .. چەقۆت نی یە ؟

ئەویش وتی :

ئەوەتا لە سەر ئەو رەفەیەی سەر سەرمە . منیش دەستم برد و بە پەلە کلکەکەیم گرت . پێم لە شتێك هەڵکەوت و کەوتم بە سەر کوڕەکەدا و چەقۆکەش کە بە دەستمەوە بوو ، چەقی یە سەر سنگی کوڕەکە و هەر لە جێدا مرد ..!!

منیش تووشی شۆك بووم و کەوتمە هاوار کردن :

ئەی موسڵمانان .. ئەم کوڕە ناخری یە بە دەستی من رۆژی تەواو بوو . خۆزگە پێش ئەو بمردمایە .

فریا نەکەوتم ، کاڵەکەکە بشکێنم . خوا چی ویست هەر ئەوەیە ! هاتمەوە سەر زەوی ! تەختە خڕەکەم خستەوە سەر کونەکە و گڵەکەم بە سەریدا دایەوە .. رام کرد و بە درەختەکەدا هەڵزنام و کەوتمە سەیری دەریاکە بینیم پاپۆڕێك بەرەو کەنارەکەمان دێت .

لەدڵی خۆمدا وتم :

هەر ئێستا. دادەبەزنە ژێر زەمینەکە . هەر کە کوڕەکەیان بە کوژراوی دەبینن . بۆم دەگەڕێن و دەمگرن و دەمکوژن ! چوومە سەر دارێکی بڵندتر و بە گەڵاکەی خۆم داپۆشی ! هەر هێندەم زانی پیرەمێردی باوکی کوڕە کوژراوەکە و پیاوانی دابەزین و بەرەو ژێر زەمینەکە چوون و گڵەکەیان هەڵدایەوە.

کە چوو بوونە خوارەوە و کوڕەیان بینی لە ناو جێگادا راکشاوە و پاك و خاوێنە و بریسکە دەداتەوە .

بەڵام کە بە وردتر سەرنجیاندا .. چەقۆیەك لە سنگی چەقیوە ! کەوتنە هاوار و گریان و لە خۆدان . پیرەمێردەیش بۆ ماوەی یەك سەعات بوورایەوە .

ئەوانیش وتبوویان : دوای کوڕەکەی ناژی !

کوڕەیان پێچایەوە و بەرەو پاپۆڕەکەیان برد . پیرەمێردیشیان بەرە و پاپۆڕەکە برد. ئیدی کە کوڕەکەی بینی راکشاوە. کەوتەوە هاوار و گریان خۆڵی بە سەر خۆیدا کرد و جارێکی دی بوورایەوە . کە ئەو دیمەنانەم دی خەمێکی زۆرم خوارد.. ئەم هۆنراوەیەم وت :

بە رەحمە ساتێ بەندەی بێ ئاگا خوا پشتی دەگرێ و خۆیشی تێناگا

بەیانی دڵی ناخۆش و تەنگە و ئێوارەش دڵخۆش لەگەڵ بەر بانـــگا

خاتوون گیان .. پیرەمێرد بە بووراوەیی مایەوە و پیاوانیش لە ژوور سەری بوون .. کە بەئاگا هاتەوە سەیرێکی کوڕەی کرد : مردووە . کەوتە لە خۆدان و خۆ لاواندنەوە :

دڵ لە دووریتان وا کەوتە خوارێ لە چاوانیشم فرمێسك دەبـــارێ

ناخی بە جەرگم دوور کەوتیتەوە دەستەوسانیشم: بەرداش بم هاڕێ!

بە خۆزگایی خوا هەر ئەم بینی با ئێستاش ناتوانم : بیدەم دەستبارێ

ئەو دەمەخۆش بوو هەموو پێکەوە بەختیار بووین لە یەك ماڵ وجێگەوە

بۆ تیری چاوپیس: بووینە نیشانە بووە هۆی دووری و ئەم دابـــڕانە !

ئای کە نزام کرد.. پاڕامەوە زۆر منت جێ هێشت و هەوارت بۆ گۆڕ

ئێستاش دارایی و سامانم دەدەم تا بت بینمەوە : بەڵام پێت ناگەم !

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .... بێدەنگ بوو.

شەوی ١٦

شەهرەزاد وتی :

دەگێڕنەوە .... ئەی پـــاشای بەختیار ... خـــاوەنی بڕیار.. پیرەمێرد ناڵەیەکی بڵندی لێوە هات و دڵی وەستا و مرد . پیاوانی دەست و پێوەند و سەرنشینانی پاپۆڕ..کەوتنە شین و شەپۆڕ. ئیدی چارەیان نەما. ئەویشیان بە تەنیشت کوڕەکەیەوە لە ناو پاپۆڕەکەدا راکێشا و گوریسی لەنگەرەکانیان کردەوە و کەوتنە رۆیشتن .کە لە چاوم ون بوون . هاتمە

خواردەوەو گڵەکەم : جارێکی دی هەڵدایەوەو چوومەوە خوار .

کە چاوم بە شتەکان کەوت ... ئەمە هۆنراوەیەم وت :

هەرچی دەتبینم زوو تاسەتەکەم      بۆ تۆیە جار جار کە خۆم مەستەکەم

لەوەیش بپرسە : تەنیا جێ مابێ      کە بڕوا ناکەم ( ئەشك )ی پێ مابێ

بە درێژایی مانگێك ، شەوانە لە ژێر زەمینەکەدا دەنووستم و ڕۆژانە دەچوومە ناو دوورگەکە و دەگەڕام ...دەچوومە ڕۆژ ئاوای دروەگەکە . چونکە ئاوەکەی گەڕابووەوە و شەپۆلەکانی کەم بوو بوونەوە و زەویەکی ئاوی بەجێ هێشتبوو .

ئەگەر وشترێکی پیا بڕۆشتایە دەست و قاچەکانی ڕۆ دەچوون . منیش وەرەم دایە خۆم و پێیدا ڕۆیشتم ، ئاگرێکی بە کڵپەم لە دوورەوە بینی .. بەرەو رووی بوومەوە .. ئێ .. بەڵکو خوا دەرووییەکم لێ بکاتەوە . لەبەرخۆیشمەوە ... ئەم شیعرەم وت :

ئێ بەڵکو قەدەر جڵەو بگۆڕێ      بێنێتە ڕێمان : چاکەیە.. خێرێ !

بەڵکو بە دڵی خۆمان لەگەڵ کا      دنیا ئـاڕووخێ... خێرم بێتە ڕێ

بەرەو ڕووناکی یەکە چووم . ڕووانیم ئەوە کۆشکێکە . دەروازەیەکی (مس)ی هەیە. کە هەتاو لێی دەدات دەبریسکێتەوە. زۆرم پێخۆش بوو. بەرامبەری دانیشتم . فرەی پێنەچوو (١٠) هەرزەکارم بینی جلوبەرگی جوانیان لەبەر دابوو ! پیرەمێردێکیان لەگەڵدا بوو. سەیرەکە لە وەدا بوو ، هەر (١٠) کەسەکە ( لارکوێر ) بوون . منیش سەیری ئەوەم لێهات، ئاخۆ ئەم لارکوێرانە چۆن یەکیان گرت بێت !؟

کە منیان بینی سڵاویان لێکردم و هەواڵیان پرسیم . منیش چیم بە سەر هاتبوو، بۆم گێڕانەوە . هێندە بەسەرهاتەکەمیان پێ سەیر بوو، بردمیانە کۆشکەکەوە . ڕوانیم ،لە کۆشکدا (١٠) سەکۆ هەن لە سەر ئەوانیش (١٠) سەکۆڵکەی بچوکتر هەیە و سەرتاپا شین!

هەر یەکەیان چووە سەر سەکۆڵکە بچوکەکەی خۆی و لە ناوەڕاستدا ، سەکۆڵکەیەك هەبوو، پیرەمێردەش چووە سەر ئەو سەکۆڵکەیە .

ئەمجا بە منی وت :

ئەی لاو، لەم کۆشکەدا بۆ خۆت بمێنەوە ، بەڵام نە لە (لارکوێری ) و نە لە بەسەرهاتمان بپرسە ..! پیرەمێرد هەستا و خواردن و خواردنەوەی خستە بەردەممان . تاکو نیوەشەو، پرسیاریان لێم کرد و بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێڕانەوە .

دواتر لاوێکیان وتی :

پیرەمێرد ، ئیدی کاتی مووچەکەمانە .

ئەویش وتی : بە سەر چـاوان .

هەستا و چووە گەنجینەکە . دوای کەمێك هاتەوە و(١٠) قاپی هێنا ، هەر یەکەیان ،بە قوماشێکی شین داپۆشرا بوو و هەر یەکە و قاپێکی بۆ دانـا. (١٠) مۆمی داگیرساند و هەر

قاپە و مۆمێکی داگیرساوی خستە سەر. کە سەری قاپەکانی لادا ، خۆڵەمێش و خەڵووزی کوتراو و قەترانی قەدەری تیا بوو. هەموویان قوڵیان لێ هەڵکرد و دەستیان بە شین و واوەیلاکرد و خۆڵەمێش و خەڵووزەکەیان ، بە سەر وچاوی خۆیاندا کرد .
لە خۆیان دەداو دەیان وت :
بێخەم دەژیاین هەر وەکو مەردان     کەوتنە فیتنەیی و هەم دەست تێوەردان
تاکو بەرەبەیان ئەمە کاریان بوو. پیرەمێرد ناوی بۆ گەرم کردن . ئەوانیش سەرو دەم و چاویان شت و جلوبەرگی بۆ هێنان و خۆیان گۆڕی .
خانم ... منیش کە ئەمەم بینی هۆشم لە سەردا نەما. هێندە سەراسیمە بووم ! ئەگبەتیەکەی خۆمم بیر چووەوە .
بۆیە پرسیم :
دوای ئەو دانیشتنەی کە هەموو پێی شاد بووین ... ئەمە چی بوو؟
ئاخر... ئێوە کەسانێکی وریا و ژیرن... ئەم کارەتان شێتانەیە . سوێندتان دەدەم : هۆی ئەم لارکوێری یەتان و لە خۆ دانەتان و خۆڵ بەسەرخۆ کردنانەتان چی یە !؟ پێم بڵێن !!
یەکێکیان وتی :
ئەی لاو بە هەرزەکاریت فریو مەخۆ! کۆڵ بدە لە پرسیار کردن .
نانی نیوەڕۆ هات و نان خورا . کە شەو داهات بە هەمان شێوە ، مۆم و چرایان داگیرساندەوە . سفرە و خوان دانرایەوە . تاکو نیوەشەو دەمەتەقێمان کرد .
لاوێکیان ، بە پیرەمێردەکەی وت : شەو درەنگە ، مووچەکەمان بۆ بێنە .
دیسان وەکو شەوی پێشوو رێ و رەسمی شین و شەپۆڕەکەیان کردەوە . مانگێك بەم شێوەیە لەگەڵیان مامەوە ! ئەمانیش هەموو شەوێك : ئاوا لە سەرو سنگی خۆیان دەداو دواتر خۆیان دەگۆڕی .
پێم وتن :
ئەی هەرزەکاران ، گەر هۆی ئەم لە خۆدانەم پێ نەڵێن ... ئەوا بە جێتان دێڵم .
ئەوانیش وتیان :
پاراستنی نهێنیی خۆمادمان بە لاوە باشترە .. تا رۆیشتنی تۆ !
منیش هەروا سەراسیمە مامەوە و مانم لە خواردن و خواردنەوە گرت !
پێم وتن : دەبێت هەر پێم بڵێن .
ئەوانیش وتیان :
ئاخر ... تۆیش بارت گران دەبێت و وەکو ئێمەت لێ دێت .
منیش وتم :
هەر دەبێت پێم بڵێن .. ئەگەرنا ، جێتان دێڵم و دەڕۆمەوە کن کەس وکارم .

ڕۆژ بووەوە بەرانێکیان هێناو سەریان بڕی و گروویان و پێیان وتم :
ئەگەر بەسەرهاتەکەت بۆ بگێڕینەوە زۆری پێدەچێت . فەرموو، ئەم کێردە تیژە بگرە و لەم پێستی بەرانەدا پاڵ بکەوە . ئێمەش دەی درووینەوە . باڵندەیەك دێت ، سیمرخی ناوە . ئەم پێستە هەڵدەگرێت و لە شەقەی باڵ دەدات و لەسەر لوتکەی شاخێك دەنیشێتەوە . بە کێردەکە پێستەکە بدڕە و وەرە دەرەوە . کە ( سیمرخ ) تۆی بینی ، دەترسێت و جێت دێڵێت . ئەمجا ئیوە ڕۆژێك بە ڕێدا بڕۆ تا دەگەیتە کۆشکێکی سەر سوورهێنەرو بڕۆ ژوورەوە . لەوێدا بە مەبەستی خۆت دەگەیت ! چونکە ئێمە لەوێدا تووشی ئەو چاوی ڕاست لە دەست دان و لە خۆ دانە بووین . زۆر دڵم خۆش بوو . چۆنیان وت.. وایان لێ کردم .
سیمرخ هات و منی هەڵگرت و دای لە شەقەی باڵ . کە نیشتەوە ، پێستەکەم بە کێردەکە دڕی و ڕۆیشتم . تا گەیشتمە ناو کۆشك . کە ڕووانیم (٤٠ ) کەنیزەکی تیایە هێندە جوانن .. وەکو مانگی تابانن! کە منیان بینی بەخێریان هێنام و لەسەر سەکۆیەکی بڵند دایان نام بۆ خواردن لەگەڵم دانیشتن . چوون حەسیرێکیان هێنا و رایان خست . چەند پیاڵە و چەند جۆر میوەیان لەسەر دانا . چەند کەنیزەك ( عوود )یان ژەن و گۆرانی خۆشیان چڕی . کۆڕ هێندە خۆش بوو.... خەم و پەژارەم فەرامۆش بوو!
کە سەری ساڵ هاتەوە ، پێیان وتم :
خۆزگە هەر ئەمان ناسیبای! گەر گوێیان لێ بگرتینایە بۆ خۆیان باش بوو . دەستیان کرد بە گریان.
پێم وتن : چیتان بیستووە ؟
وتیان :
ئێمە هەموومان شازادەین و چەند ساڵێکە لەم کۆشکەداین . هەرجارە و( ٤٠ ) ڕۆژ ون دەبین . دواتر دێینەوە ئێرە و ساڵێك دەمێنینەوە ! ڕێورەسمی خۆمان هەیە و دەترسین ، کە ڕۆیشتین تۆ سەر پێچی بکەیت . چونکە کلیلەکانی ئەم کۆشکە دەدەینە دەست تۆو خۆمان دەڕۆین .
ئەم کۆشکە (٤٠)دەرگای تێدایە . بۆت هەیە (٣٩ ) دەرگایان بکەیتەوە . بەڵام دەبێت ئاگادار بیت و (٤٠)هەمیان نەکەیتەوە .
چونکە گەر ئەو دەرگای چلهەمە بکەیتەوە . ئەوە ئێمەت لە دەست دەچێت !
منیش وتم :
جا... چی یە ، پەیمانتان دەدەمێ کە هەرگیز نایکەمەوە .
ساڵ کۆتایی هات و ئەوان جێیان هێشتم و بە تەنیا لەو کۆشکە زەبەلاحەدا مامەوە . کە ئێوارە هات . دەرگای یەکەمم کردەوە . ڕۆیشتم تا گەیشتمە خانوویەك کە دەتوت بەهەشتە.. ڕەز و باخێکی تیابوو سەوزو ڕازاو.. میوەی ناسك و پاراو. جۆگەکانی و تاڵگە

زێرینەکانی دڵرفێن بوون. بە نێو ئەو درەختانەدا ڕۆیشتم . هەوا پڕ بۆنی گوڵان بوو.. دەنگی خۆشی بولبولان بوو. پڕ بە وەسفی شاعیران بوو:

بەه .. بەه ! لەو میوە و هەرمێ یە لە دنیادا بە نـــامێ یە

چێژی خۆشەو بۆنی ( مسك )ە ڕەنگی زەردی هی ( شەرمێ)یە

قۆخم بینی ، ئاوی چاوی دەبردو دەتوت یاقووتە ! دوایی گەڕامەوە . دەرگاکەم لەسەر داخستەوە و لێی نووستم . ڕۆژی دواتر دەرگای گەنجینەیەکی دیم کردەوە و چوومە ئەو دیو . دەڕوانم گۆڕەپانێکی گەورەیە و دارخورمایەکی فرە و جۆگەلەی ئاو و گوڵ و یاسەمین و مـەردەقوش و نەسرینی تێدایـە . نێرگـز بـە هـەردوو لایدا بووەتـە ڕاخـەر. ئەم بەرو ئەوبەریدا شنەی شـەماڵ بـوو. بـۆنی ئـەو گوڵانـەی بـڵاو دەکـردەوە .کاتێکی خۆشم تێدا بەسەر برد . دەرنگانێك گەڕامەوە و دەرگاکەم داخستەوە .

ڕۆژی دواتر دەرگای گەنجینەی سێ یەمم کردەوە . هۆڵێکی فراوانم بینی . کە پایەکانی و ناو ژوورەکان لە بەردی مەڕمەڕ دروست کرابوون . چەندین قەفەز و جۆرەکانی بولبول و کەناری و ڕیشۆڵە و قومری تێدا بوو. خەم و پەژارەی بیر بردمەوە . ئەو ڕۆژەم لە ناو باخەکەیدا بەسەر برد و شەویش مامەوە .

بۆ سبەینێ دەرگای چوارەمم کردەوە : کە دەڕوانم خانوویەکی گەورەی تێدایـە و (٤٠) گەنجینەی تێدایە و دەرگایان کراوەیە . خۆم کرد بە گەنجینەیەکیدا. بینیم پڕە لە یاقووت و مرواری و مەرجان .

هەر سەرم لێی سوڕما بە خۆم وت :

ئەم هەموو شتە گرانبەهایانە : لە گەنجینەی پاشایانیشدا نین !

ئیدی زۆر دڵم خۆش بوو بە خۆم وت :

ئێستا من پاشای سەر دەمم . ئەم سامانەش لە خواوەیە ! ئیتر من (٣٩ ) ڕۆژ، بەو کۆشکانەدا دەگەڕام . هـەموو گەنجینـەکانم کـردەوە .. تـەنیا ئـەو گەنجینەیـە نـەبێت ، کە ئامۆژگاریان کردبووم . تا نەیکەمەوە !

خـاتوون گیان .. بیر و هۆشـم هـەر لای ئـەو گەنجینەیـە بـوو... کە ئـەم دیبـوو، پێیان وتبووم ، نەکەی بیکەیتەوە . شەیتان چووە کەللەمەوەو ئارامم لەبەر هەڵگیرا ، ئەوا .. یەك ڕۆژی تەنیاییشم ماوە . خۆم پێ نەگیراو دەرگای گەنجینەی چلەمم کردەوە . کە چوومە ژوورەوە ، بـۆنێکی هێنـدە خۆشـی لـێ دەهـات .کـە لـە ژیانمـدا هـەڵم نەمـژی بـوو. لـەو بیرکردنەوەیەمدا بووم و بوورامەوە . سەعاتێکم پێچوو. کە بە ئاگا هاتمەوە ، وەرەم بە خۆم دا و چوومە ناوەوە . سەیر دەکەم ، زەوی کۆشکەکە بە ڕەنگێکی زەعفەرانی ڕاخراوە . کۆمەڵە فانۆسێکی زێـڕین!! چـەندین گوڵـدانی تێـدا بـوو کـە بـۆنی مـسك و عەنبـەریان لێ دەهات و بریسکەیان دەهات .

خاتوون گیان.. ئەسپێکی قەترانیم بینی ، زینەکەی لە زێڕ بوو و دەتوت شەوی ئەنگوستە چاوە ! ئاخورێکی لە بلوور بۆ دروست کرابوو. ئالیکی کونجیی تیابوو. رەشمە کرابوو و بە جوانی بەسترابووەوە . کە ئەمەم بینی بە خۆم وت .. ئەم ئەسپە وا راگیرابێت و بە خێو کرابێت .. دیارە کاری گەورەش دەکات ! شەیتان فریوی دام و سواری بووم ! لە جێی خۆی نەبزووت . پاژنەم لە ژێر سکی داو نەبزووت..! قامچی یەکەم لێ گردەوە و توند پێمدا کێشا.. هەر کە هەستی بە ئازار کرد حیلانی و دوو باڵی لێ پەیدابوو . وەکو هەورە بروسکە فڕی و منی گەیاندە ئاسمان ! لە سەر بانی کۆشکەکە نیشتەوە و کلکێکی کێشا بە دەم و چاومدا و چاوی راستم دەرپۆقی و لەگەڵ خوێندا بە رووەمتمدا هاتە خوارەوە !

کە کەوتمە خوارەوە ( لارکوێر)ەکانم بینی یەوەو پێیان وتم : بەخێر نەیەیتەوە .

منیش وتم :

ئەوە منیش بووم بە یەکێك لە ئێوە! لەمەودوا قاپ و قوماشە شینەکە بدەن بە منیش . با تێر لە خۆم بدەم و رێگەشم بدەن لای ئێوە بمێنمەوە .

ئەوانیش وتیان : نەخێر.

بە دڵ شکاوی و پەژارەیەکی فرەوە .. ملی رێگام گرت و بە خۆم وت : هەڵەکونیم کرد... لە خۆمم تێکدا !

شارە و شارو دێ و دێ سەری خۆم هەڵگرت! ئەم ئێوارە گەیشتمە ( بەغداد) و ئەم دوانەم بینی .

پێم وتن : ئـــامۆم .

ئەوانیش وتیان : ئێمەش نامۆین بەم شارە..!!

ئیدی وارێك کەوت ئەم ( ٣ ) کورە کەچەڵەیش وەك من چاوی راستیان کوێر بوو.

خـــاتوون ... ئەمە بوو هۆی ( لارکوێر)یم و کەچەڵە بوونم .

کیژۆڵەی خانەخوێنیش پێی وت :

*هەردوو بەری دەستت .. بخە سەر سەرت و برۆ بەرێی خۆتەوە .*

ئـــەویش وتی :

منیش وەکو ئەوانی تر دەکەم و نـــارۆم ... تاکو بەسەرهاتی ئەوانی تر نەبیستم .

کیژۆڵەی خـــانەخوێ رووی کردە ( خەلیفە ) و ( جەعفەر ) و ( مەسرور ) و وتی :

ئێوەش بە سەرهاتی خۆتان بگێڕنەوە .

( جەعفەر) هاتە پێشەوە و چی بۆ دەرگاوانەکە گێڕابووەوە ، ئەوەیشی بۆ کیژۆڵەکە گێڕایەوە .

کیژۆڵە وتی : ئەوە ئێوەشم بەخشی یەوە بە یەك ..

لەماڵ چوونە دەر و بە کۆڵانەکەدا ڕۆیشتن .
( خەلیفە ) چووە لای ( ٣)کوڕە کەچەڵە و لێی پرسین :
هێشتا ڕۆژ نەبووەتەوە ، بۆ کوێ دەچن ؟
ئەوانیش وتیان :
بە خوا... قوربان خۆشمان نـازانین بۆ کوێ دەچین..!!
خەلیفەیش وتی : وەرن ئەمشەو لە ماڵی ئێمە بن .
بە ( جەعفەر )یشی وت :
لەگەڵ خـۆت بیـان بـەرەوەو سـبەینێش بیـان هێنـە بـۆ لام . تـاکو بەسـەرهاتەکانیان بنووسینەوە .
جەعفەریش فەرمانەکەی جێبەجێ کـرد . خەلیفـەش بۆکۆشـکی خـۆی و ئـەو شـەوە خـەو نەچووە چاوی و تەپ وتلی بوو. سبەینێ لە سەر تەختی شاهی دانیشت . وەزیران و پیاوانی دەوڵەت کۆبوونەوە .
ڕووی کردە جەعفەر و وتی : بڕۆ (٣)کیژە و (٢) سەگەکە و کوڕە کەچەڵەکانم بۆ بێنە .
کە هێنایانن (٣) کیژەکە خرانە پشتی پەردەوە و خەلیفە پێی وتن :
بێ ئەوەی بمان ناسن . میواندارییەکی باشتان کـردین . ئێـستا خۆمتـان پـێ دەناسـێنم . مـن پێنجەمینی عەباسی یەکان و بـرای ( هاروونـە ڕەشـید )م . فـەرموون بـە سـەرهاتی ڕاسـتی خۆتان بگێڕنەوە !
کیژە گەورەکەیان لە پشتی پەردە دەرچوو و هاتە بەردەم ( خەلیفە ) و وتی :
*میری موسڵمانان .... دەهێنێت : بەسەرهاتی من بە ئـاوی زێڕ بنووسرێ ..!*
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.*

## شەوی ١٧

بەسەرهاتی کچە گەورە و دوو سەگە ڕەشەکە
*شەهرەزاد* وتی :
ئـەی پاشای بەختیار .... خـاوەنی بڕیار...
خوشکی گەورە لە بەردەم خەلیفەدا وتی :
گەورەم پێت سەیر نـەبێت بڵێم : ئـا.. ئـەم دوو سـەگە ڕەشـەی پێمـە .. هـەردووکیان خوشکی خۆمن سێ دەستە خوشکی دایە و بابە بووین ! بەڵام ئەم (٢) کچەی بـەردەمتان ، کە یەکێکیان شوێنی ئەشکەنجە و لێدانی پێوە دیارە و ئەویتریان ، نـاوی ( خوشکاشـە )یـە . لە باکمەوە خوشکمن !! کـە باوکمـان مـرد . میراتیمـان بـەش کـردو دوای چـەند ڕۆژێـك

دایکیشمان مرد . ئەویش (٣) هەزار دیناری لە دوا بەجێما ! هەر کچەمان و (١٠٠٠) دیناری ئەویشی بەرکەوت .. من بچوکترنیان بووم .

هەردووکیان شوویان کرد. ماوەیەکی پێچوو، هەر زاوایە و کاروانی بازرگانیی بەو (١٠٠٠) دینارە رێکخست و سەفەریان کرد و منیان بە تەنیا جێ هێشت و (٥) ساڵێکیان پێچوو.

تووەمز.. هەردوو زاواکەم دەستمایەکانیان لە دەست داوە . دوو خوشکەمیان لەو غەریبایەتیە بەرەڵا کردووە و سەری خۆیان هەڵگرتووە .

خوشکە گەورەکەم .. شارە و شار بەدەم سواڵکردنەوە و بە جلوبەرگێکی شڕەوە، گەڕایەوە بۆ لام !

کە بینیم ئەم ناسی یەوە..! کە پێی وتم خوشکتم : سەرم سووڕما!

کە پرسیم : بۆ ئەمەت بە سەر هاتووە؟

ئەویش وتی : قسە سوودی نی یە . ئەمە لە چارەم نووسرابوو .

بردمەوە و گەرماوم بۆ داخست و بە بەرگی خۆم پۆشتەم کردەوە .

ئەمجا پێم وت :

خوشکە گیان .. تۆ لەجێی دایك و باوکمی . ئەو میراتیەی وەرم گرت ، کاسبیم پێوە کرد و منیش زەکاتم لێ دەدا و خوایش بەرەکەتی تێ خست . سوپاس بۆ خوا حاڵم زۆر باشە .. لەمەودواش پێکەوە دەیخۆین .

بەو شێوەیە ، ساڵێك لای من دانیشت . دڵمان هەر لای خوشکەکەی ترمان بوو. هێندەمان زانی ئەویش پەیدا بوو و ئەویش حاڵی لە حاڵی خوشکە گەورەکەم خراپتر بوو. چیم لەگەڵ خوشکە گەورەم کرد. لەگەڵ ئەمیشیاندا بە هەمان شێوە کردم .

دوای ماوەیەك ، دوای ماوەیەك ئەم دوو خوشکەم زۆریان بۆ هێنام و پێیان وتم :

بە بێ مێرد هەڵناکەین و دەمانەوێت شوو بکەینەوە !

منیش پێم وتن :

شووتان کرد و ژیانی بە دواوە بوو . بۆیە جارێکی دی ، شتی وا مەکەن .

نەیان بیست و بێ پرسی من ... شوویان کرد . ناچار بە پارەی خۆم .. ( جیازی)م بۆ کڕین و ئاهەنگم بۆ گێڕان و بە ڕێم کردن ... دوای ماوەیەکی کەم : مێردەکانیان .. پارە و پوولیان پێ ئەهێشتن و تەڵاقیان دان !

دیسان هەردووکیان هاتنەوە بەر دەرگاکەم و وتیان :

تۆ لە ئێمە بچووکتریت .. بەڵام لە هەردووکمان زیرەك و داناتری .. لێمان خۆش ببە..! وەکو کەنیزەکی خۆت رامان بگرەو ئێمەش جارێکی دی بیر لەشووکردن ناکەینەوە .

منیش وتم : دەتانخەمە گلێنەی چاوانمەوە و لە ئێوە نازیزترم نی یە .

ساڵێك بەوشێوەیە مانەوە ، شتومەکی بازرگانیم ئامادە کرد و بەرەو بەسرە گەشت بکەم،

بە دووخوشکەکەم وت :

پێتان خۆشە لەگەڵم گەشتی بەسرە بکەن. ئەگەریش نا..ئەوا لە ماڵدا بۆ خۆتان بمێننەوە .

ئەوانیش وتیان : گەشتت لەگەڵ دەکەین .

لەگەڵ خۆم بردمن و سامانەکەم کردە دوو بەشەوە.. بەشێکم هەڵگرت بۆکاتی تەنگانە و لێقەومان .

ئەوی ترم خستە ئەو بازرگانی یەوە . وا بە بیرمدا هات کە ئەگەر پاپۆڕەکەمان کارەساتێکی بە سەردا هات وکەلوپەلە بازرگانی یەکەم تیاچوو... ئەم نیوە سامانەم بمێنێ ، باشترە .

چەندین شەو و چەندین رۆژ بە ڕێوە بووین . تووەمەز پاپۆڕەکەمان رێی هەڵە کردووە لە دەریایەکدا پاپۆڕ بە ئاراستەیەکدا دەڕوات ، کە پێشتر پێیدا نەڕۆیشت بوو. با .. لە بار بوو و بێخەم بووین .

پیاوی دووربین لە مل بەکۆڵەکەی نێوەندی پاپۆڕدا هەڵزنا...

کە سەرنجیدا هاواری کرد :

مژدە ! شارێك دەبینم .. ئێمەش لە سەرۆکمان پرسی : ئەمە کام شارە ؟

ئەویش وتی :

نازانم ئەو سەرزەوی یە کوێ یەو هەرگیز ئەم دیوە! بە درێژی تەمەنیشم بەم دەریایەدا نەڕۆیشتووم ! بە هەرحاڵ ئێوە بچنە شارەوە و شتومەکی خۆتان بۆ فرۆشرا .. ئەوا بیفرۆشن ..ئەگەر بۆتان .. نەفرۆشرا.. ئەوا (٢) رۆژ دەحەوێینەوە و دواتر ، رێی دەریا دەگرینەوە بەر. ئەمجا سەرۆك رۆیشت و سەعاتێکی پێچوو.

کە گەڕایەوە وتی :

دابەزن و بچنە ناو شارەوە با سەرتان لە کاری خوا سوڕ بمێنێ ! پەنا بدەنە خوا خۆی ، لە رق کینەی خۆی ! کەگەیشتینە بەر دەروازەی شار. خەڵکمان بینی . لێیان نزیک بووینەوە . هەموویان ببوون بە بەرد. چووینە ناو شارەوە . ئەوێیش بە هەمان شێوە . بەڵام کاڵاو سامان و زێڕ و کوتاڵیان وەکو خۆی مابوووەوە ! دڵمان بەو شتومەکانە خۆش بوو. بەڵام *وتیشمان : بە خوا مەترسی یەك هەر هەیە..!*

بڵاوەمان لێکرد . یەکێك بۆ زێڕ دەگەڕا... یەکێك بۆ پارە . ئەوی تر بۆ کوتاڵ . منیش خۆم کرد بەکۆشکی پاشایاندا..! سەیر دەکەم هەرچی پەرداخ و پیاڵە و قاپ و قاچاغە .. لە زێڕ دروست کراوە! (٥٠) خزمەتکارم بینی جلوبەرگیان ئاوریشم بوو.. شمشێریان هەڵگێشا بوو... پەردەی پەنجەرەکان ئاوریشم بوو. تان و پۆکەی زێڕین بوو. سەیر دەکەم : شاژن نووستووە و ملوانکەی ملی مرواری یە . تاجێکی بە سەرەوەیە . رازاوە بە ( نقێم ) و ( ملەکۆ ) و ملوانکەی ئاڵتوون . زێڕەکان وەکو خۆیان مابوون . شا ژن ببوو بە بەردی رەش !

دەرگایەکی کراوەم بینی . بە (٧) پلیکانە بۆی سەرکەوتم.
دەروانم هەمووی بەردی ( مەڕمەڕ)ە ! کۆمەڵە فەرشێك ڕاخراوە . کە هەندێ لە تانوپۆکانی ، لە زێڕە! چرپایەك ، لە داری ( عەرعەر) دروست کراوە . بە دووڕ و یاقووت نەخش کراوە ، پەردە و کوللەیەکی پیا شۆڕ بووەتەوە ... بە مرواری نەخش کراوە . لەدەمی پەردەو کوللەکەوە بریسکە یەکم بینی ، کە چووم سەیرم کرد دەروانم پارچەیەك (مرواری)یە بە هێندەی هێلکە قازێك و دەدرەوشێتەوە! چرپاکەیش ، بە چەندین جۆری ئاوریشم داپۆشراوە . ئەوەی ببینێ سەری سووڕ دەمێنێ ! چەند مۆمێکیشم بینی داگیرسا بوون .
لە دڵی خۆمدا وتم :
بێگومان .. ئەمانە مرۆڤ دایگرساندوون .
چوومە شوێنێکی دی و بەو شێوەیە دەگەڕام و دەحەپەسام ! هێندە ڕۆیشتبووم و عەجایبم لێ هاتبوو ئێوارەم بە سەردا هات . ویستم بگەڕێمەوە شوێنی ئەو دەرگایەی کە لێوەی هاتبووم ، بۆم نەدۆزرایەوە.
ناچار چوومەوە لای ئەو پەردە کوللەیەی مۆمەکانی لێ داگیرسا بوو. دوای ئەوەی هەندێك قورئانم خوێند . چوومە سەر چرپایەك و خۆم داپۆشی . ویستم بنووم ، بەڵام دڵەراوکێ نەیهێشت ! نیوەشەو گوێم لێ بوو بە نەرمی و دەنگێکی خۆش : قورئان دەخوێندرا. دڵم کرایەوە و شوێنی دەنگەکە کەوتم .
تا گەیشتمە ژووری پشتەوە . سەیر دەکەم دەرگاکەی داخراوە .کردمەوە سەیری شوێنەکەم کرد . مزگەوتە و میحراب و چرا دەسووتێ و دوو مۆم داگیرساوە.. فەرشی تیا ڕاخراوە. گەنجێکی شۆخ و شەنگ و قورئانێك لە بەردەمیدا بوو. سەرم لەوە سووڕماچۆن ئەمیش وەکو ئەوانی تر نەبووە بە بەرد!؟
پرسیاری خەڵکی ئەم شارەم لێکرد ئەویش وتی :
پەلەم لێ مەکە . قورئانەکەی داخست وخستیە توورەکەیەکی ئەتڵەسەوە و لەلای خۆیەوە داینام .سەرنجمدا هێندە جوانە.. دەڵێی مانگی تابانە . زمانی شیرین و لە سەر خۆیە.. دەڵێی شەکری کڵۆیە :

ئەستێرەناسان، بەختیان گرتەوە — پەنایان لە بۆ ( بورج )ی بردەوە
عەتارد زێڕیی کەبێ بەخشیوە — وەك مانگ، ئەستێرە دەوری چنیوە
سەراسیمە بوو چی بڵێ، فالچی؟ — مانگ هاتە زەوی و کەوتۆتە ماچی

ئەم وەسفەیشی دەهێنا :

سوێند بەو جوانیە و بەو ڕاستگۆییەی — بەو ڕۆژی بوونە و بەو شکۆییەی
بە هۆی ئەمەوە مسکیش ناسرا بوو — دەنا، نرخێکی لای کەس نەمابوو

بۆیە سەرنجێکم دا... هەزاران هەناسەی بە دواوە بوو..! دڵم پێوە بەند بوو.

پێم وت : گەورەم وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە !

ئەویش وتی :

ئەم شارە هی باوکمەو خۆی پاشایەتی . کە رەنگە ئەوت بینی بێت کەوا چۆن لە سەرکورسی یەکەی بووە بە بەردی رەش .. ئەو شاژنەش کە لە پەردە و کوللەکەدا بوو، دایکمە! خەڵکی شارەکەش ئاگر پەرستن !! تەنیا پاشا نەبێت . هەموو سوێند بە ئاگر دەخۆن . بە سێبەر و گەرمای پڕۆکێن بەو هەسارانەی کە دێن و دەڕۆن . درەنگانێ خوا منی دا بە باوکم ! پەروەردەی کردم . پیرەژنێکمان لابوو خواناس ، بە سەرزارەکیش ، وەکوکەس وکارم ئاگر پەرست بوو. باوکم متمانەیەکی زۆری پێی بوو!

ڕێزی دەگرت و منی دایە دەستی و وتی :

بیگرە خۆت و فێری ئاگر پەرستی بکە و پەزێرایی بکە .

*بەڵام پیرەژنە بە قسەی باوکمی نەکرد و فێری ئایینی ئیسلامی کردم . نوێژ و ڕۆژووی فێر کردم . قورئانی پێ لەبەر کردم. ئامۆژگاریشی کردم خوا نەبێت .. شتێکی دی نەپەرستم .*

کە گەورە بووم ، پێی وتم : نەهێڵیت دایك و باوکت بزانن کەوا موسڵمانیت !

چەند ڕۆژێك ئاوا مامەوە.. پیرەژنە مرد! خەڵکیش تا دەهات خراپەکاری و گوناهیان فرەتر دەبوو.

ڕۆژێکیان هێندەمان زانی دەنگێك لە ئاسمانەوە هات دەتوت هەورە بروسکەیە دەناڵێت :

ئەی خەڵکینە ... *واز بێنن لە ئاگر و خۆری ڕووناك ... ڕوو بکەنە خوای تاك .*

خەڵکەکە سەریان سووڕما!

باوکم کۆی کردنەوە و پێی وتن : *مەترسن و بێخەم بن .... ئاگرپەرستیی خۆتان بکەن و هەڵ مەگەڕێنەوە .*

خەڵکەکەش فەرمانی باوکمیان جێبەجێ کرد و لە سەر خراپەکاری سەرومڕ بوون . ساڵی دووەمیش لە هەمان کاتدا .. دەنگەکە بیسترایەوە . ساڵی سێ یەمیش بە هەمان شێوە . ئیدی هێندیان زانی کە بەڵای خوا لە ئاسمانەوە ، بە سەریاندا باری . ئاوا.. خۆیان و هەر هەموو وشترو ئاژەڵەکانیشیان بوون بە بەرد . منیش بە تەنیا و بێکەس مامەوە و هەر خەریکی نوێژ و قورئان خوێندن بووم . تەنانەت کەسێکیش نەبوو ، دەمەتەقێی لەگەڵ بکەم .

منیش لە ئاخەوە پێم وت : دە.. لەگەڵ من وەرە : با بچین بۆ شاری ( بەغداد ) . زانایان و پیاوانی ئایین ببینیت ! ئەوەش بزانە ئەم کەنیزەکەی بەردەمت شاژنی خێڵی خۆیەتی! سەرۆکی پیاوان و خزمەتکارانەو خاوەن پاپۆڕی بازرگانی یە. قەدەری خوا منی کەیاندە ئێرە . قەدەری خوا نەبوایە .. ئەم کارەساتی شارەم نەدەبینی ! زۆرم ڕێز لێ گرت و

زۆرم لەگەڵ وت ... دوایی رازی بوو لەگەڵم بێت .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەنگ بوو ... بێدەنگ بوو .

## شەوی ١٨

شەهرەزاد وتی :

ئـــەی پاشای بەختیار... سەرکردە و سەلار ...

کیژەکە هەوڵی زۆری لەگەڵدا ... تاکو رازی کرد .

ئەمجا کچەکە لە سەری رۆیشت و وتی :

ئەو شەوە ، لێی نوستم . لـە کاتێکدا لـە خۆشیاندا بـڕوام بـە خـۆم نـەدەکرد..! کەرۆژ بووەوە، هێندەی بۆمان هەلگیرا لەوانەی کێشیان سووك و بەهایان گران بوو ، هێنامان و لە قەڵاکە هاتینە دەرەوە و چووینە ناو شارەوە . سەیر دەکەم سـەرۆکی پـاپۆڕ و کۆیلەکان بۆ من دەگەڕان . کە بینیمیان فرەیان پێ خۆش بوو .

ئیدی منیش ئـەوەی بینی بـووم ، بـۆم گێڕانـەوە و بەسـەرهاتی لاوەکەیشم پێ وتن. تێیشم گەیاندن خەڵکی ئەم شارە بۆچی بوون بە بەرد؟ کە هەردوو خوشکەکەم ... واتە ئەم دوو سەگە رەشە ، ئـەم لاوەیـان بـینی کەوتنـە بـەغیلی پـێ بـردنم و دەریشیان نـەدەبڕی. ئێمەش بەدڵی خۆشەوە سواری پاپۆڕەکە بووین . چاوەڕێی بای لـە بـار بـووین . کە بایەکە هەلی کرد... چارۆکەکانمان هەڵداو کەوتینە رێ و دەمەتەقێ کردن .

لێیان پرسیم : خوشکێ چی لەم کوڕە قۆزە دەکەیت ؟

منیش وتـــم : مەبەستتان ئەوەیە بیکەم بە مێردی خۆم .

رووم کردە ، کوڕەکە و وتم :

شتێکت پێ دەڵێم بە قسەم بکە ...کە گەیشتینە ( بەغداد ) دەبمە خێزانت .

ئەویش بە بێ سێ و دوو وتی : بە چـــاوان .

بە خوشکەکانم وت :

من تەنیا ئەم لاوەم بەسە ! ئیدی هەرچی یەکمان پەیدا کرد بۆ ئێوە .

ئەوانیش وتیان : زۆر چاکە ... خوشکێ .

بەڵام لە دڵەوە رقیان لێم هەلگرتبوو. لە دەریای تـرس دەرچووین.. گەڕاینـەوە دەریـای ئارام . دوای چەند رۆژێکیش دیوارەکانی شاری (بەسرە)مـان لێوە دەرکـەوت ! ئیـدی ئێـوارە داهات . شەو لێی نوستین. هەر ئەو شەوە خوشکەکانم خۆم کوڕەیـان بـە نوێنەکانـەوە فـڕێ دایە دەریاوە ..!! لاوەکە چونکە مەلەوان نەبوو ، خنکاو منیش شەپۆلەکان بردمیان . تا لە کەناری دوورگەیەك ، گیرسامەوە.

تاکو بەیانی بە کەناری دەریادا رۆیشتم . کە رۆژ بووەوە ، شوێن پێی مرۆڤێکم بینی بە سـەر لـە تەڕەکـەوە و ئـەو شـوێن پـێ یـەم هـەلگرت تـاکو گەیـشتمە زەوی دوورگەکـە لـەوێ

جلەکانم هەڵخست . خۆیشم دەستم کرد بە خواردنی میوەی درەختەکان . خۆم لەبەر کردەوە و کەوتمە ڕێ . ڕۆیشتم و ڕۆیشتم ، تاکو نزیکەی (٢) سەعاتە ڕێ یەکم مابوو، بگەمە ناو شار. ڕووانیم .. وا ( ئەژدیها)یەك کە بە هێندەی قەدی دراخورمایەك ئەستوور بوو ، بەرەو رووم هات . کە گەیشتە بەردەمم زمانی بستێ درێژ بوو بوو. بە لای راست و چەپدا دەکەوت . ماندوو شەکەت بوو.. توومەز توولە مارێك راوی ناوە و ئەمیش لە دەستی هەڵاتووە !

منیش بەزەییم بەم ( ئەژدیها )یەدا هاتەوە . بەردێکم هەلگرت و دام بە سەری توولە مارەکەدا و دەم و دەست مرد. ئەژدیهاکەیش دوو باڵی لێ پەیدا بوو و دای لە شەقەی باڵ و فڕی و منیش تا لە چاوم ون بوو ، لێم روانی. فرەیش ماندوو بووم . خەوم لێکەوت ، نزیکەی سەعاتێك نووستم . کە بە ئاگا هاتم . دەڕوانم کەنیزەکێك بە هێواشی پێ بە پێمدا دەنێت و دوو سەگیشی پێ یە . شەرمم لێ کرد و لە جێی خۆم دانیشتم .

ئەمجا پرسیم : خوشکێ .... تۆ کێ یت ؟

ئەویش وتی :چەند زوو منت بیر چووەوە! من ئەوەم تۆ رزگارت کردم . چاکەت لەگەڵ کردم و دوژمنەکەمت کوشت .

من ئەو ئەژدیهایەم . کە لە توولە مارەکە رزگارەت کردم . من کچە جنۆکەم و ئەویش نێرە جنۆکە بوو و دوژمنم بوو ، تۆ فریام نەکەوتیتایە ، دەیکوشتم . ئـــەو کاتەش تـــۆ ( توولە مار )ەکەت کوشت ئەوە بوو ... لە شەقەی باڵم دا فریای ئەو پاپۆڕە کەوتم کە دوو خوشکەکەت خۆت و مێردەکەتیان تێدا فڕێ دایە دەریاوە!! (٢) خوشکەکەتم رزگار کرد. هەردووکیانم بە ( سیحر) کردووە بە (٢) سەگی رەش. چونکە ئاگام لە ئەو ناپاکیەیان بوو لەگەڵ خوشکەکەت کردیان . بەڵام بە داخەوە لاوەکە خنکا .

ئەمجا جنۆکەکە منی خستە بن دەستی و فڕی و لە سەر بانی ماڵی خۆمان نیشتەوە . کە ڕووانیم شت و مەکەکانی ناو پاپۆڕەکە لە حەوشەکەدان .

ئەژدیهاکە وتـی : توو حەزرەتی سولەیمان .. هەموو ڕۆژێك (٣٠ ) قامچی بدە لەم دوو خوشکەت . ئەگەر بە قسەیشم نەکەیت ... دێمەوە سەرت و تۆیش وەکو ئەوان لێ دەکەم !

منیش پەیمانم دایە و وتم : بە سەر چاوان .

ئـەی .. میری موسڵمانان ، ئـا.. ئـاوا.. منیش لێیان دەدەم و بەزەییشم پێیاندا دێتەوە ! خۆیشیان دەزانن کە من هیچم بە دەست نی یە ..!! خەڵکینە ئەمە بەسەرهاتەکەم بوو.

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

## چیرۆکی کچی دووەمی لێدراو

*شەهرەزاد وتی :*

خەلیفە بەسەرهاتەکەی بەلاوە زۆر سەیر بوو..! بە کیژی دووەمی وت :

ئەی تۆ شوێنەواری ئەو قامچی یانە چی یە بە جەستەتەوە؟

کیژەیش وتـــی :

ئـەی مـیری موسـڵمانان.. بـاوکم مـرد و سـامانێکی فـرەی بـۆ بـەجێ هێـشتم ! هێنـدەی پێنەچوو، شووم کرد بە پیاوێکی بەختەوەری سەردەمی خۆی ! نزیکەی ساڵێك لای بووم. ئەویش مرد! ( ٨٠٠٠) دیناری لە پاش بەجێما.کە ئـەوە بەشـی شـەرعیی خـۆم بـوو . ناوبانگم بە دەوڵەمەندی بڵاو بووەوە! (٥) کراسی ئاودامانم دروست کرد هەر کراسێکی بە (١٠٠٠) دینار .

رۆژێ لە رۆژان... بێخەم لە ماڵی خۆمـدا لێی دانیـشتبووم . هێنـدەم زانـی ، پیرەژنێکی، خوار و خێچ دەم و چاوێکی مرِ و مۆچ . پڕ لە چرچ و لۆچ . دانەکانی کەلەفیچ ! خۆی کرد بە ماڵمدا.

کرنووشی بۆ بردم و پێی وتم :

ئێمە نامۆین بەم شارە و کچەتیوەیەکم هەیـە ، ئەمـشەو ئاهـەنگی شـوو کـردنێتی . جا لەبەر ئەوەی کەس ناناسین ، تاکو بێتە ئاهەنگەکەیەوە .

ئەو خێرە لە دەست خۆت مەدەو گەر هاتیت بـۆ ئاهەنگەکـەمان ، ئـەوا دەرو دراوسـێش بە خۆشی تۆوە دێن . کچەکەی منیش خۆشحاڵ دەکەیت. ئێمەش خوا و تۆ شك دەبەین.

پیرەژنە دەستی کردە گریان و ئەم شیعرەی وت :

دانی پیا دەنێین میوان ئـازیزە    تەنیـــا هاتنتان بۆ ئێمە رێزە

لێی نەبوون جێتان ناگیرێتەوە    وەك ئێوە کەسی تر نابێتەوە

منیش بەزەییم پێیدا هاتەوەو پێم وت :

لەبەر خاتری خـوا و تـــۆ دێم .

پیرەژنە زۆری پێخۆش بوو. داموکایەوە بۆ پێڵاوەکانم و وتی :

خوا پاداشتت بداتەوە و دڵنەوا بیت کـە ئـاوا : دڵنـەوایی کچەتیوەکەم دەکـەیت ! ئێـستا خۆت ماندوو مەکە و ئێوارە خۆم دێمەوە بە شوێنت دا .

دەستی ماچ کردم و رۆیشت .

ئیدی خۆم ئامادە کرد و ئێوارە و پیرەژنە پەیدا بوو و وتی :

خانمەکەم... خانمانی شار، کە زانییان تەشریف دێنیت ، هەموویان هـاتوون و لـە مـاڵی ئێمـەن و چـاوەڕێی تـۆن ... هەسـتام و کەنیزەکـەکانم دوای خـۆم خـست و رۆیـشتین . تـا

گەیشتینە کۆلانێکی ئاوپرشێن کراو، شنە بایەکی خۆشی لێوە دەهات . چووینە بەردەرگایەکی سەر بە گوومەز! دیوارەکانی لە بەردی مەرمەڕ! لە ناوەوەیشیدا کۆشکێکی بە قوڕ دروست کراو.. سەری لە ئاسمانی دەساو. لە سەر دەروازەی نوسراو:

هەواری شادومانیم پڕ ئاواز و گۆرانیم

حەوز و فوارەم تیایەو خۆم مایەی کامەرانیم

پیرەژنە لە دەروازەی دا. چووینە دالانێکەوە ، بە دیوارەکانیدا مەشخەڵی داگیرساو.

فەرشی تیا راخراو . پەردەی ئاوریشم و زێڕ و زیوی پیا هەڵواسراو... دوو ریز مۆمی داگیرساو... لە بەرامبەردا ، چرپایەکی دار ( عەرعەر ) ... نەخشی زێرینی لەسەر. کەژاوەیەك لە قوماشی ئەتڵەس ، کیژێکی ناسك وجوان ، هەر وەك مانگی درەخشان . لەکەژاوەوە ـ ئەی میری موسڵمانان ـ خۆیدا پێشان .

کیژە لە کەژاوەکە هاتە خوارە و وتی : بەخێر بێیت ، خوشکی ئازیز .

ئەم شیعرەیشی وت :

( هەوار) زانیبای میوانی کێ یە زوو ماچی دەگرد شوێنی ئەو پێ یە

سینەی وەك دۆشەك بۆ رادەخستی چونکە شایستەی بچی یە ئەو جێ یە

لام دانیشت و وتی :

خوشکێ ... برایەکم هەیە ، لە ئاهەنگ و بۆنەکاندا، تۆی بینیوەو حەزی لێ کردوویت ! براکەم لە خۆم جوانتر و قۆزترە ! بیستوویەتی تۆ خانمی خێڵی خۆتیت . ئەویش گەورەی خێڵی خۆیەتی . دەیەوێت بە گوێرەی شەرع و سوننەت مارەت بکات .

منیش چونکە بێوەژن و بێ کەس و تەنیا بووم . بە باشم زانی شووی پێ بکەم ... کیژە زۆری پێخۆش بوو ، چەپڵەیەکی لێدا... دەرگایەك کرایەوە ! کوڕێکی گەنجی رێکپۆش .. باڵابەرزو برۆ کەوانی . چاوانێك کە نەك دڵێك سەد دڵ دەبوو حەیرانی ... هاتە دەرەوە .

رووی دەڵێی مانگە دەبریسکێتەوە مرواری تێیدا دەدرەوشێتەوە

پەنامان بەخوا بۆ ئەو جوانییە! بێ ئەوکاری وا ، قەت ناکرێتەوە

لە نێوچاوانی دیار بوو نووسرا بوو لەم شێوە دووبار، قەت نابێتەوە

کە بینیم ، دڵم بۆی لێی داو خۆشم ویست . نزیکەی سەعاتێك پێکەوە قسەمان کرد . کیژەکە چەپڵەیەکی دیی لێدا.. دەرگای گەنجینەیەك کرایەوە و قازی و( ٤ ) شایەت هاتنە دە ر. سڵاویان کرد و دانیشتن . مارەیان لە لاوەکە بڕیم !

ئەمجا کوڕەکە رووی تێکردم وتی : پیرۆز بێت خاتوون .. من تەنیا یەك مەرجم هەیە !

منیش پرسیم : ئەو مەرجە چی یە بەرێز؟

هەستا و چوو قورئانێکی هێناو وتی :

سوێند بخۆ ، لە من زیاتر، دڵت بە لای کەسی دیدا نەچێت ! منیش سوێندم خوارد .

ئەویش دڵی زۆرخۆش بوو. سفرە و خوانیان رازاندەوە . تاکو توانیمان خواردمان . ئەو شەوە لە کەژاوەی بووك و زاوایەتیدا دەست لە ملان لێی نوستین . مانگێکمان بەو شێوەیە بە خۆشی بردە سەر.

ڕۆژێکیان مۆڵەتم لێ وەرگرت ، تاکو بچمە بازاڕ و هەندێك قوماش بکرم . منیش پیرەژنە و کەنیزەکێکم لەگەڵ خۆم بردو چوومە دوکانی بازرگانێکی لاو.

پیرەژنە هاتە لامەوە و وتی :

ئەمە کوڕێکی منداڵکارە ، باوکی دوای خۆی سامانێکی فرەی بۆ جێهێشتووە . دوکانێکی گەورەی کۆتاڵی هەیە .

بە لاوەکەیشی وت : قوماشی جوان بخە بەردەستی ئەم کیژۆڵەیە.....

منیش وتم :

هێندەی پێدا هەڵ مەدە . پێویستیەکانی خۆمان دەکرین و دەگەڕێینەوەماڵەوە .

بازرگانەیش ئەوەی ویستمان خستی یە بەر دەممان .

کە پارەیشمان دایە وەری نەگرت و وتی : ئێوە ، ئەمجارە میوانی منن .

بە پیرەژنم وت :

گەر پارەکەیمان لێ وەر نەگرێت ، شتەکان نابەین .

کەچی دوکاندارەکە وتی :

ئەوانە دیاری منن و ئەگەر لە جیاتی پارە ..ماچێکیشم بدەیتێ ، ئەوا سوپاسگوزارم !

کە پیرە ژنە سڵ کردنەوەی منی بینی ، هاتە پێشەوە و کارەکەی لە لا ئاسان کردم و تێی گەیاندم کە ماچێ هیچی تێ ناچێ !

منیش بیرم خستەوە و وتم :

ئەی بیرت چووەوە کە سوێندم خواردووە کەسی ترم خۆش نەوێت و خۆم نەدەم بە دەستەوە !؟

پیرەژنەیش زۆری تەقەلا دا و رازیی کردم .

منیش عەباکەم بۆ کردەوە و دوکاندارە سەری هێنایە ناوەو ماچێکی کردم ! دواتر بە توندی گازێکی وای لە لێوانم گرت. دانەکانی چەقاندە لێوانمەوەو بوورامەوەو پیرەژنە لە باوەشی کردم .

کە بەئاگا هاتمەوە دەروانم دوکانی خڕ داخستووە و رای کردووە! پیرەژنەش کە دەم وچاوی خوێناوی بینیم زۆر خەمبار بوو. وتـــی :

هەستە با بڕۆینەوەو خۆت بکە بە نەخۆش و منیش ..جێ دانەکانت تیمار دەکەم. کەگەیشتینەوە خۆم نەخۆش خست و شەو مێردەکەم هاتەوەو منی بینی ، پرسی؛

ئەوە چیتە؟

منیش وتم : نەخۆشم و سەرم ژان دەکات .

ئەویش مۆمێکی داگیرساوی ، لە رووم نزیك کردەوە، کە برینەکەی بینی پرسیی :

ئەی ئەو : برینانە چی یە؟

منیش وتم :

کە رێت پێدام وچووم لە بازاڕ قوماش بکرم . کۆڵەدار بە کۆڵێك دای بە لامدا و چەوێڵ : لە پەچەکەم ئالا و چوو بە دەم و چاومدا و پەچەکەیشی دڕاندم .

مێردەکەم وتی :

هەر سبەینێ دەچمە لای حاکم . فەرمانی پێ دەردەکەم هەر چی دارفرۆشێك لە شار دایە: بیکوژێت !

منیش وتم : ئۆباڵی بێتاوانان مەخە ، ئەستۆی خۆت.. ئاخر منیش سواری کە رێك بووم و گلام ! ئەمجا چیلکە و چەوێڵەکە چوو بە دەم و چاومدا .

ئەویش وتی :

کەواتە ... سبەینێ دەچمە لای ئەبو جەعفەری بەرمەکی و بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕمەوە . فەرمانی پێ دەردەکەم کە گوێدرێژەکانی شار بکوژرێن .

منیش پێم وت :

بەم کارەت و بە هۆی منەوە ، خەڵکی لە خۆت دەکەیت . لە کاتێکدا کە ئەم رووداوە قەزا و قەدەری خوا بووە .

ئیدی ئارامی لەبەر هەڵگیرا و وتی : دەبێت هەر وا بکەم .

بەراستی منیش دەستم کرد بە بۆڵە بۆڵ بە سەریدا . هێندەم زانی ..ئەی میری موسڵمانان نەڕاندی... منیشی تاوانبار کرد بەوەی پەیمانەکەم شکاندووەو سوێندەکەم کەوتووە .

بە نەڕە کردنەکەی دەرگایەك کرایەوەو ( ٧ )کۆیلەی رەش ، هاتنە دەرەوە . فەرمانی پێدان بەکێشیان کردم و فڕێیان دامە ناوەڕاستیماڵەکەوە . کۆیلەیەکیان هەر دوو شانی گرتم ... فەرمانی بە کۆیلەی دووەم دا کە لەسەر هەردوو ئەژنۆم دانیشت و قاچەکانی گرتم .

کۆیلەی سێ یەم بە شمشێرێکەوە هات ووتی :

گەورەم هەر ئێستا بیکەم بە دوو کەرتەوە و فڕێی بدەمە دیجلەوە .. تا سزای سوێند کەوتنەکەی وەربگرێت ..؟

ئەویش تووڕە بوو و وتی :

لەرەوا بوون دا ببنە هاوڕێم     گەر نەیان کوژم : بۆ خۆم دەتەقێم

نەفسم بەپاکی کە راهێناوە      عەشقێکم ناوێت : پێی لۆمە بکرێم

بە کۆیلەکەی وت : سەعد ... تێی بسرەوێنە .

ئەویش چۆکی لەسەر سنگم دادا و وتی :

ئیتر ژیانت کۆتایی پێ دێنم .... وەسیەت بکە و شایەتمان بێنە .

کە خۆم بەمجۆرە بینی و سەرنجی مێردەکەم دا . ژیانی بەختەوەری و ئاسوودەیی خۆمم بیر کەوتەوە.

ئێستاش ئەوەتا سەرم لێ تێك چووە . چاوم هەڵبڕی و سەیرێکی مێردەکەم کرد . کە ئاوا تووڕە بوو..

دامە پڕمەی گریان و وتم :

بێخەوت کردم هەر بۆ نەگبەتی      پشتگوێت خستم و خۆیشت لێی خەوتی

بە بێدارانی شەوت ناساندم      نە وەکو هەر من : خۆیشت تێ کەوتی

پەیمانت دامێکە بە وەفابێت      وەك دڵت بردم ئێستایش لالووتـــی

لە کێلی گۆڕم تووخوا بنووسن :      کە ( ا ن زوجی سبب موتـــــی )

ئەویش سەیری فرمێسکەکانی کردم و هێندەی تر توند بوو و ئەم شیعرەی وت :

بۆ دڵدارەکەم خۆم بە ئەمەك کرد      ئەو تاوانی کرد منی تەرك کرد

ویستی یەکێ دی بخاتە بەینمان      منی مەجبوری رەفزی شیرك کرد

لێی پاڕامەوەو لە دڵی خۆیشمدا وتم :

با.. فریوی بدەم . بەڵکو رزگاریی بە دواوە بێت . هەموو سامانەکەشم تیا بچێت گرنگ نییە! کەوتمە سکاڵاو ئەم شیعرەم وت :

سەر بە بـــان ملدا : بە مۆڵەقەوە      بۆ دەم خەیتە ژێر خەمی: عەشقەوە

رۆحم چی لێ بێت هۆی دووریی تۆیە      شەیدای تۆ بووەو بەدوای شەوقەوە

ئەویش کە شیعرەکەی بیست . نەڕاندی بە سەر کۆیلەکەدا :

خێری نەماوە و دوایی پێ بێنە . لە کاتێکدا ئێمە خەریکی ئەم شەڕە شیعرە بووین و من دەستم لە ژیان شت بوو. هێندەم زانی پیرەژن خۆیدا بە سەر دەست و پێی مێردەکەمدا و وتی :

بۆ خاتری ئەو ماندوو بوونەم بە بەخێو کردنتەوە . لەم ژنە خۆش ببە ! بەوخوایە بێ تاوانە و تۆیش جوانکەیت و خوێنی ئەم ژنە مەکە ملی خۆت . رۆڵە گیان خوا دەستوورێکی وای داناوە ... ئەوەی کە کوشتی .. خۆیشی کوژراوە ! هێندە دڵت رەق نەبێت ! ئەمەندەی بە سەراگریا تاکو رازی کرد و لێم خۆش بوو وتی :

ئەوا لێی خۆش بووم ، بەڵام دەبێت ، شوێنەوارێك بە سەر گیانی یەوە ، جێ بێڵم ! فەرمانیدا و لە سەر زەوی رایان کێشام و توولێکی دار( بەهێ )یان بۆ هێنا... کۆیلەیەك

هێندەی لێدام ... تاکو لە هۆش خۆم چووم . فەرمانی دابوو، نیوەشەو.. بردبوومیانەوە ، خانووە کۆنەکەی خۆم و لەوێ فڕێیان دابووم ! دەمەوبەیان بە ئاگا هاتمەوە. کەوتمە چارەسەری برینەکانی لەشم و هەنوونی برینەکانم بە مەرهەم . ( ٤ ) مانگ لە جێگادا بۆی کەوتم . زەردو لاواز بوو بووم . کە هەستامەوە بەرەو ئەو کۆشکە چوومەوە کە تێیدا فەلاقە کرابووم . دەروانم بووەتە کەلاوە و وێران بووە . ئیدی چار ناچار.. چوومە سەردانی ئەم خوشکەم کە دوو سەگە رەشەکەی هەبوو . ئاخر .. *میری موسڵمانان* ، ئەمەیان لە باوکمەوە .. خوشکمە ! بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕایەوە .

ئەویش پێی وتم :

بەس نی یە ، لە بەڵای خوا قوتار بوویت ! سوپاس بۆ خوا کە ماویت .

ئەم شیعرەی بۆ خوێندمەوە :

قۆرتی زەمانە هەر چەند گران بێ دەبێت ئارام بی و رووت لە یەزدان بێ

خوشکە داماوەکەیشم ، بەسەرهاتی خۆی و( ٢ ) خوشکەکەی بۆ گێڕامەوە . کە چیان بەسەر هاتووە .

سەرمان نابە سەری یەکەوە و بڕیارمان دا بەبڕ... جارێکی تر باسی شووکردنمان نەکرد و ئەم خوشکەشمان گرتە خۆمان کە رۆژانە بچێتە ناو بازاڕ و شمەکمان بۆ بکڕێت . تا ئەوە بوو ، رۆژێکیان بەو حەماڵەدا شتومەکی هێنا بووەوە کە بینیتان . هەر ئەو شەوە ( ٣ )کوڕە کەچەڵەش هاتنە بەر دەرگامان .

ئەوە بوو پەزێراییمان کردن . هەر ئەو شەوە هێندەی پێ نەچوو( ٣ ) بازرگانی رێزداری. رێکپۆشی شاری ( موسل)یش لە دەرگایان دا . بەسەرهاتی خۆیان بۆ گێڕاینەوە . ئەوە بوو ئێمەش مەرجمان بۆ دانان و داڵدەمان دان و مەرجەکەیان شکاند .

بەڵام دوای ئەوەی هەر یەکەیان بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە.ئازادمان کردن . ئێستاش پایەدار بیت. لە پەزێراییتداین .

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

## شەوی ٢٠

شەهرەزاد وتی :

خەلیفە فەرمانی نووسینەوەی بەسەرهاتەکەیدا... تاکو بخرێتە کتێبخانەی مەملەکەتەوە .

لە کیژی یەکەمی پرسی : ئەی هەواڵی دەڵەدێوەکە چی بوو؟

ئەوەی کە ( سیحر)ی لە هەردوو خوشکەکەت کرد!؟

کیژە وتی :

ئەی میری موسڵمانان .. چەند تاڵە موویەکی خۆی پێدام و پێی وتم ..هەرکاتێک تاڵێک لەم
موانە هەڵبکروزێنیت..ئەگەر لەو دیو( کێوی قاف)یشەوە بووم ..دەم ودەست دەگەمە لات!

پاشایش وتی : مووەکە بێنە !

خەلیفە موویەکی سووتاند! هێندەمان زانی کۆشك لەرزیەوە و نەعرەتەیەکمان هاتە گوێ!

دەڵە ( دێو )ێکی موسڵمان پەیدا بوو و وتی :

سڵاوت لێ بێت .... ئەی نوێنەری خوا لە سەر زەوی !

میری موسڵمانانیش وتی : سڵاو لە ئێوەش .

دەڵە ( دێو ) وتی :

بزانن ... ئەم کیژە ، چاکەیەکی لەگەڵ کردووم کە هەرگیز پاداشتیم بۆ نادرێتەوە . لە
مردن رزگاری کردووم ! دوژمنەکەی کوشتووم ! منیش کە بینیم ئەو دوو خوشکەی ئەو
بەڵایە یان بەسەر هێنا .

ئەو سیحرەم لێکردن کە دەی بینن . ویستم هەردووکیان بکوژم .. بەڵام خەمی ئەوەم بوو
ئەم کیژە لە خەفەتی ئەو دوو خوشکەیدا بمرێت ! ئێستاش لەبەر خاتری تۆ و ئەم کیژە :
گەر دەتانەوێت ، سیحرەکە بەتاڵ دەکەمەوە ! چونکە منیش وەکو ئێوە موسڵمانم .

میری موسڵمانانیش وتی :

ئەو دوو خوشکە رزگار بکە ، دواتر دەگەڕێمەوە ، سەر ئەم خوشکەی کە ئاوا لێیان داوە ،
گەر راست بکات ، تۆڵەی ئەویش لە مێردەکەی دەکەمەوە و سامانەکەیشی بۆ دەگێڕمەوە .

دەڵە دێو وتی :

هەر ئێستا ئەم دوانەت بۆ رزگار دەکەم و مێردی ئەوی تریشت دەخەمە بەردەست ! کە
ئەویش یەکێکە لە نزیک ترین پیاوانی خۆت ودەوڵەت !

دەڵە دێو ، قاپێك ئاوی هێنا و هەندێکی بە سەردا خوێند . کە ئێمە لێی تێنەگەیشتین .
ئاوەکەی پرژاند بە رووی دوو سەگەکەداو وتی :

پەنا بە خوا ، بگەڕێنەوە شێوەی یەکەمجارتان . دوو سەگەکە بوونەوە بە دوو کیژە
جوانەکە ..

دەڵە دێو رووی کردە پاشا و وتی :

مێردی ئەم کیژە لێدراوەش ، (ئەمین)ی برای (مەئموون)ی کوڕتە ! ئەمین کە جوانی و
خانومانی ، ئەم کیژەی بینی بوو.. حەیرانی بوو بوو! مارەی کرد . بەڵام سوێندێکی لێ
خواردبوو. دواتر بە هەڵەدا چووبوو: پێی وابوو سوێندەکەی شکاندووە . ویست بووی
بیکوژێت ! بەڵام لەبەر خاتری خوا : نەی کوشتبوو. فەرمانی دابوو، زۆریان لێدابوو. تا..
ئاوای لێهات . دواتر فەرمانیدا بردیانەوە خانووە کۆنەکەی خۆی....

خەلیفە زۆری پێ سەیر بوو و وتی :

سوبحان الله ، كه خوا ئەمەی پێ بەخشیم ، بتوانم ئەم دوو كیژە رزگار بكەم . هەروەها بە ناسینی ئەم كیژەی دی . بەو خوایە ... دەبێت كارێك بكەم . دوای خۆم بنووسرێتەوە! فەرمانیدا : (ئەمین)ی كوریان هێنایە بەردەستی . پرسیاری لەبارەی كیژی یەكەمەوە لێ كرد .. ئەویش بێ پێچ و پەنا بۆی گێرایەوە . خەلیفە فەرمانیدا : قازی و شایەتیان ئامادەكرد . خەلیفە : (٢)كورە كەچەڵەو كیژەی یەكەم و دوو خوشكە ( سیحر) لێكراوەكەی ! لە یەكتر مارە برێ . كە كاتی خۆی كورە پاشا بوون . لە سەرای دەوڵەت دایمەزراندن . چییان پێویست بوو پێی بەخشین و خانووی بۆ دابین كردن .

كیژە لێدراوەكەشی گەڕاندەوە بۆ ( ئەمین )ی كوڕی . سەر لە نوێ لەوێدا مارەی كردەوە لە كورەكەی .خۆیشی ( خوشكاشە )ی مارە كرد و ناردییە یەكێك لە كۆشكەكانییەوە و خزمەتكار و كەنیزەكی خستە بەردەست .. خەڵكەكەیش ، سەریان لە پیاوەتی و چاكەی ( خەلیفە ) سووڕما!!

بەسەرهاتی كچە كوژراوەكە

دنیازاد ، بە *شەهرەزاد* ی خوشكی وت :

بەخوا خوشكێ ، چیرۆكێكی هێندە خۆش بوو ، لە دنیادا وێنە نی یە !

بەڵام شەو بە بەری یەوە ماوە و چیرۆكی ترمان بۆبگێڕەوە .

شەهرەزاد وتی :

گەر پاشام رێگام بدات .... بەسەر چاوان .

پاشاش وتی : خێراكە.... بۆمان بگێڕەوە !

شەهرەزاد وتی :

دەڵێن ... شەوێكیان ( هاروونە رەشید ) دەنێرێتە شوێن ( جەعفەر )ی وەزیردا وپێی دەڵێت :

با : ئەم شەو خۆمان بگۆڕین و بچینە ناو هاوڵاتیانەوە . گوێ هەڵبخەین ، بزانین كام دەسەڵاتدار و لێپرسراو و پیاوی دەوڵەت : خراپە وخەڵكی : لێیان ناڕازین ، تاكو : دەریان بكەین .. كامیشیان لای هاوڵاتیان پەسەندن ، پلە و پایەیان بڵندتر بكەین .

چوونە ناوشار، شەقام و كۆڵانان گەڕان ... پیرێكیان بینی : گالۆكێكی بە دەستەوە . تۆڕێكی ماسی بەسەر شانەوە ، ئەم شیعرەی دەوت لەبەرەوە :

وتیان : وەك پۆڕوكەوی  سەركانی و مانگەشەوی
وتم : جوانی بێ كەڵكە  بە هێز نەبم و قەوی
بڕستم لێ دە بـــڕی  دەستم بە سەرا دەگری
جۆرێ دەگریم بۆ هەژار  تۆش لەگەڵ مندا بگری
هەژار بوویت چاكتر وایە  لەگۆڕستان جێ بگری

که خەلیفە هارونەرەشید ، شیعرەکەی بیست ، زۆر کاری تێکرد .
بە جەعفەری وت :
برۆ بزانە لەوە دەچێت زۆر هەژار و نەدارا بێت !
دواتر خۆی بۆ نەگیرا و چووە لای و پرسی : چکارەیت ؟
پیرە وتی :
راوە ماسی دەکەم و خێزانـدارم .لـە نیـوەڕۆوە لـە مـاڵ هاتوومەتـە دەروە . راو دەکەم ماسیەکم نەگرتووە . تاکو ماڵ و منداڵی پێ بژێنم ... خۆم لەبەرچاو کەوتووەو مەرگ بە ئاوات دەخوازم .
خەلیفە وتی :
لەگەڵ منـدا ، بگەڕێوە سـەر دەریـا .. تۆڕەکـەت لـە بـەختی مـن فڕێـدە دیجلەوە . هەر چیەکی پێوە بوو. ئەوا من بە (١٠٠) دینار لێت دەکڕم !!
پیرەکە زۆری پێخۆش بوو وتی : هەر ئێستا لەگەڵت دەگەڕێمەوە .
تۆڕەی فڕێدایە دیجلەوە . دوای کەمێك راکێشایەوە و کۆیکردەوە . سـندووقێکی قورسی تیا بوو. خەلیفە ویستی هەڵی بگرێت . بەڵام زۆر قورس بوو. ( ١٠٠) دینارەی دایە ماسیگر و ئەو رۆیشت . مەسرور و جەعفەر سندووقەیان هەلگرت و گەڕانەوە ، بۆ کۆشـك و دیسان مۆمیان داگیرساندەوە .
سندوقەیان شکاند . سەیریان کرد گوونیەیەکی تێدایە ! بەتاڵێك دەزووی سوور ، سەردروو کرابوو .
گوونییەکەیان هەڵدڕی . فەرشێکیان دی . فەرشەکەیان هەڵدایـەوە ، چـەند قۆپـچەیەکیان بینی . لاشەیەکی مردووی تیا بوو. کە بە پارچە قوماشی زیوین داپۆشرابوو.
ئیدی خەلیفە پەژارەی بۆ خوارد و سەیرێکی جعفری کرد و وتی :
ئەی سەگی وەزیران . لە سەردەمی خەلیفایەتی منـدا . خـەڵك دەکوژن و فڕێـی دەدەنـە دەریـاوە !؟ لەسـەر منـیش دەنووسـرێت ! مـەرج بێـت : کـوژەری ئـەم کیـژە بدۆزمـەوەو لە ئەمەی خراپتر بەسەر بێنم .
بە گۆڕی بەنی عەباسی باپیرەم ، گەر کوژەری ئەم کچەم نەخەیتە بەردەست.. تاکو تۆڵەیان لێ بکەمەوە ئەوا...خۆت و( ٤٠ ) ئامۆزا و پوورزات .. لەبەر دەمی کۆشکدا هەڵدەواستم .
جەعفەری وەزیریش وتی : تەنیا ( ٣ ) رۆژ مۆڵەتم بدە .
وەزیر چووە ناوشارو لە دڵی خۆیدا وتی :
خوایە گیان ... ئاخر چۆن بزانم ... کێ ئەم کچەی کوشتووە ؟ تاکو بیخەمە بەردەستی خەلیفە؟
گەر کەسێکی دی بۆ بەرم .. ئەوا خوێنی ئەوکەسە دەچێتە ملم . نازانم چی بکەم ؟

لە بێدەسەڵاتیدا ( ٣) ڕۆژ لە ماڵەوە لێی دانیشت . ڕۆژی چوارەم ، خەلیفە ناردی بە شوێنیداو لێی پرسی :

کوا ئەوەی کچەکەی کوشتووە؟

جەعفەریش وتی :

ئەی میری موسڵمانان ، بۆ من غەیب زانم .. تاکو بکوژەکەی بدۆزمەوە ؟

( خەلیفە ) زۆر تووڕە بوو . فەرمانیدا لەبەر دەروازەی کۆشکدا.. لە سێدارەی بدەن .. فەرمانیشیدا جارچی جاڕ بدات بە شاردا ، کە هەرکەسێك دەیەوێت لە سێدارەدانی ، جەعفەری بەرمەکی و (٤٠ ) کەس لە ئامۆزا و پوورزاکانی ببینێ ، با بێتە ... بەر دەروازەی کۆشکی خەلیفە . زۆرێك لە دانیشتوانی ، ئامادە بوون و نەشیان دەزانی بۆچی لە سێدارە دەدرێن ؟

خەڵکەکە ، دەگریان بۆ ئەبوجەعفەر و ئەو(٤٠ ) کەسەی وا داربەستی سێدارەیان بۆ هەڵخراوە...

ئەبو جەعفەری بەرمەکی و ئەو(٤٠) کەسە لە بەردەمیدا ، بۆ لە سێدارەدان ، ئامادە کراون ! هێندەیان زانی لاوێك دری بە خەڵکەکەدا .. خۆی بەرەو لای (جەعفەر)ی بەرمەکی کوتا .

کە گەیشت بەوەزیری وت :

خوا بت پارێزێت ... ئەی پەناگای هەژاران .. سەرۆکی هەمووان ، ئەو کیژەی کە لە سندووقەکەدا بوو... من کوشتوومە و تۆڵەی لە من بکەنەوە !

( جەعفەر ) ئەمەی بیست ، دڵی بە خۆی خۆش بوو.. بەڵام خەفەتی بۆ ئەو لاوە خوارد . ئەوان لەم کەین و بەینەدا بوون . پیرەمێردێکیش دری بە خەڵکەکە دا و خۆی گەیاندە لای وەزیر و لاوەکە.

سڵاوی لێ کردن وتی :

گەورەو بە توانا.... وەزیری دانا.... بڕوا بەم لاوە مەکە.... ئەم کیژە من کوشتوومە ! گەر تۆڵەی لە من نەکەیتەوە.... لەو دنیا یەخەی تۆ دەگرم .

لاوەکە.... هەڵیدایە :

ئەم پیرە ئاوەزی لە دەست داوە ... خۆیشی نازانێت چی دەڵێت...ئەو کیژە من کوشتوومە. تۆڵەکەی لە من بکەرەوە .

پیرەمێرد وتی :

کوڕم تۆ منداڵیت ، لەبەری دنیات نەخواردووە، من تەمەنێکی زۆرم بە سەربردووە. تێرم لەدنیا خواردووە. بە قوربانی وەزیران و ئامۆزا و پوورزایانی بم... خێرا بکەن من لە( سێدارە) بدەن . جەعفەر بە سەرسووڕمانەوە ! هەردووکیانی سەر خست بۆ لای خەلیفە و کڕنووشی بۆ برد و وتی :

ئەی ( میری موسڵمانان ) .... ئەوە کوژەری کچەکەمان ئامادە کردووە .
خەلیفە پرسیی : کوا ؟
جەعفەر وتی :
ئەم لاوە دەڵێت : من کووشتوومە . ئەم پیرەمێردەش دەڵێت : من کوشتوومە. ئەوە
هەردووکیانن خۆت پرسیاریان لێ بکە .
( خەلیفە )ش سەیرێکی هەردووکیانی کرد و پرسیی :
کامتان ئەو کچەتان کوشتووە؟
لاوەکە وتی : من .
پیرەش وتی : من نەبێت کەسی تر نەیکوشتووە !
خەلیفە فەرمانی دا : هەردووکیان لە سێدارە بدەن ..!!
(جەعفەر) هەڵیدایە :
ئەگەر یەکێکیان (کوژەر) بوو : لە (سێدارە)دانی ئەوی دی : ناڕەوایە .
لاوەکە وتی :
بەحەقی ئەوەی ئاسمانی بڵند راگرتووە .. زەوی راخستووە . من ئەو کیژەم کوشتووە !
ئەمەش ناونیشانی کوشتنەکەم .. دەستی کردە باسی سندووقەکە و شتەکانی ناوی ! خەلیفە
بۆی دەرکەوت کە راست دەکات و زۆری بە لاوە عەجایب بوو و پرسی :
بۆچی.. بە ناڕەوا ئەم کیژەت کووشت؟ بۆچی ئێستا دانی پیادەنێیت ودەڵێیت : تۆڵەییم
لێ بکەنەوە ؟
لاوەکە وتی :
ئەو کیژە - میری موسڵمانان- ئامۆزایشم بوو.. ژنیشم بوو..! ئەو پیرەمێردەش کە
لەبەردەمتایە ، باوکی کوژراوەکەیە و مامی منە ! بە کچی ماردەم کرد وخوا( ٣)کوڕی داینێ !
زۆری خۆش دەویستم و پەزێرایی دەکردم . هیچ خراپەیەکم لێ نەدی . منیش زۆرم خۆش
دەویست . تاکو سەرەتای ئەم مانگە .. زۆر نەخۆش بوو. پزیشکێکی زۆرم هێنایە سەر، تاکو
بەرەبەرە چاك بووەوە . رۆژێك کە دەمویست بیبەمە گەرماوەکەوەو بیشۆم !
پێی وتـم : حەزم لە شتێکە ...
منیش وتـم : بەسەر چاوان....
ئەویش وتی : (سێو)ێك ، با بۆنێکی بکەم و قەپاڵێکی لێ بگرم .
منیش چوومە ناوشار و زۆری بۆ گەڕام .. دەستم نەکەوت ! ئەگەر (سێو)ێك بە
دینارێکیش بوایە.. دەمکڕی . هێندە گەڕام - ماندوو بووم .
گەڕامەوەو وتم : ئامۆزا.. بەوخوایە .. دەستم نەکەوت .
هەر ئەمەی بیست : زەرد هەڵگەڕا و دەستی کردە گریان .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٢١**

چیرۆکی سێ سێوەکە

شەهرەزاد وتی :

پیاوەکە وتی ..

کە رۆژ بووەوە . لە ماڵ هاتمە دەرەوە و هەموو رەز و باخەکان گەڕام . بێ سوود بوو. لە ڕێگا رەزوانێکم بینی و پرسیاری سێوم لێ کرد و لەوەڵامدا وتی :

کوڕم لەم وەرزەدا . بوونی (سێو) دەگمەنە . تەنیا لە رەزو باخەکەی (میری موسڵمانان) کە لە شاری (بەسرە)یە : هەیە ..! کە هەموو ساڵێك : بەرەکەی دەرنن و بۆ ( خەلیفە ) دەنێرنە (بەغداد) . هێندە ژنەکەم خۆش دەویست ،گەڕامەوە ماڵ وخۆم ئامادەی سەفەر کرد و رۆیشتم . چوون و هاتنەوەم (١٥) رۆژی پێچوو. (٣) سێوم بە(٣ )دینارکڕی وبۆ ئامۆزام هێنایەوەو پێمدا . وا ئەویش لەجێگادا کەوتووە و نەخۆشی زەرد و لاوازی کردووە .

بایەخی بە ( سێو )ەکان نەدا و هەر سێکیانی لەو لای خۆیەوە دانا . (١٠) رۆژی تر لە جێگادا کەوت و چاك بووەوە. ئیدی منیش چوومەوە سەر دوکان و کەوتمەوە کاسبی کردن .

نیوەڕۆیەکیان : لە دوکان دانیشتبووم . کۆیلەیەکی رەش هاتە بەر دوکانەکەم . سەرنج دەدەم یەکێك لەو سێوانەی پێ یە . کە بۆ ژنەکەمم هێنابوو. یاری پێ دەکرد.

منیش لێم پرسی :

ئەی کۆیلەی رەش ... ئەم ( سێو )ەت لە کوێ کڕی . تاکو منیش بچم بکڕم !؟

ئەویش بە پێکەنینەوە وتی :

لە دۆستەکەمم وەرگرت . ماوەیەك لەمەوپێش لێرە نەبووم .

دواتر چووم بۆلای و ئەم سێوەی پێدام و لێم پرسی : ئەم (٣) سێوەت لە کوێ بوو؟

دۆستەکەم وتی :

مێردەکەم بۆ ئەم سێوانە گەیشتووەتە شاری (بەسرە ) و (٣) دیناری پێداوە و بۆی هێناومەتەوە ! منیش کە ئەمەم بیست ، دنیا لەبەر چاوم تاریك بوو. دوکانم داخست و بە پەلە بەرەو ماڵ بوومەوە . هێندە تووڕە بووم . مێشکم لە سەردا نەمابوو ، کە سەیردەکەم دوو سێوی لە ماڵەکەمدا ماونەتەوە..

لە ژنەکەمم پرسی : کوا سێوی سێ یەم ؟

ئەویش وتی : نـــازانم !

قسەی (کۆیلە ) رەشە راست دەرچوو. چووم چەقۆیەکم هێنا و ژنەکەمم دایە زەویدا و چوومە سەرسنگی و کەوتمە چەقۆ لێدانی ! سەریم پەڕاند وخستمە ( توورەکە)یەکەوە و

بە قۆپچەکان دام خستەوە .

پارچە فەرشێکم هێنا و تێم پێچا و دووریمەوە . سندووقێکم بۆ هێناو تێم خست ! بردم و بە دەستی خۆم فڕێم دایە رووباری دیجلەوە .

بۆ خاتری خوا : ( میری موسڵمانان ) ... پەلە بکە لە لە( سێدارەدان )م . زۆر لە لێپێچینەوەی ئەو دنیادەترسم ! چونکەکە گەڕامەوە ماڵ سەیر دەکەم کوڕە گەورەکەم بۆ دایکی دەگری ولێم پرسی : بۆچی دەگریت ؟

لە وەڵامدا وتی :

سێوێکی دایکمم هەڵگرت وبردمە کۆڵان .لەگەڵ منداڵاندایاریم پێدەکرد .هێندەمزانی کۆیلەیەکی رەشی درێژ پەیدا بوو.

کە ( سێو )ەکەی بینی لێی پرسیم : ئەمەت لە کوێ بوو؟

منیش وتم :

*باوکم چووە لە شاری ( بەسرە ) بۆ دایکمی هێناوە! (٣) سێوی بە( ٣) دینار کڕیوە .کۆیلەکەش.... سێوەکەی لێ سەندم . زۆریش گریام بە دوایدا .. نەیدامەوە . لە ترسی دایکم خۆم شاردەوە . نەکو لێم بدات . ئێستاش : ئێوارەیەو لە ترسانا گەڕامەوە . تو خوا بابە گیان بۆ دایکم مەگێڕەوە ! با هێندەی تر نەخۆش و بێهێز نەبێت .*

کە ئەمەم بیست بۆم دەرکەوت (کۆیلە) رەشەکە بۆختانی بۆ ژنەکەم کردووە ، درۆی کردووە !منیش لەخۆڕا .. ژنەکەی خۆمم کوشتووە .. زۆر زۆر گریام . ئەم پیرەمێردەش کە باوکێتی هات بۆ لام و بۆم گێڕایەوە . ئەویش لەگەڵ مندا دەستی کردە گریان .تا نیوەشەو گریاین .(٥) رۆژ تەعزیەمان بۆ گرت . تا ئەمڕۆش هەر بەداخین . ئەوەیش بەهۆی ئەو کۆیلەیەوە ، رووی دا . ئێستاش تووە : *گۆڕی باپیرانت : بێ ئەو ژنە ژیانم نی یە.. زووکە.. با بمکوژن !*

خەلیفە زۆری پێ سەیر بوو! وتی : ئەو (کۆیلە) رەشە نەبێت ..کەس لە سێدارە نادەم .

رووی کردە (جەعفەر) و فەرمانی پێدا : ئەوکۆیلە رەشە بوختان چییەم ، بۆ پەیدا بکە ، پەیدای نەکەیت تۆ دەخەمە جێگای ئەو.

جەعفەر بە سەری خۆیدا دا و چاوانی بە فرمێسک بوون و وتی :

ئەمەش مردنێکی تری منە .. هەموو جارێکیش (گۆزە) بەساغی لەکانی ناگەڕێتەوە !

جا ئەوە چۆن دەبێت؟ ئەمانە دەستی دەستیم پێ دەکەن! مەرجەگەیشتمەوە ماڵ هەر(٣) رۆژەکە نەچمە دەرەوە . چی دەبێت با ببێت !

رۆژی چوارەم ، خەلیفە ناردی بە شوێنی و پێیان وت :

خەلیفە زۆر توند بووە .. دەڵێت : ناهێڵم ئەمڕۆ بگەیەنێتە ئێوارە و لە (سێدارە)ی دەدەم !

جەعفەر کە ئەمەی بیست دایە پرمەی گریان وماڵ و منداڵ و دانیشتوانی کۆشك بە دوایدا. باوەشی کردە کچە بچکۆلەکەیدا، کە لە هەموویانی خۆشتر دەویست . بە خۆیەوە نووساندوهەستی کرد شتێکی خڕ لەگیرفانیدایە !

لێی پرسی : ئەوە چی یە لەگیرفانتدا؟

کچەکە وتی :

بابە گیان ئەوە سێوێکە، ڕێحان ی کۆیلەمان بە(٣) دینار پێی فرۆشتم و (٤) رۆژە ، پێمە!

جەعفەر بەمە دڵخۆش بوو و ( سێو )ەکەی دەرهێنا و وتی :

خوایە .. هەر خۆت کارسازیت !

( ڕێحان)ی بانگ کرد و پرسیی : رسوا ... ئەم سێوەت لە کوێ بوو؟

کۆیلەکە وتی :

بەو خوایە .. گەورەم .. درۆ باش نی یە ،(٥) رۆژ لەمەوپێش : کۆڵانە و کۆڵان دەگەڕام . کۆمەڵێ منداڵم بینی یارییان دەکرد . یەکێکیان ئەم (سێو)ەی پێ بوو . منیش زللەیەکم لێدا و لێم سەند .

ئەویش هاواری کرد :

ئەوە هی دایکە نەخۆشەکەمە وحەزی لێ کردبوو. باوکم گەیشتووەتە (بەسرە) و(٣) سێوی بۆ کڕیوە بە (٣) دینار. منیش ئەم سێوەیانم لە دایکم دزیوە ، تاکو یاری پێ بکەم .

دەستی کردە گریان .

منیش گوێم نەدایە و هێنامەوە . ئەم کچە بچکۆلەیەی تۆیش لێی کڕیمەوە بە(٢) دینار، ئەمە بوو بەسەرهاتی ئەو(سێو)ە .

(جەعفەر) ئەمەی بیست ، سەری لەم گێرەشێوێنێیە سووڕما!! خەمی بۆ (ڕێحان) خوارد و دڵخۆش بوو بە ڕزگار بوونی لە چنگی خەلیفە و ئەمەی وت :

کێشەت نەبوونی گەرخزمەتکاربێ      ڕەنگە برینت زوو بە زوو چار بێ

بەڵام ڕۆحی تۆ یەك کەسی دەوێ      بێئەو کەس نییە بە دۆست و یار بێ

قۆڵی گرت و بۆ لای خەلیفەی برد . بەسەرهاتەکەشی بۆ گێڕایەوە .

خەلیفە هێندە پێکەنی و سەری سووڕما کە فەرمانیدا : ئەمەش بۆ مێژوو بنووسنەوە !!

جەعفەری وەزیر وتی :

جا..ئەم بەسەرهاتە - ئەی میری موسڵمانان - کەی بە هێندەی چیرۆکی نورەدینی وەزیری (میسر) و شەمسەدینی برای سەرسووڕهێنەرە!! ؟

( خەلیفە ) وتی :

فەرموو..بابزانین کامەیە : ئەوەی ، لەم چیرۆکە عەجایب ترە!؟

جەعفەر وتی : نایگێڕمەوە ، تا ئەم کۆیلەیەم لە کوشتن ڕزگار نەکەیت .

خەلیفەش وتی :

گەر لەم بەسەرهاتە عەجایب تر بوو. ئەی دەمەوە بە خۆت ، گەر نە..( کۆیلە )کەت دەکوژم .

جەعفەر وتی :

ئــەی ( میری موسلمانان ) ، لە سەردەمی کۆن ، زەمانی جاران . لە (میسر)دا پەیدا بوو ، یەك سولتان . دادوەر و لێزان .. هاونشینی زانایان .. پەنای هەژاران .

یەك وەزیری بە تەگبیری ... رۆشنبیری هەبوو. ( پیر ) بوو . تەمەنی فرە ساڵانێکی بڕی بوو.( ٢) کوڕی بوو . بێ وێنە بوون لە جوانیدا. گەورەکەیان ناوی ( شمس الدین محمد ) و بچوکەکەیان ( نورالدین عەلی) .

بچوکەکەیان زۆر شۆخ و ژیر بوو. زمان شیرین و بە تەگبیر بوو. لە وڵاتانەوە دەهاتنە لای بۆ راوێژ پێ کردنی ! کە باوکیان مرد .. سولتان زۆری پێناخۆش بوو. هەردووکیانی لەخۆی نزیك کردەوە.

سامانێکی زۆری پێ بەخشین و وتی :

من لە جێی باوکتانم و سەر لە خۆتان تێك مەدەن .

ئەوانیش کڕنووشی رەزامەندیان بۆ برد . مانگێك : تەعزییەیان بۆ باوکیان گرت . پاشایش هەردووکیانی کردە وەزیر و لە جێی باوکیان داینان .کار گەیشتە ئەوەی کەسولتان سەفەری بکردایە.. یەکێکیانی لەگەڵ خۆی دەبرد .

شەوێك کە هەردووکیان پێکەوە بوون . رۆژی دواتر سولتان دەبوو، سەفەرێکی دوور بکات .

گفتوگۆیان دەکردو برا گەورە بەبرا بچووکی وت :

حەز دەکەم ، هەردووکمان لە یەك رۆژدا... ژن بێنین !

برا بچووك لەوەڵامدا وتی :

لە قسەت دەرناچم و چۆن دەڵێیت : بــا وا بێت .

بـرا گـەورە ، لـە سـەری رۆیـشت گـەر خـوا کـردی و ژنـەکانمان پێکـەوە منالیـان بـوو و ئەوەکەی تۆ کوڕی بوو. هی منیش کچی بوو.کە گەورە بـوون. لـە یـەکتریان مـارە دەبڕین و ئەوانیش دەبنە ئامۆزای یەك!

برا بچوك پرسیی : باشە ... مارەیی کچەکەت : چی دەبێت ؟

برا گەورە وتی :

(٣٠٠٠)دینار مارەیی و(٣) رەز و باخ و (٣) رانە مەڕ وا نەبێت مارەی لە کوڕەکەت نابڕم!

( نورالدین ) ئەمەی بیست وتی :

ئەمە چ مـارەیی یەکە ، دەیکەیتـە مـەرج بـۆ کوڕەکەم ؟ ئـەی نازانیـت : ئێمە براین؟ سوپاس بۆ خوا هەردووکمان وەزیرین و لە یەك پلە دایـن ، پێویستە بێ مارەیی کچەکەت

بدەیتە کوڕەکەم !

ئەویش وتی : جـــا ... چی یە؟

برا بچوك وتی : لای کەس ئەمە ناگێڕمەوە.. ئەمە لەوە دەچێت کە وتویانـە یـەکێك دەچێتە لای هاوڕێیەکی بۆ داوا کردن .

هاوڕێکەی دەڵێ : بە سەرچاو... سبەینێ وەرەوە.

کابراش ئەم شیعرە دەڵێت :

کە بۆشتێ چوو و وتیان سبەینێ     داواکار دەبێ ئیدی واز بێنێ

برا گەورە وتی :

لەوە دەچێت کوڕەکەی خۆت لـە کچەکەم بـە بـەنرخ تـر بزانیت !! مـن بـەزەییم پێتا هاتەوە . کە هێشتم تۆیش ببیتە وەزیر! ویستم دڵت نەشکێنم و یارمـەتی دەریـشم بیت ! مادام ئەمە قسەتە .کچەکەم نادەمە کوڕەکەت ! ئەگەر کێشی خۆی زێڕیشم بدەیتێ !

( نورالدین )یش وتی :

منیش کچەکەت داوا ناکەم بۆ کوڕەکەم .

( شەمس الدین ) زۆر تووڕە بوو وتی :

منـیش رازی نـیم کوڕەکـەت مێـردی کـچم بێـت ! گـەر لەسـەر سـەفەر نەبوومایـە . نەمدەهێشت بە سەرتا بڕوات .. با بگەڕێمەوە .. پیاوەتی خۆمت پیشان دەدەم .

هەر یەکەیان لە سووچێکی ژوورەکەدا لێی نووست . رۆژ بووەوە( سوڵتان ) سەفەری کرد و ( شمس الدین ) بە دوایەوە! گەیشتنە (جیزە) ولەوێوە بۆ هەرەمەکان . ( نورالدین )یش بە تووڕەییەوە لێی نوست . بۆ بەیانی دوای نوێژ کردن ، قاسەکەی کردەوەو هەندێ پارەی لێ دەرهێنا.

بیری کردەوەی برا گەورەکەی کەوتەوە ... ئەم هۆنراوەیەی وتەوە :

سەفەر دابـــڕان بیر دەباتەوە     یاداشت دەتژێنێ بە ئاواتەوە

نامۆ بوون چاکە : خەم دەڕەوێنێ     بڕۆ وخوو مەگرە: بە وڵاتەوە

گەر ئاو بوەستێ زوو بۆگەن دەکات     گەر رۆیشت بەندە بە حەیاتەوە

مانگ ئاوا دەبێت کە تێی دەڕوانن     وەستا خۆی لە بیر خەڵك دە باتەوە!

فەرمانیدا ئەسپە زەردی بۆ بێنن و زینی بکەن . سـەر زینـە زێڕینەکەی پێدا بـدەن . تووڕەکەی پێدا هەڵ بواستن ... ئاوزەنگی یە ، زیوینەکەی پێدا شۆڕ بکەنـەوە . خـواردنێکی کەمی لەگەڵ خۆی برد و سوار بوو و بە خزمەتکارەکانی وت :

کەمێك دڵم تەنگە و لە شار دەردەچم ! کەس بە شوێنمدا نەگەڕێت .

لە میسر دەرچوو و کەوتە دەشتایی بۆ نیوەڕۆ گەیشتە "بلبیس". ئالیکی بۆ ئەسپەکەی پەیدا کرد و خواردنیش بۆ خۆی . کەوتەوە رێ . پێش ئەوەی شەو دابێت گەیشتە شارێك

ناوی "سعدیه"بوو. هەندێ لە خواردنەکەی خوارد . ئەمجا توورەکەکەی کردە سەرین و لێی نوست .

ئەو شەوە لەوێ مایەوە . بۆ سبەینێ بەیانی سواری ئەسپەکەی بوو، بە ڕێ کەوت تاکو گەیشتە حەڵەب . ( ٣ ) ڕۆژ لە خان مایەوە . تاکو خۆی و ئەسپەکەی بحەوێنەوە . ئەمجا سوار بووە و وەڕێ کەوت . بێ ئەوەی بزانێت بۆ کوێ دەچێت !؟ هەر ڕۆیشت تاکو گەیشتە "بەسرە". بێئەوەی بزانێت ئەوێ کوێ یە ! ئەسپی دایە کەسانی خان ، تاکو تاقەتی بکەن . خۆیشی پاشکۆکەی داگرت و فەرشی لێ ڕاخست . وارێکەوت ، وەزیری بەسرە لە پەنجەرەی کۆشکەکەیەوە سەیری دەرەوەی دەکرد .

ئەسپەکەی بینی ئەو فەرشە نایاب و شمەکە شاهانەیەی بینی . سەری سوڕما..!

بە هەندێ لە پیاوانی خۆی وت : بچن ... ئەو دەرگاوانەم بۆ بێنن .

کە هێنایان کڕنووشی بۆ وەزیر برد.

وەزیر لێی پرسیی : خاوەنی ئەو ئەسپە کێیە؟

ئەویش وتی :

لاوێکی ڕێکپۆشی خاوەن کەسێتیە و لە کوڕە بازرگان دەچێت .خۆی چوو بۆ خانەکەو بەخێری هێنا.

ئەمجا لێی پرسی : لە کوێوە هاتوویت ؟ بۆچی هاتوویت ؟

نورالدین وتی :

لەمیسرەوە هاتووم و کوڕە وەزیر بووم و باوکم مرد .دواتر خۆم جێگەکەیم گرتەوە .

بەسەر هاتی خۆی گێڕایەوەو وتی :

سوێندم خواردووە ، سەری خۆم هەڵبگرم ! شارە و شار و دێ بە دێ وڵاتان بگەڕێم .

کە وەزیر ئەمەی بیست زۆر کاری تێکردو وتی :

کوڕەکەم هێندە بەگوێی هەوا و نەفسی خۆت مەکە . با .. ماندووت نەکات . وڵات وێرانەیە و زەمانە زاڵمە . فەرش و شمەکی بەنورالدین کۆ کردەوە ، بردیەوە بۆ ماڵی خۆیان .

پێی وت : کوڕەکەم پیر بووم و خوا کوڕێکی پێ نەبەخشیم . تەنیا کچێکم هەیە . هێندەی تۆ جوان و شۆخ و شەنگە! داواکارێکی زۆرم بەڕێ کردووە و نەمداوەتێ ! تۆیش بە دڵی منیت ، وەرە کچەکەم پەسەند بکە و با کەنیزەکت بێت و لێت مارە بکەم ! ئەمجا پەیمانی دایە کە بیباتە لای خەلیفە و بڵێت برازایەتی ... بیخاتە جێی خۆی و بیکاتە وەزیر.

وەزیری پیر ، زۆر دڵخۆش بوو. فەرمانیدا هۆڵی بۆ برازێننەوە ، تاکو ئاهەنگی کچەی تێدا بگێڕێ ! بازرگانان و گەورە پیاوانی شاری بەسرەی بانگێشت کرد .

پێی ڕاگەیاندن کە برایەکی هەیە لە وڵاتی میسر وەزیرە و دوو کوڕی هەبووە . بۆ خۆتان دەزانن منیش کچێکم هەیە . ئامۆژگاری کردبووم ، کە کچەکەم بدەمە یەکێك لە کوڕەکانی . منیش لە قسەی دەرنەچووم . ئێستاش ئەم کوڕەیانی بۆ ناردووم کە دەی بینن . لە بێگانەش لە پێشترە ، منیش کچەکەمی لێ مارە دەبڕم و پیرۆزیان بێت ..
دواتر گەر ویستی لای خۆمان بێت با بمێنێتەوە گەر گەڕایشەوە وڵاتی خۆی با بگەڕێتەوە .
میوانەکان وتیان : کارێکی چاکت کردووە .
ئیدی قازی و شایەتەکان هاتنە روو . بوخوورد و داری عوود ، دانرا. شیرینی خورایەوە . گوڵاوپرژێن کرا . وەزیر فەرمانیدا نورالدین ببەنە گەرماو و لە بەرگەکانی خۆی پۆشتەی بکەنەوە . کە لە خۆشتن بووەوە و هاتە دەر.... دەتوت مانگی چواردەیە...!
بە سواری هێسترەکەیەوە بەرەو ماڵی وەزیر چوو و بە گەیشتنی دەستی ماچ کرد .
ئەویش لای خۆیەوە داینا و پێی وت :
سبەینێ : دەتبەمە لای سوڵتان ، بەڵکو یارمەتیت بدات .
ئەمە هەواڵی نورالدین بوو . براکەیشی ماوەیەك لەگەڵ سوڵتاندا لە سەفەر بوون .کە گەڕانەوە نورالدین ی برای نەبینی یەوە . لە خزمەتکارانی کۆشکی پرسی...
پێیان وت :
کە تۆ سەفەرت کرد ، ئەویش سواری هێسترەکەی بوو . هەندێ شمەکی لەگەڵ خۆی برد و وتی : بەرە و(قەلیوبیە) دەبمەوە رۆژێك یان دوانم ، پێ دەچێت . کەمێك دڵم تەنگە ! کەس بە دوومدا نەگەڕێت !
ئیدی لەو رۆژەوە دەرچووە ، هەواڵی نی یە !
شمس الدین زۆر پێی تێکچوو، پەژارەیەکی زۆری خواردو لە خۆیدا وتی :
ئەمە بەهۆی سەرکۆنە کردنی بووە ، لەلایەن منەوە .... پێویستە بنێرمە دووی!
چووە لای سوڵتان و هەواڵی سەرهەڵگرتنی نورالدین ی برای پێدا... سوڵتانیش نامەی نارد بۆ لای نوێنەرانی لە شاروشارۆچکەکانی وڵاتەکەی ،کە هەواڵی نورالدین بپرسن .
بەڵام سەفەری (٢٠ ) رۆژەی سوڵتان و شمس الدین ، هێندە زۆر بوو، کە نورەدین ، رێ یەکی زۆری بڕی بوو، بۆیە زۆری بۆ گەڕان ، بەڵام سوودی نەبوو.
کە شمس الدین دەستی لە براکەی شت ، لە دڵی خۆیدا وتی :
ئەمەندە زۆربڵێ بووم بەرامبەر ئەو ژن هێنان و شوو کردنە .. تاکو ئاوام بەسەرهات خۆیشی . دوای ماوەیەك ، کچە بازرگانێکی مارە کرد .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

## چیرۆکی بدرالدین حسەنی نورالدین

شەهرەزاد وتی :

دوای ماوەیەك ژنی شمس الدین کچێکی بوو، جوانیەکەی کەم وێنە بوو! هەر لەو رۆژەیشدا ژنی نورالدین کوڕێکی جوانی بوو. کە دەتوت ئەم شیعرە بۆ ئەوە وتراوە :

قژی بەروویدا پەخش و بڵاوە     شەوە زەنگێکی سەر رووی هەتاوە

ئەوخاڵە رەشەی لەسەر روومەتی     گوڵە ( لالە)یە و رەشی تێزاوە

ناوی نا... بدرالدین . باپیرەی کە وەزیری ( میسر) بوو ... زۆری خۆش دەویست . لە شاردا.. لە هەرکوچە و کەناردا . سفرەخوان راخرا . وەزیری بەسرەش ، نورالدین ی بردە لای سوڵتان و کڕنووشی بۆ برد و بە زوبانێکی پاراو.... شیرین و رەساو .. ئەم شیعرەی بۆ وت :

هەر پایەدار بێت خاوەنی سایە     بمێنیت تاکو دنیا دنیایە

تا رەز و باخان بە بولبولان بن     بژیت بۆ ئێمە بە شادی خوایە

سوڵتان لەبەری هەستا و سوپاسی شیعرەکەی کرد و پرسیی : ئەم لاوە کێیە؟

دوای ئەوەی وەزیر وتی : برازامە .

بە سەرهاتەکەی لە نووکەوە بۆ گێڕایەوە .

سوڵتان پرسیی : ئەمە ، کام برازایەتە!؟ ئاخر کە ئێمە هیچمان لەم بارەیەوە نەبیستووە؟

وەزیریش وتی :

گەورەمان .. ئەی سوڵتان .. برایەکم لە وڵاتی میسر ، وەزیر بوو و ئێستا مردووە . دوو کوڕی لە دوا بەجێما ..گەورەکەیان خرایە شوێنی باوکی و بوو بە وەزیر. ئەمەش کوڕە بچووکەکەیەتی و هاتووەتە لای من . منیش سوێندم خواردووە کچەکەم بەم نەبێت ، نەیدەم بە کەسی تر . ئێستاش زاوامە و هەرزەکارە ! ئەوەتا منیش پیرم و گوێم گران بووە و بلاوە بیرم . ئەم لاوەیش برازامە و مێردی کچمە ...خوازیارم بیخەیتە شوێنەکەم و بیکەیت بە وەزیری خۆت ! ئەمیش پیاوێکی تا بڵێی زاناو بە تەگبیرە.

سوڵتان .. سەرنجیدا و بەلایەوە بیر ورایەکی باش بوو . دواتر بە وەزیرانی ناساند و لە جێی دایناو رێزی گرت و پاداشتێکی باشیشی کرد . هێسترێکی خۆی دایە و مووچە و سەر مووچەی بۆ بڕی یەوە . ( نورالدین )یش دەستی پاشای ماچ کرد و سوپاسی کرد .

بە دڵێکی خۆشەوە گەڕانەوە ماڵەوە و وتیان :

ئەمە پێ و قەدەمی کوڕەکەیە .

بۆ سبەینێ بەیانی ، چووە لای پاشا و کڕنووشی بۆ برد و وتی :

رۆژان دێت : دڵم شاد دەبێتەوە　　خەمی حەسوودیش زیاد دەبێتەوە
داهاتووت روون و گەلێ رەنگینە　　ناحەزیش : رەنجی بەر باد بێتەوە

پاشاش فەرمانیدا، لە شوێنی وەزیریی دابنیشێت . ئەویش کار و باری سەرشانی وەکو وەزیر جێ بەجێ کرد . کاری وەزیر چۆن بوو ، وای کرد . سوڵتانیش هەروا سەیری دەکرد و لە وریاییەکەی سەرسام دەبوو ! رۆژ بە رۆژ پتر دەچووە دڵی یەوە . کە دەوام تەواو بوو ، گەرایەوە ماڵ و کاری ئەو رۆژەی بۆ مامەی گێرایەوە . ئەویش زۆری پێخۆش بوو. وای لێهات هەمیشە لای سوڵتان بوو. داهاتی دەوڵەت باشتر بوو. مووچەی سەربازان زۆرتر بوو. خۆیشی بووە خاوەنی موڵك و ماڵێکی زۆر و پاپۆری بازرگانی وکۆیلە و خزمەتکاران . تەمەنی بووە (٤٠) ساڵان کە باپیرەی مرد .

( نورالدین ) تەعزیەکی شایستەی بۆ گێرا ، کەوتە پەروەردە کردنی حەسەنی کوری . کە ئەو کورەی تەمەنی گەیشتە(٧) ساڵان : فەقێی بۆ گرت کە فێری خوێندنی قورئانی بکات .

ماوەی (٦) ساڵ لە ماڵەوە فێرە خوێندن کرا . (حەسەن)یش تا دەهات جوانتر و قۆز و شۆخ و شەنگ تر دەبوو . هەر دەتوت ئەم شیعرە بەودا هەڵدراوە :

خۆرە وا هەڵدێ لەو دوو لێوانە　　بە خۆشی تۆوە مانگ لە ئاسمانە
شاژنی جوانیش سەراسیمەیە!　　بەرامبەر مەستیی : ئا ئەو چاوانە!

تا ئەو کاتە حەسەن لە کۆشکی ماڵ نەچوو بووە دەرەوە .

رۆژێکیان جلوبەرگی حەسەنیان گۆری و بە سواری باشترین هێستر لەگەڵ باوکی رۆیشتە دەرەوە . باوکی بردی بە دیوان ، تاکو ببینێ سوڵتان . سوڵتان فرە پێ سەرسام بوو. لە رێگایدا خەڵکی دەوەستان تاکو تێر لە بینینی جوانی ئەم کورە بخۆن .

سوڵتان دەستی بە سەری بدرالدین حەسەنی کوری نورالدین ی وەزیردا هێناو وتی :

ناو بە ناو ئەم کورەش لەگەڵ خۆت بهێنە .

ئیدی زۆرجاران ، نورالدین ی لەگەڵ خۆی دەیبردە کۆشکی فەرمانرەوایەتی . کورە تەمەنی گەیشتە ( ١٥) ساڵان و باوکی بەرەو پیری و لاوازی دەچوو.

رۆژێکیان کورەکەی دانا و پێی وت :

کورم ، ئەم دنیایە دەروا. ئەو دنیا دەمێنێتەوە ، ئەمەوێ هەندێك ئامۆژگاریت بکەم . لێم تێبگە.

ئامۆژگاریی کرد هەڵسوکەوتی جوان بێت . لەو کاتەدا براکەی بیر کەوتەوە ، کە چۆن لە یەکتری دابران دەستی کردە گریان و ئەمەی وت :

گلەیی دووریت کە ئاوا:دەکەین　　ئەدی پەنامان لە بۆ کێ ببەین
بە تەتەرماندا سکالامان نارد　　تا بە پەرۆشیی دڵی خۆ بگەین

وشك بووینەوە بە خەمت ، ئێستا نوقمی فرمێسکی سوێری دووچۆگمین
ئەی ئادریاری، دوورەدەست ئەوا بۆ وێنەت ، دڵ وگیان دەڵێن ( جێگمین )

رووی کردە کوڕەکەی و وتی :
ئاگادار بە... مامت وەزیری وڵاتی ( میسر )ە ! منیش لە فەرمانی ئەو دەرچووم و سەری خۆم هەڵگرتووە . زۆر مەبەستمە ، کە ئەم هەواڵە لای خۆت بنووسیتەوە . (بدرالدین )یش کاغەزی هێنا.
باوکیشی ورد ورد بەسەرهاتەکەی دەگێڕایەوە و ئەویش دەینووسیەوە .
ڕۆژی ژن گواستنەوەو هاتنە بەسەرەی نووسی ، تەمەنیشی کە لە خوار(٤٠) ساڵانەوە بوو. کاغەزەکەی نوشتانەوە و مۆری کرد و وتی :
کوڕەکەم ، ئەم نووسینە مێژووی تۆ و بنەماڵەکەتە . گەر تووشی نوشتی بوویت. بگەڕێوە میسر و بگەڕێ بە شوێن ئەو مامەیەتدا . تێی بگەیەنە کە من لەم ئامۆژیەدا بە ئاسەی ئەوەوە مردووم. حەسەن بە دەم گریانەوە نامەکەی لە قوماش گرت و دووری پەوە.
باوکی وتی :
(٥) ئامۆژگاریت دەکەم . تکایە پەیڕەویان بکە .
یەکەم : دوورە پەرێز بە و هێندە تێکەڵی خەڵك مەبە، تاکو بێوەی بێت ، شیعرێك لەبەرە دەڵێت:

نییە سەرنجت بۆی رابکێشێ هاوڕێیەك خەم و پەژارەت کێشێ
دوورە پەرێز بەو مەچۆ سایەی کەس بۆیە پێم وتی ، سەرت نەئێشێ

دووەم : کوڕەکەم .. شوێن کەس مەکەوە با زەمانە شوێنت نەکەوێت . چونکە زەمانە ڕۆژێك لە تۆیە و ڕۆژێکی دی بەرهەڵستتە ! شاعرێك وتوویەتی :

ئەوەی دەتەوێ پەلە مەبە لێی بەزەییت هەبوو، ئیتر ناترسێی
دەستی خوا سەرووی هەموو دەستانە زۆردار، زۆردارێك دێتەوە سەر ڕێی

ئامۆژگاری سێ یەم :
کەم دوو بەو واز لە ناتەواوی یەکانی خەڵك بێنەو خەریکی ناتەواوی یەکانی خۆت بە ! وتویانە ، زمان بوەستێنێت ... سەر رەحمەتە !
شاعیرێك وتوویەتی :

گفتوگۆ زیـــوە و بێدەنگی زێـــڕە کە قسە دەکەی ، قەت رامەبوێرە
لۆمەی بێدەنگیی خۆت بکەیت،جارێ لۆمەی زۆر وتن ، بە بار بژمێرە !

چوارەم ، کوڕەکەم ( مەی) مەخۆرەوە ، ئەوەتا شاعیرێك وتویەتی،
بیاڵەم فڕێ دا و هەر زوو مەیم ڕشت جونکە خستمی یە بەر پلاری گشت
ئەو( مەی)یە ڕێگای ڕاست ون دەکات دەرگای ئاژاوەیش دەخاتە سەرپشت

پێنجەم ، پارە و سامانت بپارێزە .. ئەویش تۆ دەپارێزێت . بە فیرۆی مەدە .. تاکو پێویستت بە کەسانی سووك و خوێڕی نەبێت. ئەو درهەمە مەرهەمە! شاعیرێك وتویەتی ،

گەر سامانم بوو، هاوڕێم هەزارە     بێ هاوڕێ دەبم ، ئەمشم بوو پارە

بۆی خەرج بکەم لە دەورو بەرە     سوودم بۆی نەما ، پشت لە هەوارە

تا .. گیانی دەرچوو، ئامۆژگاری ( بدرالدین ) حەسەنی کرد . دواتر سوڵتان رێ و رەسمی تەعزیەی گرتە خۆی . تاکو(٢) مانگ بدرالدین حەسەن تازیەباری باوکی بوو. ئەمجووە سەری حوکمڕان و نە بۆ لای سوڵتان ! بۆیە ( سوڵتان ) لێی تووڕە بوو. فەرمانی بە پۆلیسدا : دەستیان گرت بە سەر موڵك و سامانیدا. دیوانی وەزارەتەکەیشی مۆر کرا.

جێگرەکەی فەرمانی بۆ دەرکرد . بدرالدین بگرن و بیبەنە بەردەم سوڵتان . لە نێوان سەربازەکاندا، کۆیلەیەکی باوکی هەبوو. کە بەمەی زانی سواری ئەسپەکەی بوو و خۆی گەیاندە ماڵی بدرالدین . بینی لەبەر دەرگا دانیشتووە و خەفەتبار و سەری لە کۆشیدایە !

دابەزی و دەستی ماچ کرد و وتی :

گەورەی کوڕی گەورەم .. فریاکەوە خێراکە .... لەم مەرگە خۆت قوتارکە!

( حەسەن ) گیانی کەوتە لەرزین و پرسیی : هەواڵی چیت پێ یە ؟

ئەویش وتی :

سوڵتان رقی لێت هەڵگرتووە . خۆت رزگار بکە ... با : دوای من هیچت بەسەر نەیەت !

( حەسەن )یش وتی :

دە.. با بچمە ژوورەوە ، هەندێك پارە و پوول بۆ رێگای خۆم ببەم .

ئەویش وتی : گەورەم ، فریا ناکەویت ! هەر ئێستا ماڵ جێ بهێڵە .

ئەویش بەدەم خۆ ئامادە کردنەوە . ئەمەی وت :

خۆت رزگار بکە بۆنی کێشەت کرد     هەر ئەوە تیاچوو کە بەرکەوت و مرد

هەر شێری ورە بەرزە و مل ئەستوور     بە هیچ رووداوێك ملی نابێ : ورد

ئیتر بە دامێنی کراسەکەی دەم و چاوی شاردەوە و لە ماڵ دەرچوو ..

لە رێگا دەی بیست کە وەزیری نوێ هەڵی کوتاوەتە سەر ماڵی وەزیری کۆن . تاکو دەست بە سەر کۆشکەکەیدا بگرێت و ( بدرالدین )ی کوڕیشی بباتە بەردەم سوڵتان .. تاکو فەرمانی کوشتنی دەربکات . خەڵکەکەش زۆر بەداخ بوون بۆ پیاوچاکی و جوانیەکەی .

ئیتر سەری خۆی هەڵگرت .تاکو قەدەری خوا ..گەیاندی بە خاك و ئاوی باوکی ... ئەوسا چووە ناو گۆڕستانێکەوە .

کە ملنوویەتی دەرچوو، بینی لە کراسەکەی خۆی نووسرابوو:

ئەی خاوەنی روویەکی جوان     ئەستێران بۆت هاتنە دووان

وتیان کە تۆ بـــالاتری و     خاوەنداری هەموو جیهان

که بە گۆڕستانەکەدا، سووڕایەوە ، گۆڕەکەی باوکی دۆزیەوە .. رووانیی جولەکەیەك کە لە زێڕنگەر دەچوو لە سەری بوو. چوو بۆلای و سەرنجیدا توورەکەیەکی پێ یە .. بڕێك زێڕی تێدا یە .

جوولەکەکە لە ( حەسەن )ی بەسری پرسی :

گەورەم ... ئەوە بۆ رەنگت تێکچووە ؟

ئەمیش لە وەڵامدا وتی :

لە خەوندا، باوکم گلەیی سەرنەدانیم لێدەکات . بە خەمی ئەوەوە بووم : شەو دابێت و ئەگەمە سەر گۆڕی باوکم .

جوولەکەکەیش وتی :

باوکت چەندین پاپۆڕی بۆ بازرگانی ناردووە و هەنـدێکیان گەڕاونەتەوە . منیش ئەوە (١٠٠٠) دیناری زێڕت دەدەمێ . لە حەقی یەکەم پاپۆڕ، کە دەستم پێیدا گەیشت . دەستی کردە توورەکەیەکدا پڕ بوو لە زێڕ .

(١٠٠٠ ) دیناری بۆ ژمارد و دایە دەستی وپێی وت :

تۆیش کاغەزی بەڵگەی فرۆشتنەکەم بۆ مۆر بکە .

( حەسەن )یش لە وەرەقەیەکدا نووسیی :

من کە ( حەسەن )ی کوڕە ( وەزیـر )م . هـەر پـاپۆڕەی بگاتـە کـەناری ئـاو، فرۆشتوومە بە(١٠٠٠ ) دینار و پارەی یەکێکیانم وەرگرتووە . جوولەکەکە لێی دا و رۆیشت ، حەسەنیش سەردەمی بەختەوەری خۆی بیر کەوتەوە . ئەو دەمەی لای باوکی بوو و ئەم شیعرەی وت :

هەوارم : بێ هـــاوارە بێ تۆ دراوسێم نادیـــارە بێ تـــۆ

ئەدڵم بە دۆست گەشاوە دەبێ ئەمانگی ئاسمان شەوقدارە بێ تۆ

خۆری ئاسمانی و بە ئاوا بوونت هەوار وهەرێـــم شەوگارە بێ تۆ

سەری نا بە کێلی گۆڕەکەی باوکیەوەو زۆر گریـا و خـەو بـردی یـەوە. مانگە شەو بوو. ئەمیش ملی لار بووە و کەوتە سەر پشت بێ ئەوەی بە ئاگا بێتەوە . گۆڕستانەکەش پڕ بوو لە جنۆکەی موسڵمان .

( جنۆکە مێ )یەك هاتە ژوور سەری و سەری لە جوانی سووڕما بوو!

لە دڵی خۆیدا وتی : پەنا بە خوا.... ئەمە دەڵێی لاوانـــی نێو بەهەشتە ..!!

فری و بڵند بوودوە .

لە ئاسمان دێوێکی بینی و لێی پرسی : لە کوێوە هاتوویت ؟

دێوە وتی : هەر لێرەم .

ئەمیش پرسیی : لەگەڵمدا دێیت ... تا ئەو لاوە نووستووەت پیشان بدەم ؟

دێوەکەش وتی : با بڕۆین !

خۆڕ بوونەوە ، بۆ گۆڕستانەکە .
کە گەیشتن (جنۆکە مێ )یەکە پرسیی :
لە ژیانتا جوانی بەم شێوەیەت ، بینیوە؟
دێوەش وتی :
پەنا بەخوایە ئەمە تاك وبێ وێنەیە ! خوشکێ ڕێی مەیش بدە جیم دیوە، بۆت بگێڕمەوە.
جنۆکە مێ وتی : فەرموو.
دێوە وتی :
تا ئەم لاوە جوانترم ، لە وڵاتی (میسر) دیوە . ئەویش کچێکە تەمەنی دەوروبەری (٢٠) ساڵانە و کچی (شمس الدین )ی وەزیرە . کە( سوڵتان ) جوانی و شۆخ و شەنگی ئەم کیژەی بیستووە ناردووی بە دوای وەزیری باوکیداو پێی وتووە :
بیستوومە کیژێکی جوان و نایابت هەیە . بۆیە خوازبێنیت لێ دەکەم بۆ خۆم .
وەزیریش وتوویەتی :
گەورەم.. سوڵتان .. لێم ببوورە و بەزەییت پێمدا بێتەوە . خۆت دەزانیت ( نورالدین )ی برام هاوبەشم بوو، لە وەزارەتدا . دواتر سەری خۆی هەڵگرت . کاتی خۆی باسی منداڵەکانمان و شووکردن و ژن هێنانیانمان کردووە ... هەر ئەوەیش بووە هۆی تووڕە بوونی و سەرهەڵگرتنی . منیش هەر لەو ڕۆژەوە ئەم کچە لە دایك بووە سوێندم خواردووە کە لە برازاکەمی مارە بکەم . کیژی زۆر هەن سوڵتانی گەورەمان مارەی بکات .
سوڵتان ئەمەی بیست زۆر تووڕە بوو و وتی :
کەسێکی وەکو من داوای کچی تۆ بکات ، بەم بیانووە ، پڕو پووچە دەست بەرووییەوە دەنێیت؟ مەرج بێت ، دەبێت کچەکەت لە خوێڕی ترین خزمەتکار.. مارە بپڕم ...!!» .
پاشا کۆیلەیەکی هەبوو لە پشت و لە پێشەوە ( قەموور) بوو. فەرمانیداو هێنایان و هەر بە زۆر کچی وەزیریان لێ مارە بڕی ! بە دەم گاڵتە جاڕی و لاقرتێوە کۆیلەیان کردە گەرماوەوە ! لەولایشەوە کچە وەزیری بووك دەگریا. تەنانەت نەیانهێشت باوکی بووکەش ئامادە بێت!! قەمووری زاوایش هێندە ناشیرین بوو.. لە وێنەی نەبینرابوو....
( جنۆکە مێ ) وتی :
*با .. لەم لاوە هەڵبگرین و بیبەین بۆ لای ئەو کچە ... تا بزانین کامیان جوانترە !؟*
دێوە وتی : زۆر باشە . هەر ئێستا ئەم کوڕە هەڵدەگرم و دەڕۆین .
فڕی و ( جنۆکەمێ ) بەدوایەوە . کە گەیشتنە ( میسر) کوڕەی خستە سەر سەکۆیەك .
کوڕە خەبەری بووەوە . سەیری دەوروبەری کرد . بۆی دەرکەوت ئەم شوێنە شاری ( بەسرە ) نی یە . ویستی هاوار بکات .

دێوە دەستی نا بە دەمیدا و وتی :
دەمەوێت کارێکت بۆ بکەم . ئەم مۆمە داگیرساوە بگرە و تێکەڵی خەڵکەکە ببەو بچۆ گەرماوەکەوە .
لەگـەڵیان بـڕۆ... تـا دەگەیتـە هـۆڵی بـووك . بـێ تـرس : بـچۆ لای راسـتی زاوا قەمووڕەوە..دابنیشە .
هەر کە گۆرانی بێژ ... شاباشی کردی .. دەست بخە گیرفانت : پڕە لە زێڕ.. بۆیان هەڵبدەو مەترسە.. گیرفانت ، پشت بەخوا، هەمیشە پڕ دەبێت لە زێڕ..!
کە ( بدرالدین حسن ) ئەمەی لە ( دێو )ەکە بیست پرسیی :
ئەم کێژە چی یە !؟ هۆی ئەم چاکە کردنە چی یە؟
چوو و مۆمێکی داگیرساندو خۆی کرد بە گەرماودا..هاتە دەرو قەمووری بینی سواری ئەسپ بووە . ئەمیش چووە ناو خەڵکەکە ، کە ئەو جوانی و شۆخ و شەنگی یەی بدرالدین یان بینی و ئەو بەرگە جوانـەی لەبەردایە. هـەر (گـۆرانی بێـژ)یش پێیـدا هەڵـدەداو داوای شاباشی دەکرد . ئەویش دەستی دەبردو زێڕی بۆ هەڵ دەدا. خەڵکەکە سەریان سووڕما..! بە دەم ڕێگاوە ئاهەنگ بوو تـاکو گەیـشتنە بـەردەم کۆشـکی وەزیـر.. دەرگاوانـان نەیانهێشت ، خەڵکەکە هەموویان بچنە ناو کۆشك . بۆیە ڕێگەیان نـەدا (بـدر الـدین حـسن )یش بچێتە ژوورەوە .
گۆرانی بێژان بێدەنگ بوون و وتیـان : *ئـەم لاوە نەکەنـە ژوورەوە : ئێمـەش ناچینە ژوور. چونکە.. زێڕ و پارەیەکی زۆری شاباش کردووین .*
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.*

## شەوی ٢٣

شەهرەزاد وتی :
هەرکە چوونە هۆڵی ئاهەنگ . ( بدرالدین حسن ) لە بەرامبـەر بـووك و زاوا دانیشت . ژنـان و کیـژانی وەزیـران و پیـاوانی دەوڵـەتیش بـە درێـژی دوو ڕیـز دانیـشتبوون . هـەر ئافرەتێك پەچەی بە سەرەوە و مۆمێکی داگیرساوی بە دەستەوە بوو. ڕیزەکانیان لە بەردەم بووك و زاواوە تاکو ناوەڕاستی هۆڵ درێژ ببووەوە . گۆرانی بێـژان سـەرەڕای جوانی یەکەی ئەو بەخشندەی یەشیان لێ بینی بوو.
بە کەنیزەکە مۆم بە دەستەکانیان وت :
*پەزێرایی ئەو لاوە بکەن . چونکە نوقمی زێڕ و پارەی کردووین . نزای خراپیش بۆ زاوا بکەن .*
گۆرانی بێژان لە تەپڵ و دەفیان دا..گۆرانیان چڕی . کچە وەزیریش بە ڕازاوەیی لە نێواندا

بوو. ملوانکەی زێڕی لە گەردنیدا بوو و کراسێکی لەبەردا بوو. وێنەی شێر و پڵنگی زۆر
جوان و باڵندەی بە ئاوی زێڕ لەسەر نەخش کرابوو. ملوانکەیەکی لە مل دابوو ، پەمەنی و
بە( نقێم ) ڕازا بۆوە . کە بایی هەزاران دینار بوو و قەیسەریش شتی وای نەبوو. بووکەکیش
دەتوت ، مانگی چواردەیە .

ژنان جۆرێك سەرنجیان دەدا... دەتووت ، سەیری ئەستێرە دەکەن . ( بدرالدین حسن
)ی بەسریش سەرنجی خەڵکەکەی ڕاکێشابوو. ( قەموور )ەی زاوایش ، پشت گوێ خرابوو .
ئەو قەموورە هەر لە ( مەیموون) دەچوو. هەرچەند مۆمی بەردەمیان دابگیرساندایە،
دەکوژایەوە بۆیە کەوتبووە تاریکی یەوە .

لەبەردەم ئەمیشدا ، مۆمێکی زۆر داگیرسابوو... کە سەرنجی کچە مامیدا... دڵی خۆش بوو.

بووکەش کە ( بدرالدین حسن )ی بینی ئەم نزایەی کرد ،

*خــوایە بیکە مێردم ئەو کوڕە .... نەکو ئــا ئەم قەموورە !*

دیاری و تەدارەکییان دایە بووك . زاوای ( قەموور)یش لەولاوە بەتاکو بێ کەس . کە
ئاهەنگ تەواو بوو و هۆڵ و کۆشکیان چۆڵ کرد . تەنیا ( بدرالدین ) و ( قەموور)ەی زاوا
مانەوە . بەربووك و پێخەسوو... بووکەیان بردە ژوورێکی دی بۆ ئەوەی ئامادەی کەژاوەی
بووکێنیی خۆیی بکەن .

( قەموور )ی زاوایش .. لە ( بدرالدین حسن ) چووە پێش و پێی وت :

بەخێر هاتیت ، چاکە و پیاوەتیت دیارە و ئیدی بۆت هەیە بڕۆیت .

ئەویش وتی : بسم الله ..هەستا و لە ماڵ چووە دەر.

دێوەکە لەبەر دەرگا گرتی و پێی وت :

بدرالدین .. بوەستە !

کە قەموور لە کەژاوەی بووك و زاوا هاتە دەر. تۆ بچۆ ژوورەوە.کە بووکێ پرسیی : بڵێ
من زاوام .

پاشا لەبەر چاو و نفوس ئەمەی کردووە . ( زاوا )ی (قەموور)یش سەرکاری خزمەتکارانە .
کە ئەمان سەرگەرمی گفتوگۆ بوون . سەرکار هاتە دەر و بەرەو ژووری کەژاوە ، چوو .

( دێو )ەکە خۆی کردە حەوزی ناوەکەدا و لە شێوەی مشکێکدا هاتە دەر و وتی :

زیك ..!

قەموورەیش وتی : چیتە ؟

مشکەکە گەورەتر بوو و بە هێندەی پشیلەیەکی لێ هات و وتی :

میاو...میاو...

خۆی گەورەتر کرد بۆ هێندەی سەگێك و وتی : وەو.... وەو.

سەرکاری قەموور ترساو وتی : بێدەنگ بە .... ئەگبەت ..!!

سەگەکە خۆی گەورەتر کرد . بە هێندەی ( جاشوولکە )یەك و کەوتە زەڕین .
قەمووری گەورە سەرکار بێزار بوو و هاواری کرد : فریام بکەون ..!!
جاشوولکەکە خۆی گەورەتر کرد . تا بووە : گامێشێك ! ددانەکانی لێ جیڕ کردەوە
هەر وەکو خۆمان قسەی کرد و پێی وت :
قوڕ بە سەرت ...!
هەموو جەستەی قەموور کەوتە لەرزین .
( گامێش ) پێی وت :
گەڕایت .... گەڕایت ... کەس نەما مارەی بکەیت ، ئەم کیژە نەبێت !؟
( قەموور)ە ، بێدەنگ بوو.
دێوەکە خوڕی بە سەریدا : قسە بکە با نەتخەمە ژێر گڵ .
سەرکاری قەموور وتی :
بە زۆر لێیان مارە بڕیوم ! ئێستاش ( تـۆبە) بێت لای خوا و تۆ .
( دێو )ەکە پێی وت :
سوێند بێت ، هەر لە ئێستاوە .. تاکو سبەینێ ، ڕۆژ هەڵدێت لێرە بجوڵێیت و کەس تێ بگەیەنیت دەتکوژم ! کە ڕۆژ بووەوە . یەکسەر لەم کۆشکە دەچیتە دەرەوە و جارێکی دی ناگەڕێیتەوە . منیش تاکو بەیانی شەونخوونی دەکێشم ، بەدیارتەوە .
( قەموور)ە لەترساندا وتی : بەسەر چاو .
ئەمە بوو : بەسەرهاتی قەموور- بەسەرهاتی ( بدرالدین حسن )ی بەسری . بووکە و پیرەژنی پێخەسوو و خۆیان کرد بە کەژاوەدا . پیرەژنە لەبەر دەرگا مایەوە .
دوای کەمێك هاتە دەر و وتی : ها.... ئەوەش پەرۆی ڕوو سووری .
ئەمە بەسەرهاتی بدرالدین حەسەن و کیژەی ئامۆزای بوو.
( دێو )ەش بە جنۆکە مێی وت :
*هەستە ئێستێ بەرەبەیانە ... با ( بدرالدین ) ببەینەوە شوێنی خۆی .*
( جنۆکە مێ ) بدرالدین ی هەڵگرت و فڕی و دێوەش بە تەنیشتی یەوە . فڕین.. فڕین .. هێندەیان زانی بانگبێژان ، (حی علی الصلاە) یان بوو . خوا ڕێیدا بە فریشتەکان بەردی گڕاوی بگرنە دێوەکە . دێوە سووتا و مرد . ( جنۆکەمێ )یەش بە بێ زیان قوتار بوو . قەدەری خوا وابوو ، لە شام لەبەر دەرگای ماڵێك نیشتەوە . ( بدرالدین حسن )ی دانا و لێی دا و فڕی .
ڕۆژ بووەوە ، خەڵکەکە لە ماڵ هاتنە دەرو هەر یەکە بۆ سەرکاری خۆی . سەیریان کرد وا لاوێك بە شەرواڵ و جلوبەرگێکی جوانەوە لەبەر دەرگایەکدا پرخەی دێت ..! چونکە ماندووی دوێنێ شەو بوو و بە هۆی ئاهەنگەکەوە تێر خەو نەبوو بووا

ئەوانەی بینیان وتیان :
خۆزگە ، پەلەی ئەکردایە و جلەکانی بگۆڕی بـا .
یەکێکی دی وتی :
منالانی خەلك داماون . ئەمە رەنگە .. لە مەیخانەکەوە هاتبێتەدەر، هێنـدە سـەرخۆش بـوو
بێت ڕێگەی ماڵەوەی ون کردبێت و خەوی لێ کەوتبێت .
دەنگە دەنگ ( بدرالدین )ی بە ئاگا هێنایەوە و خۆی بینی .
بە سەرسووڕمانەوە ، پرسیی :
ئێرە .... کوێ یە؟ ئەرێ بۆچی لێم کۆبوونەتەوە !؟
ئەوانیش وتیان :
ئێمە .. ئەم بەیانی یە تۆمان لەبەر ئەم دەروازەی شارەدا بینی .... نوستبووی !
لێیان پرســـی : ئەمشەو لە کوێ بوویت ؟
ئەویش وتـــی : خەلکینە ، ئەمشەو من .. لە ( میسر ) بووم !
یەکێك پرسیی : تۆ حەشیشەکێشیت !؟
یەکێکی دی وتی :
بیارە شێتیت ! ئەگەرنا ..چۆن ئەمشەو لە (میسر) بوویت و ئێستا لەدیمەشق!؟
( بدرالدین )یش وتی :
بەو خوایە دوێنێ لە ( میسر) بووم .. ئەمشەویش ، ئەوتا لێرەم کە (دیمەشق)ە ..!!
یەکێکیان وتـــی : چاکە !
یەکێکی دی وتی : ئـــەم لاوە .. شێت بووە !
هەندێك چەپۆکیان پێداداو کەوتنە مقۆ مقۆ و وتیان :
نووخوا.. داماوە ..گەنجیشە ! گومانی تیا نی یە .. تێك چووە !
ئەمجا پێیان وت : ئاگات لە خۆت بێت ، لەمەو دوا بیر بکەرەوە ئەمجا قسە بکە !
بدرالدین یش وتی : ئەوە دەڵێن چی؟ دوێنێ لە ( میسر) لە ئاهەنگی ( بووك )دا بووم !
ئەوانیش پێیان وت : بابە گیان ... رەنگە خەونت بینیبێت !
ناچار گومانی لە خۆی کردو وتی :
نە خێر.. ئەوە خەون نەبوو لە شەودا.. بینی بێتم ..!! لەگەڵیان بووم . بووکیان دابەزانـد !
دوایی خۆم و ( قەموور) و ( بووك ) ماینەوە . بە خوا خەون نەبوو ! ئەی باشە کوا کیسە
زێڕ و جلەکانم !؟
خۆی کرد بە شاری ( دیمەشق )دا و کەوتە گەڕان ... خەڵکەکە سـەیریان دەکـرد . خـۆی
کرد بەچێشتخانەیەکدا ، کـە خاوەنەکـەی کۆنـە دز بـوو و تۆبـەی کردبـوو . بـەڵام تـووڕە
وەڵەند بوو، خەڵك لێی

دەترسان ! کە بینیان ( بدرالدین ) چووە ناو دوکانەکەی . دوور کەوتنەوە و ئەو ناوچەیان جۆڵ کرد.
خاوەن دوکان ئەو شۆخ و شەنگی و جوانی یەی ئەم لاوەی بینی چووە دڵی یەوە .
لێی پرسی :
لەکوێوە هاتوویت؟ بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە . تۆ جێی خۆت لە دڵمدا کردووەتەوە!
( بدرالدین )یش لە نووکەوە سەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە .
چێشت لێنەر وتی :
ئەی .. ( بدرالدین )ی بەڕێز ، ئەمەی تۆ وتت ... سەرسووڕهێنە و شتێکی نامۆیە! بەڵام کوڕم لەمەودوا باسی مەکە . با.. نهێنی بێت .. تا خوا دەرووییەکت لێ دەکاتەوە . لێرە لای من بمێنەوە ، من کوڕم نی یە و دەتکەمە کوڕی خۆم .
( بدرالدین )یش وتی : چی دەڵێیت وا دەکەم .
( چێشت لێنەر) چووە بازاڕ و بەرگی جوانی بۆ کڕی و پۆشتەی کردەوە . بردی یە لای ( قازی ) و شایەتی دا کە کوڕی خۆیەتی ! ئیدی رۆژانە لە دوکانەکەدا لە سەر دەغیلەی چێشتخانەکە دادەنیشت و پارەی وەردەگرت . بەم شێوەیە کاروباری باش بوو. لەولایشەوە شاجوانی ئامۆزای ، زۆر چاوەڕێی (بدرالدین حسن)ی کرد . بەڵام .. هەر نەگەڕایەوە !!
کاتێکی زانی باوکی خۆی کرد بە ژووورداو پەژارە دایگرت بوو بەو خەمەی کە سوڵتان بۆی دروست کردبوو.کە چۆن هەر بە زۆر کچەکەی لە کۆیلەیەکی قەموور مارە کردبوو !! بۆیە لە دڵی خۆیدا بڕیاری دابوو ... کچەکەی خۆی بکوژێت . تا لە دەست ئەو نەفرەتی یە رزگاری بکات . رۆیشت تا گەیشتە بەردەم ژووری بووکەکە . بانگی کردە ، کچەکەی . بووکە بە روویەکی خۆشەوە هاتە دەر و کڕنووشی بۆ باوکی برد .
باوکیشی کە ئەو رووە خۆشەی بینی . بەتووڕەیی یەوە پرسیی :
چی یە ئەفرەتی .... دەڵێی بەو ( قەموور )ە .. خۆشحاڵیت !؟
( بووک )ە ، بزەیەك گرتی و وتی :
توو خوا با.. ئیدی بەس بێت .. دوێنێ هەر دوێنێ بوومە گاڵتەجاڕی ئەو خەڵکە بە هۆی ئەو سەرکارە( قەموور )ەوە ، کە نینۆکێکی مێردەکەم ناهێنێت . دە ئەو کوڕە، قەموورەم بیر مەخەوە .
ئەو (١٠) دیناری کرێی خۆی وەرگرت و رۆیشت .. بەڕێی خۆیەوە! منیش چوومە پەردەوە دەروانم مێردی خۆم دانیشتووە . ئەو لاوەی کە هێندەی شاباشی زێڕ بەسەر گۆرانی بێژاندا هەڵدا بوو و هەژارانیشی دەوڵەمەند کردبوو. باوکی کە ئەمەی بیست بەرچاوی تاریك بوو . هاواری کرد بە سەریدا : بێ رەوشت ... ئەمە چی دەڵێیت !؟ بیر و هۆشت لای خۆتە ؟
کچەش وتی :

بابه ... جگەرت بڕیم ! هێندە خۆت بە گەورە مەزانە.. بەم نزیکانە مێردەکەم
دەگەڕێتەوە و دێتە خزمەتت !! خۆت بچۆ بنج و بناوانی کێشەکەوە .
باوکە چووە ، ناو کەژاوەی بووک و زاواوە .
سەرکاری ( قەموور )ی لەو ناوەدا بینی، وتی :
خۆ... ئەوە سەرکاری قەموورە...!!
پێـــی وت ، ئەی قەموور
ئەویش وتی : تفووم.....تفووم ..!
چونکە وای زانی .. ئەوە هەر ( دێو )ەکەیە و دەی دوێنێ !
وەزیر شەرفندی بە سەریدا ، قسە بکە... یا بەم شمشێرە سەرت ئەپەڕێنم !
سەرکاری قەموور وتی ، سەرکردەی دێوان ..خۆت منت لێرە داناو منیش ئەموێراوە ،
سەرهەڵدەم ! بەڕەچیت پێما بێتەوە.
کە وەزیر ئەمەی بیست پرسیی :
ئەوە تۆ دەڵێی چی ؟ من وەزیری باوکی کچەم .. ( دێو ) نیم !
ئەویش وتی :
بەسە .. بەس... نیازتە گیانم بکێشیت !؟ بڕۆ بەڕێی خۆتەوە . پێش ئەوەی بێتەوە و
بت بینێ و ئەوەی بە سەر منی هێناوە.. بە سەر تۆیشی بێنێ !! خوا.. ئەوە بگرێت ئەم
بووکەی لێ مارە کردم و خوا ئەوش بگرێت کە دەستی لەم ئیشەدا بوو.
وەزیر کە ئەمەی بیست وتی : هەستەو ئەم کۆشەکە جێ بهێڵە ... دەی !
( قەموور )یش وتی :
چۆن بوێرم بە بێ رێ پێدانی ( دێو )ەکە ئێرە جێ بهێڵم !؟ دێوەکە فەرمانی پێداوم کە
خۆر هەڵهات بڕۆم ... بەڕێی خۆمەوە..!
وەزیر پرسیی : کێ تۆی هێنایە ئەم شوێنە ؟
( قەموور ) وتی :
دوێنێ هاتمە ئێرە ، بۆ مێز کردن . ( مشك )ێك لەو ناوە هاتە دەر و هاواری کرد . هەر
گەورە بوو ..گەورەتر بوو ، تا بە هێندەی گامێشێکی لێهات . هەندێ قسەی پێ وتم .. چوو
بەگوێمدا. خوا رووی ( بووك )ە رەش بکات و ئەوەی لێی مارە کردم ..
وەزیر قۆڵی گرت و بردی بە دەرەوە و ئەو داماوەیش بڕوای بەخۆی نەکرد خۆر کەوتووە.
رزگاری بوود.
بە راکردن خۆی گەیاندە ( سوڵتان ) و چی بەسەرهاتبوو.. بۆی گێڕایەوە...!!
( وەزیر )ی باوکی کچەش ، چووە ژوور و سەراسیمە بوو لەم کارەو وتی :
کچەکەم هەواڵی خۆشم پێ بڵێ .... چوون بوو؟

کچەش وتی :

ئەو زاوایەی دوێنێ تۆ بۆ منت هەڵبژارد بوو... لاوێکی شۆخ وشەنگ بوو . ئەگەر بڕواشم پێ ناکەیت ئەوە مێزەرەکەیەتی . ئێستاکەش هەر لە سەر کورسی یەکە ماوەتەوە . باوکی چووە ژوور و بینی ، ئەوە هەر ئەو مێزەرەیە کە (بدرالدین حسن )ی برازای بە کاری دەبرد ..

هەڵیگرت و ماچی کرد و وتی : ئەم مێزەرە وەزیرانەیە و لە ( موسڵ ) چنراوە .

سەیری ئەو مووروورەی کرد ، بە ( کڵاوقووچ )ەکەوە بوو. هەڵی بچڕی و نووشتەیەکی پێوە بوو کردیەوە و سەیری کرد (١٠٠٠) دینار و نامەیەکیشی تیابوو کە پەیمان نامەی فرۆشتن بوو، بە ئیمزای ( بدرالدین حسن )کوڕی ( نورالدین علی میسری ) کە (١٠٠٠) دینارەکەشی لەگەڵیدا بوو.

(شمس الدین) ئەمەی خوێندەوە ... زریەکەیەکی کرد و بوورایەوە ..

ئاویان بە دەم و چاویدا پژران ... کە بەئاگا هاتەوە ، زۆری پێ سەیر بوو وتی :

خوای بێ هاوتا.. توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە! دەزانیت ..کچەکەم .. شووت بەکێ کردووە؟

کچەش وتی : نـــە ء ...!!

( شمس الدین) وتی :

ئەو لاوە برازاکەی خۆمەو ئامۆزای تۆیە! پەنا بەخوا(١٠٠٠) دینارەکەش پێشەکی مارەیی تە! خۆزگە دەمزانی ئەم چیرۆکە .. چۆن دروست بووە؟

کە نامەکەشی کردەوە... دەست و خەتی براکەی ناسی یەوە نووسرابوو :

کە شوێنەوارێك لێتان دەبینم زوو دەتوێمەوە و چاو بە گرینم !

ئەی:ئەوەی تیری دووریت کوشتوومی حەز دەکەم جارێك بێتە سەرینم

ڕۆژی مارە بڕینی تێدایە . لەگەڵ مێژووی لە دایك بوونی بدرالدین حسن. زۆر دڵخۆش بوو بەم زانیاریانە . بەراووردی کرد بە ڕۆژی ژن هێنانی خۆی و ڕۆژی لە دایك بوونی کچەکەی. سەیری کرد هاوچەشنن ! ڕۆژی لە دایك بوونی بدرالدین و کچەکەی وەکو یەکن .

ئەو کاغەزەی لەگەڵ خۆی برد و چووە بەردەم ( سوڵتان) و پیشانی دا .. بەسەرهاتەکەیشی بۆ گێڕایەوە... پاشا سەری سووڕما !! فەرمانیدا ئەم ( چیرۆك )ە ..لە مێژووی ( شاهان )دا بنووسرێتەوە.

وەزیر ئەو ڕۆژە تا ئێوارە چاوەڕوان بوو. برازاکەی بگەڕێتەوە ماڵ . دیار نەبوو . ڕۆژی دووەم و سێ یەم ... تاکو هەفتەیەك ، بەڵام بێ سوود بوو.

ئەمجا وەزیر وتی :

دەبێت کارێك بکەم . کەس نەکردە بێت !

هێلکێشی (کۆشك)ی کرد . شوێنی شتومەکی ناو ( کۆشك )ی تیا دیاری کرد . شوێنی
گەنجینە و بەردەی پەنجەرەکان لە کوێدان ... ژوورەکانی کۆشك و شتەکانی کردە نەخشەی
سەر کاغەز .
(کڵاو فووچ )ەی هەڵگرت . دەروازەی کۆشکی کلۆم دا و بە فەرمانی شاهانە مۆری کرد .
تا.. برازاکەی دەگەڕێتەوە....
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو

## شەوی ٢٤

### چیرۆکی (عەجیب)ی کوڕی بدرالدین حەسەن

شەهرەزاد وتی :
ئـەی پاشای بەختیار ... گەورەی وەفـــادار .. ( کچە وەزیر)یش (٩) مانگەی خۆی بردە سەرو کوڕێکی بوو . وەك مانگ بوو بە جوانی ..!
چوو بووەوە سەر باوکی . چاوانیان بە کل رشت و بۆنی خۆشیان لێدا و ناویان نـــا..( عەجیب ) و بە ( دایەن )یان سپارد ، تاکو بەخێوی بکات . ڕۆژان ڕۆیشت و مانگان هات .
تاکو منداڵە تەمەنی بووە (٧) ساڵان . فەقێ یان بۆ گرت . تاکو فێرەخوێنـدنی بکات . (٤) ساڵان بوو و لەماڵەوە پێی خوێندرا .
( عەجیب ) کەوتە بە شەڕ هاتن لەگەڵ هاوڕێیانی و پێی دەوتن ،
من کوڕە وەزیری (میسر)م . کێ وەکو منە !؟
هاوڕێکانیشی سکاڵایان بردە لای یاوەرەکەی ، کە چاودێری بوو . یاوەرەکەی پیلانـی بۆ دانان کە سبەینێ هاتە ناویانـەوە ئـەوانیش بڵێن : هـەر کەسـێ نـاوی دایك و بـاوکی خۆی نەڵێت ، یاری لەگەڵ ناکەین! چونکە ئەوانەی ناوی دایك و باوکیان نەزانن( زۆڵ )ن !!کە ( عجیب) هاتە نێو منداڵانەوە .
یەکێکیان هاتە پێش و وتی :
ناوم (ماجد)ە ، (عالیە) دایکمە و ( عزالدین) باوکمە .
یەك لە دوای یەك خۆیان ناساند . کە سەرە گەیشتە سەر ( عەجیب ) ئەویش وتی :
ناوم ( عەجیب)ە ، دایکم ( شاجوانە) ، باوکم ( شمس الدین )ی وەزیری ( میسر)ە .
منداڵانیش پێ یان وت :
باوکت وەزیر نی یە !
( عەجیب )یش وتی :
نەختێر وەزیر، باوکی راستەقینەمە !

چووە بازاڕ و پێویستی یەکانی سەفەری کڕی .

بۆ سبەینێ کەوتنە رێ ... رۆژی یەکەم و دووەم و سێ یەم ، بەڕێوە بوون و گەیشتنە ( دیمەشق). بینیان پڕە لە رووبار و رەز و باخ .. هەر دەڵێی ئەمەی بۆ وتراوە ,

شەو و رۆژێکی خۆشم بردەسەر — دووباری ئاکات، جارێ دی، قەدەر

خوێندنی مەلان هاژەی شەتاوان — گەواڵە هەور و سرووەی بای سەحەر

بێدەنگی شەوان ئامێزی کردین — رۆژەکەی مەست و بێ ئاگا و خەبەر

وەزیر لە گۆڕەپانە جەولگەکەدا بارو بارخانەی خست و بە پیاوەکانی وت ، رەشماڵ هەڵ بدەن . ( ٢ ) رۆژ لێرە دەمێنینەوە... تاکو بحەوێینەوە .

دوای تەواو کردنی کارەکانیان . پیاوانی کاروان چوونە شارەوە ، بۆ کڕینی شتومەکی پێویستی خۆیان . یەکێ دەچووە گەرماو و یەکێکی دی شتی دەکڕی . یەکێ شتی دەفرۆشت . هەندێکیان چوونە سەیری مزگەوتی ( بەنی ئومەیە ) .کە لە دنیادا وێنەی نەبوو...(عەجیب) و خزمەتکارەکەشی چوونە ناو شار بۆ سەیرکردن و گەڕان . عەجیب دەرۆیشت و خزمەتکار بە دوایەوە . خەڵکی شاری (دیمەشق ) پێش کە ئەو لاوە قۆز و جوانەیان دی وەك شنەی شەماڵ پێی دەحەوانەوە و دەگەشانەوە . هەر بۆیە... وەدووی کەوتبوون . هەندێك لە سەرە رێ یدا وەستابوون . تاکو ببینن ! قەدەری خوا وابوو کۆیلەکە لەبەردەم دوکانی ( بدرالدین حسن )ی باوکیدا وەستا . لەبەرئەوەی کاتی خۆی لە دادگا پیرەی خاوەن چێشتخانە کردبووی بە کوڕی خۆی . (پیرە مێرد) مردبوو و هەموو سامان و دوکانەکەی بۆ بدرالدین حسن مابووەوە . کە ئەم لاوە قۆزەی بینی بە لایەوە سەیر بوو. خوێنی کوڕ و باوکایەتی قوڵپی داو ..چووە دڵی یەوە ! هەر وەکو جاران .. برنجی بە ( رووبەمەنار) لێنابوو.

فەرمووی لە عەجیب کرد :

گەورەم .. گەورەمان بکە و دڵمان مەشکێنە ... کەمێك لە خواردنەکەمان بخۆ .

بێ ئەوەی پێ بزانێت .. چاوانی بە فرمێسك بوون . بیری سەردەمی خۆی و خەمی ئێستای کەوتەوە . کە عەجیب ئەمەی بینی . رەحمی بۆی جوڵا!

سەیرێکی کۆیلەکەی کرد و پێی وت :

لەوە دەچێت ئەم خاوەن چێشتخانەیە ، کوڕێکی لێ دابڕابێت !! با دڵی بدەینەوە و ببینە میوانی. بەڵکو خوا بەزەیی بە منیشدا بێتەوە ، باوکم بدۆزمەوە !

کۆیلەکە وتی :

باشە چۆن دەبێت کوڕە وەزیر چێشتی بازاڕ بخوات ؟ ئاخر .. لە ڕێگا بەم داوە خەڵکم لێ دوور خستوێتەوە ! ئێستا چۆن لەم دوکانە دڵنیا بم !؟

بدرالدین حسن : چاوانی پڕ بوون لە فرمێسك .

عەجیب یش رووی کردە کۆیلەکە و وتی : دڵم وای دەوێت !
کۆیلەکەیش وتی :
واز لەم قسانە بێنە ، مەچۆ دوکانەکە .
لەو کاتەدا : باوکی عجیب بە کۆیلەکەی وت :
پیاوی باش .. بۆچی دڵم دەشکێنی و نایەنە ژوورەوە؟ ئەی قۆزاخەی لۆکەی دڵ سپی و بێ گەرد. ئەی ئەو کەسەی هەر دەڵێی .. ئەم شیعرەت بۆ وتراوە .
کۆیلەکە پێکەنی و وتی : چیم پێدا هەڵدراوە ..!؟
بدرالدین حسن ئەم شیعرەی وت :
گەرخوو و رەوشتی باشت نەبوایە      کۆشکی شاهانت نەدبووە سایە
سەیرە: ئەم کوڕە خزمەتکارێکە      کەچی فریشتەیش: بۆی بە نزایە
کۆیلە بە دڵی بوو ، بۆیە لەگەڵ عەجیب چووە چێشتخانەکەوە. برنجی (رووبەهەنار)ەکە بە کەرەی مەشکەوە لێنرا بوو. گوێز و بادامی تێکرابوو . دەستیان بە خواردن کرد . ( بدرالدین )یش زوو زوو دەیوت عافیەتتان بێت.
عەجیب بە باوکی وت :
دانیشە و لەگەڵمان بخۆ.. بەڵکو خوا شادمان بکاتەوە بەوەی کە دەمانەوێت .
بدرالدین یش وتی :
کوڕەکەم دەڵێی لە خۆشەویستت دابڕاویت !؟
(عەجیب )یش وتی:
بەڵێ.... مامە ئەو دابڕانە دڵی سووتاندووم . من لە باوکم دابڕاوم...!! خۆم و باپیرەم بە شوێنیدا وێڵین !! شارانی بۆ دەگەڕێین . داخی بە جەرگم !! خۆزگە پێی شاد دەبوومەوە . کەوتە گریان و هەنسك دان . ئەوانیش لەگەڵیدا گریان. هەموویان تێریان خوارد . دواتر هەردووکیان لە چێشتخانەکە چوونە دەرەوە ، بدرالدین وا هەستی دەکرد رەوانی لەگەڵیاندا چووەتە دەرەوە !! بۆیە ئەمیش دوکانەکەی داخست و شوێنیان کەوت . پێش ئەوەی لە دەروازەی شار دەربچن . بدرالدین پێیان گەیشتەوە! کۆیلەی خەسێنراو .. لای کردەوە و خاوەن چێشتخانەی بینی .
لێی پرسی : چی یە ؟
بدرالدین یش وتی :
کە چوونە دەرەوە . هەستم کرد رۆحی منیش دەچێتە دەرەوە! بۆیە وتم :
منیش شتێکم لە دەرەوەی شارە، با بۆی بچم! جا ..... شوێن ئێوە کەوتم .
کۆیلەی خەساو ، تووڕە بوو و وتی :
ئا.. لەمە دەترسام . ئەو چەند پاروەی، بوو بە نەگبەتی بۆمان . ئەوەتا.. هەنگاو بە

هەنگاو شوێنمان کەوتووە..!!

عەجیب لای کردەوە، جێشت لێنەری لەدوای خۆیەوە بینی...

سوور هەڵگەڕا، تووڕە بوو بە خزمەتکارەکەی وت :

وازی لێ بێنە ، با بڕوات بە ڕێی خۆیەوە . کە گەیشتینە دوارەکانمان و هەر بە شوێنمانەوە بوو، ئەوا دەری دەکەین . سەری داخست و خزمەتکارە بە دوایەوە . ( بدرالدین حسن ) شوێنیان کەوت.... تا گۆڕەپانە چەولکەکە و لە دوارەکانەوە نزیك بوونەوە .. لایان کردەوە .. ڕووانیان هەر بە دوایانەوەیە! عەجیب تووڕە بوو و ترسی لێ نیشت . کۆیلەی خەساو.. چوونە ناو چێشتخانەکە بۆ باپیری بگێڕنەوە . پێی ناخۆش بوو بڵێن چووەتە( چێشتخانە )وە و ( چێشت لێنەر) شوێنی کەوتووە. لای کردەوە لووتی تەقی بە لووتی باوکی دا..!

( چێشت لێنەر) ڕۆحی تیانەما و ڕەنگی تێکچوو . عەجیب وای بینی ئەمە ناپاکە و ترسناکە!! بەردێکی گرتە باوکی.... بدرالدین کەوت و بووڕایەوە . خوێن بە ڕوخساریدا هاتە خوار.... ئەوانیش بەرەو ڕەشماڵ بوونەوە و جێیان هێشت . ئەویش کە بە ئاگا هاتەوە ، لە دڵی خۆیدا وتی :

تاوانی خۆم بوو... ئاخر نارەوایە شوێنیان کەوتووم و ئەوانیش بە دوژمنی خۆیانم دەزانن !! گەڕایەوە دوکانەکەی و کەوتەوە کار کردن .

دایکی کەوتە بیر:

چاوەڕێی ویژدان مەکە لە هەڵەك لۆمەشی مەکەو (داد)ی مەدە تەك

جێژ لە ڕۆژانی شادیت ببینە خەم پشتگوێ بخەو قەت نەت بێ گەرەك

کەوتەوە فرۆشتنی خواردنەکەی . بەڵام وەزیری مامی(٢) ڕۆژ لە ( دیمەشق)دا مایەوە . دواتر بەرەو (حمص) بووەوە . لە هەر شوێنێك لای دەدا دەی پرسی . هەر ڕۆیشت ، تا گەیشتە ( دیاربەکر ) و ( ماردین ) . دواتر( موسل).. لەوێوە بۆ ( بەسرە) و چووە بینینی ( سوڵتان ) . ئەویش زۆری ڕێز لێنا. کە هۆی گەشتەکەی لێ پرسی. ئەمیش چیرۆکی (نورالدین علی) وەزیری برای بۆ گێڕایەوە. سوڵتان بەسەریدا هات و وتی :

هاوڕێ.... ئەو وەزیری من بوو! زۆرم خۆش دەویست . (١٥) ساڵ دەبێت کۆچی دوایی کردووە. کوڕێکی لە دوا بەجێماوە . کوڕەش هەر مانگێك مایەوە . ئیدی ون بوو..! بەڵام دایکی کوڕەکە لای خۆمانە ! چونکە کچی وەزیری گەورەیە .

کە ( شمس الدین )ی وەزیر بیستی براژنەکەی ماوە و سەلامەتە . زۆر دڵی خۆش بوو. وتی : پاشا گیان.... دەمەوێت ئەو ژنە ببینم .

پاشاش ڕێی پێدا و ئەویش چوو بۆ ماڵی براکەی . کە سەرنجیدا... براکەی بیر کەوتەوە. کە لە نامۆییدا مردووە. بە گریانەوە بەم شێوەیە ، لاوانی یەوە :

حاڵ ودەورو بەر خانوو بەرجیە      دالان و ژوور و باخ و حەوشەیە
خۆشەویستیمان بۆ هەوار نییە      بۆ ئەو کەسەیە تێیدا : نیشتەیە
لە دەرگاوە چووە سەر حەوشە بچکۆلەیەك . کە بە بەردە (مەرمەڕ) دارێژرابوو. بە وردی چاوی گێڕا بە دیوارەکانیدا. ناوی نورالدین ی پێوە بینی . بە ناوی ئالتوون نووسرابوو. ناوەکەی ماچ کرد و بە سەریدا گریا و بەو فرمێسکی قەتیس ماوە .... لاوانەی یەوە بەم هۆنراوە :
لە خۆر و مانگ و هەوریش دەپرسم      چوون مەیلتە کەم پرسای گشت کەسم
هەر چاوم لێك نا: لوولی تاسەتم      بێ سەر و شوێنم بێ ئاگا و ترسم
کە دابڕان بوو: مەیل بڕان بوو.      کەچی تۆ بوویتە هەوا و هەوەسم !
ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو هۆڵەی براژنەکەی لێ بوو. دایکی ( بدرالدین )یش لەو کاتەوەی کوڕەکەی ون بوو بوو..کار و پیشەی لە سوێی کوڕەکەیدا ، هەر گریان بوو .گۆڕێکی لەماڵی خۆیدا بە بەردی (مەرمەڕ) بۆ هەڵبەست بوو . ئەمیش گەیشتە پشتی دەرگاکەو گوێی لەم لاوانەوەیە بوو:
ئامێزت گرت و زوو بویتە گۆڕی      تەڕ و بڕیەکەی ئەویشت گۆڕی؟
خۆ تۆ گەردوون نیت وا بە ئاسانی      لەئامێزت گرت مانگ و هەم خۆری
لەوکاتەدا (شمس الدین )ی وەزیر خۆی کرد بەلایدا و سڵاوی لێکردو پێی وت : کە برای مێردەکەیەتی.
هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوەو وتی :
(٢٠) ساڵ لەمەوپێش ، کچەکەم لە( بدرالدین ) مارە بڕیوە . ئێستاش ، سکی لێی هەیە . تەنیا شەوێك چوونە پەردەوە و پێکەوە بوون ! ئیدی ڕۆژی دواتر بدرالدین ون بوو . ئێستاش کوڕەکەی بدرالدین ی لەگەڵدایە و کوڕەزاتە و لە کچی منە .
براژنی ئەمەی بیست ، هەستا و کڕنووشی بۆ ( شمس الدین )ی وەزیر برد و وتی :
هێندە بە تاسە و بە چێژ و تامێ      مژدەی هاتنی ئێوەیان دامێ
مژدانەم دەدا ، گەر بیویستایە      کە بە منی دا وەها ئاکامێ
وەزیریش یەکێکی نارد( عەجیب ) بهێنێت.کە گەیشت براژن باوەشی پێدا کرد دەستی کردە گریان .
وەزیر وتی :
ئێستا کاتی گریان نی یە ... کاتی ئەوەیە خۆت ئامادە بکەیت بۆ سەفەری ( میسر )! بەڵکو ئەمە خوایە ، لەوێ بە کوڕەکەت شاد ببیتەوە .
ئەویش هەستا و چیی بە نرخی هەبوو کۆی کردەوە . کەنیزەك و خزمەتکارەکانیشی ئامادە کرد . ( شمس الدین )ی وەزیر چووە لای سوڵتانی ( بەسرە ) و سوپاسی کرد و

خواحافیزی لێکرد . ئەویش هەندێ دیاری دایە تاکو بیدات بە سوڵتانی میسر . کەوتنە ڕێ و گەیشتنە ( دیمەشق) . وەزیر دابەزی و دەوار و ڕەشماڵی بۆ هەڵدان .

بە کاروانەکەیشی وت ؛

هەفتەیەک لێرە دەمێنینەوە، تاکو هەندێ دیاری و نەختینە بۆ سوڵتانی میسر بکڕین .

( عەجیب )یش بە کۆیلە خەساوەکەی وت ؛

لایەق ..حەزم لەگەڕانە بە نێو بازاڕدا . سەرێکیش لە چێشت لێنەرەکە دەدەین . چونکە خراپەمان بەرامبەری کرد .

خۆیش بۆ باوکی جولاو لەدەوارەکە هاتنە دەرەوە . چوونە شاری دیمەشقەوە .. گەڕان .. گەڕان . تاکو گەیشتنە چێشتخانەکە . کات پاش نیوەڕۆ بوو. چێشت لێنەر لە دوکانەکەدا وەستا بوو . وا ڕێکەوت بوو کە ئەو ڕۆژەیش خواردنی ( برنج بە رووبەهەنار)ی لێنابوو . سەیری دەم و چاوی کرد .

شوێنی بەردەکەی پێوە بوو و بەزەیی پیاهاتەوەو پێی وت ؛

سڵاوی خوات لێ بێت . ئەوە بزانە لای من شیرینیت !

بدرالدین سەرنجیدا و هەستی بۆی بزوا . سەری داخست و هەرچەندی کرد نەیتوانی قسە بکات .

دوای کەمێک سەری بڵندەوەو کرد و وتی ؛

زانیم تێکەڵیت بە گیان و خوێنم بۆیە هەستم کرد بێ سەر و شوێنم

کە سەری ڕێزم بۆ ئەوی کردی دەرکەوت شەرمەکەی شوورەیی هێنم

پێیشی وتن ؛

دڵم بهێننەوە جێ .. بەوەی لە خواردنەکەم بخۆن . ئەی لاو ئەوە بزانە کە دەتبینم ، ئێدانی دڵم خێراتر دەبێت . بڕوا بکە بێ ئاگا شوێنت کەوتبووم !

( عەجیب )یش وتی ؛

تۆ لای ئێمە شیرین بوویت ، بۆیە خواردنەکەتمان خوارد . تۆیش شوێنمان کەوتیت و خەریک بوو ڕسوامان بکەیت ! ئێستاش دەمەکت ناکەین ، تا سوێندمان بۆ نەخۆیت ، کە دوایی شوێنمان ناکەویت .

وا مەزانە کە ئیدی ناتبینمەوە ! چونکە هەفتەیەک دەمێنمەوە ، بۆ ئەوەی باپیرەم دیاری بکڕێت بۆ پاشا.

چوونە ناو چێشتخانە و ئەویش ( برنجی رووبە هەنار)ی بۆ دانان .

عەجیب وتی ؛ لەگەڵمان بخۆ ، تاکو خوا دڵمان بکاتەوە .

( بدرالدین ) زۆری پێخۆش بوو، لەگەڵی خواردن . روو کراوە و دڵی پێیانەوە بەند بوو .

عەجیب وتی ؛

ئەی تۆ ئەتووت پیاوێکی سەنگین و بە رەوشتم !؟ ئیدی بۆچی هێندە سەیرم دەکەیت ؛
( بدرالدین )یش وتی :
لەدڵا جێی خۆت وا کردۆتەوە        گڕەوی عەشقی خۆت بردۆتەوە
تۆ بەهەشتم بیت نابێ بسووتێم        کەوسەر لێوانتە بە بڕۆتەوە
سەعاتێك بدرالدین ، خەریکیان بوو، پارووی بۆ دەکردن . کە تێریان خوارد هەستان.
(حسن )ی بەسریش ئاوی کرد بە دەستیانداو خاولی ئاوریشمی بۆ هێنان و دەستیان وشك کردەوە . گوڵاوی پیا پرژاندن . هەر یەکە و پیاڵەیەك شەرابی تێکەڵ بە مسکی پێندان و ئەوانیش هەڵیان دا و بەرەو دەوارەکانیان بوونەوە . عەجیب باوەشی بە ئەنکیدا کرد و ئەویش ماچی کرد .
بدرالدین ی کوڕی بیرکەوتەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا و کەوتە لاواندنەوە :
خۆزگە بە ئێوە شاد دەبوومەوە        دەست بە کەمەری ئارەزوومەوە
دڵ هەواداری تەنیا ئێوە بوو        بە مێژووی ئێستا و عومری زوومەوە
پرسیی : لە کوێ بوویت ..کوڕە شیرینەکەم ؟
ئەویش وتی : لە دیمەشق بووم .
ئەنکی خوانگەی ڕاخست و برنجی بە رووبە هەناری بۆ دانان و بە خزمەتکارەکەی وت ،
دانیشە لەگەڵ عەجیب نان بخۆ .
خزمەتکارەکە وتـــی : بەخوا .. بۆمان ناخورێت !
(عەجیب )یش هەر چەند لە چێشتخانەکە زۆری خوارد بوو . پاروویەك برنجی کرد و کردی بە رووبە هەنارەکەدا و خواردی .
سەیری کرد زۆر شیرین نی یە ، بۆیە وتی : ئۆف ... لەم خواردنە ناخۆشە..!!
ئەنکیشی وتی :
کوڕەکەم ، خۆم بۆم لێناوی ، چۆن خەوشی لێ دەدۆزیەوە؟ ئەم خواردنە تەنیا بدرالدین ی باوکت نەبێت .. کەسی دی نازانێت لێی بنێت !
( عەجیب ) وتی :
ئەنـــێ خواردنەکەت خراپـە ... ئێمـە ئێستا لـە شـار گەڕاینـەوە ، چێشتخانەیەکمان دۆزیوەتەوە ، لەم خواردنەشی لێنابوو، کە بۆنت دەکرد دڵت دەکرایەوە . ئەوە بوو برنجی بـە رووبـە هـەنار ! هـەر حـەزت دەکـرد بیخۆیـت ! ئەمـەی تـۆ هـەر هـیچ نـی یـە لە بەرامبەریدا..!!
ئەنـــێ لە خزمەتکارەکە تووڕە بوو و پێی وت :
تۆ خووی کوڕەکەمت خراپ کردووە . هێندەی ئەم دوکان و ئەو دوکان دەیگێڕیت !
خزمەتکارە خەساوەکەیش وتی :

ئەچووینەتە دوکانەکانەوە . هەر سەیرمان کردووە .
( عەجیب ) وتی :
ئەخێر چووینەتە ناو چێشتخانەکانەوە و خواردنەکانی لە هی ئەنکم خۆشترن !
ئەنە چووە لای شووبراکەی و سکاڵای خۆی کرد و خزمەتکارەیان بردە لای وەزیر .
ئەویش پرسیی : چوونەتە ناو چێشتخانەکەوە ؟
دیسان عەجیب وتی :
چووینە ژوورەوە ، برنج و رووبەهەنارمان خوارد ، تاکو تێر بووین . چێشت لێنەر، شەرابێکی داینێ بە شەکر و بەفرەوە بوو .
وەزیر هێندەی تر تووڕە بوو و بەخزمەتکاری وت ،
گەر راست دەکەیت دانیشە نان بخۆ ، لەبەر چاومان .خزمەتکارەیش لەسەر خوانەکە دانیشت بەڵام تەنیا پارووییەکیشی بۆ نەخورا .
ناچار وتی : گەورەم لە دوێنێوە تێرم !
( وەزیر ) فەرمانیدا بە کۆیلەکانی دی و وتی :
پاڵی بخەن و بکەونە لێدانی ... ئەویش کەوتە هاوار هاوار.
هاواری کردو وتـــی : گەورەم لێم مەدەن .. با راستی پەکەیت ، بۆ بگێرمەوە .
وازیان لێ هێنا و پاشا وتی : راست بڵێ .
کۆیلەکە وتی :
لە چێشتخانەیەکدا هەمان ( برنجی رووبە هەنار)مان خوارد گەورەم . هێشتا خواردنی وا بە تام و چێژم نەخوارد بوو..! ئەمەی ئێرە هەر هیچ نی یە لە بەرامبەریدا ..!
ئەنە بە تووڕەییەوە وتی :
کەوابوو دەبێت .. لەو چێشتخانەیە ( برنج بە رووبەهەنار )مان بۆ بێنی .. با گەورەت بیخوات ! تا بەراوردیان بکات .
ئەویش وتی : بە چاوان .
ئەمجا گەرەی پێستەی پیا نارد و رەوانەی کرد .
کە گەیشت بە چێشت لێنەری وت :
بیاوی چاك بە.. گرەومان لەسەر چێشتی برنج بە رووبە هەنارەکەت کردووە . ئەمە نیو دینار و ئەوەش "کەرە". جوان لێی بنێ . چونکە لەسەر ئەم خواردنەت لێدانم خواردووە .
بەدرەدین حەسەن دەستی کردە پێکەنین و وتی :
ئەم خواردنە ..خۆم و دایکم نەبێت ..کەسـی دی نازانێت لێی بنێت ! ئێستا ئەو لە دوورە وڵاتە .
ئەمجا گەرەی پێستەکەی جێی بە مسك و گوڵاو و تەڕی کرد . چێشتەکەی ئامادە کرد.

خزمەتكارەش خێرا ..خواردنەكەی بردەوە بۆ رەشماڵەكان و خستییە بەردەستی دایكی حەسەن .

دایكی بدرالدین كە بۆنی كردو لێی خوارد . لێنەرەكەی ناسی یەوە و هاوارێكی كرد و بوورایەوە . وەزیر رەنگی زەرد بوو . ئاویان پژاند بە دەم و چاویدا .

دوای سەعاتێك بە ئاگا هاتەوە و وتی:

ئەم برنجی بە رووبە هەنارە ، تەنیا بدرالدین ی كوڕم ئەزانێ لێی بنێ ! گومانی تیا نی یە ئەو لێی ناوە ! چونكە هەر خۆم و خۆی دەزانین لێی بنێین و خۆم فێرم كردووە ..!

وەزیر زۆر دڵخۆش بوو و وتی :

ئـای .... كە بە تاسەی بینینی برازاكەمەوەم ! بڵێی پێك شاد بینەوە ؟ لە خوا ئاواكارم.

فەرمانیدا (٢٠ ) كەس بچن . ئەو خاوەن چێشتخانەیە بە چەقتەكەی خۆی قۆڵبەست بكەن و بیهێنن و چێشتخانەكەیشی تێك بدەن . بەڵام ئازاری خۆی مەدەن .

خۆیشی سوار بوو بەرەو ( دیمەشق ) و چـووە لای جێگری والیـــی ( دیمەشق ) و نووسراوەكەی ( سوڵتان)ی دایە ..

ئەویش ماچی كرد و خستی یە سەرسەری وپرسیی : ئەوەی مەبەستتە : كێ یە؟

ئەویش وتی : چێشت لێنەرێكە .

جێگری والی فەرمانیـدا كە بچن ئـەو پیـاوە چێشت لێنـەرە بگـرن و بیهێنن . پیاوانی چەكداری دەوڵەت چوون . بەڵام تـا ئـەوان گەیـشتنە دوكانەكـە .. تێك درابوو ! شتەكانی ئـاوی شـكابوون . پیـاوانی ( شـمس الـدین )ی وەزیـریش ( بدرالـدین حـسن )یـان بردبوو . چاوەڕێی هاتنەوەی وەزیر بوون .

( بدرالدین ) لە دڵی خۆیدا دەیوت :

ئاخۆ ..چی یان لەم ( برنجی رووبە هەنار )ەدا بینی بێت !؟ وا .. ئاوایان بە سەر من هێنا !

وەزیر گەڕایەوە و فەرمانی گرتنەكەی بێ بوو و چووە رەشماڵەكە و وتی : بۆم بێنن .

ئەوانیش ( بدرالدین حسن )یان بە دەستی بەستە بۆ هێنا. ( بدرالدین حسن ) سەیری مامی كرد و دایە پڕمەی گریان و پرسیی :

گەورەم ... تاوانم چی یە !؟

وەزیر وتی : برنجی بە رووبە هەنارت لێناوە !

بدرالدین حسن پرسیی :

بۆچی شتی خراپی تێكرابوو؟ كە بە ئـەو شێوەیە دوكانم بـڕوخێنن و خـۆم قۆڵبەست بكەن ؟

وەزیری مامی وتی : ئەوە كەمترین سزاتە !

ئەویش وتی : ئاوانەکەی خۆمم بێ بڵێ .
وەزیر وتی : هەر ئێستا.
وەزیر هاواری کرد ، وشترەکان بێنن .
شتەکان ئامادە کرا. بدرالدین حسن ، لە سندووقێك نرا . بارو بارخانە پێچرایەوە و کاروان کەوتە ڕێ .
تا ئێوارە بەڕێوە بوون . دواتر لایان داو خواردنیان ئامادە کرد . ئەویشیان لە سندووق دەرهێنا و تێریان کرد و خستی یانەوە سندووقەکە . بۆ ڕۆژی دواتر کەوتنەوە ڕێ و گەیشتنە وڵاتی ( میسر )..
دیسان ( بدرالدین حسن )یان لە سندووقەکە دەرهێنا .
وەزیر لێی پرسی یەوە :
تۆ برنجی بە رووبە هەنارت لێنابوو؟
ئەویش وتی : بەڵێ .. گەورەم .
فەرمانیدا دارتاشێك بێنن .
کە هێنایان ، پێی وت : لە تەختە، یاری یەکی منداڵانەی بۆدروست بکە.
بدرالدین پرسیی : چی لێ دەکەیت ؟
وەزیریش وتی :
لە سێدارەت دەدەم و بە بزمار یاریە تەختەکەت پێدا دادەکوتم و بە شاردا دەتگێڕم.
بدرالدین وتی : ئاخر.... لەبەر چی وام لێ دەکەیت ؟
وەزیر وتی :
برنجی بە رووبە هەنار ، چۆن بە بێ بیبەر لێ دەنرێت ؟ چێشتەکەت خراپ بوو .
ئەویش وتی :
هەر لەبەر ئەوەی لە بیبەری کەم بوو ... ئاوام لێ دەکەیت ؟ گرتنەکەم بەس نەبوو؟ ڕۆژی یەك ژەمیش خواردنم دەدەنێ !
وەزیر وتی :
گەر رووبە هەنار بیبەری کەم بوو، سزاکەی کوشتنە .
( بدرالدین ) زۆری پێ سەیر بوو، بەزەیشی بە خۆیدا دەهاتەوە .
وەزیر لێی پرسی : بیر لە چی دەکەیتەوە ؟
بدرالدین وتی :
بیر لەوانە دەکەمەوە وەکو تۆ کاڵفامن ! تۆ گەر تۆزێکت لە ژیری ببوایە ، ئەم کارەت بە سەر من نەدەهێنا!
وەزیریش وتی :

پێویستە ئەشکەنجەت بدەین ... تاکو ئەو کارە دووبارە نەکەیتەوە .
( بدرالدین حسن )یش وتی :
ئەمەی بە منت کردووە ، هەرە سادەکەی : ئەشکەنجەیە ؟
ئەویش وتی : پێویستە لە ( سێدارە ) بدرێیت !
دارتاشەیش بە دەم کار کردنەوە ، سەیری دەکردن . شەویان بە سەردا هات و خستیانەوە سندووقەکە.
مامی پێی وت : سبەینێ شتەکان روون دەبنەوە .
ئارامی گرت . تاکو زانیی کە خەوی لێ کەوتووە ! ئەسپێکیان بۆ هێنا و سندووقەکەی خستە بەردەمی و بەرەو شار بووە و لەوێشەوە بۆ ماڵی خۆیان .
کچەکەی خۆی بانگ کرد و وتی :
سوپاس بۆ خوا.. بە ئامۆزاکەی خۆت شاد بوویتەوە . هەستە (کۆشك ) وەکو ئەو شەوەی کە تێیدا ئێرەی جێ هێشت ، لێ بکەوەو بیرازێنەوە . کچەش هەستا و بە خۆشی یەوە مۆمەکانی داگیرسان و کاغەزی وەسیەتەکەی هەڵواسی و لەگەڵ باوکیدا شتەکانیانی خستەوە شوێنی جاران . وەزیر فەرمانیدا شاڵەکەی و هەگبەکەی بخەنەوە جێگای جارانی.
بە کچەکەیشی وت :
کە بدرالدین هاتە ژوورەوە ، لێی بپرسە بۆچی لە گەڕانەوەدا زۆرت پێچووا؟ تا بەیانی بیدوێنە دواترمێژووەکەی پیشان دەدەین .
وەزیر .. ( بدرالدین )ی لە سندووقەکە دەرهێنا و دەست و پێی کردەوە . هەر خەبەری نەبووەو قەدەری خوا وابوو، تلێکی دا.. ئیدی بە ئاگا هاتەوە..خۆی لە دالانێکی رووناکدا بینی یەوە !
بە خۆی وت : دیارە، زیندەخەو، دەبینم ..!!
هەندێك رۆیشت ، دەرگای دووەمی بینی و سەیری ناوەوەی کرد . بۆی دەرکەوت ، ئەمە هەر ئەو کۆشکەیە کە کاتی خۆی لێی چووەتە دەرەوە . کورسی و پەردە و کوڵلەکەی بووکەکەی ناسییەوە. شاڵەکەی سەری و شتومەکەکانی خۆی بینی یەوە . کە ئەمانەی بینی رەنگی تێکچوو.
دەچووە پێش و دەهاتەوە دواوەو لە خۆی دەپرسی :
چی بە بەخەبەرم یان نوستووم!؟ ئارەقی نێو چاوانی دەسڕی یەوە و سەری سوورِما بوو!
لە دڵی خۆیدا وتی :
ئەمە شوێنی ( بووك )ەکەیە .. ئێستا من لە کوێم !؟ خۆ لە سندووقدا بووم ..!!
لە کاتێکدا ئەم دەی بزرکاند ، کچی وەزیر وتی :
تازە وەڕوور مەکەوە! تۆ زۆر درەنگ گەڕاویتەوە ..!

که ئەمەی بینی و ئەوانەی بیست وتی :
ئەخێر... زیندەخەو دەبینم ! هەناسەیەکی هەڵکێشا! کەوتە بیرکردنەوە لەوەی بە سەری هاتووە و سەری سوورِما! کە بینیی ئەوە شاڵەکەیەتی و ئەوەش کیسەی (١٠٠٠) دینارەکەیەتی .
بەخۆی وت : خوا دەزانێ رەنگە ئەمە ... زیندەخەو بێت کەوا من دەی بینم .
کچە وەزیر پرسیی : ئەوە سەرت لە چی سوورِماوە ؟! سەر لە ئێوارە وا نەبوویت !
( بدرالدین حسن ) پرسیی : لە کەیەوە لە تۆ دابراوم ؟
ئەویش وتی : خوا ئاگای لێت بێت .. ئەو شەوە بە ئیشێك چوویتە دەرەوە .. چی بە دڵێی شێت بوویت ؟!
بدرالدین وتی :
تۆ راست دەکەیت ! کەواتە من لە خەوەمدا (٢٠) ساڵی رەبەق لە( دیمەشق) چێشتخانەم هەبوو!! هەر وەکو ئەوەی لاوێك هاتبێت بۆ لام ! کە لە منداڵە دەوڵەمەند دەچوو.
بدرالدین دەستی برد بۆ نێوچاوانی شکاوی و شوێنی بەردەکەی هەست پێکرد و وتی :
خاتوون ... دای بە نێو چاوانمداو ئەوە شوێنەکەیەتی و هەر دەڵێی خەو نەبووە !
ئێستاش هەر دڵێی ئەو کاتەیە کە تۆم بە جێ هێشت و چوو بوومە شاری ( دیمەشق ) . بە بێ کڵاو و شاڵەکە و لەوێ بوو بوومە ( چێشت لێنەر) !
رەنگی هەڵبزرکا بوو.
دیسان وتی :
هەر وەکو ئەوەی ( برنجی رووبە هەنار)م لێ نابێت و ( بیبەر )ی کەم بوو بێت ! لەوەش ناچێت ، لە خەودا.. ئەمانەم کرد بێت !
دەستی کردە ، گێرِانەوەی بۆ کچە وەزیر..
دواتر پرسیی :
تووخوا ... لەمانە پتر چی ترت دیوە ؟ ئۆو... خەبەرم نەبوایەتەوە، یاری بە دارنعیەکیان بە سنگمدا بزمار رێژ دەکرد .
ژنەکەی پرسیی : لەبەر چی ؟
ئەویش وتی :
لەبەر ئەوەی .. ( برنجی رووبەهەنار )مکەم ، ( بیبەر )ی کەم بووا دوکان و قاپ و قاچاخەکەمیان بەسەر یەکدا رووخاند و کاولیان کرد . منیشیان خستە سندووقێکەوە و دارتاشیشیان هێنا. لە تەختە سێدارەم بۆ دروست بکات ، تاکو پێیدا هەڵم بواسن ! سوپاس بۆ خوا ، کە ئەوانە لە خەومدا بوون. راستەقینە نەبوون .
ژنەکەی بە پێکەنینەوە وتی :

ئەمانەی وتت : لە خەون ناچن !! لەوە دەچن ڕاست بن !!
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٢٥**

شەهرەزاد وتی :

ئەو شەوە بدرالدین تاکو ڕۆژ بووەوە ، سەراسیمە بوو و دەمێك دەیوت : خەونم بینیوە!
دواتر دەیوت : نە ء .. خەون نەبوو...!!

بۆ سبەینێ مامەی سڵاوی لێکرد .

ئەویش دوای وەڵام دانەوە... لێی پرسی :

تۆ نەبوویت قۆڵبەستت کردم و دوکانەکەت بە سەر شتومەکەکەم دا ڕووخاند !؟ ویستت خۆیشم بزمار ڕێژ بکەیت ! لەبەر ئەوەی (برنج بە ڕووبەهەنار )ەکەم بێ بیبەر بوو!
( وەزیر) وتی :

ئێستا ڕاستی یەکان ئاشکرا بوون . شاراوەکان دەرکەوتن .. تۆ برازای منیت.. ئەمانەم بۆیە کرد تا بزانم بە ڕاستی تۆ کچەکەی منت مارە کردووە ؟ ئێستا بۆم دەرکەوت کە تۆ شاڵ وکڵاو و توورەکە زێڕەکەی خۆتت ناسی یەوە . نامەکەش بە دەست وخەتی خۆتە .

کوڕم نارەواییم بەرامبەرت نەکردووە . چونکە پێشتر تۆم نەبینی بوو. ئەوەش بزانە لە بەسرەوە دایکتم بۆ هێناویت..!! باوەشی پیا کرد و دەستی کردە گریان.. کە ( بدرالدین حسن ) ئەمەی لە مامی بیست زۆر سەری سوورما..!! باوەشی کرد بە مامیداو لە خۆشیدا فرمێسك بە چاوانیدا هاتە خوار .

وەزیر وتی :

هۆی ئەم هەموو ڕووداوانە ، بەهۆی دەمەتەقێ یەکی من و باوکتەوە بوو .

کەوتە گێڕانەوەی و سەفەر کردنی باوکی بەرەو ( بەسرە) . دواتر ( عەجیب )ی بانگ کرد. بدرالدین کە ئەوی بینی وتی :

ئەمە بوو، بەردەکەی دا بە نێوچاوانمدا !

وەزیر وتی : ئەمە کوڕی خۆتە !

بدرالدین حسن باوەشی پێدا کرد و ئەمەی بە سەردا هەڵدا :

بۆ دابڕانمان فرە داماوم
جۆگەی لێ هەڵبەست فرمێسکی چاوم
نەزرمە،هەر کە پێك شاد بووینەوە
لە بیری بکەم خەم و زووخاوم
چونکە خەمی تۆ وا دای بە سەرما
بووە مێزەر و سەر و کڵاوم

دایکی هاتە ژوورەوە و باوەشی پێدا کردو دەستی کردە گریان . چی بەسەر هاتبوو بۆی

گێڕانەوە کە چۆن ئەشکەنجەی کێشاوە. سوپاسی خوایشی کرد، کە هەموویانی بە یەك شاد کردۆتەوە . دوای دوو رۆژ ( شمس الدین )ی وەزیر چووە دەربـاری ( سـوڵتان ) و کڕنووشی بۆ برد و سڵاوی شاهانەی لێکرد .

( سوڵتان ) بە روویدا پێکەنی و بانگی کـردە لای خـۆی و هـەواڵی سـەفەرەکەی لـێ پرسـی .

وەزیریش ، بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

( سوڵتان ) پێی وت :

سوپاس بۆ خوا وا بە ئـاواتی خـۆت گـەیشتیت .. خـێزانەکـەت گـەڕایـەوە لات ! ئـێستایش فرە حەز دەکەم ( حەسەن )ی بەسری برازات ببینم . سبەینێ خـوا یـار بـێت لەگـەڵ خـۆت بۆم بێنە .

وەزیر بەرەو ماڵ بووەوەو برازاکەی بینی پێی وت :

کە ( سوڵتان ) بە تاسەی بینینی یەوەیە .

( حەسەن )ی بەسری وتی : هەمیشە ( سوڵتان ) پێ لە ملی هاوڵاتیانە .

ئەوە بوو.. لەگەڵ مامیدا چوونە لای سوڵتان و جوانترین سڵاوی شاهانەیان لێ کرد .

ئەویش بە پێکەنینەوە وتی :

فەرموو.. دابنیشە . ئەمیش چووە لای مامی خۆیەوە لێی دانیشت .

سوڵتان پرسیی : نـاوت چی یە ؟

ئەمیش وتی :

کۆیلەی دەم بە نزای پایەدار بوونتان : (حەسەنی بەسری) . سوڵتان زۆری پێی سەرسام بوو و ویستی لە ئەدەب و زانستیشدا تاقی بکاتەوە و لێی پرسی :

هیچ دەربارەی کتێبی (تفصیل الحسن) دەزانیت ؟

ئەویش وتی :

بەڵێ .. بەرەبـەیان لـە روودا هەیـە و بریـسکەش لـە پێـست دا ..جوانیش لـە لووتـدا .. شیرینیش لە چاواندا... پاراوییش لە وتاردایە . شۆخیش لە باڵا..! کە ئاوا وەسف کراوە : ئەودەمی خونچەو رەشیی دوو چاوە ئەو رێکی قەد و باڵا ناسراوە

وتیان: ئەو دەم و دوو لێوە تەنکە ئەگریجە و برۆ و ئەو زوڵفە خاوە

قەد و باڵاکەت وا رێك خستووە: مرۆڤ لە ئاستیا..سەری سوڕماوە

( سوڵتان ) بە وەڵامەکەی دڵخۆش بوو و پرسیی :

مەبەست لەم پەندەی وتراوە - شەریح لە رێوی فێڵبازترە - چی بووە ؟!

ئەویش وتی :

( سوڵتان ) پایەدار بێت ... ساڵێکیان : نەخۆشیی ( تاعون ) بڵاو دەبێتەوە . ( شـەریح ) ناوێك لە ترسی ئـەو نـەخۆشی یـە .. سـەری خـۆی هەڵدەگرێ و دواتـر لـە شـاری نەجـەف

دەگیرسێتەوە . دوای ماوەیەك لەوێ ( ڕێوی )یەك پێی فێر دەبێت و هەموو جارێك لە کاتی نوێژ کردنیدا دەچێتە بەرامبەری و لاسایی دەکاتەوە ..! شەریحیش هەموو جارێك بەمە خەیاڵی لای نوێژەکەی نامێنێت..!

ناچار دوو دار دەهێنێت و ڕاست و چەپیان پێ دەکات و کراسێکی خۆی دەکاتە بەر ئەو دوو دارە..! چەفتە و عەگالەکەشی دەخاتە سەر داهۆڵەکە و لە شوێنی نوێژەکەی خۆیی رادەوەستێنێت .

مام ( ڕێوی ) وەك جاران دێتەوە بەرامبەری . ( شەریح )یش لەولاترەوە ... بێخەم نوێژەکەی خۆی دەکات .

ئەم بەسەرهاتە دەماو دەم دەگێڕڕایەوە ... تاکو بووە : پەندی پێشینان .

( سوڵتان ) ڕووی کردە وەزیر و وتی :

برازاکەت زۆر بە ڕەوشتە و بێ عەیبە . لە هەموو وڵاتی میسردا هاوتای نییە!! حەسەنی بەسری هەستا و کڕنووشی بۆ برد . چوو لە تەنیشتی یەوە دانیشت . سوڵتانیش فەرمانیدا خەڵاتێکی باشی بکەن . حەسەنی بەسری هەستایەوە و کڕنووشێکی تری بۆ سوڵتان برد و داوای لێکرد ڕێ بە خۆی و مامی بدات تاکو بڕۆن . ئێوارە گەیشتنەوە ماڵ . سفرە ڕاخراو هەر چی یەك خوا دابووی خورا . ئیدی حەسەن چووە ژووری خێزانەکەی و چی ڕوویدابوو بۆی گێڕایەوە .

ژنەکەی پێی وت :

بێخەم بە سوڵتان دەتکاتە هاونشینی خۆی و دەوڵەمەندت دەکات . چونکە پیاوێکی ڕۆشنبیریت و لە زەوی و دەریادا ناسراویت .

حەسەنیش وتی : دەمەوێت شیعرێك بە سوڵتاندا هەڵدەم .

ژنەکەی وتی :

کارێکی باشە . بیرۆکەکە با پاراو بێت و شیعرەکە ناسك .. دەزانم پەسەندی دەکات .

لە سووچێکی ژوورەکەدا بۆی دانیشت و ئەمەی نووسی :

شکۆمەندێکیت وای بە لووتکەوە ئازایی و وەفات هەردوو پێکەوە

دادوەریت تەواو پەخش و بڵاوە بەسەر زەویدا و ماڵ و موڵکەوە

بە نان بدەیی وەکو خۆریت و جەنگیشت : تارە بە نووتەکەوە

ئەستۆمان بارە بە پیاوەتی تۆ لەشمان بە کاڵا و جل و بەرگەوە

کە لێ بووەوە ، بە یەکێك لە خزمەتکارەکانی مامیدا ناردی بۆ سوڵتان . سوڵتانیش دایە یەکێك و لەنێو کۆڕەکەیدا خوێندرایەوە . هەموو پێیان جوان بوو. سوڵتان ناردی بە شوێن بدرالدین حەسەندا، تا بێتە دانیشتنەکانیەوە .

کە هات سوڵتان پێی وت :

لێرە بەدواوە.. تۆ هەمنشینی منیت و بوویتە : فەرمانبەری دەوڵەت ، بە مووچەی (١٠٠٠) پەنجایی مانگانە . بێ لەو پاداشتانەی پێشوو.

حەسەنی بەسری هەستا و( ٣) جاران ، کڕنووشی بۆ سوڵتان برد و نزای پایەداری بۆ کرد . حەسەن ناوبانگی بڵاو بووەوە و تا ئەوکاتەی مرد بەختیارانە لەگەڵ ژنەکەی و مامی و کەس و کاری ژیانی بردە سەر. مانەویش تەنیا بۆ خوای بانی سەر ..

( هاروونە رەشید)یش بەسەرهاتەکەی هێندە پێ سەیر و گرنگ بوو ... فەرمانیدا : بنووسرێتەوە . کۆیلەکەی ئازاد کرد . فەرمانیشیدا مووچەی مانگانە بۆ کوڕەکەی دابین بکرێت .

خۆ..ئەم بەسەرهاتە سەرسووڕهێن تر نییە لە چیرۆکی :

( *بەرگدروو و قەموور و جوولەکەکە و شایەتە نەسرانی یەکە* ) کە چی یان بەسەر هاتووە ..!

پاشا پرسیی : بەسەرهاتی ئەوان چۆن بووە؟

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

## شەوی ٢٦

### چیرۆکی بەرگدروو و قەموور و جوولەکە و نەسرانیەکە

شەهرەزاد وتی :

ئەی پاشای بەختیار..... خاوەنی بڕیار....

دەگێڕنەوە : لە زەمانی زوودا لە سەردەمی پێشوودا ، لە وڵاتی ( چین ) پیاوێکی پەنجە نەرم و کراوە هەبوو . ئارەزووی لە ئاواز و گۆرانی و یاری کردن بوو... جار وبارە ماڵ و منداڵی دەبردە باخی گشتی ناوشار.

ڕۆژێکیان..کە تاکو ئێوارە لە سەیران بوون . درەنگانێك گەڕانەوە و لە سەرە ڕێگایاندا ( قەموور)ێکی پشت کووڕی یان بینی . کە هەر بە بینینی مرۆڤ پێکەنینی دەهات و خەمی لە دڵ دەڕەویەوە . بەرگدروو و ژنەکەی چوونە لای و داوایان لێکرد ئەمشەو میوانیان بێت .

ئەویش قسەی نەشکاندن و شوێنیان کەوت . ئێوارەیەکی درەنگ بوو. بەرگدروو چووە بازاڕەکە و ماسی یەکی براژاو و نان و لیمۆی کڕی . کە گەیشتنەوە ماڵ ، ژنی بەرگدروو ماسی یەکەی خستە بەردەمیان و دەستیان کرد بە خواردنی .

ژنی بەرگدروو .. بەدەم سوعبەت وتەشقەڵە کردنەوە .. پارووی یەکی بۆ ( قەموور) کرد و بە زۆر کردی بە دەمی یدا و وتی :

دەبێت .. نەی جوویت و یەکسەر قووتی بدەیت . چونکە سوێندم خواردووە .

گۆشتەکە ئێسکی گەورەی تێدا بوو و لە قورگی قەموور گیرا و دەم ودەست بەلادا هات وکەوت .
بەرگدرۆو کە ئەمەی بینی وتی : لاحول ولاقوة الابالله العلي العظيم .
بڕوانە قەدەری خوا ! ئەم داماوە دەبوو لە سەردەستی ئێمەدا بمرێت!
ژنەکەی وتـــی :
جا... ئەم کەمتەرخەمی یەی بۆچی یە؟ ئەی ئەمەت نەبیستووە ؟
خەم و پەژارە گەرنەش دێتە ڕێم نەگبەتم ورد ورد خۆم بۆی دەگەڕێم
لەسەر خۆڵەمێش دادەنیشم و دوای کەمێ بۆ خۆم گڕ بەردەبێ تێم!
مێردەکەی وتی : چی بکەم ؟
ژنەکەی وتی :
هەستە و هەردوو دەستت بخە ژێری و منیش ئەو کۆڵۆانە ئاوریشمەی پێدا دەدەم . هەر بەم شەوە پێشت دەکەوم و تۆ بە دوامدا . کە پرسییان بڵێ : ئەمە کوڕەکەمە و ئەوەیش دایکێتی و دەی بەینە لای پزیشك .
( بەرگدروو) ئەمەی بیست هەستا و دوو دەستی خستە ژێری ( قەموور )ەوەو ژنەکەی بە دوایدا .
ژنەکەی بە دەم ڕێوە دەیوت :
خوا بتپارێزێ کوڕم .... کوێت دێشێت ؟ ئەم ئاوڵەیەیش هەر کۆڵی لێ نەدایت !
هەر کەسی دەیبینی ، وای دەزانی کوڕەکەیان نەخۆشە..! هەر ڕۆیشتن و پرسیاریان کرد . تاکو ماڵی پزیشکێکی ( جوولەکە )یـان پیشان دان . لـە دەرگایـان داو کـەنیزەکێك دەرگای کردەوەو پیاوێکی بینی ..منداڵێکی نەخۆشی پێ یە و ژنەکەشی بە دوایەوە .
کەنیزەکەکە پرسیی : چیتان دەوێت؟
ژنە بەرگدروو وتی :
منداڵێکمان پێ یە . دەمانەوێت پزیشك ببینێ . ئەوەش چارەکە دینارێك بۆ پزیشك و با بێتە خوارەوەو نەخۆشەکەمان ببینێ .
کەنیزەکەکە بە پلیکانەدا سەرکەوت و چوو پزیشك بانگ بکات .
ژنە وتی :
پیاوەکە لاشەی ( قەموور) دابنێ و با رابکەینە دەرەوە و ڕزگارمان بێت ..!!
( قەموور )ەیان بە دیواری ژوورەکەدا هەڵپە ساردو تێیان تەقاند .
( کەنیزەك )ەیش چووە نهۆمی سەرەوەو بە پزیشکی وت :
ژن و مێردێك لە دەرگایان دا.. منداڵێکی لاوازیـان پێ یـە . ئـەم چارەکە دینارەیان بۆ ناردوویت ، تا نەخۆشەکەیان ببینی و دەرمانیان بۆ دیاری بکەیت !

جوولەکەیش پارەکەی وەرگرت و لە خۆشیدا خێرا هەستا و هاتە خوارەوە تا نەخۆشەکە ببینێ .

چونکە تاریك بوو لە ( قەموور ) هەڵکەوت و قەموورەکە بە لادا هات .

ئەمیش کە راستی کردەوە بۆی دەرکەوت مردووە! وتی :

بۆ خاتری عەزیز .. موسا و (١٠) وشەکە !! هاوار بۆ ( هاروون ) و ( یەسوع ) . لەوە دەچێت بە هۆی ئەوەوە لێی هەڵکەوتم مرد بێت !! ئاخر.. من چۆن ئەم کوژراوە لە ماڵەکەم ببەمە دەرەوە !؟

( قەموور )ەی بردە سەرەوە و پیشانی ژنەکەی دا...

ژنەکەی ئەویش وتی :

بۆ دەستەوسان دانیشتووی؟ خۆ ..رۆژمان لێ ببێتەوە هەموومان تیا دەچین..!!

ئێمەش دەچینە سەربان و فرێی دەدەینە .. ماڵی دراوسێ موسڵمانەکەمانەوە !

دراوسێکەیان پیاوێکی ناسراو بوو . چاودێری چێشتخانەی ماڵی ( سوڵتان ) بوو . لەبەر ئەوەی ناوە ناوە ( دووگ ) و ( چەوری )ی دەهێنایەوە بۆ ماڵ . خانووەکەیان ( سەگ ) و (پشیلە )ی زۆر بوو. کە ماڵەکە چۆڵ دەبوو ، لە سەربانەوە ... سەگەلێکی فرە دەچووە حەوشەوە و لەو دووگ و چەوری یەی دەخوارد . پزیشك و ژنەکەی دابەزینە ئەو حەوشەیەوەو چوار پەلی ( قەموور )میان گرتبوو لە بن دیواری حەوشەدا .. پاڵیان پێ پێدایەوە و بە پەلە جێیان هێشت .

هێندەی پێ نەچوو . خاوەن ماڵ گەڕایەوە کە ( شاهد )ی ناو بوو . دوای کەمێك مۆمێکی داگیرساند و سەرکەوت بۆ باڵەخانەکە ... رووانی ئەوە مرۆڤێکە و پاڵی بە دیوارەکەوە داوە..!

ئەویش لە دڵی خۆیدا وتی :

ئـۆو... کەوابوو ئەو شتانەی کەدیار نامێنن .. ئەم مرۆڤە دەیان دزێت..!!

رووی کردە ( قەموور)ە و وتی :

ئەمە ئەو ( گۆشت ) و ( دووگ )انە ، تۆ دەیبەیت ! لە منیشدا وایە ..(سەگ) و( پشیلە) دەیان دزێت ! منیش هەموو سەگ و پشیلەی گەڕەکم کوشتووە !! تاوانیان لە ملی منە و تۆیش ئاوا بێدەنگ دێیتە خوارەوە ..! دەستی دایە کوتەکێك و دای بەسەرسنگی ( قەموور )دا و خستی . کە هەڵی گرتەوە .. قەموورە ئێستا نەمردووەو پار مردووە..!!

زۆر ترساو وتی :

لاحول ولاقوە الا بالله العلی العظیم . نەفرەت لەو رۆن و دووگانە ! پەنا بەخوا .. ئەمە چۆن بە دەستی من کوژرا!؟

کە بینی ( قەموور )یشە وتی :

به قەمووریيەكەیشت كۆڵت نەدا : جەناب ..دزیش دەكەیت و دووگ و گۆشتیش دەدزیت
. پەنا بەخوا..!
قەمووورەی دا بە شانیدا و بردی ... ئەو شەوە گێڕای .. تا...گەیشتە سەرەتای بازاڕی
شار. بە لای دوكانێكدا هەڵی پەسارد و بۆی دەرچوو .
( نەسرانی )یەكی دەلالی (سولتان ) ، بە سەرخۆشی بەوێدا تێپەڕی . دەگەڕا بۆ
پەنایەك میزی لێ بكات . گەیشتە لای ( قەموور ) و دەستی كردە میزكردن و بێ ئەوەی (
قەموور) ببینێ .
دواتر لایەكی كردەوە و كەسێكی بینی پاڵی بە دیوارەكەوە داوە و سەیری ئەم دەكات!
هێندە سەرخۆش بوو ، ئاگای لەوە نەبوو.. زووتر و لە ریگا یاشماخ و عەگالەكەی سەریان لێ
دزی بوو..! بۆیە وای زانی ، ( قەموور ) دەیەوێت یاشماخەكەی سەری بفرێنێت ! بە
سەرخۆشی بۆی چوو و ئەژنۆی خستە سەرسنگی و كەوتە مشتەكۆڵە لێدانی .
پاسەوانی شەو هات و پرسیی : ئەمە بۆ لێی دەدەیت ؟
( نەسرانی )یەكەیش وتی : ئەمە دەیەوێت .. یاشماخەكەی سەرم لێ بفرێنێت .
پاسەوانەكە پێكەنی و وتی : وازی لێ بێنە !
لە( قەموور) چووە پێش و پەنجەی لەسەر بۆریی خوێنبەری قەمووورە دانا تا بزانێت
دڵی لێ دەدات؟
هەر زوو ، بۆی دەركەوت كە مردووە !
حەسحەس توورە بوو و پرسیی :
وای لێهات .. ( نەسرانی )یەك ( موسڵمان )ێك بكوژێت ؟
نەسرانی یەكەی قۆڵبەست كرد و بردی یە لای ( والی ) .
نەسرانی یەكەش لەبەر خۆیەوە وتی :
هاوار ... ئەی مەسیح ! ئەی .. مەریەمی پاكیزە ! خۆیشم نازانم كە چۆن ئەمەم بە
یەك مشتەكۆڵە كوشتووە !!؟
ئەو داماوە ، خەیاڵەكەی رەوی یەوە و هاتەوە هۆش خۆی ! نەسرانی و قەمووری كوژراو
.. تاكو بەیانی لە ماڵی ( والی ) مانەوە .
بۆ سبەینێ ، والی فەرمانیدا :
با ..جارچیی نێو شار بانگ بكات كە (نەسرانی)یەك لە سێدارە دەدرێت .
جارچی ، بانگی لە سێدارەدانی بە خەڵكەكە گەیاند .جەلاد هەڵەفەی پەتی خستە ملی
نەسرانی ! لەوە دابوو ، كورسی ژێر پێی بكێشنەوە .
ئامادەبوویەك دڕی بە خەڵكەكەدا و بەرەو ( سێدارە )كە بووەوەو هاواری كرد :
*مەكەن ! ئەو بێ تاوانە : مەیكوژن..! ئەوە من كووشتوومە ..!*

هێنایانە بەردەم ( والی ) و ئەویش لێی پرسی : بۆ چی کوشتت ؟

ئەویش وتی :

ئێوارە کە گەڕامەوەو بە ماڵدا گەڕام .. سەیرم کرد ، ئەم ( قەموور )ە .. لە هەورەبانەکەمانەوە هاتووەتە ناو ماڵم ، تاکو دزیم لێ بکات . منیش کوتەکێکم دا بەسەر سنگیداو مرد . ئیدی لاشەکەیم دا بە شانمدا وکەوتمە ڕێ . تاکو گەیاندمە بازاڕ و لە فلان شوێن دام نا..

دەستی کردە گریان و هاواری کرد:

*هێندەم بەسە کە ئەم ( موسڵمان )ەم کوشتووە.. باخوێنی ئەم ( نەسرانی )یەش نەیەتە ملم ! ( والی ) فەرمانیدا ملی ( نەسرانی )یەکە .. لە هەڵقەی سێدارەکە دەربێنن و بیکەنە ملی ئەم .*

ئیدی لە ملی ئەمیان کرد و ویستیان بیخنکێنن .

پزیشکە ( جوولەکە )کە دڕی بە خەڵکەکەداو هاواری کرد :

*نەکەن ..کەس نەی کوشتووە : من نەبێت ! ئێوارە لە ماڵی خۆم بووم ژن و مێردێک هاتن و ئەم ( قەموور )ەیان پێ بوو . چارەکە دینارێکیان دابوو بە (کەنیزەك )ەکەم . ئەویش پارەکەی بۆ من هێنا.. تاکو هاتینە خوارەوە ، ئەم ( قەموور )ەیان لە ژوورەکەدا..هەڵپەساردبوو. شەو بوو، ماڵ تاریک بوو . کە هاتمە ژوورەکەوە ... لێی هەڵکەوتم ! ( قەموور )کەوت و مرد ! چار ..ناچار، خۆم و ژنەکەم هەڵمان گرت . ئەم (شاهد)ەش ، دراوسێمانە... کە ماڵەکەیمان بە چۆڵی بینی ، بردمانە هەورەبانەکەیەوە و دامان نا.*

دیارە ، کە ئەمیش ( قەموور )ەی بینیوە : بە دزی تێگەیشتووە! بۆیە کوتەکێکی پیادا ماڵیوە ! قەموورەش کەوتووە . دراوسێکەیشمان پێی وابوو : کە ئەو کوشتوویەتی !

ئاخۆ.. هێندەم پێ کەمە ، کە ئەم ( قەموور )ەم کوشتووە !؟ واخەریکن خوێنی ئەم دراوسێ یەشم دەکەنە مل !!؟

کە ( والی ) ئەم دان پیانانەی بیست . فەرمانیدا : ئەو (شاهد)ە .. بەر بدەن و ئەم پزیشکە ، جوولەکەیە .. لە بری ئەو لە ( سێدارە ) بدەن !

هەر هێندەیان زانی( بەرگدروو )یەك دڕی بە خەڵکەکە داو بەرەو( سێدارە )کە بووەوەو بە(جارچیی) وت :

*مەکەن ..! بێ لە خۆم : کەسی دی ئەو ( قەموور )ەی نەکوشتووە ! ئەو ڕۆژە لەگەڵ خێزانمدا لە سەیران بووین . ئێوارە بە ناو بازارەکەدا گەڕاینەوە . بڕێ شتم کڕی و ئەم ( قەموور )ەمان بینی ، دەفێکی پێ بوو، بە سەرخۆشی گۆرانی دەوت . ئێمەیش : لەگەڵ خۆمان بردمانەوە بۆ ماڵ .*

ماسی یەکی برژاوم کڕی بوو. دانیشتین و دەستمان کرد بەخواردنی. ژنەکەم بابۆڵەیەکی لە گۆشتی ( ماسی )یەکە بۆ ( قەموور )کرد و دەرخواردی داو ئێسکی ماسی یەکە لە قورگی گیرا...دەم و دەست مرد ...!!

چار نا چار .. (قەموور )ەم بە باوەشەوە گرت و ژنەکەم لە پێشمەوە . ڕۆیشتین . تا گەیشتینە بەردەرگای ماڵی ئەم : ( پزیشك )ە جوولەکەیە .. لە دەرگامان داو کەنیزەکەکەی بردینی یە ژوورەوەو چاوەڕێمان نەکرد تاکو ئەم ( پزیشك )ە بێتە خوارەوە . ئەم قەموورەمان هەڵپەسارد بە دیوارەکەیاندا .

کاکی جوولەکە وانەبوو ؟

( جوولەکە )کەش وتی : بەڵێ ... وابوو.

( بەرگدروو) ڕووی کردە ( والی ) و وتی :

کەوابوو.. ئەو ئازاد بکە و من لە ( سێدارە) بدە !

( والی ) کەمێ ڕاما و وتی : پێویستە ئەمە بۆ مێژوو بنووسرێتەوە..!

فەرمانیدا بە ( کوژەر- جەلاد ) و (جارچی ) :

ئا دەی ( جولەکە )کە ، ئازاد بکەن و ( بەرگدوور )ەکە : لە شوێنی ئەو لە ( سێدارە ) بدەن ، بە پشت بەستن بەدان پیانانی خۆی ، جەلاد ئەوی ئازاد کرد و ئەمی خستە شوێن .

( والی ) تووڕە بوو و وتی :

ماندوویان کردین! ئەمە چی یە : ئەم بێنە و ئەو ئازاد بکە ! دواجاریش کەس لە ( سێدارە ) نەدراوە ؟ پەتی سێدارەی کردە ملی بەرگدرووەکە .

ئەمە حاڵی ئەمان بوو . توومەز ئەم ( قەموور )ە مایەی ڕابواردن و پێکەنینی ( سوڵتان ) بوو .. سوڵتان : هێندە بەم قەموورە سەرسام بوو ، بێ ئەو هەڵی نەدەکرد !

ئەو ڕۆژە بەسەرخۆشی ( سوڵتان ) بەجێ دێڵێت و ڕۆژی یەکەم و دووەم و تاکو نیوەڕۆی سێ یەم ..دیار نابێت . کە سوڵتان هەواڵی دەپرسێت ، پێی دەڵێن :

( قەموور) کوژراوە و( والی ) دانیشتوانی شاری بانگ کردووە و جەلاد لە( سێدارە ) دەدات .

هێندەی پێناچێت یەکێکی دی .. دێت و ددانی پیادەنێت : کە ئەو کوشتوویەتی . (والی)ش ئەوەی پێشوو ئازاد دەکات و ئەمی تر دەخاتە شوێنی تا لە سێدارە بدرێت !

سوڵتان تووڕە بوو .. ناردی بە شوێن والی دا . لەگەڵ ئەوانەی ئامادەی سێدارە کراون .. کە پۆلیسی دەرباری سوڵتان گەیشتە شوێنی سێدارەکە ..خەریکی ئەوە بوون فەرمانەکە جێبەجێ بکەن .

پۆلیسەکانی دەربار هاواریان کرد :

نەکەن .. قەموورەیان بە چواردەستە هەڵگرت و بەرگدروو و جوولەکەکە و نەسرانی و

( شاهد )یان دایەپێش خۆیان .. بەرەو لای ( سوڵتان ) . کە( والی )گەیشتە بەردەستی سوڵتان . کڕنووشی بۆ برد و بەسەرهاتی هەموویانی بۆ گێڕایەوە .

سوڵتان زۆری پێ سەیر بوو ! فەرمانیدا کە بە ئاوی ئاڵتوون بنووسرێتەوە !

رووی کردە پیاوانی دەوڵەت و خەڵکەکە و پرسیی :

لە ژیانتاندا : چیرۆکی ئاوا سەیرتان بیستووە !؟

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

شەوی ٢٧

شەهرزاد وتی :

نەسرانی یەکە چووە پێشەوە و وتی :

ئەی پاشای زەمان ..گەر رێم بدەیت بەسەرهاتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە کە زۆر سەر سووڕهێنەرترە لە بەسەرهاتی ئەم ( قەمبوور )ە .. !

پاشا وتی : فەرموو.

ئەویش وتی :

کە هاتمە ئەم وڵاتە ..کاروانێك بار و شتومەکم پێ بوو . قەدەری خوا وابوو . کەوتمە بەردەستتان ئەگەرنا من لە ( میسر) لە دایك بووم و( قیبتی )م ! هەر لەوێیش پەروەردە بووم . باوکم جامباز بوو. کە گەورە بووم .. باوکم مرد و منیش کاری دەلالی و جامبازیەکەی ئەوم گرتە دەست .

رۆژێ لە رۆژان : لاوێکی جوانم بینی ، بە سواری کەرێکەوە رێی دەکرد . کە گەیشتە ئاستم سڵاوی کرد و منیش لە بەری هەستام . دەستە سڕێکی دەرهێنا کە هەندێك نموونەی (کونجی)ی تێدا بوو و لێی پرسیم :

ئا... لەمە ( ربە )ی بە چەند دەکڕیت ؟

منیش وەڵامم دایەوە : (١٠٠) پەنجایی .

ئەویش پێی وتم :

پێوانە کەران لەگەڵ خۆت بێنە و وەرە بۆ دەروازەی ( نەسر). لە خانی ( جەوالی) چاوەڕێت دەکەم .

ئەو دەستە سڕەی کە نموونەکەی تیابوو دایە دەستم و رۆیشت .( ٤ ) کەسی تێکەر و پێوەرم برد و چوومە شوێنەکە . بینیم چاوەڕێمە و هەستاو دەرگای گەنجینەی بۆ کردینەوە .( ٤ ) کەسەکە کەوتنە پێوانەی و رێك (٥٠ ) ربە دەرچوو ، کە بایی (٥٠٠٠ ) درهەم بوو.

لاوەکە وتی :

حەقی دەلالی وماندوو بوونی ئەوەی کە بۆم دەفرۆشیت : هەر ربەی (١٠) درهەم

وەربگرە . واتە (٤٥٠٠ ) درهەم بۆ من دابنێ و ئەوی تری بۆ خۆت و کە هەموویت فرۆشت
. دێم و پارەکەت لێ وەردەگرم .
منیش وتم : بەڵێ ... باشە .
دەستیم ماچ کرد و ڕۆیشتم .
ئەو ڕۆژە (١٥٠٠) درهەمم پەیدا کرد . لاوەکە مانگێك ون بوو .
منیش لە دڵی خۆمدا وتم : ئەم لاوە ، دەست و دڵی باشە .
دوای مانگەکە ، لاوەکە بە سواری هێسترێکەوە هاتەوە .
لێی پرسیم : کوا درهەمەکانم ؟
منیش وەڵامی سڵاویم داوە و پرسیم :
ئەی نابێت .. نانمان لەگەڵ بخۆیت و نمەکمان بکەیت ؟
ئەویش پەسەندی نەبوو... جلوبەرگێکی جوان و نایابی لەبەردا بوو . دەتوت : مانگی چواردەیەو ئەوەی بی بینیایە ، وای دەزانی دەمێك نییە لە گەرماو هاتووەتە دەرەوە! لێوانی ئاڵ .. پێستی پەمەیی کاڵ ، لەسەر گۆنایشی خاڵ..!
نزای خێرم بۆ کرد و پرسیم : درهەمەکانت بۆ بێنم ؟
ئەویش وتی :
جا بۆچی وا بە پەلە؟ کە کارو بارم تەواو بوو دێمەوەو لێت وەردەگرم. لێی داو ڕۆیشت.
منیش لە دڵی خۆمدا وتم :
بەو خوایە ... ئەم جارە هاتەوە دەبێت دەعوەتێکی نایابی بکەم . چونکە قازانجێکی زۆرم لە دەستی کردووە . کۆتایی ساڵ هاتەوە جلوبەرگێکی لەبەردا بوو.. نایاب تر لەجاران. سوێندم لێ خوارد کە دەبێت دەعوەتم بێت .
ئەویش وتی :
بەو مەرجەی چەندی تێچوو من بیدەم و هەر لەو پارەیەی لای تۆیە . ناچار ڕازی بووم. ناردم و خواردنیان هێنایە دوکان بۆمان . فەرمووم لێ کرد و دەستمان کرد بە نان خواردن . ئەویش دەستی چەپی هێنا و دەستی پێ کرد . زۆر سەرم سووڕما! کە لێ بووینەوە و تەشت و ئاوم هێنا دەستی شت و دەستە سڕم دایە .
دواترکەمێك کەوتینە دەمەتەقێ و منیش لێم پرسی :
گەورەم ..خەم ڕەوێن. بۆ بە دەستی چەپ نانەکەت خوارد؟ ڕەنگە دەستەکەی ترت ئازاری هەبێت .
کە ئەمەی بیست وتی :
هاوڕێ مەپرسە ئەمە بۆ وایە ؟ | ژیان هەزاران دەردی تێدایە
کێ بێت حەز بکات بەکەم ئەندامی؟ | دیارە کە ئەمە قەدەری خوایە

دەستی ڕاستی لە مۆڵەکەی دەرهێناو لە ئاستی مەچەکیدا ئەو دەستەی بڕا بوو. پێم سەیر بوو!!

ئەویش وتی :

بەلاتەوە سەیر نەبێت بە دەستەچەپم دەخۆم! چونکە دەستە ڕاستم بڕاوە و هۆیەکی عەجایبی هەیە .

منیش پرسیم : بە هۆی چی یەوە بوو؟

ئەویش وتی :

منیش لە منداڵانی بەغدام و باوکم یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی ئەو شارە . کە بوومە هەرزەکار، لە گەشتکاران و سەفەرکەران و بازرگانانم دەبیست .. وڵاتی میسر چۆنە و ئەوان چی یان بینیوە . ئەمە لە مێشکمدا مایەوە.. تا ئەو کاتەی باوکم مرد . دواتر کاروانێکی بازرگانیم ئامادە کرد، لە کۆتاڵی بەغایی و موصڵی . لە بەغداوە بەڕێ کەوتم تا گەیشتمە ئەم شارەی ئێوە .

ئەمجا دەستی کردە گریان و ئـاوا خۆی لاواندەوە :

| | |
|---|---|
| چاڵێ چاوساغێ گەر بکەوێ تێی | دوای کەمێ بێخەم دەردێتەوە لێی |
| نەزان وشەیە دەڵێ و ڕەت دەبێ | زانایەك بیڵێت زوو دەگوزرێ پێی |
| ڕۆزیی کافران .. زۆر مسۆگەرە | خواناسیش فرە ماندوودەبێ بۆی |

شیعرەکەی تەواو کردو وتی :

گەشتمە وڵاتی میسرو بارە کوتاڵەکانم لە خانی ( مەسرور) خست . چەند درهەمێکیشم دایە خزمەتکارەکەم. تاکو هەندێك خواردنمان لە بازاڕ بۆ بکڕێت . خۆیشم لە خانەکەدا سەرخەوێکم شکاند. ئەو شەوە لەو خانە مامەوە و بەیانی بارێکی کوتاڵم کردەوەو پارچە قوماشێکم جیاکردەوە .

بە خۆم وت :

ئەمە بە بازاڕدا دەگێڕم . تا پیشانی بدەم و خزمەتکاران تۆپە کوتاڵەکان بە دوامدا بێنن . ئەوە بوو شوێن خۆم خستن . تا گەیشتینە ... قەیسەریی ( جەرجیس). لەبەر ئەوەی دەڵاڵەکان بیستبوویان کوتاڵم هێناوە بەرەو ڕووم هاتن و تۆپە کوتاڵەکانیان لێ وەرگرتم . مەزادیان کرد . سەیر دەکەم ، مایەکەی خۆی ناگرێتەوە ! لەبەر ئەوە پەژارە دایگرتم . گەورەی (دەلاڵ )ەکان پێی وتم :

شتێك دەزانم ، سوودی لێ وەردەگریت ! بازرگانەکان چی دەکەن ، تۆیش وا بکە .. خۆت کوتاڵەکانت بفرۆشە و لە چەند مانگێکدا دوایی دێت . شایەت و دەغیلەداری بۆ بگرە . ئەو کاتە هەر درهەمێکی ئێستات دەبێتە دوو درهەم . بۆ خۆیشت (میسر) و ڕووباری ( نیل ) دەبینیت .

منیش وتم : ئەمە ... بیرۆکەیەکی چاکە .
دەلالەکانم بردەوە بۆ خانەکە و بە وەرەقەی مۆرکراو پێم سپاردن . ئەوانیش کوتاڵەکانیان بردەوە بۆ قەیسەریەکە و دواتر کەوتنە فرۆشتنی . منیش لە خانەکەدا مامەوە و هەر خۆم خواردنم بۆ خۆم ئامادە دەکرد . هەموو دووشەموان و پێنج شەموانێک ، دەچووم لەگەڵیان دادەنیشتم و ئەوانیش تاکو پاش نیوەڕۆی ئەو رۆژە پارەکانیان بۆ کۆدەکردمەوە و دەم نووسین و وەرم دەگرت .
بەیانی یەکی دوو شەمە نان و شۆربام خواردو چوومە گەرماو و خۆم شت . بۆ نیوەڕۆ مریشکم بۆ خۆم ئامادە کرد و خواردم . خۆم گۆڕی و بۆنم لە خۆم داو بەرەو قەیسەری یەکە بوومەوە . لە دوکانی بدرالدین ی باخەوان ، لێی دانیشتم . بەخێری هێنام و دەستمان کردە دەمەتەقێ . دوای سەعاتێك بازاڕ قەرەبالغ بوو.
دەروانم ژنێك بەلارو لەنجە پەیدا بوو. هەندێك بۆنی پێ بوو. سلاوی لێ کردین و کەوتە گفتوگۆ ، لەگەڵ بدرالدین .
گوێم لێ بوو لێی پرسی :
قوماشت هەیە ... بە زێڕ چنرابێت ؟
ئەویش پارچەیەك قوماشی لە کوتاڵەکەی من پێ فرۆشت بە (١٢٠٠) درهەم .
ژنـــە وتی : قوماشەکە دەبەم ، دوایی پارەکەیت بۆ دەنێرم ؟
بازرگانەکەش وتی :
خاتوون نابێت چونکە ئـا ئەم پیاوە ، خاوەنەکەیەتی و هەفتانە دەبێت پارە بدەم پێی.
ژنەکە دەستی کردە بۆڵە بۆڵ و وتـــی :
یاخوا بەزیاد نەبێت . من وا راهاتووم . پارچە کووتاڵەکان ببەم . دواتریش بە مشت پارەم بۆ ناردوویت و سوودیشم پێ گەیاندوویت .
دوکاندار وتی :
راست دەکەیت . بەڵام هەر ئەمرۆ پارەکەم دەوێت .
کیژەش قوماشەکەی بە سنگی بازرگانەکەدا و وتی :
ئێوە نرخی کەستان لانی یە . ئەمجاکەوتە لە خۆدان و خۆ ڕنینەوە .
منش دەستیم گرت و نەم هێشت لەخۆی بدات و پێم وت :
وەرە .. کیژی جوان .
کە ئەمەی بیست .. بزەیەك گرتی و وتی :
ئەوەیش لەبەر خاتری تۆ . هاتەوە دوکانەکە و بەرامبەرم دانیشت .
منیش لە بدرالدین م پرسی : ئەم پارچە قوماشە چەند لە سەر خۆت کەوتووە ؟
بازرگانە وتـــی : (١١٠٠) درهەم .

منیش وتم : (١٠٠) درهەم خێرەکەیت دەدەمێ و کاغەزێك بێنە بۆت بنووسم .

پارچە قوماشەکەیشم دایە ژنەکە و پێم وت :

گەر لاریت لێ نییە . با دیاری میوانداریەکەت بێت . ئەگەریش نا.. پارەکە دوایی بنێرە.

ئەویش وتی :

خوا پاداشتی بە خێرت بداتەوە . موڵك و ماڵم بە قوربانت بێت و خوا بتکاتە مێردم .

منیش پێم وت : قوماشەکە ببە ، چی تریشت دەوێت بیبە .

ئەویش وتی :

گەورەم .. ئەمشەو تۆ میوانی منی .

لێیدا و ڕۆیشت . تاکو پاش نیوەڕۆ لە قەیسەریەکەدا مامەوە .

پرسیاری ئەو ژنەم لە بازرگانەکان کردو وتیان :

ئەو کیژە دەوڵەمەند و میرزادە بوو . باوکی مرد و سامانێکی زۆری بۆ بە جێ هێشت . ماڵی لە گەڕەکی ( نەقیب )ە .

منیش دواتر ، سواری کەرێك بووم و بە خاوەنەکەیم وت :

بم گەیەنە گەڕەکی ( نەقیب ) .

ڕۆیشتین هەر زوو گەیشتینە سەر ڕێگایەك پێی دەوترا ڕێی مەنقەری .

بە کەرەوانم وت : برۆ .. پرسیاری گەڕەکی نەقیب بکە .

دوای کەمێك هاتەوە و وتی : دابـــەزە .

منیش کە دابەزیم ، پێم وت :

پێشم بکەوە ، بۆ ماڵەکە ..کە گەیـشتین چـارەکە دینـارێکم دایـە خـاوەن (کـەر) و ئـەو ڕۆیشت . لە دەرگام دا . خزمـەتکارێك دەرگای لێ کردمەوە و بردمـی یـە ژوورەوە . هـۆڵێکی گەورە بوو.(٧) دەرگای لەسەر بوو. دەیڕوانی بە سەر ڕەزوباخێکدا کە چـەندین جـۆر بـەری گرتبوو . جۆگەی ئاوی پێدا دەڕۆیشت. بولبول و کەناری تێیدا دەیخوێنـد . سـپیکاری یـەکی سوڵتانانە کرابـوو. بنمیـچەکەی بـە نەخـشی زێـڕین ڕازابـووەوە . زەوی یەکەشـی بـەردە (مەرمەڕ ) ڕێژ کرابوو . لە ناوەڕاستیدا حەوزوفوارە بوو . بە کـەناری حەوزەکەشدا باڵنـدە و(٤) ماری زێڕین هەبوو . کە ئاو لە دەمیانەوە دەڕژایە حەوزەکەوە . فەرشی تیا ڕاخرابوو . لەسەر فەرشەکە ، دانیشتم .

بازرگانە لاوەکە بە (نەسرانی)یەکەی وت :

هێندەم زانی کیژەکە هات و تاجێکی لەسەر نابوو . بە دوو( گۆ )ی زێڕ ڕازا بووەوە . بۆم پێ کەنی و بەخێری هێنام و لەگەڵم دانیشت . سفرە ڕاخراو خۆشترین خواردن ... هەر لـە مریشکی برژاو، هەنگوینی شانەوە بیگرە تا گۆشتی ڕەش و جگەر دانرابوو.. تێرمان خواردو تاس و مەسینەیان هێناو دەستمان شت . گوڵاو پرژێنیـان کـردین . کەوتینـە دەمەتـەقێ و

ئەمەی بۆ وتم :

گەردە مانزانی بە ئێمە دۆستی مەمانی خۆمان بۆ رادەخستی

لەنێو چاواندا:هەڵمان دەگرتیت تاکو بزانیت: چەند خۆشەویستی!

بۆ ئێوارە دیسان سفرە و خوان رازایەوە. تێر و پڕمان خوارد. ناردی بە شوێن (شایەت)و( قازی )دا و فەرمانیدا.. خۆی لە من مارە بڕی ..!! شایەتەکان مۆری ئەومیان کرد، کە مارەیی یەکەی.. رۆژی (٥٠) دینار بێت . کە ئەم رێ و رەسمەیان تەواو کرد . کرێی خۆیان وەرگرت و رۆیشتن . ئیدی زۆر بە خۆشی لەگەڵیدا ژیام . هەموو رۆژێك دەسرێکم دەدایە کە(٥٠) دیناری تێدا بوو. بەو شێوەیە مامەوە ، تاکو سامانم هەموو لە دەستداو دینارێك چی یە؟ پێم نەما.

بە خۆم وت : ئەمەی من دەیکەم لە خۆبایی بوونە .

ئاوا ... خۆم لاواندەوە :

دیار نەبووم هەواڵپرسم نامێنێ دیاریش بووم: رەزام قورس و بەد دەبێ

لەبازاڕیش بووم مات و بێدەنگم بەشم پەژارە و خەم و دەرد دەبێ

دەستم بە رۆیشتن کرد ، روانیم شار قەرەباڵغە و رێ بەر رێبوار ناکەوێت ! قەدەری خوا وابوو: سەربازێکم بینی و تەنگم پێ هەڵچنی ! دەستم بە گیرفانێکیدا کردو کیسەی پارەکەیم دەرهێنا.. سەربازەکە هەستی کرد گیرفانەکەی سووك بووە . بەلای مندا ئاوری دایەوە . مشتەکۆڵەیەکی لەسەرم دا و کەوتم .

خەڵکەکەش رەشمەی ئەسپی سەربازەکەیان گرت و لێمان کۆبوونەوەو وتیان :

هێندە قەرەباڵغە ... ئەم پیاوە کەوتە ژێر دەست و پێی ئەسپەکەتەوە ..!

سەربازەکە شیڕاندی : ئـەم نەفرەتی یە : دزە... دز !

بەئاگا هاتمەوەو گوێم لە خەڵکەکە بوو دەیان وت :

ئەم لاوە قۆزە هیچی نەدزیوە .

هەندێکی تریان دەیان وت : راست دەکات و دزە .

بووە مقۆ مقۆ !! خەڵکەکە ویستیان من لە دەست سەربازەکە بسەندنەوە . بەڵام قەدەری خوا وابوو بەڕێوەبەری پۆلیس و والی ، پەیدا بوون .

لە کۆمەڵەکەیان پرسی : ئەمە چی یە ؟

سەربازەکە لە وەڵامدا وتی :

بەو خوایە گەورەم .. ئەم پیاوە دزەو لەم قەرەباڵغی یەدا ، کیسە شینەکەم (٢٠)دیناری تێدا بوو، لێی دزیوم .

( والی ) پرسیی : کەست لەگەڵ نەبوو؟

والی خوڕی بە سەر بەڕێوەبەردا و ئەویش منی گرت .

فەرمانیشیدا رووتی بکەنەوە ، کە رووتیان کردەمەوە . کیسە شینەکە لەجلەکانمدا بوو .
بردیان بۆ ( والی ) .
ئەویش کیسەکەی کردەوە و ژماردی و بە منی وت :
راست برۆ ... تۆ ئەم کیسە پارەیەت دزیوە؟
منیش سەرم نەوی کردو بە خۆم وت :
گەر بڵێم ئەم دزیوە . بەدرۆ دەکەومەوە چونکە کیسە شینەکە لە جلەکانی مندا بوو .
بشڵێم من دزیومە ، ئەوە تووش بووم !
سەرم بڵند کرد و وتم : بـــەڵێ .. من دزیومە !
( والی ) عەجایەبی لێ هات ! دوو شایەتی بانگ کرد ، گوێ لەدان پیانانەکەم بگرن .
فەرمانی بە مەشاعلی (جەلاد )دا دەستی راستیان بڕیم . سەربازەکەیش کە لەولامەوە وەستا بوو ، بەزەیی پیاما هاتەوە .
والیش بە دەست بڕراوی جێی هێشتم . خەڵکەکە لێم کۆبوونەوە و شەربەتێکیان کرد بە گەروما.
سەربازەکەش کیسە پارەکەی دامەوە و وتی : تۆ لاوێکی شۆخی ، نابێت دز بیت ..!
ئیدی منیش کەوتمە لاوانەوەی خۆم :
بەخوا دز نەبووم لێم رامەمێنە — هەژاری یە وا رسوایی هێنە
لەپڕ زەمانە شەقی تێی هەڵدام — وا بە داماوی کەوتمە ئەم شوێنە
بێ تاوان بووم و تیری قەدەر بوو — کە ئاوا تاجی قەدر: شکێنە
منیش دەستە بڕاوەکەم پێچاوکردمەوە بە قۆلی جلەکەمدا. رەنگم زەرد هەڵگەڕا بوو. چوومەوە بۆماڵەوە و خۆم فڕێدایە ، سەر جێگەکەم .
ژنەکەم پرسیی : دەبینم گۆڕڕاویت؟ کوێت دێشێت ؟
منیش وتم : نەخۆشم و سەرم دێشێت !
ژنەکەم پەژارە دایگرت و پرسی یەوە :
دڵم تەقی .. گیانەکەم . دانیشە و سەرت بڵند بکە و پێم بڵێ ئەمڕۆ چیت بەسەر هاتووە ؟ من دەم و چاوت دەخوێنمەوە!
منیش وتم : کۆڵم لێ بدە ..
کە گوێی لەم قسەیەم بوو ، دەستی کردە گریان و وتی :
وەکو رۆژانی پێشوو نەماوی .
بەدەم گریانەوە دەی پرسی و منیش وەڵامم نەدەدایەوە . ئێوارە هات و خواردنی دانا.
منیش ئەم خوارد لە ترسی ئەوەی کە ئەگەر بە دەستی چەپ بخۆم ... پێم دەزانێت!
بۆیە وتم : ئێستا.. برسیم نی یە!

ئەویش وتی : چی بووە؟ بۆم بگێڕەوە ، ئەمڕۆ زۆر غەمباریت !

منیش وەڵامم دایەوە : هەر ئێستا بە شێنەیی بۆت دەگێڕمەوە .

جامێ شەرابی بۆ هێنام و وتی : ئەمە خەم ڕەوێنە . بیخۆرەوە و بۆم بگێڕەوە .

وتم : پێویستە قسەت بۆ بکەم .

وتی : بـــەڵێ .

وتم : گەر هەر دەبێت قسە بکەم : بیکە بە دەممەوە . جامەکەم هەڵدا .. دووەم جامم بە دەستە چەپ لێ وەرگرت و چاوانم پڕ بوون لە فرمێسك و ئاوا خۆم لاوانەوە :

بۆ پیاوی ئازا و تەوانا و دانا یەزدان گرفتی ئەگەر بۆ دانا

کەڕ و کوێر دەبێت:کاتی روداو و دواتر وەك جاران ژیر و بە توانا

بە دەم گریانەوە بە دەستی چەپم جامە شەرابەکەم گرت .

ئەویش زریکەیەکی کرد و وتی :

دڵم سووتا ، بۆ دەگریت ؟ بۆ بەدەستی چەپ جامەکە دەگریت !؟

وتم : دەستم برینی لێ هاتووە .

وتی : دەری بێنە ، با بۆت تیمار بکەم .

منیش وتم : کاتی تیمار کردنی نی یەو دەستم دەر ناهێنم .

جامە شـەرابەکەم خـواردەوە . ئیـدی پێکی بـۆ پـڕ دەکردمـەوە ..هێنـدە خـەیاڵ بووم. خەوم لێ کەوتبوو.

قۆڵە براوەکەم و کیسە پارەکەی دەرهێنابوو. تـاکو بـەیانیش نەنووسـت بـوو و خەفەتی خواردبوو. بەیانی (٤) باڵندەی سوور کردەوە و خـواردنی بـۆ دانـام . تێـرم خـوارد ...جامێ شەرابی پێدام .

منیش کیسە پارەکەم دانا و هەستام بچمە دەرەوە .

پرسیی : بۆ کوێ دەچێت ؟

وتم : دەچمە دەرەوە .

وتی : دابنیشە ... مەچۆ دەرەوە.

کە دانیشتم پرسیی :

ئەو خۆشەویستیەت هێندە بە تینە سامانەکەت تەواو بوو.دەستیشت لەپێناویدا بەخشی؟ خوا شایەتی حاڵە .. هەرگیز لێت جیا نابمەوە ! منیش راستیی ئەم پەیمانەیشیم دەبینی. دەستی چەپی گرتم و بەرەو قاسەکەی بە کێشی کردم و کە کردی یەوەو وتی : سەیری ناو ئەم سندووقە بکە . کە سەیرم کرد پڕ بوو لە دەسڕی بەستراو.

رووی تێ کردم و وتی :

ئەمانە پارەی خۆتن و کاتی خۆی لێم وەرگرتووی . هەر رۆژەی کە (٥٠) دینارەکەت دەدامێ

، دەم خستە دەسرێکەوە لەو دەسڕانە و لێرەم دادەنا. ئێستاش ماڤ خۆتە ، پارەکانت بیەرەوە! تۆ بە هۆی منەوە ئاوا دەستت دۆڕاندووە . من رۆحی خۆمت بدەمێ : هێشتا ناتوانم پاداشتت بدەمەوە !

دەسرەکانی لە سندووقەکەی خۆیەوە بۆ سندووقەکەی من گواستەوەو وتی :

ئیدی سامانمان تێکەڵ دەکەین .

دڵی خۆش کردم و زۆر سوپاسیم کرد . بەوەوە نەوەستا و کاغەزی هێنا و هەموو سامانەکەی خۆی پێ بەخشیم . بە شایەتی دوو کەس مۆری کرد و پەیمان نامەکەی دایە دەستم !! منیش بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێرایەوە . دوای مانگێك هەستم کرد نەخۆشە . (٥٠) رۆژێك بۆی کەوت و مرد!! منیش تەعزیەیەکی شایستەم بۆ گرت . (خەتمە) و (مەولود)م بۆ خوێند ... خێر و چاکەم بۆ کرد .

کە سەر خۆم کەوتمەوە : دەڕوانم چەندین خانوو و زەوی و گەنجینەی هەیە . ئەو گەنجینەی کونجی یە .. بە تۆم فرۆشت . یەکێك بوو، لەوانە . ئەوە بوو.. ساڵێکم پێچوو و گەڕامەوە لای تۆ . سەرقاڵی فرۆشتنی سامانەکان بووم .

ئێستاش هەندێك ماوە . پێچەوانە بیر مەکەوە . ئەوا پارەی ( کونجی )یەکەم پێت بەخشی . ئەمە بوو.. هۆی نان خواردنم ، بە دەستی چەپم !

ئەویش وتی : پیاوی باش boویت و چاکەت بەرامبەرم کردووە .

منیش وتم : بۆ لەگەڵم نایەیت بۆ وڵاتی ( میسر) . بازاڕێکی بازرگانی ( میسر) و ئەسکەندەرانیم لەوێ کڕیوە؟

منیش وتم : زۆر باشە دێم .

ژووانی سەری مانگم دایە و ئەوانەی مابوونەوە ، فرۆشتم . شوێنێکی بازرگانی دیم پێ کڕی . خۆم و ئەو لاوە ، گەشتمان کرد بۆ نیشتمانەکەتان . ئەویش شوێنی بازرگانی یەکەی فرۆشت .

*ئەی پاشای زەمان .. ئەمە : عەجایب تر نییە لە بەسەرهاتی ( قەموور)ەکە!؟*

پاشایش وتی : *دەبێت هەمووتان لە سێدارە بدەم .*

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

## شەوی ٢٨

### بەسەرهاتی لاوی پلاوی کونجی خۆر

شەهرزاد وتی :

شایەتەکە بە پاشای ( چین )ی وت :

رێم بدە بەسەرهاتی دوێنێی خۆمت بۆ بگێڕمەوە . کە ئەگەر لە بە سەرهاتی ( قەموور )ەکە عەجایب تر بوو ئەوا دەبێت .... ئازادمان بکەیت .

پاشا وتی : بەڵێ .... باشە .

ئەویش دەستی بە گێڕانەوە کردو وتی :

ئەزانی ... ئەمشەوی رابردوو، لە کۆڕی (خەتمە )یەك دا بووم . مەلا و فەقێ یان بانگ کرابوون . تاکو ( زکر و تەلیلە )مان کرد .. کردمان . کە خوێندنەکە کۆتا بوو ، سفرە راخرا. یەکێك لە خواردنەکان ( پلاَوی کونجی ) بوو . هەر کە دەستمان کرد بە خواردنی ( بریانی یە کونجی )یەکە .

یەکێکمان دەستی درێژ نەکرد بۆ خواردنەکە . لە ئێمە سوێند کە دەبێت بخوات و لە ئەویش سوێند کە : نایخوات و زۆرمان بۆ هێنا.

ئەویش وتی :

پیاوی چاك بن زۆرم لێ مەکەن ! هێندەم بەسە..کە بە هۆی ئەم ( پلاَوی کونجی )یەوە بەسەرم هاتووە !

ئەمجا کەوتە لاواندنەوەی خۆی . لێ بووەوە سوێندمان دا.. کە هۆی نەخواردنی ئەم پلاَوی کونجییەمان بۆ بگێڕێتەوە...

ئەویش وتی :

ئەگەر هەر دەبێت ، لەم خواردنە بخۆم ، دەبێت (٤٠) جار بە سابون و(٤٠) جار بە ( پوونگە ) و (٤٠) جاریش بە گیای ( هاز ) کە دەکاتە ( ١٢٠ ) جار.. دەم و دەستم بشۆم ..!

کە ئەمەیان بە خاوەن ( خەتمە ) وت ، ئەویش فەرمانی بە خزمەتکاراندا : ئەو شتانەیان بۆ ئامادە کردین . لاوەکە بە قێزەونیەوە ، دەستی بۆ (پلاَوی کونجی )یەکە درێژ کرد . دەیخواردو رەنگ و رووی تێکچوو بوو . ئێمەش سەرمان لێی سووڕما بوو !! کابرایش دەستی دەلەرزی ! دەستی دەرهێناو سەری ( پەنجە کەڵە )ی پێوە نەمابوو و بە (٤) پەنجە چێشتەکەی دەیخوارد..!

لێمان پرسی : بۆ خاتری خوا.. ئەمە هەرکە لەدایك بوویت (٤) پەنجەت هەبوو؟ یان چیت بەسەر هاتووە؟

ئەویش وتی :

هەر ئەم دەستەم نی یە ، بەڵکو پەنجە کەڵەی دەستەکەی دی و هەر دوو پێیشمە ..!! دەستەکەی تری پیشان داین و هەردوو قاچی .

ئەمەمان بینی پتر سەرمان سوڕما و پێمان وت:

لەمە زیاتر ناتوانین ئارام بین .. بۆمان بگێڕەوە هۆی نەمانی (٤) پەنجە کەڵەت چی بە و بۆچی (١٢٠) جاردەبێت .. دەستت بشۆیت !؟

ئەویش وتی :

لە سەر دەمی ( هاروونە رەشید )دا . باوکم یەکێك بوو، لە گەورە بازرگانانی بەغدا.

بەڵام خوارده بوو، ئارەزووی زۆری لە( مەی) و( مۆسیقا) و( رابواردن ) بوو. کە مرد هیچی لە دوا بەجێ نەما. منیش بە جوانی کفن و دفنم کرد . خەتمە و خێرم بۆ کرد . کە دوکانەکەیم کردەوە .. شتێکی کەمی تیا مابوو. دەڕوانم.. قەرزاریشە . دڵی خاوەن قەرزانیشم دایەوە .کەوتمە کارکردن و لە هەینی یەوە بۆ هەینی کارم تێیدا دەکرد . دوای ماوەیەك هەموو قەرزەکانم دایەوە و بگرە سەرمایەکەشم زۆر بوو.

ڕۆژێ لە ڕۆژان : لە دوکان دانیشتبووم . کیژێکی جوانم بینی بەسەر هێسترێکەوە ، کۆیلەیەك ڕەشمەکەی بۆ ڕادەکێشاو کۆیلەیەکی تریشی بە دواوە بوو ... لە ژیانما کچی وا جوانم نەدی بوو . زێڕ و ئاڵتونی لە خۆ دابوو.. لە دەمی قەیسەری یەکە : وەستان وکیژە دابەزی و لەگەڵ کۆیلەدا هاتن .

لەبەر ئەوەی دوکانەکانی دی نەکرابوونەوە .. هاتنە دوکانەکەی من و سڵاویان کرد و کیژە دانیشت .

قسەکانی زۆر خۆش بوون و پرسیی :

کوڕی باش .. قوماشی شایستەت هەن؟

منیش وتم : خاتوون بەندەت هەژارترینی دوکاندارەکانە . چاوەڕێ بکە .. با دوکانەکان بکرێنەوەو چیت ویست ، خۆم بۆت دێنم !

ئەویش لە دوکانەکەمدا لێی دانیشت و کەوتینە دەمەتەقێ . تا ئەو کاتەی دوکانەکان کرانەوە و زۆرێك لە دوکانەکانی لەگەڵدا گەڕام . کوتاڵەکانم بۆ جیا کردەوە . ئەویش بێ ئەوەی پارەکەی بدات ..شتەکانی دایە خزمەتکارەکەی و بردی . کوتاڵەکانیش بایی (٥٠٠٠) پەنجایی بوو. تا لە قەیسەری چووە دەر شوێنیان کەوتم . سوار بوو و ڕۆیشت . بێ ئەوەی ناونیشانی خۆیم بداتێ ! منیش پێم شەرم بوو لێی بپرسم ! ئیدی من بوومە بەرپرسی پارەی ئەو شت و مەکانە . هەفتەیەکی پێچوو. ژنەکە دیار نەبوو. بازرگانەکان داوای پارەکەیان لێم کرد. منیش داوام لێ کردن کە هەفتەیەکی دی ، چاوەڕێ بن . بۆ هەینی ، دەڕوانم ، خۆی و دوو کۆیلە و خزمەتکارێك پەیدا بوون .

سڵاوی لێ کردم و وتی :

بەڕێز ئەوە دوایش کەوتم و پارەکەم درەنگ هێنا. با بڕۆین ، تا پارەی شت و مەکەکانت پێ بدەم .

کۆیلە خەساوەکە ..پارەکەی دامێ .

کەوتینە دەمەتەقێ ، تاکو دوکانەکان کرانەوەو وتی :

ئەوە و ئەوەم لەم بازاڕە بۆ بکڕە. چی ویست لە بازرگانەکانم بۆ کڕی . نەیپرسی نرخەکەی کرد و نەهیچ . لێیدا و ڕۆیشت . منیش گەلێ پەشیمان بووم . چونکە بایی (١٠٠٠) دینارم بۆ کڕی بوو.

لە خۆم پرسی :

ئەمە چ خۆشەویستی یەك بوو ؟ (٥٠٠٠) پەنجایی دایەوە .. بەڵام بایی (١٠٠٠)دینار شتی تری بە قەرز بردەوە؟

هەستم کرد کە ئەم پارەیەم بۆ نادرێتەوە بە دوکاندارەکان و لە دڵی خۆمدا وتم : بازرگانەکان من دەناسن ... ئەم ژنەش دەستبڕ دیارە . منی بە جوانی یەکەی خۆی فریودا..! دیارە وتوویەتی ئەمە منداڵە ، با فریوی بدەم .. منیش پرسیاری شوێنی ماڵەکەیم نەکرد .

ئیدی کەوتمە دڵەڕاوکێوە! چونکە ئەمجارە مانگێکی پێچوو . بازرگانەکان .. داوای قەرزەکەیان لێ کردم و زۆریان بۆ هێنام . منیش دوکانەکەم هێنایە سەر فرۆشتن و لەوە بوو ، ئیفلاس و مایەپووچ ببم ، لە دوکانەکە دانیشتبووم و هەر بیرم لەم تووش بوونەم دەکردەوە . هێندەم زانی ، لە دەمی قەیسەری یەکە ژنەکە دابەزی یەوەو بەرەو دوکانەکەم هات !! ئیدی لە خۆشیاندا هەموو شتێکم بیر چووەوە .

هات و دانیشت لام و دەستی کردە قسەی خۆش و ئەمجا پرسیی :

ئەوە دەڵێی .. دەگریت !؟

منیش وتم : نەخێر ..!

لەگەڵیدا رۆیشتم و پارەی بازرگانەکانمان دایەوە . ئەوان بە خێری خۆیان گەیشتن و منیش بە خەمی قەرز...! ماوەیەکی پێچوو... خزمەتکارەکەی هات .

منیش رێزم گرت و پرسیاریم کرد .

وتی : خاتوونەکەم ، نەخۆشە .

منیش وتم : بۆم باس بکە .

ئەویش وتی :

ئەم ژنە ، خاتوو ( زبێدە )ی ژنی (خەلیفە هاروونە رەشید ) پەروەردەی کردووە و لای خۆیان هێشتوویانەتەوە . ئێستایش بووە بە ( سەرۆکی کەنیزەکانی کۆشك ) . زۆر سەر بەدەرەوەیە . ئێستاش بە خاتوو زبێدەی وتووە کە دەیەوێت شوو بکات بە تۆ .

ئەویش وتویەتی :

تاکو لاوەکە نەبینم و نەزانم وەك خۆت شۆخ و شەنگە .. ناهێڵم ! ئێستاش دەبێت بت بەین بۆ لای تاکو پەسەندت بکات و لێت مارە بکات . لەناو کۆشکیشدا ببینرێیت دەکوژرێیت !! بۆیە دەبێت بەدزی یەوە بتبەین . دەڵێیت چی ؟

منیش وتم : لەگەڵت دێم و ئارام دەبم و شان دەدەمە بەر: ئەم مەترسی یەش...!

خزمەتکارەکەیش وتی :

کەوابوو بچۆ ئەو مزگەوتەی کە خاتوو( زبێدە ) دروستی کردووە . نوێژی خەوتنان

بکە و لەوێ بمێنەوە . ئەو مزگەوتەش لەسەر رووباری ( دیجلە ) دروست کراوە .

منیش وتم : بە چاوان .

ئێوارە چوومە شوێنی دیاری کراو و نوێژی خەوتنانم کرد و مامەوە . دوای نیوەشەو بەلەمێك هات و دوو خزمەتکاری تیا بوو. لەگەڵ چەند سندووقێکی خاڵی و کردیان بە مزگەوتەکەدا و جێیان هێشت . یەکێکیان دواکەوت و کە وردتر سەرنجم دا . ئەو خزمەتکارە بوو.. کە لەگەڵ کچەکدا دەهاتە دوکانەکەم . دەستی گرتم و خستمی یە یەکێك لە سندووقەکانەوە و ئەوانی تریشی پڕ کرد لە شتومەك. سندووقەکانیان خستە ناو بەلەمەکەوە و بەرەو ماڵی زبێدە خاتوون بوونەوە .

منیش کە لە نێو سندوقیان نابووم .. بە خەیاڵمدا هات کە تیاچووم !! دەستم کردە گریان و لە خوا پاڕامەوە کە رزگارم بکات . هەر رۆیشتن ، تاکو گەیاندمیانە بەردەم دەرگای کۆشك . لەگەڵ سندووقەکانی تردا بردمیانە ژوورەوە. دوای پرسیار و وەڵامێکی زۆری پاسەوانانی کۆشك . گەیاندمیانە بەردەم گەورەی خزمەتکاران و لە خەویان هەستان .

ئەویش شیڕاندی : ئەم سندووقانە چی یان تێدایە ؟

ئەمانیش وتیان : شتومەکی ( خاتوو زبێدە )ی تیایە .

ئەویش وتی :

زۆرتان پێ نەچێت و یەکە یەکە سەری سندووقەکان هەڵبدەنەوە. تا سەیریان بکەم .

یەکمجار سەری ئەو سندووقەیان هەڵدایەوە کە منی تیا بووم و لە ترساندا خەریك بوو تێك بچم و هەموو گیانم دەلەرزی .

خزمەتکارەکە بە ( سەرۆك خزمەتکاران )ی وت :

پێشەوا، ئەوە منیش و تۆیش تیا چووین . زیانێکت بەم سندووقە گەیاند کە بایی (١٠٠٠٠) دینارە !

فەرموو..ئەوە کۆمەڵە کوتاڵێکی تیایە لەگەڵ (٤) شووشە گوڵاو و سەریان کراوەتەوەو بە کوتاڵەکاندا رژاون ..!! هەر ئێستا رەنگی کوتاڵەکان تێك دەچن .

( سەرۆکە خەساوەکە ) وتی :

برۆ بە نەفرەتت لێ بیت .. ئەوە خۆت و سندووقەکانت ... ملت بشکێنە .

خزمەتکارەکە سندووقەکەی منی بردو ئەوانی دی بە دوایدا .گوێم لە کەسێك بوو هاواری دەکرد ئەی هاوار خەلیفە ... خەلیفە !

ئیتر نازانم چۆن لەسندووقەدا لە ترساندا نەمردم ؟ هێندەم بیر مابوو کە بڵێم : لاحول و لاقوە..

ئەمجا وتم : خۆم بەخۆمم کرد... باوکەرۆ تیاچووم !

گوێم لە دەنگی ( خەلیفە ) بوو پرسیی : ئەم سندووقانە چین ؟

سەرکاری خزمەتکاران وتی :
گەورەم جلوبەرگی ( زبێدە خان )ی تیایە !
خەلیفەیش وتی : سەریان هەڵبدەوە ..
کە ئەمم بیست ، هەر وەختە بوو گیانم دەربچێت و بە خۆمم وت :
ئای زەمانە... بە خوا گەر پێم بزانن ئەوا دوارۆژمە و لە ملم دەدرێت.... ئەگەر رزگاریش بووم . ئەوا.. بێ سێ ودوو کەنیزەکەکەم لێ مارە دەبڕن !
گوێم لە خزمەتکارەکە بوو ، بە ( خەلیفە )ی دەوت :
ئەم سندووقانە ، سپاردەن و بە من دراون . لەگەڵ هەندێ جلوبەرگی ( خاتوو زبێدە ) خۆی .کە نایەوێت کەس بیان بینێت...!
خەلیفە لە وەڵامدا وتی :
دەبێت هەر ئەم سندووقانەم بۆ بکەیتەوە .. تاکو سەیری ناویان بکەم .
شیراندی بە سەر خزمەتکارەکەدا :
دەی سندووقەکان بێنن .
ئیدی گومانم نەما کە تیاچووم و بورامەوە . سندووق دوای سندووق .. دەیان بردە بەردەستی و ئەویش سەیری دەکردن . هەر کوتاڵ و جلوبەرگ و شووشەی بۆن بوو..دەردەهات و دەکرایەوە شوێنی خۆی . تاکو ئەو سندووقە مایەوە کە منی تیابووم ! ئاگام لێبوو ، دەستیان دایە.. بیکەنەوە..
خزمەتکارەکە بە پەلە چووە لای (خەلیفە ) و پێی وت :
ئەوە.. ئەو سندووقە ... تایبەتەیە .. کە نهێنیی ( خاتوو زبێدە ) خۆیی تیایە .
خەلیفە ئەمەی بیست ، فەرمانیدا : با ببرێتە ژوورەوە . خزمەتکارەکان ، سندووقەکەمیان هەلگرت و لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا دایان نام . منیش لە نیویدا قورگم وشك بوو بوو .
خزمەتکارەکە لە سندوقەکە دەری هێنام و وتی :
بێ خەم بە .. ترست نەما ، سنگت فراوان بکە ، دڵی خۆت بدەوە. چاوەڕێ بکە تا.. خاتوو زبێدە دێت . بەڵکو ئەو کەنیزەکەت ، بە نسیب بێت !
نزیکەی سەعاتێك بێدەنگ لێی دانیشتم . کاتێکم زانی(١٠) کەنیزەکی پاکیزە . دەتوت مانگی چواردەمینن هاتن و هەر دووانیان بەرامبەر بە یەك وەستان . واتە دوو ڕیزی (٥)کەنیزەکی بەرامبەر بە یەك . دواتر(٢٠)کەنیزەکی پاکیزەی دی هاتن و ( خاتوو زبێدە ) لە نێوانیاندا بوو. هێندەی( زنجیر) و ( ملەگۆ ) و ( بازنگ ) و ( ملوانکەی زێڕ ) و ( مرواری ) پێوەبوو... کە نەیدەتوانی بە باشی پێیانەوە بەرێدا بڕوات . هاتە لام وکەنیزەکەکان بلاوەیان لێ کرد و منیش چوومە بەردەمی و کڕنووشم بۆ برد.

ئەویش ئاماژەی دامێ و دانیشتم . کەوتە پرسیاری خۆم و تیرە و هۆزەکەم و منیش وەڵامەکانیم دایەوە .
دڵی خۆش بوو وتی :
پەروەردە کردنی (کەنیزەك )ەکەمان بە فیرۆ نەچووە . ئەم کەنیزەکە دەبێتە سپاردەی خوا لای تۆ .
بیپارێزە..! وا تۆیشمان کردە کوڕی خۆمان .
منیش کڕنووشم بۆ بردەوە و ڕازی بووم بە مارەکردنی کەنیزەکەکە . فەرمانی پێم دا کە ( ١٠) ڕۆژ ، لای خۆی بمێنمەوە . ئەو ماوەیە مامەوە ، بێ ئەوەی (کەنیزەك )ەکە ببینم . بەڵام هەندێك لە کەنیزەکانی دەربار دەهاتن بۆ لام . لەو ماوەیەدا (خاتوو زبێدە ) گفتوگۆی دەربارەی بە شوو دانی کەنیزەکەکە لەگەڵ خەلیفەدا کردبوو . ئەویش ڕێی پێدان و (١٠٠٠٠) دیناریشی خەڵات کردبوو. خاتوو زبێدە ناردی بە دووی ( قازی ) و ( شایەت ) . لێیان مارە کردم و شیرینیان بە گەرەکەکاندا گێڕا و خواردنێکی زۆریان دروست کرد .(١٠) ڕۆژیش بەم شێوەیە ماینەوە .
بووکیان بردە گەرماو . دوای ئەوە سینی یەکیان خواردن هێنا . لەگەنێکی پڕ لە( پلاوی کونجی) و شیرینی لە سەر بوو . کە بە گوڵاو و بۆنی مسك لێنرابوو . سنگی مریشکی سوورەوەکراوی تیا بوو.
هێندە بە تام بوو ژیریی مرۆڤی سەراسیمە دەکرد! بەخوا.. منیش بۆی چوومە سەر ئەژنۆ و تا توانیم لێم خوارد . بۆ ئەگبەتی بیری ئەوەم نەبوو ، دەستم بشۆم . لێی دانیشتم و چاوەڕێم کرد . تاکو دنیا تاریك بوو . مۆمێکی زۆر داگیرسێنرا و چەند کەنیزەکێکی گۆرانی بێژ بە خۆیان دەفەکانیانەوە، پەیدا بوون. بووکەی بە زێڕ و زیو ڕازاوەیان بە کۆشکدا گێڕا . دواتر، زێڕ و زیو و هەندێ لەبەرگیان لێ کردەوە . هاتە لام و کەنیزەکەکان بڵاوەیان لێ کرد ..دوای ماوەیەك بۆنی پلاوەکەی کرد و هاواری لێ هەستا ! لە هەموو لایەکەوە ( کەنیزەك ) هات .
منیش گیانم کەوتە لەرزین .. بێ ئەوەی بزانم کێشەکە چی یە؟
کەنیزەکەکان پرسییان : خوشکێ .. ئەوە چیتە ؟
ئەویش وتی : ئەم شێتەم لێ دوور بخەنەوە . خۆ....من وام زانی پیاوێکی ژیرە !
منیش پرسیم : بە چیدا دەزانیت شێتم ؟
ئەویش وتی :
شێتی بەرەڵڵا .... بۆچی ( پلاوی کونجی)ت خواردووە و دەستت نەشتووە؟ بەو خوایە دەبێت تۆڵەی ئەوەت لێ بکەمەوە . هی وەکو تۆ لەگەڵ مندا نابێت بژی !
( قامچی )یەکی وەك پرچ هۆنراوەی هەڵگرت و کەوتە لێدانم . کۆڵی نەدا تا لە هۆش

خۆم چووم .

ئەمجا وتی : بیبەن بۆ لای ( جەلاد )ی شار.. تا ئەودەستەی ( پلاوە کونجی )ەکەی پێ خواردووە و نەی شتووە: بیبڕنەوە .

منیش وتم :

دەستێکم دەبڕنەوە ، لەبەر ئەوەی پلاوم پێ خواردووە و دواتر نەم شتووە !!؟

کەنیزەکەکان وتیان : خوشکێ ئەمجارە لێی مەگرە !

کەمێ هێور ببووەوە و وتی : بەلام خۆ دەبێت نیشانەیەك لەسەر چوار پەلی دابنێم .

رۆیشت و تاکو(١٠) رۆژ نەم بینی یەوە . کە بردمیانە لای پێی وتم :

خەجالەت بیت . من بۆ تۆ نابم .... چۆن دوای ( پلاو ) خواردن ... دەستت ناشۆیت !؟ زریکانی بە سەرمدا . کەنیزەکەکان کۆبوونەوە و قۆلبەستیان کردم و داوای گوێزانێکی کرد . کە هێنایان ... هەر دوو پەنجە کەلەی پێی بڕیمەوە . دواتر دوو پەنجە کەلەکەی دەستەکانم... ئەوەتا بە چاوی خۆتان بی بینن ! ئیتر منیش بوورامەوە . خۆلی والابێژیان ، بە پەنجەکانمەوە کردو خوێن لەبەرچوونەکەیان وەستان .

ئەمجا وتم :

*ئەگەر مام و نەمردم : ئیتر (پلاوی کونجی) ناخۆم ... تاکو( ٤٠ ) جاران بە سابون و (٤٠)جاریش بە گیای (پونگە) و (٤٠ ) جاری دی بە گیای ( هاز) دەستەکانم نەشۆم .*

ئەویش لای خۆیەوە ئەم پەیمانەی لێ وەرگرتم . کە ئەم پلاوەتان خستە بەردەستم ، ئەوە بوو رەنگم تێك چوو. چونکە کۆل بوونەکەمی بیر هێنامەوە .

کە زۆریشتان لێ کردم ، بەخۆمم وت :

*دەبێت پەیمانەکەت .. جێبەجێ بکەیت .*

دانیشتوانیش پرسی یان : دوای ئەوە چی روویدا ؟

منیش وتم : کە سوێندم بۆ خوارد ، دلی چاك بوو و هێور بووەوە .

ماوەیەك لە (کۆشك) ماینەوەو دواتر وتی :

کۆشکی خەلافەت ، بە کەلکی ئێمە نایەت ! کەسی دی ، پێش تۆ تێیدا نەماوەتەوە . تۆیش بە هۆی خاتوو زبێدەوە لێرە ماویت . بگرە ئەوە (٥٠٠٠٠) دینار . بڕۆ خانوویەکی خۆشی پان پۆڕ بکڕە .

منیش چووم و کڕیم . ئەویش چی هەبوو و چی پاشەکەوت کردبوو لە سامان و کونال و شتی بە نرخی نەختینە . هەمووی گواستەوە بۆ خانووە نوێ یەکە .

ئا... ئەوە بوو هۆی کۆل بوونم .

ئیتر نانمان خوارد . قەمووریش ئەوەی بەسەرهات کە بەسەری هات !

پاشایش وتی : ئەمە لە بەسەرهاتی ( قەموور) عەجایب تر نەبوو . بەلام دەبێت هەر لە

سێدارەتان بدەم .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بووە... بێدەنگ بوو.

شەوی ٢٩

## چیرۆکی لاوە موسڵاویەکە

شەهرەزاد گێرایەوە :

( جوولەکە )کە هاتە پێشەوەو کڕنووشی برد و وتی :

ئەی پاشای وەخت ... بەسەرهاتێکت بۆ دەگێڕمەوە ، لە بەسەرهاتی ( قەموور) سەیرتر بێت .

پاشای وڵاتی ( چین ) ڕێی داو ئەویش وتی :

ئەو شتە سەیرەی کە لە گەنجیمدا بەسەرم هات ، لە ( دیمەشق )ی وڵاتی شام بوو . هەر لە ئەوێیش فێری پزیشکی بووم .

ڕۆژێکیان : لێی دانیشت بووم ..کوێلەی یەکێك لە پیاوانی دەرباری دەوڵەت هات و وتی :

خاوەنەکەم دەیەوێت بت بینێت .

منیش لەگەڵیدا چووم و لەبەردەمی هەیوانەکەیاندا چرپایەکم بینی لە داری ( عەرعەر)و نەخشی زێڕینی بە سەرەوە بوو. گەنجێکی نەخۆشی لەسەر ڕاکشابوو. کە شۆخ و قۆزی وام لە ژیانمدا نەدیبوو..!

هیوای چاك بوونەوەم بۆ خواست و وتم :

گەورەم .... دەستێکتم بدەرێ .

دەستی چەپی دایە دەستم و منیش عەجایەبم لێهات و بە خۆم وت :

ئای عەجەب ... ئەمەش بوو بە ئەدەب ؟ بە دەستی یەوە دام .. دەستە چەپ ؟ کەی ئەمە کارێکی جوانە؟ خۆ.. ئەمە خانەدانە !؟

لێدانی دڵیم ژمارە کرد و دەرمانم بۆ نووسی و تاکو(١٠) ڕۆژ سەردانیم کردو چاك بووەوە . چووە گەرماو و خۆی شت و هاتە دەر. خەڵاتێکی باشی کردم و لەلای خۆی لە خەستەخانەی (دیمەشق) دای مەزراندم . بەڵام لە گەرماوەکەدا کە خۆی دەگۆڕی . ویستم یارمەتی بدەم .. دەروانم دەستی چەپی تازە بڕراوە و شوێنی لێدان ، بە پشتیەوەیە و مەرهەمی لێداوە . چەندەم پێ سەیر بوو! هێندەش خەمم بۆ خوارد ! سەرسوورمانەکەم پێوە دیار بوو بۆیە پێی وتم :

ئەی پزیشکی زانا، لێرە چووینە دەر بەسەرهاتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە . دەزانم ئەمەت پێ سەیرە !

هاتینە دەرەوە و دانیشتین و خواردنیان دانا .

دوای ئەوەی تێرمان خوارد ، لاوەکە دەستی پێ کرد :

با بچینە سەر ئەو ( بستوو )ە و تەماشای دەورو بەر بکەین !

فەرمانیشی بە کۆیلەکان کرد کە راخەرمان بۆ ببەنە سەرەوە . وتیشی بەرخێك سەر ببڕن و بۆمان ببرژێنن.

دوایی کە شتەکان ئامادە بوو ، بە دەستی چەپی خواردی .

منیش وتم : بەسەرهاتەکەتم بۆ بگێڕەوە ...

ئەویش وتی : کەوابوو گوێم لێ بگرە :

من مندالّی شاری (موسلّ)م . کە باپیرەم مرد (١٠) کوڕی لە دوا بەجێ مابوو . یەکێکیان باوکم بوو. منیش تاقانەی باوکم بووم ..!

(٩) براکەی تری . واتە (٩) مامەکەم وەجاخ کوێر بوون ..! ئیدی تاقانەی نەك هەر باوکم بووم ..

بەڵکو هەر(٩) مامەکەیشم . کەگەورە بووم و بوومە پیاو . رۆژێکی هەینی ، لەگەڵ باوك و (٩) مامەکەمدا لە نوێژی هەینی بووین . لە مزگەوتێکی (موسڵ). نوێژکەران هەموویان چوونە دەرەوە . باوکم ومامەکانم نەبێت . منیش لایان مامەوە .گفتوگۆیان لە بارەی ولاّتی عەجایب وشارانی سەرسووڕهێنەرەوە بوو. هاتنە سەر باسی ولاّتی ( میسر ) .

مامێکم وتی :

گەڕۆکەکان وتویانە ... لە ولاّتی( میسر) و رووباری( نیل )چاکتر لە سەر زەویدا نیە !

منیش : ئەمەم بیست شەیدای (میسر) بووم .

باوکم وتی :

ئەوەی ( میسر )ی نەدی بێت : دنیای نەدیوە ! چونکە تەنانەت خۆڵەکەیشی زێڕە! نیلی سەیرە! خانووەکانی هەموویان تەلارن . هەوای فێنکە .. بۆنی ( عوود ) و ( بخوورد ) لە ئاستیدا روو زەردە ، ئافەرین بۆ ئەو کەسەی ئەم شیعرەی پیا هەڵداوە :

| | |
|---|---|
| دەست لە نیعمەتی میسر بەر بدەم | جاتووخوا ئیدی دڵ بە کوێ خۆش کەم |
| شوێنێکە هەردەم لە بەهەشت دەچێ | رەز و باخانی جوان و گوڵ بە دەم |
| گشت هاوڕێی چاکە و پیاوەتین بۆیە | کۆڕ و کۆمەڵیان: خەندان و هاودەم |
| بەوەفای پەیمان سەر راست وراستگۆن | پەیمانیان پێدایت : بێخەم بە بێخەم |

گەر زەردەپەڕ.. رەز و باخەکانی دەبینن کە سێبەر دەخەن . سەرتان لێی سووڕدەمێنێت و مەستتان دەکات . ئیدی هەر بە میسر و رووباری نیلیاندا وت . کە ئەمانەم لە بارەی میسرەوە بیست . بوو بە خولیای سەرم . بلاّوەمان لێکرد و هەر یەکە و بەرەو مالّی خۆی بووەوە . هێندە تامەزرۆی ولاّتی میسر ببووم ئەو شەوە ، خەوم لێ نەکەوت . ئیدی

خواردن و خەوم لێ تاڵ بوو. دوای چەند رۆژێکی کەم، مامەکانم باری بازرگانییان رێکخست و بەرەو میسر. منیش هێندە لە باوکم پاڕامەوە کە لەگەڵیان گەشت بکەم .. دڵی نەرم بوو. بارو بارخانەی بازرگانیی بۆ رێك خستم و لەگەڵیان رۆیشتم . ئامۆژگاری براکانیشی کرد کە هەر لە ( دیمەشق ) بارەکانم بفرۆشم و من بگەڕێمەوە و نەگەمە وڵاتی (میسر) . خواحافیزیم لە باوکم کرد و لە موسڵەوە دەرچووین تا گەیشتینە دیمەشق .

شاری درەخت بە هەزاران .. ئاو و جۆگە و رووباران ... میوەی زۆر و باڵداران . ئیدی لە چەند (خان ـ ئوتێل)ێکدا ماینەوە . مامەکانم کەوتنە فرۆشتنی کوتاڵ و شتومەکی بارەکان ، بەوانەی منیشەوە . هەر درهەمێك (٥) درهەمی قازانج کرد . زۆر دڵم بە قازانجەکە خۆش بوو . منیان جێهێشت و بەرەو وڵاتی میسر بوونەوە . منیش لە هۆڵێکی خانەکەدا مامەوە.کە کرێی مانگانەی (٢) دینار بوو . پاڵم لێ دایەوە تاکو پارەکانم خەرج کرد .

رۆژێکیان دانیشتبووم دوو برادەرم کە پێشتر دەمناسین ، هاتنە هۆڵەکەوە و بەخێرم هێنان . دواتر کەوتینە دەمەتەقێ . کاتی نان خواردن ، خواردنم بۆ هێنان و تێرمان خوارد . دەستمان کردە خواردنەوە و یاری کردن . درەنگانێك بەدمەست بوون و بووە دەمەقاڵێ و شەڕیان .

منیش ناوبژیم کردن و ئاشتم کردنەوە و پێم وتن :

کە دەبێت ئەمشەو لای من بمێننەوە . ئەو شەوە مانەوە بەیانی رۆژی دواتر ویستم بە ئاگایان بێنمەوە و لە جێگاکەدا شانی یەکێکیانم جوڵان تا هەڵ بستێ . روانیم سەری خل بووەوە و سەرینەکەی هەر خوێنە..! توومەز یەکێکیان ، هەر دڵی لە ئەوی دی پاك نەبووەتەوە و لە شیرین خەودا سەری بڕیوە..!!

هاوارم کرد : خوایە .... پەنامان بدە!!

دنیا لەبەر چاوم تاریك بوو. گەڕام بۆ ئەوی دی . لە جێگادا نەمابوو.. منیش وتم :

لاحول و لاقوة الا بالله العلي العظیم ..... ئێستا من چی بکەم ؟

هەستام و چەند بەردە ( مەرمەڕ)ێکم هەڵکەند و چاڵێکم لێداو کوژراوەکەم تێ فڕێدا و گڵەکەم بە سەردا کردەوە و بەردە مەرمەڕەکانم وەکو خۆی دانایەوە . دواتر دەستم شت و بەرگی پاك و خاوێنم لەبەر کرد . هەر چی یەکم لە پارە و شتومەك بوو هەڵم گرت و هاتمە دەر و دەرگای ژوورەکەم داخست .

کرێی ساڵێکی ئەو ژوورەم دایە خاوەن خان و وتم : دەچم بۆ لای مامەکانم .

کە گەیشتمە ئەوێ ، هەر چۆنێك بوو، مامەکانم دۆزینەوە .

ئەوانیش کە منیان بینی زۆریان پێ خۆش بوو و پرسییان : چۆن هاتیت بۆ ئێرە ؟

منیش وتم :

ئاسەم کردن و پێیشم نەوتن : چەندم پارە پێ یە . ئیدی لەو پارەیەم خەرج کرد .

تاکو، مامەکانم سەفەریان کرد . لەوانیش هەڵهاتم .. لەوێ بۆم گەڕابوون . کە نەیان دۆزی بوومەوە .. وتبوویان دەچینەوە ، ( دیمەشق ) ... چـاوەڕێی دەکەین و هەر دێتـەوە ، بۆ ( دیمەشق ) .

(٣) ساڵ لە (میسر) مامـەوە . هەموو سـاڵێك کرێی ساڵانەی ژووری خانەکەم دەنارده دیمەشق . تاکو بێ پـارە بـووم . نـەم تـوانی ئیـدی کرێی ژوورەکە بنێـرم . چونکە پارەی ساڵێکم پێمابوو .

گەڕامەوە بۆ( دیمەشق). چوومەوە ئـەو (خـان)ەی کرێی ژوورەکەم دەدا .خاوەن خان پێخۆش حاڵ بوو.

بە گەڕانەوەم . لە کاتێکدا خەریکی نوێنەکانی ژوورەکەم بووم . (موستیلە)یەکی خوێناویم : لە ناو نوێنەکاندا دۆزیەوە و پاکم کردەوە . دەڕوانم ، ئاڵتوونە و نقێمی لە سەرە . دوای دوو رۆژ چوومە گەرماوەکە و خۆم شت . سەیری گیرفانی خۆم کرد .. پارەیەکی ئەوتۆم پێ نەماوەو رۆژی سێ یەم چوومە گوزەری زێڕینگەران و (موستیلە)کەم بردە دوکانێك وپیشانم دا .

ئەویش وتی : با دوکانەکان بکرێنەوە ، دەیگێڕم .

ئیدی لای دانیشتم .

دوای گەڕاندنی هاتەوە و وتی : زێڕینگەرێکیان (٢٠٠٠) دیناری داوە .

منیش وتم : برۆ .... پێی بفرۆشە.....

رۆیشت و دوای کەمێك هاتەوە و وتی :

وامان دەزانی (موستیلە)کەت زێڕی پاکە ..کەچی لە مس دروست کراوبووا! بۆیە دەڵێت هەر (١٠٠٠) درهەمی پێ دەدەم .

منیش وتم :

راست دەکەن . ئەمە کاتی خۆی بۆ ژنێکمان دروست کردووە ، هەر بۆ پێکەنین . دواتر کەوتۆتە لای ژنەکەی خۆم ! ئێستاش دەمانەوێت بیفرۆشین ، بیدەرێ و پارەکەیم بۆ بێنە .

نیتر ، دەڵاڵەکە گومانەکەی سەری گرت و(موستیلە)کەی بردە لای سەرۆکی زێڕەنگەران و تێی گەیاند .

ئەویش موستیلەکەی گەیاندە لای( والی) و تێی گەیاند کە گومانیان لە خاوەنەکەی هەیە . هێندەی نەبرد ، چەکدارانی ( والی) دەورەیان دام و بە قۆڵبەستراوی گەیاندمیانە لای . کە( والی) پرسیاری لێکردم . هەمان قسەی لای دەڵاڵەکەم کردەوە.

ئەویش پێکەنی و وتی : ئەمە ، راست نی یە .

رووتیان کردمەوە و کەوتنە قامچی لێدانم .. زۆریان ئازار دام.. بۆیە وتم : من دزیومە . چونکە لە دڵی خۆمدا وتم :

وا باشە بڵێم دزیومە .. گەر بڵێم ، خاوەنەکەی لای من کوژراوە ... دەمکوژنەوە .

ئیدی بۆیان نووسیم کە دزیومە . دەستی راستیان بڕیم و مەچەکیان کردم بە ڕۆنی قرچاودا. منیش لە ئازاریدا .. لە هۆش خۆم چووم . کە بە ئاگا هاتمەوە ، شەرابیان دەرخوارد دەدام ، بۆ ئەوەی لە ئازارەکەم کەم بکاتەوە . دەست و مەچەکە بڕاوەکەی خۆم هەڵگرت و بەرەو خانەکەم چوومەوە .

خاوەن خان هات و پێی وتم :

لێرە جێگەت نابێتەوە..! تۆ کاری حەرامت کردووە و بگەڕێ بۆ جێگەیەکی دی .

منیش وتم :

(٣ ) ڕۆژ لە سەرم بوەستە تاکو جێگایەك بۆ خۆم دەدۆزمەوە . ئەویش پەسەندی کرد .

لێی دانیشتم و دەستم کردە گریان و بە خۆم وت :

لەمەودوا.. بەم قۆڵە بڕراوەوە ، چۆن بچمەوە ناو کەس و کارم ، لە کاتێکدا کە بێتاوانم ؟!! مەگەر خوا خۆی فریادڕەسم بێت .

دوو ڕۆژ هەر هۆشم بە خۆم نەبوو. سێیەم ڕۆژ بیرم لەوە دەکردەوە چی بکەم ؟ هێندەم زانی خاوەن خان و چەند پۆلیسێك خۆیان کرد بە ژوورەکەمدا . خێرا قۆڵبەستیان کردم و زنجیریان کردم !

پرسیم : ئەمەیان بۆچی ؟

وتیان :

تۆ (موستیلە)ی حاکمی (دیمەشق )ت دزیوە ! چونکە لە پەنجەی کوڕەکەیدا بووە . ئەوە (٣ )ساڵە .. ئەو کوڕە بێ سەر و شوێنە .

منیش خەریك بوو دڵم بوەستێت .

لە دڵی خۆم دا وتم :

مەرج بێت بێ سێ و دوو.. دانی پێدا بنێم کە ڕووداوەکە چۆن بووە .. یان ڕزگار دەبم .. یان دەمکوژن و دەبڕێتەوە .

کە گەیشتینە دەربار لە بەرامبەر ( حاکم ) ڕایان گرتم .

ئەویش بە تیلەی چاو، سەیرێکی کردم و پرسیی :

بۆ دەستی ئەم پیاوە داماوەتان بڕیوە ؟

کە ئەمەم لێ بیست کەمێ ورەم بڵند بووەوە و وتم :

بەو خوایە گەورەم ... دز نیم . ئەو تاوانە گەورەیان دایە پاڵم . لە ناوەڕاستی ئەو بازارەدا، بەر قەمچی یان دام .. زۆریان لێ کردم : دانی پیا بنێم ! منیش لە ترساندا درۆم لەگەڵ خۆم و ئەوان کرد و وتم : من دزیومە .

ئەمجا وتی : گوێ مەدەرێ .

فەرمانی دەرکرد :
گەورە زێرنگەری گوزەرەکە بگرن و بە برێك پارە تۆڵەی ...دەستە براوەکەی بۆ بکاتەوە .
گەر نەیکرد، فەرمانی بۆ دەردەکەم . لە ( سێدارە )ی بدەن و دەست بە سەر سامانەکەشیدا
بگیرێت . زنجیرەکەیان لە ملی منیش کردەوە .
بە منیشی وت :
کوڕەکەم راست و رەوان پێم بڵێ : ئەم (موستیلە)یە چۆن گەیشتە دەستی تۆ؟
ئەم شیعرەیشی وت :

راست برۆ ، دنیا ئەوە ناهێنێ بـا گرەکەیشی خۆت بسوتێنێ

ئەمجا وتم : گەورەم ، راست و دروستت پێ دەڵێم .
ئیدی چۆن بوو... وەکو خۆی بۆم گێڕایەوە . کە ئەمەی بیست ، دەستی بە دەستدا دا...
دەسرۆکەکەی بە دوو دەستی بە دەم و چاویدا دا ..
دەستی کردە گریان و لاوانەوە :

قۆرت و نەگبەتی رووی کردە شۆخێ شاخی گۆیژەش[٢] بێ دەبێ برووخێ
مردن نینۆکی گیرکرد لە کەسێ سەبووریی نادات هیچ بـار و دۆخێ

باوەشی پیا کردم و وتی :
کوڕەکەم ، ئەو لاوە کوڕم بوو.. تۆ بزانە : بەڵایەکەم چەند گەورەیە ؟ هەر چیەکم پێ وتی
: جێبەجێی بکە . کچێکم هەیە.. لێت مارە دەکەم ..پێشەکیم لێت ناوێت . مووچەتان لای
خۆمەوە بۆ دەبڕمەوە .
لە شوێنی کوڕەکەیشم دات دەنێم .
منیش وتم : بەڵێ... باشە ، بەڵام من ئەوە نیم !
ناردی ( قازی ) و شایەت هاتن و کچەکەی خۆی لێ مارە کردم و سامانێکی زۆری لە
سەرۆکی بازاڕەکە بۆ وەرگرتم ! زۆریشی رێز گرتم . هەر ئەو ساڵە باوکیشم مرد.. تازیەی
ئەویشم بەرێکرد و چی موڵك و ماڵی ئەویش بوو : بۆم گەڕایەوە . ئێستا بەختیارم و ژیانم
خۆشە . ئەمە بوو هۆی بڕینی دەستم .
(٣) رۆژ لەوێ مامەوە . پارەیەکی باشیشی پێدام و ئیتر : جێم هێشتن و هاتمە ئێرە . ژیان
و گوزەرانم باشتر بوو . تا ئەو دەمەی ئەم ( قەموور )ە ، پەیدا بوو.
پاشای ( چین) وتی :
ئەم بەسەرهاتە ، هێندەی بەسەرهاتی ئەم ( قەموور )ە سەیر نەبوو.کەوابوو دەبێت لە
سێدارە بدرێن .
ئەی بەرگدروو : هەر تۆ ماویت و تاوانباری یەکەمیشی . گەر بەسەرهاتێکی لەوەی

(٢) – گۆیژە : ناوی کێوێکە کەوتووەتە پارێزگای سولەیمانیەوە .
وەرگێڕی کوردی

(قەموور) سەیرترم بۆ بگێڕیتەوە ... هەمووتان ئازاد دەکەم .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٣٠**

## چیرۆکی سەرتاشێکی زۆربلێ

شەهرەزاد وتی :

ئــەی شاشەهرەیار ... پیاوی وەفــادار ...

بەرگدرووەکە هاتە پێش و وتی :

شای زەمانە .. عەجایب ترین بەسەرهاتێ کە بە سەرم هاتبێ دوێنێ بوو. بەرەبەیانی ئەو رۆژە پێش ئەوەی ئەم ( قەموور )ە ببینم لە جێیەك دەعوەت کرابووم . هەروا (٢٠) کەسێك دەبووین . هەر لە دارتاشەوە ، بیگرە ، تا شووشەچی و بەرگدرووی تیابوو. چێشتەنگاو سفرە و خوان راخرا. هێندەمان زانی خانەخوێ .. لاوێکی نامۆ بە ئێمەی هێنا ، شۆخ و شەنگێکی بە غایی بوو، جلوبەرگێکی جوان و نایابی پۆشی بوو.. بەڵام خۆی شەل بوو. سڵاویان کردو ئێمەش لە بەریان هەستاین . لاوەکە کە خەریك بوو دابنیشێت . سەرتاشێکی لە نێوانماندا بینی . پەشیمان بووەوە و ویستی بڕواتە دەرەوە . خانەخوێ دەستی گرت و هەموومان سوێندمان لێ خوارد ، کە نابێت بڕوات .

خانەخوێ پرسیی : بۆچی هاتیتە ژوور و ئێستا دەتەوێ بچیتە دەرەوە ؟

ئەویش وتی :

بۆ خاتری خوا.. بەڕێز..زۆرم لێ مەکە. لە داخی ئەم سەرتاشە نەگبەتەی کە دانیشتووە دەچمە دەرەوە !

خاوەن دەعوەتەکە ، ئەمەی بیست زۆری پێ سەیر بوو ! پرسیی :

بۆچی بەم لاوە سەرتاشە بەغایی یە ، تێك دەچیت ؟

سەیرێکی یەکتریمان کردو وتمان :

کەوابوو.. هۆی رق بوونەوەت : لەم سەرتاشەمان بۆ بگێڕەوە .

لاوەکە وتی :

خەڵکینە ... لەم بەغدایەی کە شاری خۆمە .. لای ئەم سەرتاشە کێشەیەکم بە سەرهاتووە..کە بووە هۆی شەل بوونم ! بۆیە سوێندم خواردووە هەرگیز نە لەگەڵیدا دابنیشم و نە لەو شارەیشدا بژیم کە ئەم سەرتاشەی لێ یە ! لەبەر ئەوە .. هەر ئەمشەو نانووم و گەشت دەکەم و ئێرە بەجێ دێڵم .

ئێمەش وتمان :

بۆخاتری خوا... بەسەرهاتەکەتمان بۆ بگێڕەوە . سەرتاشەش رەنگی زەرد هەڵگەڕابوو.

لاوەکە دانیشت و وتی :

ئەوا .. باوکم لە گەورە بازرگانانی بەغایە و منیش تاقانەی ئەوم ! گەورە بووم و باوکم خوا بردیەوە ومرد. سامانێکی فرەی بۆ بەجێ هێشتم . بەرگی نایاب و خۆراکی باش وخواردنەوەم دەنۆشی .

بەڵام خوا... ژنانی لەبەرچاو خست بووم !!!

ڕۆژێکیان.. بە کۆڵانێکی بەغادا، دەڕۆیشتم . کۆمەڵە ژنێکم لە سەرە رێدا بینی . منیش چوومە کۆڵانێکی دی ، کە گەیشتمە ئەوسەری کۆڵانەکە سەیر دەکەم دەرناچێت. سەکۆیەکی لێ بوو. لەسەری دانیشتم .

دوای کەمێك گوێم لە گۆرانی یەك بوو. کە هەرگیز دەنگی وا خۆشم نەبیستبوو!! زۆرم حەز لێی بوو و دڵم پێی کرایەوە . نزیکەی سەعاتێك لەوێدا مامەوە ... حەزیشم دەکرد نزیك تر بوومایە ، لە گۆرانی بێژەکەوە . کە گۆرانی یەکە وەستا ... خەریك بوو دڵی منیش بوەستێت !!

ڕوانیم سوارەیەك پەیدا بوو، کۆیلەیەك لە پێشی یەوە و خزمەتکار بە دوایەوە. گەیشتنە بەر ئەو دەرگایەی ، دەنگی گۆرانی یەکەی لێوە دەهات . ( قازی ) دابەزی و خۆی کرد بە ژووردا .

منیش لە پیرەژنێکم پرسی : ئەو گۆرانی بێژە کێ یە؟

ئەویش وتی :

کوڕەکەم ئەوە کچی قازی بەغایە و زۆری حەز لەگۆرانی وتنە. بەڵام باوکی بۆتە بەربەستی و ناهێڵێت کە گۆرانی بڵێت .

ئەوکاتانەی باوکی دەچێت بۆ نوێژی هەینی و ماڵ چۆڵ دەکات . ئەمیش دەست دەکات بە گۆرانی وتن . خۆ.. منیش زۆر جاران خۆم دەکەم بە ماڵیاندا . ئەگەر حەز دەکەیت بیبینی . هەینی داهاتوو پێش نیوەڕۆ وەرە ، ئەم شوێنە ! چەند درهەمێك دەدەمە دەرگاوان و دەچینە ژوورەوە . لە شوێنێکت دادەنێم نەت بینێت و نە تۆیش ئەو ببینی . گوێ لە گۆرانیەکانی بگرە . تاکو دوای نوێژی هەینی .

زۆرم پێ خۆش بوو و هەستام و(١٠٠) دینارم بەخشی بە پیرەژنەکە و ڕۆیشتم . هەینی داهاتوو.. بەرەو ئەو شوێنە بوومەوە . دوای کەمێك چاوەڕوانی . پیرەژنە پەیدا بوو. دوای چاك و چۆنی وتی :

هێشتا زووە . بۆ ناچیت سەرت بتاشیت !؟ دواتر بچۆ بۆ گەرماو و با پووختە بیت. لەوە دەچێت تازە لە نەخۆشی چاك بوو بیتەوە ! شوێنەواری نەخۆشی بە سەر و قژتەوە دیارە .

منیش وتم :

راست دەکەیت . هەر ئێستا دەچم .

ڕۆیشتم و چوومە گەرماوێکی ناو بازاڕ و منداڵێکم ناردە شوێن سەرتاشێکی کەم دوو ، تا.. سەرم نەنێشێنێ و خۆ تێ هەڵقورتێنەریش نەبێت..!

ڕۆیشت و ئەم پیرە ، نالەبارەی بۆ هێنام ..کە لێرە دانیشتووە . سڵاوی کرد و بەخێرهاتنم کرد .

ئەمجا وتـــی : خوا... خەم پەژارە و کێشەت بڕەوێنێتەوە .

منیش وتم : دەی خوایش ئەم نزاکەی تۆ پەسەند بکات .

ئەمجا وتی : مژدە بێت ، تۆ بەرەو چاك بوونەوە دەچیت.. بە کەڵەشاخ خوێنت بگرم ؟ یان هەر سەرت بتاشم؟

لە زاری کوڕی عەباسی یەوە دەگێڕنەوە ـ خوایان لێ ڕازی بێت ـ وتویەتی :

*ئەوەی ڕۆژانی هەینی سەری چاك بکات (٧٠) نەخۆشی دەپەڕێنێت !*

هەر لە زاری ئەوی دەگێڕنەوە :

ئەوەی هەینیان .. ( کەڵە شاخ ) بگرێت (٧٠) نەخۆشی لەکۆڵ دەبێتەوەو لە سەفەری دا بۆ چوونە شاری ( بەسرە) بێوەی دەبێت .

منیش وتم :

بێ بڕەوە ... هەستە سەرم چاك بکە ... چونکە زۆر بێ هێزی نەخۆشیم .

جانتای کردەوەو حەوت پارچەی سەرتاشینی تیابوو.چووە بەر ڕۆشنایی خۆرو تێی ڕاما!

ئەمجا هاتەوەو وتـــی :

*ئەوە بزانە ...ئا .. ئەم ڕۆژە پیرۆزە ، ڕۆژی هەینی یە و (١٠)ی مانگی سەفەری ساڵی (٦٥٣)ی کۆچیی پێغەمبەرە (د.خ). دەکاتە ( ٧٣٢٠ ) بە مێژووەکەی ئەسکەندەر و بە گوێرەی ئەم حسابە ( مەریخ ) لە پلە (٨)دایە و ( ٦) دەقیقە دەمێنێتەوە . وا ڕێکەوتووە کە هاوشانی ئەستێرەی ( عەتارد)ە .*

*ئەمە دەری دەخات . سەر چاك کردن ، چاکەو دیسان پێم دەڵێت : تۆ دەچیت بۆ شوێنێك دڵخۆش دەبیت ، تێیدا . بەڵام دواتر ، دەمەقاڵە دەبێت ! پێت ناڵێم چی ڕوو دەدات .*

منیش وتم :

*مردووت نەمرێ .... بێزارت کردم ، فاڵێکت بۆ گرتمەوە.. دڵ خۆشی کردم . دواتر خۆشی یەکجت ڕەواندەوە! هەستە سەرم چاك بکە و هێندە درێژەی مەدەرێ .*

ئەویش وتی :

گەر بمزانیایە ڕووداوە خراپەکە چی یە .. ئەمڕۆ کارم نەدەکرد . بەڵام ئامۆژگاریەکانم بگرە گوێ ! ئەوەی وتم حیسابی ئەستێرەی تۆیە .

منیش وتم :
ئەمە لە تۆ نەبێت نەم بیستووە! ئاخۆ سەرتاشێك بوو بێت ئەستێرەناس و فالچی پێش
بێت . بەلام دەزانم فێلت زۆرە .. من تۆم بۆ سەرتاشین بانگ کردووە . نەکو بۆ ئەم قسە
قۆڕانە .
ئەویش پرسیی :
حەز دەکەیت .. زیاتر بزانیت !!؟ تۆ .. چیت دەوێت خوا ... سەرتاشێکی ( فالچی ) و
( کیمیاگەر) و زمان و رێزمان زان ... ئەندازە... بیرکاری ، مەلای شەرع و فەرموودە زان ،
شیکەرەوەی قورئانی بۆ رەخساندوویت ! بڕوا بکە لەبەر ئەوەی خۆ تێ هەڵقورتێنەر
نەبووم : باوکیشم زۆری خۆش دەویستم ! ئەوەیش بزانە کە بە (کەم دوو)یی ناسراوم!
هەر بۆیە دەبێت ستایشی خوا بکەیت . پێچەوانەی ئامۆژگاریەکانم نەکەیت . بەزەییم
پێتدا دێتەوە . ڕێم بدە سالێك ڕێنماییت بکەم و پارەشم لێت ناوێت .
کە ئەمەم بیست وتم : ئەمڕۆ ، من دەکوژیت .
سەرتاشەکەیش وتی :
قوربان ... لە نێو هەر (٥) براکەمدا ، بە من دەڵێن ( کەم دوو ) . برا گەورەکەم ناوی
(بەقبوق)ە . دووەمیان ( هەدار) و سێ یەمیان ( فەقیق ) و چوارەمیان (گۆزەی ئەسوانی) .
پێنجەمیان (ئەسار)ە .
منیش لە داخدا خەریك بوو زراوم بتەقێت !بە شاگردی گەرماوەکەم وت :
ئەو چارەکە دینارەی بدەرێ و با بڕوات ... بابەگیان سەر چاکردنم پێویست نی یە !!
سەرتاشەکە کە ئەمەی بیست وتی :
ئەوە دەڵێی چی گەورەم ؟ ئەگەر تۆ رێزی من ناگریت ..من رێزت دەگرم .. شونکە هەر
خۆم دەزانم کوڕی چ پیاوێکیت !
سالێکیان هەر لەم وەرزەدا بوو ، باوکت ناردیە دووم . تا کەڵەشاخی لێ بگرم و خوێنی
دەربێنم .
منیش کە سەیری ئەستێرەی بەختیم کرد پێم وت :
قوربان ئەمڕۆ رۆژێکی خراپە بۆ خوێن لێگرتنت .
کە بە قسەی کردم ئەم شیعرەم پیا هەڵدا :

گەورەم وا هاتم خوێنت لێ بگرم      لەشیشت دەڵێ بەرگەی ناگرم
دانیشتمشتی سەیرم بۆ باس کرد      توانای خۆم وت و بووە گوێگرم
زۆری پێ سەیر بوو، بۆیە پێی وتم      زۆر زیرەکم و لە زانست پـــڕم
وتم ، تۆ نەبیت پێچەوانەیە      کەس گوێ ناگرێ لە عەقڵی وڕم
دیارە بەخشندە ونان بدە خۆتیت      بۆیە:( ژیری )یت کرد بە باڵا بڕم

باوکت دایە قاقای پێکەنین و فەرمانیدا بە خزماتکارەکەی (١٠٣) دینارم بدەنێ .. ئەویش خەڵاتەکەی پێ بەخشیم . ئیدی چاوەڕێم کرد . تاکو سەعاتی بەختیاری باوکت لە ئەستێرەکەیدا دەرکەوت... ئەمجا (کەڵەشاخ )م بۆ کرد و خوێنیم دەرهێنا..!

دواتر خۆم پێ نەگیرا و پرسیم :

قوربان .. بۆچی رێك (١٠٣) دینارت خەڵات کردم !؟

باوکت فەرمووی :

دینار بۆ ئەستێرە گرتنەوەکەت و(١) دینار بۆ دەمەتەقێ خۆشەکەت و(١) دیناریش بۆ کەڵەشاخ گرتنەکەت و(١٠٠) دیناریش بۆ شیعرە پیاهەڵدانەکەت !

منیش ـ کەتەواو بێزار بوو بووم ـ وتم :

رەحمەتی خوا لە باوکیشم نەبێت کە تۆی ناسیوە!!

سەرتاشەکە پێکەنی و وتی :

لا اله الا الله محمد رسول الله . ئەوازش بۆ ئەو کەسەی شتەکان دەگۆڕێت ، بەڵام خۆی ناگۆڕێت !

وام دەزانی ژیریت ، وا دیارە نەخۆشی سەری لێ تێکداوی ! چونکە خوا فەرموویەتی : ئەوانەی کینە دەخۆنەوە و لێبووردەن بەرامبەر خەڵك ... خوا لێیان خۆش دەبێت ! هەر چۆنێك بێت ، تۆ نەخۆشیت و لێت ناگیرێ ! نازانم بۆچی هێندە پەلەیت؟ لە کاتێکدا باوك و باپیرانت ، پرس و رایان بە من دەکرد ! وتراوە : کەس بە پرس و رای دەوروبەری زیانی لێ نەکەوتووە ! یان هەرکەسێ رابەرێکی نەبێت ، خۆیشی گەورە نییە !

شاعیرێك وتوویەتی :

هەر کارێکت کرد پرسی بۆ بکە     بە گوێی خەڵکی کە و گفتوگۆ بکە

لە منت شارەزاتر دەست ناکەوێت . ئەوەتا ، بە پێوە لەبەر دەمتام و پەزێراییت دەکەم و لێت بێزار نابم . چونکە باوکت چاکەی زۆری بە سەرمەوە بوو.

منیش پێم وت :

ئـەی کلکی کەر... زۆرت وت و منیش تەنیا، بۆ سەرتاشین بانگم کرد بوویت .

سەری تەڕ کردم و پێی وتم :

دەزانم لێم بێزار بوویت ، بەڵام لێت ناگرم . چونکە منداڵیت ! ئەودەمەی ساوا بوویت ، دەم خستیە سەر شانم و دەم گەیاندیتە نووسینگەکەی باوکت .

منیش دەم و چاوی خۆم رنی یەوە و وتم :

بۆ خاتری خوا براکەم ، بێدەنگ بە تا سەرم چاك دەکەیت و دەڕۆیت بە رێی خۆتەوە.

کەوتە تیژکردنی چەقۆکەی و منیش خەریك بوو گیانم دەربچێت ، دواتر دەستی گرت بە ... ، هەندێکی لێ تاشی و وتی :

گەورەم .. شەیتان پەلەی کرد ، چاوێکی خۆی کوێر کرد .

بەدەم سەرتاشینەوە ، ئەمەی وت :

شێنەیی باشە: لەوەی دەتەوێت          بۆخەڵکی چاك بویت:خەڵکیش چاك دەبێت

باڵادەست تەنیاخودا:خۆیەتی          زۆرداربە زۆردار : بە خاشاك دەبێت

گەورەم .. نرخی من نازانیت !! ئاخر من سەری شاهان و میران ( وەزیران)م چاك کردووە . شاعیرێك وتوویەتی :

پیشەکان هەموو بازنگی زێڕن          سەرتاش ئەڵماسە وا ئاشکرایە

سەری حیکمەتە و هاوشانی کەمە          سەری شاهانی لەبەردەستایە

منیش وتم :

خۆ هەڵمەقورتێنە کاری خەڵکەوە . من تەنگە چیقەڵانەم ... تۆیش سەرقاڵت کردووم !

ئەویش وتی :

پێدەچێت پەلەت نەبێت !؟

منیش وتم : بەڵێ .... بەڵێ .

سەرتاش وتی :

ئارام بە و پەلە مەکە ... چونکە پەلە کردن ، پەشیمانیشی لە دوایە .

پێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی:

باشترینی کارەکان ئەوانەن کە بە شێنەیی دەکرێن ! من زۆرت لێ دەترسم . حەز دەکەم لە مەبەستم بگەیت . دەترسم کارەکە بە دڵی خۆت نەبێت !! ئەوە (٣) سەعاتی ماوە بۆ نوێژو دەمەوێت لەوە بێگومان بم .. چونکە گەر کارەکە ناپەسەند بوو ... تەگەرە و بەربەستی لەغەیبەوە بۆ دروست دەبێت . خۆ.. ناکرێت وەکو زۆرینەی ( تالع )گرەوەکان لە خۆمەوە شت بڵێم ..گوێزانەکەی خستە سەر جانتاکەی و چووەوە بەر خۆرەکە و ماوەیەکی پێچوو.

ئەمجا وتی :

(٣) سەعاتی ماوە بۆ نوێژ .

منیش وتم : بۆ خاتری خوا .... چی بوو؟ جەرگت بڕیم .

گوێزانەکەی هەڵگرتەوە و هەندێك لە سەری تاشیم و دواتر وتی :

لەم پەلە پەلە کردنەت دەترسم ! وا باشترە کە پێم بڵێیت بۆ کوێ دەچیت؟ خۆ.. باو و باپیرانت ، بێ پرسی من هیچ کارێکیان نەدەکرد .

منیش زانیم تاکو نەزانێت کۆڵ نادات ، بە خۆم وت :

کاتی نوێژ هاتووە ، دەبێت پێش تەواو بوونی نوێژ بڕۆم ، تا گوێ لە گۆرانی بگرم .

ئەمجا وتم :

بەس خۆ هەڵقورتێنە . لای چەند هاوڕێ یەکم دەعوەتم .

هەرکە دەعوەتی بیست ، وتی :

ڕۆژەکەت ڕۆژێکی پیرۆزە حەیاچوو خۆم دوێنی سوێندم لە کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی خۆم خوارد... بیرم چوو ، گوێ بە شتێ بدەم تاکو براکانم بیخۆن ! ئێستا بیرم دەکەوێتەوە..!

منیش بەلاقرتێوە وتم :

گوێ مەدەرێ ماڵی من پڕە لە خواردن وخواردنەوە.هەمووی بۆ خۆت..تەنیا زوو سەرم چاك بکە .

سەرتاش وتی : خوا پاداشتت بداتەوە .. ئادەی بزانم خواردنەکان چین ؟

منیش وتم :

(٥ ) جۆرە خواردنم هەیە... (١٠) مریشکی سوورەوەکراوە .. بەرخێکی برژاو.

ئەویش وتی : دە .. بیان هێنە با بیان بینم .

کە هەموویم پیشان دا پرسیی : ئەی خواردنەوە هەیە ؟

منیش وتم : ئەویشم هەیە .

ئەمجا وتی : دە.. ئەویشم پیشان بدە.

دواتر وتی :

خوا یار و یاوەرت بێت . چەند بەخشندەیت . ئێستا ( بخوورد ) و ( داری عود ) ماوە .

چەکمەجەیەکم کردەوە بایی(٥٠) درهەم دار عوود و بخوورد و مسك و زەعفەرانم خستە بەردەستی .

کات درەنگ بوو بۆیە بە پەستی یەوە وتم :

بیگرە .. توو پێغەمبەر (د.خ) زوو سەرم چاك بکە .

ئەم سەرتاشەیش وتی :

بەخوا.. نایگرم تا هەموویان نەبینم .

هەندێکی دی سەری تاشیم و وتی :

گیا لە سەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە[١] منداڵ جێی باوکی خۆی دەگرێتەوە

دوای شیعرەکە وتی :

بەو خوایە نازانم سوپاسی باوکت بکەم یان خۆت! چونکە خواردنی دەعوەتەکە خێر وچاکەی خۆتە .

منیش توانام نییە تۆڵەت بۆ بکەمەوە. چەند کەسێکی ڕێزدارم لە دەورە ، وەکو ( زنتووت )ی کۆترباز. ( کەچەڵی بێ ناز) ..( وسیلە)ی بێ هۆش .. عەکروشەی (میوە فرۆش).. حەمیدی ( زبڵ )کێش .. ( سەعید)ی وشترکێش ..( سوەید)ی حەماڵ ..( ئەبو مەکارش)ی

[١]- پەندێکی کوردی یە ... لە پەندەکانی پیرەمێردە

ناتر..( قەسیم )ی حەسحەس .. (کەریم )ی سەرکردە ، ئا لەم هەمووەدا ، نە (سەنگین) ..
مەی خۆری بێ هۆش .. نە (خۆ تێ هەڵقورتێن ) و نە ( نەگبەتی بێ گوێش)ی تیا نییە .
هەر یەکەیان سەمایەکی تایبەتی خۆی و شیعری گۆرانی خۆی هەیە . لە هەمووی باشتر
ئەوان ، هەر وەکو خۆم نە ( زۆربڵێن ) و نە(خۆ هەڵقورتێن)ن ! کۆتربازەکەیان لەسەر
ئاوازی تەپڵەکەی گۆرانیەکی سیحراوی دەڵێت و سەما دەکات و دەڵێت دەچم گۆزە ئاو
دێنم .

کەچەڵی بێ نازیش ، زۆر زانایانە دێتە پێش و دەڵێت :

خاتوو نائحە ، درێغیت نەکرد . کە سەر بە قوری پێ دێتە پێکەنین و لەوەیە دڵی
دابکەوێت ! زبڵ کێشیش ، کە گۆرانی دەچرێ و بە هەڵبەستێ.. باڵندە لە ئاسمان دەوەستێ !
دەڵێت .. خێر و بێر ئەوەتا بەلای ژنەکەمەوە . لە سندووقێکی ناوە و بە دەستنە دەری
دێنێ . لەجوانی ئەودایە . وتومە :

به خۆڵرێژتەوە دڵی من بەندە — باڵاشمشادەی: لێو وەکو قەندە
بەختی خۆم یار بوولە یارم پرسی — گەر تاسەت بکەم منت پەسەندە ؟
کە دڵت ئاوا کردمە ئاگردان — وەرە توونچی بە ،لای کوورەی بەندە

هەر یەکەیان بە جۆرێك ، فشقیات و گەمە و پێکەنین دەسازێنن و دڵی هەمووان خۆش
دەکەن . بینینیان لە پیاهەڵدانیان چاکترە. بۆت هەیە کە بانگیان بکەیت و ئەو سەردانی
و دەعوەتەی کراویت : لە بیر خۆت ببەیتەوە . تۆ هێشتا نەخۆش کەوتنەکەت پێوە دیارە.
رەنگە بچیتە کۆمەڵێکەوە، زۆربڵێ و چەنەبازبن وسەرت بئێشێنن . یان خۆ تێهەڵقورتێنی
تیابێت ! تۆیش : بێتاقەتی نەخۆشیەکەتیت .

منیش وتم : رۆژێکی ئاوا... هەر رێك دەخەین ...

لە داخدا پێکەنیم و وتم :

تۆ.... سەری من چاك بکە .. با بڕۆم . تۆیش هاورێکانت : چاوەرێتن !

لەوەڵام دا وتی :

گەورەم ئامانجی من تەنیا ئەوە بوو ئەو پیاوە ماقووڵانە بناسیت کە بۆم وەسف کردیت
و هیچی تر کە نەخۆ تێهەڵقورتێن و نە چەنەبازیان تیایە . لە ژیانمدا هاورێی کەسانێکی
بەو شێوانەم نەکردووە . تەنیا تێکەڵی ئەو کەسانەم کردووە.. کە وەکو خۆم کەم دوون .
بەو خوایە .. ئەگەر یەکجار تێکەڵیان بیت هاورێیەتی کەسانی دی ناکەیت ..!!

منیش وتم :

خوا ، ئەوانت بۆ بهێڵێت . پێویستە لەکاتێکی دیدا بیان بینم .

دیسان وتی :

گەر هەر دەچیت بۆ لای هاورێکانت ئەوا رێم بدە.. ئەم خواردنەیان بۆ ببەم و

بەخشندەیی تۆیان بۆ بگێڕمەوە . کە گەڕامەوە .. لەگەڵت دێم بۆ ئەو دەعوەتە . شەرم لە یەك ناکەین.. بۆیە ئاسانە جێ یان بهێڵم ... زوویش دەگەڕێمەوە .

منیش وتم :

لاحول و لا قوه الا باللە العلی العظیم... دەبرۆ .. کاکە ، با دڵت پێ یان بکرێتەوە..رێی منیش بدە ، با بگەمە هاوڕێکانم . ئاخر .. چاوەڕێم دەکەن .

سەرتاشە زۆربڵێ یەکە وتی :

ناهێڵم .... هەر خۆت برۆیت !

منیش وتم :

ئەو شوێنەی بۆی دەچم .. شوێنێکە رێ بە هەموو کەسێك نادەن .. بچێتە ژوورەوە.

سەرتاش وتی :

بۆ لای هاوڕێکانت نادەچیت . ئەگەر نا منیشت دەبرد . جێی خۆیەتی بمبەیت . من لێت دەترسم . نەبادا تووشی شتێك ببیت . با یارمەتی دەرت بم ..! ئەمە بەغایە.. لەم رۆژانەی دوایدا...ژیان تێیدا ، مەترسیدار بووە .

منیش وتـــم : بەلاّ لێت بدا... ئاخر چی هەڵدەگرێنیت لەم قسانە ؟

سەرتاش وتی :

خەمسارد ..! دەمەوێت ، خزمەتکار و یارمەتی دەرت بم .

هێندە وەرس بووم ، ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بووم .. تاکو من لە سەرتاشین بوومەوە ..کاتی نیوەرۆ هات و وتاری هەینی دەستی پێکرد .

ئەمجا وتم :

دە برۆ خواردنەکە بۆ هاوڕێکانت ببە. چاوەڕێت دەکەم . ویستم فریوی بدەم و لێم دوور بکەوێتەوە.

سەرتاشەکەیش وتی :

تۆ دەم خەڵەتێنی ، هەرکە رۆیشتم ، تۆیش دەڕۆیت و جێم دێڵیت وخۆت تووش دەکەیت .. بەجۆرێك کە دەرباز بوونت نەبێت . سوێند بەخوا..ناهێڵم برۆیت بە بێ من ! دەبێت هەر بزانم چیت بە سەر دێت .

خواردنەکانی کۆکردەوەو چوو حەماڵێکی بۆ هێنا و پێیدا رەوانەی هاوڕێکانی کرد . خۆیشی لەگەڵیدا ، لەکۆڵانەکاندا ون بوو. خۆم پۆشتە کردەوەو بە تەنیا رۆیشتم . تاکو گەیشتمە شوێنەکەی جاری پێشوو. روانیم ، پیرەژنە چاوەڕێی منە . بردمی بە کۆشك و ناو ژوورێك . خانەخوێ خۆی کردەوە بە ماڵدا . چووە هۆڵەکەو دەرگاکەی داخست . کە دەڕوانم کاکی سەرتاش- بەنەفرەت بێت __ لەبەر دەرگای ژوورەکەمدا چاوەڕێم دەکات !

لە خۆم پرسی :

ئەم شەیتانە .. ئێرەی چۆن دۆزیوەتەوە؟ دیاربوو ویستی خوا بوو. رووی من هەڵ بماڵرێت.. چونکە نازانم چ شتێکی خراپم کردبوو؟ خانەخوێ زللەیەکی لێدا و ئەویش قیژاندی .

خزمەتکارێك بە دەنگی یەوە چوو. زللەیەکی لەویش دا . سەرتاشە ، نەگبەتەکەیش پێی وابوو لە من دەدەن .

کەوتە هاوار و پاڕانەوە و یەخەی خۆی دادڕی ! دای بەسەری خۆیدا و هاواری کرد :

*باوکە رۆ.. لە ماڵی ( قازی )دا ئاغاکەی منیان کوشت .*

رای کرد بەرەو دەرگای دەرەوە و بەسەری خۆیدا دەکێشا . بەرەو ماڵەکەم دەی قیژاند : کە گوایە منیان کوشتووە !

ئیتر هەر هەمووکەنیزەك و خزمەتکارانی ماڵی قازی دەیان قیژاند و هاواریان دەکرد : بە داخەوە بۆ ئەو پیاوە .

ئیدی (سەرتاش ) پێشەنگ و ئەوان بە دوایدا... رایان دەکرد . لە رێگایش هەر خەڵك بوو، شوێنیان دەکەوتن ! کە گەیشتنەوە بەر دەرگای کۆشکی ( قازی) دەستیان بۆ ماڵەکە رادەکێشا و سەرتاش دەیوت و ئەوانیش بە دوایدا دەیان قیژان :

کوشتیان ... کوشتیان..!!

خاوەن ماڵ کە ئەم هەرا گەورەیەی بیست ، بە خزمەتکارێکی وت :

برۆ.. بزانە ئەو هەرایە چی یە !؟

خزمەتکار گەڕایەوەو وتی :

گەورەم .. لەبەر ماڵماندا پتر لە (١٠٠٠٠)کەس وەستاون و دەقیژێنن : کوشتیان .. کوشتیان ..!

کە قازی ، ئەم هات و هاوارە گەورەی بیست . کێشەکەی هێندە دی لا گەورە بوو . رەنگی زەرد هەڵگەڕا و چوو، دەرگای لێکردنەوەو پرسیی :

خزمان چی روویداوە ؟

خزمەتکارەکان وتیان :

نەفرەتی ! ئەی سەگی بەراز ! تۆ گەورەکەی ئێمەت کوشت !

قازی پرسیی :

گەورەکەتان بۆچی چی کردبوو! تاکو بیکوژم ؟ ماڵەکەم لەبەر دەستانایە . وەرن بگەڕێن

سەرتاش وتی :

تۆ بە کوتەك گەورەی ئێمەت کوشت !! من بۆ خۆم گوێم لە هاواری بوو.

دیسان ( قازی ) پرسی یەوە :

ئاخر.. ئەو سەرۆکەی ئێوە چ تاوانێکی کردبوو.. تاکو من بیکوژم ؟ ئەمە کێ هێنایە

مالی من ؟ له کوێوه هاتبوو ؟ بۆ کوێ دەچوو ؟
سەرتاش وتی :
مەبە ... بە پیری ئاخر شەڕ! من هەموو بەسەرهاتەکەم لایە! تۆ کە زانیت هاتوومتە ماڵەکەت فەرمانت بە خزمەتکارەکانت داوە لێی بدەن ! لەبەر ئەوە ئێمە و تۆ و بەردەمی خەلیفە! دەبڕۆ گەورەی خۆمانمان بۆ بێنە تاکو بی بینین ! با.. خۆم نەچمە ژوور و دەری بهێنم ! تۆیش تەریق ببیتەوە!
هەرچەند خانە خوێ .. لە ئاست ئەو خەلکەدا زمانی بەسترابوو.
وتی : گەر راست دەکەیت خۆت بچۆ بیهێنە دەرەوە !
شەهرەزاد هەستی کرد ڕەنگ بوو.... بێدەنگ بوو.

شەوی ٣١
شەهرزاد وتی :
سەرتاشەکە چووە ناو ماڵەکە. منیش کە بینیم هاتوومتە ژوور. تەقەلای ڕێگایەکم دا بچمە دەرەوە. بێ سوود بوو. بەڵام سندووقێکی گەورەم بینی ، سەریم هەڵدایەوە و چوومە ناوی و دام پۆشی یەوەو هەناسەم لە خۆم بڕی . ئەویش کە گەیشتە هۆڵەکە ، بێ سێ و دوو دەستی دایە ئەو سندووقەی منی تیابووم . خستمیە سەرسەری . لە ترساندا، بوورامەوە !
کە بەئاگا هاتمەوە و هەستم کرد ئەو کوڵ نادات و دەمبات . سەری سندووقەکەم هەڵدایەوەو خۆم بەردایەوەو قاچێکم شکا .
دەرگایان کردەوە و خەڵکێکی زۆرم بینی . ئاڵتوونێکی زۆرم لابوو. هەڵمدایە ناو خەڵکەکە ، تاکو بە کۆکردنەوەیەوە سەرقاڵ بن و کوڵ لە من بدەن . ئیدی بەراست و چەپی کۆڵانەکانی بەغادا..کەوتمە راکردن .
ئەم سەرتاشە نەفرەتی یەش بە دوامەوە بوو و هاواری دەکرد :
خەریك بوو گەورەکەم بکوژن .. خوا رزگاری کرد ! هەر بە قسەت نەکردم .. تاکو ئەم بەڵایەت بەسەر خۆت هێنا . گەر خوا ، منی نەکردایەتە هاوڕێت ، لەم بەڵایە رزگار نەدەبوویت ! چونکە کێشەیەکیان بۆ دروست دەکردیت کە رزگار بوونت نەدەبوو . بەڵام لێت ناگرم چونکە بزۆز و کاڵفامیت .
منیش پێم وت :
ئاخر .. چیت بەسەرهاتووە . تاکو ئاوا : رادەکەیت بە شوێنمدا !؟ ئا..بەم شێوەیە قسەم لەگەڵ دەکەیت لە بازاڕەکەدا؟ لە داخیدا وەختە بوو..بتەقم ! لە ناوەڕاستی بازاڕدا .خۆم کرد بە دوکانێکدا و رووم کردە دیوارەکەی .
لێی دانیشتم و بە خۆم وت :

ناتوانم کارێك بکەم . دەستم لە دەستی ئەم سەرتاشە بێتەوە . توانای بینینی ئەوم نەماوە !

شایەتم هێنا و ( وەسیەت )م نووسی . ماڵ و دارایی خۆم دابەش کرد بەسەر خزم و کەس و کارداو وەکیلم بۆ جێ بەجێ کردنی گرت . هەر بۆ ئەوەی لەو سەرتاشە( گەواد )ە ، رزگار ببم . سەفەرم کرد . ئەوە بوو هاتمە ئەم شارەی ئێوە ! ماوەیەکی زۆرە لێرەم و دەعوەتتان کردم . کەچی بۆ نەگبەتیی من ئەوەتا.. ئەم سەرتاشە گەوادە لێرەیە ! لای ئێوەیە ..! ئاخر چۆن دڵم پێتان بکرێتەوە !؟ کە ئەو کارەساتەی بەسەر هێنام و قاچیشم تیادا شکا!! دواتر لاوەکە ، دانەنیشت .

لە سەرتاشەکەمان پرسی : ئەم لاوە .. راست دەکات ؟

ئەویش وتی :

بەڵێ .. بە هەموو عەقڵی خۆم : پیاوەتیم کردووە . ئێستایش دەڵێم کە من نەبوومایە تیادەچوو . من رزگارم کرد.. من !! سوپاس بۆ خوا کە قاچی شکا و خۆی نەکوژرا ! گەر زۆربڵێ بوومایە ئەو چاکەیەم لەگەڵ نەدەکرد . هەر ئێستاش ، بەسەرهاتێکی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە . تاکو.. بڕوا بکەن کە من کەسێکی ( فرەوێژ ) و ( خۆ تێ هەڵقورتێن ) نیم...!

لە سەردەمی حوکمڕانی ( موستەنسیر بالله )دا . ئاخر ئەو هەژارانی خۆش دەویست و هاونشینی زانایان بوو . وارێکەوت رۆژێکیـــان ، رقی لە (١٠) کەس هەستا . فەرمانیدا بە ( متەوەلی ) رۆژی جەژن بیان هێنێت . ئەو(١٠) کەسە هەموویان دز و جەردە و رێگر بوون متوەلی رۆیشتە ناو شار و هەر دەیانی گرت و خستنی یە ناو بەلەمێکەوە .

کە سەیرم کردن .. لەدڵی خۆمدا وتم :

بەخوا... هەبێ و نەبێ ئەمانە بانگهێشتی دەعوەت کراون ... تا .. ئێوارە دەخۆن و دەخۆنەوە .

وا چاکە... لەگەڵیان بڕۆم و ببمە هاوڕێیان . بە هەموو عەقڵێکمەوە چوومە بەلەمەکەیانەوە و تێکەڵیان بووم .

بەڵام کەوتە سەرناو بەرەو ئەوبەر.هەر کە گەیشتین پۆلیس قۆڵبەستیان کردین و زنجیریان خستە ملمان .

منیش لە کەسیەتی بە توانا و ژیریمەوە ، متەقم لە خۆم بڕی و قسەم نەکرد . بە زنجیرکراوی بردینیانە لای خەلیفە ( مستنەسر بالله) . ئەویش فەرمانیدا... لە ملی هەر (١٠)کەسەکەمان بدەن .

( جەلاد ) هات و یەك لە دوای یەك هەر(١٠)کەسەکەی مل پەڕاند .

میری موسڵمانان سەیرێکی منی کرد و لە ( جەلاد )ی شمشێر بە دەستی پرسی : ئەوە بۆ ملی (٩) کەست پەڕاندووە !؟

دیسان وتی :
پێم وایە (٩) کەست کوشتوە و ئەوەش (دە)یەمینە .
جەلاد وتی :
بەو خوایە (١٠) کەسم کوشتووە . فەرمانیدا..کوژراوەکان بژمێرن .
دوای ژماردن وتیان (١٠) کوژراوە .
ئەمجاخەلیفە رووی تێکردم و پرسیی :
ئەوە بۆچی زمانت چووەتە کلیلە!؟ هەی بە تەمەن گەورەی بە عەقڵ بچووك .
منیش وتم :
میری موسڵمانان ، بزانە کە پیرێکی (کەم دوو)م ، بەڵام خاوەن حیکمەت و زانیاری زۆرم و سەرتاشیشم .
خەلیفە هێندە پێکەنی بە پشت دا کەوت !
ئەمجا خەلیفە پێی وتم :
ئەی کەم دوو ئاخۆ هەر(٥) براکەیشت ، وەکو تۆ زانا و دانا و خاوەن پیشە و کەم دوون؟
منیش وتم :
خوا من لە ناو بەرێت ، گەر وەکو من بن ! بەڵام ئەی ( میری موسڵمانان) تۆ بەم پرسیارەت منت سووك کرد . چونکە لەبەر بێ ویژدانی و زۆربڵێی ، هەر یەکە و بە جۆرێك کەم ئەندام بوون . یەکێکیان شەلە! یەکێکیان کوێرە ، ئەویتر لووت و گوێی بڕڕاوە ! یەکێکی تریان هەر دوو لچیان بڕیوە !! ئەوی دی قەمبوورە . وام تێ مەگە ئەی ( میری موسڵمانان ) گوایە .. زۆربڵێم . من ویژدانم پاکە . هەر یەکێك لەوانە ، بەسەرهاتێکیان بەسەرهاتووەو کەمئەندام بوون !! ئێستایش خۆم ئامادەم کە چیرۆکەکانیانت بۆ بگێڕمەوە....

چیرۆکی برای یەکەمی سەرتاشە زۆربڵێ یە(هەڵەکون)ەکە
یەکەم برام : ( قەمبوور) بوو . دوکانێکی لە پیاوێکی دەوڵەمەندی بەغدا بەکرێ گرتبوو و بەرگدروویی تێدا دەکرد .
دەوڵەمەندەکە ماڵی لەسەر خانەکە بوو. دوکانی براکەیشم لە ژێر خانەکەیدا بوو .
رۆژێکیان بەدەم کار کردنەوە ، سەر بەرز دەکاتەوە .کیژێك لەبەر پەنجەرەی ماڵێکدا دەبینێت ! سەیری خەڵکەکە دەکات . کە براکەم ئەمەی بینی ئیدی .. دەست لە کارەکەی هەڵدەگرێت و هەر خەریکی سەیرکردنی ئەو دەبێت .. بەیانی رۆژی دواتر دوکانی کردەوە .. دەست بەکار بوو. هەر تەقەڵێکی لێدەدا و سەیرێکی بەرپەنجەرەکەی دەکرد . کیژەش کە ئەمەی بینی ، وا تێگەیشت ، کە ئەمە ، بووە بە داوی دڵداری یەوە ، بۆی پێدەکەنی . خۆی لێ ون کردبوو. دواتر بوخچەیەك قوماشی لە سادە و خەتداری بە کەنیزەکەکەیدا بۆ

ناردبوو.

کەنیزەکەکە چووە بەردوکانی براکەم و وتی :

خاتوونم .. سڵاوت لێ دەکات و دەڵێت : ئا.. لەم پارچە قوماشە خەتدارە بەڵکو کراسێکم بۆ بدورێت جوان و رێك و پێك بێت .

هەر ئەو رۆژە قوماشەکەی بڕی و بۆی دروو. کەنیزەکەکە ئێوارە کراسەکە دەباتەوە .

سبەینێی رۆژی دواتر کەنیزەکەکە هاتەوە بەر دوکان و وتی :

خاتوونم .. سڵاوی هەیە بۆت .

پارچەیەك قوماشی ئەتلەسی زەردباوی دەداتە دەست و پێی دەڵێت خاتوونم دەڵێت : (٢) کەوای لێ ببڕێت و هەر ئەمڕۆ بۆم بدوورێت .

براکەشم دەڵێت :

سڵاوێکی گەرمی منی پێ بگەیەنە و بڵێ دیوت : بە چاوان .

زۆر بە وردی (٢) کەواکە دەبڕێت و دەیان دوورێت و سەیرێکی پەنجەرەکە دەکات و سڵاوێکی تێ دەگرێت . کیژەش بۆی پێدەکەنێت و براکەم دڵخۆش دەبێت . چونکە پێی وابێت رووی دەدرێتێ ! کەنیزەکە هاتەوە بەردەم دوکان و(٢) کەواکەی برد . ئەو شەوە برا داماوەکەم نانوێت و تا بەیانی تەپاوتلی بوو..! بۆ سبەینێ بەرەو دوکان بووەوە .

دیسان کەنیزەکەکە هاتەوە و پێی وت :

خاتوونی گەورەم .. خۆتی دەوێت !

کە براکەم ئەمە دەبیستێت دەترسێت ! کەنیزەك ئەو ترسەی لە روخساردا خوێندبووەوە پێ ی وتبوو:

خەمت نەبێت ، لە کاری چاك زیاتر.. کاری خراپی پێت نی یە! خاتوون ، کارێکی کردووە تۆ و پیاوی ماڵ... بوونەتە ناسیاوی یەکتر !

بەرگدروو ، هەر زۆر شادمان بوو و لەگەڵی رۆیشت . کە گەیشتە ماڵ و مێردی خاتوونی بینی کڕنوشی بۆ برد .

ئەویش .. بەخێری هێناو کۆمەڵێك قوماش و جلی دایە و پێی وت :

هەندێ کراسی بۆ لێ ببڕێت و بیدرووێت .

براکەم کەوتە کراس بڕین ، تاکو نوێژی خەوتنان (٢٠) کراسی بڕی . ئەو ئێوارە دەمی لە خواردن نەدا ! تاکو تەواوی کردن .

کە بۆی بردنەوە، کابرا پرسیی : چەندت حەق دەست بدەمێ ؟

براکەم وتبووی : (٢٠) درهەم .

ئەویش بانگی کەنیزەکەی کرد (٢٠) درهەم بێنە .

ژنە چاوێکی لە براکەم داگرت . براکەم بێ دەنگ بوو. تاکو تێ بگات هیچی لێ

وەرنەگرێت .

براکەیشم دەبینێ ژنی کابرا چاوی لێ دادەگرێ دەڵێت : بەخوا هیچت لێ وەرناگرم !

مێردەکەیشی :

کراسەکانی وەرگرت و سوپاسی کرد .

لە کاتێکدا براکەم زۆر برسی بوو .( ٣) ڕۆژیش بوو تێر سکی خۆی نەخواردبوو .

توومەز ژنە .. پیاوەکەی خۆی ئاگادار کردبووەوە ، لەحاڵی بەرگدروو . برا داماوەکەشم ئاگای لە هیچ نییە ! ئیتر ژن و مێردەکە ، ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی دروومانی زۆری پێ بکەن ، بێ ئەوەی پوولی بدەنێ و پێیشی رابوێرن .

ڕۆژێکی دی ، کەنیزەکەکە هات و وتی :

گەورەم دەڵێت : با .. ببیینم .

براکەشم شوێنی کەوت ومێردی ژنە پێی وت :

دەمەوێت (٥) چاکەتم بۆ ببڕیت .

ئەویش جلەکانی برد... دواتر کە تەواوی کردن، بۆی بردنەوە، پیاوەکە دەست خۆشی لێکردو بانگی کرد کیسەی پارەکەیان بۆ هێنا .

دەستی کردە پارەکەدا و پرسیی : چەند دەکات ؟

ژنەش کە لە دوای پیاوەکەیەوە، وەستابوو: ئیشارەتی دا کە هیچ وەرنەگرێت .

بۆیە براکەشم وتبووی: گەورەم .. پەلەی چیتە !؟ ڕۆژانی تر زۆرن .

ئیتر وەکو کەر ملی شۆڕ کرد و بێ پارەی حەق دەست هاتە دەر. زۆر بە روونی : بێ پارەیی و هەژاری و برسێتی و رووت و رەجاڵی و ماندوویەتیی بە براکەمەوە دیاربوو.. بەلام ورەی دەدایە خۆی .

تاکو رووتانیانەوە، ماندوویان کرد . ئەمجا تەگبیریان بۆ کرد، کە کەنیزەکەکەی خۆیانی لێ مارە بکەن . ئەویش رازی بوو. شەوی چوونە کەژاوە ، تەگبیریان بۆ کرد ، کە لە ئاشەکەی لای خۆیان بخەوێت و براکەم بە قسەی کردن . لە ژێرەوە ، ئاشەوانیان : هاندا کە شەو پەنێکی پێ بدا .

ئاشەوانیش ئەو شەوە، ئاشەکەی وە ستان .

کەوتبووە هاوار و فیغان و براکەم لێی پرسی بوو : ئەوە چی یە ؟

ئەویش وتبووی :

گایەکی بەرداشەکە ، ناتوانێت کار بکات و بەرداشەکەش بە وانی تر ناخولێتەوە..!! ئاش وەستاوە و منیش باراشێکی زۆرم بەسەرا کەوتووە!

رووی لە براکەم نا کە بچێتە شوێنی گایەکە..! براکەم چووە جێی (گا )یە نەخۆشەکە و ئاشەوان پەتی لە ملی براکەم خست بوو ! کەوتبووە قامچی لێدانی و پێی وت بوو ..

بجوولێ : با گەنمەکە بهاڕڕێت و ببێتە نارد . هەر چەند براکەم هاواری کرد بوو و قیژاندبووی .. بەڵام کەسی لێ نەبوو بە هانایەوە بچێت . تا بەرەبەیان ئەمە حاڵی براکەم بوو. بۆ سبەینێ ، کەنیزەکەکەی خاوەن ماڵ هات و براکەمی بینی بە تەختە نێڵەی ملی یەوە..! هیچی بۆ نەوترابوو.

کەنیزەکەکە چووبووە ژوور سەری و وتبووی :

زۆرم پێ ناخۆشە ...کە ئەمەت بە سەر هاتووە ! من و خاتوون .. زۆرمان خەم بۆ خواردی .

براکەشم هێندەی لێ درابوو ، هۆشی و گۆشی وەڵام دانەوەی نەمابوو..! گەڕایەوە ماڵ و هێندەی زانی بوو ئەو مەلایە پەیدا بوو کە نامەکەی بۆ نووسی بوو .

سڵاوی لێ کرد و وتی :

سڵاو لەو رووە نازدارە و بەختیاریت سەرومڕ بێت .

براکەیشم وتبووی :

نە سڵاو و نەسەرچاو، کام نازدارییە؟ رەنگە تۆیش بۆ ئەوە هاتبیت کە بم خەیتە شوێنی گایەکەی تری ئاشەکە و تاکو بەیانی بەرداشم پێ بخولێنیتەوە !

ئەویش پرسی بووی : تووخوا چی بووە ؟

براکەشم بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕابوبووەوە .

ئەویش بە لاقرتێوە پێی وتبوو :

ئەوە ئەستێرەتان جووت بووە...! گەر حەز دەکەیت بۆت دەگۆڕم..!

براکەشم وتبووی :

بشزانە هیچ فروفێڵێك نەماوە ؟ سەری شۆڕکرد بوو.. بەرەو دوکان بوو بووەوە . تا.. بەڵکو کەسێك بەرگێکی پێ بدرووێت .. تاکو پارەی ژەمێ خواردن پەیدا بکات . دوکانی کردەوە و دانیشت هێندەی زانی کەنیزەکێك هات .

ئەو کەنیزەکە پێی وت بوو :

ناردوومیان بە دووتدا تاکو بێیت قسە لەگەڵ خاتوونم بکەیت .

براکەیشم پێی وتبوو :

برۆ... بەرێی خۆتەوەو هیچم نێوان نییە لەگەڵ خاتوونتدا .

کە گەڕایەوە و گێڕایەوە هێندەی پێ نەچوو، ژنەکە چووەوە بەر پەنجەرەکە و هاواری کرد :

ئاخر لەبەرچی هیچمان بە سەر یەکەوە نەماوە ؟ براکەم وەڵامی نەدابووەوە . تاکو دواتر سوێندی بۆ براکەم خوارد بوو ، کە دەستی نەبووە . لە کارەساتی ناو ئاشەکەدا .. ئیدی براکەم دڵی ئاوی خواردەوە و هیچی تیا نەمابوو. کەوتەوە کار کردن لە دوکانەکەیدا.

رۆژێکیان کەنیزەکەکە هات بوو و پێی وتبوو :
خاتوون سڵاوی هەیەو دەڵێت : با بێت بۆ ماڵ و مێردەکەشی دەڵێت : دەبێت هەر بێت .
تووەمەز ژنە ، وتبووی واز بێنن .. با کارێکی پێ بکەم ، لە شاردا دەنگ بداتەوە . برا داماوەکەشم ، بێ ئاگایە لە فێڵی ژنان . کەنیزەکەکە ، براکەمی لەگەڵ خۆی بردەوە ماڵ .
کە ژنەکە ، براکەمی بینی بوو وتبووی :
بەرێز .. بیرت دەکەم .
برای بەرگدروویشم وتبووی : منیش تاسەت دەکەم .
هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو .
کە مێردەکەی ئامادە بوو بوو و لە براکەمی پرسی بوو :
ئەمە بۆچی من لە ماڵ نیم و تۆ ئا بەم شێوەیە ژنەکەم دەدوێنی؟ بەو خوایە... دەبێت ، دەستت بدەمە ، دەستی پۆلیس .
هەر چەند براکەم پاڕا بووەوە ، بێ سوود بوو. سکاڵای لێ دەکرێت و لە پۆلیسخانە بە قامچی دەکەونە لێدانی برا کلۆڵەکەم . سواری وشترێکیان کردبوو و بە شاردا گێڕابوویان و خەڵکیان تێگەیاند بوو کە ئەمە شەڕواڵ پیسە ! خەڵکەکەش بەردبارانیان کردبوو و دواتر شار بەدەریان کرد بوو .
منیش زۆر ترسام ، شوێنی کەوتم و هێنامەوە لای خۆم و ئێستاش خۆم بەخێوی دەکەم.
خەلیفەش زۆر بە بەسەرهاتەکە پێکەنی و وتی :
ئەی کەم دووی بێ زمان ! چاکت کردووە .
فەرمانیدا ، خەڵات بکرێم و ڕێم بدەن بڕۆم .
بەڵام من پێم وت :
هیچت لێ وەر ناگرم ، تاکو بەسەرهاتی براکانی تری خۆمت بۆ نەگێڕمەوە . حەزیش دەکەم وا .. تێ نەگەیت کە زۆربلێم !

چیرۆکی برای دووهەمی سەرتاشی زۆر بلێ
سەرتاشەکە قورگی پاك کردەوەو وتی ..
کە برایەکی تری هەیە و ناوی ( فەقیق )ە و کوێرە ! ڕۆژێکیان لە دەرگای ماڵێکی گەورە دەدات .
تا....بەڵکو خێرێکی پێ بکەن .
خاوەن ماڵ دەپرسێت : کێ یە ؟
ئەمیش وەڵام ناداتەوە .
خاوەن ماڵ دەرگا دەکاتەوە و دەپرسێت : چیت دەوێت ؟

براكەشم دەڵێت :
لەبەرخاتری خوا... خێرێکیم بدەنێ !
خانەخوێ دەپرسێت : تۆ کوێریت ؟
براکەیشم دەڵێت : بەڵێ .... قوربان !
ئەویش دەڵێت : کە وابوو .. بێنە دەستت .
براکەشم وا دەزانێت شتێکی دەداتێ و دەستی دەداتێ ، ئەویش لەگەڵ خۆی : بە پلیکانەکەدا سەری دەخات ودەیگەیەنێتە سەربان . براکەشم چاوەڕێی ئەوەیە یان تێری بکەن .. یان شتێکی بدەنێ .
خانەخوێ پرسی یەوە : چیت دەوێت .. ئەی کوێر؟
براکەشم دەڵێت :
لەبەرخاتری خوا .. شتێکم بدەنێ .
ئەویش دەڵێت : خوا بت داتێ .
براکەم پرسی بووی :
ئەی لەبەر دەرگا . بۆ ئەمەت پێ نەوتم ؟ ئێستا دەتەوێ چیم لێ بکەیت !؟
ئەویش دەڵێت : هیچم نی یە تاکو بتدەمێ .
براکەشم پێی دەڵێت :
کەوابوو دامگرەوە ، خوارەوە .
ئەویش پێی دەڵێت :
ڕێگەکە ، لەبەردەمتایە . بۆخۆت دابەزە .
براکەم وردە وردە هاتە خوار (٢٠) پلیکانەیەکی مابوو بۆ دەرگاکە. قاچی هەڵکەوت وتل بووەوە .
بەسەری شکاوەوە لە ماڵەکە چووبووە دەرەوە ! بێ ئەوەی بزانێت .. بۆ کوێ دەڕوات . لە ڕێگا تووشی بوو بوو بە تووشی هەندێ لە کوێرانی هاوڕێ یەوە ..
ئەوانیش لێیان پرسی بوو :
ئەوە ، ئەمڕۆ چیت بەسەر هاتووە ؟
ئەو داماوەش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕابوونەوەو پێی وتبوون :
دەمەوێت چەند درهەمێك دەربێنم بۆ خۆم خەرجی بکەم ..تاکو چاك دەبمەوە . بەڵکو دوای نوێژی عەسر..بێنە ماڵەوە بۆلام . کوێرەکانی هاوڕێی وتبوویان .. باشە .
تووەمز خاوەن ماڵەکە بە شوێنیەوەیەو گوێی لە قسەکانیەتی. براکەشم ئاگای لێی نیە. لە ماڵەکەیدا دانیشتبوو .
کە هاوڕێ کوێرەکانی هاتنە ژوور، پێی وتبوون :

دەرگای دەرەوە دەبخەن و ماڵەکە بپشکنن ..!! ئەگەر کەسێکی بێگانە شوێنمان کەوتبێت .
کابرا گوێی لە تەگبیرەکە دەبێت گوریسێك بە بن میچەکەوە دەبێت . خۆی پێدا هەڵ دەواسێت .

کوێرەکان هەموو ماڵیان پشکنی بوو . کەسیان نەدۆزی بووەوە . لەولا براکەمەوە ، سەردەکەن بەیەکەوە دادەنیشن !! دواتر دەکەونە.. پارە ژماردن و پارەکەیان (١٢٠٠٠) درهەم دەبێت . ئیدی هەر یەکە و چەندی پێویست دەبێت : لەپارەکەی هەڵدەگرێت و ئەوەی دەمێنێتەوە لە ژێر خۆڵدا دەی شارنەوە. خواردنیان دەهێنن و پێکەوە دەیخۆن .

یەکێکیان پێی زانی بوو و هاواری کردبوو :

ئەناسێکمان لەگەڵدایە . خواو راسان دەست دەگێرێت .. مەچەکی خاوەن ماڵ دەگرێت و بە هەموویان دەکەونە لێدانی و دەیکەنە هاوار هاوار :

*خەڵکینە .. دز : هاتۆتە سەرمان و دەیەوێت دزیمان لێ بکات !*

خەڵکێکی زۆریان لێ کۆ دەبێتەوە و کابرای لێدراویش خۆی دەکات بە کوێر و دەکەوێتە سکاڵا لە کۆمەڵە کوێرەکە و دەڵێت :

*خەڵکینە ... بمان گەیەننە لای والی !*

خەڵکە کۆبووەکەش ، دەیان بەنە بەردەم ماڵی ( والی). ئەویش دێتە دەرو دە پرسێت :

چی روویداوە !؟

کابرای چاوساغ دەڵێت :

قوربان ... هەروا سەیر بکە..! لە منەوە دەست پێ بکە و سزامان بدە .

دەستیشی راکێشا بوو بۆ براکەم و وتبووی : ئەمەیان رێی بۆ دانام .

( والی ) فەرمانیدا :

(٤٠ ) داریان لێدا..!! براکەیشم کە ئازاری چەشت بوو چاوێکیانی کردبووەوە !! برێکی تریان لێدابوو و چاوەکەی ترییشی کردبووەوە !

والی پرسی بووی :

ئەفرەتی .... ئەمە چ کارێکە !؟

ئەویش وتبووی : تۆ... مەهێڵە لێم بدەن..گەورەم .. بەسەرهاتەکەت بۆ دەگێرمەوە .

هەرچوارمان چاو ساغین!خۆمان لە خەڵك دەگۆڕین و دەچینە ناو ماڵان سواڵ دەکەین پارەیەکی باشمان کۆکردووەتەوە ، کە(١٢٠٠٠) درهەمە .

جەنابی والی هەر هێندەم خۆش بوو داوای (٣٠٠٠) درهەمەکەی بەشی خۆمم کرد.. بۆم هەستان و تێر و پڕیان لێدام و پارەکەشمیان برد . ئێستاش خۆم دەخەمە پەنای خوا و تۆ ! بەشی رەوای خۆمم دەوێتەوە . حەزیش دەکەم راستی ، قسەکەمت بۆ دەرکەوێت .. لە هەر یەکەشیان بدەو با لێدانەکەش لەوە زۆرتر بێت .. کە لە منیان داوە !!

( والــی) فــەرمانی ســزادانی ، پێــدان . لــە براکــەی منــەوە ، دەســتیان پێ کرد و بەپەیژەیەکیانەوە بەست .

( والی) پێی وتبوون :

*ڕسواییـنە ، گاڵتە بە نیعمەتی خوا دەکەن . وا : پیشان دەدەن : کە کوێرن !؟*

براکەم هاواری لێ هەستا و وتی :

بەوخوایە کوێرین و بیناییمان تێدا نی یە !

پۆلیسەکانیش هێندەیان لێدابوو تا لە هۆش خۆی چوو .

( والی)یش وتبووی : *وازی لێ بێنن ، تا بەئاگا دێتەوە ، ئەمجا لێی بدەنەوە .*

هەر یەکە و زیاتر لە (٣٠) داری لێدرا.

پیاوە ( چاوساغ ) پێی دەوتبوون :

چاوتان بکەنەوە با.. لێدانەکەتان ، بۆ دووبارە نەکەنەوە ..!!

بە( والی)یشی وتبوو :

گەورەم .. با لەگەڵم بێن ، تاکو پارەکەت بۆ بێنن . ئەمانە : لەترسی خەڵك : چاو ناکەنەوە .

والی چەند کەسی خۆی لەگەڵ نارد و پارەکەیان هێنـا و هـەر لەوێـدا (٣٠٠٠) درهەمەکەی ئەمیان دایە . ئەوەی مایەوە ، ( والی) بردی بۆ خۆی و تاوانبارانی لە شار دوور خستەوە .

ئیتر ئەی ( میری موسڵمانان) ، چووم بە شوێن ئەم برایەشمداو هێنامـەوە لای خۆم و ئەمەی بۆ گێڕامەوە کە بۆم گێڕانەوە . ئیدی لە مـاڵ شـاردمەوەو بـە دزیـیەوە ، بە خێوم دەکرد .

خەلیفە زۆر بەم بەسەرهاتە پێکەنی و فەرمانیدا : خەڵاتی بکەن و با بڕوات

منیش وتم :

هەر چەندە زۆربڵێیش نیم ، بەڵام ناڕۆم تا بەسەرهاتی هەموویانت بۆ نەگێڕمەوە..!!

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

## شەوی ٣٢

### چیرۆکی برای سێ یەمی سەرتاشی زۆربڵێ

شەهرزاد وتی :

ئەی پاشای بەختیار ... خاوەنی بڕیار ...

بـرای سێ یـەمم .. کـە ( لارکوێر )ەکەمانـە ! ( قەسـاب ) بـوو . لـەم شاری بەغدایە . لەبەرئـەوەی گۆشـتەکەی هـی رانـە مەڕەکـەی خـۆی بـوو . زۆربـەی دەوڵەمەنـدانی شار مشتەریی ئەو بوون پارەیەکی زۆر و خانووبەرەیەکی فرەی هەبوو..!

رۆژێکیان لەدوکان خەریکیگۆشت فرۆشتن بوو ، پیرێکی ریش سپی چووە بەر دوکانەکەی . براکەشم ، چەند درهەمێکی دایە .

پیرەمێرد وتی : گۆشتم بدەرێ .

براکەم سەرنجی دابوو درهەمەکانی ئەم کە گۆشتەکەی وەرگرت لێیدا و رۆیشت . پیرەمێردە ، زۆر جوان و بە بریسکەن ! بۆیە بە جیا هەڵی دەگرتن..! ماوەی (٥) مانگ ئەم پیرەمێردە هامشۆی دوکانی براکەمی دەکرد . ئەویش سندووقێکی بۆ پارەکانی ئەو پیرەمێردە دانابوو. رۆژێکیان ، براکەم دەیەوێت بچێت چەند مەڕێك بکرێت . بۆیە سەری سندووقەکەی پارەی ئەو پیرەمێردە هەڵدەداتەوە ، دەڕوانێت لە چەند پارچە کاغەزێك زیاتر ، هیچی تری تیا نی یە ..!!

دەکەوێتە ، سنگ کوتان و هاوار کردن ... خەڵکی لێ کۆ دەبێتەوە . ئەویش بەسەرهاتەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە... خەڵکەکە سەریان سووڕ دەمێنێ..!! ئیدی وەکو جاران .. بەرانێك سەر دەبڕێت و لاکەکەی ، بە پێشی دوکانەکەیدا.. هەڵدەواسێت و لەبەرخۆیەوە دەڵێت : بەڵکو ، ئەمە خوایە پیرە نەگبەتەکە بێتەوە !

سەعاتێکی پێ نەچوو بوو . پیرەمێردەکە بە پارە زیوەکەیەوە پەیدابوو. یەکسەر براکەم یەخەی دەگرێت و هاوار دەکات :

موسڵمانان وەرن .. گوێ لە بەسەرهاتم بگرن لەگەڵ ئەم بێ نامووسە .

پیرە پێی دەڵێت :

کامیانت پێ باشە بەرم بدەی و بڕۆم ؟ یان سووکت بکەم لە ناو خەڵکدا !؟

براکەیشم دەڵێت : ئاخر ... بەچی حەیام دەبەیت !؟

پیرە دەڵێت :

بەوەی کە گوایە گۆشتی ئادەمیزاد دەفرۆشیت بە خەڵکەکە بەگۆشتی مەڕ..!!

براکەم دەڵێت :

نەفرەتی .. درۆ دەکەیت . چونکە ئەوە بوختانە بۆم دەکەیت .

دیسان دەڵێت : ئەگەر ئەوەت بۆ کرا ... ئەوا سەر وماڵی خۆیشم دەدەم بە تۆ!

پیرە تووڕە دەبێت و هاوار دەکات :

موسڵمانینە ، وەرن سەیری ناو دوکانەکەی بکەن ! خەڵکەکەش هەڵمەتیان هێنا بۆ بینینی دوکانەکە . کە سەیریان کرد... لاکی بەرانەکان بوون بە لاشەی مرۆڤ..!

خەڵکەکە ئەمەیان دەبینن ، یەخەی براکەم دەگرن و هاوار دەکەن :

هەی کافری ... بێ نامووس !!

*ئیتر کامەی فرە خۆشەویستی بوو ، پێیدا دەکێشا و دەیوت :*

*ئەوە گۆشتی مرۆڤمان ، دەرخوارد دەدەیت ؟*

پیرەمێردەیش مشتەکۆڵەیەکی کێشا بە چاویدا وچاوی تەقاند . خەڵکەکە لاکەکانیان گەیاندە پۆلیسخانە .

پیرە بانگ کرا بۆ شایەتی و وتی :

*میرم ئەم قەسابە مرۆڤ سەر دەبڕێت و گۆشتەکەی وا دەفرۆشێت ... کە گوایە هی مەڕە! داوا دەکەین یاسای خوا بەسەریدا جێ بەجێ بکەیت .*

هەر چەند براکەم هاوار دە کات بێ سوود دەبێت . فەرمانی بۆ دەردەچێت کە (٥٠٠) قامچی لێ بدەن و دەست بەسەر سامان و موڵکەکانیدا بگرن ! گەر دەوڵەمەندیش نەبووایە هەر زوو دەیان کوشت.

براکەشم سەری لووتی خۆی رەش کرد و سەری نایەوە . رۆیشت ، تا گەیشتە شارێکی گەورە .. لەوێ کاری پینەچێتی ، هەڵبژارد و دوکانێکی بچکۆلەی گرت و کەوتە پەیدا کردنی بژێویی خۆی .

رۆژێکیان لە دوکان دەرچێت . دوای کەمێك گوێی لە حیلەی( ئەسپ )ێك دەبێت و دەپرسێ : ئەوە چی یە؟

ئەوانیش تێی دەگەیەنن کە پاشا دەچێتە راو.

ئەویش دەوەستێت و دەکەوێتە سەیری کاروانی پاشا. وا رێکەوت پاشابراکەم دەبینێ .

براکەیشم سەری خۆی نەوی دەکات و لەبەرخۆیەوە دەڵێت :

پەنا بە تۆ دەگرم ..خوای مەزن لە شەڕ و بەڵای ئەمڕۆ.

ئەسپی پاشا دەسڵەمێتەوە و کاروانەکە دەوەستێت . پیاوانی دەرباری پاشا پەلاماری براکەمیان دابوو و لێدانێکی باش لێیان دابوو و هەر وەختەبوو بە دەستیانەوە بمرێ . بێ ئەوەی ئەو داماوە بزانێت بۆچی لێی دەدەن؟

ئەویش خۆی بە کێش کردبووەوە بۆ دوکانەکەی . دواتر، بەسەرهاتەکەی بۆ یەکێك لە پیاوانی پاشا گێڕابووەوە .

پیاوی پاشایش پێی وت بوو:

براکەم .. پاشا ، حەز ناکات ( لارکوێر ) ببێنێت..! بە تایبەتی ئەوانەی چاوی راستیان کوێرە..!

ئیتر ئەوە تاکو نەیکوژێت ، بەری نادات..!! پاسەوانەش دابوویە قاقای پێکەنین ....

براکەم ئەمەی بیست ... لە ترسانا ئەو شارەیشی جێ هێشت و چووە شارێك کەس نەیناسێت و ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە .

رۆژێکیان بیری لە خۆی کردەوە دواتر وتبووی چی دەبێت ، با ببێت ! رۆیشتبووە پیاسە و گەڕان . گوێی لە حیلەی ئەسپ بوو .

چونکە ترسابوو ، بەخۆی وت :

خوا ناردی ! زۆر بە پەلە کەوتە تەقەلای خۆشاردنەوە . شوێنی دەست نەکەوت و خۆیدا بە دەرگای ماڵێکدا و کرایەوە . چووە ژوور و سەیری کرد داڵانێکی درێژە .

هێندەی زانی دووکەس قۆڵیان گرت و وتیان :

سوپاس بۆ خوا کەوا تۆمان گرت ... ئەی دوژمنی خوا.. ئەوە (٣) شەوە ، ناهێڵیت بنووین ! هەر جارەو بە جۆرێك مردنت پیشان داوین !

براکەشم پرسی بووی : خزمینە ... چیتان لێم دەوێت ؟

ئەوانیش وتیان :

خۆت لێمان دەگۆڕیت ، پیلان دادەنێیت بۆ کوشتنی خاوەنماڵەکە ! بە هێندە کۆڵتان لێ نەداو هەژار و بێ پارە و پوولتان کرد !؟ دەی .. وەکو شەوانی پێشوو چەقۆمان لێ دەربێنە !

کە جلەکانیان پشکنی بوو چەقۆیەکی پێ بوو بوو !

براکەم کەوتە خۆی و هاواری کرد :

خەڵکینە لە خوا بترسن ! من خراپم بەسەر هاتووە و بەسەرهاتێکی سەیرم هەیە !

ئەوانیش پرسییان : بەسەرهاتی چی !؟

براکەم کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی بەڵکو، بەرەڵڵای بکەن . بەڵام بێ سوود بوو . هێندیان لێدا کە جلەکانیان لەبەردا دڕی .

کە جێگای لێدانیان بە پشتی یەوە بینی بوو پرسی بوویان :

نەفرەتی ... ئەوە شوێنی لێدانت بە پشتەوەیە؟

کە براکەمیان برد بووە لای ( والی) لە دڵی خۆیدا وتبووی :

مەگەر خوا پەنام بدا.... ئەگەرنا : تاوانبار بووم و لێ بوومەوە .

( والی) لێی پرسی بوو :

خوێڕی ... چی وای لێکردی بچیتە سەریان و هەوڵ بدەیت ، بیان کوژیت ؟

براکەشم وتبووی : بۆ خاتری خوا... مۆڵەتم بدە و گوێم لێ بگرە .

والیش وتبووی :

گوێ لە کەسێك بگرم کە هەموو جەستەی شوێنی قامچی یەو خەڵك هەژارو بێ سامان دەکات ؟ ئەگەر تاوانێکی گەورەت نەکردبوو بێت ، بەو شێوەیە دارکاری ناکرێیت .

( والی )ش فەرمانی دابوو کە (١٠٠) شووڵی لێ بدەن .

کە براکەم هۆشی هات بووەوە . بەرو دوا سواری وشتریان کردبوو و بە شاردا گێڕابوویان و بانگەوازیان بۆ کرد بوو و هاواریان کرد بوو :

( خەڵکینە .. ئەوە سزای ئەو کەسانەیە ، پەلاماری ماڵی خەڵکی دەدەن..)

فەرمانی بۆ دەرچوو شار بەدەرکرا. ناچار شوێن براکەم کەوتم و هەواڵیم پرسی .

دەڕوانم بەر جنێو دراوە! بە دزیەوە هێنامەوەو بردمەوە ماڵی خۆمان. ئەویش لێی دانیشت و کەوتمە بەخێو کردنی .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەڕەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٣٣**

بەسەرهاتی برای چوارەمی سەرتاشی زۆربلێ
شەهرەزاد وتی :
ئــەی شاشەهرەیار .. شکۆ و پــایەدار ...
سەرتاشی زۆربلێ .. دەستی بەقسەکردن کردو وتی....
چوارەم برام : کە هەردوو گوێی بڕابوو. شەوانە سواڵی دەکرد و ڕۆژانەش هەمووی خەرج دەکرد. باوکە پیرەمان مرد و (٧٠٠) درهەمی بۆ بەجێ هێشتین و لە نێوان خۆمانا بەشمان کرد. ئەم برایەم سەراسیمە بوو کە ئاخۆ.. چی لەم پارەیە بکاتا؟ ئەوە بوو. بە خەیاڵیدا هات و شووشەی جۆراو جۆری پێ کڕی و بردی یە بازاڕ و بە لادیوارێکدا هەڵی پەسارد .
کەوتە بیر کردنەوە و بە خۆی وت :
سەرمایەکەم (١٧٥) درهەمە..کە فرۆشتمەوە ، دەبێتە (٢٠٠) درهەم . دواتر بایی (٢٠٠) درهەمەکە ( شووشە ) دەکڕم .
کە ئەویشم فرۆشتەوە : سەرمایەکەم دەبێتە (٤٠٠) درهەم . ئیتر ئەمەندە دەکڕم و دەفرۆشمەوە ... تاکو پارەیەکی زۆرم دەبێت ودەوڵەمەند دەبم ... لە هەموو شتەکان دەکڕم . کاسبی بە زێڕیشەوە دەکەم . ئیتر هەر زۆر زۆر قازانج دەکەم . خانووبەرەیەکی گەورە دەکڕم . کۆیلە دەکڕم . ئەسپی پشت بەزینی زێڕین دەکڕم . خواردن و خواردنەوەی چاک . گۆرانی بێژ نامێنێت ، بانگی نەکەمە ماڵی خۆم . هەر ئیش دەکەم . تاکو، خوا یار بێت سەرمایەکەم دەبێتە(١٠٠٠٠٠) دینار. ئەوا .. قەفەزی شووشەکەیش، بەرامبەرێتی .
لەبەر خۆیەوە وتی یەوە کە(١٠٠٠٠٠) دینارم بوو . دەڵاڵ دەدۆزمەوە . تاکو ڕەوانەی ماڵە پاشا و وەزیرانییان بکەم بۆ خوازبێنی کچەکانیان..!
هەر کچە وەزیر داوا دەکەم . بیستوومە زۆر جوان و نازدارن ! چی تیایە (١٠٠٠) دینار مارەیی . گەر وەزیر پەسەندی بوو..ئەوا چاکە ! گەرنا...هەر بە زۆر لێی دەسەندم ! (١٠) خزمەتکار دەکڕم . جل و بەرگی پاشایانەش دەپۆشم...ها!! تەنانەت قەڵپووزی زینی ئەسپەکەیشم دەبێت لە زێڕ بێت !
هەر کە سوار بووم : خزمەتکاران هەندێکیان بە دوامەوە دەبن و بڕێکیشیان پێشم دەکەون ! بە شاردا دەگەڕێم ، خەڵکی دەم بینن و سڵاوم لێ دەکەن... خۆم دەکەم بە لای

وەزیری خەزوورم دا . لەبەرم هەڵ دەستێت و لە شوێنی خۆی دام دەنێت..!! چونکە دەبێتە مامم . (٢) خزمەتکار بانگ دەکەم کە هەر یەکەیان کیسەیەك پارەیان پێ بێت و هەر کیسەیەکیش (١٠٠٠) دیناری تێدا بێت . (١٠٠٠ ) دیناریش مارەیی دەدەم بە خەزوورم ... کیسە (١٠٠٠)کەی دی . هەروا دەدەم پێیان : تاکو..تێیان بگەیەنم کە پارەم لەلا بێ نرخە و زۆری ترم هەیە ! خۆ.. ئەگەر رووی دەمی کردە من و (١٠) وشەی قسە بۆ کردم .

ئەوا من بە دوو وشە وەڵامی دەدەمەوە .کە گەڕایشمەوەماڵی خۆم . خزمەتکارانی ماڵی ژنەکەم هاتن.... دەست بە دیاری بوون ، ئەوا : وەری ناگرم لێیان و خەڵاتیشیان دەکەم . تاکو تێیان بگەیەنم ، نەفسم بەرزە و نرخی خۆم رادەگرم . پێش ئەوەی ژنەکەم بگوێزمەوە . خانووەکەم نۆژەن دەکەمەوە .

لە کاتی زاوایەتیدا لەسەر ئەو کورسی یە دانیشتم . ئەوەندە بە دەوروبەردا ناڕوانم.. تاکو دەری بخەم : ژیرم و ژنەکەشم بە بەرگی ئاڵ و واڵاو زێڕەوە دەبێت .

وەکو خەرمانی گوڵ لای خۆمەوە دەدرەوشێتەوەو خۆیشم بە سەرسامیەوە لێی دەڕوانم ..!

بێگومان ئامادە بووانی ئاهەنگ لە دڵی خۆیاندا پێم دەڵێن :

سەیر بکە.. چێژی لێ وەربگرە. دەستمان بە لایەکت . ژنێکی ئاوا جوان بووەتە کەنیزەکت !! دواتر زۆرینەیان کڕنووشم بۆ دەبەن .

سەرم بڵند دەکەم و سەیرێکی بووکێ دەکەم و سەرم نەوی دەکەمەوە . ئیدی دەیبەن. جوانترین بەرگی پێ دەپۆشن . گەر جاری دووەم بووکەیان هێنایەوە سەیری ناکەم . تاکو چەند جارێك نەپرسن .

سەیری دەکەم وسەرم دادەخەمەوە . تاکو بووکە دەبەن. فەرمان دەدەم توورەکە پارەیەکی(٥٠٠)دیناریی هەڵبدەن بۆ ئەوانەی سەری بووك شانە دەکەن و دەیرازێننەوە . دواتر بووکە دێننە لای دانیشتوان . کە هێناشیان سەیری ناکەم . دواتر دایکی بووکە دێت و سەرم ماچ دەکات .

پێم دەڵێت : بەڕێز .. ئاگات لەم کەنیزەکەت بێت .

منیش خوا نەکات وەڵامی بدەمەوە .

کە ئەمە دەبینێت ، پێ یەکانم ماچ دەکات و دەڵێت :

بەڕێز کچەکەم...شەرمنە ، گەر ئاوا رەفتار بکەیت، دڵی دەشکێت. رووی بدەرێ و بیدوێنە.دەچێت جامێ شەرابم بۆ دێنێ و کچەکەی لێی وەردەگرێت . گەر بۆی هێنام ، بە راوەستاوی پشتگوێی دەخەم و شان دادەدەم و هێندە خۆم بەزل دەگرم . هەر سەیریشی ناکەم ! تاکو باوەڕ دێنێ کە من سوڵتانێکی مەزنم .

ئەمجا پێم دەڵێت :

بەڕێز بۆ خاتری خوا.. جامە شەرابەکە ، مەگێڕەوەو لە کەنیزەکی خۆتی وەربگرە.

منیش هیچ نالێم..! ها... ئە ئاوا.. زللەیەکی لێ دەدەم و ئاوا.. شەقێکی تێ هەڵدەدەم !!

لەو خەیاڵەدا... دەست و قاچی دەکێشێت بە قەفەزە شووشە هەڵپەسێردراوەکەدا و دەیخات . سندووقە شووشە هارِە دەکات و هەمووی دەشکێت...!

براکەیشم بەدەم هاوارو گریانەوە دەڵێت :

*ئەمەش ئەنجامی خۆ بەزل زانین بوو....*

سەرتاشەکە دەستی بە قسەکردن کردەوە و وتی :

براکەم جلوبەرگی لەبەرخۆیدا درِی بوو و کەوت بووە لەخۆ دان... خەڵکەکەش بەرەو مزگەوت و نوێژ کردن دەچوون. لێی کۆ بووبوونەوە، هەندێکیان بەزەییان پێدا هات بوووەوە و دەستگیرۆییان کردبوو. هەندێکیش گوێیان نەدابوویە . براکەشم یەك سەعات گریابوو. هێندەی زانی بوو ژنێکی جوان و خان و مان ، بە سواری هێسترێکەوە پەیدا بوو کە قەڵپووزی زینی هێسترەکەی زێرِ بوو. بۆنی مسکی رۆژە رێ یەك دەرِۆیشت ..! هەندێك خزمەتکاری بە دواوە بوو . بۆ نوێژی جەماعەتی جومعە دەچوو. کە بەم شێوەیە براکەمی دی بوو بەزیی پێدا هات بووەوە .

دڵی نەرم بوو بوو و پرسی بووی . خەڵکەکەیش تێیان گەیاند بوو کە چۆن ئەم شووشە فرۆشە، شووشەکانی شکاوە و ئەویش رۆزیی لەسەر ئەم کارەیە . ژنەکەش ، فەرمانیدا بوو بە خزمەتکارەکەی خۆی کە توورەکەیەك پارەی بداتێ کە (٥٠٠ ) دیناری تێدا بوو بوو. براکەم کە پارەکەی وەرگرت بوو لەخۆشیانا، خەریك بوو، تێك بچێت...! دەستی کردبووە، نزا کردن بۆ خێرەومەندەکە . ئەوە بوو بە دەوڵەمەندی گەرِابووەوە بۆ ماڵ . لە ماڵەوەش لە کاتێکدا، بیری هەر بەلای پارەکەوە بوو . لە دەرگا درابوو و چوو بوو کردبوویەوە .

پیرەژنێکی بینی بوو کە نەیناسی بوو و وت بووی :

کورِەکەم .. کاتی نوێژە و منیش دەستنوێژم نی یە . رێم دەدەیت ، لێرە دەستنوێژ هەڵبگرم ؟

براکەشم وت بووی : فەرموو .

مەسینەیەکی پرِی دابووە دەست . خۆیشی دڵخۆشی پارەکەی بوو . کە پیرەژنە ، هات بووە دەر. بەرماڵی بردبووە لای ئەو شوێنەی ، براکەمی لێ بوو . دوو رکات نوێژی دابەست بوو و نزا و پارِانەوەی بەخێری بۆ براکەیشم کرد بوو .

ئەویش دەستی برد بوو ، لەو توورەکەیە (٢) دیناری پێ بەخشی بوو .

( پیرەژن )ە وت بووی :

پەنا بەخوا .. تۆ بۆ دەم کەیتە سواڵکەر؟ ئەوەش پارەکەت بیگرە! پێویستم پێی نی یە. ئەگەریش دەتەوێت ، ئەو ژنە مارە بکەیت . کە ئەم پارەیەی پێ بەخشی بوویت . ئەوا کارەکەت بۆ دەکەم! چونکە هاورِێمە .

براکەیشم وت بووی :

جا.. ئەوە چۆن چۆنی دەیکەیت؟

پیرەژنەیش وت بووی :

کوڕەکەم ... ئەو ژنە شوو بە پیاوی دەوڵەمەند دەکات... تۆیش هەر چی یەکت پارە هەیە، لەگەڵ خۆت بیهێنە و شوێنم بکەوە . کە چووینە ماڵی ژنە خۆ بەرمپێش مەبە و مامە حەمەیی مەکە ! ئیتر ژنەکە چەندت بە خەیاڵدا بێت لە پارە.. دەتداتێ !

براکەم هەر چی یەك پارە و زێڕی بوو . هەڵی گرت بوو و شوێن پیرەژنە کەوت بوو و لە خۆشیدا بڕوای بە خۆی نەدەکرد بوو . ڕۆیشت بوون تا..گەیشت بوونە بەر دەروازەیەك و لە دەرگای دا بوو کەنیزەکێکی ڕۆمی لێی کردبوونەوە . پیرەژنە چووبووە ژوور و براکەم بە دوایدا . خانوویەکی گەورە و خەڵکێکی زۆر، کۆمەڵە فەرشێکی نایاب ڕاخرابوو . چەند پەردەیەکی جوان هەڵواسرابوو . براکەم دانیشت بوو و زێڕ و پارەکەیش لە کۆشیدا بوو . چەفتە و جامانەی لەسەر ڕانی دانابوو . هێندەی پێ نەچوو بوو .کۆیلەیەکی ڕەشی قەبەی مەچەك ئەستوور..بە شمشێرێکەوە هات بوو بۆ لای .

لێی پرسی بوو :

داماو.. چی دەکەیت !؟ کێ تۆی هێنایە ئێرە..!

ئەمیش وا ترسابوو کە زمانی لاڵ بوو بوو... هیچی بۆ نەوترابوو . ( کۆیلە )ش هەر گرت بووی و جلوبەرگی لەبەر داکەند بوو! هێندەی بەلای پانی شمشێرەکە لێدابوو تاکو لە هۆش خۆی چوو. کۆیلەی نەگبەت ، وای زانی بوو ئیتر مردووە .

براکەم هێندەی گوێ لێ بوو بوو ، کۆیلەکە وت بووی :

خوێم بۆ بێنن !

( کەنیزەك )ێك پڕ بە سینی یەك ، خوێی بۆ هێنا . ئەویش کەوتە خوێ کردنە سەر برینەکانی . براکەیشم لە ترساندا نەدەجووڵا. نەکو بزانێت کە نەمردووە . کەنیزەکەکە ڕۆیشت و پیرەژنەکە هات و هەر دوو قاچی براکەمی ڕاکێشا بەرەو ژێرزەمینەکەیان . فڕێی دایە ناو کۆمەڵە کوژراوانێکی ترەوە! دوو ڕۆژ لەوێدا مایەوە . ئەو خوێ یە بووە هۆی وەستاندنی خوێن بەربوونەکەی و نەمرد بوو..! براکەیشم کەوت بووە خۆی و هەر چۆنێك بوو بە تاریکی شەو لە ژێرزەمینەکە هات بووە دەرو بە داڵانەکەدا خۆی گەیاند بووە دەروازەکەی دەرەوە .

بەیانی پیرەژن ، هات بوو و دەرگای کرد بووەوە و بەرەو ڕاو کردنی نێچیرێکی دی!!

براکەشم شوێنی کەوت بوو، بێ ئەوەی پێی بزانرێ تا گەیشت بووەوە ، ماڵی خۆیان . ئەمجا کەوت بووە تیمارکردنی خۆی و چاك بوو بووەوە . دواتر کەوت بووە چاودێری کردنی .

پیرەژنەش ، هەر خەڵکی دەبردەوە بۆ ماڵەکە . براکەشم لێی بێدەنگ بوو . کە چاك بووەوە ، توورەکەیەك وردە شووشەی لە کەمەری بەست بوو و جۆرێك خۆی گۆڕی بوو کە کەس نەی ناسێتەوە . خۆی گەیاند بووەوە هەمان پیرەژن .

هەر کە پیرەژنی بینی بوو پێی وت بوو :

پیرەژن ، نامۆم ! ئەمرۆ گەشتوومەتە ئێرە ، کەس ناناسم . شوێنێك شك نابەمێت ، ئەم (۹۰۰) دینارە زێڕەم بۆ بگۆڕێت !؟ شتێکیش بەخشیش دەدەمە خۆت .

( پیرەژن )ەش وتی :

خۆم کوڕێکی پارە گۆڕەوە (صرا ف)م هەیە.. خێرا شوێنم بکەوە ، نەکو بڕوات ، با.. پارەکەت بۆ بگۆڕێت .

براکەشم وت بووی :

پێشم بکەوە . ڕۆیشت بوون تاکو گەیشت بوونە بەر هەمان دەروازەو هەمان کەنیزەك دەرگای لێ کردنەوەو پیرەژنەیش بە رووی دەرگاواندا پێکەنی بوو .

بە دزی یەوە پێی وت :

کاری ئەمرۆمان چەورە..!

(کەنیزەك )ەکە دەستی براکەمی گرت بوو و برد بوویە ژوورەوە . لەهەمان شوێنی جاری پێشوو، داینا بووەوە. دیسان سەعاتێك لای براکەم دانیشت بوو.

ئەمجا هەستا بوو و بە براکەمی وت بوو :

نەڕۆیت ، بەم لاولادا... هەر ئێستا دێمەوە .

هێندەی پێ نەچوو بوو ( کۆیلە) رەشە نەفرەتییەکە بە شمشێرێکەوە پەیدا ببوو .

بە براکەمی وت بوو : هەستە نەفرەتی ..

خۆی لە پێشەوە و براکەم بە دوایدا. براکەم شمشێری ژێر جلەکانی لێ ڕاکێشا بوو و هەرلەوێدا کوشت بووی .

قاچی ڕاکێشا بوو بۆ ژێر زەمینەکە و بانگی کرد بوو : خوێ یەکە کوا؟

( کەنیزەك )ەکە بە خۆی و سینی یەك خوێوە هات بوو. کە براکەمی بینی ، سینی یەکەی دانا بوو و بە پەلە رایکردبووە دەرەوە .

براکەیشم بانگی کرد بوو : پیرەژن... لە کوێیت؟

پیرەژنەیش خۆی کرد بوو بە ژێرزەمینەکەدا .

ئەویش گرت بووی و لێی پرسی بوو :

پیرەژنە سەر ئاسنینە ، دەم ناسی یەوە ؟

پیرەژنەیش وەڵامی دابووەوە : نە بەخوا گەورەم .

براکەم وتی :

خاوەن پارە زێڕەکانم . ئەوەی لە ماڵەکەمدا نوێژەکەت کرد و دوایی منت هێنایە ئێرە !
پیرەژنەیش وت بووی : لە خوا بترسە .. نیەتت بگۆڕە !
براکەم بە شمشێرەکەی دەستی ئەویشی پارچە پارچە کرد . گەڕا ... تاکو کەنیزەکەکەی دۆزیەوە .
کەنیزەکەیش هاواری کرد بوو : بمپارێزە بۆ : خوا !
براکەم ئەوی نەکوشت بوو و لێی پرسی بوو :
ئەی تۆ چی دەکەیت لێرە ؟
(کەنیزەك)ەکەیش وت بووی :
کوڕە کاکە کارەکەری ماڵە بازرگانێك بووم . ئەم پیرەژنە جارو بار سەری لێ دەدام . تاکو هۆگری بووم .
ڕۆژێکیان هات و پێی وتم :
ئەمڕۆ ئاهەنگێکمان هەیە کە لە وێنەی نی یە.. وەرە با لەگەڵ خۆم بتبەم .
منیش چووزانم ... وتم زۆر باشە . ئیتر خۆم ڕازاندەوە و ئاڵتوونم لە خۆم دا و (١٠٠) دینارم خستە توورەکەیەکەوە و لەگەڵ خۆم بردم . ئەویش کردمی بەم ماڵەدا . هەر هێندەم زانی .. ئەو (کۆیلە ) ڕەشە بردمی . ئەوە (٣) ساڵی ڕەبەقە لەم ماڵەدا ، خزمەتم پێ دەکەن .
لێی پرسی بوو : هیچ لەم ماڵەدا هەیە !؟
کەنیزەکە وت بووی :
ئەمانە زۆر دەوڵەمەندن ! گەر دەتوانیت ، پشت و پەنا بەخوا ، شتەکانی ببە !
کەنیزەکی لەگەڵ خۆی برد و سندووقەکانیان هەڵ بچڕی بوو. دەڕوانن پڕن لە توورەکە و براکەم سەری سووڕما بوو .
کەنیزەکەکە وت بووی :
من لێرە دەبم ... تۆیش بڕۆ . هەوڵی گواستنەوەیان بدە .
براکەم (١٠) کەسی بە کرێ گرتبوو ، کە هاتەوە ماڵەکە ، بینی دەروازە والایە..! کە چوونە سەرسندووقەکان . بۆی دەرکەوت .. کەنیزەکەکە، تاکو توانیویەتی ، لێی بردووە و براکەمی خەڵەتاندووە. براکەشم ئەوەی مابووەوە ، لەگەڵ قوماش و شتی ناوماڵ هەمووی برد و ماڵ هیچی تیا نەمابووەوە . ئەو شەوەی بە دڵخۆشی بردە سەر.
بەیانی ڕۆژی دواتر .. کە دەرگای ماڵی کردەوە (٢٠) سەربازی بینی .
گرتیان و پێیان وت :
( والی ) داوات دەکات . براکەشم زۆر پاڕابووەوە، کە چەند سەعاتێك مۆڵەتی بدەن . بێ سوود بوو بوو . بەرتیلی پێدابوون وەریان نەگرتبوو! قۆڵبەستیان کرد و بردیان . لە ڕێگا ناسیاوێکی بینی بوو زۆری لێ پاڕابووەوە کە یارمەتی بدات . ئەویش کێشەی براکەمی لێی

پرسی بوون .

پێیان وتبوو : ( والی ) داوای کردووە ، ئێمەش بۆی دەبەین .

ئەمجا پێی وتبوون : (٥٠٠) دینارتان دەدەمێ بەری بدەن و بگەڕێنەوە و بڵێن لە ماڵ نەبووە تا بیگرین . بەڵام رازی نەبوون . بە کێشیان کرد ، تا گەیاندیانە لای ( والی ) .

( والی) لێی پرسی بوو : ئەو هەموو سامان و قوماشانەت لە کوێ بوو؟

براکەم وت بووی : بمپارێزن !

( والی )ش دەستەسری پارێزراوی پێ دابوو ! ئەمجا بۆی گێرابووەوە کە چۆن پیرەژنێك کردوویەتی بە ماڵێکدا ، تاکو کۆتایی بەسەرهاتەکەی .

ئەمجا بە ( والی )ی وت بوو :

چیم هێناوە ، بیبە بۆ خۆت .. هێندەم بۆ جێ بێڵە تاکو پێی بژیم .

( والی )ش هەموو شتەکانی براکەمی دەست بەسەرا گرت و لە ترسی ئەوەی ( سوڵتان ) پێی بزانێت ناردبووی بە شوێنی براکەمدا و فەرمانی دابوو کە گەر ئەم شارە بەجێ نەهێڵێت لە سێدارەی دەدات .

براکەم ناچارە شاری جێ هێشت بوو. لە رێگایش جەردە رووتی دەکاتەوەو جلەکانی بەریشی لێ دەبەن ! بە ئەوەیشەوە ناوەستن .. هەردوو گوێیشی دەبڕن ! ناچار دیسان کەوتمە گەڕان بە شوێنیدا . کە دۆزیمەوە پۆشتەم کردەوە و هێنامەوە لای خۆم .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٣٤**

چیرۆکی برای پێنجەمی ر زۆربلێ

شەهرەزاد وتی :

سەرتاشەکە دەستی بە قسەکردن کردەوەو وتی :

ئەی ..میری موسڵمانان ، ئەم برایەیانم کە هەردوو لێوی بڕراوە . زۆر هەژار ودەست کورت دەبێت .

رۆژێکیان دەچێتە دەرەوە تاکو شتێك پەیدا بکات .و بیخوات ! خانوویەکی خۆش دەبینێت . بەر دەرگاکەی پڕ دەبێت لە خزمەتکار و داڵانێکی گەورەی هەبووە و کە لە خەڵکەکە دەپرسێ.پێی دەڵێن ماڵە بەرمەرکی یە! ئەویش دەست لە دەرگاوانان پان دەکاتەوە بۆ سواڵ. ئەوانیش دەڵێن :

بچۆ ژوورەوە، خاوەن ماڵ نائومێدت ناکات . براکەشم کە دەچێتە ژوورەوە . ماڵێکی زۆر خۆش دەبینێ . لە ناوەراستیدا رەز وباخێك بوو.. کە هەرگیز نەی دی بوو ! زەویی ژوورەکان ، لە بەردی (مەڕمەڕ) بوو بوون . پەردەکان شۆڕ ببوونەوە. براکەم سەراسیمە بوو بوو! نەیزانی بوو روو بکاتە کوێ ؟

پیاوێکی سەر و ریش جوانی بینی بوو! لەبەری هەستابوو و بەخێری هێنابوو و لە براکەمی پرسی بوو.
براکەشم وتبووی : کە هەژار و دەست کورتە ..!
پیرە کە ئەمەی بیست بوو خەمێکی زۆری بۆ خواردبوو و یەخەی خۆی دادڕی بوو و وتبووی :
چۆن دەبێت من لەم شارەدا بم و هێشتا هەژاری وەکو تۆی تێدا مابێت..!؟ نەخێر خۆم پێ ناگیرێت !
پەیمانی چاکی بە براکەم دا بوو و پێی وتبوو : دەبێت پەیوەندیمان پێکەوە هەبێت ..!
براکەیشم وتبووی :
گەورەم ، ئارامم لەبەر هەڵگیراوە و زۆرم برسی یە .
خانەخوێیش هاواری کردبوو :
ئادەی .. ( تەشت ) و ( مەسینە ) بێنن .
کە شتەکان ئامادە کرابوو وتبووی : میوانی ئـــازیزم .. فەرموو دەستت بشۆ .
کە برکەیشم سەرنجی دابوو .. نە تەشتی بینی بوو و نە مەسینە..!
خانەخوێش.. هاواری کردبوو :
ئادەی میوانەکەم برسی یەتی و سفرە و خوان ئامادە بکەن .
دوای کەمێك بە براکەمی وتبوو : فەرموو ، نان بخۆ!
براکەیشم کە هیچی نەبینی بوو: دەستی درێژ کردبوو ، کە گوایە نان دەخوات..
خانەخوێیش پێی دەڵێت :
سەیرە کوڕە خۆ : شتێکی وات نەخوارد !
براکەم ناچار دەستی بردەوە ، هەر وەکو ئەوەی خواردن دانرابێت .
خانەخوێ گەوتبووەوە قسە کردن :
تۆ سەیری ئەو نانە سپی یە جوانە..!!
براکەشم هیچی نەبینی بوو و لە دڵی خۆیدا وتبووی :
ئەم پیاوە حەز بە رابواردن دەکات بە خەڵك .
بۆیە پێی وتبوو :
گەورەم ، هێشتا نانی وا سپی و بە تامم نەخواردووە!
پیاوەکەیش پێی وتبوو :
ئەمە کەنیزەکێکم بۆی کردووم کە (٥٠٠) دینارم پێداوە .
ئەمجا هاواری کردبوو :
ئادەی کوڕە .. شۆربای بۆ بێنن .. با چەوریش بێت !

دوای کەمێك وتبووی :

توو سەری من تێر بخۆ . بزانە لە ژیانتدا شۆربای وا بە تامت خواردووە !؟ شەرم مەکە.

ئەمجا بانگی کردبوو : ئادەی .... کوڕە گۆشتاوی ( قەتێ)ی بۆ بێنن .

بە براکەیشمی وتبوو : فەرموو : بخۆ .. میوانی ئازیز ، درێغی مەکە .

براکەشم هەر.. دەم دەجولێنێ و هیچ قووت نادات !! ئیدی کابرا هەر جۆری خواردن بانگ دەکات و هیچ نایەت و خێرا... خێرا بە براکەم دەڵێت : فەرموو، بخۆ..!

دواتر بانگی کرد بوو و وتبووی :

دەی ... خواردنی مەحشی بێنن ، با.. ناوەکەی پڕ بادەم بێت..!

ڕوویشی کردبووە براکەم و وتبووی :

ئەمانە بە بادەم ئاخنراون ..!! تکایە هێندە بخۆ ... کە هەرگیز نەتخواردبێت !

خانەخوێ وەسفی ئەو خواردنانەی کردبوو و براکەیشم خۆی برسی بوو و هێندەی تر برسی ببوو !! بۆیە لەو کاتەدا بە نانێکی جۆیش قایل بوو.

ئەمجا لە براکەمی پرسی بوو :

تا ئێستا خواردنی ئاوا... بە تامت خواردووە؟

براکەیشم وتبووی : نەخێر .. گەورەم .

ئەویش وتبووی :

درێغی لێ مەکە . نۆشی گیانت بێت! شەرم نەکەیت !

برا داماوەکەشم وتبووی :

تێرم خواردووە !

خانەخوێ فەرمانی دابوو سفرەو خوان هەڵبگرن و وتبووی : میوە بێنن .

ئەمجا دەستی بۆ درێژ کردبوو و وتبووی :

ئەمانە.. تازە لە دارەکانیان کراونەتەوە. ... فەرمو بخۆ.

براکەم کە زۆر پەست ببوو و دەستی درێژ کردبوو و بە تەوسەوە وتبووی :

لەوە دەچێت .. ئەم میوەیانە.. بۆنی مسکیان پێوە کرابێت...!!

خانەخوێیش وتبووی :

ئـەوە وا پێی ڕاهاتووم..هەموو جارێك مسقاڵێك بۆنی ( مسك )م بۆ پێوە بکەن و نیو مسقاڵ عەنبەر!!

لە کاتێکدا .. براکەم گووپەکانی هەڵدەئاوساندبوون و دەم و لێوی بادابوو!!

کابرا پێی وتبوو : لەم بادەمەیش .. بخۆ و شەرم مەکە .

براکەشم وتبووی :

گەورەم ، زۆرم خوارد و ئیتر ناتوانم .

ئەویش وتبووی :
میوانی ئازیز ، چیم خستە بەردەمت : بخۆ و تووخوا برسی مەمێنە !!
براکەشم وتبووی :
گەورەم هەر کەس لەو خواردنانەی تۆ بخوات .. چۆن برسیی دەبێت !؟
براکەم لە دڵی خۆیشیدا وتبووی :
مەرج بێت .. کارێکت بەسەر بێنم : ئەمەت پێ تەرك بدەم !!
کابرا گوێی نەدابوو و فەرمانی دابوو:
خواردنەوەمان بۆ بێنن .
دەستیان لە هەوادا بادابوو هەر وەکو ئەوەی خواردنەوە وەربگرن.
پیاڵەیەکی دایە دەست براکەم و وتبووی :
سوێندت دەدەم ئەم پێکەم لێ وەربگرە... گەر بە دڵت بوو پێم بڵێ !
براکەشم وتبووی :
گەورەم ، ئەم مەیە بۆنی خۆشە... بەڵام من حەزم لە شەرابی کۆنی (٢٠ )ساڵەیە!
ئەویش وتی :
تۆ ئەمە نۆش بکە... چونکە لەمە بەتام ترت نەخواردۆتەوە !
براکەم وەری گرت و سەر لێوی خست... هەر وەکو ئەوەی (مەی)ی تێدابوو بێت .
کابرایش پێی وتبوو : نۆشت بێت .
خانەخوێ ، دوو پیاڵەکەی پڕ کردبووەوەو دانەیەکی دابووە براکەم و خۆیشی ملی بۆ درێژ کردبوو . هەر وەکو ئەوی( مەی)ی تێیدا بوو بێت..! هەڵی دابوو . براکەم وای نیشان دابوو ، کە سەرخۆشە . ئەوی خلافاندبوو و دەستی بڵند کردبووە و تا هێزی تێدا بوو ، زللەیەکی وای لێدابوو.. ناڵەی هات بوو! بۆی نوێ کردەوە .
خانە خوێ یەکە پرسی بووی : ئەمە چی بوو.... هەی رسوا !؟
براکەیشم وتبووی :
گەورەم ، بچووکی خۆت هێنایە ماڵ و تێر و پڕت کردم ! (مەی )یت پێ نۆش کردم و سەرخۆش بووم ! ئێستاش تۆ لەوە گەورەتریت تا لێ پرسینەوەم لەگەڵ بکەیت..!!
ئەویش کە ئەمەی بیست بوو دابوویە قاقای پێکەنین و وتبووی :
زمان درێژی یەکەی منیش کەم وێنەیە !! ئاوا..حەزم بە گاڵتە کردنە بە خەڵك..! بەڕاستی کەسیان وەکو تۆ ئارام و خۆڕاگر نەبوون ! بۆیە لێت خۆش بووم .
ئێستاش هەر بە ڕاستی با ببینە هاوڕێ !
فەرمانیدا :
سفرەیان بۆ ڕاخرا . هەندێك لەو خواردنانەی کە زووتر بانگی کردبوو.. دانرا .

شەرابیان خواردەوە . کەنیزەکان... گۆرانی بێژان .. بە سەما و گۆرانی کوڕەکەیان خۆش کردبوو .

کابرا براکەمی .. چوو بووە دڵەوە و زۆری خۆش ویست بوو ! ئەو شەوە لە ماڵیان مابووەوە ! هاورێیەتیان ، زیاتر لە (٢٠) ساڵی خایاند . کابرا مرد و ( سوڵتان ) دەستی بەسەر موڵك و سامانیدا گرتبوو و کەوتە گیانی براکەشم و ماڵی ئەویشیان تاڵان کرد . کە براکەم هەژار و بێ دەرتان بوو. سەری خۆی هەلگرت و ڕۆیشتبوو . لە ناوەڕاستی ڕێگادا چەند جەردەیەکی عەرەب گرتبوویان و کردبوویانە کۆیلە..!!

هەر لێیان دابوو و پێیان وتبوو :

مردووت مرێ ، پارە بێنە و ئازادیی خۆت وەربگرەوە !

براکەشم وتبووی من هەژار و نەبووم ... چیم لێ دەکەن بیکەن !

کە ئومێدیان لە براکەم بڕی بوو یەکێکیان چەقۆیەکی دەرهێنابوو و لێوی براکەمیان بڕی بوو . ئەمجا سواری وشترێکیان کرد بوو و بردبوویان لەو شاخانە بەرەڵایان کردبوو . خەڵکەکە ، بەو حاڵەوە کە بینی بوویان ، تێریان کردبوو .

هەواڵیان بە من داو چار ناچار چووم و دۆزیمەوە و هێنامەوە ناوشار .

ئێستاش وام لە خزمەتتدا .. دەبێت ، هەواڵی براکانم بدەمە ئێوە . ئەی (میری موسڵمانان) .. ئێستا خۆم ئەو (٥) برا ناتەواوانە بەخێو دەکەم .

خەلیفە زۆر پێکەنی و وتی:

بەڕاستی تۆ کەم دوویت و زۆربلێ نیت ! لەم شارە دەر بچۆ.. لە شوێنێکی دی نیشتەجێ ببە . خەلیفە دووری کردم و شاربەدەر بووم . نەم وێرا.. بگەڕێمەوە بۆ شار.. تاکو (خەلیفە) مرد و خەلیفەیەکی دی لە شوێنی دانرا.. بەڵام کە کەوتمە سۆراخی براکانم : هەموویان ، مردبوون !! منیش کەوتمەوە کارکردن و سەرتاشین .. تاکو ئەو ڕۆژەی یارمەتی ئەم کوڕە لاوەم دا .

بەرگدرووەکە ، بە پاشای چینی وت :

کە چیرۆکی سەرتاشە زۆربلێ یەکەمان بیست و زانیمان چی بەسەر ئەو گەنجە هێناوە.. گرتمان و لە بەندیخانەمان توند کرد. ئیدی بێ خەم لێی دانیشتین و خواردمان و خواردمانەوە . تاکو دەمە و عەسر! هەستام و چوومەوە ماڵ .

ژنەکەم لێم توورە بوو و وتی :

گەر نەمبەیتە دەرەوە بۆ گەڕان .. دەتۆرێم !

ناچار بردم بۆ گەڕان . کاتێکی خۆشمان بردەسەر . دەمەو ئێوارە لە گەڕانەوەماندا ئەو قەمبوورەمان بە سەرخۆشی بینی کە ئەم گۆرانی یەی دەوت :

مەی و پیاڵـــە وا توانـــەوە      بوویشم بە خەمی ئەو دووانەوە

مەی بە پیاڵە و پیاڵەش بەمەی        لێم ئاوەژوو بوون ، جوێ نەکرانەوە!

سوێندم لێخوارد ، شەو بیبەمەوەو ماسی یەکی برژاوم بۆ کڕی و لە ماڵەوە دەستمان کردە خواردنی . ژنەکەم بابۆڵەیەکی لە ماسی یەکە بۆ کرد و خستی یە دەمی ( قەموور )ەوە و ئەویش لە قورگی گیرا و مرد . ژنەکەم کەوتە فڕوفێڵی خۆ رزگار کردن لەم کەتنە و ئەوە بوو، بردمە ماڵی ئەم پزیشکە جوووەوە !

پزیشکەیش فڕوفێڵی کردو خستی یە ماڵی ئەو ( شاهد )ەوە . ( شاهد )یش فێڵی کرد و خستی یە سەرەڕێی دەلاڵە نەسرانی یەکە . ئەمە بەسەرهاتی دوێنێی من بوو.

رووی کردە ئەوان و پرسیی :

تووخوا لە دنیادا .. بەسەرهاتی لەمە سەیرتر.. هەبووە !!

پاشای (چین ) ئەمەی بیست ، پێکەنی و سەری لەقاند .. پەسەندیی قسەکەی سەلماند .

بەدەم قاقای پێکەنینەوە وتی :

*چیرۆکی سەرتاشە هەڵەکونەکە : سەیرترە.... لە چیرۆکی ( قەموور )ەکە !*

ئەمجا فەرمانیدا لەگەڵ بەرگدرووەکە بڕۆن . سەرتاشەکە لە بەندیخانە بێننە دەرەوەو قەموورەکە بنێژن و گۆڕەکەی هەڵبەستن .

کە سەرتاشەیان بۆ لای پاشای چین هێنا و ئەوەی بینی ، سەرنجیدا : رەشێکی تەمەن لە (٩٠) ساڵ زیاترە ..! برۆ و ریش و سمێڵ سپی . گوێ سمراوی لووت درێژ .

هەر کە بینی پێی پێکەنی و پێی وت :

کاکی کەم دوو... دەمەوێ هەندێ لە بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕیتەوە .

سەرتاشەکە وتی :

ئەی پاشای زەمانە .. چیرۆکی ئەم نەسرانی و ئەم جووە و ، موسڵمانە چین !؟ ئەم قەموورەی نێوانتان چی یە ؟ بۆچی کۆبوونەتەوە؟

بۆیە پرسیم :

تاکو تێتان بگەیەنم کە ( هەڵەکون ) نیم ! ئەم تاوانەی لەسەری بەندم لە منەوە دوورە! نازناوەکەم خەسار نەکردووە و بە (کەم دوو ) ناسراوم .. هەر وەکو ئەم شاعیرە دەڵێت :

نازناو : سیفاتی خاوەنی تیایە        هەر بۆ ئەوەیشە هاتۆتە گایە

پاشا وتی :

هەر چەند دووبارە کردنەوە بێخێرە ، بەسەرهاتی ئەو نێوارەیەی ( قەموور)ە و ( نەسرانی ) و (جوو)ەو ( شاهد ) و ( بەرگدروو ) بۆ ئەم سەرتاشە بگێڕنەوە .

دوایی سەرتاشەکە سەرێکی باداو وتی :

ئەم بەسەرهاتە .. سەیری سەیرانە !! ئەو قەموورەم پێ نیشان بدەن .

سەری قەموورەی کە هێشتا نەنێژرابوو بۆ هەڵدایەوە ، سەرتاش سەیری دەم و چاوی کرد دایە قاقای پێکەنین و وتی :

هەندێ مردن هەیە سەیرە ! مردنی ئەم قەموورەش دەهێنێت : بنووسرێت .. بە ئەو ناوە زێڕە! خەڵکەکە سەریان لەم قسەیە سوڕما..!

پاشایش وتی : چی یە ..کەم دوو.. قسەمان بۆ بکە؟

سەرتاش وتی :

پاشا .. بە نەمەکی ماڵت : ئەم( قەموور )ە درۆزنە نەمردووەو زیندووە ! توورەکەیەکی چەرمی دەرهێنا و کلچێوکێکی تیا دەرهێناو ملی ( قەموور)ەی پێ هەنوو و چەوری کرد . دەمارەکانی ملی بۆ شێلا..دواتر( گاز)ێکی دەسك درێژی دەرهێناو خستی یە قورگی قەموورەوە!! پارووە ماسی یەکەی لە قورگی دەرهێنایەوە .

قەموورەیش پژمەیەکی کرد و دەستی برد دەم و چاوی سڕی و وتی :

اشهد ان لا اله الا الله و اشهد و ان محمدا رسول الله .

پاشای ( چین ) زۆری پێ سەیر بوو . هێندە پێکەنی بوورایەوە !! ئەو خەڵکەش لە پێکەنیندا زۆربەیان لاڵ و پاڵ کەوتن ..!!

پاشایش کە هۆشی هاتەوە وتی :

بەو خوایە ! ئەمەم هێندە پێ سەیرە ! شتی وا سەیرم نەدیووە !؟

پاشا رووی کردە چەکدارەکانی و خەڵکەکە و پرسیی :

خەڵکینە لە ژیانتاندا شتی وا سەیرتان دیوە... کەسێك بمرێت و زیندوو ببێتەوە!!؟ گەر خوا... ئەم سەرتاشەی بۆ نەناردایە... دەبوو بمرێت !!

خەڵکەکەش لە نێو خۆیاندا دەیانوت : بەخوا... سەیرە !!

پاشا فەرمانیدا :

ئەم بەسەرهاتە لە گەنجینەی دەوڵەتدا .. بە نووسراوی هەڵبگرن .

خەڵاتی (جوولەکە) و ( نەسرانی) و( شاهد )ی کرد . ، خەڵکەکەش بڵاوەیان لێکرد، دواتر خەڵاتی بەرگدرووەکەشی کرد وکردی یە : بەرگدرووی سوپا و مووچەی بۆ برایەوەو بووە هاوڕێی نزیکی پاشا .

هەروەها (سەرتاش )یش دوای خەڵات کردنی . بووە سەرتاش و هاوڕێی پاشا . ئیتر بە خۆشی و بەختیاری ژیانیان بردە سەر.. تاکو ئەو دەمەی خوا بردینەوە بۆ خۆی .

شەهرەزاد وتی :

ئەی شاشەهریار، هێشتائەم چیرۆکە بەهێندەی بەسەرهاتی ( ئە نیس ) و( جەلیس ) سەرسووڕهێنەر نین !

*دنیازادیش* لە شەهرەزاد ی پرسی :

خوشکێ .... ئەو بەسەرهاتە چۆن بووە؟
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٣٥**

بەسەرهاتی ئەنیس و جەلیسی وەزیر

شەهرەزاد وتی :

ئەی پاشای بەختیار... خاوەنی بڕیار ...

دەڵێن پاشایەك بووە لە پاشاکانی( بەسرە ) ... هەژاران و سوالکەرانی زۆر خۆش ویستووە .

شایەك کە جەنگی لەگەڵ سوپایە — لە ناویان دەبات هێندە ئازایە !
لەسەر سینەیان کە چۆکی دادا.. — بە نێزەیەوە سەریان باڵایە..!
شمشێر بازێکی زۆر بە هەڵمەتە — تیرەندازێکە و رمی پۆلایە!
بە هەڵمەت وەکو شەپۆلی دەریا — جەربەزە و ئازاو دەستی واڵایە
بریسکەی رمی سوپای نێوکەشتیی — تا لێی بڕوانی: کۆتایی نایە
فەلەك سوێند بخوا هی وەك تۆی ببێ — سەر لەبەرد دەدا وەك تۆی بۆ نایە

ئەم پاشایە "محمد سلێمان زێنی" پێدەوترا . دوو وەزیری بوو "مەعینی ساوی"و "فەزڵی خاقان". فەزڵی خاقان بەخشندەی سەردەمی خۆی بوو و خۆشەویستی خەڵك .
هاوڵاتیان زۆر خۆشحاڵ بوون
کە ئەو پیاوە وەزیریان بوو . چاکەکار ولابەری شەڕ و هەرابوو. مەعینی وەزیر. بە پێچەوانەوە بوو.
دەڵێت ئەم شیعرە بە سەر ئەودا هەڵدراوە :

ئەوان لە قسەی خەڵکی بێ باکن — چونکە دوژمنی پیاوانی چاکن
پیاوخراپانیش دەگمەنە چاك بن — هەمیشە:خوێڕی وپیس و ناپاکن!

خەڵکەکەش چەندیان ( مەعین )خۆش دەویست . هێندەشیان رق لە ( فەزڵ)دەبووەوە . قەدەری خوا وابوو . شا موحەمەد کە لەسەر کورسیی دەسەڵات دانیشت بوو . سەرانی حکومەتی لە دەور و پشت بووو.
فەزڵی وەزیری بانگ کرد و وتی :
کەنیزەکێکم بۆ بکڕە ، ناسك و جوان ، لە وێنەی کەم بێت ! رەوشتی جوان بێت !
یەکێك لە سەرانی دەوڵەت وتی : کەوابوو (١٠٠٠) دیناری تێ دەچێت !
( سوڵتان ) فەرمانی دایە ، رۆژانە بچێتە ( بازاڕی کۆیلەیان ) و دەڵاڵەکان رابسپێرێت . کە نابێت هیچ کەنیزەکێك بە (١٠٠٠) دینار زیاتر بفرۆشرێت و بە وەزیر نەوترێت ! ئیتر

هەر کەنیزەك بوو پێش فرۆشتنی .. پیشانی ( وەزیر ) دەدراو ئەویش بە دڵی نەبوو.

ڕۆژێکیان دەڵاڵێك بەرەو ماڵی وەزیر دەبێتەوە. سەیر دەکات وەزیر بە سواریی بۆ سەرا دەچێت . لێی نزیك دەبێتەوە و دەڵێت :

تا تۆمان تیا بیت بەخشندە ماوە تەقەلات: لەلای یەزدان نووسراوە

ناوبانگی پاشایش بە هۆی تۆوەیە دیارە بەختیارییش خووی بە تۆداوە

قوربان لەوە دەچێت.... خوا بەویستی خۆتی کردبێت !

وەزیریش دەڵێت : کوا .. بیهێنە !

دەڵاڵیش کەمێ ون بوو . کە هاتەوە (کەنیزەك)ێکی ...جوانی قەد باریکی.. ڕێك پۆشی پێ بوو. ناسك و ڕەوان . دەتووت ئەم شیعرە بۆ ئەو وتراوە :

خوای عەرش شۆخی و باڵای پێداوە قسە و کردەوە و ڕەوشت پاراوە

ئاسمانی ژیریی حەوت ئەستێرەیە چۆن وەسفی بکەیت.ئاوا ڕەخساوە

وەزیر زۆر بە دڵی بوو بۆیە پرسیی : بایی چەندە؟

دەڵاڵەکەیش وتی :

بایی (١٠) هەزار دینارە .. هەرچەند بایی ئەو پارەیە ، هەر خواردن و جلوبەرگی نایاب و کرێی مامۆستایانی بووە . ئێستا ئەم کەنیزەکە ڕێزمانی عەرەبی وراڤە کرنی قورئان و بنەماکانی شەرع شارەزایە و خۆشنووس و (موسیقا ژەن)یشە .

وەزیر وتی :

خاوەنەکەیم بۆ بێنە .

خاوەنەکەی کابرایەکی ، دنیا دیدەی تاڵ و سوێری چەشتوو بوو. ئەم شیعرە بەودا هەڵ درابوو:

زەمانە زۆری .. ڕاچڵەکاندووم بەرگە ناگیرێ و پشتی شکاندووم

بەبێ ئاگایی ڕێگای خۆم دەبڕی ئێستا بە ئاگام .. بۆیە دانیشتووم

وەزیریش بە خاوەنەکەی وت :

(١٠٠٠٠) دینارت پەسەندە .. بۆ نرخی ئەم کەنیزەکە .کە بیفرۆشیت بە سوڵتان محمد سلێمان ؟

خاوەنەکەی وتی : مادام بۆ( سوڵتان)ە ، پارەشم نەداتێ .. هەر پەسەندمە !

فەرمانیدا زێڕیان بۆ کێشانە کرد و پێی دا...

دەڵاڵە هاتە پێش و وتی :

ئەگەر گەورەم .. ڕێم بدات قسە بکەم .

وەزیر وتی : چیت هەیە ... بیڵێ ؟

ئەویش وتی :

لام وایە ئەمڕۆ ئەم کەنیزەکە نەبەیت بۆ سوڵتان باشترە . چونکە لە سەفەرگەڕاوەتەوە و ماندووە و کەمێك ناساغە ! (١٠) ڕۆژێـك .. بـا لای خـۆت بێـت . دواتـر لـە گـەرماو خـۆی بشوات و جلوبەرگی جوان لەبەر بکات و بیبەیت .. بۆ تۆ باشترە .

( وەزیر) قسەی ئەم کابرایەی پەسەند کردو بردی یەوە بۆ ماڵی خۆیان . ژووریکیان بۆ تەرخان کردو هەموو پێداویستیەکیان بۆ دەستەبەر کرد. ماوەیەك بەم شێوەیە بوو. ( فەزڵ )ی خاقانی وەزیرکوڕێکی تـووڕەی زۆر شـۆخ و شـەنگی هـەبوو .. ڕۆژێکیـان ئـەم ( کەنیزەك )ە ، خۆی دەکات بە گەرماوی کۆشکدا و کە دێتە دەرەوە و بەرگی نایابی لە بەردا دەبێت و هێندەی تر قەشەنگ و جوان دەبێت . دەیەوێت سەردانی ئاغاژنی بکات . دەچێتە ژوورەکەی و دەستەکانی ماچ دەکات . ئاغا ژنیشی پیرۆزبایی خۆشتنەکەی لێ دەکات و دواتـر بە کەنیزەکەکانی خـۆی دەڵێـت : هەسـتن بـا ئێمـەیش بـچینە گـەرماو و فـەرمان بـە دوو کەنیزەکی منـداڵیش دەدات ، کـە چـاودێریی ( ئـەنیس ) بکـەن و مـەهێڵن کـەس بـچێتە ژوورەکەم و ئەنیس ببینێت . ژنی فەزلی خاقانی لە گەرماودا بوو و نورالدین ی کوڕی هات و هەواڵی دایکی پرسی . دوو کەنیزەکە منداڵەی یاوەری ( ئەنیس ) تێیان گەیاند کە دایکی لە گەرماودایە . ئەوان لەم وتو وێـژەدا بـوون ، ئـەنیس لـە درزی دەرگـاوە ڕووانیـی کوڕێکی شۆخ و شەنگ و هەر دڵێ سەد دڵ حەیرانی دەبێت . بدرالدینیش لای کردەوە ، ئەنیسی لـە ژوورەکەی دایکیـدا بینـی . حـەیرانی بـوو . بـۆی چووە ژوورەکەوە و لێی پرسی تـۆ ئـەو کەنیزەکەیت کە باوکم بۆ منی کڕیویت ؟ ئەویش وەڵامی دایەوە ، بەڵێ . ئەمجا لە ئامێزی گرت و ماچی کرد . دواتر کاری خۆی لەگەڵیدا کرد . کوڕە لـە ترسـانا مـاڵ بـەجێ دێڵێت و کەنیزەکانی تر دەیکەنە هات و هاوار .

خاتوونی دایکی کوڕە دەپرسێت :

ئەرێ ... ئەم هاوار هاوارە چی یە !؟

( ئەنیسی جەلیس ) بینی ، کەنیزەکەکان دەم و چاوی کەنیزەکەکە پاك دەکەنەوە . زۆر ترساو خەمی بوو . کە ئەگەر باوکی نورالدین ئەمە بزانێت سەری دەبڕێت! تـا لـەم کاتـەدا وەزیر هاتە ژوورەوە هەواڵەکەی پرسی و ژنەکەی پێی وت :

بڵێ بە خوا ... گوێم لێ دەگریت !

ئەویش وتی : بڵێ .. باشە .

هەواڵی کوڕەکەی پێدا ! زۆری پێ ناخۆش بوو.

یەخەی خۆی دادڕی وتفی لەریشی خۆی کردو وتی:

ئیتر ناتوانین ، بیبەین بۆ سوڵتان . چونکە دەستی بۆ بردووە .

ژنەکەیشی وتی :

بێخەم بە .. خۆم (١٠٠٠٠) دیناری نرخەکەیت دەدەمەوە .

مێردەکەیشی وتی :
ئەگبەت ، خەمی پارەکەیم نی یە ... خەمی ئەوەمە سەرو ماڵم تیا بچێت !
ژنەکەی پرسیی : ئەیەڕۆ .. چۆن شتی وا دەبێت ؟
پیاوەکەی وتی :
ئەی تۆ نازانیت ، ( مەعین )ی وەزیر ، بە دوامانەوەیە ؟
هەر کە ئەمە ببیستێت دەڕواتە لای سوڵتان و پێی دەڵێت :
ئەی سوڵتان ئەوەش ، وەزیرە خۆشەویستەکەت ( ۱۰۰۰۰ ) دینارت پێدا کەنیزەکت بۆ بکڕێ . ئەوەتا...کڕیویەتی ، بەڵام هەڵی گرتووە بۆ خۆی! کەنیزەکەکە لە ماڵی خۆیدایە.. دیارە ( سوڵتان )یش دەڵێت : درۆ دەکەیت .
( مەعین )ی وەزیریش دەڵێت :
ڕێگام بدە ، با هێرش بکەمە سەر ماڵی و کەنیزەکەکەت بۆ بێنم .
ئەوسا.. دێت و کەنیزەك دەبات و لای سوڵتان دەڵێت :
گەورەم ، هەمیشە ئامۆژگاری چاکی بەڕێزتان دەکەم . بەڵام بەختم نی یە و دەمکەنە گاڵتەجاڕی خەڵك و ڕۆحم دەردێنیت .
ژنەکەی دڵی دایەوە و وتی :
خوا یار و یاوەر بێت ... کەس نازانێت .
وەزیریش بەم قسەیە ، ئارام بووەوە....
ئێستاش وەزیر بەجێ دەهێڵین و دەچین بۆ لای نورالدین عەلی . ئەویش لە ترسی باوکی ڕۆژانە ، لە ڕەز و باخێکدا خۆی ون دەکرد .. شەوانەش بە دزی باوکی یەوە ، دەهاتەوە و لێی دەنووست . بەیانیانیش زوو ماڵی جێ دەهێشت ! دەچووە ناو ڕەزەکەوە..!! یەك مانگ خۆی پیشانی باوکی نەدا.
ڕۆژێکیان دایکی بە باوکی وت :
بەقوربان ..دەبێت لەبەر کەنیزەکێك کوڕەکەمان بکوژین !؟ گەر ون بوونی کوڕەکەمان درێژە بخایەنێت.. ئەوا تەرە دەبێت !!
باوکی کوڕە وتی : چارە چی یە؟
خۆت لە ماڵەکەدا بشارەوە هەر کە هاتەوە ماڵ ..بیگرە و ئاشتی بکەرەوەو کەنیزەکەکەی لێ مارە ببڕە.... مەرج بێت ، پارەی کەنیزەکەکەت بدەمەوە .
وەزیر چاوەڕوانی شەوی کرد . هەر کە نورالدین هاتەوە ... گرتی و ویستی هەر سەری ببڕێ !
دایکی فریای کەوت و لێی پرسی : ئەوە چی لێ دەکەیت ؟
ئەویش وتی : سەری دەبڕم .

نورالدین وتی : جا ... دەستت تێم دەچێت ؟
چاوانی باوکی پڕ فرمێسك بوون و وتی :
کوڕەکەم چۆن خۆم و سامان وموڵکی منت هێندە بەلاوە سووك بوو... ئەم کارەت کرد!؟
منداڵەیشی وتی :
گوێ بگرە ...لەم شیعرە :

لێبوردن ، کاری گەورەپیاوانە    کە بەخشندەبوویت ڕەوشتت جوانە
دوژمن سەرشۆڕ بێ چی پێ دەکرێ    لێبووردەیش ئاوا باڵا و لە بانە

وەزیر کە لە سەر سنگی چۆکی دادابوو، هەستایەوە و وتی :
کوڕەکەم دە.. بڕۆ ئەوا لێت خۆش بووم .
کوڕەکەی دەستی باوکی ماچ کرد .
باوکیشی وتی :
کوڕم بەزانیایە لەگەڵ ( ئەنیسی جەلیس) باش دەبیت ، هەر زوو پێشکەشم دەکردی .
نورالدین وتی :
بابە گیان ... ئاخر چۆن بۆی باش نابم ؟
باوکە وتی :
ئەوە ڕێنماییت دەکەم .. ئەلێی بدە .. نە ژنی بە سەر بهێنە ... نە بیفرۆشەوە .
کوڕەیش وتی : سوێند دەخۆم ... ئەژنی بەسەر دێنم ، نە دەیفرۆشمەوە .
خوا کارێکی کرد ... پاشا کڕینی کەنیزەکی بیر چووەوە . هەر چەند ( مەعین )ی

وەزیر پێیشی زانی . بەڵام ، دەیزانی ( خەلیفە ) ئەو وەزیرەی زۆر خۆش دەوێت .. نەی دەوێرا هەواڵەکە بە خەلیفە بڵێت و ساڵێك بە سەر ئەم کارەدا ڕۆیشت ...
ڕۆژێکیان ( فەزڵ )ی وەزیر لە گەرماو دێتە دەرەوە...ئارەق دەکاتەوە و سەرمای دەبێت و لە جێگادا دەکەوێت . نەخۆش کەوتنەکەی درێژەی کێشا . زەرد و لاواز بوو .
نورالدین ی کوڕی بانگ کرد و پێی وت :
کوڕم .. ئەوە بزانە کە ڕۆزیی و بژێوی لای خوایە .. مردنیش بە بێ : پێچ و پەنایە .. هەموومان دەمرین! ئاواش لاوانی یەوە :

تەنیا خوا نەبێت هەموومان دەمرین    لە گۆڕستاندا ، جێگایەك دەگرین

کوڕەکەم وەسیەتم ئەوەیە .... خواپەرستی بکە . هەمیشە بیرت لای ئەنجامی کارەکانت بێت . پەزێرایی ( ئەنیسی جەلیس )ی کەنیزەك بکە .
نورالدین یش وتی :
بابە گیان ..خۆ من بە نزا و پاڕانەوەی مزگەوت و میحراب ناسراوم ! خێرکەرێکی

باشیشم !

باوکیشی وتی : خوا لێت وەربگرێت .

شایەتمانی هێنا و گیانی دەرچوو . ئیتر( کۆشك ) پڕ بوو لە گریان و هاوار و فیغان. هەواڵ گەیشتە خەلیفە و ناو شار.. لاوان .. پیران ..منداڵان بۆی گریان. پیاوانی دەوڵەت ..ناسراوانی مەملەکەت ، ئامادەی ڕێ ورەسمی ناشتنی بوون .

دارەمەیتیان هێنایە دەرو ئەم شیعرەی بۆ وترا:

پێنج شەمەبوو ، لە هاوڕێیان دابڕام — شۆردمیان و لە سەر تەختەیەك نرام
بەرگی پۆشتەی ئێرەیان داکەندم و — بە بەرگێکی سادەوە ، بە ڕێ خرام
ژێر دارەمەیت کەوتن و خۆمی تیابووم — بەرەو مزگەوت : بە گریانەوە برام
هاوڕێیان و خۆشەویستانم هەموو — لەپێغەمبەر: سلاواتیان بۆ دەدام
لەگۆڕستان ، جۆرێ لە گۆڕیان خستم — جارێکی دی کەسێ نەدا لە دەرگام

ناشتیان و هەموو گەڕانەوە . نورالدین دڵی پڕ بوو .

دەستی کردە گریان و وتی :

وا بەم ئێوارەی ئەم پێنج شەمەیە — ڕۆیشتی و خەمت هەر بۆ ئێمەیە
کە تۆ ڕۆیشتیت بەختیشمان تۆرا — دڵیشمان کەیلی هەر ئەم خەمەیە
گیانمان قالۆرە و دڵمان : ویرانە — ویژدانیش چەشنی ..مامەخەمەیە!
چاوانم کەوا : نوقمی فرمێسکن — گوێچکەشم کەڕی: ئا ئەم بـــەزمەیە

ماوەیەکی زۆر نورالدین خەفەت باری باوکی بوو.... ڕۆژێکیان لە دەرگای ماڵیان دا. هەستا و چوو کردیەوە. بینی یەکێك لە هاوڕێیانی باوکی بوو .

کەمیوان دانیشت دەستی ماچ کرد و وتی :

گەورەم .. ئەوەی کوڕی وەکو تۆی لەدوا جێ بمێنێ : نامرێت ..! دنیا بۆ پێغەمبەر ( د.خ) نەما. بۆ خەم لە دڵی خۆت دەرناکەیت ؟

ئەمیش .. ژووری میوانی کردەوەو کەمێ ئاڵوگۆڕی تێداکرد . هاوڕێ و نزیکانی لێ کۆبوونەوە. کوڕەش کەوتە خێر و چاکەکردن .

ڕۆژێکیان ڕاوێژکارەکەی پێی وت :

گەورەم نەت بیستووە ، ئەو کەسەی پارەو سامانی تەخشان و پەخشان بکات : لە هەژار بوونەوە نزیك دەبێتەوە !؟ شاعیرێك وتویەتی :

دەست بە سامانی خۆمەوە دەگرم — چەکە و بەرگری پێ دەکەم لە خۆم
چۆن دەبێت ناحەز سامانم بخوات؟ — بەختیاریم بڕوا و نەگبەتی بێت بۆم؟
بە سامانی من تێر و تەسەل بێت — ڕێ نەدات خۆیشم پوولێکی بخۆم
پارەو سامانم نادەمە کەسێك — سپلە و بۆ تەماع بکات هاتووچۆم

تا پێنج درههمم بێ خەرج نەكات        تەنیا درهەمێك خەرج نەكات بۆم !
ئای .. لە رسوایی خەڵكی بێ پارە!        نەبوو وهەژاربووم  سووك ودەستەمۆم
گەورەم : ئەم خەرجی و بەخشیشەی تۆ هەژاری دێنێ .
نورالدین یش وتی :
ئامۆژگاریەكانت ، نابیستم . چونكە: بزانە ئەم شاعیرە چی وتووە.
دەستم گرتەوە و بەخشندە نەبووم        نە سەر ئەژنۆم چووم نە دەست بڵندبووم
كێ بە رەزیلی گەورە و پیاوچاك بوو؟        بە بەخشندەیش كەسێك تیا نەچوو
گەر رێزی نەمەكی منت بوو خەمی خوانی ئێوارەی منت نەبێت .
راوێژكارەكەی لێیدا و رۆیشت .. نورالدین یش درێغی نەكرد لەخۆشی یەكانی ژیانی . هەر میوانێكی
بی وتایە  ئەم شتەی ماڵت زۆر جوانە .
پێی دەوت : پیرۆزت بێت بیبە !
یان میوانێك بیوتایە :
فلان خانووتان خۆشە !
دەیوت :
وا بەدیاری پێم دایت . بەیانی و ئێواران ماڵی بە میوان پڕ بوو !! ساڵێكی بەم جۆرە بردە سەر.
رۆژێكیان ( ئەنیسی جەلیس ) هات و ئەم شیعرەی بۆ خوێندەوە :
رۆژانی خۆشت كە بەسەردەبرد        نەترسای قەدەر، چیت بە سەر دێنێ
شەوانی خۆشی، وا فریوی دایت        پێت وابوو، هەرگیز لێت ناشێوێنێ
كە لە خوێندنەوەی  شیعرەكە بووەوە ، لە دەرگا درا.
نورەدین پرسیی : ها.. خێرە ؟
راوێژكار وتی :
گەورەم ئەوەی كە دەمێكە لێی دەترسام روویدا...!
ئەویش وتی :  چـــــۆن ؟
ئەمیش وتی :
ئێستا بایی (١) درهەم ، سامانی تۆ لە ژێر دەستمدا نییە !!
ئەمەش دەفتەرەكانی پارە و موڵكەكانت .
نورالدین ، سەری داخست و وتی :
لاحول و لا قوة الا بالله العلی العظیم .
یەكێك لەو میوانانەی كە لەگەڵیدا دەرگای كردەوە ، گەڕایەوە ناو میوانانی ژوورەوە

وپێی وتن :
نورالدین ئیفلاسی کردووە ! ئێمە چی بکەین باشە؟
نورالدین یش گەڕایەوە ناو میوانەکانی و ڕەنگی تێك چووبوو...!
یەکێك لە میوانەکانی هەستا و وتی :
بەڕێز ڕێگەم بدە ، من دەڕۆم .
نورالدین یش وتی :
جا بۆچی پەلە دەکەیت !؟
ئەویش وتی :
ژنەکەم لەسەر منداڵ بوونە ! دەمەوێت ، ئاگام لێی بێت . من خواحافیزیم لێ کردن .
میوانێکی تر هەستا و وتی :
بە یارمەتیتان . براکەم ، کوڕەکەی بۆ گەرماو دەبات ، دەبێت بڕۆم بۆ لای .
هەر یەکە و بە بیانوویەكماڵیان چۆڵ کرد و هەر خۆی مایەوە .
ئەویش ئەنیسی جەلیسی بانگ کرد وتی :
ژنەکە ئاگات لێ یە ... چیم بەسەر هات !؟
ئامۆژگاری ڕاوێژکارەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە و ژنەکەی پێی وت :
چەند شەوێك لەمەوپێش ویستم پێت بڵێم !
بەڵام تۆ ئەم شیعرەت وت :

دنیا پێی بەخشیت سامان و پارە    زوو بیبەخشەوە کوڕە هاوارە!
بەدەست بڵاوی سامان کەم ناکات    نەبوونییش دەڕوا و خەمی دواجارە

گوێم لەم شیعرە بوو بێ دەنگ بووم .
نورالدین عەلی وتی :
ئەنیس گیان خۆ من ئەو سامانەم بۆ دۆست و هاوڕێیانم خەرج کردووەو ئەوان ، منیان هەژار خست . بڕوا ناکەم پشتم تێ بکەن .
ژنەکەی وتی :
بەخوا چاوەڕێی هیچیان لێ مەکە !
نورالدین یش وتی :
بەو خوایە دەبێت بچم لە دەرگایان بدەم : بەڵکو سەرمایەیەك پێکەوە بنێم و بازرگانی پێ بکەم  و واز لە یاری و ڕابواردن بێنم .
(١٠) هاوڕێی لە گەڕەکێکدا بوون . کە گەیشتە ئەو گەڕەکە ، لە یەکەم دەرگای دا، کەنیزەکێك دەرگای لێ کردەوەو پرسی :  کێیت ؟
ئەویش وتی :

بەڵێ نورالدین عەلی یە. دەستەکانت ماچ دەکات و چاوەڕێی یارمەتی و پیاوەتیتە !
کەنیزەکە چوو و ئەو قسەیەی گەیاند و هاوڕێکەی لەوەڵامدا پێی وت :
برۆ.. بڵێ لە ماڵ نی یە .
نورالدین بە خۆی وت :
ڕەنگە ئەم هاوڕێ یەم نەبوو و هەژار بێت ..با بچم بۆ لای ئەوانی تر، خۆ.دەوڵەمەندیان هەر تێدایە.
لە دەرگای دووەم هاوڕێی دا. ئەویش هەمان وەڵامی بوو .
ئەمجا ئەم شیعرەی لەبەرخۆیەوە وت :
لەدەرگای خەڵکی مەکە(دق الباب)
گۆشتی خۆت بخۆ.نە منەتی قەساب (٤)
دەبێت هەموویان تاقی بکەمەوە، ڕەنگە یەکێکیان، باش بێت و جێی هەموویان بگرێتەوە !
لە دەرگای هەموو هاوڕێکانی دا. کەسیان دەرگایان لێ نەکردەوە و لەتێك نانیان نەدایە..!
ئەویش بەم جۆرەی خۆی لاواندەوە :
مرۆڤ هەروەکو داری بە بەرە تابەری هەبێت ، ئەرکی لە سەرە
کەبەری خورا:بێکەس دەمێنێ بەڵا لێی دەدا و نەخۆشی : خۆرە
تف لە دۆستانی ئەم زەمانەیە بۆچاکی لە ( سەد) یەکێکی زۆرە !
بە پەژارەیەکی زۆرەوە گەڕایەوە ، لای کەنیزەکەکەی .
ئەویش پێی وت : بە قوربان... ئەم وت.. بێ سوودن !؟
نورالدین لە وەڵامدا وتی :
ئەرێ بەخوا.. یەکێکیان خۆی پیشانم نەدا...!
ژنەکەی وتی :
ئەزانی چی دەکەیت !؟ شتومەکی ماڵ بفرۆشە . تاکو: خوا دەرووەکمان لێ دەکاتەوە .
دوای ماوەیەك ... شتومەکی ماڵیش کۆتایی پێ هات .
نورالدین رووی لە کەنیزەکی ژنی کرد و پرسیی :
لەمەودوا چی بکەین !؟
ئەویش وتی :
وەرە بمبە بازاڕ و بمفرۆشە . خۆت ئاگاداریت..کاتی خۆی باوکت بە (١٠٠٠٠)دینار منی کڕیوە ! گەر زەمانە رووی تێ کردیتەوە ئەوا بە یەك دەگەینەوە.
نورالدین یش وتی :
ئەنیس گیان .. ئاخر یەك سەعات بێ تۆ هەڵناکەم !

---

(٤) ــ پەندێکی پێشینانی کوردی یە و شیعری پیرەمێرد ........................ وەرگێڕی کوردی

ئەنیسی جەلیس یش وتی :

گوڵەکەم منیش هەر وەکو تۆم ... بەڵام چارە نی یە!

دواتر ئەم شیعرەی وت :

ناچاریی کردەی وات پێ دەنوێنێ          سەرجەم ژیانت لێ دەشێوێنێ

زەمانە دەورت وا لێ دەگۆڕێ          خۆت سەرت لە خۆت پێ سوردەمێنێ!

نورەدین هەستایە سەر پێ .. فرمێسك لە چاوانی دەباری و کەوتە خۆ لاواندنەوە :

هەستە بت بینم ، تا دانەبڕاوی          تۆ تاسەی دڵ وجەرگی بڕاوی

گەر ئەرکە بۆ تۆ ڕێم بدە گیانە          بکەومە بەر پێت بە سەر بڕڕاوی

بردی یە بازاڕی کۆیلە فرۆشان و دایە دەست دەڵاڵەکە و پێی وت :

حاجی حەسەن .. ڕێزی ئەم کەنیزەکە بزانە !

ئەویش وتی :

گەورەم .. ڕێ و ڕەسم پارێزراوە ، خەمت نەبێت .

ئەمجا پرسیی :

ئەمە ئەو کەنیزەکە نی یە کاتی خۆی باوکت بە (١٠٠٠٠) دینار لەمنی کڕی ؟

نورالدین یش وتی : خۆیەتی .

دەڵاڵەکە ، مەزادەکەی دواخست تاکو بازرگانان و دەوڵەمەنـدان پەیدا بوون و بازاڕیش سـیخناخ بـوو، بـە کـەنیزەکانی ( تـورك)ی و( چـەرکەس)ی و(حەبـەش)ی و( ڕۆم )ی و( تەتەر)ی و(جۆرجیا)یی .

هەستا و دەستی پێکرد :

*ئەی بازرگانان... دەوڵەمەنـدان ! هەموو ( گۆ )یەك .. (گوێز) نـی یـە..!! هـەموو.. درێژ کۆلەیەکیش (مۆز) نـی یـە..!! هـەر (سـوورە) یـەکیش .. (گۆشـت) نـی یـە..! هـەموو (سپی )یەکیش (دووگ) نی یە! ئەم ( مرواری ) یەم هەیە.... ئەوەڵ مەزاد.*

بـــازرگانێك وتی :

(٤٠٠٠) دینـار لـە سـەر مـن. یـەکێکی تـر(٤٥٠٠) دینـار. (مـەعین)ی سـاوی وەزیـریش لەوێ ئامادەبوو.

نورالدین عەلیی بینی بە خۆی وت :

بڵێی هات بێت .. بۆ کەنیزەك کڕین !؟

سەیری دەڵاڵەکەی کرد و لە دڵی خۆیدا وتی :

ئێستا بۆم دەرکەوت .. ئەمە ئیفلاسی کردووە و( ئەنیسی جەلیس)ی دەفرۆشێت ..!

حەسەنی دەڵاڵی بانگ کرد ، ئەویش هات و کڕنووشی بۆ برد .

( مەعین ) پێی وت :

حەسەن ئەم کەنیزەکەم دەوێت و پرسی نرخەکەی کرد.

دەلالیش وتی :

مەزادی گەیشتووەتە (٤٥٠٠ ) دینار.

( مەعین ) وتی :

بە ئەو (٤٥٠٠ ) دینارە لە سەر من .

دەوڵەمەندان کە ( مەعین )ی وەزیریان بینی : نەیان وێرا... زەم بکەن و نرخەکەی زیاد بکەن . بلاوەیان لێ کرد.

( مەعین ) بە دەلالەکەی وت :

لەسەر چی وەستاوی ؟ برۆ.. پرسی خاوەنەکەی بکە و(٥٠٠ ) دیناریش بۆ تۆ .

دەلالیش بە نورالدین ی وت :

گەورەم .. کەنیزەکەمان بە خۆڕا لە دەست چوو .

ئەویش پرسیی : بــــۆ !؟

دەلالەکە پێی وت :

ئەو مەعینی ساوی یە زاڵمە .. بە بازاڕەکەدا، رەت بوو . بۆ نەگبەتی..کە کەنیزەکەکەی بینی، بە دڵی بوو..دەشزانێت خاوەنەکەی ( تۆ )یت . قوربان ئەگەر : هەر ئێستا کاش پارەکەی دا.. ئەوا زۆر باشە . گەر کاغەزێکی دا.. تیا نووسرابوو (٤٥٠٠ )دینار بدەنە هەلگری ئەم کاغەزە.. ئەوا هێندە دەچێتە لای ، راوێژکارەکەی و دەڵێت : سبەینێ . هێندە دەت هێنێ و دەتبات ، بێزار دەبیت و کاغەزەکەت لە دەست دەردێنێ و دەی دڕێنێ ! تا .. کەنیزەکەکەت لەدەست دەردێنێ !

نورالدین عەلی ش لێی پرسی :

ئەی چارە چی یە ؟

دەلالەکە وتی :

ئامۆژگاریەکت دەکەم ، بەجێی بێنە ..گەر بەختت بوو. ئەوا...رزگارت دەبێت .

ئەویش وتی : چــۆن ؟

دەلالەکە وتی :

لەو کاتەدا ... من بانگەواز دەکەم : ئەم کەنیزەکە بە (٤٥٠٠ ) دینار تۆ لێم وەرە پێش و زللەیەك لە کەنیزەکەکەت بدەو بڵێ ئەوە سوێندم لێت خواردبوو. کە بتخەمە .. مەزاردەوە ! بۆ ئەوەی سوێندەکەم نەکەوێت تۆم هێنایە ئێرە..! قۆڵی بگرەو بە کێشی بکەو لەگەڵ خۆت بیبە ! چووەوە ناو خەڵکە و دەستی پێکردەوە .

دواتر بە ( مەعین )ی وەزیری وت :

گەورەم .. ئەوە خاوەنەکەی هات .

نورالدين كەنيزەكەكەی لەدەست دەلاڵەكە دەرهێناو زللەیەكی لێداو پێی وت :
نەگبەت .. ئەوەش بۆ ئەوەی سوێندەكەم نەكەوێت . تۆم خستە مەزادەوە ! ئەگەر نا
هەر شتومەكی ماڵ بفرۆشم چەند هێندەی تۆ پارە وەردەگرم و بۆ پارەی نرخی تۆ پەكم
نەكەوتووە .

كە( مەعين ) ئەمەی بيست وتی :

داماو...بۆ هيچ لە ماڵەكەتدا ماوە تاكو بيفرۆشيت !؟

( مەعين ) ويستی نورالدين بشكێنێت و لە ناوی ببات . خەڵكەكە كە نورالدين يان
بينی ، چونكە خۆشيان دەويست . لێی كۆبوونەوە .

نورالدين پێی وتن :

خەڵكينە .. ئەوە بە چاوی خۆتان زوڵم و زۆری ئەم وەزيرە دەبينن .

( مەعين )يش هەڵی دايە :

بەو خوايە .. لەبەر ئێوە نەبووايە : هەر ئێستا دەمكوشت .

خەڵكەكە ئيشارەتيان بۆ نورالدين كرد . كە لێی بدات . هەر بۆيە ... بۆی چووە پێش .
خۆيشی پياوێكی بەهێز بوو . وەزيری لە سەر زينی هێسترەكەی راكێشايە خوار و دای بە
زەويدا . كەوتە ناو : (پێ خوێ) يەك : قوڕی گيراوەوە ! ئەمجاكەوتە مشتەكۆڵە لێدان .
مشتێك پووشی كورتانی كردە دەمی يەوە . خوێن بە ريشی دا هاتە خوارەوە . كاكی وەزير
(١٠) خزمەتكاريشی لەگەڵ بوو.. ئەمەيان بينی كە بە سەر وەزير هاتووە . دەستيان برد بۆ
شمشێرەكانيان ويستيان پەلاماری نورالدين بدەن .

بەڵام خەڵكەكە نەيان هێشت و بە خزمەتكارەكانيان وت :

يەكێكيان وەزيرە ... ئەوی تريش كوڕە وەزيرە ! نەبادا .. دوايی ئەوان ئاشت ببنەوە،
ئێوە : پياو خراپ دەربچن ! يان لێتان بكوژرێت ... بۆيە وا چاكە ..كڕ بن و هيچ نەكەن .

نورالدين دەستی كەنيزەكەكەی گرت و بەرەوماڵەوە .( مەعين )يش بەرگەكەی بەری
سێ رەنگ بوو بوو. سوور و خۆڵ وخۆڵەمێشی .

كە ئەمەی بەخۆيەوە بينی . يەكسەر بەرەو ماڵی خەليفە بووەوە.

كە گەيشتە بەر دەرگايان دەستی كردە هاوار و وتی :

فريام بكەون ، كوشتووميان . دەرگاوان بردی يە بەردەمی خەليفە..

وەزير بە گريانەوە ئاوا خۆی لاواندەوە :

لێم دەن لەسايەی حوكمی بێ خێرا    با گورگ بمخوا. لە سايەی شێرا
خەڵكی پاراوی كانی و ئاوت بن    منيش لە سايەت. بە تينوو كوێرا

وتـــی :

قوربان .. ئاوا: دەبێت هەر كەسێك ، پەزێراييت بكات ، وەكو منی بەسەر بێنن !؟

خەلیفەش وتی :
خێرائە ڕێزی تۆ... ڕێزی منە و پێم بڵێ.. کێ وای لێ کردوویت !؟
(مەعین)ی وەزیریش وتی :
ئەمڕۆ چوومە بازاڕی کەنیزەکان تاکو دانەیەکی چێشت لێنەر بکڕم . کەنیزەکێکم بینی. هێندە جوان بوو ، لە وێنەیم نەدیبوو. ویستم بۆ بەڕێزتانی بکڕم !
لە دەلاڵەکەم پرسی :
کە هی کێ یە ؟
ئەویش وتی :
عەلی فەزڵی خاقان خاوەنێتی . کە کاتی خۆی (١٠٠٠٠) دینارت دابوو، بەباوکی تاکو کەنیزەکێکت بۆ بکڕێت . باوکیشی کە ئەم کەنیزەکەی کڕی بوو، زۆری لەلای جوان و نایاب بوو. بۆیە هەڵی گرتبوو بۆ خۆی و دابووی بەم کوڕەی . ئێستاش کوڕەکەی ئیفلاسی کردووە و شتومەکی ماڵی هەمووی فرۆشتووە . ئەمڕۆ ئەو کەنیزەکەی هێنابووە مەزادخانە . تاکو بیفرۆشێت. دەلاڵ خستبووی یە مەزادەوە . نرخی کەنیزەکەکە گەیشتە (٤٠٠٠) دینار .
منیش سێ و دوویەکی خۆم کرد و بە خۆم وت :
ئەم کەنیزەکە بۆ ( سوڵتان )ی گەورەی خۆمی دەکڕم .
دەلاڵەکەم بانگ کرد و پێم وت :
لەسەر من بە (٤٥٠٠ ) دینار.
کەچی پێی وتم :
پێری شووم بە ( جوولەکە ) و ( نەسرانی) دەفرۆشم و نایدەم بە تۆ...!
منیش وتم : کاکە گیان بۆ خۆمم نی یە .. منیش بۆ سوڵتانی بەڕێزی دەکڕم !
کە ئەمەیان بیست لێم هاتنە پێش و لەسەر قەڵپووزی زینەکەیان خستمە خوارەوە .. ئا بەم ڕیشە سپی یەوە . ئەمەندەیان مشتەکۆڵە لێدام .. تاکو ئاوایان بەسەرهێنام . ئەمجا خەلیفە تووڕە بوو...
ئەویش هەستایە سەر پێ و نەڕاندی :
چەکداران کوان ؟ هەر خێرا (٤٠ ) کەسی شمشێر بەدەست ئامادە بوون .
سوڵتان فەرمانی پێدان :
بچن ماڵی عەلی( فەزڵ)ی خاقان .. داگیر بکەن وخۆی وکەنیزەکەکەی هەتا ئێرە بە کێش بکەن .
ئەوانیش وتیان : فەرمایشتە .
ئەمجا بەرەو ماڵی نورالدین عەلی بوونەوە . لە نێو ئەو چەکدارانەی خەلیفەدا ( علم الدین سنجر) هەبوو. ئەو پیاوە کاتی خۆی کۆیلەی باوکی نورالدین علی بوو. خۆی پێ

ئەگیراو لە نێوان چەکدارەکاندا خۆی دزی یەوە و بە سواریی کەوتە غار کردن بەرەو ماڵی نورالدین عەلی . کە گەیشت (نورالدین عەلی) بەخێرهاتنی کرد .

ئەویش وتی :

کاتی جۆنی وچاکی نییە! گوێ بگرە : خۆت رزگار بکە .

گەورەم هەرکاتێ ئەگەر ترست بوو — کەی ماڵ و سامان خەم وکۆستت بوو

لە جێی سامان و ماڵ دەبێتەوە — بەڵام یەك گیان و یەك ئەفست بوو!

نوردالدین پرسیی :

عەلەمەدین، هەواڵ چییە؟

ئەویش وتی :

هەستە خۆت و کەنیزەکەکەت .. برۆن ، ئێرە بەجێ بهێڵن .. چونکە (مەعین) ی وەزیر لە لای خەلیفە بۆی تێ چاندوون . خەلیفەش (٤٠) جەنگاوەری بۆ ناردوون تاکو بتان گرن! دەستی کردە گرفانیدا(٤٠ ) دیناری پێ بوو. دایە دەستی ( نورالدین عەلی) و وتی :

هەر ئەمەندەم پارە پێ یە .. بیگرە .

ئەویش خۆی کرد بە ژووردا وکەنیزەکەکەی تێگەیاند . زۆر ترسا . ئەمجا هەردووکیان ماڵیان جێ هێشت . بەرەو دەرەوەی شار. خوا پاراستنی . رۆیشتن تاکو گەیشتنە کەناری دەریا سەیریان کرد کەشتی یەك خەریکە دەڕوات .

کەشتیەوانێك هاوار دەکات : هیچتان بیر نەچێت .

ئەوانیش وتیان : هیچمان نەماوە .

(نورالدین عەلی) چووە پێش و پرسیی :

سەرۆك گیان بەرەو کوێ؟

ئەویش وتی :

بەرەو، خانەی ئاشتی: بەغدا.

بە دڵخۆشی یەکی فرەوە، کەنیزەکەی سەرخست ، گوریسی لەنگەرخستنی پاپۆڕەکە ، کۆ کرایەوە و چارۆکە هەڵدرا...کەشتی کەوتە رێ .

هەر وەك چۆن دەڵێن :

کەشتی کەوتە رێ لەسەر ئەو ئاوە — جۆرێك خۆی دابوو، بەدەمی باوە

وەکو باڵندە ، باڵی لێك دەدا — سنگی تیژ رەوی لەو ئاوە ئاوە

کۆیلە چەکدارەکانیش ، کە گەیشتنە ماڵی نورالدین عەلی ، دەرگایان شکاند وماڵەکە گەڕان . کە کەسیان بۆ نەگیرا . خانووەکەیان رووخاند وگەڕانەوە . خەلیفە فەرمانی دەرکرد : لە هەرکوێ بن .. بیان گرن .

دوای ئەوەیش.. ( مەعین ی ساوی) وەزیر خەڵات کرا ، خەلیفە پەیمانی دایە تۆڵەی بۆ

بکاتەوە . ئەمجا جارچی بە شاردا گەڕا و هاواری لە نێو خەڵکدا کرد : هەرکەس (نورالدین علی) بگرێت و بیبات بۆ سوڵتان خەڵاتێکی باش دەکرێت (١٠٠٠ )دینار، وەر دەگرێت . هەر کەسێکیش ، نورالدین پەنا بدات ، کە گیرا، سووکایەتی پێ دەکرێت و بە هێندەی تاوانبارەکە سزا دەدرێت !!

نورالدین عەلی ش ون بوو و ژنەکەی بە بێوەی گەیشتنە شاری بەغد ا.

سەرۆکی کەشتیەکە پێی وتن :

ئەوا گەیشتینە بەغدا زستانیش کۆتابوو و بەهارە . کاتی گوڵ و گوڵزارە . سەوزن درەخت وداران . لە دامێنی رووباران ..!

نورالدین (٥) دیناری کرێی دا . دەستی ژنەکەی گرت و ڕۆیشتن . زۆری پێ نەچوو گەیشتنە رەزو باخێك و سەیریان کرد شوێنێك ئاوڕشێن کراوە . تەختەی درێژ بۆ دانیشتن دانراوە . چەند سەتڵە ئاو، هەڵواسراوە . لەو سەریشی یەوە ، دەرگای داخراوی رەز و باخەکەیە .

نورالدین بە کەنیزەکەکەی وت : بە خوا ئێرە خۆشە !

کەنیزەکەکەش وتی :

کەوابوو با سەعاتێك لەسەر ئەو تەختە رایەڵانە دابنیشین ، تاکو کەمێك بحەوێینەوە .

دەم و چاویان شت و لەسەر تەختەکان لێی دانیشتن . لەبەرئەوەی هەوا فێنك بوو ، نووستن ! رەزەکە سەیرانگایش بوو. کۆشکی نێوی مۆزەخانەی تیابوو. هاروونە رەشید خاوەنی بوو و (٨٠) پەنجەرەی هەبوو . لە ناوەڕاستی هۆڵەکەیدا ( مۆم دان )ێکی زێڕین دانرابوو ..! کە خەلیفە دڵی تەنگ دەبوو ، دەهاتە ئەوکۆشکە . هەر (٨٠) پەنجەرەکە دەخرانە سەرپشت ! فەرمان دەدرا ( ئیسحاقی کوڕی برایم )ی مۆسیقارو هەمنیشینی و کەنیزەکان بۆ گۆرانی و سەماکردن ئامادە دەبوون و ئاهەنگ سازدەکرا..

ئیتر خەلیفە دڵی دەکرایەوە . ئەم رەز و باخە باخەوانێکی هەبوو، ناوی( مام برایم) بوو . جار و بارێك کە رەز و باخەکەی جێ دەهێشت و دەچووە شار. خەڵکی دەچوونە ناو باخ و دەستکاری شتەکانیان دەکرد . ئەویش زۆر تووڕە دەبوو.

کە خەلیفە هات ، سکاڵای خۆی لای کرد .

خەلیفەش فەرمانی پێدا هەر کەسێکت لەناو رەزو باخەکەدا بینی ..چی لێ دەکەیت .. بیکە

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

## شەوی ٣٦

چیرۆکی نورالدین و ئەنیسی جەلیس و مام برایمی بلخەوان

شەهرەزاد وتی :

ئـەی پاشای بەختیار.. زیـــرەك و وشیار ..

دەبوو مام برایم بۆ کارێکی خۆی بچوایە بۆ شار..کە دەرگای رەز و باخەکەی کردەوە دوو کەسی بینی لاڵ و پاڵ لێی نووستبوون .

لە دڵی خۆیدا وتی :

ئـای نەگبەتینە .. نازانن فەرمانی شاهانەم پێ یەو بۆم هەیە ئێستا بتانکوژم .. بەڵام نەءء! ناتانکوژم و فەلاقەیەکی باشتان دەکەم ! تاکو تەمێ بین وجارێکی دی نەوێرن توخنی ئەم رەز و باخە بکەون . دارێکی تەڕی لە لق و پۆپی دارخورمایـەك کـردەوە و چووە ژوور سەریان .. دەستی بڵند کرد، پێ یاندا بکێشێت .

کەچی پەشیمان بووە و بەخۆی وت :

کورە .. کێ دەڵێت ، نـامۆ نـین بـە ئـەم ناوچـەیە ! یـان رێبـوارێکی مانـدوو و شەکەت نین..!؟ با هەڵیان بستێنم و لێ یان بپرسم .

سەری یەکێکیانی راست کردەوە ، بە خۆی وت :

ئەم ناسك و جوانە ... دەست لێنادەم ..!!

چووە سەر نورالدین عەلی ، قاچەکانی راوەشـاند .کە نورالـدین عـەلی چاوی کردەوە ، پیرێکی بـە هەیبـەتی بینی و شـەرمی لێ کـرد . خێـرا قاچـەکانی هەڵکێشایەوە و هەستایە سەرپێ و دەستی مام برایمی ماچ کرد .

ئەویش پرسیی : لە کوێوە هاتوون ؟

نورالدین عەلی وتی : نامۆین بە ئێرە !

چاوانی پڕ فرمێسك بوو .

مام برایمیش دڵی دایەوە و وتی :

پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی : کە بۆ نامۆیان چۆن بین . با بچینە ناو رەزەکە، بەڵکو دڵتان بکرێتەوە.

نورالدین عەلی پرسیی : ئاخۆ .. ئەم رەز و باخە هی کێ بێت !؟

مام برایم بۆ ئەوەی لەگەڵی بێن و سڵ نەکەنەوە وتی :

ئەم رەز و باخە لە باو و باپیرانمەوە بۆم ماوەتەوە .

ئەویش سوپاسی رەزەوانی کرد و کەنیزەکەکەی لە خەو هەستان . ئەمجا دوای مام برایم کەوتن و چوونە ناوەوە . باخ .. چ باخێك!!؟ دەرگاکەی دەتوت ، دەروازەی کۆشکە . هەموو جۆرە میوەیەکی تیابوو . سوور دەتوت یاقووتە! ترێی رەشی قەترانی . چوونە ژێر ساباتی

کەپرێك ، میوەی پێدا شۆڕ بوو بووەوە . کەناری و قومری و بولبولان دەیان خوێند . ترێی (کشمیشی) و ( سپی) و ( سەرقووڵە) و ( خۆراسانی) . ( قۆخ )ی سوور هەڵگەڕاو ، دەتوت : دەنووکی کەوە ! ( بەلاڵوك ) کە لە ژێر دانەکانیاندا دەتوایەوە ئەو ( هەنجیر )ە سوور و زەردە ئاودار و جوانە ! گوڵی بە بریسکە دەتوت مەرجانە . گوڵە ( وەنەوشە ) ئاسك و شەرمن .. لە سایەی باخدا ، وەك ( بووك )ی خرپن ، یان ( گوڵە پرژە)..( لالە) و (خوزام)ی .. زامدار بێ بینیایە سارێژ دەبوو زامی ..!!

گوڵە ( نێرگز ) و گوڵە ( کەنیزە ) یان ( لیمۆ ) : دەتوت گۆیەکی زێڕە ! بەهارە و زەوی تەڕ و پاراوە... چیمەن و گیایە و بە گوڵ رازاوە . قەڵبەزەی رووبار بە ئاوی خوڕی.... بولبول لە سایەی ئاوازی چڕی . ئەمجا مام برایم ، بردنی بۆ هۆڵە و گۆڕەپانەکەی ئاوەوە . ئەوانیش روانیان هەر پەنجەرە و ( مۆمدان )ێکی تیا دانراوە . نورالدین عەلی کۆشك و دیوەخانی جارانی خۆی بیر کەوتەوە .

ئەمجا وتی : بەخوا .. شوێنێکی خۆشە ..!

مام برایم سفرەی راخست و نانیان خوارد . دواتر دەستیان شت . نورالدین چووە بەر پەنجەرەیەك و لەوێوە سەیری دار و درەختەکانی کرد .. ئەو هەموو میوەیەی بینی ، کەنیزەکەکەی بانگ کرد .

بە مام برایمی وت :

ئەوە شەرابتان لانییە ؟ ئاخر دوای نان خواردن خواردنەوە خۆشە !؟

ئەویش چوو ئاوێکی سازگاری بۆ هێنا.

(نورالدین عەلی)ش وتی : ئەم خواردنەوەمیە ، ناڵێم !

ئەویش وتی : رەنگە مەبەستت ( مەی ) بێت ! "

ئەویش وتی : بەڵێ .

ئەمجا پیرە وتی :

خوایە .. تۆبە ! ئەوە (١٣) ساڵە لێرەم و بۆنیشم نەکردووە ! پێغەمبەر (د.خ) دروستکەر و فرۆشیار وکڕیاریشی بە نەفرەت کردووە .

نورالدین یش وتی : گوێ بگرە .

ئەویش وتی : فەرموو.

نورالدین وتی :

ئەوە دینارێك . سواری کەرەکەت ببە ، برۆ نزیك ( مەیخانە )یەکەوە و بە یەکێك بڵێ : برۆ لە ژوورەوە بایی ئەم دینارە ( مەی )م بۆ بکڕە . ئەوە خۆت نەتکڕی ! بیخە سەرپشتی کەرە و ئەوە خۆیشت هەڵت نەگرت ! (کەر)ەکە .. بێنەوە . ئەوە نە نەفرەتت بەرکەوت و نەهیچ ..!

مام برایم دەستی کردە پێکەنین و وتی :

کەسی وەکو تۆ ، سوعبەتچیم نەدیوە !

پارەکەی لێ وەرگرت و چوو ، بۆی کڕی . کە گەڕایەوە ، نورالدین زۆرسوپاسی کرد. بردی بە شوێنێك پیاڵە و جام و پێداویستی یەکانی خواردنەوەی زێڕینی لێ بوو .. بە دڵی خۆی خواردی یەوە .

پیرەش چوو ، میوەی بۆ ڕنین و چەپکێ گوڵی بۆ کردن و لەبەر دەمی نورالدین و کەنیزەکەکەدا داینا . خۆیشی لێیان دوور کەوتەوە . ئەوانیش .. هێندەیان خواردەوە ، لێویان سووڕ هەلگەڕا و شادی دایگرتن .

مام برایم ، کە لە دوورەوە ، دانیشتبوو، بە خۆی وت :

هەموو ، ڕۆژێك دوانی ئاوا لاو و شۆخ و شەنگ ، لە لات نابن .. بۆچی لای ئەوان دانەنیشم !!؟ بۆیە چووەوە لایان .

نورالدین عەلی ( پێك )ێکی بۆ کرد و وتی :

ئەمە بخۆرەوە ، تاکو تامی بزانیت !

مام برایم وتی :

پەنا بە خوا دەگرم . (١٣) ساڵە لێرەدام ، دەمم لە ( مەی ) نەداوە !

دوای کەمێك نورالدین ، خۆی لە زەویدا درێژ کرد ، وەکو ئەوەی لە سەرخۆشیدا بوورابێتەوە !

( ئەنیسی جەلیس)یش بە مام برایمی وت :

بنوارە ، چیم پێ دەکات .

مام برایم پرسیی : خاتوون ... ئەمە چیەتی ؟

ئەویش وتی :

هەموو جارێك هێندە دەخواتەوە : تاکو بەدمەست دەبێت .. ئیتر لێی دەخەوێت. منیش بە تەنیا دەمێنمەوە . کەس نابێت لەگەڵمدا ، دابنیشێت و کاتی لەگەڵدا بەسەر بەرم و گۆرانیی بۆ بڵێم .

مام برایمیش وتی : بە خوا ... کارێکی باش ناکات .

ئەنیسی جەلیس پیاڵەیەکی پڕ کرد و وتی :

ئەم قوومە بخۆرەوە و دڵم مەشکێنە .

مام برایمیش دڵی نەشکاند..! وەری گرت و هەڵیدا . دواتر دووەم و سێ یەمیشی هەڵدا... نورالدین هەستایەوە و لێی دانیشت .

ئەمجا مام برایم وتی : کەنیزەکەکەت سوێندی دام .بۆیە خواردمەوە ..!

نورالدین عەلی دەستی کردە پێکەنین و دواتر دەستیان کردەوە بە خواردنەوە .

کار گەیشتە ئەوەی مام برایم هاواری لێ هەستا : بۆچی مەی بۆ منیش تێ ناکەن ..!!؟
ئەوانیش زۆر پێکەنین .
نورالدین عەلی وتی :
ڕێگەم بدە .. با یەکێك لەم مۆمە گەورانە ، دابگیرسێنم .
ئەویش چوو ، بەو سەرخۆشی یەوە (٨٠ ) دانەی داگیرساند و ئەو ناوەی کردە چراخان .
مام برایم کە - مەست بوو بوو- وتی :
بە ڕاستی ئێوە لە من بە جەرگترن . کە دەوێرن ئاوا دایان بگیرسێنن !
شەھرەزاد ھەستی کرد شەو دەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٣٧**

شەهرەزاد وتی :

باخەوان خۆی هەستا و هەموو پەنجەرەکانی کردەوە . ئەمجا دەستیان کردە ، گۆرانی وتن و شیعر خوێندنەوە .

خەلیفە لە ناو شارەوە و لەماڵی خۆیەوە دەڕوانێتە ئەو ڕەزو باخەی کە کەوتبووە سەر کەناری دیجلە . دەبینێت چراخانە و ئەو ڕووناکی یانە لە ئاوی دیجلەدا ، بریسکەیان دێت .

فەرمان دەدات :

بچن ئەبوجەعفەری بەرمەکیم بۆ بانگ بکەن .

کە هێنایان میری موسڵمانان لێی پرسی :

سەگی وەزیران ... ئەوە (بەغداد)ت لێ داگیر کردووم ... بێ ئەوەی بە خۆم بزانم !؟

جەعفەریش وتی : ئەمە چ قسەیەکە ؟

خەلیفەش وتی :

گەر بە تەمای گرتنی بەغدا نەبیت ، کۆشکی پەیکەران ، ڕووناك و ئاوەدان .. پەنجەرەکانی کراوە نابن ! تۆ نەبیت کێ دەوێرێت ، ئەم کارە بکات ؟

ئەبو جەعفەر، چووە لای خەلیفەوە ، سەیری کۆشکی پەیکەرانی کردو وتی :

ئا.. قوربان ئەوە بیرم کەوتەوە ...ئەوە مام برایمی باخەوان پێی وتم :

فەرمانم لە خەلیفە ، بۆ وەربگرە .. با ئەم هەینی یە ، منداڵەکانم ببەمە کۆشك و ئاهەنگ بگێڕن .. ئەوە چەندین ساڵە پەزێرایی ئەم کۆشکە دەکەم.. شەوێکم پێ دەبرێت ..!

منیش ڕێم پێدان و وتم :

خۆم فەرمانتان لە خەلیفە بۆ وەردەگرم ، بۆ نەگبەتی بیرم چووەوە ، پێت بڵێم .

خەلیفەش وتی :

ئێستا ، تاوانەکانت بوو بە دوو.. یەکێکیان منت ئاگادار نەکردۆتەوە ، ئەوەی دی پارەت نەداوە بە مام برایم تا ئاهەنگەکەی پێ ساز بدات !

ئەویش وتی : قوربان.. بیرم چووا

خەلیفە وتی :

بە گۆڕی بابم ... دەبێت ئەمشەو لای ئەوان بەسەربەرین ! ئەو باخەوانە پیرێکی نوورانی روو لە خوایە ..! بەڵکو بەم کارەمان نزایەکمان بۆ بکات و خوا گیرای بکات و ببێتە مایە سوودی هەردوو دنیامان . دڵی مام برایمیش خۆش دەکەین .

جەعفەریش وتی : گەورەم .. کات درەنگ بووە و ئاهەنگەکەیان لە کۆتا بوونایە .

خەلیفەیش وتی : دەبێت هەر بچین . وەزیریش سەری لێ تێك چوو بوو و نەیدەزانی چی بکات ..!

بەسەرهاتی نورالدین و ئەنیس و بلخەوان و هاروونەرەشید

خەلیفە هاروونەرشید هەستا و جەعفەر و مەسروری خزمەتکار بە دوایدا و چوون خۆیان گۆڕی بە جۆرێکی وا کە نەناسرێنەوە . کۆڵانە و کۆڵان بە رێکەوتن بە جلوبەرگی بازرگانی یەوە و گەیشتنە دەروازەی رمز و باخەکە و بینیان دەروازە کراوەیە .

خەلیفە پرسیی :

باشە ... جەعفەر چۆن مام برایم ئەم دەروازەیەی بە کراوەیی بە جێ هێشتووە ؟

چوونە ناو باخەکەوە و بۆ بەردەم کۆشك .

خەلیفە وتی :

ئەمەوێت ، بەدزی یەوە ، سەیرێکیان بکەم و بزانم خەریکی چین ؟ خۆ .. من نە گوێم لەدەنگە ، نە نزای کەسێك ..!

ئەمجا سەیری ئەملا و ئەولای کرد و وتی :

جەعفەر ئەم دارگوێزە لق و پۆپەکانی بە پەنجەرەکانەوەیە با سەر بکەوم و سەیرێك بکەم.

خەلیفە لق بە لق بە دارەکەدا ، هەڵزنا . تا گەیشتە سەر لقێك و بەرامبەر پەنجەرەیەك و لێی دانیشت. کە سەیری کرد کوڕو کچێکی شۆخ و قەشەنگ لەوێن و پەنا بەخوا لە جوانیان !

مام برایمیش لەولاوە پیاڵەیەك ( مەی )ی بە دەستیەوەیە و دەڵێت :

خواردنەوە ، بە بێ ئاواز و گۆرانی ، خۆش نی یە .. بۆیە شاعیرێك وتویەتی :

مەی بگێڕن چوون بۆ گەورە و بچووکە لە دەستی مانگ وەری بگرن ئەو پێکە

بەبێ ستران هەڵی مەدەن بیستوومە کە ( ئەسپ )یش ئاو دەخواتەوە بە فیکە

خەلیفە کە ئەمەی بینی دابەزی و وتی :

من پیاو چاکانم بەو شێوەیە نەدیوە ..! ئادەی بۆ ئەوەی لەو ( فەرە) بێبەش نەبیت .. سەرکەوە ، سەیرێکی مام برایم بکە ..!

ئەبو جەعفەر سەراسیمە بوو!! بە دارەکەدا ، هەڵزنا . ( نورالدین عەلی) و کەنیزەکە ( ئەنیس)ی بینی پێکەوە دەخۆنەوە . مام برایمی باخەوانیش پیاڵەیەك ( مەی )ی بە دەستەوەیە ! تێگەیشت تیاچووە . بێ دەنگ جەعفەر هاتە خوارەوە بە تەریق یەوە لەبەر دەم خەلیفەدا وەستا .

خەلیفە سەیرێکی کرد و پرسی :

ئاخۆ... کێ ئەمانەی گەیاند بێتە ئێرە !؟ کێ .. ئەم دووانەی بردووەتە کۆشکی منەوە!؟ هێشتا بە (٢ ) چاوی خۆم کیژ و کوڕە لاوی .. ئاوا شۆخ و شەنگ و جوانم نەدیوە ..!!

جەعفەری وەزیر کە دەیویست ، خەلیفە تووڕە نەبێت ، وتی :

فەرمایشتە ، قوربان . با هەردووکمان سەر بکەوینەوە سەر درەختەکە تاکو سەیریان بکەین .

کە سەرکەوتن گوێ یان لێ بوو، مام برایم وتی :

ئەم ئەندێشەو ئەم خەون و ئەم سازە ... زۆر پێویستیی بە گۆرانی و ئاوازە .

( ئەنیسی جەلیس) وتی :

مام برایم ، ئەوە ئەگەر، ئامرازێکی (مۆسیقا) هەبووایە ، کۆڕەکەمان خۆشتر دەبوو.

مام برایم هەستایە سەرپێ...!

خەلیفە پرسیی : ئـاخۆ... خەریکە چی بکات !؟

جەعفەریش وتی : بەخـوا ... نازانم !

مام برایم کەمێك ون بوو، کە گەڕایەوە ( عوود )ێکی پێ بوو.

خەلیفە وتی :

ئەگەر دەنگی ناخۆش بێت ، هەموویان لە سێدارە دەدەم ! بە تۆیشەوە..!

جەعفەر وتی : کەوابوو: خوا بکات دەنگی ناخۆش بێت ..!!

خەلیفە پرسیی : بۆ !؟

جەعفەر وتی :

ئەگەر بە مردنیش بێت ، با.... لەگەڵ ئەمانەدا کۆ ببمەوە..!"

کەنیزەکە (ئەنیس) عوودەکەی لێ وەرگرت وکەمێ سەیری کرد ، کۆکی کردەوە و گۆرانی یەکی چڕی ئاسنی دەتوانەوە .. هێڕانی هۆش خۆ.. دەهێنانەوە :

کە بوون بە خەمی عاشقانەوە فرمێسك مەڕێژن بە گریانەوە

چیمان بۆ بکەن بە فیرۆ ناچێت نەکەن دەست بنێن بە روومانەوە

خەلیفە وتی :

بەخوا .. هێشتا دەنگی ئاوا خۆشم نەبیستووە !

وەزیریش لەدڵی خۆیدا وتی : رەنگە ، خەلیفە تووڕەیی یەکەی رەوی بێتەوە !

بەخەلیفەیشی وت : ئا...ئا.. دەنگی زۆر خۆشە ..!
خەلیفەیش وتی :
ئارەزوومە بچمە لایان و لە نزیکەوە ئەو کەنیزەکە گۆرانیم بۆ بڵێ !
وەزیریش کە حەزی نەدەکرد وتی :
قوربان.. رەنگە لێ یان تێك بدەین ! ئەو مام برایمە پیرەش هەر لە ترسانا: دەمرێت!"
خەلیفەش وتی :
کەواتە : فێڵێکم بۆ بدۆزەرەوە ، بۆ چوونە ژوورەوە .جۆرێك ئەوان نەم بینن !
بەرەو دیواری ئەو باخەی کە بە سەر رووباری دیجلەدا دەڕوانی ، چوون . ماسیگرێکیان بینی بە سەر بەلەمەکەیەوە ، لە ژێر پەنجەرەکانی کۆشکدا .. راوە ماسی دەکات . کاتی خۆیشی خەلیفە لە مام برایمی باخەوانی پرسی بوو ، ئەو دەنگە دەنگەی ئێرە چی یە؟
ئەویش وتبووی : دەنگی ماسیگرەکانە !
خەلیفەش فەرمانی دابوو کە نابێت لەو دەورو بەرەدا راوە ماسی بکرێت . ئەم ماسیگرە کە کەریمی ناو بوو، بینی بووی دەروازەی رەز وباخ کراوەیە ، لە دڵی خۆیدا وتبووی کۆشك چەنجاڵەو کەس ئاگای لە من نی یە و لێرەدا راو دەکەم .
لە پڕێکا خەلیفە کە دەیناسی ، بانگی کرد : کەریم .
ماسیگرەش ئاوڕی دایەوە .. کە بینی ئەوە خەلیفە خۆیەتی ، کەوتە پاڕانەوە و وتی : گەورەم ، وا مەزانە فەرمانەکانی تۆم شکاندووە ! بەخوا.. لە هەژاری دا هاتوومەتە ئەم شوێنە .
خەلیفەیش پێی وت : ئادەی ، لە بەختی من تۆڕەکەت فڕێ بدە ئاوەوە .
کە کەریم ئەمەی بیست زۆری پێخۆش بوو. جێگەی شیاوی دۆزی یەوە و تۆڕەی فڕی دایە ئاوەکەوە. دوای کەمێك رای کێشایەوە رووانی چەندین ماسی جۆراو جۆری تیایە .
خەلیفەش زۆری پێخۆش بوو و پێی وت :
ئادەی کەریم جلوبەرگەکەی خۆتم بۆ دابکەنە .
کەریمیش کەوایەکی بە شانەوە بوو لەپێستی مەڕ بوو و سەدان پۆخڵەواتی پیا شۆڕ ببووەوە . چەفتەیەکی بە سەرەوە بوو، دەیان پینەی پێوە بوو. خەلیفەش کە بەرگەکەی بەری داکەند جۆرێکی ئەسکەندەریی نایاب و قوماشەکەی (بەعلەبەگی) و لە ئاوریشم بوو.
فەرمانی پێدا : برۆ... راوەماسی خۆت بکە .
کەریمیش دەستی ماچ کرد و رۆیشت و لەبەر خۆیەوە ئەمەی وت :
لە ئاستی چاکەکانتا:سەرم شۆڕما نقوومم: لێم دەرژێ .. لە زۆرما
هەتا زیندووم گۆرانی بۆ تۆدەڵێم : کە مردیشم ئێسکەکانم لە گۆڕما

كه خەلیفە ، بەرگەكەی لەبەركرد وكەواكەی بە سەردادا پرسیی :
ئەریٚ ئەمە چی یە .. پڕە لە كێچ و ئەسپیٚ ..!!
ماسیگرەش وتی : گەورەم ... دوای هەفتەیەك لەگەڵی رادێیت ..!
خەلیفەیش دەستی كردە پێكەنین و وتی :
ئەگبەت بۆچی دەتوانم هەفتەیەك ئەمە لەبەر بكەم !؟
ماسیگرەش وتی :
گەورەم .. گەر ویستت فێرە راوە ماسی ببیت .. كە پیشەیەكی بە سوودە . ئەوا.. ئەم
كەوایە بە كەڵكت دێت..!خەلیفە گورزەیەك گیای كردو چووە بەردەم جەعفەری وەزیر .
ئەویش وایزانی ماسیگرەكەیە و وتی :
ئەوە .. ملت لە چەقۆ دەسوویت !؟ بڕۆ.. لەم دەورو بەرە مەمێنە ! خەلیفە بتبینێت
دەتكوژێت !
خەلیفە دەستی كردە پێكەنین و جەعفەر بە سەرسوورمانەوە پرسیی :
گەورەم ئەوە خۆتیت !!؟
خەلیفەیش وتی :
ئەی ئێمە پێكەوە نەهاتینە ئێرە!؟ نام ناسی تەوە!؟
جا .. مام برایمی سەرخۆش چۆن دەمانناسێتەوە !!؟ لێرە بمێنەوە ، تا دەگەڕێمەوە .
چووە بەر دەرگا و لە سەرخۆ لێی دا... نورالدین عەلی بانگی مام برایمی كرد : وەرە
بزانە كێیە ؟
كە مام برایم پرسیی : كیٚ یە ؟
خەلیفە لە وەڵامدا وتی :
منم ، كەریمی ماسیگر .. ئەوە زانیم میوانت هەیە . هەندێك ماسیم بۆ هێناویت .
كە ( نورالدین عەلی ) و كەنیزەكەكەی گویٚ یان ، لە ناوی ماسی بوو، بانگیان كرد :
مامە گیان .. بۆمان بێنە !
دەرگای بۆ كرایەوە ، هات و سڵاوی لیٚ كردن .
مام برایم وتی :
ئای بەخێر بێیت مام دزی قومارچی ! كوا .. بزانم ماسی یەكانت باشن !؟
كەنیزەكەكەیش وتی :
ماسی یەكان زۆر باشن ... خۆزگە بە برژاوی دەبوو.
مام برایم وتی : راست دەكەیت خاتوون .
ئەمجا رووی كردە خەلیفە و پرسیی :
بۆچی بە برژاوی نەت هێنا؟ هەستە، بۆمان ببرژێنە !

خەلیفەش وتی : هەر ئێستا.. دەیبرژێنم .

چووە دەرەوە بۆ لای جەعفەر وهاواری کرد : جەعفەر...!

ئەویش پرسیی : ها.... چی بوو ، ئەی میری موسڵمانان ؟

خەلیفە وتی : کورە.... فەرمانیان پێدام ماسی یەکان ببرژێنم !!

جەعفەریش وتی :

بێنە .. با من بۆیان ببرژێنم .

خەلیفە وتی :

بە گۆڕی باپیرانم .... هەر خۆم ئەوەشیان بۆ دەکەم !

گەڕا، تا کۆختەی مام برایمی دۆزی یەوە ... چووە ژوورەوە سەیری کرد ، هەموو پێداویستیەکانی برژاندنی ماسیی تێدایە . هێنایە دەرەوەو دارو چیلەکەی کۆکردەوە و ماسیی بە شیشەوە کردو ژێرەکەیی گردا. ( خوێ ) و( زەعفەران) و ( زەعتەر)ی پێوە کرد . کە ماسی یەکان برژان خستیە سەر گەڵا مۆز و هەر لەباخەکە لیمۆیشی بۆ کردنەوەو بردی و لەبەردەمیاندا.. داینا . کیژ و کوڕە لاوە و مام ، برایم تا توانیان لێیان خوارد . ئەمجا کە دەست و دەمیان شت .

نورالدین کەوتە قسە و وتی :

ئەی ماسیگر، ئەمشەو کارێکی چاکت بۆ کردین .

دەستی کرد بە گیرفانیداو لەو پارانەی کاتی خۆی (سەنجەر) پێی دابوو ، تاکو گەشتی پێ بکات ( ٣) دیناری دەرهێنا و دایە خەلیفە پێی وت :

بەخوا گەر پێش ئەوەی ئاوام بەسەر بێت دەت بینیم . نەم دەهێشت ئازاری نەبوونی بچێژیت ! بیگرە بەڵکو خوا... بەرەکەتی تێ بخات .

خەلیفەش لێی وەرگرت و پارەکەی ماچ کرد و خستیە گیرفانی ... بەڵام خواستی خەلیفە ، پارە نەبوو! بەڵکو گوێ گرتن لە گۆرانی بوو.

بۆیە وتی :

قسەکانت بە جێن ! بەڵام خواستی من گوێگرتن بوو لە گۆرانی ! فەرمان بدە بە کەنیزەکەکەت گۆرانیمان بۆ بڵێت .

نورالدین عەلی رووی کردە کەنیزەك و وتی :

لەبەر خاتری ماسیگر هەندێ گۆرانیمان بۆ بڵێ .

کەنیزەکەکە عوودەکەی بەدستەوە گرت و کۆکی داو وتی :

ئاسکۆڵەیەك پەنجەی بۆ ژیان دەبا     بە خورپەی دڵ گیان و هەناوان دەبا

کەڕو لاڵیش لە خۆشیان دێتە سەما     خۆ ناگرێ و دەستی بۆ چاوان دەبا

جۆرێك ئەو (عوود)ەی دەژەنی بیرو هۆشی دانیشتوانی دەتەنی..!

دڵی غەمبار بە نێوە چاك بووەوە     بە یەکجاری کە (ماڵ) روناك بووەوە
دەبا گوڵاو پرژێنی کەم ئەم دەورە     کە سینە و دڵ بە جارێ پاك بووەوە
خەلیفە زۆر خۆشحاڵ بوو ، بەو گۆرانی یە .
هاواری کرد : زۆر باشە ، زۆر باشە .
نورالدین عەلی لێی پرسی : ئەم کەنیزەکەت بە دڵە !!؟
خەلیفە وتی : ئەرێ .. بەخوا.
ئەویش وتی :
ئەوە دیاری بێت و پێشکەش بە تۆ ..کە پەشیمان بوونەوەی نەبێت .
ئەمجا بە ماسیگرەی وت :
ئەوەش کەنیزەکەکە ... هەستە و لەگەڵ خۆت بیبە .
کەنیزەکەکە رووی تێکرد و وتی :
گەورەم هەر بە بێخواحافیزی جێم دێڵیت ؟ ئەگەر هەر دەڕۆم .. مۆڵەتم بدە خواحافیزیت لێ بکەم و هەستی خۆم دەر ببڕم .

لە دەریای دیدەت بۆم بڕەخسایە     یەکەم کەس دەبووم مەلەم کردایە
هۆ کوڕی خاقان خۆشەویستی یەکەمت     لە نێو دڵدایە و بە کەس: دەرنایە
سەرت هەڵگرت و زێدی خۆت جێهێشت     منت هەڵبژارد : بۆت ببمە سایە
دووریی تۆ نەبێت خەمێکم نابێت     چوون خاوەنی نوێم دەستی واڵایە

کە ئەمەی وت نورالدین یش ئەمەی وت :

ڕۆژی دابڕان کە منی سپارد :     بە گریە وخەم و بە هەناسەی سارد
پرسیت بەبێ من چی دەکەی؟وتم     منیش بۆلای خوا : هاواری خۆم نارد

خەلیفەش زۆر بە لایەوە سەخت بوو. ئەو دووانە لەیەك بکات .
بۆیە پرسیی :
ئەم کەنیزەکە لە شیعرەکەیدا وتی : گوایە .. تۆ بە گژ سوڵتانەکاندا چوویتەوە لەبەر خەلیفە کە خەریك بووە بگیرێیت و هەڵاتوویت ؟ تکایە بەسەرهاتەکەم بۆ بگێڕەوە .
نورالدین وتی :
ماسیگر بەسەرهاتی سەیرو سەمەرە بە سەر من و ئەم کەنیزەکە هاتووە ..! کە دەبوو بە ئاوی زێر بنووسرایەتەوە .. تاکو خەڵکی پێی سوودمەند بوونایە .
خەلیفە وتی یەوە :
دە.. بۆمان بگێڕەوە .. بەڵکو خوا رزگارت بکات و دەروازەی ژیانت بۆ واڵا ببێتەوە .
ئەمجا نورالدین کەمێ سەری داخست و وتی :

هاوڕێ کە لانەم جێ هێشت هەڵاتم     تاسەم خرۆشا ، لە بۆ وڵاتم

باوکی بە سۆزم جۆرێ لە دەست چوو
دواتر زۆر کێشەی ترم هاتەرێ
کەنیزەکێکی بۆ کریم ( ناسك )
لە یەکەم بانگدا:دەلاڵ نرخاندی
لەو مەزادەدا نرخیان زیاد دەکرد
کە زۆر تووڕە بووم پەلامارم دا
ئەو بێ نامووسەش زوو رقی هەستا
مشتێکی توندم بە دوودەست لێدا
ئیشارەتیان دام دوور بکەومەوە
کە هیچم نەما: ئاوایش هەژار بووم!
خۆشەویستی خۆم کە بەخشی بە تۆ
شەهرەزاد هەستی کرد شەو وەرنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

لە گۆڕستانا ، تاسەر جێگیر بوو
بە خەمیان تەواو رۆحم زەنجیر بوو
زۆر بە سەلیقە و ئاغر و ژیر بوو
کە ئەوم رۆیشت ، غەمم دەستگیربوو
پیرە دەلاڵیش وەك من زویر بوو
راکێشانەوەی کیژەم لە بیر بوو
نەیزانی بە بان ملی یەوە شیر بوو!
خوێنی لێ دەتکا و ناو دەمی سوێربوو
پۆلیس گرتنی منی تەدبیر بوو
بۆیە کەنیزەك بە تۆوە پیر بوو
لەگەڵیا: دڵم لای تۆ ئەسیر بوو

## شەوی ٣٨

شەهرەزاد وتی :
ئـــەی پاشای زەمان ... شارەزا و لێـــزان ...
کە لە شیعرەکە بووەوە خەلیفە پێی وت :
نورالدین گیان بە دوور و درێژی بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە .
نورالدین عەلییش لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە .
خەلیفە ئەوەی بیست پێی وت :
ئێستا دەتەوێت بۆ کوێ بچیت ؟
ئەویش وتی :
سەر زەوی خوا ، فراوانە .
خەلیفە وتی :
نامەیەکت بۆ دەنووسم بۆ سوڵتان محمدی سلێمانی زەینی و ئیتر زیانت پێ ناگەیەنێت !
( نورالدین عەلی )ش وتی :
جا تو خوا لە دنیادا ئەمە بووە ماسیگرێك نامە بۆ پاشایان بنووسێت؟ ئەمە هەر نابێت.
خەلیفە وتی :
خۆ... تۆ راست دەکەیت ، بەلام من هۆیەکەت پێ دەڵێم ! دەزانی چۆن..!؟ خۆم و خۆی لە یەك حوجرەدا پێکەوە لای یەك مەلا دەمان خوێند! ئەو سوختەی بەردەستی من بوو..! دواتر ئەو خوا لای لێکردەوە و بووە سوڵتان ! خوا منیشی کردە ماسیگر. هەر داواکایەکیشم

لێ گردبێت بۆی جێ بەجێ کردووم . هەزاران کارم پێ کردووە .

کە نورالدین ئەمەی بیست ، وتی :

زۆر باشە ... بینووسە ، با.... بیبینم .

نووچ و مەرەکەبییان بۆ هێنا و دوای "بسم الله" نووسیی :

ئەم نامەیە لە هاروونە رەشیدەوە بۆ بەرێز سوڵتان موحەمەد کوڕی سلێمانی زەینی نوێنەرم ، لە یەکێك لە هەرێمەکانی مەملەکەتەکەم . ئەم نامەیە بە هەڵگری کە نورالدین علی کوڕە وەزیرە دەنێرم .

کە گەیشت : دەم و دەست پۆستەکەی خۆتی بدەرێ و دەست لە کار کێشانەوەی خۆت رابگەیەنە .... فەرمانەکەم جێبەجێ بکە و سڵاو .

نامەکەی دایە دەست ( نورالدین عەلی خاقان) . ئەویش نامەکەی ماچ کرد و خستی یە پێچی مێزەرەکەی سەری و هەستاو خۆی ئامادەی گەشتەکە کرد ، ئەمە حاڵی ئەم بوو .

مام برایمیش سەیرێکی خەلیفەی کرد و وتی :

خوێڕی ( ٢ ) ماسیت بۆ هێنایین بایی (٢٠) فلس بوو(٢) دینارت لە حەقیدا وەرگرت .

ئێستاش چاوت بڕیوەتە کەنیزەکەکەیش ..!

پەلاماری خەلیفەیدا. وەزیریش کە ناردبووی تابە دزی یەوە بەرگی پاشایەتی بۆخەلیفە بێنن ! بەرگەکانیان هێنا . خەلیفە کابرای خەڵات کردو لەبەری کردن .

مام برایم لە سەر کورسی یەك دانیشتبوو. خەلیفەش سەیری ئەم لا و ئەولای خۆی دەکرد . مام برایم خەلیفەی ناسی یەوە .. سەری سوورڕما و حەپەسا!!

پەنجەی خۆی کرۆشت و ووتی :

ئاخۆ .. ئەمەی دەی بینم : خەوە یان راستەقینەیە !؟

خەلیفە سەیرێکی کردو لێی پرسی :

ئەوە چی یە : مام برایم ... چیتە؟

مام برایم بە ئاگا هاتەوە و خۆیدا بە زەویدا و ئەم شیعرەی وت :

بە تاوانەوە ، گیرام: بم بوورە    تۆڵەش لە پیاوی وەك تۆوە دوورە

دانی پیادەنێم کە گوناهبارم    بەڵام بەخشینی تۆیش بێ سنوورە

کە مام برایم شیعرەکەی تەواو کرد، خەلیفە فەرمانیدا کەنیزەکەکە بەرن بۆ کۆشك . لەوێ خانوویەکی جیای بۆ تەرخان کردو کارەکەر و خزمەتکاری پێدا.

ئەمجا پێی وت :

بزانە ، خاوەنەکەتم ناردووە بۆ بەسرە وکردوومە بە ( والی) ئەوێ . خوا یار بێت .. لەتەك خەڵاتی خۆمدا بۆی ، تۆش رەوانەی ئەو دەکەمەوە .

ئەمە لێرە ئاوا بوو . ( نورالدین عەلی )ی کوڕی خاقانیش کە بەرەو بەسرە گەشتی

کردو گەیشت خۆی کرد بە کۆشکی ( والی) داو کردی یە هاوار.. هاوار.
کە ( والی) گوێی لێ بوو، وتی : با.. بێت !
کە بردیان ، کڕنووشی بۆ برد . دواتر نامەکەی خەلیفەی دایە دەستی ! ئەویش کە نامەکەی بینی و تێگەیشت لە خەلیفەوەیە ، هەستایە سەر پێ .
نامەکەی ماچ کرد و وتی :
فەرمانەکانی خواو میری میران دەبێت جێبەجێ بێت .
فەرمانی دا( ٤ ) قازی و میرەکانی بانگهێشت کرد . ویستی فەرمانەکە جێ بەجێ بکات .
لەو کاتەدا ( مەعینی ساوی ) وەزیری پەیدا بوو. ( والی) نامەکەی خەلیفەی دایە دەست .
ئەویش نامەکەی ورد ورد کردو خستی یە دەمی و هەندێك جوویی و دواتر تفی کردەوە .
والی هاواری لێ هەستا و وتی : نەگبەت ، چیت کرد !؟
مەعینیش وتی :
بە سەری تۆ، ئەم کابرایە : نە خەلیفەی دیوەو نە وەزیرەکانی . ئەمە فێڵبازە و ئەم نامەیەی بە مۆر و ئیمزای خەلیفەی .. دەست کەوتووە ! بە دڵی خۆی پڕی کردووەتەوە .
خەلیفە نەی ناردووە. تاکو پلە و پایەی ( والی) لە تۆ وەربگرێتەوە . هەرگیز ئەمە لای خەلیفەوە نەهاتووە . ئەگەر ئەم نامەیە ڕاست بوایە: وەزیرێك ، یان هەر هیچ نەبێت چەکدارێکی مەملەکەتی لەتەکدا دەنارد .
والی پرسیی :
ئەی ئێستا چی بکەین ؟
( مەعین )ی وەزیریش وتی :
بیدە دەست من . لەگەڵ چەند چەکدارێکدا دەیبەمەوە شاری بەغدا لەوێ دەیبەمە دەرباری خەلیفە. گەر ڕاست بوو، ئەوا فەرمانێکی ترم دەداتێ ! هەڵەش بوو، خۆم دەزانم چۆن تۆڵەی لێ دەکەمەوە.
کە ( والی ) ئەمەی بیست وتی :
دەی ئەوە ئەم پیاوە و ئەوە تۆ . دەست بەکار ببە .
(مەعین )ی وەزیریش .. قۆڵی نورالدینی گرت و بردی و بەرەو ماڵی خۆیان بووەوە..
خزمەتکارەکانی ماڵی خۆی بانگ کرد . دایان بە زەویدا و هێندەیان لێدا .. تاکو لە هۆش خۆی چوو . ئەمجا پێوەندی کردو بەرەو بەندیخانەی کردەوە. کە گەیشتە ئەوێ بەڕێوەبەری بەندیخانە کڕنووشی بۆ برد.
(مەعین) پێی وت :
پشیلە کوێر ئەمە بگرەو فڕێی بدە نێو قوڕو لیتەی زیندانەکەتەوە. شەو و ڕۆژ لێی بدە.

ئەویش وتی :

فەرمایشتە .

دەستیان گرت و فڕێ یان دایە زیندانەوەو دەرگایان لەسەر کلۆم دا. کە ڕۆیشتن بەڕێوەبەری بەندیخانە، فەرمانی دا( سەکۆ)یەك کە لە ژوورەکەی نورالدین عەلی دابوو بۆی پاك بکەنەوە و ناوڕشێتی بکەن .

پێوەندەکەی دەست و پێی بکەنەوە (٤٠ ) ڕۆژ نورالدین علی لەو زیندانەدا مایەوە و چەند ڕۆژ جارێك (مەعین )ی وەزیر، یەکێکی دەنارده لای بەڕێوەبەری زیندان و پێی دەوت .. دەبێت سزا بدرێت . ڕۆژی ( ٤١ ) هەمین سوڵتانی ( بەسرە ) دیاری و خەڵاتی لای خەلیفەوە بۆ هات . سوڵتان دیاریەکانی زۆر بە دڵ بوو.

لەوەزیرەکانی پرسی و هەندێکیان وتیان :

ڕەنگە ئەم دیاری یانە ، بۆ ( والی )یە نوێیەکە هاتبێت !

(مەعینی ساوی) وەزیریش وتی :

باشتر وابوو، هەر زوو بمان کوشتایە .

والی هەڵیدایە :

ئەوە بیرت خستمەوە ، برۆ بیهێنە با لە ملی بدەین .

وەزیریش وتی : بەسەر چاوان .

دیسان وەزیر وتی :

تا مەبەستم ئەوە بوو بە شاردا بیگێڕن و بانگەوازی بۆ بکەن . هەر کەس دەیەوێت لە (سێدارە) دانی (نورالدین عەلی خاقانی) ببینێت ، با بێت بۆ بەردەم کۆشکی( والی) . ئیتر خەڵکی دێن و رق و قینەی منیش دەڕوێتەوە .

خەلیفەش وتی : چی دەکەیت بیکە .

مەعینی ساوی وەزیر، بە دڵخۆشیەوە چووە دەرو فەرمانەکەی بە ( والی) شار ڕاگەیاند و فەرمانیدا نورالدین بە شاردا بگێڕن . کە هاوڵاتیان ئەو دەنگ و باسەیان بیست . زۆر دڵگران بوون . هەر زوو خەڵکێکی فرە چوونە بەر کۆشك تا جێیان بەر بکەوێ ! هەندێکیش چوونە بەر ئەو زیندانەی کە نورالدینی لێ بەند بوو . وەزیریش (١٠) کۆیلەی چەکداری بردو چوو بۆ زیندانەکە .

بەڕێوەبەری زیندان پرسیی :

فەرمانیان بە چی یە؟

ئەویش وتی : برۆ ئەو نەگبەتەم بۆ بێنە .

بەڕێوەبەریش وتی :

حاڵی زۆر خراپە .. هێندەی لێدراوە .

ئەمجا چووە لای ( نورالدین عەلی) گوێی لێ بوو .. ئەم شیعرانەی دەوت :

گیان دان و مردن بە نازارەوە — دەریای زانست و بەخشندە : خوایە
ڕێبەری گەورە و توانا و بە زەبر — بەڵا و ماندوێتیم لە سەر شان لایە

پەنام پێت لە خەم دەرم بهێنە

بەڕێوەبەری زیندان ، دەستێ بەرگی کۆنەی چڵکنی لەبەر کردو بردی بە لای وەزیر.

نورالدین عەلی سەیری کرد ، ئەوە دوژمنەکەیەتی ، کە لە کوشتنی دەگەڕێت .

لەبەر ئەوە بە دەم گریانەوە پێی وت :

لە شەقی زەمانە ناترسی ؟ ئەم شیعرەت نەبیستووە؟

دنیا بۆ کیسرا و ئازا یان نەما — سامان و موڵکیان لە دوا بە جێما

ئەمجا وتی :

ئەوە بزانە ... ئەی وەزیر : خوا چیی هێنایە ڕێ : هەر ئەومیە!

وەزیریش وتی :

ئەی عەلی دەتەوێت بەم قسانە بم ترسێنی !؟ ئەمڕۆ با هاوڵاتیانی هەموو ( بەسرە)ش نیگەران بن بۆت من هەر لە ملت دەدەم ! ڕۆژ چۆن بێتە پێش وادەکەم . ئیدی سەیری ئەم لاولای خۆیشم ناکەم .

گوێ بە ئامۆژگاری تۆ نادەم و لەم شیعرە دەڕوانم :

ڕۆژگارچیم پێ کات ئەوەم لە سەرە — ئاسوودەم چونکە قەزا و قەدەرە

ئەم وتەیەش چەند جوانە :

کە دوژمنت خست کوشتنت مەردانە — ڕۆژێکیش بژیت ، ڕۆحت خەندانە

وەزیر فەرمانیدا.. سواری هێسترێکی بکەن .

پیاوانی وەزیر کە دڵتەنگی (نورالدین عەلی)ش بوون ، وتیان :

ڕێمان بدە .. با ئێمە بەرد بارانی بکەین .

( نورالدین )یش وتی : کاری وا مەکەن ... ئەی ئەمەتان نەبیستووە ؟

تەمەنم تاکو کاتی خۆی مابێ
شێری جەنگەڵیش هەڵمەت بهێنێ — هەر چیم لێ بکەن هەر کۆتا نابێ
نامکوژێ ئەگەر قەزای خوا وا بێ !

جارِیان لە شاردا بۆی دا کە : ئەمە کەمترین سزایە . بۆ ئەو کەسانەی ساختە لە پاشای خۆیان دەکەن . ئیدی کۆڵانەکانی ( بەسرە )یان گێڕاو جارِیان بۆ دەدا . تا گەیاندیانەوە، بەر پەنجەرەی کۆشك و شوێنی لە ( سێدارە ) دانی .

جەلادی شمشێر بەدەست ، چووە بەردەمی و وتی :
من فەرمانبەری مەملەکەتم . فەرمانم جێبەجێ دەکەم .. داوای چی دەکەیت .. تاکو بۆت جێ بە جێ بکەم؟ هەر ئەمەندە تەمەنت ماوە ، تاکو ( والی ) لەو پەنجەرەیەوە دەر دەکەوێت بیر بکەرەوە .
ئەویش سەیرێکی چواردەوری خۆی کرد .. ئەم شیعرەی وت :

جەلاد و شمشێر، بۆ من ئامادەن — کە بۆ رسوایی و سووکیم ئاماژەن
خاوەن بەزەیی و پاڵپشتێ نییە — بۆچی ، بێ دەنگن وەڵامم نادەن ؟
ژیانم کۆتا و مەرگم لە پێشە — کوا خاوەن بەزە و سۆزان ئامادەن ؟
حاڵم ببینن، سەیری (بەڵا)م کەن — دە .. شەربە ئاوێ بە دەروونما کەن

خەڵکەکە دەستیان کردە گریان ... جەلاد چوو، شەربەیەك ئاوی بۆ هێنا. شەربە ئاوەکەی لێ وەرگرتەوە و فڕێی دایە لاوە . چونکە فەرمانی پێدرا ، کە پەتی سێدارە لە ملی بخەن و هەڵی بواسن .
چاوی ( نورالدین )یان بەستەوە . بوو بە ژاوە ژاو و هاوار بۆ وەزیرەکە . کە خەڵکەکە سەیریان کرد تەپ و تۆز لەولاوە بڵند بووەوە .
( والی) ئەو تەپ و تۆزەی بینی وتی :
پەلە مەکەن ، بزانن ئەوە چی یە؟
تووەمز ئەوە ئەبوجەعفەری بەرمەکی وەزیر و چەکدارەکانیەتی بۆ ماوەی (٣٠) رۆژ خەلیفە فەرمانەکەی ( نورالدین )ی بیر چوو بووەوە . کەسیش بیری نەخستبووەوە .
شەوێك لە شەوان ، دەچێتە ژووری ( ئەنیسی جەلیس ) ، گوێ لە گۆرانیەکی دەگرێت ...
کە ئاوا دۆستەکەی دەلاوێنێتەوە :

لە ئەندێشەی مندا ئێوە — ناوتان لە سەر زا ر و لێوە

لەو کاتەدا.. خەلیفە خۆ بە ژووردا دەکات . ( ئەنیس ) دەبینێت کە دەگری ! دەچێتە ژوورەکەی . ئەویش کە خەلیفەی بینی کڕنووشی بۆ برد . سنگی بە زەوی یەوە نوساند . (٣) جار کەوشەکانی پێی خەلیفەی ماچ کرد .
ئنجا ..هاتە دواوە و هەستایەوە و ئەم گۆرانی یەی بۆ وت :

رەسەنیت رۆژی بوونت پیرۆزە ! — قەد و باڵاکە و زەویت بە پێزە
پەیمانەکەی خۆت بیردەخەمەوە : — تۆش پیاوی و قسەی خۆت لا پیرۆزە

خەلیفە لێی پرسیی : تۆ کێیت؟
ئەویش وتی :
من دیاری یەکەی (عەلی کوڕی خاقان)م . داوات لێ دەکەم پەیمانەکەی خۆت جێ بەجێ بکەیت .

چونکە بەپیمانت پێدام کە بەرپزەوە دەمنێریتەوە بۆ لای عەلی خاقانی . ئێستاش ئەوە (٣٠) ڕۆژی رەبەقە خەو نەچووەتە چاوانم و هەر چاوەڕێم !!

کە خەلیفە ئەمەی بیست فەرمانیدا، ئەبوجەعفەری بەرمەکیم بۆ بێنن .

کە هات پێی وت :

جەعفەر (٣٠) ڕۆژە هەواڵی (عەلی خاقانی)م نەبیستووە ، رەنگە( والی) کوشتبێتی، بەڵام بە گۆڕی باو و باپیرانم .. ئەو کورە شتێکی لێ هاتبێت ، ئەوا ئەو کەسانەی دەستیان تێدا بووە لە ناویان دەبەم . بۆیە هەر ئێستا بە ڕێ بکەوە ، بەرەو( بەسرە) بۆ لای ( والی محمد سولێمانی زەینی) هەواڵی (عەلی خاقانی)م بۆ بێنەوە . زۆریشت پێ بچێت و دوا بکەویت لە ملت دەدەم . باسی ( نورالدین عەلی ) و ئەو نامەیەی بۆم نووسی و خۆیشت ئاگادار بوویت، بۆی دەکەیت . گەر زانیت ، ( والی) کاری بەنامەکەی ( نورالدین عەلی) نەکردووە . خۆی و مەعینی کوڕی ساوی بە هەر شێوەیەك خۆت پێت باش بوو بۆم بێنە .

جەعفەریش وتی : بە چاوان .

ئیدی ( ئەبو جەعفەر)و یاوەرانی لە جەنگاوەران کە بەرەو ( بەسرە ) بوونەوە خەڵکەکەش .. دەستیان کردە هەواڵ بردن بۆ ( والی محمدی سلێمانی زەین )ی ، کە ( ئەبو جەعفەر)و چەکدارانی بەرەو ( بەسرە ) دێن . کە گەیشتن ، ئەو قەرەباڵغی و ژاوە ژاوەیان بینی ..

جەعفەر پرسیی : ئەمە چی یە؟

پێیان وت :

کە بە نیازن ( نورالدین علی ) لە سێدارە بدەن .

ئەویش فەرمانەکەی خەلیفەی بیر کەوتەوە .. کە وتبووی ، هەر کەسێك ببێتە هۆی تیا چوونی (نورالدین عەلی) لە ملی دەدەم . پەلەی کرد بۆ گەیشتن بە محمد سلێمانی زەینیی ( والی) و فەرمانەکەی خەلیفەی پێ ڕاگەیاند : کە هەر کەسێ نورالدین عەلی بکوژێت ، لە سێدارەی دەدات .

ئەمجا فەرمانیدا :

( والی) و وەزیرەکەی کە (مەعینی کوڕی ساوی) بوو... قۆڵبەست کران و گیران .

فەرمانیشی دا :

کە ( نورالدین عەلی خاقان )ی ئازاد بکەن . دیسان فەرمانی خەلیفەی بەو خەڵکە ڕاگەیاند ، کە ئیدی (نورالدین عەلی) لە جێی والی ( موحەمەد سلێمان زەینی )یە . ( ٣) ڕۆژ بە میوانی مانەوە . ( والی) کۆن لە ئەبو جەعفەر پاڕایەوە کە بیباتە بەردەم خەلیفە . ئەبو جەعفەر پێی ڕاگەیاند کە بەرە بەیانی ڕۆژی چوارەم لەگەڵ مەعینیشدا بەرەو بەغدا دەبنەوە . ( نورالدین عەلی خاقان )یش لە تەکیاندا سوار بوو ڕۆیشتن تا گەیشتنە (

دارالسلام ) و چوونە لای خەلیفە و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە . کە چۆن لە ئان و ساتدا بوو ، هەڵی بواسن و لە سێدارەی بدەن !!

خەلیفە شمشێرەکەی خۆی دایە دەست نورالدین عەلی و فەرمانی دایە :

ئەم شمشێرە بگرەو لە ملی دوژمنەکانت بدە .

ئەویش چووە بەردەم مەعینی ساوی وەزیر .

بەڵام مەعینی وەزیری پێشوو پاڕایەوە وتی :

من کردم .. تۆ مەیکە !

( نورالدین عەلی ) شمشێرەکەی لەو لایەوە دانا.

سەیرێکی خەلیفەی کرد و وتی :

ئەی میری موسڵمانان ... لە راستیدا منی خەڵەتاند .

ئەمجا ئەم شیعرەی وت :

وا فریوی دام بۆ من شەرم بێ        پیاوی چاك دەبێ دڵی نەرم بێ

ئیدی خەلیفە وتی : تۆ .. لێی دوور بکەوە ..!

فەرمانیشی دایە مەسرور و ئەویش لە ملیدا.

دواتر بە ( نورالدین عەلی خاقان)ی وت : داوا بکە .

ئەویش وتی :

گەورەم پێویستم بە سامان و ماڵی ( بەسرە ) نییە! حەز دەکەم لێرە لە پەزێرایی بەڕێزتانا بم .

بۆیە .. خەلیفەش فەرمانیدا ، هەر لە بەغدا دا کۆشکێکی بدەنێ..! ناردیە شوێنی کەنیزەکەکەدا و خەڵاتی هەردووکیانی کرد .

نورالدین عەلی خاقانی کردە هامنشینی خۆی .. بۆیە تاکو خوا بردنیەوە بۆخۆی بە بەختیاری ژیانیان بردە سەر.

بەڵام خۆ ئەم بەسەرهاتە ... لە بەسەرهاتی ( بازرگان و منداڵەکانی ) خۆشتر نییە...!

شەهریار شا پرسیی : ئـــەی ئەو بەسەرهاتە چۆن بووە؟

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

## شەوی ٣٩

## بەسەرهاتی ئەیوبی بازرگان و (غانم) و (فتنە)ی کوڕ و کچی

شەهرەزاد وتی: خـاوەنی بڕیار.....

ئـەی پاشای بەختیار ..... لە سەدەکانی رابـردوو، بازرگـانێکی دەوڵەمەنـد هەبوو، هێنـدە بیستوومە زەمانی زوو، ناوی ( غانمی کوڕی ئەیوب ) بوو . خوشکێکی بوو شۆخ جوان بوو.. لە مانگی (١٤) دەچوو. ناوی فتنە بوو. خوشکەکەیشی لە جوانیدا کەم وێنە بوو. باوکیان مرد و سامانێکی زۆری بۆ بەجێ هێشتن . (١٠٠) بار هەر ئاوریشم و شووشە بۆنی مـسك بـوو.کە کاتی خۆی ئامادەی ناردنە بەغدا کرابوون..! کە باوکیان مرد. ناردنە دەرەوەی دواخرا . کوڕەکـەی کاروانی ئەم بارانەی بەرە و بەغدا برد . سەردەم سەردەمی خەلیفە هارونە رەشـید بـوو . خواحافیزی لە کەس و کار و خزمان کرد و پشت بە خوا کاروانی خستە ڕێ و بە بێوەی گەیشتە بەغداو چەند بازرگانێکی لەگەڵدا بوو . خانوویەکیان گرت و راخەریان بۆ برد و پـەردەی جوانیان پیا شۆڕ کردەوە . بار و بارخانەکەی لەوێ خست . چەند رۆژ تێیدا حەوانـەوە. بازرگانـان و ناسـراوانی بەغـدایش سـەردانیان کـردن . ئـەویش بوخـچەیەکی پڕکـرد لـە جۆرەکـانی کوتاڵەکەی و (١٠) جۆر قوماش بوو . پیشانی دان ، ئـەوانیش بردیانـە لای گـەورە بازرگانی گوزەرەکەیان . کەوتنە کوتاڵ لێ کڕین . غانم هەر دینارێکی سەرمایەی دوو دینـاری قازانج کردبوو و زۆری پێ خۆش بوو .

بەو شێوەیە درێژەیدا بە فرۆشتن و ساڵێکی پێـچوو. لـە یەکـەم رۆژی سـاڵی دووەمدا ، غانم بەرەو قەیسەریەکە چوو. سەیری کرد داخراوە ..! کەپرسیاری کـرد وتیـان یـەکێك لە دوکانداره بازرگانەکان مردووە و ئەوانی دی چوونەتە گۆڕستان بۆ ناشتنی . تۆیش بـڕۆ بۆ گۆڕستان و ئەو خێرە دەستگیری خۆت بکە..

ئیدی( غانم )یش شوێنیان کـەوت ، رۆیـشتن تـاکو لـە شـاری بەغـدا دەرچوون ، کە گەیشتنە ئەوێ کەس وکاری مردووەکـە دەواریـان هەڵـدا و مۆمیـان داگیرسـاند . مردووەیان ناشت و مەلاکان دەستیان کردە قورئان خوێندن . خەڵکەکە لـە ژێـر دەوارەکـەدا دانیشتن و ئەویش کەسێکی زۆر شەرمن بوو .

بۆیە لەدڵی خۆیدا وتی :

ناتوانم بەمجۆرە جێ یان بێڵم . کە بڵاوەیان لێکرد ئەوکاتە منیش دەڕۆم .

تاکو ئێوارە قورئان خوێندرا ، ئێوارەش خواردن و شیرینیان بۆ هێنان . کە نـان خواردن کۆتابوو .. دەستیان شت و دانیشتنەوە .

غانم کەوتە بیر کردنەوە :

دەمناسن کە دەوڵەمەند و پارەدارم . لە دزان دەترسم ! خەمی ئەوەمە کە چیم هەیە و

نی یە ، لێم بدزن ! هەستا و ئیزنی لێ وەرگرتن  کە گوایە دەچێتە سەر ئاو. خۆی دزیەوە

و رێی بەرەو بەغدای گرتەبەر.

نیوەشەو گەیشتە دەروازەی شار . بەڵام دەروازەکان خڕ داخرابوون و تەنیا گوێی لە سەگوەڕ

بوو.

کە زانی چۆڵ و هۆڵە.. لە دڵی خۆیدا وتی :

لا حول و لاقوە الا باللە.. لە ترسی  سامان و پارەکانم  تەعزیەکەیشم جێ هێشت ..!

کەچی ئێستا لە خۆیشم دەترسم !

ئەو ناوە گەڕا ، بۆ شوێنێك  ئەو شەوە تێیدا بنوێت ! چوار دیوارێکی بینی کە

دارخورمایەکی تیا بوو . دەرگایەکی کراوەی هەبوو . خۆی پێدا کرد و جێی بۆ خۆی چاك

کرد و لێی راکشا .

لەبەرئەوەی شوێنەکە دارستان بوو، خەوی لێ نەکەوت .هەستایە سەر پێ ودەرگایەکی

کردەوە . رووناکیی بینی کە دوور بوو لە دەروازەی شارەوە . سەیری کرد رووناکی یەکە

بەرەو لای ئەم دێت ! زۆر ترسا و دەرگاکەی پێوەدا و بە دارخورماکەدا هەڵزنا و سەرکەوت .

رووناکی یەکە کە گەیشتە بن دارخورماکە . غانم  بە وردی سەرنجیدا ، سێ کۆیلەی

بینی . دوانیان سندووقێکیان بە سەرشانەوە بوو ، ئەوی تریان تەورێکی بە دەستەوەیە و

فانۆسێك بە دەستەکەی  تری یەوەیە . کە لە گلە هەڵدراوەکەوە نزیك بوونەوە .

یەکێك لەوانەی کە سندووقەکەی هەلگرتبوو پرسیی :

سەواب : ئەوە چیتە!؟

کۆیلەکەی دی وتی :  کافوور چی یە ؟

ئەویش وتی :

ئێوارە کە لێرەبووین ، دەرگاکەمان بە کراوەیی جێ نەهێشت ؟

ئەویش وتی :  راست دەکەیت .

ئەمجا ئەویتر وتی :  ئەوەتا داخراوە !!

سێیەمیان کە تەورەکەی پێ بوو وتی :

ئەی بێ عەقڵینە ، نازانن کە خاوەن رانە مەڕەکان لێرە ئێوارەیان لێ بە سەردێ  لە

ترسی ئەوەی رەش پێستانی وەکو ئێمە . نەیان دۆزنەوە و بیان بەن بیان خۆن . لێرە

دەمێننەوە و دەرگاکە دادەخەن!؟

هەردووکیان وتیان :

راست دەکەیت ... کەسمان لە تۆ بێ عەقڵ تر نین .

ئەویش وتی :

جا.. ئێوە بڕوا ناکەن تا .. نەچینە ناو چاڵە خۆڵەکەوە ، کەسێك نەدۆزینەوە .

بەڵام من دەڵێم : کە رووناکی چراکەی دەستی منی دیوە ، رای کردووەو بە سەردار خورماکەوەیە!

غانم کە لەسەر دارخورماکە بوو، لە دڵی خۆیدا وتی :

خوا پشت و پەنات نەبێت کۆیلە..بۆ ئەو زیرەکی یەت ! لاحول و لاقوة الا بالله العلي العظیم . ئاخر ئێستا .. چۆن من لە دەست ئەمانە رزگار ببم !!؟

دوانەکەی کە سندووقەکەیان پێ بوو. بە تەور بە دەستەکەیان وت :

دەی .. ( بخیت ) سەر بکەوە . دەرگاکەمان بۆ بکەرەوە . ئەم سندووقە قورسە پشتی شکاندین .

دواتر لەوانەی لێرەدان دانەیەکت بۆ دەگرین . برژاندن و سوور کردنەوەی لەسەر خۆمان.. تەنانەت ناهێڵین رۆنەکەشی بتکێتە سەر زەوی !

ئەمجا وتی :

سەیر.. سەیر چەند کاڵفامم !؟ با سندوقەکە بە سەر دیوارەکەدا فڕێ بدەینە ئەو دیو !

ئەوانیش وتیان : سندوقەکە دەشکێت !

ئەویش وتی :

خۆیشم خەمی ئەوەمە ! ئەی ئەگەر لە ژوورەوە چەند دزێکی تیا بوو و شمەکە دزراوەکەیان بەش بەش کرد بە سەر خۆیاندا؟ چونکە دزان فێرن . دزیەکانیان دێننە ئەم جۆرە شوێنانە و بە سەر خۆیاندا ئەو پیاو کوژانە دابەشی دەکەن ...!

ئەوانیش وتیان : کاڵفام ، ئەوانە ناوێرن بێنە ئێرە .

ئەمجا بە دیوارە کەدا هەڵزنا و لەو دیوەوە دەرگای کردەوە و سندووقەیان بردە ژوورەوە..

یەکێکیان وتی :

ئێستا دوای نیوە شەوە .. چاڵمان بۆ هەڵناکەندرێ تا ئەم سندووقەی تێدا بشارینەوە . (٣) سەعاتێك دەحەوێینەوە . هەر یەکەمان هەر لە نووکەوە هۆی دەم و چاو سووتاندنی خۆی بگێرێتەوە ، تاکو رۆژ دەکەینەوە .

یەکەمیان کە تەور و فانۆسەکەی پێ بوو وتی :

من بەسەرهاتی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە .

ئەوانیش وتیان : فەرموو .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

شەهرەزاد بەرامبەر شا شەهرەیار دانیشت و دەستی بە گێڕانەوە کرد :

شەهرەزاد بە دەست ، دەستی بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی خۆی کردو وتـی :

کۆیلەی هانۆس تەمەنم هەر وا (٥) ساڵێك دەبوو ، کە کۆیلە فرۆشان هێنامیان و فرۆشتمیان بە پیاوێکی بازجاوەش. ئەم پیاوە کچێکی (٣) ساڵانەی هەبوو . پێکەوە لە ماڵەکەدا یاریمان دەکرد و لە گیلێدا هەل دەپەڕیم و گۆرانیم بۆ دەگوت و داك و باوکەکەی کچە تێر و پڕ پێمان پێ دەکەنین . تەمەنی من ببووە (١٢) ساڵان و کچەیش (١٠) ساڵان بوو . ئیمەیان لە یەکتر دەمبڕی و چاودێرییان نەدەکردین .

ڕۆژێکیان دەڕوانم لە ژوورێکدایە و هەر خۆیەتی و دەوری چۆڵە . منیش سەرنج دەدەم زۆر جوان و سەرنج کێش دەنوێنێت و هەر دەڵێی تازە بە تازە لە گەرماوی ماڵ هاتووەتە دەرەوە . بۆنی لە خۆی دابوو و دەتوت مانگی چواردەیە ! دەستم کردە یاری کردن لەگەڵیداو ئەویش دریغیی لێ نەکردم و کەوتە یاری کردن .

بە دەم یاری کردنەوە ، منی خستە سەر پشت و لە سەرم دانیشت . ئیدی هێندەی جولاندم تا ئارەزووم جولا و ئەوەی نەدەبوو ببێت .. رووی دا .

بووە قیژەو هاوارو دایکی کچە هات و کە ئەوی بەو جۆرە بینی .. دەستی بە لە خۆدان کرد و لە ترساندا بوورایەوە . منیش زۆر بە پەلە رام کردو بۆی دەرچووم .

دوای چەند رۆژێك دایکەکەی زیرەکانە ، کارەساتەکەی لە مێردەکەی شاردەوە . هەرو دوو مانگ بەسەر ئەو رووداوەدا رابوورد و دایکی کچە کارێکی کرد .. کچەیان لە کوڕە سەرتاشێك مارە بڕی کە ناوە ناوە دەهاتە کۆشك و سەری مێردەکەی و منی دەتاشی . شەوی بووکێنی کچە کۆترێکیان سەربڕی و وایان پیشان دا کە خوێنەکەی روو سووریی بووکێ یە .

ماوەیەك منیان پشتگوێ خست و ئارامیان کردمەوە . لە ناو منیشیان گرت و خەساندنیاندم بەو کارەیان سزای منیشیان دا . ئیدی من پشتگوێ خرام و چەند بە چەند لەو کۆشکەدا مامەوە و هەموویانم بە ڕێ کردن و مردن .

میراتگریان نەما و گەنجینەی دەوڵەت دەستی گرت بەسەر موڵك و سامانەکەدا و منیش بەر لێ بووردن کەوتم و ئازاد بووم . بەڵام هەر زوو لە پیاوییان خست بووم . دواتر ڕێم کەوتە لای ئێوە .

## چیرۆکی "بەخیت" ی کۆیلە

شەهرەزاد وتی :

کۆیلەی دووەم دەستی بە گێڕانەوەکرد و وتی :

براکانم ، ئەوە بزانن ئەوساکە تەمەنم ( ٨) ساڵان بوو ، ساڵی درۆیەکم بۆ دەکردن . ئیدی ئەوان بە یەکیاندا دەدا..! ئەوانەی کە منیان هێنا بۆ ئەوەی کە بمفرۆشن ، کەوتنە

دڵەڕاوکێ و یەکێکیان دەستی لە دەست دەڵاڵەکە کردەوە و پێی وت :
بانگ بکە .. ئەم کۆیلە خەوش دارە : دەفرۆشین .
کڕیارانیش پرسییان : خەوشەکەی چی یە!؟
دەڵاڵەیش پێی وتن : ساڵێی (١) درۆ دەکات ..!
یەکێك لە بازرگانان چووە پێشەوە و پرسیی :
بەو خەوشەوە بایی چەندە؟
ئەویش وتی : (٦٠٠) درهەم .
بازرگانیش وتی : ئەوە نرخی کۆیلەکە و ئەوە (٢٠) درهەمیش بۆ دەڵاڵەکە .
دەڵاڵیش منی گەیاندە ماڵی بازرگانەکە . دەڵاڵانەی خۆی وەرگرت و لێیدا و رۆیشت .
ئیدی خاوەنەکەم پۆشتەی کردمەوە ، ئەو ساڵەیش تا کۆتایی ساڵەکە منیش پەزێراییم کردن .. ساڵی نوێ هاتەوەو ساڵەکەی ساڵی پیت و بەرەکەتی کشتوکاڵ بوو . بەجۆرێك خەڵکەکە خێر و مەولوویان دەکرد .
خاوەنەکەم لە باخەکەی کەنار شاریدا ئاهەنگی ( مەولوود )ی گێڕا . میوانەکانی بردە باخەکە و هەموو پێداویستییەکی نان خواردن ئامادە کرا . ئەورۆژە .. تاکو درەنگانێ مانەوە ! لەبەر ئەوەی خاوەنەکەم شتێکی دەویست کە لە ماڵەوە بیری چوو بوو.
بانگی کردم و وتی :
برۆ .. سوار ببە بەرەو ماڵ و ئەو شتەم لە ژنەکەم وەربگرە و خێرا بگەڕێوە .
منیش خێرا.. سوار بووم ، بەرەو شار. کە گەیشتمە بەر دەرگا .. دابەزیم و خۆمدا بە زەویدا و هاوارم کردو خەڵکی گەڕەك لێم کۆ بوونەوە .
ژنی خاوەنەکەم و کچەکانی هاتنە دەرەوەو کە پرسیان ...
منیش وتم :
چۆن ناگریم .. خاوەنەکەم و هاوڕێکانی لە بن دیوارێکی بڵندا دانیشتبوون . دیوارەکە بە سەریاندارما..!! ئیدی منیش بە پەلە هاتمەوە .. تاکو هەواڵەکەتان پێ رابگەیەنم .
ژن و کچەکانی ئەمەیان بیست . کەوتنە هاوار و قیژە و لە خۆدان و یەخە دادڕین .
ژنە دراوسێکان لێیان کۆ بوونەوە . ژنی ئاغام کەوتە خۆ بە دیوارا کێشان و شووشەی پەنجەرە شکاندن و شتی ناوماڵ فڕێدان .
ئەمجا بانگی کردم و وتی :
دەی ئەو دۆڵاب و سنووقانەم لەگەڵ بشکێنە .. ئەم قاپ و قاچاخانەیش .
ئیدی پێکەوە شتەکانی سەر ڕەفەکانمان داگرت و چیمان دەست کەوت شکاندمان .
ناو بە ناویش هاوارم کرد :
ئاخ ... بۆ ئاغام !

ژنی ئاغام بە سەری رووت و پێی پەتی و خۆی و کچەکانی .. شوێنم کەوتن ، کە بیان بەم بۆ لای دیوارە رووخاوەکەی کە ئاغامی لە ژێردا مردووە ..! تاکو بیخەینە ناو تابووتێکەوە و بی هێنینەوە..! بۆ ئەوەی بە رێ و رەسمی شیاو... بینێژین .
پێشیان کەوتم و دەم قیژاند : هاوار بۆ ئاغام .
ئەوانیش بە دوامەوە و بە سەری رووت و پێی پەتی دەمیان قیژاند :
شۆف ... شۆف بۆ ئەو پیـاوە ...!!
چی لە گەڕەکدا بوو، لە ژن و پیاو و پیرەمێرد و پیرەژن و منداڵان شوێنم کەوتبوون و دەیان قیژاند و لە خۆیان دەدا . منیش بە ناوەڕاستی شاردا.. تێم پەڕاندن .
هەر خەڵك بوو، دەیان پرسی :
ئەمانیش چیم بۆ گێڕابوونەوە . ئەوەیان بۆ خەڵکەکە دەگێڕایەوە ..!
خەڵکەکەیش دەیان وت : لاحول ولاقوە الا بالله ...
هەندێك لە خەڵکەکە وتیان :
دیارە ئەمە پیاوێکی ناسراو و بە ناوبانگ بووە . بۆیە وا چاکە بچین ( والی ) تێ بگەیەنین .
والی یان تێگەیاند و ئەویش فەرمانیدا گۆڕ هەڵکەنیان هێناو چەند دەست وپێوەن ، شوێن ( والی) کەوتن و بە دوای ئاپوورەی خەڵکەکەوە بوون . پێشیان کەوتبووم و خۆڵم بەسەر خۆمدا دەکرد . بە لە خۆدان و قیژە و هاوار گەیشتنە بەر باخەکە . کە ئاغام ئەمەی بینی رەنگی زەرد بوو !
منیش دەستم پێکرد :
ئاخ .. بۆ ئاغا ژنم ! ئیتر کێ بەزەیی پێما بێتەوە..!؟ خۆزگە من لەجێی ئەو بوومایە !
کە ئاغام بەو شێوەیە منی بینی پرسیی : ( بخیت ) .. ئەوە چی روویداوە !؟
منیش وتم :
کە منت ناردەوە بۆ ماڵەوە ، دەروانم دیواری ژوورێك رماوە بە سەر خاتوون و کچەکانیدا..!!
پرسیی : خاتوون ، رزگاری نەبووە؟
منیش وتم :
نەخێر ..گەورەم ، خاتوون یەکەم کەس بووە تیاچووە و ئەمجا کچەکانت !!
ئەمجا پرسیی :
کچە بچکۆلەکەشم ؟
منیش وتم : بەڵێ ... ئـەویش .
ئەمجا پرسی یەوە : ئاخۆ .. هێسترەکەی ژێر خۆم .. هیچی بە سەر نەهاتووە ؟

وتم : كه ديوارى هۆڵەكە كەوتووە ..ديوارەكانى تريشى خستووە . لەبەر ئەوە ، هيچ شتێكى ماڵەكە ..دەرنەچووە!! تەنانەت مەرە دابەستە و قاز و مريشكەكانيش .. سەگ و پشيلە كەوتۆتە خواردنى لاشەكانيان .

ئەمجا پرسيى : ئـــێ ...!!

منيش وتم :

نەخێر..كەس رزگارى نەبوو. خانووەكەش تەپى !! مەرو قاز ومريشكەش سەگ وپشيلە خواردنى .

كە ئاغام ئەمەى بيست . دنيا لە بەرچاوى تاريك بوو. خۆى بە پێوە بۆ رانەگيرا.. يەخەى خۆى دادرِى ... هێندە گريا.. ريشى تەرِ بوو. بەخۆيدا كێشا وخوێن بە رووەمەتەكانيدا دەهاتە خوارەوە .

هاوارى كرد :

ئاى هاوار بۆ ژن و منداڵەكانم ! كەس وەكو منى بەسەر نەهاتووە ..!

ميوانە بازرگانەكانيش بە دەم گريانەوە، يەخەى خۆيان دادرِى . ئاغام بەدەم لە خۆدانەوە ، لە باخەكە هاتە دەرەوە . سەيرى كرد لە دوورەوە تەپ و تۆز هەستا..كە وردتر سەرنجى دا.. بۆى دەركەوت كە ( والى ) شار و ياوەرانيەتى .. خەڵكێكى زۆريشيان بە دواوەيە .. هاوار و قيژەيانە و دەگرين ! كە گەيشتن .. ئاغام و ژن و كچەكانى لووتيان بە يەكدا تەقى ..!! هەر ئاغام ئەوانى بينى رەنگى كرايەوە و دەستى كردە پێكەنين .

ئەمجا لێى پرسين : چيتان بەسەرهات .. لە ماڵەوە؟

ژن و كچەكانيشى بە ئاغاميان وت :

لە خوا بە زياد بێت ، كە هيچت بە سەر نەهاتووە .

ئەمجا بە دەم گريانەوە ئاغاميان لە ئامێز گرت .

ئاغا ژن وتى : سوپاس بۆ خوا سەلامەتن .

پرسيى : چۆن ..ئاوا بە بێوەى خۆت و ميوانەكانت رزگارتان بوو؟

ئاغاشم پرسيى :

ئەى ئێوە چۆن لە خانووە تەپيوەكەدا رزگارتان بوو؟

ئاغاژن و كچانى وتيان :

كوا .. ئێمە هيچمان بە سەر نەهاتووە !؟ خانوويش لە جێى خۆيەتى ..!

كە ( بخيت )ى كۆيلە بەسەرى رووتى و پێ ى پەتى هاتەوە ..

هاوارى دەكرد :

ئەى هاوار بۆ ئاغام !

كە لێمان پرسى وتى :

دیوارێکی باخەکە .. رما بە سەر ئاغا و میوانەکانیدا ! هەر هەموویان مردن ..!!
ئەمجا ئاغاشم بە وانی وت :
جا خۆ.. هەر بخیت خۆیشی بە هەڵە داوان و بە سەری رووتی و پێی پەتی کەلای نێوەگەڕایەوە .
هاتەوە بۆ لای منیش وپێ ی وتم :
خاتوون و کچەکانت بوون بە ژێر خانووەکەوە.. ئەی داخ بۆ خاتوونم .. بۆ کچانی !
هەموویان مردن !
ئاوڕی دایەومو منی بینی کە چەفتەکەی سەرم دڕاوەو خوڵاوی یە بە سەرمەوە .
قیژاندی : وەرە.. کورە .
کە چوومە بەردەمی وتی :
ئەی کۆیلەی شووم .. نەفرەتت لێ بێت .. ئەمە چی بوو دروستت کرد؟ هەر ئێستا .. پێستت دەکەنم . گۆشتت لە ئێسك دەکەمەوە .
منیش پێم وت :
ناتوانیت کاری وام لەگەڵ بکەیت .. چونکە تۆ بەم خەوش و ناتەواوی یەوە منت کڕیوە..!! شایەتم هەیە ، خۆیشت دەزانیت ، کە من ساڵی یەك درۆ دەکەم و ئەمەش نیوە درۆیەك بوو . تا ساڵەکە کۆتا دەبێت .. نیوە درۆیەکی ترم ماوە بیکەم ..! ئەمجا دەبێتە درۆیەك !!
ئەویش شیڕاندی بە سەرما :
سەگی .. سەگباب ، ئەمە هەمووی نیوە درۆیەك بوو!؟ خۆ من درۆی وا گەورەم هەرگیز نەبیست بوو !! برۆ لە رێی خوادا.. ئازاد بە !!
منیش وتم :
تۆ منت ئازاد کرد .. بەڵام من بوومایە لە جێی تۆ ئازادم نەدەکردی تا نیوە درۆکەی ترم نە کردایە دواتر.. بت بردمایە مەزادخانەی کۆیلەیان و بت فرۆشتمایەوە.. ئەزانی بۆ؟ چونکە هیچ کارێکی تر نازانم تاکو خۆمی پێ بژیێنم !! بەڵام بەم کۆیلەتی یە خەڵك بە خێوم دەکات . ئەمەش شەرع رێگای پێداوە .. لە بەشی ئازاد کردندا هاتووە !
کە ئێمە ئەم گفتوگۆیەمان دەکرد ، خەڵکەکەو دەرو دراوسێکانمان هاتن بۆ سەرەخۆشی. ( والی) و دەست و پێوەندەکانیشی هاتن . ئاغام بە خێری هێنان و ئەم نیوە درۆیەی منی بۆ گێڕانەوە !
کە ئەمەیان بیست زۆریان پێ گەورە بوو و سەریان سووڕما!! دەستیان کردە جنێودان پێم ! داوایان کرد کە ئاغام بمکوژێت .
منیش بە پێکەنینەوە وتم :

چۆن ئاغام دەمكوژێت؟ كاتی خۆی بەم خەوشەوە منی كڕیووە ..!

كە ئاغام گەڕایەوە ماڵ . سەیری كرد ماڵ وێران بووە . تێیان گەیاند خۆم و ژنەكەی هەموو شتەكانی ناو ماڵمان شكاندووە.

ژنەكەی وتی : هەمووی ئەم ( بخیت )ە شكاندوونی و ماڵی كاول كردووە !

ئاغام هێندەی دی تووڕە بوو و دەستی بە دەستدا كێشا وتی :

*لە ژیانمدا .. كۆیلەی وام نەدیوە..! دەشڵێت : ئەمە نیوە درۆ بوو. جا .. ئەگەر درۆی تەواو بوایە یەك دوو شار وێران دەبوو!!*

دەستی گرتم و بۆ لای ( والی ) .

ئەویش ( بنێشت )ێكی پێدام و وتی : بیخە دەمت و بیجوو.

بنێشتەم جوو و بوورامەوە !!

كاتێك بە ئاگا هاتمەوە .. دەم و چاومیان ئاوا بە ئاسنی گەرم داخ كردبوو..! ئەمجا ئاغام بردمی و فرۆشتمی . منیش درێغیم نەكرد لە درۆ كردن و فیتنەیی ! ئیتر.. ئەم دەست و ئەو دەستم كرد و فرۆشرام لەم ئاغاوە.. بۆ ئەو ئاغا.. تاكو گەیشتمە كۆشكی ( میری موسڵمانان ) .

دوو كۆیلەكەی دی كە ئەم بەسەرهاتەیان بیست ، وتیان :

ئای كە درۆیەكی گەورەت بۆ كردین ..!

ئەمجا دایانە قاقای پێكەنین و ( بخیت )یش وتی :

( دەی ، كافوور، تۆش بەسەرهاتی خۆت بگێڕەوە .)

ئەویش وتی :

ئامۆزا .. بەسەرهاتی من دوور و درێژە و وا بەرەبەیانە .. رەنگە ، خۆر هەڵبێت و ئەم سندووقەمان پێ ببینین و بمان كوژن ! دەرگاكەی بكەنەوە ، كە دواتر گەڕاینەوە كۆشك ، چیرۆكی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە .

بە سەر دیوارەكەدا سەركەوت و دەرگاكەی كردەوە . كە بردیانە ژوورەوە چەند مۆمێكیان داگیرساند، چاڵێكیان بە هێندەی سندووقەكە هەڵكەند . كە پانیەكەی هێندەی گۆڕێك بوو . كافوور هەڵی دەكەند و( سەواب ) گڵەكەی دەگواستەوە . تاكو بە هێندەی ناوقەدی خۆی چاڵ كرد . سندووقەیان خستە ناوی و گڵەكەیان بەسەردا دایەوەو رۆیشتن . هێندە دوور كەوتنەوە تاكو ، لەبەرچاوی ( غانمی كوڕی ئەیوب) ون بوون .

غانم زانی هەر خۆیەتی خولیای سندووقە كەوتە سەری و لە خۆی پرسی :

ئاخۆ ... ئەو سندووقە چی تێدا بێت ..؟!

خۆی گرت تاكو رۆژ بووەوە . لە دارخورماكە هاتە خوارەوەو كەوتە لابردنی گڵی سەر سندووقەكە .

بەردێکی هێناو قفڵی سندووقەکەی پێ شکاند . کە سەری هەڵدایەوە سەیری کرد کیژێکی بەنج کراوی بێ هۆشی تیایە!! نەمردووە و دڵی لێ دەدا..!
زۆر ناسك و جوان ، خشڵ و زێڕێکی زۆریشی پێوە بوو کە مەگەر بە پارەی سوڵتانەکان بکڕیە ! لە سندووقەکەی دەرهێناو لە سەرپشت لەولا چاڵەکەوە رای کێشا . کیژەش هەوای پاکی هەڵمژی و دواتر پژمەیەکی کرد . کڵۆ ( بەنـــج )ێك لە دەمی یەوە دەرپەڕی . کە ئەگەر لە دەمی ( فیل)یشدا بوایە دەبووڕایەوە . شەو و رۆژێکی پێچوو ..
ئەمجا کیژە چاوانی گێڕاو بە زمانێکی شیرین پرسیی :
بای .. شووم ئاوی تینووت پێ نی یە!؟ کەسێکی ئاودێریش نییە ، گوڵی باخ لە کوێ یە ؟
کەس وەڵامی نەدایەوە .
بۆیە ئاوڕێکی دایەوە و وتی :
ئەی شەفەق ..دایەی زێڕین و جەوهەرە .. دلیلە.. نجمە الصباح ..شەهوە ، نزهە ، حلوە ، زەریفە .. قسە بکەن .
کە وەڵام نەبوو چاوێکی دی گێڕا و وتی :
هاوار بە ماڵم ، گۆڕ بە گۆڕم دەکەیت !؟ ئەی ئەو کەسەی ئاگاداری دڵانیت . ئەی پاداشت دەرەوەی رۆژی زیندوو بوونەوە . کێ منی لە ناو ئەو هەمووە بەربەستانەدا دەرهێناوە ؟ وا بە زۆر.. خستومیە نێوان چوار گۆڕ؟
( غانم )یش لە ژوور سەری بوو و پێی وت :
خانم .. نە حەشارگە و نـە کۆشـك و نـەگۆڕ ئەمـەی بەرامبـەرت وەستاوە غـانمی کوڕی ئەیوبی داماوە . کە بـۆی نـاردووی ، دەلیلـی دامـاو ..! تـا رزگـار ببێـت .. ئـەی لێقـەوماو. تـا بگەیتەوە بە ئاواتی چاوەڕوانکراو .
ئیدی بێدەنگ بوو.
کە بە وردی سەرنجیدا وتی :
دانی پیا دەنێم یەك خوا هەیە و موحەممەد نێردراوی خوایە .
ئەمجا بەری دەستی خستە سەر دەم و چاوی و رووی لە (غانم) کرد :
ئەی لاوی پیرۆز ، وا بە ئاگا هاتمەوە : کێ منی هێنایە ئێرە ؟
غانمیش وەڵامی دایەوە : ئەم سندووقەی تۆی تیا بوویت ( ٣ ) کۆیلە هێنایان ..!
دەستی بە گێڕانەوەی رووداوەکە کرد . غانمیش پرسیاری لە بەسەرهاتی کیژەکە کرد .
کیژەش وتی :
ئەی لاو ، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە منی گەیاندە لای کەسێکی وەکو تۆ . ئێستاش هەستە بمخەوە نـاو سندووقەکە و بـچۆ هێـسترێك یـان حـەماڵێکم بـۆ بێنـە.. بـا.. بم گەیەنێتـەوە ماڵتان .

غانمیش ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو و لە دڵی خۆیدا وتی :
زێڕ و خشڵێکی زۆری پێویە . هەڵی دەگرم بۆ خۆم . دواتر خۆیشی وەکو کەنیزەك دەی فرۆشم .

ئەمجا کیژە وتی :
گەر لەماڵتدا مامەوە، دەبمە خێرو بەرەکەتا ئەوکات بە هێوری بەسەرهاتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە .

کە خۆر گزنگی دا.. لە دار و درەخت و ئاورنگی دا . چووە دەرەوە و لە سەرە ڕێدا، هێستر و زەلامێکی هێنا و سندووقەکەی بار کرد . زۆر دڵخۆش بوو چونکە سەرەڕای ئەوە زێڕانەی پێوەی بوو بە نیاز بوو وەك کەنیزەکیش بیفرۆشێت بە (١٠٠٠٠) دینار. کە گەیشتە ماڵ سندووقەکەی هەڵپچڕی .. کچەکەی دەرهێنا . ئەویش سەرنجی ماڵەی دا.. پاك و ناوەدان بە فەرشی جوان ! چەندین تۆپ کۆتاڵی تیابوو. بۆی دەرکەوت ئەم لاوە بازرگانە !
ئەمجا پێی وت : بەڕێز شێك بێنە بیخۆین .

غانم خێرا وتی : بە سەرچاو !.
چووە بازاڕ.. بەرخێکی برژاو و سینی یەك پاقلاوە و مەیی و چەند مۆم و مۆمدان و شووشە بۆنی کڕی و گەڕاندنیەوە ماڵ وتاکو توانیان خواردیان . هەر یەکە و لە شوێنی خۆی لێی نووست ، تاکو ڕۆژ بووەوە . ئەمجا چووەوە ناوبازاڕو ماڵ چی پێویست بوو لە خواردن و خواردنەوە ، هێنایەوە ماڵ . دوای نان خواردن مەی وجامی یان دانا..! دوای ئەوەی ، ڕێك و پێکی و ڕەوشتی کچەکەی سەرنج دا .. داوای لێکرد کە شووی پێ بکات .

کیژەش وتـــی : ئەوە هەر نابێت .

ئەویش پرسیی : لەبەر چی ؟
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو..... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٤١**

## چیرۆکی غانمی کوڕی ئەیوب و قوت القلوب

ئەمرەزاد وتی :

کیژەکە بە غانمی وت :
ئەوە بزانە من ئازدارو لەبەر دڵانی ( میری موسڵمانان ) بووم و لە کۆشکی ئەودا ، پەروەردە بووم .
یەزدانیش جوانی پێ بەخشیم . زیاد لە پێویست خۆشی دەویستم . لە بەشی تایبەتی کۆشکدا نیشتەجێی کردم . فەرمانی دابوو (١٠) کەنیزەك پەزێرایی منیان دەکرد ! ئەو هەموو خشڵ و زێڕەی پێ داوم ! کە دەی بینی . ڕۆژێك لە ڕۆژان پاشا گەشت دەکات بەرەو یەکێك لە وڵاتەکان .

شازنە ( زبێدە) هاتە لای کەنیزەکێکم و پێی وت :

کە خاتوون نووست ، (واتە من) ئەم کلۆ بەنجە بناخنە لووتی یەوە . یان بۆی بکەرە ، ناوەوە و بیدەریّ ! چەند دەڵێیت پارەت دەدەمێ !

کەنیزەکەکەش کە پێشتر کەنیزەکی خۆی بوو! لەخۆشی پارەکە رازی دەبێت و بەنجەی لێ وەردەگرێت ! دواتر بەنجەکەی بۆ کرد بوومە گۆزە ناوەکەی ژوورەکەمەوە! منیش شەو تینووم بوو و خواردمەوە . ئیدی لە سەر چرپایەکە کەوتبوومە خوارەوە و سەرو دەستم ون کردبوو!! ئەویش کە فێڵەکەی سەری گرتبوو.

لەو سندووقەی خستبووم .. پارەی بەو کۆیلانە و دەرگاوانەکەش دابوو. هەر بەو شەوەی کە تۆ لەسەر دارخورماکە بووی .. منی گەیاندبووە ئەویّ ! ئیتر ئەوەیان بەسەر هێنام ! کە خۆت بینیت !

ئەوە بوو تۆیش رزگارت کردم . ئەمە بوو بەسەرهاتی من ! ئێستاش خەلیفە نازانێت .. لە کوێم ! تۆیش رێزم بگرە و سوکایەتیم پێ مەکە !

کە غانم ئەمەی بیست و بۆی دەرکەوت : دەسکە گوڵی خەلیفەیە و نازدارێتی . بێدەنگی لێ کردو کەوتە خۆ خواردنەوە و دڵنەوایی خۆی دەکرد . سەری سوورمابوو!! دواتر هەر وەکو جاران ، بەرەو بازاڕ بووەوە . کە گەڕایەوە هەندێ پێویستی ماڵی لەگەڵ خۆی هێنایەوە . کە چووە ژوورەوە : سەیری کرد .. ( قوت القلوب ) دەگری..!

کیژە کە غانمی بینی .. بە روویدا پێکەنی و وتی :

بیرم کردی ..!

ئەمجا دەستیان کردە ، نان خواردن پێکەوە .

ئەمە حاڵی ( غانمی کوڕی ئەیوب) بوو . خاتوو ( زبێدە )ش سەری سوورما بوو..!

لە خۆی دەپرسی بوو :

باشە کە خەلیفە هاتەوە و پرسیاری کەنیزەکەکەی کرد.. چی پێ بڵێم !؟ وەڵامم چی بێت باشە!؟

پیرەژنێکی لە کۆشکدا هەبوو بانگی کردو نهێنی یەکەی بۆ گێڕایەوە .

ئەمجا لێی پرسی :

تازە .. ئەم کارە ناهەموارەم کردووەو لە دەستم دەرچووە ! چی بکەم باشە!!؟

دوای ئەوەی پیرەژنە .. لە کێشەکە تێگەیشت رێی بۆ دانا و وتی :

بنێرە .. بە شوێن دارتاشێکدا ، با پەیکەرێکی تەختەی بۆ بتاشێت ! خۆیشمان گۆڕێکی بۆ لێ دەدەین و دەی نێژین . گۆڕەکە هەڵ ببەستە وگومەزێکی بە سەرەوە بکەو مۆم و بخووردی تێ بکە . فەرمان بدە کەنیزەك و دانیشتوانی کۆشك هەموو رەش بپۆشن . کە کەنیزەك و خزمەتکاران زانیان خەلیفە هاتەوە .. گولاو بکەن بە دالانی کۆشکەوە .. هەموو

سەرەخۆشی لێ بکەن و پێی بڵێن کە ( قوت القلوب ) مردووە! هەر لەبەر خۆشەویستی تۆ خاتوو زبێدە لە کۆشکدا ناشتوویەتی ..! ئیتر ئەویش ئاهەنگی (مەولوود)ی بۆ ساز دەکات و چاکە وخێری بۆ دەکات .

پیرەژن وتی :

ئەگەر خەلیفە گریمانی ئەوە دابنێ ، کە تۆ ( غیرە )ت لە کەنیزەکەکە کردووە و لە ناوت دیردووە . ئەوا فەرمان دەدات کە گۆڕەکە هەڵبدەنەوە . نەکەی بترسیت ! چونکە کە بەردی گۆڕیچەکەیان لادا .. کفنە ، شاهانەکە دەبینێت .. یەکسەر بڕوا دەکات و فەرمان دەدات ریزە بەردەکە بخەنەوە سەر گۆڕیچەکە .. گریمان خەلیفە دڵی ئاوی نەخواردەوە و ویستی کفنەکە لا ببات ..! ئەوسا خۆت و خزمەتکارەکان بیکەن بە هەڵلا و بڵێن : شتی وا نابێت ! چونکە مردووەکە ژنە و سەیری حەرامە !

ئەوکاتە رازی دەبێت وکۆڵ دەدات و بڕوا دەکات و سوپاسیشت دەکات کەوا بە رێك و پێکی ناشتووتە .

ئەمجا پیرەژن وتی : خوا یار بێت لەو کێشەیەش رزگار دەبیت .

کە زبێدە خاتوون ، بیری لەم قسانە کردەوە.. پەسەندی کردو خەڵاتێکی زۆر باشی پیرەژنەی کرد .

برێك پارەیشی دایە کە ئەو رێ و رەسمە بەجێ بێنێ . هەر خێرا .. پیرەژن فەرمانی دا: دارتاش پەیکەری مرۆڤێکی بۆ بتاشێت . ئەمجا گۆڕی لە باخی کۆشکدا بۆ هەڵکەند و (زبێدە) کفن و دفنی کرد. گۆڕەی هەڵبەست و ( گوومەز )ی بە سەرەوە کرد و مۆم و بخووردی تیا داگیرساند. راخەری نایابی لە دەورو بەری گۆڕەکە راخست . فەرمانیدا : دانیشتوانی کۆشك هەموویان رەشیان پۆشی ..!! کارەکەیان لە ناو کۆشکدا دەنگی دایەوە..!

کە کەنیزەکە ( قوت القلوب ) مردووە . دوای ماوەیەك خەلیفە لە سەردانەکەی گەڕایەوە بۆ ماڵ . سەیری کرد دانیشتوانی کۆشك هەموویان رەشیان پۆشیوە !

لە یەکێکیانی پرسی :

ئەویش هەواڵی مردنی کەنیزەکە ( قوت القلوب )ی دایە . خەلیفە لە هۆش خۆی چوو و بووورایەوە ! کە بە ئاگا هاتەوە .. پرسیاری شوێنی گۆڕەکەی کرد؟

زبێدە خاتوونیش لە وەڵامدا وتی :

ئەی میری موسڵمانان .. لەبەر ئەوەی دەسکە گوڵ و هەڵبژاردە و زۆر نازداری خۆت بوو؛ زۆرم رێز لێگرت و هەر لە نێو ئەم کۆشکەدا ناشتم .

هەر بە جلوبەرگی گەشتەکەوە ، چووە سەر گۆڕەکە .. سەیری کرد راخەری نایابی تیا راخراوە ! مۆم و بخووردی تیا داگیرساوە ، سوپاسی خاتوو زبێدەی کرد ، کە ئاوا بایەخی بە گۆڕەکە داوە . لە دڵی خۆشیدا لە دڵە راوکێدابوو. لە نێوان بڕوا بوون و بێ بڕواییدا!! بەڵام

دڵەراوکێکەی زۆرتربوو.
دوای حەوانەوەی فەرمانیدا :
گۆڕەکە هەڵبدەنەوە و دەری بێنن . کە کفنەکەی بینی .. ترسی خوای بیر کەوتەوە .
پیرەژنە وتی :
گۆڕەکە ، وەکو خۆی لێ بکەنەوە .
خەلیفە فەرمانیدا : فەقێ و قورئـان خوێنـان بێـنن . کە ئامـادەبوون دەستیان کرد بـە "ختمە"کردن .
خەلیفە ..کە گوێی لە قورئانەکە بوو دیسان بووژایـەوە . یـەك مـانگی رەبـەق ، ئەمـە کاری خەلیفـە بـوو . رۆژێـك لـە رۆژان ، خەلیفـە لـە ماڵـەوە لێـی نووستبوو، کـەنیزەکێك لای قاچەکانی یەوەو ئەوی دی لای سەری یەوە بوو و باوەشێنیان دەکرد .
گوێی لێ بوو . ئەوەی لای سەری یەوە بەوەی لای پێ یەکانی وت :
ئای .. (خەیزەران )ی نەگبەت ..!
ئەوەی لای پێ یەکانی هەڵی دایە :
ئای .. تووخوا..! ئەی ( قچیب البان ) گیـان . ئاغامـان بـێ ئاگایـە وهـەر ناشـزانێت چی رووی داوە!؟ هەژارە شەونخوونی بەلای گۆڕێکەوە دەکێشێت کە پەیکەرێکی تەختەی تیایە و دارتاش دروستی کردووە !
ئەوی پێ ینیشی وتی :
ئەی (قوت القلوب) چی بەسەر هات ؟
ئەویش وتی :
خاتوو .. زبێدە کڵۆیەك بەنجی دایە کەنیزەکێك .. کـە ( قـوت القلوب )ی پـێ بێهۆش بکات ! کە بێ هۆشی کرد .. خستی یانە سندوقێکەوەو بە ( سەواب ) و ( بخیت )ی کۆیلـەدا رەوانـەیان کـرد . فەرمانیـشی بـە کۆیلـەکان دا لەجیاتیـدا پەیکـەرێکی داریـن لـە کۆشکدا .. بخەنە چاڵەوەو داپۆشن ! .
( خەیزەران )یش وتی :
ئای ... قوڕ بەسەرەم ! کەوابوو ( قوت القلوب ) نەمردووە !!؟
ئەوی تر وتی :
نەخێر..! گەنجـە و خـوا بـی پارێزێـت .. بـەڵام بیـستوومە ، ئـەوە (٤ ) مانگـە ..( قـوت القلوب) لای بازرگانێکە .. ناوی (غانمی کوڕی ئەیوب)ە . ئاغاشمان بەسەر گۆڕێکدا دەگری و دەی لاوێنێتەوە کە مردووی تیا نی یە ..!!
ئەوان قسەی خۆیان دەکرد و پێیان وابوو، خەلیفە نووستووە ! خەلیفەش گوێی بۆ شل کردبوون .

کە لەقسە بوونەوە و خەلیفە بۆی دەرکەوت .. گۆڕی ماڵەکەی ساختەیەو کەنیزەکە (٤)
ماڵگە لە ماڵی غانمی کوڕی ئەیوبی بازرگانە .
خەلیفە زۆر تووڕە بوو و هەستا و رۆیشت بۆ دیوانی حوکمڕان وەزیران کۆ بوونەوە .
ئەبوجەعفەری بەرمەکی خۆی کرد بە ژووردا .
هەر کە خەلیفە ئەوی بینی فەرمانی پێدا :
چەند چەکدارێك ببەو بگەڕێ بە شوێن ماڵی ( غانمی کوڕی ئەیوب )ی بازرگان دا و
هەرکە دۆزیتەوە چوار دەوری ماڵەکەی بدە و بچۆ لە ژوورەوە خۆی و( قوت القلوب)ی
کەنیزەك بێنە بۆم . پێویستە ئەو بازرگانە سزا بدەم .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

### شەوی ٤٢

شەهرەزاد وتی :

ئەبو جەعفەر و والی بەغدا و چەکداران و هاوڵاتیان بەرەو ماڵی غانم بوونەوە . کە گەیشتن سپێنەی چاو.. چۆن دەورەی بیلبیلەی داوە . ئاوا..دەوری ماڵی غانمیان دا. کەنیزەکەکە هەستا بچێت قاپێك گۆشتی سوورکراوە بهێنێتە سەر سفرەی نان خواردنی نیوەڕۆو ئاوڕێکی دایەوە . ئەو هەموو چەکدارەی بینی . شمشێری رووتیان بە دەستەوەیە!! تێگەیشت کە لەمەترسی دان و رەنگی زەرد هەڵگەڕا..!

بۆیە رووی کردە غانم و وتی : هەستە .. برۆ.. خۆت رزگار بکەو خۆت بشارەوە ..!
غانم کە چەکدارانی بینی پرسیی :
بۆ کوێ رابکەم !؟ ئاخر.. هەموو سامانەکەم لێرەیە؟
کەنیزەکەکەیش وتی :
لێرە مەبە .. با... سامان و ماڵت لە دەست نەچێت !
بازرگانەش وتی : ئاخر ... چۆن هەڵ بێم !؟ چواردەوری ماڵ گیراوە ..!!
کەنیزەکەکە وتی : مەترسە .
ئەمجا قاپی گۆشتە برژاوەکە و سفرەکە و چەند پارچە نانێکی دایە کە بیخاتە سەرسەری و لە دەرگاوە دەربچێت .
پێشی وت :
خەمی منت نەبێت . خۆم دەزانم ، خەلیفە چۆن لەگەڵمدا دەجووڵێتەوە .
غانم بە قسەی کرد و نانە بەرەو سفرە و قاپەکەی خستە سەر سەری و خوا بەزەیی پیادا هاتەوە چووە دەرەوە و رزگاری بوو . هەر کە خەلیفە گەیشت ، دابەزی و خۆی کرد

بە زووردا .

قوت القلوب یش زێر و خشڵەکانی لە سندووقێکی بچووک نابوو .

لەبەر وەزیر هەستا و کرنووشی بۆ برد و وتی :

خوا .. ئەمەی لە چارە نووسی بووم .

جەعفەر وتی : خانم ... من تەنیا فەرمانی گرتنی غانمم پێ یە .

ئەویش وتی :

گەورەم ( غانم ) بازرگانە و بارو بارخانەی بەرەو (دیمەشق) بردووە . ئیدی من لێی بێئاگام . ئێستاش ئەم سندووقەم لای خۆت بۆ هەلگرە تا دەگەینەوە کۆشک .

بۆ ئەوەی بیدەمەوە بە میری موسڵمانان .

ئەویش لێی وەرگرت و کەنیزەکەکەی لەگەڵ خۆی بردو گەڕانەوە بۆ کۆشک .

لەولایشەوە ، ماڵی غانمیان تاڵان کرد . گەڕانەوە بۆ لای خەلیفە . جەعفەری وەزیر... چی کردبوو، بۆی گێڕایەوە.

خەلیفەش شوێنێکی بۆ کەنیزەکە قوت القلوب دیاری کرد و تێیدا نیشتەجێی کرد و پیرەژنێکی بۆ تەرخان کرد . کە بەردەستی بکات . نووسراوێکی شاهانەشی بۆ میر(محمدی کوری سلێمان زەینی) نارد کە جێگری خەلیفە بوو لە (دیمەشق ) و بۆی نووسی بوو :

ئەگەر کەسێك ویستی تاڵانی ببات !! بابچێت بۆ ماڵی ( غانم )ی کوری ئەیوب !

کە چوون بۆ ماڵی( غانم ).. سەیریان کرد دایکی غانم و خوشکەکەی بەسەر گۆڕێکدا دەگرین و دەیلاوێننەوە ! کە لە ناوەڕاستی حەوشەکەیان دابوو..! هەردووکیان گرتن و ماڵەکەشیان تاڵان کردەوە .

هەر نەشیان زانی هەواڵ چییە ! کە بردیاننە بەردەم خەلیفە ، هەواڵی غانمی لێیان پرسی .

ئەوانیش وتیان :ساڵێك دەبێت ، هەواڵی نازانین !!

خەلیفەش فەرمانیدا : بردیاننەوە شوێنی خۆیان . با بچینەوە بۆ لای (غانمی کوری ئەیوب) . ئەویش کە ئەو بەڵایەی بەسەر هات و ماڵی لێ تێك چوو . لە پڕێکدا هەموو سامانەکەی لە دەست دا. هێندەی خەفەت خوارد وەختە بوو دڵی بتەقێت ..!

سەری خۆی هەلگرت و لە شار چووە دەرەوەو بە درێژی ئەو رۆژە ، بەڕێوە بوو. تاکو برسێتی زۆری بۆ هێنا . گەیشتە شاروچکەیەك وخۆی کرد بە مزگەوتێکدا . دەم و چاوی شت و پاڵیدا بە دیوارەکەیەوە و بەو برسێتی و ماندوویەتی خەوی لێکەوت . تا.. رۆژ بووەوە ، لەوێ مایەوە . کە خەڵکی شارۆچکەکە هاتن بۆ نوێژی بەیانی . ئەمیان بینی، کە چەندە ماندوو و برسی یە . جلوبەرگێکی خوا پێداویی و دەوڵەمەندانەشی لەبەر دایە !

لێ یان پرسی :

کابرای نامۆ، لە کوێوە هاتوویت ؟ بۆ هێندە ، بێ هێز و ماندوویت ؟

چاوانی کردەوەو سەیرێکی کردن و دەستی کردە گریان وبێدەنگ بوو . یەکێکیان گەڕایەوە بۆ ماڵ و قاپێك هەنگوین و( ٢) نانی بۆ هێنا. لای دانیشتن تاکو دنیا رووناك بووەوە. ئەمجا هەر یەکە و بەرەوماڵ و لەوێوە بۆ سەرکارەکەیان چوون . مانگێك لەناویاندا مایـەوە . لاواز و نـەخۆش ! بۆیـە خەڵکەکـە لـە نێـوان خۆیانـدا بڕیاریانـدا بیبەنـە خەستەخانەی بەغدا ، کە ئەمان خەریکی ئەمە بوون .

دوو ژنی سوالکەر خۆیان کرد بە لایاندا . توومەز .. ئەمانـە دایك و خوشکی خۆی بوون ! هەندێك نان لە ژوورسەری ( غانم )دا بوو دایان بە (٢) ژنەکە . ئەوانیش شەو لەوێ مانەوە . بێئەوەی هیچ بزانن !

رۆژی دواتـر وشـتر و کاروانـچی یـان ئامـادە کـردو پێیـان وت : *ئـەم نەخۆشـە ببـە .. بیگەیەنـە . بـەردەم دەرگـای خەسـتەخانەی بەغـدا . خـوا بـە خێرێکـی گـەورەش بـۆت دەنووسێت.. لەوێیش . خەڵکانێك دەیبەنە خەستەخانەکەوە ، بۆ چارەسەر کردنی .*

( غانم ) یان بردە دەرەوەو جلێکیان لەناو کەژاوەی سەر وشترەکەدا بۆ راخست . دایك و خوشکی لەگەڵ خەڵکەکەدا سەیری ئەم نەخۆشەیان کرد . بەڵام نـەیان ناسـی یـەوە . دواتر چوونە پێشترەوە و بەوردی سەیریان کرد .

دایکی وتی :

ئەمە زۆر لە (غانم)ی کوڕم دەچێت ! بڵێی ئەم لاوازە داسك و دەرزی یە .. ئەو بێت !؟ خەڵکەکە بە گوریس (غانم)یان بەسەرپـشتی وشـترەکەوە بەسـت . ئـەویش بـە ئاگا هاتـەوە وگریا..! خەڵکەکە سەیریان کرد . ئەو (٢) ژنە بەسەریدا دەگرین . ئەو دووانەشیان لەگەڵ نـارد..!! بـە ڕێکـەوتن بـەرەو شـاری بەغـدا. لـەوێش کاروانـچی گەیانـدی یـە بـەردەم خەستەخانەکە و نەخۆشەکەی داگرت وجێی هێشت بەسـەر دایـك و خوشکیدا. تاکو رۆژ بووەوە ، لەوێدا مانەوە . بەیانی خەڵکەکە لێیان کۆبوونەوە !

پیاوێکی ناسراوی بازاڕەکە دڕی بە خەڵکەکە دا و وتی : من .. بە چاك کردنـەوەی ئەم نەخۆشە ، بەهەشت بۆخۆم مسۆگەر دەکەم . چونکە ئەمە ببرێتە ئـەم خەسـتەخانەیەوە ، لە ژێر دەستیاندا دەمرێت !

حەماڵی بۆ گرت و ناردی یـەوە بـۆ مـاڵی خـۆی . ئـاوی بـۆ گـەرم کـرد و دەست و قاچ و لەشی بۆ شت . جلوبەرگی نوێی لەبـەرکرد وگوڵاو پـرژێنی کـرد. نـەخۆش بـەئاگا هاتـەوەو دەستی کردە ناڵە ناڵ و گریان .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٤٣**

شەهرەزاد وتی :

ئـەی پاشای بەختیار .. غانم بەو نەخۆشییەوە بەجێ دێڵین و بۆ لای ( قوت القلوب )

دەچێتەوە . خەلیفە لە قوت القلوب تووڕە بوو و لە ژوورێکی تاریکدا بەندی کرد ..!
(٨٠) ڕۆژی ، پێچوو واڕێکەوت - ڕۆژێکیان خەلیفە نزیکی ژوورەکەی (قوت القلوب) بوو
گوێی لێبوو خوای دەلاڵاندەوەو دەیوت :
ئای .. غانم ، چەند کەسێکی چاک بوویت ؟ چەند ڕەوانت پاک بوو! چەند پاک بوویت لەگەڵ ئەوانەدا کە خراپەیان لەگەڵ دەکردیت ؟ ڕێزی ئەوانەت دەگرت .. کە سووکایەتیان پێ دەکردیت ! تۆ خێزانی کەسێکت دەپاراست ، کە جنێوی بە کەس و کارت دەدا..! ڕۆژێک دێت ، تۆ و خەلیفە لە بەرامبەر دادوەرێکی بە داد بوەستن ! ڕۆژێک دادێ ، خوای مەزن دادوەر بێت و فریشتەکان : شایەت بن .
خەلیفە لە سکاڵاکەی گەیشت و بۆی دەرکەوت کە زوڵمی لێکراوە . چووەوە کۆشک و مەسرووری خزمەتکاری ناردە شوێنی . ( قوت القلوب ) بە چاوانی پڕ فرمێسکەوە هات .
خەلیفە پێی وت :
قوت القلوب .. جۆرێك دەتلاوێندەوە کە .. گوایە زوڵمم لە کەسێك کردووە ! کە ئەو کەسە زووتریۆ من زۆر چاك بووە ! ئەو کەسە کێ یە ؟ کە بۆ خێزانی من چاك بووە و پاراستوویەتی . بەڵام من بۆ ئەو خراپ بووم ؟
کەنیزەکەکە وتی :
گەوردم .. ئەوە غانمی کوڕی ئەیوبە کە .. بە دەمەکی ماڵت هەرگیز دەستی بۆ نەبردووم .
خەلیفە وتی : لاحول و لاقوە الا بالله .... ئێستا بخوازە و بۆت جێ بەجێ بکەم .
قوت القلوب یش وتی :
خوازیاری ( غانمی کوڕی ئەیوب )م .
خەلیفەش وتی : هەر هێناتان .. دەبێت پێشکەشی منی بکەیت .
ئەویش وتی : دیاریی بەخشندە گەڕانەوەی نی یە .
قوت القلوب وتی : ئاغام .. ڕێگەم بدە خۆیشم بۆی بگەڕێم .. ئێ .. بەڵکو..
خەلیفە وتی : بە ئـــارەزووی خۆت .
زۆر دڵخۆش بـوو. (١٠٠٠ ) دیناریـشی وەرگـرت . ئـەمجا چووە و بـازاڕ و (١٠٠٠ ) دینـارە زێڕەکەی بردە گوزەری زێڕنگەران و( ١٠٠٠ ) دیناری دایە یەکێکیان و وتی :
ئەم پارەیەم بۆ بکە بەخێر و بیدە بە کەسانی نامۆ و بێ دەرەتانان .
پیرەی سەرگەورەی زێڕنگەران کە ئەمەی دی وتی :
خاتوون .. دەکرێـت بگەیتـە نـاو مـاڵی ئێمـە ، ئـەو لاوە نـامۆ و شـەنگە .. ڕێك و پێکە ببینی !؟
گەنجەکەش ( غانمی کوڕی ئەیوب ) بوو . بەڵام سەرگەورە ، لە بەسەرهاتەکە بێ ئاگا

بوو . ئەو وای دەزانی ئەو لاوە پیاویکە ماڵ و سامانی تالان کرابێت و قەرزدار بێت .
قوت القلوب ، لێدانی دڵی خێرا بوو..! کەوتە دڵەڕاوکێ و وتی :
یەکێکم لەگەڵ بنێرە ، بۆ ماڵتان .
ئەویش منداڵێکی لە تەکدا ناردەوە . تاکو ماڵی خۆیانی پیشان بدات . کە گەیشتن ..
سڵاوی لە ژنی سەرگەورە کرد . ژنە کڕنووشی بۆ برد . چونکە ناسی یەوە .
قوت القلوب پرسیی : کوا کوڕە لاوازەکەی ماڵتان؟
ژنەکە بە گریانەوە وتی : ئا.. ئەوەتا...! ئێستاش پێوەی دیارە . کە کاتی خۆی خانەدان بووە و لێی قەوماوە .
کە ئاوڕی دایەوە و بینی ، وەکو ئەوە وابوو خۆی بێت ..! زەردو لاواز..! سەری لێ تێکچوو. بەزەیی پیا هاتەوە و دەستی کردە گریان و وتی : نامۆیان .. با میری وڵاتی خۆیشیان بن ! هەر گوناهن .
نەشی دەزانی ئەمە غانمە. سەعاتێك مایەوەو دەرمانی پێدا . ماڵئاوایی کردوکەوتەوە گەڕان بۆ غانم .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٤٤**

بەسەرهاتی ( غانم ) و خوشکی و ( قوت القلوب)

شەهرەزاد وتی :

سەرۆکی دەرگاوان قوت القلوب و دایکەو فتنەی خوشکی غانمیان هێنا..
سەرۆکی دەرگاوانان وتی :
خانم.. ئەمڕۆ ژنێك و کچەکەی هاتوونەتە شارەوە! بە دەم و چاویاندا دیارە خانەدان و بوون ..!
بەڵام جلوبەرگیان هەژارانەیەو هەر یەکەیان ملوانکەیەکی لە ملدایە . دڵ تەنگ و چاو بە فرمێسکن ! ئەوەتا بۆم هێناویت . تاکو بیان پارێزیت و نەهێڵیت سواڵ بکەن ..! ئەوانە هی سواڵ نین ! کە خوا یار بێت ، بە هۆی یارمەتی دانی ئەمانەوە هەموو دەچینە بەهەشت .
قوت القلوب وتی :
بەڕێز ، بینینی ئەوانت لە لا شیرین کردم .... لە کوێن؟
ئەوانیش هینایانە ژوورەوە .
کە( قوت القلوب ) هەر دووکیانی بینی دەستی کردە گریان و وتی :
ئەمانە بە ناز و نیعمەت گەورە بوون ! پێوەیان دیارە .
ژنە سەرۆکی دەرگاوانان وتی :

خانم .. ئێمە لەبەر خواو پاداشتەکانی هەزارانمان خۆش دەوێت . ئەمانە رەنگە لە ناز ونیعمەت دا بووبن و زۆردار لێی تێکدا بن .

ئەمجا هەردووکیان غانم و ناز و نیعمەتی خۆیانیان بیرکەوتەوەو بۆ خۆیان گریان ..!؟ قوت القلوب یش لەگەڵیاندا ، دەستی کردە گریان .

ئەوانیش وتیان :

لە خوا دەپارێینەوە..کە بە ( غانمی کوڕی ئەیوب ) شاد بینەوە .

کە ( قوت القلوب ) ئەمەی بیست .. هێندە گریا بوورایەوە .

کە بە ئاگا هاتەوە وتی :

خەمتان نەبێت ئەمڕۆ دوارۆژی خەمتانە و یەکەم رۆژی بەختیاریتانە !

فەرمانیدا کە بیان گەیەننە ، ماڵی خۆیان و لە گەرماودا باش بشۆردرێن و پۆشتە بکرێنەوە . رۆژی دواتر، چووەوە بۆ ماڵی سەرۆکی دەرگاوان ... بینی کە فەرمانەکەی جێ بەجێ کراوەو گوێی لێیان بوو، باسی ( قوت القلوب ) یان دەکرد . غانم لەڕو لاواز بوو بوو.

کە کیژەی بینی هاواری کرد :

ئەی .. قوت القلوب !

ئیدی بۆی دەرکەوت خۆیەتی و وەڵامی دایەوە : گیان ...

غانم وتی : وەرە نزیکمەوە !

قوت القلوب وتی : رەنگە غانمی کوڕی ئەیوب بیت ..!

ئەویش وتی : بەڵێ .. ئەوم !!

جارێکی دی ( قوت القلوب ) بوورایەوە .

دایك و فیتنەی خوشکیشی بیستیان ، هاواریان کرد :

ئۆخەی لەم خۆشی یە ! ئەوانیش بوورانەوە .

کە( قوت القلوب ) بەئاگا هاتەوە وتی :

سوپاس بۆ خوا کە منی بە خۆت وخوشك ودایکت شاد کردەوە .

ئەویش بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕانەوە . کە چۆن گەیشتووەتەوە دەست (خەلیفە) !

بە غانمی وت :

راستگۆیانە باسی تۆم بۆ خەلیفە کرد و ئەویش بڕوای کرد . ئێستاش مژدە بێت : خەلیفە منت لێ مارە دەکات !! غانمیش دڵخۆش بوو بەم هەواڵە .

ئەمجا پێی وت :

ئەچن بە هیچ لایەکدا ... تا دەگەڕێمەوە .

چووەوە ماڵ و سندووقی زێڕەکانی هێناو هاتەوە .

هەندێکی دابە سەرۆکی دەرگاوانان و وتی :

هەر یەکێکی ئەم خێزانە (٤) دەست جل و (٣٠) دەستەسڕو چی یان پێویستە بۆیان بکرێ .

ئەمجا فەرمانیدا :

بیان بەنە گەرماو و بە ناوی (خولنجان) و (ئاوی سێو) بیان شۆن . جلوبەرگی جوانیان لەبەر بکەن . (٣) ڕۆژ لە خواردنی باشی وەکو گۆشتی مریشك و میوەی گرتن . دواتر کە کەمێك بە خۆیانا هاتنەوە گەرماوێکی تریشی پێکردن و جلوبەرگی پێ گۆڕین . دواتر بەرەو ماڵی سەرۆکی دەرگاوانی کردنەوە . خۆیشی بەرەو کۆشکی خەلیفە بووەوە. چووە ژوور بۆ لای خەلیفە . کڕنووشی بۆ برد. ئەمجا چیرۆکەکەی بۆ گێڕانەوە و تێی گەیاندن کە غانم و دایکی و خوشکی لێرەن !

خەلیفە فەرمانی دا بە پاسەوانێکی : غانمم بۆ بێنن .

جەعفەری وەزیر چوو غانم ئامادە بکات . ( قوت القلوب ) پێشی کەوت و گەڕایەوە . پێی ڕاگەیاند کە خەلیفە دەیەوێت غانم ببینێت. ئامۆژگاری کرد . کە : ورەی بڵند بێت . لای خەلیفە زمانی شیرین بێت .

جلوبەرگێکی جوانی لەبەر کردو پارەی دایە وپێی وت :

پێش چوونە لای خەلیفە . خەڵاتی دەست و پێوەنەکانی بکە و دیارییان بدەرێ . دواتر ئەبو جەعفەری وەزیری بە سواری هێسترەکەیەوە بینی . کڕنووشی بۆ برد .

ئەستێرەی بەختی غانم کەوتە ڕووناکی و وەزیر لەگەڵ خۆی بردی . تاکو بەردەم خەلیفە . لەوێ کە سەیری کرد هەموو وەزیران و پیاوماقوڵانی مەملەکەت کۆ بوونەتەوە .

( غانم ) سەری بۆ خەلیفە نەوی کرد .. بە زمانێکی شیرین ئەمەی وت :

سڵاو لە پاشا:سەرگەورەی هەمووان   خاوەنی چاکە و پاداشت و ئیحسان
پێشەنگی شاهان لە کردەوەدا..   لە ئاشتەوادا: سەردەستەی پیاوان
هەرکە بینیان ئەم شایە: هەموو   یەکسەر بۆی دەبەن کڕنوشی شاهان
هەر لە خۆت جوانە ئەو پلە وپایە   پێی بڵندبەوە: گەورەم ئەی سوڵتان
زەوی و گۆڕەپان سوپای تۆ ناگرن   بارگەی خۆت هەڵدە: لە شاخ و کێوان
دادوەریی تۆیە زەویی پۆشیوە   دا د و دانیشتوان : هەر وەکو بران

کە لە هۆنراوەکە بووەوە ، خەلیفە پێی خوشحاڵ بوو . سەری لێی سووڕما! فەرمانی پێدا.. سەری بێنێتە پێشەوە .

چرپانی بە گوێیدا :

بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە .

ئەویش لایەوە دانیشت و دەستی کردە گێڕانەوەی . کە خەلیفە بۆی دەرکەوت بەسەرهاتەکەی ڕاستە .. خەڵاتێکی باشی کرد .

ئەمجا پێی وت : ئەوا من لێت خۆش بووم .

( غانم )یش وتی : گەورەم کۆیلە و سامان و دارایی هی ئاغایەتی .

خەلیفە دڵی بە قسەکەی کرایەوە . بۆیە فەرمانیدا : کۆشکێکی بدەنێ . مووچەیەکی
باشی بۆ ببڕنەوە . ئەمجا ئەویش دایك و خوشکی لەو کۆشکەدا نیشتەجێ کرد . خەلیفە کە
خوشکەکەی بینی بوو ، چەند جوان و ناسك و خانومان بوو، داوای لە (غانم) کرد تاکو
بیداتێ و لە خۆی مارە کرد .

چونکە ( غانم ) لە وەڵامدا وتبووی :

خوشکم کەنیزەکتە و خۆم کۆیلەت .

ئەمجا(١٠٠٠) دیناریشی دایە ( غانم ) و قازی و دوو شایەتی ئامادە کرد . هەر لەو
ڕۆژەدا خوشکی ( غانم )ی مارە کرد و ( قوت القلوب )یشی لە ( غانم ) مارە کرد .
فەرمانیشی دا چیرۆکی ( غانمی کوڕی ئەیوبی)ش ، لە مێژوودا بنوسرێتەوە . لەکتێبخانە
دا هەڵبگیرێت . تاکو پشتاو پشت بخوێنرێتەوە و هاوڵاتیان بزانن کە قەزا و قەدەر.. چۆن
ڕۆڵ دەبینێ لە ژینی مرۆڤدا !!

شەهرەزاد وتی :

پاشام خۆ.. ئەم بەسەرهاتە عەجایب تر نییە لە چیرۆکی ( شا عومەرکوڕی نعمان ) و (
شرکان و ضوءالمکان ی کوڕی ! کە ئەمانە بەسەرهاتێکی زۆر عەجاییبیان بە سەر هاتووە ..!

شا شەهریار پرسیی :

باشە چیرۆکی ئەوانە چۆن بووە ..؟

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

## شەوی ٤٥

## بەسەرهاتی شا عومەری کوڕی نعمان و دوو کوڕەکەی

شەهرەزاد وتی :

دەگێڕنـــەوە ... ئـەی شا شەهریار... پـادشای بەختیار....

پێش خەلافەتی ( عبدالملك کوڕی مروان ) پاشایەك هەبووە .. لە ( بغداد) ناوی (
عومەری کوڕی نعمان ) بووە .. مەزن و بە توانا بووە . لە جەنگەکانی ( قەیسەر) و (کیسرا
)دا براوە بووە . هێندە سوپاکەی بە هێز بووە هیچ سوپایەکی دەوڵەتانی دەور وبەری
شانیان نەداوە لە شانی!! بۆیە ناوچەیەکی زۆری حوکم کردووە و سوپاکەیشی دەگەیشتە
ئەو پەڕی مەملەکەت .

ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای لە ژێردەستا بوو . بە ( هند ) و ( چین ) و( سەند ) و (حجاز) و
( یەمەن) و (جزائر)یش لەگەڵ ( دیاربەکر) و ( سەیحون ) و ( جەیحون ) و ڕووباری ( نیل

) و ( فورات ) . تەتەرەکانی بە هەموو لادا بلاو بوو بوونەوە و هەوالگیریان بۆ مەملەکەت دەکرد . هەوالی دادپەروەری و بەرکەمال بوونی ئاسایشی مەملەکەت و ئارامییان بۆ سولتان (عومەری کوری نعمان) دەهێنایەوە .

ئەی پاشای زەمان سولتان ( نعمان) هێندە ناسراو بوو، کە دیاری لە شتی نەختینە و دێرینی بۆ دەهات . ئەم سولتانە کورێکی بوو ناوی (شرکان ) بوو. زۆر لەخۆی دەچوو . نەخۆشی یەك لە مەملەکەتدا بلاو بووەوە . کە پالەوانانیش لە ئاستیدا داماو بوون . سولتانیش هەر ئەوکورەی هەبوو.

دەبوو دوارۆژ ببێتە جێنشینی و زۆریشی خۆشدەویست . تەمەنی بە (٢٠ )سالان گەیشتبوو . هێز و توانای وای هەبوو کە هاولاتیان نەیان دەتوانی سەر پێچیی بکەن . سولتان ( نعمان )یش (٤ ) ژنی شەرعیی هێنابوو . کە لەو (٤ ) ژنە تەنیا شرکانی هەبوو . چەندین کەنیزەکیشی بوون !!

ئەم کورەی ناوبانگی دەرکردبوو. بۆیە باوکی زۆر دلی پێی خۆش بوو . کەنیزەکێکی سکی پڕ بوو.

سولتان زۆر دل خۆش بوو و وتی : بەلکو ئەمە خوایە .. ئەم سکەش کوڕ بێت و ئەوەم زۆرتر بێت !! سولتان زۆر پەزێرایی دەکرد .

شرکان کە بەم کارەی باوکی زانی پێی ناخۆش بوو و لە دلی خۆیدا وتی :

ئەوا.. برا بەشم بۆ بوو، لەحوکمرانیدا! بڕیاریدا : ئەگەر ئەو کەنیزەکەی ژنی : کوڕی بوو ، بیکوژێت !!

ئەمە حالی (شرکان) بوو. کەنیزەکەکە دیاریی شای ( رۆمی قیساری)یە بوو، بۆ سولتان لەگەل چەند ئاسەواری دێرینی مێژوویی .

ئەو ژنە کەنیزەکەی ناوی ( سەفیە ) بوو. جوانترین کەنیزەکی سولتان و پاکیزە ترینیان بوو .

هەموو جارێك بە سولتانی دەوت :

خوازیارم کوڕێکم لە تۆ هەبێت ! تاکو بە جوانترین شێوە پەروەردەی بکەم بۆت .

کە سولتان زۆر دلی بەو قسەیە خۆش دەبوو. ئیدی لەسەر خواپەرستی سەرومڕ بوو. نزا و پارانەوەی هەر ئەم ئاواتە بوو.. یەزدانیش نزاکەی پەسەند کرد .

پاشایش خزمەتکارێکی راسپارد بوو کە مندالەکەی بوو.. هەر زوو هەوالی بۆ بێنێت . کاتێك کەنیزەکەکە مندالەکەی بوو.. ( مامان )ەکان روونیان کچێکی قەشەنگی جوانە . دەورو بەر زانییان و هەوال گەیشتەوە بە پاشا ... هەروەها بە (شرکان)یش کە دەورو بەر چۆل بوو.

(سەفیە) بە مامانەکانی وت :

کەسێک چاوڕێ بێ .. هەست دەکەم ڕەحمم (ساوا)ی تری تیاماوە ! ژانی تری بۆ هات .
خوا بارمەتی دا و یەکێکی تری بوو. مامانەکانی سەرنجیاندا... کوڕێکی ناسك وجوانە !
ئەوانەی دەوروبەری کە بەسەریان ژانی کەوتنە .. هەلهەلەکێشان و شادی کەوتە
کۆشکەوە . کەنیزەکەکانی دی بەخێلیان پێ برد . کە خەلیفە ( عومەری کوڕی نعمان)یش
چووە ژوورسەری و ناوچاوانی ماچ کرد و سەرنجی کوڕەکەی دا . کەنیزەکان کەوتنە دەف
لێدان و گۆرانی وتن و ئاهەنگ گێڕان .
خەلیفەش فەرمانیدا کوڕە ناو بنێن ( جووتکان ) خوشکەکەیشی ( نزهە الزمان ) .
فەرمانیشیدا : دایەن و بەخێوکەر و شوێنی تایبەت و خزمەتکاریان بۆ دانراو مووچەیان بۆ
بڕایەوە .
هەواڵەکە بە شاردا بلاو بووەوە و شاریان ڕازاندەوە و شیرینیان گێڕا. وەزیران و پیاوانی
دەولەت و پیاوماقولان چوونە پیرۆزبایی خەلیفە . ئەویش کەوتە خەلات کردن و
بەخشیش دان .
بەم شێوەیە (٤) ساڵ تێپەڕی و زوو زوو خەلیفە لە( سەعیە ) و منالەکانی دەپرسی
یەوە و سەرپەرشتی دەکردن . لەگەڵ ئەم کەمین و بەینەدا.. هێشتا ( شرکان )ی کوڕی
ئەمیرانی بوو کە ئەم کوڕە بووە ..! چونکە پێی وابوو کە تەنیا کچێکیان بووە . ئەوانیش
چەندین ساڵ تێپەڕی و ئەو هەواڵەیان لێ شاردەوە .
ڕۆژێکیان نعمان کە لێی دانیشتبوو ڕاوێژکارەکەی هاتەلای وکرنووشی بۆ بردو وتی :
ئەی پاشای مەزن .. نوێنەری پاشای ڕۆم و خاوەنی قوستەنتەنیە هاتووە . دەیانەوێت
بت بینن ، گەر دەفەرموویت با بێنە ژوورەوە . کە هاتنە ژوورەوە ، ڕووی پێدان و
پرسیاری هۆی هاتنیانی کرد .
ئەوانیش کرنووشیان بۆ برد و وتیان :
ئەی پاشای دانا ..گەورەی بە توانا.. ئێمە شا( ئەفرەیدون ) ، پاشای ( یونان ) خاوەنی
سوپای ( نەسرانیان ) کە لە ( قوستەنتەنیە )یەیە ناردوونی ! کە ئەمڕۆ لە جەنگدایە ،
لەگەڵ سوپای شای ( قیسارییە ) . بە هۆی ئەوەوە کاتی خۆی هەندێ لە پاشایانی ( عەرەب)
لە داگیر کردنەکانیاندا گەنجینەی گەورەی ئەسکەندەریان دۆزیوەتەوە و ( ئەختینە ) بە
نرخەکانیان ڕاگواستووەو هێنەدەیان شت لێ بردووە کە لە ژماردن نەهاتووە ! ( ٢) ( گۆی )
خڕی بە هێندەی هێلکەی (نەعامە)یەکی تێدا بووە کە لە زێڕی سپی دروست کراوە. لە
دنیادا لە وێنەی نەبووە ! هەر یەکەیان بە خەتی ( یونان ) ی چەند نهێنی یەکیان لەسەر
نەخش کراوە . کە چەندین سیفاتی تایبەت بە خۆی بووە . یەکێك لەوانە گەر هەر
مندالێك لە ملی بکات : هەرگیز تووشی کێشە نابێت و نەخۆش ناکەوێت و ئازار ناچێژێت !
ئەویش کە ئەمەی زانی چەندین دیاریی بۆ شا ( ئەفرەیدوون ) نارد . لە نێو ئەوانەدا ئەو

( ٢) گۆیه بوو.

( ٢ ) پاپۆڕی ئاماده کرد ، یهکێکیان دیاری و شتومهکهکانیان تیا بار کردبوو ، ئهوی تریان پیاوانی جهنگاوهر بۆ پاراستنی شتومهکهکان .. پاشای (عهرهب ) به ناوبانگ بوو، پاپۆڕهکانی له دوورهوه دهناسران و کهس بۆی نهبوو دهست بێنێته ڕێ یان ، لهسهر ڕێگاکهشیدا دهست و پێوهندانی شا ( ئهفرهیدون )ی لێ بوو.

ههر وا دهستی کرد و شهو ڕووناک بوو . بێدهنگ بوو

## شهوی ٤٦

شههرهزاد وتی :

دوو پاپۆڕهکه ئاماده کران و به ڕێ کران . که له وڵاتمانهوه نزیک بوونهوه ، چهند ڕێگرێك پهیدا بوون . سهر به ( قیسارییه )ی یونان بوون . دهستیان به سهر دیاری یهکانیا گرت و ههموو جهنگاوهرانی پاپۆڕهکهی تریان کوشتن . که ( ئهفرهیدون ) شا ئهم ههواڵهی پێگهیشت سوپایهکی نارده سهر یونانیهکان .

بهڵام دواتر لهو جهنگهدا به شکاوی گهڕانهوه . جاری دووهم سوپای کردنهوه سهر و لهگهڵیاندا جهنگان . دیسان ڕاونران و به شکاوی گهڕانهوه .. ئێستاش شا ( ئهفرهیدون ) سوێندی خواردووه که دهبێت به سهرکردایهتی خۆی هێرش بهرێته سهر ( یونان )یهکان و وڵاتهکهیان خاپوور بکات . ئهمجا دیاری یهکانیان لێ بسهنێتهوه و که ئهو( ٣)گۆیهیشی تیا بوو . بۆیه ئێمهشی ناردووه، داوای یارمهتیتان دهکات . شا( ئهفرهیدون ) بڕێك دیاریشی بۆ ناردوون . جارێکی دی کڕنوشیان بۆ شا( عومهر) برد .

که دیاری یهکانیان گواستهوه کۆشکی شاعومهر (٥٠) کهنیزهکی ڕۆمی تایبهت و (٥٠) خزمهتکار بوو . سنگ وگهردنیان بهملوانکهی زێڕ ڕازابووهوه . ههر خزمهتکار و کهنیزهکێك گوارهکهی گوێی (گۆ)یهکی تیابوو، که بایی (١٠٠٠) درههم زێڕی پێوه بوو. بهرگهکانی بهریشیان قوماشی گرانبهها بوو. که ( شا عومهر) ئهمانهی بینی زۆر خۆشحاڵ بوو. فهرمانی دا .. پهزێرایی باشی نوێنهرانی میوان بکرێن . خۆیشی لهگهڵ وهزیرهکان بۆ ڕاوێژکردن کۆ بووهوه .

وهزیرێکی پیریان ههستا و کڕنووشی بۆ شا برد و وتی :

پێویسته سوپایهکی زۆری تۆکمه به سهرکردایهتی ( شرکان ) بنێرێت بۆ یارمهتی دانیان . ئێمهش بهندهی بهردهستی تۆین . ئهم کارهش لهبهر( ٢) هۆ.. یهکهمیان : چونکه پاشای ڕۆم هانای بۆ تۆ هێناوه و تۆش دیاری یهکانی ئهوت پهسهند کردووه . دووهمیان : دوژمن شهڕی لهگهڵ سوپای تۆ بۆ ناکرێت . که سوپای تۆش بهرگری له ڕۆم کردو سوپای دوژمن شکا.. ئهوا سهرکهوتنهکه به ناوی تۆوه دهبێت و له وڵاتانی دوورو بهردا، بڵاو دهبێتهوه . ئیدی ئهو دهوڵهتانه ، دهکهونه ناردنی دیاری و خهڵات بۆ تۆ . شا ئهمهی له

( دندان )ی وەزیری بیست . زۆری بە دڵ بوو، خەڵاتیشی کرد .

ئەمجا پێی وت :

هەموو دەم پێویستە پاشایان ، بیرو رای تۆ وەربگرن . تۆش لەگەڵ ( شرکان )ی کوڕمدا دەکەمە پێشەنگی ئەو سوپا مەزنە .

ناردی بە شوێن (شرکان )ی کوڕیداو بیرو ڕای ( دندان )ی وەزیری بۆ گێڕایەوەو فەرمانی پێدا کە (١٠٠٠٠) جەنگاوەری شۆڕەسوار، هەڵبژێرێت و پڕچەکیان بکات و ئامادەیان بکات .

ئەویش جەنگاوەرانی ئامادە کردو بەخشیشی پێدان . باوکی ئامادە کرد تا ئەو سوپایە ببینێت . بە سوپاکەی ڕاگەیاند سێ ڕۆژ مۆڵەتیان هەیە . دواتر هێرش دەبەن . ئەوانیش ئامادەیی خۆیان پیشان دا. دواتر، شا عومەر (٧) گەنجینە سامانی پێشکەش بە شرکانی کوڕی کردو ئامۆژگاری وەزیریشی کرد . کە چاودێری ( شرکان )ی کوڕی بکات . ئەمە لە دەرەوەی شار رووی دا .

ڕەشماڵ ودەوارێکی زۆر لە دەرەوەی شار بۆ سەربازەکان لێدرابوو . فەرمان درا بە سەر سەرکردەکان کە لەشکرەکانیان بپشکننەوە . خواحافیزی لە پاشا کراو تەپڵی شەڕ لێدراو سوپاکە ، جوولا .

ئەو ڕۆژە تاکو شەو بەڕێوە بوون . بەیانی ڕۆژی دووەم سوپاکە کەوتەوە ڕۆیشتن . کۆمەڵێك جەنگاوەر پێش دەکەوتن و ڕێگایان دەپشکنی و دەگەڕانەوە . (٢٠) ڕۆژ بەڕێوە بوون و گەیشتنە دۆڵێکی فراوانی پڕ دارو درەخت و سەوزایی . ئێوارە بوو .

( شرکان ) فەرمانیدا : باروبنە ... بخەن .

سێ ڕۆژ لێرە دەمێنینەوە . سوپا لایداو دەوارێکی زۆر لێدرا. سەربازان بە ڕاست وچەپدا بڵاو بوونەوە . ( دندان )ی وەزیر و نوێنەرانی شا ( ئەفرەیدون ) .. پاشای ( قوستەنتەنیە ) کەوتنە گەڕان بەو دۆڵەدا .

بەڵام ( شرکان ) چاوەڕێی کرد . تاکو سەربازەکان ، دەواریان هەڵداو جێگیر بوون . ئەمجا لەسەر ئامۆژگاری شای باوکی ئاوزەنگی لە ئەسپەکە دا . کەوتە پشکنینی ئەو دۆڵە و بووە چاودێری سوپاکەی . چونکە چوو بوونە زەوی وڵاتی ڕۆمەوە کە زەوی دوژمنەکەیان بوو. دەست و پێوەن و پیاوانی دەورو بەری ناردبووە لای ( دندان )ی وەزیرو هەرخۆی بوو . بە هێندەی چواریەکی شەو لە سوپاکەیەوە دوور کەوتبووەوە ماندووی ڕێگاش بوو. بەسەرپشتی ئەسپەکەیەوە.. خەوی لێ کەوتبوو.

نیوەشەو بوو.. ئەسپەکەیش هەر ڕۆیشت . تاکو گەیشتە دارستانێك و چووە ناوەوە.( شرکان )یش بە ئاگا نەهاتەوە . تاکو ئەو کاتەی ئەسپەکەی ژێری کەوتە سمکۆڵان . کە بە ئاگا هاتەوە خۆی لە ناو دارستانێکدا بینی یەوە ! تریفەی مانگەشەو لە نێوان

درەختەکانەوە دەبینرا .

شرکان سەری سوورِما و لەبەرخۆیەوە وتی :

لاحول و لاقوة الا بالله العلي العظيم .

دوای کەمێك گوێی لە دەنگێکی ناسکی خۆش بوو . بۆیە دابەزی و ئەسپەکەی بە دارێکەوە بەستەوە و بەرەو دەنگەکە چوو. رۆیشت.. رۆیشت ، تاکو گەیشتە کەنار جۆگەلە ئاوێك .. ئەمبەر و ئەو بەری گوڵ و لالەزار بوو. دارو درەخت و گوڵی بەهار بوو. دیمەنی ئەو ئاوە بە شەپۆلیەوە . گوڵزار بە بولبولی یەوە .

گوێی لە ژنێك بوو دەیوت :

بە گیانی مەسیح ، ئەمەی ئێوە کارێکی باش نییە ! هەر کەس قسە بکات قۆڵبەستی دەکەم ! ئا لەو دیمەنە دڵڕفێنە خۆشەدا کە دەتوت ئەم شیعرە بۆ ئەو شوێنە وتراوە :

دامێنی دەشتیش بە گوڵزارەوە    لە سەردا ئاوی بێتە خوارەوە

دەستکردی خوایە ، کەوا توانستە    ئەو بەرە زۆرەی وا بە دارەوە

شرکان سەیرێکی دەورو بەری خۆی کرد . کڵێسەیەکی کۆنی بینی . لە ناو کڵێسەکەیشەوە قەڵایەکی بڵندی بینی ، لە هەوادا کە لەبەر تیشکی مانگەشەوەکە ، دەبریسکایەوە . لە ناوەڕاستیدا رووبارێك هەبوو بە ناو رەزو باخەکەیدا دەڕۆیشت . ژنێکی بینی (١٠) کەنیزەك بە دەوریەوە بوون . دەتوت مانگی چواردەن . سەرتاپایان زێڕ وخشڵ بوو. روانین لەو کچانە . مایەی سەرسووڕمان بوو.

( شرکان ) گوێی لە ژنەکە بوو، پێی وتن :

وەرنە پێش با زۆران بگرین .

یەکێکیان لێی چووە پێش . ئەویش هەر زوو پەلاماری دا و بە کەمەندەکەی خۆی قۆڵبەستی کرد . ئیدی لەو ناوەدا زۆرانبازی کرا . تاکو هەر هەموویانی قۆڵبەست کرد .

کەنیزەکێکی پیر، رووی تێکرد پێی وت :

دڵت بە خۆت خۆشە کە هەموویانت قۆڵبەست کرد . من بەم پیریەوە (٤٠ ) جاران قۆڵبەستم کردون .

ناشێ بە خۆت بنازیت !!؟ گەر خۆت بە بە هێز دەزانیت . لەگەڵ من دا دابەزە مەیدان .. با.. سەرت بخەمە نێوان هەر دوو قاچت .

ژنەش بزەیەکی سەرزارەکی هاتە سەر لێوان .

لە ناخیشەوە ، تووڕەو توند ببوو و پرسیی :

ئەرێ فێڵاوی هەر بە ڕاستتە .. زۆرانبازیم لەگەڵ دەکەیت ! یان سوعبەت دەکەیت !؟

کەنیزەکە پیرەکە وتی :

زۆر بەڕاستمە !

ئەمجا ژنەکە وتی :

دەی هەستە ئەگەر هێزت تیایە !

کەنیزەکە پیرە ، هێندە توند بوو کە مووەکانی سەری وەکو پەڕی ژیشك راست بوونەوە . هەڵمەتی برد و دەتوت ئەژدیهایە و راست بووەتەوە . ژنەش هەڵمەتی بۆ برد . ( شرکان )یش ئەوا سەیریان دەکات و بە پیرەژنەش پێدەکەنێ . کاتێ باوەشیان بەیەکدا کردبوو ( شرکان ) سەری بلند کردەوە و لە خوا پاڕایەوە . ژنەکە سەر بخات بە سەر کەنیزەکە پیرەکەدا . لە کاتێکدا پیرەژن ویستی لە دەستی ژنە خۆی رزگار بکات ، لەسەر پشت کەوت . شرکان شمشێرەکەی هەڵکێشا هەڵی کوتایە سەری کە سەیری ئەم لاو ئەولای خۆی کرد لە پیرەژنە زیاتر کەسی دی نەبینی .

لە پیرەژنە تووڕە بوو و وتی :

*لەخۆڕا ، ناویان نەناویت !! تۆ هێز و توانای ژنەکەت بینی بوو، ئەمەت بۆ کردا؟*

شەهرەزاد هەستی کرد شەو ورەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٤٧**

چیرۆکی شرکان و شا دیریزە

شەهرەزاد وتی :

ئەمجا لە هەردووکیان نزیك بووەوە . بۆ ئەوەی گوێی لە قسەکانیان بێت .

کەنیزەکەکە هاتە بەردەم پیرە کەنیزەکە و وتی :

ببوورە ویستم بتدەم بە زەویدا..کەچی لە دەستم ترازایت !! سوپاس بۆ خوا، سەلامەت بوویت . ئەویش بێدەنگ بوو. بە تەریقی یەوە لێی دوور کەوتەوە ... تا لە چاوان ون بوو .

ئەوانی تر بە دەست بەستراوی کەوتبوون ! خۆیشی بە دیاریانەوە وەستابوو .

( شرکان ) لە دڵی خۆیدا وتی :

( رۆژیی )یش بەبێ هۆ نابێت ! خەو کە چووە چاوانم ئەسپەکەش بۆ ئێرەی هێنام ! ئەمەش لە بەختی خۆم بوو. کێ دەڵێت ، ئەم کەنیزەکە و ئەوانی دیش بە نسیبی من نەبوون !!؟

ئاوزەنگی لێدا، ئەسپ هەر وەکو تیر لە کەوان دەرچوو . شمشێرەکەش بە رووتی بە دەستیەوەبوو .

هاواری کرد : الله اکبر.

کەنیزەکەیش کە ئەمەی گوێ لێ بوو تەکانی دایە خۆی و بازێکی دایە ئەوبەر جۆگەکەوە .

بە هەموو توانای هاواری کرد :

تۆ کێی ، کە لێت تێکداین و بە شمشێرێکی رووتەوە ، دەڵێی پەلاماری سەربازگە دەدەیت ؟ چیت دەوێت و لە کوێوە هاتوویت !؟ راست بڕۆ، درۆ مەکە ، چونکە درۆ کاری پیاو خراپانە . گومانی نییە رێگەت هەڵە کردووە بەم شەوە ! بەختت باش دەبێت ، گەر بە سەلامەت رزگارت ببێت! چونکە لە شوێنێکدایت هەر ئێستا نەعرەتە لێ بدەم سوپایەکی (٤٠٠٠ ) کەسی دادەبارن بە سەرتا. پێمان بڵێ چیت دەوێت ؟ گەر رێگات هەڵە کردووە بت خەینەوە سەر رێگا.

شرکان کە ئەمەی بیست پێی وت :

من کابرایەکی موسڵمانم .. لەشوێن دەستکەوتێك ..نێچیرێك دەگەڕام . رێگام هەڵە کرد . ئێستاش ئەم کەنیزەکانەم دەست کەوتووە ، دەیان بەم و دەگەڕێمەوە ناو هاورێکانم .

کیژەکە وتی :

ئەوە بزانە دەستت بەو کچانە ناگات ! لەبەر ئەوە .. بە دەستکەوتی خۆتی مەزانە ! ئەی پێم نەوتویت : درۆ کردن باش نی یە؟

( شرکان ) لە وەڵامدا وتی : ژیر ئەو کەسەیە پەند لە کردەوەی خەڵك وەر دەگرێت !

کیژەکەیش وتی :

بە گیانی مەسیح .. لە ترسی ئەوە نەبێت کە خوێنت دەچێتە ملم . ئێستا نەعرەتەیەکم لێ دەدا ، هەموو ئەم دەورو بەرەم پڕ دەکرد، لە سوارەی چەکدار. بەڵام بەزەییم بە نامۆیاندا دێتەوە! ئەگەر هەر نێچیر و دەستکەوتت دەوێت : سوێند بخۆ بە ئاینی خۆت ، دەست بۆ چەك نەبەیت ... من ئامادەم زۆرانت لەگەڵدا، بگرم !! گەر تۆ زاڵ بوویت و پشتت لە زەوی دام .. ئەوا لەبەردەمی خۆتدا سوارم بکە و بمبە بۆ خۆت . کەنیزەکەکانیشت بە دواوە ! خۆ ..گەر من زاڵ بووم و پشتی تۆم لە زەوی دا ! ئەوا .. چارەنووست دەکەوێتە دەست من . ئەو سوێندەم بۆ بخۆ .. چونکە بیستوومە زۆرداران متمانەیان پێ ناکرێت .

( شرکان ) بەخۆی وت :

ئەم کەنیزەکە نازانێت : من پاڵەوانم .

چاویشی بڕی بووە خۆی ..! بۆیە پێم وت :

تۆیش سوێندم بۆ بخۆ : کە ئەو مەرجانە جێ بەجێ دەکەیت . منیش سوێندت بۆ دەخۆم تاکو خۆت نەڵێیت : ئامادەم نزیکت ناکەومەوە . گەر منت بە زەویدا دا ، ئەوا هێندەم سامان هەیە ، خۆمت لێ بکڕمەوە . گەر منیش بردمەوە ئەوا .. خۆت گەورەترین دەستکەوتیت بۆ من .

کەنیزەکەکە لە وەڵامدا وتی : لاریم نی یە !

شرکان کەمێك راما، دواتر بڕیاری دا : بە پێغەمبەر (د.خ )منیش لاریم لێ نی یە !

ئەمجا کەنیزەکە وتی :

سوێند بخۆ بەوەی کە گیانی کردووە بە بەر لاشەکانا . ڕێنمایی مرۆڤی سەرزەوی کردووە . کە لە زۆران زیاتر، هیچ کارێکی تر لەم زۆرانبازی یە زیاترت لەگەڵدا ناکەم .گەر بە پێچەوانەوە ، رەفتارم کرد ، لە ئایینی ئیسلام بێ بەری بم .

ئەمجا شرکان وتی :

بەو خوایە قازی حوکمی بەسەردا بداماپە ، نەیدەزانی بەم شێوەیە سوێندم بداتێ سوێندی خوارد .

دابەزی و ئەسپەکەی بە دارێکەوە ، بەستەوە .. لە کاتێکدا بیری هەر بە لای ئەم زۆرانبازییەوە بوو ، خۆی گورج کردەوەو ئامادەی زۆران بوو .

بانگی کەنیزەکەکەی کرد :

دەی ، وەرەوە ، ئەمبەرجۆگەکە .

کەنیزەکەکە وتی :

نەخێر ، تۆ بپەڕەوە بۆ لای من .

شرکان وتی :

من ناتوانم ، لەم جۆگە ئاوە بدەم . تا بپەڕمەوە .

کەنیزەکەکە وتی : دەی .. ئەی لاو.. من دێم بۆ لات .

ئەمجا بە بازێك هاتە ئەمبەر . پەلاماری ( شرکان )ی دا ، بلندی کردەوە ئاسمان و دای بە زەوی دا .

ئەمجا پێی وت :

ئەی موسڵمانان ئێوە هەمیشە دەستتان کراوەیە لە کوشتنی کافران دەڵێی چی بتکوژم !؟

ئەویش وتی :

خانم کوشتنی من حەرامە ، چونکە پێغەمبەرمان موحەممەد (د.خ) کوشتن بە دەستی ژنانی حەرام کردووە !! هەروەها منداڵان و پیران و قەشەیانیش .

کچەش وتی :

گەر ( محمد )تان فەرمانی ئاوای دابێت پێویستە سوپاس بکرێت ! دە برۆ.. ئەوا منیش ئازادم کردیت .

چونکە چاکە لای ئێوە ون نابێت !

( شرکان) هەستایەوە سەرپێ ... خۆی تەکاند .

ئەویش بازی دایەوە ئەوبەر جۆگەکە و بە پێکەنینەوە بە ( شرکان )ی وت :

ئاغام ، هەرچەند ، پێم ناخۆشە لێم دابڕێیت .. بڕۆرەوە بۆ لای هاورێکانت ، تاکو هێزەکانی ( بەترێرك ) نەهاتوون . چونکە بەردەستی یان بکەویت : دەتکەنە سەرە

رەمەکانیانەوە . تۆیش بە نا شوگری نەبێت دەرەقەتی ژنان نایەیت !! ئیدی چۆن شەڕی شۆڕە سوارانت بۆ دەکرێت !؟

شرکان سەری لە خۆی سووڕما..!

کەکەنیزەکەکە پشتی تێکردوبەرەو کڵێسەکە بووەوە ، پێی وت :

خانم ... جا چۆن دەبێت من لە ناوچەی وڵاتی تۆدام . نەمەکت نەکەم و تێرم نەکەیت !؟

کە ئێستا من یەکێکم لە خزمەتکارانت .

کەنیزەکەکەش وتی :

کوا رەزیل بەخشندەیە؟ فەرموو ناوی خوای لێ بێنە ، بەسەرچاوان . سوار بەو، بەو بەری رووباردا لە تەکم بە . پێکەوە ڕۆیشتن تا گەیشتنە پردێکی لە دار دروستکراو کە بە چەند چەرخێکی: زنجیری پۆلایین بەستراوی بە قفڵ کلۆم دراوی پێوە بوو .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٤٨**

شەهرەزاد وتی :

(شرکان) سەیرێکی ئەو پردەی کرد . بینی ئەو کەنیزەکانەی کە لە زۆرانبازیەکەدا لەگەڵی بوون . لە سەر پردەکە چاوەڕێی دەکەن .

کە ئەمانیان بینی یەکێکیان بە زوبانی ڕۆمی فەرمانیدا :

بڕۆن ... یەکێکتان جڵەوی ئەسپەکەی بگرن و بیپەڕێننەوە ، بۆ کڵێسەکە .

ئیدی کەنیزەکە لە پێشەوە و ( شرکان ) بە دوایدا . تا گەیشتە کڵێسەکە .

شرکان کە ئەمەی بینی بەلایەوە زۆر سەیر بوو!! وتی :

ئێستا دوو جاران بە سەر تۆوەم هەیە . جارێکیان بوومە هاوڕێت ، جاری دووەم بوومە میوانت و

ئێستا لە ژێر سایەی تۆدام . خۆزگە تۆش ، ئاوا دەبوویتە هاوڕێم و وڵاتی موسڵمانانت دەبینی! شێرانی سوارچاکی ئێمەت دەبینی تا لەوێیش منت بناسی بایە .

کە کەنیزەکەکە ئەمەی بیست، تووڕە بوو وتی :

بە گیانی ( مەسیح ) تۆم بە کەسێکی ژیر دانابوو . بەڵام بۆم دەرکەوت ، کە چەندە کاڵفام ودڵ خراپیت ! کە ئەڵێیت : شێرانی موسڵمانت بدیایە ! بە ڕۆحی ( مەسیح ) ڕاست ناکەیت . چونکە ئەم (٢) ڕۆژە .. کە لەسەر زەوی ئێمە هەڵتان داوە .. سوپاکەتانم بینی ! هیچ ڕێکخستنێکی شاهانەم نەبینی !! بەڵکو کۆمەڵێکی تایەفەگەریانەم بینی ! ئەوەش کە وتت : منت بناسی بایە . من لەبەر پلە و پایە و ناوبانگت ئەمەت لەگەڵ ناکەم ! بەڵکو لەبەر بەخۆ نازینم چاکەت لەگەڵ دەکەم کەسی وەکو تۆ، نابێت ئاوا بە کەسی وەکو من

بڵێت . ئەگەر (شرکان)ی کوڕی شا (عومەری کوڕی نعمان)ی ئەم سەردەمەیش بێت ..!

(شرکان)یش پرسی : بۆچی تۆ ( شرکان ) دەناسیت !؟

ئەویش وتی :

بەڵێ .. بیستوومە لەگەڵ ئەم سوپایە هاتووە ، کە (١٠٠٠٠) چەکدارن . هاتوون بە هانای شای ( قوستەنتەنیە) وە....

( شرکان ) وتی :

خاتوون ، سوێندت دەدەم بەوەی بڕوات پێیەتی .. هۆیەکەم پێ بڵێ .

کەنیزەکەکە وتی :

بەدینت ... گەر ناوبانگم بە کچە ( ڕۆم )ی بڵاو نەبوایەتەوە شەڕم لەگەڵ هەر( ١٠٠٠٠)
سەربازەکەتان دەکرد و ( دندان )ی پێشەنگ و وەزیرم لە پێشەوە دەکوشت . ئەمجا (
شرکان )ی شۆڕە سوارەکەتان . بەڵام هەندێکم لە ڕەوشتی ( عەرەب) لە کتێباندا
خوێندووەتەوە بۆیە خۆم هەڵ ناکێشم . لەگەڵ ئەوەشدا کە بە چاوی خۆت . ئازایەتی منت
بینی . خۆ .. ئەمەشەو ( شرکان )یش لێرە بوایە نەیدەتوانی وەکو من بە بازێك لەم
جۆگەلەیە بپەڕێتەوە . ئاخ ..خۆزگە ( شرکان )م دەست دەکەوت .. بە جۆرێك دیلم دەکرد
لە پیاوەتیم دەخست ! کۆت و زنجیرم دەکرد .

کە ( شرکان ) ئەمەی بیست غیرەتی جووڵا ..! ویستی خۆی دەربخات و تێی بگەیەنێ
کە خۆی ( شرکان )ە . بەڵام لە ترسی ئەوەی غەدری لێ بکات بێدەنگ بوو . دیسان
کەوتنەوە ڕێ . تاکو گەیشتنە پردێك ، کە لە مەڕمەڕ دروست کرابوو. پەڕینەوە و
کەنیزەکێك دەروازەی بۆ کردنەوە و چوونە ژوورەوە و ناو داڵانێکی گەورە . هەر شوێنە و
مۆمێکی لە سەر داگیرسابوو . کۆمەڵێك کەنیزەك لە پێشیانەوە ، ( شرکان ) بە دواوەیانەوە
، تاکو چوونە کڵێسەکەوە . کە ڕوانی پەردەکان بە گوڵی زێڕین نەخشابوون .

قەرەوێڵەکان بەرامبەر یەك ڕازا بوونەوە . زەوی کڵێسە ، یەك پارچە مەڕمەڕ بوو.
حەوزێکی مەزن لە ناوەڕاستیدا بوو کە (٢٤ ) پلووسکی بە سەرەوە بوو. لە لایەکی دی
یەوە.. چرپایەکی لێ بوو سەرچەفەکەی سەری ئاوریشمی تورکیی شاهانە بوو .

کچەکە بە ( شرکان )ی وت : بڕۆ... لە سەر ئەو چرپایە دابنیشە .

ئەویش بە قسەی کرد . جێی هێشت و نزیکەی سەعاتێك ون بوو.

بۆیە لە کەنیزەکەکانی پرسی : ئاخۆ .... بۆ کوێ چووە ؟

ئەوانیش پێیان وت : چووەتە سەر گۆڕەکەی تا ئەو دێتەوە ئێمە لە خزمەتداین !
چەندین جۆری خواردنیان خستە بەردەم . ( شرکان )یش تاکو تێر بوو، خواردی و
خواردی یەوە . ئەمجا تەشتێکی زێڕین و حەوجۆشێکی زیوینیان بۆ هێنا.. دەستی تێدا
شوشت . بیریشی بەلای سوپاکەیەوە بوو. چونکە بێ ئاگا بوو لێ یان .

ئامۆژگاریەکانی بارکیشی بیرکەوتەوە . کە چۆن بە جێی نەهێنا . پەشیمان بوو لەو کارەی .
کە رۆژ هەڵ هات و دنیا رووناك بووەوە . هەستی بە دنیایەك کامەرانی کرد . کە بینی
کەنیزەکەکەی شەوی (٢٠) کەنیزەکی بە دواوە بوو. هاتن و هەر وەکو مانگی چواردە بوون .
بەرگی شاهانەیان پۆشی بوو . پشتوێنی نەخشی زێرین لە پشتیاندا دابوو .
کەنیزەکی خانەخوێ لێی نزیك بووەوە و سەرنجێکی قووڵیداو وتی :
کۆشکت ئاوەدان کردەوە، ئەی ( شرکان ) کە ئێمەت لەلا نەبووین .. ئەمشەوت چۆن
بردە سەر!؟

ئەمجا وتی یەوە :
درۆ کردن لە لای شاهان عەیبە !! بە تایبەتی لای گەورە شاهان ! ئەوەتا تۆ ( شرکان )ی
کوڕی شا (عومەری کوڕی نعمان)یت ! خۆتمان لێ مەشارەوە . راستگۆ بە .. چونکە درۆ
کردن رق و کینە دروست دەکات . هەر کەسێ پێکای تیری قەزایە .. دیارە رەزایە .

کە ( شرکان ) ئەمەی بیست نکولی بۆ نەکراو وتی :
بەڵێ من (شرکان )ی کوڕی (شا عومەری نعمان )م . بەرکەوتووی شەقی زەمانم . کە
ئاوا لە بەر دەستتانم . نا پاڕێمەوەو چاوەڕێی سزاتانم ..!

کەنیزەکەکە ماوەیەکی زۆر سەری نەوی کرد. ئەمجا رووی کردە ( شرکان ) و وتی :
بێخەم بە .. تۆ میوانی منی. نان و نمەك لە نێوانماندایە ! تۆ ئێستا لە سایە و
دیوەخانی مندایت و پارێزراویت . بە گیانی ( مە سیح ) هەموو سەر زەوی ، شاڵاو بێنن ..
ناتوانن ئازارت بدەن ! گیانی خۆمت لە پێناودا دەدەم . تۆ لە سایەی حەزرەتی ( مەسیح ) و
مندایت .

ئەو لەم قسانەدا بوو ژاوە ژاوێکی زۆری بیست . سەیری کرد چەکدارانێکی زۆرن و
هاتوون دەڵێن :
کەوتیتە ، بەردەستمان ئەی ( شرکان ) ... ئەوا ژیانت کۆتایی هات .

( شرکان )یش کە ئەمەی بیست .. بە خۆی وت :
بەو خوایە .. ئەم کەنیزەکە بەم قسانە .. منی فریو دا ! دوای خستم تاکو ئەمانەی
گەیاندە سەرم .

سەیرێکی کەنیزەکەکەی کرد ویستی سەرزەنشتی بکات . بەڵام کە بینی رەنگی ئەویش
هەڵبزرکاوە !
هەستایە سەر پێ و پرسیی : ئێوە کێن !؟
بە ترێرکی یەوە پێشەنگەکەیان وتی :
ئەی پاشای بەخشندە مرواری تاقانە ، ئاخۆ ... نازانیت ئەوەی لای خۆت کێ یە !؟
ئەویش وتی : نای ناسم ... کێ یە؟

پێشمنگ لە وەڵامدا وتی :

ئەوە شاران کاولکەرە ! سەر دەستەی شۆڕەسوارانە : (شرکان)ە ! کوڕی ( شا عومەری شا نوعمانە) ! ئەوە رەوێنەرەوەی بەربەستی قەڵایانە .. بە هۆی پیرەژنە مەکربازیشەوە ، ئەم هەواڵە ، گەیشتووەتە ( شاحەردوب)ی باوکت . باوکیشت ، دەیەوێت خۆی بەدوایدا بچێت . ئەم رووداوەیش تۆی کردە سەردەستەی پاڵەوانانی ( رۆم ) . چونکە ئێستا تۆ ئەو شێرەت لە ژێر دەست دایە ..!

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

شەوی ٤٩

شەهرەزاد وتی :

کە قسەکانی بەترێرکی[٥] بیست لێی پرسی :

ناوت چی یە؟

ئەویش لەوەڵامدا وتی :

ناوم ( ماسوورەی موسورە) و کوڕی کاشردەی بەندەتم . سەرۆکی بەتریرکەکان.

ئەمجا پرسی :

چۆن بە بێ ئەوەی رێت پێ بدەم ، هاتیە ئێرە !؟

ئەویش وتی :

خانمەکەم کە گەیشتمە بەردەرگا ..کەس لێی نەگرتم رێگا ! هەر وەکو جاران مەگەر کەسانێکی نامۆ بێن ... لە بەردەرگا راگیرێن ..! ئێستا کاتی ، خۆ دواخستن نی یەو پاشامان چاوەڕێ یە بگەرێینەوە و ئەم شایە لەگەڵ خۆمان ببەینەوە . کە دڕکێکی سوپای ئیسلامە! تاکو بیکوژێت و دواتر بێ ماندوو بوون ، سوپا بنێرین بۆ جەنگیان .

کە کەنیزەکەکە ئەمەی بیست پێی وت :

ئەمە قسەیەکی باش نییە! چونکە پیرەژنە فێڵاوی درۆی لەگەڵ کردوون . ئەمەی لای من پیاوێکی نامۆیە و داوای میوانداریێتی لێ کردووم و پەسەندم کردووە . ئێستاش لە سایەی مندایە .

بە گیانی حەزرەتی ( مەسیح ).. ( شرکان ) نییە . دیلیش نییە لای منە و میوانە . لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکەین . گەر دەرکەوت کە ( شرکان )ە ..جوان نیە و ویژدانم رێگەم نادات رێ بدەم ، لە ناوی بەرن .. ناپاکیم بەرامبەر ئەم میوانە پێ مەکەن و روو زەردیم بە سەردا مەهێنن لە نێو خەڵکیدا .

---

(٥)-بەترێرک : زاراوەیەکی ئاینی مەسیحییە و واتا ( باوکی باوکان ) ............ وەرگێڕی کوردی

بگەڕێوە لای بــاوکم کڕنووشی بۆ ببەو پێی بڵێ : ئەو نیە و پیرەژنە فێڵاوی درۆی کردووە .

( ماسووره )ی بەتریرکیش وتی :

خاتوو ئیبریزه ناتوانم بە بێ ئەم نێچیره بگەڕێمەوه !

ئیبریزه تووڕه بوو وتی :

دەڵێم .. بڕۆ ئەو وەڵامەی منی بۆ ببەوه ! کەسیش لۆمەی تۆ ناکات!

ماسوورەش وتی :

بە بێ ئەو پیاوه ناگەڕێمەوه .

ئیبریزه ڕەنگی تێکچوو و وتی :

زۆر مەڵێ و وڕێنە مەکە . ئەم پیاوە ورەی بڵندەو جەنگی (١٠٠ ) چەکداری پێ دەکرێت .

ئێستا بانگی بکەم و لێی دەپرسم :

ئـاخۆ.. تۆ ( شرکان )ی کوڕی ( شا عومەری نعمان)یت ؟

یەکسەر دەڵێ :

بەڵێ ! گەر جەنگی بکەن کەستان لە دەستی قوتـار نـابن و هەر چیەك لێرەدایە ، دەیکوژێت . هەر ئێستاش بە خۆی و شمشێرەکەی دەستی یەوە، دەی هێنمە بەرامبەرتان .

بەتریرك ( ماسووره )یش وتی :

گەر لە تووڕە بوونی تۆ رزگارم ببێت . لە باوکت رزگارم نابێت . گەر ئەو پیاوەم بینی . فەرمان بە بەتریرکەکان دەدەم دیلی دەکەن .. بە رسوایی دەیبەمە بەردەم پاشا .

ئەمجا ئیبریزه وتی :

هەرگیز ئەوە ڕەوا نییە! ئێوە سەد چەکدارو ئەو هەرخۆی گەر ئازان .. یەکە یەکە لەگەڵی بجەنگن !

ماسورەش وتی :

بە گیانی حەزرەتی مەسیح بۆ خۆم یەکەم کەس دەبم دەچمە جەنگی .

ئیبریزەیش وتی :

چاوەڕێ بە ، با بچم ئەمەی تێ بگەیەنم . بزانم ئەو دەڵێت : چی؟ گەر پەسەندی نەکرد ئەوا ناهێڵم دەستتان پێی بگات . خۆم و ئەم کەنیزەکانە دەبینە قوربانی ئەو .

ئەمجا چووە لای شرکان و تێی گەیاند ئەویش بزەیەك گرتی و بۆی دەرکەوت کە پێی نەگوتـــوون ( شرکانە ) ، بەڵام لە دەمی ئەمەوە بووە بە قاو و دەورو بەر زانیویانە .

بە ماسوورەی وت :

باشە بەڵام غەدریان لێ ناکەین.. با یەکە یەکە نەیەنە جەنگم ! بەڵکو هەر جارە و (١٠) جەنگاوەر بێتە بەرانبەرم .

لە دڵی خۆیدایشیدا وتی :
چیم کرد بە خۆم ناوا ، هاتمە زەوی وڵاتی رۆم !
رەست بووە و شمشێر و پێویستیەکانی جەنگی هەڵگرت و چووە بەرامبەریان .
بەترێرك شرکانی بینی یەکسەر پەلاماری دا . شرکانیش هەر وەکو شێر بۆی چوو.
شمشێرێکی بە ورگیدا کرد . لە پشتیەوە دەرچوو. جۆرێك کوشتی ئیبریزە... سەری سوڕما!!
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

شەوی ٥٠

شەهرەزاد وتی :

ئیبریزە .. چووە ناو چەکداران و وتی :

دەی ... تۆڵەی هاوڕێکەتان بکەنەوە .

برای بەترێرکە کوژراوەکە هاتەپێشەوە . دوای کەمێك ئەویشی کوشت !

دیسان کەنیزەکەکە چووە لایان و وتی :

ئەی بەندەکانی مەسیح : تۆڵەی هاوڕێکانتانی لێ بکەنەوە .

ئەمجا هەر جەنگاوەرێك پەلاماری دەدا دەکوژرا، بۆیە چاریان نەما و هەموویان پەلاماریان دا ، دوای جەنگێکی بێ وێنە ، هەموویانی لال و پاڵ خست .

ئیبریزە وتی :

شانازی بە کەسانی وەکو تۆوە دەکرێت ، ئەی .. شرکان .

ئەویش بە دەم پاکردنەوەی شمشێرەکەیەوە ئەم شیعرەی وت :

**چەندین کۆمەڵەت پەرش و بڵاوکرد      کەللە سەریانت ، بەبێ کڵاو کرد**

**لە جەنگی دەستە و یەخە بپرسن      بە شاڵاوی من خەڵکی چۆن دەمرد**

**پڵنگە پیاویان چۆن تێ دەشکان      چۆن دەبەزین و ئەستۆ و ملیان ورد**

کە ( شرکان ) لە جەنگ بووەوە . شا ( ئیبریز ) پیرۆزبایی سەرکەوتنی لێکرد و بردی بەوە ناو کۆشك .

بەشێکی کەم لە بەترێرکەکان مابوونەوە.. کە هاتەوە زرێ پۆشێك و تەورێکی بڕندەی ( هیندی) بە دەستەوە بوو.

ئەمجاوتی :

پەیمان بێت گەر بوومەتە ... گاڵتەجاڕی رۆمەکان ، رەزیلیت لێ ناکەم و هیچت لێ ناپێچمەوە .

( شرکان ) لێی پرسی :

ئەوە ! ئەو زرێپۆشەت بۆ پۆشیوە و ئەم تەورەت پێ یە ؟

ئەویش وتی : بۆ پاراستنی تۆ لەو ناپاکانە .
دەرگاوانەکانی کۆشکی بانگ کرد و لێی پرسین :
چۆن هێشتووتانە پیاوانی پاشا .. بێ ئەوەی ڕێ یان پێ بدەم .. بێنە ناو کۆشك ؟
ئەوانیش وتیان :
شا خاتوون وا ڕاهاتووین کە بێ ڕێ پێدانی ئێوە بیان کەینە ژوورەوە! بەتایبەتی بەترێرکی گەورە.
ئەویش وتی :
پێم وابێ هەر ویستووتانە .. بە کوشتنی میوانەکەم .. ئەتکم بکەن !
ئەمجا فەرمانیدا بە ( شرکان ) لە ملی هەموویان بدات ، وتیشی لەوە زیاتر دەهێنن ..!!
ڕووی کردە ( شرکان ) و وتی :
ئێستا بۆت دەرکەوت کە کچی شا (حەردووب)ی ڕۆمم !؟ ناوم (ئیبریزە) یە!؟ پیرەژنە فێڵاویەکەش نەنکمە و دایکی باوکمە . ئەو هەواڵی تۆی گەیاندووە بە باوکم . دەیەوێت بە فێڵێك من لە ناو بەرێت !
بە تایبەتی کە ئێستا بەترێرکەکانی باوکمم کوشتووە . خەڵکەکەشی تێگەیاندووە کە من پشتگیری لە موسڵمانان دەکەم . لەبەر ئەوە باشتر وایە .. ئێرە جێ بهێڵم . ئەوەندەم لە تۆ دەوێت .. چۆن لەگەڵ تۆدا هەڵسوکەوتم کرد تۆیش وابیت . ئەوەتا لەپێناوی تۆدا دوژمنایەتی کەوتە نێوان خۆم و باوکم .
( شرکان ) بە ڕوویەکی کراوەوە وتی :
تا من زیندووبم ، دەستی کەست پێدا ناگات ! بەڵام ئاخۆ.. دان بە خۆتا دەگریت ، گەر لە دایك و باوکت دوور بکەوێتەوە !؟
ئەویش وتی : بەڵێ .
( شرکان )یش سوێندی دا و پەیمانیشی لێ وەرگرت .
( ئیبریزە ) وتی :
ئێستا.. دڵم ئاوی خواردەوە . بەڵام دەبێ مەرجێکی ترم بۆ جێ بەجێ بکەیت .
ئەویش پرسیی :
ئەو مەرجە چی یە؟
( ئیبریزە )ش وتی :
دەبێت .. سوپاکەت بگێڕیتە دواوە ! بەرەو وڵاتی خۆت .
( شرکان )یش وتی :
خاتوون .. شا(عومەری کوڕی نعمان )ی باوکم منی ناردووە ، جەنگی سوپاکەی باوکت بکەم ، لە پێناوی ئەو پارەو سامانانەی .. کە باوکت دەستی بەسەردا گرتووە . کە لە ناویاندا

(٢)گۆ هەیە و نگینێکی گەورەیان هەیە .

( ئیبریزە )یش وتی :

بیخەم بە ... ئێستا ئەوەشت بۆ دەگێڕمەوە .

لە سەری ڕۆیشت :

هۆیەکی تری دوژمنایەتیمان لەگەڵ شای ( قوستەنتەنیە) ئەوەیە جەژنێکمان هەیە ناوی (جەژنی کڵێسە )یە! کە هەموو ساڵێك تێیدا، پاشایان کۆ دەبنەوە. هەروەها کچە پیاوماقوڵان و دەوڵەمەندانیش . ژنەکانیان(٧) ڕۆژ پێکەوە دەبن . منیش یەکێکم لەوان و باوکم ڕقی لێم هەستا . ( ٧) ساڵ تەی هێشت لەو جەژنەدا بەشداری بکەم ! وا ڕێکەوت ساڵێکیان کیژە دەوڵەمەندان لە هەموو لایەکەوە هات بوون بۆ ئەم کڵێسەیە . لەو جەژنەدا یەکێك لەو ئامادە بووانە کیژی پاشای ( قوستەنتەنیە) بوو و ناوی ( سەفیە ) بوو. (٦) ڕۆژ لە کڵێسەدا مایەوە .

ڕۆژی حەوتەم کە دەورو بەر چۆڵ بوو وتی :

دەبێت بە ڕێگای دەریادا بگەڕێمەوە بۆ قوستەنتەنیە . بۆیە پاپۆڕێکیان بۆ ئامادە کرد و خۆی و دەست و پێوەندی سوار بوون . دوای ئەوەی پاپۆڕ دەریای بڕی بایەکی بە تین هەڵی کردو پاپۆڕەکەی لە ڕێی لادا. قەدەری خوا وابوو، پاپۆڕێکی ( نەسارا )کانیش لە دوورگەی (کافوور )ەوە هاتبوون . کە (٥٠٠ ) چەکداری فەرەنگی تیا بوو. ماوەیەك بوو ئەوانە بە سەر ئاوەوە بوون .

کە پاپۆڕەکەی خاتوو (سەفیە)یان بینی پەلاماریان دا . لە ماوەی سەعاتێکدا دەستیان بە سەرا گرت و بەرەو دوورگەکەی خۆیان ڕاپێچیان کردبوون . بەڵام هێندەی نەبرد (گەردەلوول)ەکە بەرەو ئێمەیان ڕاپێچ کردنەوە . چارۆکەکانی پاپۆڕەکەیان دڕابوو. ئێمەش تەفر و تونامان کردن ! هەموو سامان و زێڕ و زیومان بە تاڵان بردن ! لە نێوانیاندا (٤٠ ) کەنیزەك هەبوون بە ئەو (سەفیە)یەشەوە کە کچی شا ئەفرەیدونی شای ( قوستەنتەنیە ) بوو..! هەموویانمان دەستگیر کرد و دامانە باوکم . نەمان دەزانی لە نێوانیاندا (سەفیە)ی کچی پاشای قوستەنتەنیەی تیایە .

باوکم (١٠) کەنیزەکی بۆ خۆی گل دایەوە کە کچی شای قوستەنتەنیەشی تیابوو. ئەوانی تریشی دابەش کرد بە سەر پیاوانی دەست و پێوەندی خۆیدا . لەو دەمەش (٥ ) کەنیزەکی جیا کردەوە ، کە کچی شای قوستەنتەنیەی تیابوو و بە دیاری ناردنی بۆ باوکت !

باوکیشت دوای ئەوەی دیاری یەکەی پەسەند کرد . لە نێو ئەو (٥ )کەنیزەکەدا (سەفیە)ی شا( ئەفرەیدون )ی بۆ خۆی دانا . لە سەرەتای ساڵدا باوکی کچە نووسراوێکی بۆ باوکم نارد و هەندێ جنێوی تیا نووسی بوو.... کە جوان نی یە ، بوترێتەوەو هەڕەشەی کردبوو .

تیایدا نووسی بووی :

دوو ساڵ لەمەوپێش ئێوە پاپۆڕێکی ئێمەتان زەوت کرد . کە کەوتبووە دەستی دزانی ئەفرەنگی یەکانەوە ، کە (سەفیە)ی کچی منی تیا بوو، لەگەڵ نزیەکەی (٦٠ )کەنیزەك . هیچ هەواڵێکتان بە من نەدابوو . منیش لە ترسی زڕاندنی ناوبانگم نەم وێراوە ، هەواڵتان بدەمێ کەکچەکەم لای ئێوەیە . بۆیە کۆمەڵە دزێکم کۆ کردەوە و پرسیارم لێ کردن .

ئەوانیش وتیان :

بڕوا ناکەین کچەکەت لە وڵات چووبێتە دەرەوە ! بەڵام بیستوومانە هەندێك لە دزەکانی وڵاتی شا(حەردووب ) دەستیان بە سەردا گرتووە . ئەوان بەسەر هاتەکەیان بۆ گێڕاومەتەوە . هەروەها لەو نامەیەدا کە بۆ باوکمی ناردبوو، نووسی بووی :

گەر ئێوە بە نیازی سووکایەتی کردن نین بە من و کچەکەم ئەتك ناکەن . هەر کە ئەم نامەیەی منتان پێ گەیشت کچەکەمم بۆ بنێرنەوە . ئەگەریش نەء! ئەوا دەبێت سزای ئەو کردەوەیەتان لێ بکرێتەوە .. کە ئەم نامەیە گەیشتە دەستی باوکم . زۆر پەشیمان بوو کە نەیزانیـوە کچەکەی شا ( ئەفرەیدون )یشی لەلایە . تاکو هەر زوو بیناردایەوە . سەراسیمە بوو..! نەیدەزانی چی بکات ! کە دوای ساڵانێکی هێندە زۆر زانیویەتی و ئێستا ژنی شایە و چەند منداڵی لێی هەیە . کە بە وردی سەرنجماندا تێگەیشتین ، تووشی چ کێشەیەك بووین! بۆیە باوکم نامەیەکی بۆ شا( ئەفرەیدون ) ناردەوە

و داوای لێبوردنی لێکرد و سوێندی بۆ خوارد کە نەیزانیوە ... کچی ئەو لە نێو کەنیزەکانی ناو پاپۆڕەکەدا بووە ! بۆیشی روون کردبووەوە کە هەر بە بێ ئاگایی بەخشیویەتی بە شا (عومەری کوڕی نعمان ) و ئێستا ژنی ئەوە و منداڵی لێی هەیە! کە شا (ئەفرەیدون) نامەکەی خوێندبووەوە : زۆر توورە ببوو .

پرسی بووی :

چۆن شا (عومەر) توانیویەتی کچەکەم بکاتە .. کەنیزەك و لە خۆی حەڵاڵ بکات!؟

بڕیاری دابوو، بێدەنگ نەبێت !! تۆڵەی خۆی نەکاتەوەو ئەو حەیاچوونەی نەشواتەوە کۆڵ نەدات . وتبووی دەبێت کارێکیان پێ بکەم دەماو دەم بگێڕدرێتەوە! دانی بە خۆیدا گرت ، تاکو هەلی دەست کەوت و پیلانی بۆ دانا. ئەمجا نوێنەری ناردە لای شا( عومەری کوڕی شا نعمان)ی باوکت . ئەوەی تیا نووسی بوو. کە خۆت بیستووتە! ئەوەتا .. باوکت ئەو سوپایەی خستۆتە ژێر دەستی تۆوە ، بۆ ئەو کارە . ئیدی ( ٣) دانە ( گۆ )ی ( نگین )داری چی!!؟ ئەوە لە راستی یەوە دوورە. ئەو( گۆ )یە لە لای ( سەفیە )ی کچێتی .. دەیان ویست بە هۆی ئەو ( گۆ )یەوە بیدۆزنەوە .

کە باوکم کەنیزەکەکانی گرتە لای خۆی .. ( گۆ )یەکانی لێ سەند بوو، بە دیاری پێشکەشی منی کردووە .. ئێستا ئەوانە لای منن ..! ئێستاش.. بڕۆ ، بە لای سوپاکەتەوە .

ناوچەیە ، بەرەو پیریان چوون و مەڕ و بزنێکی زۆریان بۆ سەر بڕین . دوو ڕۆژیش لەوێ مانەوە . ئەمجا بە ڕێ کەوتنەوە بەرەو وڵات .

( شرکان ) داوای کرد لە ( دندان )ی وەزیر کە (١٠٠) سوارەی چەکداری بخاتە دوو . دوای رۆژێك رێ کردن . (شرکان) بە خۆی و (١٠٠) چەکدارەکەوە جیا بوونەوە . دوو فرسەخ رۆیشتن ، تاکو گەیشتنە دەربەندێکی تەنگی نێو دوو شاخ . سەیریان کرد تەپ وتۆز لە دوورەوە بڵند بووەوە ، کە تەپ وتۆزەکە رەوی یەوە (١٠٠) سوارە دەرکەوتن . بە قەڵغان و چەك و زرێپۆش داپۆشرابون و لە شێر و پڵنگی دارستان دەچوون .

نزیك چەکدارانی شرکان بوونەوە نەعرەتەیان لێدا و وتیان :

ئێمە هێندە شوێنتان کەوتین ، بێزار بووین . جا.. بۆ ئەوەی گیانی خۆتان لەدەست نەدەن ئەسپ و چەکەکانتان بدەنە ئێمە ..!

( شرکان ) کە ئەمەی بیست . چاوی پەڕی یە پشتی سەری و سوورهەڵگەڕاو وتی :

سەگە خوێڕیانە ..چۆن وێراوتانە پێ بخەنە ..خاکی وڵاتەکەمانەوە؟ بەوەشەوە ناوەستن .. پرکێشی ئەوەش دەکەن .کە لەگەڵمان بجەنگن !؟ بۆچی پێتان وایە هەروا بە ئاسانی دەگەڕێنەوە وڵاتی خۆتان؟

هاواری کردە چەکدارەکانی خۆی :

ئادەی .. بتان بینم .. چی بەسەر ئەم سەگانە دێنن . ئاخر .. ئێوەش بە هێندەی ئەوانن !

هەڵی کێشایە شمشێرو چەکدارەکانی بە دوایدا . شاڵاویان بردە سەریان . فەرەنگی یەکانیش بە دڵێکی بەردینەوە ، هێرشیان هێنا . بووە جەنگی دەستەویەخە . بووە ناڵە و زرمە و لرخە .. کەوتنە لە یەکدان ، پەلامار و زۆران . ناڵە و ئاخ و گریان ..! جەنگ بووە جەنگی شێر و پڵنگ ...درێژەی کێشا تاکو درەنگ .. تا دنیا بووە شەوە زەنگ ... لە یەخەی یەکدی بەریاندا چنگ ..!

کە( شرکان ) جەنگاوەرانی سەرژمێر کردەوە . بۆی دەرکەوت کەسیان لێ نەکوژراوە . بەڵام چواریان بریندارکراوە .

رووی تێ کردن و وتی : زۆر دەمێکە من دەجەنگم .. هێشتاجەنگاوەرانی وەکو ئەمانەم ئازا وخۆ ڕاگر، نەبینیوە !

ئەوانیش پێ یان وت :

ئەوە بزانە .. پاڵەوانێکیان تێدایە . سوارچاکێکی فەرەنگە ! کە سەرکردەی هەموویانە.. زۆر ئازایە و شمشێر وەشێنێکی کەم وێنەیە ! کەچی .. بەرەنگاری هەر کامێکمان دەبێتەوە.. بە ئەنقەست نامان کوژێت !! ئەگەر بیویستایە بمان کوژێت . ئێستا هەموومان بە دەستی ئەو پاڵەوانە کوژرابووین..!!

( شرکان ) لەم کارە سەری سوورِماو برِیاریدا سبەینێ ..داوا بکات کە زۆرانبازی بکرێت و شەرِی بەرامبەرێتی نێوان دوو پاڵەوان .

ئەوەتا ئەوان (١٠٠) جـەنگاوەرن و ئێمەش (١٠٠) جـەنگاوەرین . ئێمە داوای یـارمەتی لە ( یەزدان )ی ئاسمان دەکەین .

ئەو شەوە حەوانـەوە . سەر لە بـەیانی (١٠) سوارەی جـەنگاوەری سـوپای ( شـرکان) .. خۆیان پرِ چەك کرد و شرکان پێـی راگەیانـدن .. رۆژێکـە و ئـەمرِۆ .. چاوەرِێی دەسـت و بازووتانم و داوای روو بە روو بوونەوە بکەن لەگەڵ پاڵـەوانی فەرەنگەکانـدا . ئـەمجا بـەرەو گۆرەپانی جەنگ بوونەوە . روانیان سوپای فەرەنگ ریز بوون و ئامادەن .

پاڵەوانێکی سوپای ( شرکان ) هاتە نێوەندی گۆرِەپانی جەنگ و هاواری کرد :

ئەوەتا... لە گۆرِەپانم .. کێ شان دەدا لە شانم ! با.. خۆی بدا پیشانم...!!

هێندەی پێ نەچوو .. پاڵەوانێکی ( فەرنگی )یان بۆی چووە گۆرِەپان . دوای کەمێ بووە شەرِ و پێکدادان .. پاڵەوانی سوپای ( شرکان )ی بەزان .. بە ( دیل )ی بردی یەوە بۆ لای خۆیان..! ئەمجا جەنگاوەرێکی تری فەرەنگی هاتە گۆرِەپان .

پاڵەوانێك هات ، لە سوپای شرکان . هەر زوو پاڵـەوانی فـەرەنگی... رمـی خـستە سـەر سنگی ! گرتی و بردی بەرەو لەشکری خۆیان . زۆرانبازی سەرومرِ بوو. تاکو دوا جەنگاوەری لەشکری شرکان ! بە دەستی یانەوە گیرا وکاس و ورِبوو ..!!

گۆرِەپان بێدەنگ وکرِ بوو..! ئیدی شەو بە سەردا هات . کە( شـرکان) و دوو سـەرکردە و ( دندان )ی وەزیر گەرِانەوە بۆ حەوانەوە .

شرکان رووی تێکردن و وتی :

ئەرێ .. ئەمە چی بوو: بەسەرمان هات!؟ بەیانی خۆم دەچمە گۆرِەپان..بانگ دەکەم لە سەرکردەکەیان تاکو بێت و شانم بدا لە شان . داوا دەکەم ، لە خاکمان بچنە دەرەوە، ئێمەش جەنگیان ناکەین . گەر بە قسەیان نـەکردین ، لەگـەڵیان بـە شـەرِ دێـین ! ئەگـەریش نـە ء لەگەڵیان پێك دێین .

لەو شەوە حەوانەوە و بەیانی هەردوولا چوونەوە گۆرِەپـان . هێندەیان زانی نیوەی جەنگاوەرە سوارەکانی سوپای فەرەنگیان پیادە بوون . بەرەو نێوەندی گۆرِەپان بوونەوە و سـوارەیەکی جـەنگاوەر بـە دوایانــەوە ! ( شــرکان ) بـۆی دەرکـەوت ، کـە ئـەوە پێشەنگەکەیانە کە وردتر سەرنجیدا، پێشەنگ رەنگ و روو جوانێکە دەڵێی مانگی چواردەیە ! عەبایەکی شینی بـە خۆیـدا داوە ..! کڵاوخـودێکی جـێ چـاوان تـەنگی لەسـەر دایـە . شمشێرێکی ( هندی )ی بە دەستەوەیە . سواری ئەسپێکی ئاوچاوان مارۆ بووە .

ئەم جەنگاوەرە ، هیشتا مـووی لـێ نـەرِواوە !! ئـاوزەنگی لـە ئەسـپەکەی ژێریـداو هاتـە گۆرِەپان .. رووی کردە موسڵمانان ..

بە زوبانێکی عەرەبیی ڕەوان ، بانگی کرد :
ئەی ( شرکان ) کوڕی شا ( عومەری نعمان ) خاوەن ( قەلا ) و ( شاران)ی ویران ، کۆتایی بێنە بە شەڕ و پێکدادان . خۆت وەرە پێشەوە..بجەنگە و دەستم لێ مەگێڕەوە، من و تۆ سەرۆک هۆزین ..خاوەنی توانا وهێزین .. هەرکەسێکمان شەڕی بردەوە .. ئەوا سوپای دۆڕاوی بۆ خۆی بردەوە ..!

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٥١**

شەهرەزاد وتی :

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو..کە (شرکان) : بۆی چووە گۆڕەپان..! کەوتە غارو لە ئاوزەنگی دا تا نزیک بووەوە ، لە ئەفرەنگی هەڵمەتی بۆ برد .. هەر وەک پڵنگ . ئەویش بۆ ئەم شاڵاوی هێنا.. زرمەی شمشێر بوو.. قەڵغان بە شوێنا..! هەر وەکو (٢) کێو بدات ... یاخود (٢) دەریا شەپۆل تێکەڵ کات . ئەوەندەی پێنەچوو: ئەو بگرە و بەردە .. شەوی بەسەرا هات ئەو نەبەردە .. ناچار هەریەکەیان .گەڕایەوە ناو کۆمەڵەکەی خۆی .

دوای حەوانەوە ( شرکان ) ڕووی کردە هاوڕێکانی و وتی:

جەنگاوەری ، وەکو ئەم شۆڕە سوارەم نەبینیوە ! شتێکی هێندە سەیرم لێ بینیوە : ئەم جەنگاوەرە کاتێك هەلی بۆ هەڵدەکەوێت ، ڕمێکم تێ بگرێت ، تێم ناگرێت !!

نازانم چی لەمندا بینیوە !؟ خۆزگە لە سوپاکەمدا جەنگاوەرێکی .. ئاوا بە توانا و پاڵەوان دەبوو.

هەر کە ڕۆژ بووە.. جەنگاوەرە .. فەرەنگیەکە لە گۆڕەپان .. کەوتە غاردان . تا وەکو بۆی چوو شرکان . دەستیان بە جەنگین کردەوە . ئەو ڕۆژەش یەکتریان هێنا و برد. تاکو ڕۆژیان بە سەر برد.

شەو هەر یەکەو گەڕایەوە ناو کۆمەڵەکەی خۆی . هەر پاڵەوانە و باسی ئەو زۆرانبازیەی بۆ هاوڕێیانی گێڕایەوە .

جەنگاوەری فەرەنگی بە کۆمەڵەکەی خۆی وت :

سبەینێ ، دوا ڕۆژ جەنگینمانە ! ئەو شەوە لێی نووستن ، تاکو سبەی بەیانی . ڕۆژی دواتر دیسان کەوتنەوە پێکدادان.. ڕمبازێن و شمشێر لێدان ، تاکو نیوەڕۆ ئەمجا فەرەنگی فێڵێکی کرد و شمشێرێکی بە هێواشی لە ئەسپی شرکانەوە ژەند ، شرکانیش هەلەکەی قۆستەوە و ڕەشمەی ئەسپی فەرەنگی ڕاکێشاو خستیە خوارەوە ! شمشێری لێ بڵند کردەوە کە بیکوژێت .

فەرەنگی هاواری کرد :

ئەی شرکان ... ئەوە پیشەی شۆڕەسواران نییە .

کە شرکان گوێی لەم قسەیە بوو، سەیری جەنگاوەرەی کردو ورد لێی روانی : بۆی دەرکەوت ، ئەم جەنگاوەرە شازادە ئیبریزەیە !!

شمشێرەکەی فڕێ دا و باوەشی پێدا کرد و وتی :

ئەرێ ... تۆ ئەم کارەت بۆ لەگەڵ من کرد !؟

ئەویش وتی :

ویستم لە گۆڕەپانی جەنگدا تاقیت بکەمەوە ! بت بینم بە قەڵغان و شمشێر و قەمەوە!

دریژەی دایە :

ئەو جەنگاوەرانەم هەموو کچانی سەر بە مۆرن ! ئاوا سوپاکەی تۆیان پێچایەوە..!

ئەگەر ئەسپەکەم هەڵنەنووتایە ، ئازایەتی منیشت دەبینی کە وا ئێستا لەبەر دەستتدام ..!

ئەویش وتی :

سوپاس بۆ خوا .. کە بە بێوەی رزگارت بوو . بە یەکتر شاد بووینەوە ... شازادە گیان !

( ئیبریزە ) هەستایەوە و خۆی تەکاند . ئەمجا فەرمانیدا کە ( دیل )ەکان ئازاد بکەن .

ژنە جەنگاوەرەکان فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد . ئەمجا کڕنووشیان بۆ هەردووکیان برد .

( شرکان )یش رووی تێکردن و پێی وتن :

بەڕاستی ، ئێوە پاڵەوانانی رۆژی تەنگانەی پاشایانن .

ئەویش فەرمانی دایە ، چەکدارەکانی خۆی کڕنووش بۆ شازادە (ئیبریزە) بەرن . ئەوانیش لە ئەسپەکانیان دابەزین و فەرمانەکەیان بەجێ هێنا . فەرمان درا ، ئەو (٢٠٠) سوارە خۆیان ئامادەی گەشت کرد . دواتر بەڕێکەوتن و شەش شەو و شەش رۆژ بەڕێوە بوون . ئەمجا گەیشتنەوە مال . کە گەیشتنە جێ . شازادە فەرمانیدا کە جلوبەرگی جەنگ دابکەنن و بەرگی جوانی ( رۆم )ی لەبەر بکەن . ئەمجا تەتەری نارد، بۆ لای ( شا عومەری شا نعمان )ی باوکی تاکو هەواڵی گەیشتنی سوپاکەی بگەیەنێت و رای بگەیەنێت کە شازادە ( ئیبریزە )ی کچی شا ( حەردوب )ی ، شای ( رۆم )یشی میوانە. بارو بنەیان خست و ئەو شەوە لەوێ حەوانەوە . بۆ بەیانی فەرمان درا سوار بن بەرەو کۆشک .

کە روانیان ( داندان )ی وەزیر بە خۆی و هەزار جەنگاوەرەوە هاتوون بە پیریانەوە . ئەمەش بە فەرمانی شا عومەر بووە . ( دندان ) و سەرانی مەملەکەت کڕنووشیان بۆ (شرکان) و ( ئیبریزە ) خاتوون برد و لە خزمەتیاندا بوون . تاکو گەیشتنەوە کۆشکی شاهانە . کە چوونە ژوورەوە ( شا عومەر) باوەشی بە ( شرکان ) دا کرد و ئەملاو لای یەکتریان ماچ کرد . کە باوکی پرسیاری لێکرد ، بەسەرهاتی خۆی و شازادە ئیبرەیزەی بۆ گێڕایەوە . تێیشی گەیاند ، کە ( شازادە ئیبریزە ) لەبەر خاتری ئەم ، خاك و نیشتمانی خۆی بەجێ هێشتووە!!

به باوکی وت :

پاشای قوستەنتەنیە ویستی فێڵمان لێ بکات لە پێناوی ( سەفیە)ی کچیدا . چونکە پاشای ( رۆم ) هەواڵی ( سەفیە)ی کچی کە چۆن کاتی خۆی بە دیاری بۆ تۆی ناردووە پێ راگەیاند بوو، تێیشی گەیاند بوو کە نەیزانیوە ( سەفیە)کچی شا ( ئەفرەیدون )ی پاشای ( قوستەنتەنیە )یە! خۆ .. گەر بیزانیایە کە ( سەفیە ) کچی ئەوە ، بە دیاری نەی دەنارد بۆ تۆ! دەیناردەوە بۆ باوکی !

ئەمجا بە باوکی وت :

بڕوا بکە ئازایەتی خاتوو ( ئیبریزە ) نەبوایە ، هەرگیز رزگارمان نەدەبوو لەم خاتوونە : ئازاتریشی نەدیوە !

شەڕە شمشێری نێوگۆڕەپانی ئەو کیژەی بۆ باوکی گێڕایەوە . ئیدی هێندەی تر شازادە ( ئیبریزە ) لای باوکی مەزن بوو . شا عومەر.. ناردی بە شوێن شازادە ئیبریزەدا .

( شرکان ) چوو بۆ لای ( ئیبریزە ) و پێی وت :

پاشا ناردوویەتی یە ، شوێنی .

ئەویش وتی : بە چاوان .

هەر کە گەیشتن . شا عومەر لەسەر کورسی یەکەی دانیشتبوو فەرمانیدا.. پیاوانی مەملەکەت دەورو بەریان چۆڵ کرد . هەر خۆی و دەرگاوان مابوونەوە . شازادە (ئیبریزە) چووە ژوورەوە . کڕنووشی بۆ ( شاعومەری شا نعمان ) برد. بە زمانی شیرین سوپاسی کرد. شایش فەرمانی دایە کە دابنیشێت . ئەویش دانیشت . شا سوپاسی ( ئیبریزە )ی کرد بۆ ئەو بە هاناوە چوونەی بۆ کوڕەکەی .

فەرمانیدا کۆشکێکی بدەنێ و مووچەی بۆ خۆی و کەنیزەکەکانی بڕی یەوە . لە بارەی ئەو ( ٣ ) گۆیەوە لێی پرسی .

شازادە ( ئیبریزە )ش لە وەڵام دا وتی :

ئـەی پاشای زەمان .. هەر سێکیانم پێ یە .

سندووقە زێڕینەکەی هێناو هەر سێ ( گۆ )یەکەی دایە دەست شاعومەر و هۆڵەکەی بە جێ هێشت . دواتر شا عومەر ناردی یە شوێن .. شرکانی کوڕی و ( گۆ)یەکی دایە . شرکانیش پرسیاری هەردوو ( گۆ )یەکەی تری کرد .

شا وتی :

کوڕم .. یەکێکیانم داوە بە ( چووالمکان )ی برات و ئەوی دی بە ( نزهە الزمان)ی خوشکت .

کە ( شرکان ) بیستی برایەکی تری هەیە بە ناوی ( چووالمکان )ەوە لە باوکی پرسی :

بۆ لە من زیاتر ، کوڕی ترت هەیە !؟

ئەویش وتی ، بەڵێ ! ئێستا شەش ساڵانە ..!
( شرکان ) ( گۆ )یەکەی فڕێ دایە ئەولاوە .
باوکی پێی وت :
دەبینم ، رەنگت تێکچووە!! سووریش دەزانیت دوای مردنم مەملەکەتەکە هی خۆتە!
سوپایەکم بۆ پێکەوە ناویت . یەکێك لەو سێ گۆیەشم پێداویت !
( شرکان ) سەری داخست و پێی شەرم بوو. دەمە دەمێ لەگەڵ باوکی بکات .(گۆ)یەکەی هەلگرت و ماچی کردو چووە دەرەوە . هێندەش تووڕە بوو، نەی دەزانی چی بکات؟ ملی ڕێگای گرت.. تاکو گەیشتە کۆشکی ( شازادە ئیبریزە ) . ئەویش کە بە هاتنی زانی چووە پێشوازی ، دوای بەخێر هێنانی سوپاسی پێزانینەکەی کرد .کە دانیشت زانی تووڕەیە . بۆیە ، هۆی تووڕە بوونەکەی پرسی .
ئەویش لە وەڵامدا وتی :
باوکم کوڕ وکچێکی لە (سەفیە)ی کەنیزەکی هەیە ! کوڕەکەی ناوی (ضوءالمكان)ە . کچەکەیش : ( نزهه الزمان ) . (٢) گۆیشی بە ئەوان داوە ..! ( گۆ )یەکیشی بە من داوە .
منیش لە داخدا فڕێمدایە گیرفانمەوە ! ئا لەم کاتەدا زانیومە برایەکی شەش ساڵانم هەیە !
شازادەش پێی وت :
ئەگەر( گۆ )یەکەی کە باوکت پێی بەخشیت بیبەخشیتەمن ، زۆرسوپاست دەکەم .
( شرکان )یش وتی : بە چاوان و فەرموو..
خاتوو ( ئیبریزە ) وتی :
گوێی مەدەرێ و بێخەم بە !
دواتر شازادە ( ئیبریزە ) ، وتی :
خەمی ئەوەمە .. باوکم بزانێت کە من لای ئێوەم .. چونکە لەگەڵ پاشای باوکی ( سەفیە) رێدەکەوێت و سوپای دوو مەملەکەت ، یەك دەگرن و هەڵدەکوتنە سەرمەملەکەتەکەتان . ئاژاوەیەکی گەورەتان بۆ دەنێتەوە..!
( شرکان )یش وتی :
گەر بۆ خۆت لاریت نییە لە مانەوەت و پێمان رازیت ..خەمی ئێمەت نەبێت : چونکە لەشکری هەموو سەر زەوی بێنە سەرمان ، بێ باکین !
شازادەش وتی :
ئەوە بە دەست ئێوەیە ، گەر لەگەڵمدا باش بن ، ئەوا دەمێنمەوە . ئەگەر مامەڵەتان لەگەڵ من خراپ بوو ... ئەوا جێتان دێڵم ...!
ئەمجا فەرمانیدا : کەنیزەکەکانی سفرەیان رازاندەوە . (شرکان) خواردنێکی کەمی خوارد، دواتر ماڵئاوایی کردو بە دڵی تەنگەوە گەڕایەوە . لەو لایشەوە (شا عومەری کوڕی

نعمان) ، دوای ئەوەی ( شرکان )ی کوڕی جێی هێشت ، چووە لای ( سەفیە )ی ژنی و هەردوو (گۆ) یەکەی تری پێ بوو، ژنەکەی لەبەری هەستا، هەردوو منداڵەکەشی ( چووالمکان ) و ( نزهە الزمان ) بەخێریان هێنا . پاشا ناوچەوانی هەردووکیانی ماچ کردو هەر یەکەو ( گۆ )یەکی کردە ملیان . ئەوانیش پێی دڵخۆش بوون و دەستیان ماچ کرد . کە پێشانی دایکیان دا..ئەویش نزای تەمەنی درێژی بۆ کردن .

پاشایش رووی کردە ژنەکەی و پرسی :

باشە .. ئەی تۆ.. بۆ هەر زوو..نەت وتووە کە من کچی ( شا ئەفرمیدون )ی شای (قوستەنتەنیەم)؟ تاکو رێزی زیاترت بگرم و پلەو پایەت بڵندتر بکەم !؟

( سەفیە)ش وتی :

پاشا گیان .. لەم رێزو بەهایە زیاترم بۆ چی یە !؟ کە من لەسەرمەوە تا پێینم ، پۆشراوی چاکەکانی تۆیە ! خوا.. کوڕو کچێکی جوانکیلەشی لە تۆ پێ بەخشیوم .

شا عومەر سەری لەو وتە جوانانەی سووڕما و زۆری پێخۆش بوو . ئەی بۆ نا؟ شا کۆشکێکی نایابی پێ بەخشی بوو! خزمەتکارو زانایان و پزیشکانی بۆ دابین کردبوو . خواحافیزی کرد و رووە و کۆشکی حوکمڕان چوو لە کاتێکدا.. شازادە (ئیبریزە)شی زۆر بە دڵ بوو.. مارەی کرد . تاکو سالانێکی زۆربە بەختیاری ژیانیان بردە سەر دواتر.. شازادە ( ئیبریزە ) : تاسەی ماڵە باوان و نیشتمانی خۆی کرد .

دەستی بە گریان کرد . هێندەی خەم بۆ خواردن تا زەردو لاواز بوو . بۆیە فەرمانی بە خزمەتکار و کەنیزەکەکانی دا کە رێ نەدەن .. کەس بێتە سەردانی و ئەوە بوو .. ئەم هەواڵە گەیشتەوەی لای شا عومەر و پزیشك و داو و دەرمانی بۆ نارد . لە ئەنجامدا مەیلی بەرامبەری سارد بوو و نەدەچووە لای . ئەوا سکیشی لە شا پڕ بوو و دنیای لا تەنگ بوو بووەوە .

رۆژێك بە کەنیزەکەی خۆی وت :

ئەمان غەدریان لێ نەکردووم ، خۆم دایك و باوك و نیشتمانم جێ هێشتووە . بۆیە زەرد و لاواز بووم و گوڕوتینم نەماوە . جاران ئەو هەمووە: سواری و غارغارێنەم دەکرد . ئێستا ئەوەشم پێ ناکرێ .

جا باشە بە چ روویەکەوە بگەڕێمەوە ، ماڵە باوانم !؟ بوومە گاڵتەجاڕ! چەند جوانیان وتوە

بێکەس و بێ دەر بە بێ لانە خۆم دوور لە هاوڕێیان . ئای بێگانە خۆم

مەرجانەی کەنیزەکی وتی : فەرمان فەرمانی خۆتە : من سەرم لە رێتە !

شازادە ( ئیبریزە )ش وتی :

( دەمەوێ بە نهێنی بەرەو وڵاتی خۆم بڕۆمەوە و لە تۆ زیاتر کەسی دی نەزانێت ! ماڵەباوان رۆوگەیە..! خوایش چی لە چارە نووسیبم هەر ئەوەیە .

کەنیزەکەکە وتی : هەر ئەوە چاکە.. وا بکە .

شتومەکی پێچاوە و خۆی ئامادە کردو چەند رۆژێك ئارامی گرت تا پاشا چوو بۆ راو و شکار .

( شرکان )یش کاروباری مەملەکەتی گرتە دەست .

شازادە ئیبریزە بە کەنیزەکەکەی وت : ئەمەوێ ، هەر ئەمشەو بۆی دەربچم ، جا.. نازانم چی بکەم !؟

پیاوێکم بۆ پەیدا بکە ، هەردووکمان بەرێت و لە رێگ بمان پارێزێت : چونکە من توانای چەك هەلگرتنیشم نەماوە..!

مەرجانە وتی : بەو خوایە شازادە . هەر یەك کۆیلە دەناسم ، کە شا بۆ ئەوە رایگرتووە تەنیا پەزێراییمان بکات . ئیتر ئێمەش چاکەی زۆرمان لەگەلدا کردووە . هەر ئێستا دەچمە لای و داوای یارمەتی لێ دەکەم و پەیمانی پارەشی دەدەمێ .

چەند رۆژێك لەمەوبەر باسی خۆی دەکرد کە کاتی خۆی رێگر و جەردە بووە ! بە خوا..گەر بە قسەمان بکات ، ئەوا بە ئاسانی .. دەمان گەیەنێتە خاك و ئاوی خۆمان ...

شازادەش وتی : برۆ .. بۆم بانگ بکە ، یا خۆم قسەی لەگەلّ دەکەم .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٥٢**

بەسەرهاتی ئیبریزە و غەزبان ی کۆیلە

شەهرەزاد وتی :

مەرجانە چووە دەرەوە و بانگی کۆیلەکەی کرد.

کە هات پێی وت :

غەزبان... ئەزانی خوا... شاد و بەختیارت دەکات گەر بە گوێی خاتوونەکەم بکەیت ؟

دەستی گرت و بردی یە لای و ئەویش کرنووشی بۆ برد .کە شازادە ، ئەم (غەزبان)ەی بینی سلەمی یەوە .. هەر چەند دلیشی ئەم پیاوەی نەدەخوازی ! بەلام چارەیشی نەبوو .

کەوتە گفتوگۆ لەگەلیدا و لێی پرسی :

( غەزبان ) ئامادەییت تیایە . یارمەتیم بدەیت لەم بەلایەی زەمانە بە سەری هێناوم ؟ دەتوانیت نهێنیم بپارێزیت ..!؟

هەر چەند غەزبان خۆیشی پێ نەدەگیرا بەلام وتی :

خاتوونەکەم ... فەرمانت بەجێ یە..!

شەویش وتی :

کەواتە( ٣) ئەسپم لە ئەسپەکانی پاشا بۆ ئامادە بکە . لەگەلّ (٢) (هەگبە)یش تاکو پڕیان بکەم لە زێڕ و پارە و بە دزیەوە: خۆم و کەنیزەکەکەم ، لە شار بەرە دەرەو بەرەو

ولاتی خۆم سەفەر دەکەین .
هەرکە گەیشتینە ئەوێ . بۆت هەیە لای من بمێنیتەوە . منیش ژیانێکی خۆشت بۆ مسۆگەر دەکەم ... خۆ ئەگەر حەزیشت کرد بگەڕێیتەوە بۆ ئێرە .. ئەوا پارەیەکی زۆر باشت ، دەدەمێ .
( غەزبان ) زۆر دڵی خۆش بوو وتی :
خاتوونەکەم .. لەبان چاوم داتان دەنێم و لە پەزێراییتاندا دەبم و لەگەڵتان دێم ..!
پشتی تێ کردن ولەبەر خۆیەوە وتی :
ئەمە ... ئەو هەلەیە.. بۆی دەگەڕام ! گەرلە ڕێگاش لێم هەلگەڕانەوە ، ئەوا..هەردووکیان: دەکوژم و پارەکەیان دەبەم .
بە خۆی و (٣) ئەسپەوە گەڕایەوە و خۆی سواری یەکێکیان بوو . دوانەکەی تری دایە خاتوو ئیبریزە . خۆی سواری یەکێك بوو . کەنیزەکە ( مەرجانە )یشی سواری ئەویتر کرد .
مەرجانە تووشی سەر ئێشە ببوو کە کەوتنە رێ ، دۆل و شاخی سەختیان بڕی . شەو و رۆژێکیان پێچوو. شازادە ئیبریزە . ژان گرتی و بانگی ( غەزبان )ی کرد تاکو.. لە ئەسپەکەی دای ببەزێنێ .
هاواریشی کردە مەرجانە :
دابەزە .. مامانی یەکەم بکە ..! ژانم بۆ هاتووە..!
غەزبان دای بەزاند و رەشمەی هەر (٣) ئەسپەکەی گرت و بە دارێکەوە بەستنی یەوە .
ئەمجا شمشێری لە ( شازادە ) هەلکێشا و وتی :
دەبێت : لەگەلٚمدا بە دڵی من جووت بیت !
( شازادە ) ئەمەی بیست وتی :
موبارەك نەبێت ..! کەس نەمابوو .. تۆ نەبێت !؟
ئەوە بزانە کاتی خۆی بە پاشایانیش .. رازی نەدەبووم ..!
ئەمجا شیراندی بە سەریدا و وتی :
پێم خۆش نی یە جارێکی تر لەم قسانە ببیستم ! هەرگیز کاری ئاوا... پەسەند ناکەم .
ئەگەر بشمکوژیت..! لەسەرم بووەستە .. با منداڵەکە، رێك بخەمەوە و خۆم کۆبکەمەوە .
ئەوسا .. ئەگەر زاڵ بوویت بە سەرم دا ئەوا .. ناهێڵم دەستت بمگاتێ و خۆم دەکوژم .
ئەم شیعرەی وت :

هێندە بێخەم نیم واز بێنە غەزبان
فەرمانی بە دوور بوونی خراپە
قەت هەواداری خراپە نەبووم !
کاری ناشیرین ، لە من بە دوور کە

بۆخۆم کەوتوومە بەر شەقی زەمان !
دراوە و شوێنمان دۆزەخی یەزدان
کۆڵم لێ بدە و مەبە چاوەڕوان
مەیکە دوژمنت گشت بەرەی باوان

گەلەکۆمەکەت با لێ نەکەن و   لێت کۆ نەبنەوە لە ئاغا تا شوان !
گەر بە شمشێری ( یەمەن )بم بڕی   لە من نابینی گوناه و تـــاوان
(نا)م بۆ پاشا و پیاوماقوڵان کرد   هەی کۆیلەی رەش و لە تیرەی ( زەوان )

شازادە (ئیبریزە) زۆر گریا وتی :
(بەڵا) لێت بدات .. غەزبان هێندە رسوام . تاکو بەم شێوەیە بم دوێنیت !؟ هەی .. بەد ڕەوشت .
پێت وایە مرۆڤ هەموویان چون یەکن !؟
( غەزبان ) زۆر تووڕە بوو. رەنگی تێکچوو. ئەو بەد فەساڵە . شمشێری بۆ داهێنایەوە و کوشتی..!
هەموو پـارە و زێڕەکەیشی برد. جێی هێشتن و لە نێو شاخـەکاندا خـۆی ون کرد . لـەم لایشەوە ( مەرجانە) کە شازادە ( ئیبریزە )ی بینی کوژراوە . کەوتە لە خۆدان و قوڕپێوان ! کوڕە ساواکەی لەبەر هەلگرتەوە و کەوتەوە شین شـەپۆر. هێنـدە رووی خـۆی ڕنـی یـەوە.. خوێن لە کوڵمەکانی یەوە هاتە خوار..
بە دەم یەخە دادڕینەوە قیژاندی :
ئـەی هـاوار.. بـۆ خاتوونەکـەم ! بـۆ ئـەم کلـۆڵی یـەی! کـە بـەو هـەموو سوارچاکی و ئازایەتیەوەو بەو هەموو چاکی یەوە : ئاوا.. بەدەستی کۆیلەیەکی رەشی رسوا کوژرا..!!
هێندەی زانی تەپ و تۆزێکی زۆر بڵند بووەوە . کە تەپ و تۆز رەوی یەوە . لەشکرێکی بینی . توومەز.. لەشکری شا(حەردوب )ی باوکی شازادە ( ئیبریزە )یە . هەر کە بیستبووی کچەکەی و کەنیزەکێك ، هەڵاتوون . لە شا (عومەری کوڕی نعمان) . لەشکرێکی زۆری شوێن خۆی خستبوو، کەوتبووە پرسیار . کە ئاخۆ... راستە خاتوو( ئیبریزە ) لای شا عومەرە !؟
ئەو رۆژە هەر لە بەیانی یەوە تاکو ئێوارە بەرێوە بوون . لە دوورەوە (٣) سوارەی بینی بوو شوێنیان دەکەوێت تاکو پرسیاری کچەکەی خـۆی لـێ یـان بکـات .. بـێ ئـەوەی بزانێـت یەکێك لـەو سـوارانە کـچەکەی خۆیـەتی و دوانەکـەی دی (کەنیزەکـە)کـەی و (غـەزبان)ی کۆیلەیە . کە گەیشتە سەریان بینی ئەوە کچەکەیەتی کوژراوە و ئەویتر کەنیزەکەیەتی و بە سەریدا دەگری..!
لە ئەسپەکەی دابەزی و گەیشتە سەری و بوورایـەوە و کـەوت..! ئیدی ئەوانـەی کە لـە تەکیدا بوون.. لـە وەزیـران و پێشەنگان و پیاومـاقوڵان . پیـادە بـوون و دەواریـان هەڵـدا و باروبنەیان خست و دەوارێکیان تایبەت بە شا(حەردوب) رازاندەوە . کە مەرجانە شای بینی ناسیەوە کە باوکی شازادەی کوژراوە !!
هێندەی تـر بـەکوڵ گریـا . شـا ( حـەردوب ) بـە ئاگا هاتـەوەو ناردیـە دووی کەنیزەکەکەو هەواڵەکەی لێ پرسی ؟

ئەویش بە سەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە و وتی :

ئەو کەسەی کچەکەیشی کوشتیت ، کۆیلەیەکی رەش بوو، لە کۆیلەکانی شا (عومەری کوڕی نوعمان)ە .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو

**شەوی ٥٣**

## چیرۆکی راوێژکردنی شا حەردوب و دایکە فێڵاوییەکەی

شەهرزاد وتی :

ئـەی شاشەهرەیار ... هــەی زانـای بەختیار ...

رۆژێکیان ... شا (حەردوب) چووە لای دایکە فێڵبازەکەی و پرسی :

جا.. دەبێ موسڵمانان ..ئاوا بە من بکەن ؟ ئاوا کچەکەمیان سزادا و تاڵاویان پێ نۆشی !؟ دوا جاریش بە دەستی کۆیلەیەکی رەشی رسوا ، بەکوشتیان دا! بـەگیانی ( مەسیح ) دەبێت نەهێڵم بە سەریانەوە بچێت ! دەبێت بە دەستی خۆم .. تۆڵەی کچەکەمیان لێ بسەندمەوە ! گەر ئەم تۆڵەیەم بۆ نەسەندرایەوە ئەوا بە دەستی خۆم .. خۆم دەکوژم..! ئـەمجا بە کوڵ گریا.

دایکە فێڵاوییەکەی وتی :

کەس کچەکەتی نەکوشتووە : مەرجانە نـەبێت ، چونکە لـە دڵەوە قینـی لێی بوو. بێخەم بە .. من تۆڵەیت بۆ دەکەمەوە . لای شا (عومەری نعمان) ناگەڕێمـەوە تـاکو خۆی و کوڕەکانی نەکوژم .

دەبێت کارێکیان پێ بکەم . کە پاڵەوانانیش بۆیـان نـەکرابێت..! کارێکی هێنـدە مەزن بێت کە لە نێو شاران و وڵاتاندا بڵاو ببێتەوە . بەڵام دەبێت چیم وت .. بە قسەم بکەیت.

ئەویش بە تووڕەییەوە وتی :

لە قسەت دەرناچم .

پیرەژنە مەکربازە کەمێ سەری داخست و رووی کردە شا (حەردوب) و وتی :

هەندێ لە پیاو ماقوڵان و فەیلەسوفان لەگەڵ چەند کەنیزەکێکی سەر بە مۆرم بۆ ئامادە بکە.. با.. ئەو پیاوانە ئەو کچانە فێـری رێ و رەسمـی هەڵسوکەوتی پاشایان بکەن. پەند و شیعریان فێر بکەن. با زانایان عەرەب بن ... تـاکو مێـژووی عـەرەبیان فێـر بکەن و بەسەرهاتی خەلیفەکان و پاشا و سەرکردەکانیان بۆ بگێڕنەوە ..! گەر (٤) ساڵ ئەم کارەمان درێژەی کێشا.. ئەوا بە مەبەست و ئاواتمان دەگەین . بۆیە دەبێـت دان بـە خۆتـدا بگریت . ئارام بە .

عەرەبان وتویانە :

بۆ تۆڵە سەندنەوە (٤٠) ساڵیش هەر کەمە! گەر ئێمە کەنیزەکەکانمان ڕاهێنان و فێرمان کردن .

بە ئاواتی خۆمان دەگەین . کە کارەکەمان کۆتابوو، لەگەڵ خۆم دەیان بەم .کە (حەردوب) شا ئەمەی لە دایکی مەکربازی بیست . لە خۆشیدا سەری ماچ کرد و فەرمانی دەرکرد ، بگەڕێن بە شوێن زانایان و فەیلەسوفاندا. بیان هێنن بۆ دەرباری شا. دواتر لەگەڵیان کۆبووەوە و ڕێزێکی زۆری گرتن و خەڵاتی کردن و پەیمانی پێدان گەر ئەو کەنیزەکانەیان ، فێر کرد . خەڵاتی بێ وێنە و شایستە بکرێن .

لەولایشەوە کە شا عومەری کوڕی نعمان لە ڕاو و شکار گەڕایەوە.. دوای حەوانەوە ناردیە شوێن شا( ئیبریزە ) . پێیان ڕاگەیاند کە لە کۆشکدا نەماوە . زۆری پێ گران بوو. بۆیە پرسیی :

چۆن دەبێت لە کۆشك بچێتە دەرەوەو کەس پێی نەزانێت ؟ ئەگەر مەملەکەتەکەشم وەکو کۆشکەکەم بەڕێوە ببرێت .. ئەوا..بۆم کۆنترۆڵ ناکرێت و لە دەستم دەڕوات و دەبێت جێگرەکانم بکەمە دەرگاوان !

کەوتە خەمی شا ئیبریزە . لەم کەین و بەیندەدا بوو کە ( شرکان )ی کوڕی لە گەشت گەڕایەوە . باوکی ئەم هەواڵە ناخۆشەی پێدا.. کە شا ( ئیبریزە ) هەڵاتووە !

( شرکان )یش پەژارە دایگرت . ئیدی زوو زوو شا عومەر کوڕەکانی بەسەر دەکردەوە . کۆمەڵێك مامۆستاو زانای بۆیان گرت بوو ، تاکو منداڵەکانی فێری خوێندەواری و زانست بکات . مووچەی باشی بۆ بڕی بوونەوە. کە شرکان سەرنجی ئەم کارەی باوکی دەدا ، خەفەتی پێ دەخوارد و بەغیلی پێیان دەبرد.

کە کارەکە وا کەوتەوە ، ئەم خەفەتە شرکانی نەخۆش خست .

ڕۆژێکیان باوکی لێی پرسی :

بۆچی هەر لەڕو لاواز دەبیت و ڕەنگت زەرد هەڵدەگەڕێت؟

( شرکان )یش وەڵامی دایەوە :

بابە گیان .. کە دەبینم هێندە بە لاولوی خوشك و براکانم دا دێت و خۆتیان پێوە ماندوو دەکەیت ، بەغیلیان پێ دەبەم . لەوە دەترسم لە بەغیلیاندا بیان کوژم ! دواتر بە هۆی ئەوانەوە تۆیش من بکوژیتەوە . بەهۆی ئەمەوەیە ئاوا زەرد هەڵگەڕاو ولاوازم .

خۆزگە قەڵایەکت پێ دەبەخشیم ، تاکو پاشماوەی تەمەنم تێیدا بەسەر بردایە . لەم بارەیەوە چاکیان وتوە : دوور کەوتنەوە ، لە خۆشەویست باشترە.. چونکە چاوان نایان بینن ، تاکو دڵان بۆیان بە خەم بن ..!

ئیدی سەری نەوی کرد .

شا( عومەری کوڕی نعمان ) دڵنەواییەکی فرەی کرد و وتی :

بێ دڵنیت ناکەم . لە قەڵای دیمەشق گەورەتر و باشترم نی یە .. پێشکەشت بێت . دواتر ( شرکان )گواستی یەوە بۆ شاری دیمەشق . کە دانیشتوانەکەی بە هاتنیان زانی شاریان رازاندەوە و چوونە پێشوازی و بەخێریان هێنا . سوارانی سوپا ریزێک لای شانی راستیەوە.. ریزێکی دی لای شانی چەپیەوە . ریزێکیش پێشەنگ و ریزێک لە دوایەوە . خۆیان کردبە شاردا .

لەولایشەوە ، زانایان و فەیلەسوفان ، چوونە دیدەنی ( شاعومەر) و پێیان راگەیاند کە فێرکردن و راهێنانی کەنیزەکەکان کۆتایی هاتووە .

ئەمجا پێیان وت :

قوربان .. زانست و ئەدەب و رەوشت ، فێری منداڵەکانت کرا. ئیدی شا عومەر زۆر خۆشحال بوو.

فەرمانیدا خەڵاتی شاهانە پێشکەش بکرێت بەو فەیلەسوف و زانایانە . چونکە شا عومەر قورئان خوێن و بۆ خوا رەخساو بوو هاوڵاتیان خۆشیان دەویست . ئەوە بوو بەغدای جێ هێشت و چووە حەج .

( چووالمکان ) بەرەو رووی باوکی چوو و پێی وت :

بۆ ئەوە هاتووم .. رێم پێ بدەی منیش بچمە حەج .

باوکیشی پێی وت :

پەلە مەکە ! ساڵێکی دی خۆیشم لەگەڵت دێم بۆ حەج کردن .

## بەسەرهاتی شاعومەر و (شرکان) و ( ضوء المکان)ی کوڕی

شەهرەزاد وتی :

کە (چووالمکان) بۆی دەرکەوت ، باوکی رێی پێ نادات . خۆی کرد بە ژووری خوشکەکەیدا . روونیی لەسەر بەرماڵە و نوێژ دەکات . چاوەڕێی کرد تا سڵاوی دایەوە . پێی وت :

خەریکە شێت ببم ، بۆ حەج کردن و شاد بوون بە بینینی گۆڕی پێغەمبەر (د.خ) . مەبەستم پەیداکردنی برێک پارەیە . تاکو بە دزی باوکمەوە سەفەری حەج بکەم .خوشکەکەشی لێی پاڕایەوە، ئەویش بیبات .

ئەمیش پێی وت :

کە دنیا تاریک بوو . بە دزی یەوە ، ئێرە جێ بێڵە و مەهێڵە کەس پێت بزانێت .

نیوەشەو خوشکی پارەی لەگەڵ خۆی هێناو جلی پیاوانەی لەبەر کرد و بەرەو دەروازەی کۆشك بووەوە . سەیری کرد براکەی دوو وشتری ئامادە کردووە . خوشکەکەی سوار کردو خۆشی سواری ئەوی تریان بوو ، خوا یاوەریان بوو.. بێخەم خۆیان کرد بە شاری

( مەکە)دا و چوونە ( عەرەفات )و ڕێ و ڕەسمی حەجیان بە جێ هێناو ویستیان لەگەڵ حاجیانی عێراقدا بگەڕێنەوە .

( ضوءالمكان ) بە خوشکەکەی وت :

حەز دەکەم سەردانی قودس بکەم .. تاکو بچمە سەر گۆڕی حەزرەتی ئیبراهیم . سڵاوی خوای لەسەر بێت .

خۆیان ئامادە کرد . لەگەڵ کارواندا بەرەو قودس بوونەوە . لە ڕێگا خوشکەکەی لەرز دایگرت .

براکەی زۆری پەرستاری کرد و چاك بووەوە . کاروان بەڕێوە بوو ، تاکو گەیشتن . چووالمکان نەخۆشی یەکی گرانی گرت . زەردو لاوازی کرد . لە ( خان ـ ئوتێل )ێك لایان دا. بەرە بەرە نەخۆشی لاوازی کرد و تووشی بوورانەوەی کرد .

خوشکەکەی پەژارەیەکی زۆر دایگرت و بە خۆی وت :

لاحول و لاقوة الا بالله العلي العظيم ، ئەمە بەڵای خوابوو .

ئیدی لەو خانەدا مانەوە . خوشکە هەر چیەکی پارە پێمابوو بۆ خۆی و برا نەخۆشەکەی خەرج کرد. تەنانەت هەندێ لە جلوبەرگەکەی خۆیشی فرۆشت ..! حەسیرە شڕێکی ژێر خۆیان نەبێت .. هیچیان نەما!!

بە دەم گریانەوە وتی :

خۆمان داوەتە دەست خوا ..!

( ضوءالمكان )یش وتی :

خوشکێ .. دان بە خۆتدا بگرە.. وا بەرەو چاك بوونەوە دەچم .. زۆریشم حەز لە گۆشتی برژاوە !

ئەویش وتی :

برا شرینەکەم .. بەخوا سواڵم پێ ناکرێت .. بەڵام سبەینێ دەگەڕێم بەڵکو ببمە کارەکەری ماڵە دەوڵەمەندێك و بە پارەکەی بژین ..!

بە براکەیشی وت :

هەر چەند پێم خۆش نییە بەجێت بێڵم . بەڵام چارم نی یە .

براکەی پێی وت :

دوای ئەو هەموو نازو نیعمەتەی تیا بوویت . ئاوا ڕسوا دەبیت !!؟ لاحول و لا قوە الا بالله .. دەستی کردە گریان ، خوشکەکەشی لەگەڵیدا .

خوشکە وتی :

براکەم .. ئێمە دوو نامۆین بەم وڵاتە ، ئەوە ساڵێکە لێرەین ..کەس لە دەرگای نەداوین .. ئاخۆ... مردووین لەبرسانا!!؟ یان : نە ء؟ تەنیا چارە هەر ئەوەیە دەبێت کارەکەری

مالاَن بكەم تاكو مەمرە و مەژی بەسەری بەرین . تا.. ئەو كاتەی چاك دەبێتەوە . ئەمجا دەگەڕێینەوە ولاَتی خۆمان . سەعاتێك یەكتریان لاواندەوە و گریان .

قوماشە كۆنێكی پەیدا كرد و دای بەسەریدا. ناوچەوانی براكەی ماچ كردو چووە دەرەوە تاكو كارێك بدۆزێتەوە . بێ ئەوەی خۆیشی بزانێت بۆ كوێ دەچێت!!؟ ئێوارە هات ( ضوءالمكان ) نەگەڕایەوە..!

ئەو شەوە براكەی تاكو بەیانی چاوەڕوانیی كرد . دوو رۆژ چاوەڕێی كرد . ئیدی ئارامی لەبەر هەڵگیرا.

ئەمجا هاواری برد بۆ خاوەن خانەكە و لێی پاڕایەوە .. تا بیبات لە ناو بازاڕەكەدا دای بنێت . ئەویش بە قسەی كرد . خەڵكی بازاڕەكە بەو حاڵەوە بینیان . بەزەییان پێداهاتەوەو چەند درهەمێكیان بۆ كۆ كردەوە .

(ضوءالمكان) بە ئیشارەت تێی گەیاندن .كە برسی یەتی و تێریان كرد . راخەرە شڕێكیان لەبەر دوكانێكدا بۆ راخست و مەسینەیەكی پڕ ئاویان لە ژوور سەری یەوە بۆ دانا . شەو بەسەریداهات .

بازاڕ چۆڵ بوو . خوشكەكەی بیر كەوتە و هێندەی تر خەمبار و بێ هێز بوو.

تا دەهات خواردن وخواردنەوەی كەم دەبووەوە . خەڵكەكە (٣٠) درهەمیان بۆ كۆكردەوە و وشترەوانێكیان بۆ بەكرێ گرت و پارەكەیان پێداو وتیان :

ئەم نەخۆشە بگەیەنە دیمەشق و لەبەردەم خەستەخانەكەیدادای بنێ.. لەوێش خێرخوایەك هەر پەیدا دەبێت بەڵكو.. چاك ببێتەوە .

وشترەوان .. باری كردو رۆیشت . لەكەناری شار چاوەڕێی كرد . تاكو تاریك داهات . نەخۆشەكەی لەسەر سەلوێنكێك و لەبەردەم گەرماوێكدا فڕێ دا و جێی هێشت .

شەهرەزاد هەستی كرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٥٤**

بەسەرهاتی ضوء المكان و توونچی یەكە

شەهرمزاد وتی :

بەیانی توونچی رۆیشت تاوونی گەرماو گڕ بدات كەسێكی بینی راكشابوو.

لەدڵی خۆیدا وتی :

ئاخۆ بۆچی .. ئەم مردوویان لێرە فڕێ داوە ..!؟

بە نووكی پێی پاڵێكی بەلاشەكەوە نا و سەیری كرد دەجووڵێتەوە ..!

هەر کەسێك ( حەشیشە ) دەکێشێت ، دێتە ئێرە و لێی دەنوێت..!

ئەمجا سەیرێکی دەم و چاوی کرد . بینی هێشتا مووی .. لێ نەڕواوە و لاوێکی جوان و قۆزە ! بۆی دەرکەوت کە نەخۆشە و نامۆیە بە ئێرە .

لەبەر خۆیەوە وتی :

لا حول و لاقوە الاباللە . تازە پێویستە بۆ ئەوەی گوناهبار نەبم ، یارمەتی بدەم . چونکە پێغەمبەر(د.خ) ئامۆژگاری کردووین رێز لە نامۆیان بگرین .. نەخوازەڵا.. ئەمە نەخۆشیشە .

بردی یەوە ماڵی خۆی و بەژنەکەی وت :

کە جێ یەکی بۆ رابخات و پەزێرایی بکات .

ئەویش ئاوی بۆ گەرم کردو دەست و قاچی بۆ شت و سەرینێکی خستە ژوور سەری . گەڕایەوە ناو بازاڕ و بڕێك گوڵاو و ئاوی نەعنا و شیرینی بۆ هێنایەوە و دەرخواردی داو کراسێکی پاکیان لەبەر کرد . ئیدی بەرەو چاکبوونەوە چوو. وای لێهات شانی لەسەر سەرینەکە دادە دا .

توونچی یەکە زۆری پێخۆش بوو ئەم نزایەی کرد :

سوپاس بۆ خوا .. کە چاك بوونەوەی ئەم هەرزەکارە لەسەردەستی ئێمەدا بوو . سێ رۆژە بەرەو باشتر دەڕوات .

لێی پرسی :

ئێستا چۆنی کوڕی خۆم ؟

ئەویش وتی : سوپاس بۆ خوا ، زۆر باشم .

توونچی بەرەو بازاڕ بووەوە و (١٠ ) فرۆجی کڕی و هێنایەوە و بە ژنەکەی وت :

رۆژی (٢) فرۆجی بۆ سەر دەبڕێت یەکێکیان بەیانیان ئەوی دی ئێواران و دەرخواردی بدە . ئیدی ژنە گۆشتاوی مریشکەکەی دەرخوارد دەدا. بەیانیان لەسەر جێگەکەی رادەکشا و ژنە جاجمێکی پێدا دەدا . دوای دەست شتن .. لێی دەنووستەوە .

رۆژێکیان توونچی خۆی کردەوە بە ماڵدا رووانی ژنەکەی خواردن دەرخواردی کوڕە دەدا .

لێی پرسی : ئێستا .. چۆنیت ؟

نەخۆشەکە وتی : سوپاس بۆ خوا زۆر باشم وخوا پاداشتی ئێوەش بداتەوە .

توونچی کە رۆژانەکەی( ٥ ) درهەم بوو. ئاوی وەنەوشە و ئارەقی نەعنای بۆ هێنایەوە . رۆژی درهەمێکی بۆ دەدا بە دەرمان . درهەمێکی دی دەدا بە ( فرۆج ) بەم شێوەیە (١) مانگ پەزێرایی یان کرد . لاوە چاك بووەوە .

ئەمجا توونچی پێی وت :

کوڕم دەتوانیت ..کارم لەگەڵ بکەیت !؟

تورنچی کەرێکی بۆ بە کرێ گرت و بە سواری بردی و پێداویستیی خۆ شتنی بۆ کری.
کردی بە گەرماوەکەداو پێی وت : دەی ناوی خوای لێ بێنە : با بتشۆم .
کەوتە شتنی ( ضوءالمکان ) .
دوای کەمێك خاوەن گەرما و ناترێکی نارد و وتی :
ئەمەی تۆ دەیکەی ئەرکی ئێمەیە .
توونچی وتی :
ئەمانە .. چاکە و پیاوەتی تۆن .
ناترەکە سەری نەخۆشەکەیشی هەر لەوێدا تاشی و ئەمجا شتی .
کە توونچی .. برد ی یەوە ماڵەوە ، کراسێکی تەنك و دەستێك جلی جوانی خۆی و پاشماخێکی ، پێ پۆشی و قایشێکی باریکش بۆ پشتی . ژنە توونچیش دوو فروجی مریشکی بۆ لێنابوو . کە لە سەر جێگاکەی خۆی دانا . هەستا و شەکرۆکەی لە ناوە دەرماندا بۆ توانەوە و پێی نۆشی .
کەسفرەی خوان راخرا . خۆی گۆشتی مریشکە ناسکەکەی دەکرد بە دەمەوەو فروجاوەکەی دەدایە .
( ضوءالمکان ) وتی :
خوا.. تۆی بۆ من کردە فریشتە و لەسەر دەستی تۆدا چاك بوومەوە .
توونچیش وتی :
واز لەم قسانە بهێنە و پێم بڵێ لە پێناوی چیدا، گەیشتوویتە ئەم شارە !؟
خەڵکی کوێ یت !؟ چونکە دیارە تۆ، کاتی خۆی بووە بوویت؟
ئەویش وتی :
تۆیش پێم بڵێ ، چۆن منت دۆزیوەتەوە؟ تاکو منیش بۆت بگێڕمەوە .
توونچی وتی :
تۆم لەو سەر سەلوێنکەی بەردەم توونی گەرماوەکەدا، دۆزی یەوە . ئیتر نەمزانی کێ فڕێی داویت؟ ئەوە بوو تۆم هێنایەوە ماڵ .
( ضوءالمکان )یش وتی :
پەنا بەوخوایەی ئێستقانە فڕێ دراوەکان زیندوو دەکاتەوە کارت بەفیرۆ نەچووەو پاداشتت دەدەمەوە .
ئەمجا پرسیی : ئێرە کوێ یە؟
توونچی وتی : ئێرە شاری قودسە .
چووالمکان نامۆیی خۆی و ون بوونی خوشکەکەی بیرکەوتەوە و بەسەرهاتی خۆی بۆ توونچی گێڕایەوەو وتی :

بە هۆی ئەوان بوو، پرزەم لێ بڕا    خۆم بینییەوە: لە کلپەی گڕا
کەچی ئەوکەسەی من بۆی سوتابووم    فرە دڵڕەق بوو زوو دڵی گۆڕا
لام لێ کەنەوە و پشتی گوێم مەخەن    دەرم بێننەوە لە گڕی سوورا
لە دڵدا ، زۆرێك لە ئێوەم پرسی :    دڵیش ناسکە و هاکا وا تۆرا..!

توونچی وتی : مەگری و ستایشی خوا بکە! کە سەلامەتیت..!

( ضوءالمكان ) پرسی :

دیمەشق ، لێرەوە چەند دوورە ؟

ئەویش وتی :

(٦) ڕۆژە ڕێ یە .

ئەمجا پرسیی :

دەتوانیت بمخەیتە سەر ڕێگاکەی؟

توونچی وتی :

گەورەم ناهێڵم ، بە تەنیا بڕۆیت .. تۆ گەنجێکی نامۆ و نەشارەزای و خۆم هاوڕێت دەبم .. بە ژنەکەشم دەڵێم ئەگەر ویستی ئەویش لەگەڵ خۆم دێنم . حەز ناکەم هەر خۆت گەشت بکەیت .

لە ژنەکەیشی پرسی :

ئاخۆ.. تۆیش لەگەڵم دێیت؟ چونکە ئەم میوانە نیازی چوونە ( دیمەشق )ی هەیە . ئەگەر لێرەش دەمێنیتەوە .. ئەوا، دواتر دەگەڕێمەوە ماڵەوە . چونکە دەترسم جەردەو ڕێگران رووتی بکەنەوە .

ژنەکەش بڕیاریدا، لەگەڵیان بڕوات . توونچی ، شتومەکی خۆی و ژنەکەی و ماڵەکەی هەڕاج کرد . وشترێك و کەرێکی لێ کڕی . هەر سێکیان سوار بوون . هەر ڕۆیشتن (٦) ڕۆژ بەڕێوە بوون. ئەمجا خۆیان کرد بە شاری دیمەشقدا . توونچی چووە بازاڕ و هەندێ خواردنی کڕی.

ژنی توونچی چەند ڕۆژێك نەخۆش کەوت و دواتر مرد . مەرگی ئەو ژنە زۆر کاری کردە سەر ( ضوء المكان ) . چونکە هەمیشە پەزێرایی دەکردو پێوەی ماندووو دەبوو . پێنج ڕۆژ مانەوە .

کە بینی زۆر بە خەم بوو بۆ ژنەکەی وتی :

خوا پاداشتت بداتەوە .. مردن چارەنووسی هەمووانە.

توونچییش وتی :

خوا پاداشتی تۆیش بداتەوە : بەڵکو خوا.. ئەم خەمەمان بە خێر بگێڕێت . کوڕەکەم ، خۆت ساز بدە با کەمێك ، بچینە ناو شارەکە و تۆزێك دڵمان بکرێتەوە .

ئەویش وتی :

چۆنت پێ باشە وا دەکەین .

دەستی بە دەستی ( ضوءالمكان )ەوە بوو. قەرەباڵغی بینی . وشتر و باری بینی ، بە فەرش و تۆپە کوتاڵ و زین و سەرزین و چەندین کۆیلەو خزمەتکارییان بینی .

( ضوءالمكان ) لە دڵی خۆیدا وتی :

ئاخۆ... ئەم بارە وشترانەو ئەم هەموو فەرش و کوتاڵ و کۆیلانە هی کێ بن ؟

لە خزمەتکارێکی پرسی ؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی :

ئەمە دیاری و داهاتی والی دیمەشقە رەوانەی شا عومەری کوڕی دەکرێت .

ئەویش چاوی پڕ فرمێسك بوو! ئەم شیعرەی وت :

ئەی ئەوانەی کەوا ونن لە چاوان لە نێو دڵدان ئازیزن وەکو میوان

بە دووریتان ژیانم خەیلێ تاڵە لە تاسەی ئێوە بوو دڵ دایە کێوان

کە خواکردی و بە ئێوەشاد بوومەوە لە ئامێزت دەنێم لە سوبحێ تاکو شێوان

توونچی پێی وت :

کوڕەکەم .. ئێمە هێشتا بڕوا ناکەین : تۆ چاك بووبیتەوە ! بێخەم بە دڵی خۆت بدەوە .. من خەمی ئەوەم بوو تێك بچیت !

کەوتە دڵدانەوەی و هاندانی .. ئەویش هەر هەناسەی هەڵدەکێشاو لە داڵغەی خوشکیدا بوو.. بیری بە لای نیشتمانەکەیەوە بوو.

بە دەم فرمێسکەوە سرینەوە ئەم شیعرەیشی وت :

تویشوو هەڵگرە کوا تۆ جێگیریت ؟ گومانی نییە ، ڕۆژێ دێ بمریت

خۆشی ئەم دنیا، لەخشتەت نەبا دوایی کفنێك و چەند بست خاك دەگریت

تۆ.. ڕێبوارێکیت ئێوارە لات دا سبەی جێی دێڵیت ! ملی ڕێ دەگریت

دیسان دایەوە پرمەی گریان . توونچیش بە دوایداو ئەمیان بۆ لە دەستدانی ژنەکەی . ئیدی تاکو ڕۆژ بووەوە ، هەر دڵی چووالمکان ی داوە .

کە ڕۆژ بووەوە توونچی لێی پرسی :

دەڵێی بیری نیشتمانت دەکەیت !؟

ئەویش وتی :

ئەرێ بە خوا.. ئیدی ماڵئاواییت لێ دەکەم و لەگەڵ ئەم کاروانە وشترەدا دەڕۆمەوە .

توونچیش وتی :

منیش ناتوانم لێت دوور بم .. چاکەیەکم لەگەڵ کردوویت : خۆ... دەبێت بیگەیەنمە ئەنجام . ئەویش زۆر سوپاسی پیاوەتی کرد . ئەمجا چووە گۆڕەپانی ئاژەڵان وشترەکەی فرۆشت و بە بڕێکی پارەکەی کەرێکی دی کڕی بۆ چووالمکان .

...گریەوەو وتی :
...سواری ئەم کەرە.. ببە ، هەر کە ماندوو بوویت .. دابەزە و پیادە ببە .
...ەویش وتی :
...پاداشتت بداتەوەو هێندەم دەسەڵات بداتێ ، تۆڵەی ئەم چاکانەت بۆ بکەمەوە !
...خوا.. ئەوەی تۆ بۆ منت کردووە برا بۆ برای ناکات .
... شەو داهات ، بڕێك خۆراکیان بارکرد و شوێن کاروانەکە کەوتن . لەولایشەوە ..
... خوشکەکەی لە خانەکە لە شاری قودس عەبای بە سەریدادا.. بچێت بۆ کار بکەرێت
... گۆشت بۆ براکەی بکرێت و بۆی ببرژێنێت ..
... ڕێگاوە دەگریا و نەیدەزانی روو لە کوێ بکات ؟ سوێی دووره وڵاتی و نامۆییش چوو
...ەوە .
...ی دەکردو لە خوا دەپاڕایەوەو دەیوت :

شەو هاتەوە بۆ زاری من — بۆ تاسە و بۆ ئازاری من
دووریت جەرگی لەت کردووم و — تۆ نابیستیت هـاواری من
فرە دووره دەستی بە من — شێواندووتە بازاڕی من
گرت خستۆتە گیانەوە — هەی رۆح و شا دەماری من
ئەستێرەکانم شایەتن — بۆ شەوانی بێداری من

... دەدەن هاوڕێیان — بۆ بەختی رەشی سواری من
... بە سۆزە پاکەکەت — بە تەنیا تۆی خەمخواری من
... هەستی کرد شەووەرەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

... ٥٥

...هاتی نزهە الزمان و کابرای دەشتەکی

...مزاد وتی :
...الزمان بـە دەم گریانـەوە دەڕۆیـشت و بـەم لاو ئـەو لای خۆیـدا دەیروانـی .
...ێکی دەشتەکی و ( ٥ ) لاوی عەرەبی بینی . پیرەکە ( نزهەالزمان )ی بەو عەبا
...نی زۆری بە لاوە جوان و ناسك بوو .
... لای خۆیدا وتی :
... کیژە جوانە .. هەر چەند هەژارە بەڵام دڵ دەبات !! خەڵکی ئەم شارە بێ یان نە ء ،
...! ماوەیەك شوێنی کەوت .
... لێی پرسیی :
... کچەکە ، تۆ ئازادیت ، یان کەنیزەکیت ؟
... کچەکە وەڵامی دایەوە : برینم مەکوڵێنەوە .

پیرەش وتی :

(٦)كچم بوون (٥)یان مردن . بچكۆلەكەیانم بۆ ماوەتەوە . ئێستاش دەمەوێت بزانم خەلكی ئەم شارەیت یا.. نامۆیت؟ بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆم بتبەمەوە بتكەمە دەستە خوشكی تاقانەكەم و بەلكو دڵی پێت بكرێتەوە . ئەگەر ( بێكەس )یشیت ئەوا دەتكەمە كچی خۆم .

نزهەالزمان كە ئەمەی بیست لە دڵی خۆیدا وتی :

رەنگە ، لای ئەم پیرە خۆم بۆ بپارێزرێت .

ئەمجا بە پیرەی وت :

مامەكە من كیژە عەرەبێكی نامۆم .. برایەكی نەخۆشی لاوازم هەیە ، رێزدار و بە ناوبانگی ولاتی خۆم بووم . گەر رێم دەدەیت رۆژانە لای كیژەكەت بم .. شەوانیش بگەرێمەوە لای براكەم . ئەوا لەگەڵت دێمەوە . تاكو براكەیشم شوێنەكەم بزانێت و ئێمە خەلكی حیجازین .

پیرەش وتی :

نامۆیان ئازیزی ئێمەن . چۆنت پێ باشە وابكە. حەز دەكەیت براكەیشت بێنە ماڵی من. پیرە.. زۆر بە رێز و بە نەرمی یەوە قسەی بۆ دەكرد . تاكو رازی كردو شوێنی كەوت .

لەولایشەوە چاوی لە(٥) هاورێكەی داگرت . وشتر و كەژاوەیان بۆ هێنا . خواردن و خواردنەوەیان خستە بەردەمی .

توومەز.. پیرەی دەشتەكی و هاورێكانی جەردە و رێگرن . نە منداڵی هەیە و نە هیچ. رێبوارێك بوو، قەدەری خوا وابوو: ئەم كیژە لە رێ ببینن .

پیرەش، بەدەم قسە كردنەوە كیژەی گەیاندە كەناری شار.(٥) لاوە عەرەبەكەیش وشتر و كەژاوەیان ئامادەی سەفەركرد . پیرە سواری وشترێك بوو، نزهەالزمان ی خستە پاشكۆی خۆی . دواتر بۆی دەركەوت فێڵی لێكراوە . پیرە دەشتەكی یەكە فریوی داوە . بە درێژی ئەو شەوە بە دەم رێوە . هاواری كردو گریا. ئەوانیش خۆیان گەیاندە كێوەكان . تاكو كەس نەیان بینێ .

بەرەبەیان پیرە دابەزی و بە كیژەی وت :

ئەم شین و شەپۆرە چی یە.. كیژە شلە شاری ئاسكۆڵە؟ گەر نەیبرێتەوە. تا بتوانم لێت دەدەم !!

كیژەكە ژیانی لەبەر چاو تاڵ بوو، وتی :

پیری نەگبەت .. من خۆم دایە ، سایەی تۆ.. بۆ غەدرم لێ دەكەیت !؟ دەتەوێت سزایشم بدەیت؟

پیرە لە وەڵامیدا وتی : ئەوە زمانیشت هەیە .. ئاوا .. وەڵامم دەدەیتەوە!؟ قەمچی یەكەی هەلگرت و پێ یدا كێشاو پێی وت :

بێدەنگ نەبێت دەتکوژم .کیژە سەعاتێک بێدەنگ بوو بیری هەر بە لای براکەیەوە بوو.
ڕۆژی دووەم بە پیرەی وت :
جوان ، دەستی منت بڕی و منت هێنایە ئەم شاخ و کێوە ! ئێستاش چیت لە من دەوێت؟
پیرەی هێندە دڵی ڕەق بوو وتی :
ئەوە زمانیشت هەیە! وەڵامی پێ بدەیتەوە. ئەگینا؟
هێندە قامچی بە پشتیدا کێشا . کە خەریک بوو بیبوورێتەوە . کەوت بەسەر
پێلاوەکانیداو ماچی کردن ، ئەمجا وازی لە لێدانی هێنا .
بەدەم جنێو دانەوە پێی وت :
گوێم لە گریانت بێت .. یا بەم چەقۆیە زمانت دەبڕم .
ئەویش لە ترسا بێدەنگ بوو . لەبەر ئازار چوارمەشقی لێی دانیشت و سەری خستە
کۆشی یەوە. بیری لەم ڕسواییەی ئێستاو نازو نیعمەتی جارانی خۆی کردەوە . خەمی برا
نامۆ نەخۆشەکەیشی خوارد.. بە دەم هەنسکەوە وتی :

وەفای زەمانـــە کوا تاکو سەرە — کێ ڕزگار دەبێت لەو بێنە و بەرە؟
دنیا کە بۆ خۆی هەر کۆتا دەبێت — ئێمەش مردن وگۆڕمان لەبەرە
داخی ئەم هەمووخەم و پەژارەش — بۆ ژینم بۆتە کۆسپ و ئەگەرە
سەدەیەک بژیت بێسودە ئەگەر — تێیدا سەرشۆڕ بووی بویتە سەمەرە
پرزەم لێ بڕا و بێ ئومێد ماوم — نامۆیی بردمی بە ڕیزی ئەو کەرە!
گەر ڕێتان کەوتە شار و هەوارم — دەزانن گریە و ئەشکم بە خوڕە

شیعرەکە زۆر کاری کردە سەر پیرە دەشتەکی یە و دڵنەوایی کرد و فرمێسکەکانی بۆ
سڕی .
کولێرەیەکی جۆی دایە و وتی :
ڕقم لـەو کەسـانەیە ، لـەکاتی تـووڕە بوونمـدا وەڵامـم دەدەنـەوە . دەتفرۆشـم بـە
دەوڵەمەندێك وەکو خۆم باش بێت .. چاکەکار بێت .
کیژە وتی : خێرت بنووسێت .
شەوگار درێژ بوو . برسێتی زۆری بۆ هێنا. بۆیە هەندێ لە کولێرە جۆیەکەی خوارد .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو

## شەوی ٥٦

شەهرەزاد گێڕایەوە :
پیرەی دەشتەکی فەرمانیدا، سوار بن . خۆیشی کیژەی خستەوە پاشکۆی و سێ ڕۆژ
بەڕێوە بوون .

ئەمجا خۆیان کرد بە شاری ( دیمەشق )دا . لە( خان - ئوتێل )ی سوڵتان لایان دا کە نزیک ماڵی جێگری شا بوو . ( نزهەالزمان ) بە هۆی ماندوویی ڕێگاوە . ڕەنگی هەڵبزڕکابوو. بۆیە دەستی کردە گریان..!

پیرەی دەشتەکی تووڕە بوو. سوێندی لێ خوارد بە حەقی شووڵە تەڕەکەم : ئەم گریانە .. نەبڕیتەوە دەتفرۆشم بە جوولەکەیەك .

دەستی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی یە مەزادخانەی ( کۆیلە)یان .

بەم شێوەیە، پێیدا هەڵدا:

یا الله ئەم کەنیزەکەم هەیە .. براکەی نەخۆش کەوتووە . ناردوومە بۆ شاری ( قودس) . تاکو خزمانم بی دۆزنـەوەو چارەسـەری بکەن و پێکیـان شـاد بکەنـەوە . ئیـدی ئـەم کیژە هەمیشە بۆ براکەی دەگری . بۆیە دەمەوێت بیفرۆشم . هەرکەسێك لێم بکرێت کە براکەی چاك بووەوە ، ئەویشی بۆ دەهێنم و بە نرخێکی هـەرزان پێـی دەفرۆشـم . بـا هـەردووکیان پێکەوە بن .

بازرگانێك پرسیی :

ئەم کیژە تەمەنی چەندە ؟

پیرە وتی :

ئەمە هێشتا کچە . زۆر بە ڕەوشت و زیرەك و جوانە ! ئەم زەرد و لاوازیەشی ، بە هۆی خەم خواردنیەوەیەتی بۆ براکەیەتی !

بازرگان ، دەستی پیرەی گرت و بردی یە لاوە و پێی وت :

ئەم کەنیزەکەم دەوێ و پارەی باشت دەدەمێ.بەڵام مەرجم هەیە! گەر پەسەندی بکەی

دەشتەکی وتی :

حەز دەکەیت : بیبـە بـۆ سـوڵتان ! چـۆن مـەرج دادەنێیـت .. دای بنـێ ! گـەر دەتوانیت بیگەیەنە .. لای ( شرکان )ی کوڕی شا ( عومـەری کـوڕی نعمـان) ! خـاوەنی شـاری بەغدا و خۆراسان . ڕەنگە بە دڵی بێت و نرخێکت بداتێ .. قازانجێکی زۆریشی لێ بکەیت !

بـازرگانەکە وتی :

منـیش دەمـەوێت فـەرمانێکی شـاهانەم بـۆ دەر بکـات . کـە بـاجی گـومرگ نـەدەم! نامەیەکیش بۆ تۆ بنوسێت ، کە چاوێکی لە تۆیشەوە بێت . پەیمان بێت بـە هێنـدەی خۆی زێڕت بدەمێ !

هەردووکیان چوونەوە نزیك ( نزهەالزمان ). دەشـتەکی یەکـە.. نـاوی نـابوو (ناجیـە) . بۆیەکە بانگی کرد ( ناجیە ) . کیژە کە گوێی لەو ناوە بوو.. دەستی کردە گریان و وەڵامی نەدایەوە .

پیرە ڕووی کردە بازرگانە و پێی وت :

هەر وەکو ئامۆژگاریم کردی . بی لاوێنە و ئاگات لێی بێت .
بازرگان لێی چووە پێش و بە زمانێکی شیرین کەوتە دواندنی . ( نزهەالزمان )یش کە
بە زمانی عەرەبی قسەی دەکرد ، وەڵامی دەدایەوە .
بـازرگان لە دڵی خۆیدا وتی :
ئەگەر ئەمـە ئـەوە بێت کە پیرەی دەشتەکی دەیڵێت ، ئـەوا بەئاواتی خۆم دەگەم .
بازرگان سڵاوی لێکرد و هەواڵی پرسی .
کە ( نزهەالزمان ) سەیری بازرگانەکەی کرد لە دڵی خۆیدا وتی :
لەوە دەچێت . ئەمە کڕیارەکەم بێت ! ئەگەر نەهێڵم بە ئەمەم بفرۆشێت .. دەبێت ،
هەر لای ئەوپیرە زاڵمە بمێنمەوە . هێندەشم لێ دەدات هەر دەمکوژێت .
ئەم پیاوە ، بەروخساریدا دیارە کە کەسێکی باشە ! بۆیە دەبێت بە زمانێکی شیرین
وەڵامی بدەمەوە .
ئەمجا وتـــی :
سڵاو لە ئێوەش ، گەر هەواڵیشم دەپرسیت : یاخوا.. دوژمنەکەت بە حاڵم بێت ! ئیدی
بێدەنگ بوو .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٥٧**

شەهرەزاد وتی :
کە بازرگان ئەمەی لە ( نزهەالزمان ) بیست کۆڵێ دڵی خۆش بوو.
رووی کردە دەشتەکی و وتی :
ئەمە کەنیزەکێکی چاك و زۆر بەرێزە ، هەر بۆیە لێت دەکڕم .
پیرە وتـــی :
ئەوا لێت تێکدام ! بۆچی بەم کەنیزەکەدا هەڵ دەدەمیت!؟
ئاخر.. ئەمە گەندترینی کەنیزەکەکانە ! ئەمە کچە شوانێکە ..!
بازرگان بۆی دەرکەوت ئەم پیرە زۆر هەرزە و کاڵفامە!! بۆیە پێی وت :
لەسـەرخۆ بـە .. مـن بـەو هـەموو خـەوش و ناتـەواوی یـەوە .. کـە پێت وتم : هـەر
پەسەندمە !
دەشتەکی پرسیی : چەندم دەدەمیتێ ؟
بازرگان وتی : نرخ لای خۆتە !! بڵێ!
دەشتەکەی وتی : تۆ قسە بکە .
بازرگان لەدڵی خۆیدا وتی :

ئەم دەشتەکی یە زۆر گێلە..! منیش ئەو زمان پاراوی و جوانی یەی ئەم کەنیزەکەم بەدڵدا چووە. خۆ..گەرخوێندەواریش بوایە ، ئەوا ..هەر زۆرگرنگ تر دەبوو. دیارە ئەم دەشتەکی یە نرخی نازانێت !

ئەمجا رووی کردە دەشتەکی و پێی وت :

کاکی برا (٢٠٠) دینارت دەدەمێ و نە حەقی سوڵتانت هەبێت و نە هیچ .

پیرە تووڕە بوو وتی :

هەستە دەی لاچۆ.. بەو خوایە (٢٠٠ ) دینارم هەر بەو عەبایەی داوە کە بە سەری دا داوە نات دەمێ ! نا..کاکە .. نە ء .. نایفرۆشم و وشتری پێ دەلەوەڕێنم و نانی پێ دەکەم !

بانگیشی کردە ( نزهەالزمان) : وەرە بۆگەن . هەر ناتفرۆشم ..!!

بە بازرگانەشی وت :

وام دەزانی پیاوێکی ژیریت ! بە حەقی ئەم شووڵە گەر دوورنەکەوێتەوە لێم . قسەی خراپیشت پێ دەڵێم.

بازرگان لە دڵی خۆیدا وتی :

ئەم پیاوە، شێتە نرخی ئەم کەنیزەکە نازانێت ! ئەگەر شێت نەبێت : بۆچی سوێند بە شووڵەکەی دەستی دەخوات !!؟ بە خوا.. ئەم کەنیزەکە سامانی (کیسرا) دێنێت !! خۆ من هێندەشم پارە نی یە.. بەڵام بەو خوایە .. داوای هەموو ماڵ و سامانیشم بکات ، دەیدەمێ !

ئەمجا بە پیرەی دەشتەکی وت :

گەورەی عارەبان دڵت گەورە بێت لەگەڵمدا.. ئاخر عەباکەی شڕە! کوا بەرگی گرانبەهای لەبەر دایە؟

پیرەش وتی : ئەو عەبایەشی پێ زیادە !

بازرگان لە کەنیزەکەکەی پرسی : ناوت چی یە؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی : ناوی ئەمڕۆم ... یان ڕۆژانی پێشووم ؟

بازرگان پرسیی :

بۆچی تۆ ئەمڕۆ ناوێکت هەیە و ڕۆژانی پێشوو ناوێکی دی؟

کیژە وتی :

بەڵێ جاران ناوم ( نزهەالزمان ) بوو.. ئەمڕۆش شکاوەی زەمانەم .

بازرگان چاوانی پڕ فرمێسك بوون و پرسیی :

ئەی راست دەکات کەوا برایەکی نەخۆشیشت هەیە؟

ئەویش وتی :

ئەرێ بە خوا گەورەم..وا زەمانەش لە یەکی دابڕیوین ! ئێستا ئەو لە (بیت المقدس )ە و نەخۆشە ! دەنگ و شێوەی قسە کردنی بە دڵی بازرگان بوو .

لە دڵی خۆیدا وتی :
دەشتەکی ڕاست دەکات ئەمە بە نرخە !
کیژەش دووە وڵاتی وبرای وماڵە باوانی بیرکەوتەوەکەوتەوە گریان ئەم شیعرانەی هاتە سەر زمان :

| | |
|---|---|
| بۆ هەر کوێیەك ڕۆیشت بیت | لە نێو بیر و هۆشی مندایت |
| لە کوێ بیت خوا ئاگای لێتە و | پارێزراوی قەزا و بـــەڵایت |
| بە دووریت بۆ دیدەکانم | بوویتە فرمێسك و نەڕژایت! |
| خۆزگە سەد خۆزگە دەمزانی | لەکام شوێنی سەرزەویدا یت!؟ |
| تا لە ناوی "خدری زیندە" | لە دەیدەم دا ئـــاوم بدایت ! |
| لە نێو دڵی خوشکی خۆتا | بە جوانی نازم بکێشایت |
| قۆرتی نەگبەتیم بەلایەك | بە تەنیا گەر تۆم بۆ بمایت |

بازرگان لەگەڵیدا گریاو دەستی درێژ کرد کە فرمێسکەکانی بسڕێت .
کیژە رووی وەرگێڕاو وتی : بمبەخشن گەورەم .
ئەوا.. پیرە دەشتەکیش هەر سەیریان دەکات . دەشتەکی پێی وابوو، لە بازرگان هەڵگەڕاوەتەوە. بۆیە بە خۆی و شووڵەکەی دەستی یەوە .. هەڵی کوتایە سەر نزهەالزمان و کێشای بە پشتیدا و بەدەمدا خستی . پارچە بەردێك هەڵ چەقی یە نێو چاوانی و هەڵی دڕی و خوێن جۆگەلەی بەست .
کیژەش قیژاندی و لەهۆش خۆی چوو!
بازرگان دەستی کردە گریان بە سەریدا و لە دڵی خۆیدا وتی :
گەر بەهێنـدەی کێشی خۆی داوای زێـڕی کـردووە ، ئـەم کەنیزەکەی لـێ دەکـڕم ولـەم زاڵمەی ڕزگار دەکەم .
ئەمجا دەستی کـردە جنێـودان بـە دەشـتەکیەکە . کە کیـژە بـە ئاگـا هاتـەوە بـە پارچە بەرۆیەك ناوچەوانی خوێناویی بۆ بەست و کچەیش چاوانی بەرەو ئاسمـان بڵنـد کـردەوە و ئەم شیعرەی وت :

| | |
|---|---|
| کوانێ بەزەیی بە کەسی پـــاکا | تا سەبەب کارم ئاوا ڕسوا کا؟ |
| وەك من فرمێسك وخوێنی تێکەڵ بێ | دۆزەخیش سنگی گری بۆ وا کا ؟ |

نزهەالزمان رووی کردە بازرگان و بە دزی دەشتەکیەوە لێی پاڕایەوە و وتی :
تۆو خوا لە دەست ئەم خوا نەناسە زاڵمە ڕزگارم بکە . خوا .. لـە ئـاگری دۆزەخ ڕزگارت بکات .
ئەوە بزانە گەر ئەمشەو لای ئەم کابرا دەشتەکییە بمێنمەوە خۆم دەکوژم .
بازرگانەکە بە عەرەبە دەشتەکی یەکەی وت :

دیاره.. تۆ بەو نیازە لەم کێژەت نەدا کە ناوای بەسەر بێت ! وەرە .. با..لێت بکڕم .

پیرەی دەشتەکی وتی :

نرخی خۆیم بدەرێ و پیرۆزت بێت . ئەگەرنا ، لەگەڵ خۆم ..دەیبەم و دەیکەمە وشترەوان .

بازرگانیش وتی : ئەوە (٥٠٠٠) دینار.

ئەویش وتی : نای دەم !

ئەویش (٧٠٠٠ ) دیناری دایەو پیرە وتی :

نایدەم .. چونکە بایی (٧٠٠٠) دینار هەر کولێرەی جۆم دەرخوارد داوە ! ئەو نرخە مایەکەی خۆیشی نییە !

بازرگان زۆر تووڕە بوو. وەختە بوو لە پێستی خۆی بچێتە دەرەوە .

بۆیە وتـــی :

بە خۆت و تیرە و هۆزەکەت بایی ئەو پارەیە کولێرەی جۆتان نەخواردووە ! وا من یەك نرخت دەدەمێ .. پەسەندت کرد زۆر باشە .. ئەگەرنا.. چاوێك لە ( والی دیمەشق ) دادەگرم . کە هەر بە زۆر لێت بسەنێت و پوولێکیشت نەداتێ ..!

پیرەی دەشتەکی وتی : بلێ ... بزانم !

بـــازرگانەکە وتی : (١٠٠٠٠ ) دینارت دەدەمێ .

پیرەی دەشتەکی وتی :

ئەوا .. پێم فرۆشتیت و ماڵی خۆتە . منیش وا دەزانم لای برای خۆم دەبێت !

بازرگان گەڕایەوە ماڵ و پارەکەی بۆ هێنا. (نزهەالزمان )ی بردو بە دەم ڕێوە بڕیاری دا کە بچێتە شاری ( قـودس ) ، براکەشـی بدۆزێتـەوە و بیکڕێتـەوە . دواتـر خـۆی گەیانـدە (قودس) . دوای گەڕانێکی زۆر ( خان )ەکەی دۆزی یەوە . بەڵام براکەی لەوێ نەبوو!

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٥٨**

بەسەرهاتی نزهەالزمان و بازرگان

شەهرەزاد گێڕایەوە :

بازرگانەکە ، ( نزهـەالزمان )ی بـردە ماڵـەوە و جوانتریـن جلوبـەرگی بـۆ کـڕی ، تـا بی پۆشێت !

هەندێك زێڕی بۆ کڕی و پێی بەخشی و وتی :

ئەم هەموو شتومەکەم بۆ کڕیویت ، لەبەر خاتری خۆت . ئەوەندەم لـە تـۆ دەوێت ، کە

تۆم برده لای جێگری شاری ( دیمەشق ) بتکڕێت . هەر چەندە هەر چەندێک پارەم بداتێ
. نرخی نینۆکەکانت نییە .
ئەوەندەم لێت دەوێت چۆن رزگارم کردوویت و چۆن لەگەڵتا بە رەوشت بووم و بۆت چاک
بووم هەمووی بۆ بگێڕیتەوە . ئەمجا داوای لێ بکە .. فەرمانێکی شاهانەم بۆ دەربکات کە
بەخشراویم لە ( باج ) و (گومرگ ) دانی شتومەك و کوتاڵ . لە کاتی بازرگانی کردنما لێرە
و لەشاری (بەغداد ) و لای شا عومەری کوڕی نعمان .
ئیتر زۆر دڵیشی پێی خۆش بوو و لە دڵی خۆیدا وتی :
خوا یار بێت بە ئاواتی خۆم دەگەم .
ئەمجا پرسیی :
کاتی خۆی تۆی بینیوە ؟
( نزهەالزمان )یش وتی :
نەخێر.. بەڵام لەگەڵ کچەکەی خۆیدا..منی پەروەردە کردووە ! لەبەر ئەوە منیشی زۆر
خۆش دەویَ ئەگەر مەبەستت، ئەوەیە (شا عومەری کوڕی نعمان) چیت دەوێت بۆت بکات :
بڕۆ.. قەڵەم و کاغەزم بۆ بێنە.. نامەیەکت بۆ دەنووسم بە دەستی خۆت بیدە ، بە (شا
عومەری کوڕی نعمان) پێی بڵێ : کەنیزەکەکەت ئەم دەست و ئەو دەستی زۆر کردووە و
فرۆشراوە . کە پرسیشی ئێستا ئەوکەنیزەکە لە کوێ یە؟ پێی بڵێ کە ئێستا لەلای (
جێگری والی دیمەشق )ە !
بازرگانەکە هێندەی تر بە زمان پاراوی و عەرەبی زانیی سەرسام بوو و وتی :
پێم وا بێت ئەو خەڵکانە سووکایەتیان بە ژیری و ورياييت کردووە !! کە تۆیان
فرۆشتووە ! ئاخۆ.. قورئانت لەبەرە !؟
کیژە وتی :
بەڵێ ... لە زانستی پزیشکیش دەزانم . سەرەتای هەموو زانستەکان بەندەکانی (سقراگ)
و (گالیلۆس) .. هەندێکی بۆ باس کرد. ( تذکرة )م خوێندووە . هەندێکی لە ( بورهان ) بۆ
وت .
(مفردات ابن بیگار)یشم خوێندووەو قسەیشم لەسەر ( قانوون )ی ( ئیبن سینا) کردووە .
نهێنی یەکانیم پەی پێ بردووە . هەروەها لە بارەی ( ئەندازە )یشەوە . زانیاری دەربارەی
لەشی مرۆڤ..و کتێبەکانی ( شافعی )م خوێندووە . ( رێزمانی عەرەبی) و ( فەرموودەکان )
( د.خ )م خوێندووە . کتێبیشم هەیە لە( علم المنگق ) و ( بیرکاری )دا .
لە بارەی ( رە وانبێژی ) و (ئەستێرە ناسی)یەوە شارەزاییم هەیە . بڕۆ.. قەڵەم و
کاغەزم بۆ بێنە با..بۆت بنووسم . تاکو لە گەشتی وڵاتاندا سوودی لێ ببینیت .
کە بازرگان ئەمەی بیست قیژاندی : بەه .. بەه .. سەعد! بڕوانە کێ لە کۆشکت دایە!!؟

کاغەز و قەڵەمێکی ( مس )ینی هێنا و کرنووشی بۆ برد . کیژەش لێی وەرگرت .

خستیە بەردەستی .

پێش ئەوەی بنووسێت.. ئاوا..خۆی لاوانەوە :

لەو ساوە دەستم لە تۆ بەرداوە — خەو و خۆراکم لێ هەڵگیراوە

ئەو دڵەم بۆ تۆ جۆرێ دەسووتێ — پێم سەیرە! عاشق چۆن وا ژیاوە؟

تاسەم لە جوانیت هەر نەشکاوە

رۆژانی شادیم ئەوا تێپەڕی و — تا بەردی رەقیش بۆمن تواوە!

پەژارەت هێندەی من گریاندووە — کەوا هەواڵی تۆی بۆم هێناوە

خۆم بە قوربانی شنەی شەماڵ بم

دەستی کرد بە نووسین :

لە کەسێکەوە..کە خەیاڵ و بیرکردنەوە پووکاندوویەتیەوە ! شەونخوونی زەرد و لەڕ و لاوازی کردووە .کە ژیانی تاریکی روناکیی نەدیوە . نە شەوی شەوە و نە رۆژی رۆژ!.

هەر ئەم دیو و ئەو دیوی سەر جێگا دەکات و ئەستێرە دەژمێرێت . کەسێك فرمێسك دەرێژێت .. ئەم شیعرە دەبێژێت :

کە لە نێو باخدا دەخوێنێ بولبول — لەگەڵ مندایە دەیکات دەردە دڵ

کاتێ دەنگ خۆشێ گۆرانی دەچڕێ — لەگەڵیا دڵم دێتە کەف و کوڵ

سکاڵام بۆ برد. تاکو تێ بگات : — تاسەم وەك هی رۆح وایە بۆکۆتەل

ئەمجا فرمێسکی چاوانی سڕی .. ئەمەی وت :

خەڵکی لە شیرین خەودان — من ئیشکچی و بێدارم

ساڵانێك بوو نازدار بووم — ئێستاش نامۆ و نەدارم

لە دامێنی نامەکەوە نووسی :

دوورکەوتەی ناسیاو و خزمان .. پەرەوازە لەنیشتمان .. دڵ پڕلە خەم و ژان ..( نزهە الزمان ) . نامەکەی پێچایەوەو دایە دەستی بازرگانەکە . ئەویش وەری گرت و ماچی کرد .

لە خۆشیان پێی وت :

پەنا بە خوا لەو شۆخ و شەنگیەت!

دەمەو ئێوارە چووە بازاڕ و خواردنی باشی کڕی و پیرەژنە ناترێکی هێنایەوە گەرماوی بۆ دابخات و فەرمانی دایە.. جوان لە گەرماو سەری بشوات و جلوبەرگی واڵای لەبەر بکات .

فەرمانیشیدا. سفرەیان رازاندەوە . کە ئەوان لە خۆ شتن بوونەوە ، چوونە سەر سفرەو ناردیانە شوێنی بازرگان .

بۆ بەیانی رۆژی دواتر بازرگان کە لە ژوورێکی دی نوست بوو ، هەستا وچووە ژوورەکەی ( نزهە الزمان ) و لە خەوی هەستاند . کراسێکی ناسکی بۆ کڕی بوو. بۆی هێنا و سەرپۆشێکی (١٠٠٠) دیناریی و ملوانکەیەکی تورکیی پێدا .کە ناو ناوە زێڕی تێدابوو ،

ملوانکەیەك (١٠) هەلمەت و (٩) ( گۆ )ی تێهەڵ کێشرابوو و زێڕ بوو . ( ٢ ) گوارەی زێڕ کە بایی (٢٠٠٠) دینار بوو .

خۆی گۆڕی و ( نزهەالزمان ) بە دوایدا و رۆیشتن . لە ڕێگا خەڵکەکە نەی بینن ، سەریان لە جوانیی کەنیزەکەکە سوورڕدەما !

بە یەکتریان دەوت : پەنا بەخوا لەو جوانییە!

ئەم دەنگوباسەیش گەیشتەوە لای سوڵتان.

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

شەوی ٥٩

بەسەرهاتی شرکان و نزهەالزمان

شەهرەزاد گێڕایەوە :

کە بازرگان چووە لای پاشا، کڕنووشی بۆ برد و وتی :

پاشای بەختیار..کەنیزەکێکی بەهرەدارم بۆ هێناویت . لە وێنەی نییە و زۆر ناسك و نازدارە !

پاشا پرسیی :

کوا ...پیشانم بدە ؟

بازرگان چووە بەر درەگاکە و هێنایە ژوورەوە . کە شا بینیی ، خوێنی خزمایەتیی جوڵا! شا بە منداڵی ( نزهەالزمان )ی دی بوو.. درەنگانێك بیستبووی کە خوشکەکەی ناوی ( نزهەالزمان )ە.

برایەکەشی ناوی (چووالمکان )ە .. بۆ ئەوەی جێ نشینی و حوکمدارێتی خۆی لە دەست نەدات و رقی لەم دوانە دەبووەوە .

ئەمجا بازرگان هەڵیدایە :

پاشای زەمان .. ئەم کەنیزەکە : سەرەڕای جوانی و نازداریەکەی ، هەموو زانستە ئاینیی و زانستە دنیای یەکان ، لەوانە (سیاسەت) و ( بیرکاری ).. هتد دەزانێت و تیاندا شارەزایە .

شا وتی : بە چەندت کڕیوە ، با پارەکەیت بدەمەوە و جێی بێڵە .

بازرگان وتی :

بەسەر چاوان .. بەڵام ( فەرمانێکی شاهانە )یشم بۆ دەر بکە .. با لەمەودوا باجی (دەیەك ) و (گومرگ) نەدەم ، بۆ ئەو کاڵانەی کە دەیان هێنم . یان دەیان بەمە دەرەوە .

شا وتی :

یەکەمجارە ئەو فەرمانە دەردەکەم ، بەڵام پێت نەگوتم : نرخەکەی چەندە؟

بـــازرگان وتی :

٢- تێر نەخواردنی . ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە دڵی نەهاتووە !
( سوفیان ) پرسی بووی :
دەگونجێت کەسێکی دەوڵەمەند خۆی بگرێتەوە لە چێژەکانی ژیان .. واتە ( خۆ گرەوە
ـ زاهد ) بێت!؟ کە تووشی کێشەیەکی گەورە بوو ئارام بێت ! هەرچی یەکی پێ درا..
سوپاس گوزار بێت !
دەگێڕنـــەوە .. کـە (عبداللـەی کـوڕی شـداد) لـە سـەرەمەرگدابوو و کـەوت بـووە
گیانەلا...موحەمەدی کوڕی بانگ کرد بووە لای خۆی و بەم شێوەیە ئامۆژگاری کرد بوو :
کوڕم .. وا( گیان کێش ).. لێم هاتووەتە پێش !! تۆیش بە ئاشکراو بە نهێنی ..لە خوا
بترسە ! پێویستە کە سوپاس گوزاری نیعمەتەکانی خوا بێت.. لەخوا ترسان باشترین :
توێشووی ئەو دنیایە ! وتویانـــە :

سامان بەختیاری مسۆگەر ناکات خوا ناسی بۆ تۆی دەستەبەردەکات
باشترین توێشوو تەقوایە.. تەقوا بەرگی ئارامیت کە لەبەردەکات

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

## شەوی ٦٥

شەهرەزاد گێڕایەوە:
( نزهەالزمان) دەستی پێ کردەوە و وتی :
با پاشا.. گوێ لەم نوکتەیەی بەشی دووەمی ( دەروازەی یەکەم ) بگرێت .
پێیان وت : ئەو نوکتەیە چی یە؟
ئەویش وتی :
کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە (خەلیفە).خزم و ناسیاوانی دەست بە دیاریەوە هاتنە پیرۆز بایی .. دیاری یەکانیانی خستە ناو ( بیت المال ـ خەزێنەی دەولەت)ەوە.
( بـەنی ئومەیـە )کـان ترسـیان لـێ نیـشت . چـوون بـۆ ( فاتیـــمەی کـچی مـروان )یـان گێڕایـــەوە . ( فاتیمە)ش هەواڵی بۆ نارد کـە دەبێـت هـەر بـت بیـنم . ( عومـەری کوڕی عبدالعزیز )یش شەو گەیشت بووە لای . لە وشترەکەی دابەزی بوو .
کە لە ژوورەوە دانیشت بوون پرسی بووی :
پوورە گیان.. بڵێ چیت دەوێت؟
( فاتیمە )یش وتبووی : حەز دەکەم .. تۆ دەست پێ بکەیت.. !
( عومەری کوڕی عبدالعزیز )یش وتبووی:
خوای گـەورە موحەمـەدی (د.خ) کـردە پێغەمبـەرو بـووە هـۆی بـەزەیی و سـوود بـۆ هەندێك لە هۆزەکان و خەم و ناخۆشیش بۆ هەندەکەی تریان..!! ئەو کەمەی هی خۆی بوو

خۆتما ئێمه کەنیزەکی تۆین ! توو خوا.. ڕێمان بده بەو جوانی و شۆخ و شەنگیەتدا هەڵبڕوانین .

ئەویش زۆر سوپاسی کردن . ئەمه له کاتێکدا پەرده له نێوان ( نزهەالزمان ) و ژنانی میوانی و له نێوان پاشا و چوار قازی و بازرگاندا دادرابووەوە..!

شا شرکان بانگی ( نزهەالزمان )ی کرد :

شابانوو.. ئەم بازرگانه : بەوە وصفی کردوویت . که له ( زانست ) و ( ئەدەب )دا زۆر شارەزایت . تەنانەت زانستی ( ئەستێرەناسی )ش دەزانیت . هەندێك لەوانەی بۆ بازرگانت وتووە ، بۆ ئێمەشی بڵێ !

( نزهەالزمان ) وتی :

هەنگاوی یەکەم ، بە ڕامیاری و شێوازی مامەڵەی شاهانه دەست پێ دەکەم: که ئاخۆ..پێشەنگەکانی ئاینی و شەرعیەکان دەبێت چۆن بن ؟ ڕەوشتیان چۆن بێت؟

پاشای بەڕێز...ئەوە بزانه : باشترین ڕەوشت له ( ئایین ) و ( ژیانی کۆمەڵایەتی دا) کۆ بووەتەوە . به هۆی ژیانی ئەم دنیاوە نەبێت ..کەس به ئایینی پاك ناگات . کەوابوو دنیا چاکترین ڕێگایه بۆ گەیشتن به ڕۆژی زیندووبوونەوە . کاروباری دنیا به مرۆڤەکانی ڕێك دەخرێت . خەڵکەکەش (٤) لایەنه: یەکەم بەڕێوەبردن . دووەم : بازرگانی کردن . سێ یەم : کشتوکاڵ . چوارەم : پیشەسازی بەڕێوەبردنی سیاسەتێکی تۆکمە و کۆمەڵناسیەکی ڕاستگۆیانەی دەوێت . چونکه بەڕێوه بردن ، واتای ئاوەدانکردنەوە و بنیات نان دەگەیەنێت و مسۆگەر کردنی دوارۆژ . خوا دنیای داناوە بۆ تۆیش و بۆ که سانی بەخوا گەیشتوو . بۆیه پێویسته کەسەکان هێنده له دنیا سوودمەند بن ، که بیان گەیەنێته خوا..! نابێت شوێن حەز و ئارەزووەکانی خۆیان بکەون ، گەر مرۆڤەگان دادپەروەر بوون ، ڕق وکینەبەرایەتی نامێنێت . بەڵام مرۆڤەکان به زوڵم و ستەم ، حەز و ئارەزووەکانیان دەستەبەر دەکەن . لێرەوە ، پێویستیان به سوڵتانەکان دەبێت . تاکو نێوانی مرۆڤەکان ڕێك بخەنەوە! که سوڵتانەکان و پاشایان خەڵکەکه چاوترسێن نەکەن ئەوا : بەهێزانیان لاوازانیان دەخەنه ژێر و به سەریاندا زاڵ دەبن .

( ئەردەشێر) وتویەتی :

( ئایین و پاشایەتی دوانەن ) . ئایین گەنجینەیەکه و پاشایان چاودێریانن .

شەریعەتەکانی ژیری دەڵێن : پێویسته مرۆڤەکان گەورەیەکیان هەبێت . تاکو بەرگری له ستەم لێکراوان بکات . له بەرامبەر زۆردارانـدا . دادپەروەری بخاته نێوان لاواز و بەهێزەکانەوە . سنوورێك بۆ ملهووڕان دابنێت . ئەوەش بزانه ئەی پاشا زەمانه .. له سەردەستی ڕەوشتی سوڵتانەکاندا دەگۆڕدرێت .

پێغەمبەر ( د.خ ) فەرموویەتی :

دوو شتی نێوان خەڵك چاك بوو.. ئەوا ژیانی خەڵكەكەی چاك دەبێت . گەر ئەو دوو شتەش خراپ بوو .. ئەوا نێوانی مرۆڤەكان خراپ دەبێت . ئەو دوانەش ، ( سوڵتانەكان ) و ( زانایان )ە .

هەندێك لە ژیران وتویانە :

( پاشایان و سوڵتانان (٣) جۆرن .. پاشایانی ( ئایین پارێز) . پاشایانی ( ڕەوشت پارێز) .

پاشایانی شوێن چێژەكانی ژیانی خۆ كەوتوو .

شەهرەزاد هەستی كرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٦١**

شەهرەزاد وتی :

ئــــەی پاشای دانا ... زیــــرەك و زانا ..

نزهەالزمان وتی :

پاشای ئایین پـەروەر... ئـایین دەسـەپێنێت بەسـەر هاوڵاتیانـدا . پێویـستە خۆیشی لە هەموویان ئایین پەروەرتر بێت . چونكە هاوڵاتیان لاسایی پاشایان دەكەنـەوە و چاوی لێ دەكەن . پاشا ... پارێزەری نـەرێتی ئـایین و كلتـووری كۆمەڵایـەتی یـە! پارێزگـاری (دیـن) و (دنیا) دەكات . فەرمان دەدا كـە شـەرع جێ بـەجێ بكرێـت و خـاوەن ویـژدانیش بـن . ئەو جۆرە پاشایانە قەڵەم و شمشێر پێكەوە كۆ دەكەنـەوە . ئـەوەی كـە بـەرچاوی لێڵ بـوو ، لە ڕێگەی ڕاست خلیسكاو لـە شـەریعەتی قەڵـەم و نووسـین دەرچـوو، ئـەوا بـە هێـزی شمشێر ڕاستی دەكەنەوە . ئیدی دادپەروەریش لە وڵاتدا سەقامگیر دەبێت .

بەڵام پاشای شوێن حەز و ئارەزوو كەوتوو نە ئایینی هەیە و نەهیچ . شوێن ئارەزووەكانی دنیا كەوتووە . خەمی داگیركردن و دەست بە سەرا گرتنی دەورو بـەری خۆی نییە! وڵات بەرەو هەڵدێر و كاولكاری دەبات . تاكو سەری خۆی دەخوات ..!

زانایان وتویانە :

هاوڵاتیان بەهەموویان پێویستیان بە یەك كەس هەیە سەرۆك و ڕێنەمایان بێت . بەڵام پاشا پێویستی بە هەموو دانیـشتوان و هاوڵاتیانـە بـۆ ئـەوەی بتوانێـت مەملەكەت بـەڕێوە بەرێت . بۆیە دەبێت لە ڕەوشت و هەڵسوكەوتیان شارەزا بێت . تاكو بتوانێت دوو بەرەكیان تێدا نەهێڵێت و برایەتیان تێدا بچەسپێنێت . ئەمجا بۆیشیان باش بێت .

ئەمجا وتی :

ئەی پاشا.. ئەوەش بزانە كـە ( ئەردەشێر) یەكـەمین كـەسی ساسـانیان بـوو، لـە چینی سێیەمی پاشایانی فارس بووەو هەموو هەرێمەكانی داگیر كردووە . ئەمجا كۆمەڵی كرد بە چوار بەشەوە . بۆ هەر بەشێك مۆرێكی دانا كە بریتی بوو ، لە مۆری ( دەریـا ) و ( پـۆلیس

) و ( پارێزەران ).. دووەمیان مۆری ( داهات ) و ( باجی دەرامەت ) . ناوی لێنان ناوەدان کردنەوە ، سێ یەمیان مۆری ( زیاری ) و لەسەری نووسرابوو بژێوی . چوارەمیان ( مۆری دادوەری ) ، ناوی نابوو ( داد ) . کە ئەو یاسایە ، تاکو سەرهەڵدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام کاریان پێ دەکرا..!

(کیسرا) بۆ کورەکەی - کە سەرکردەی سوپا بوو- نووسی ؛

سوپاکەت ، با..زۆر و بۆر نەبێت و گەر بەدحیت بە دەمیانەوە پشتت تێ دەکەن . هێندەش مەیان هێنەوە یەك و هەشاریان مەخە سەر.. تاکو لێت بێزار بین .

دەشتەکی یەك بە خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنسووری وت ،

سەگەکەت برسی بکە . با.. شوێنت بکەوێت ..!

خەلیفە لەم قسەیەی زۆر تووڕە بوو.

ئەبو عەباسی تووسیش وتوویەتی ؛

ڕەنگە یەکێکی دی لەتە نانێك پیشانی سەگە برسیەکەت بدات . شوێن ئەو بکەوێت و پشت لە تۆ بکات . خەلیفەش خاو بووەوە و خەڵاتی عەرەبە دەشتی یەکەی کرد .

ئەمجا ( نزهەالزمان ) وتی ؛

ئەی پاشا ( عبدالملك کوڕی مروان ) نامەیەکی بۆ براکەی کە لە میسر بوو ، نووسی ؛

{ هەمیشە کاتبەکانی دەورووبەرت بخە ژێر چاودێری خۆتەوە .. چونکە بە هۆی ئەوانەوە .. ئاگات لەکێشەکانی دەورو بەرت دەبێت !! } . بەرەنگار بوونەوەت لەگەڵ دەوڵەتانی دوژمنتدا . توانای سوپاکەت دەردەخات .

خەلیفە (عومەری کوڕی خەتاب ) - خوای لێ رازی بێت- گەر کارێکی بە کەسێك بسپێرایە ، چوار مەرجی بۆ دادەنا ؛ *نابێت سواری بارگیر ببێت . نابێت بەرگی تەنك بپۆشێت . شرەخۆر نەبێت ! نوێژەکانیش لەکاتی خۆیدا بکات .*

ئەمجا وتی ؛

وتراوە ؛ هیچ سامانێك به هێندەی ژیری نی یە . ژیری به تەکبیر ناگات . بە سوور بوون لەسەر؛

هیچ سوور بوونێك بە هێندەی خوا پەرستی نییە . هیچ شتێك بە هێندەی ڕەوشت ئێمە تینووی نین ! ) هیچ تەرازوویەکیش وەك تەرازووی ئەدەب نییە . هیچ شتێك بە هێندەی سەرکەوتن خۆش نییە . هیچ بازرگانیەکیش بە کاری چاکەدا ناگات ! هیچ قازانج و سوودمەندیەکیش بە پاداشتی خوادا ناگات هیچ خۆ پاراستنێك بە هێندەی سنووری سوننەتەکانی ئیسلام نییە .

هیچ ڕەوشتێك هێندەی بێ فیزیی جوان نی یە..! هیچ شەرمێك هێندەی شەرمەندی زانست نییە .

سەرت پارێزراوە : بە ئەو راستی یانەی کە لە خۆی دەگریت . گەدەت بپارێزە ، لەو شتانەی تێی دەکەیت . ( بەلا) و( مردن )ت بیر نەچێت .

حەزرەتی عەلی فەرموویەتی : لە ژنانی شەڕەنگێز بترسن و خۆتانی لێ بپارێزن . پرسیان پێ مەکەن . چاکەیان لەگەڵ بکەن .

وتراوە : هەرکەس پشت لە ئابووری بکات : سەری لێ تێك دەچێت . ئەمەش رێ و شوێنی خۆی هەیە و باسی دەکەین .

حەزرەتی عومەر فەرموویەتی :

ژنان سێ جۆرن : ژنانی لەخوا ترسی بە بەزەییی.. لەکاتی تەنگانەدا، پشتی مێردەکەی دەگرێت . ژنانێك هەن نایانەوێت .. پیاوەکانیان دەوڵەمەند ببن ..! ژنانێکی تر هەن .. خیانەتکارن و دەبنە تەوق و دەچنە ملی مێردەکانیان . پیاوانیش سێ جۆرن : پیاوی ژیر راوێژی پێ دەکرێت . پیاوی ژیرتر ئەو کەسەیە ، کە تووشی کێشەیەك بوو راوێژ بە دەورو بەری دەکات . دواتر بە قسەیان دەکات .

جۆرێکی تری پیاوان هەیە نە خۆی رێ بەدێی خۆی دەکات و نەگوێ لە ئامۆژگاری کەس دەگرێت پێویستە دادوەریی لە هەموو شتێکدا هەبێت . تەنانەت : کەنیزەکانیش پێویستیانە .

جەردە و رێگرانیش ئەوانەی زوڵم لە هاوڵاتیان دەکەن پێویستە.. دادوەر بن لەدابەش کردنی دەستکەوتەکانیاندا..! ئەگەرنا..یاساکانیان تێك دەچێت ! کارەکانیان هەڵدەوەشێتەوە!

بە کورتی :

لێبووردن کاری پیاوانی مەردە ( رەوشت )یش کاری پیاوا نی راستگۆ

پەنا بۆ سامان دەبرێ بۆ (چاکە ) خەڵکی شاد بکات خێرا و راستەوخۆ

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٦٢**

شەهرەزاد گێڕایەوە :

( نزهەالزمان ) کەوتە وتن لە بارەی سیاسەتی پاشایانەوە . خەڵکەکە وتیان تا ئێستا کەسمان نەدیوە ، بەم شێوە جوانە بتوانێت هێندە لەبارەی سیاسەتەوە بدوێت ..! خۆزگە ..باسەکەی دەگۆڕی .

( نزهەالزمان ) گوێی لێ بوو. بۆیە .. بابەتەکەی گۆڕی و وتی :

( ئەدەب ) بۆ خۆی گۆڕەپانێکی بەربڵاوە چونکە هەموو ژیان لەخۆ دەگرێت .. دەڵێن :

جارێکیان معاویە هاوڕێ یەکی دەبێتە میوانی . هەر زوو دەست دەکات بە هەڵدان ، بە زیرەکی و لێهاتوویی خەڵکی ( بەغداد )دا . ( مەسون )ی دایکی ( یەزید ) کە ژنی ( معاویە ) بوو . گوێی لێ دەبێت و کە میوانەکە دەڕوات بە معاویە دەڵێت :

ئەی ( میری موسلمانان ) رێگە بدە بە عێراقی یەکان .. بێنە لات وگوێیان لێ بگرە .

معاویەیش پرسیی :

کێ یان لە بەردەرگایە؟

وتیان : چەند کەسێکی تیرەی بەنوتەمیم .

فەرمانیدا :

با بێنە ژوورەوە.. ( ئەحنەفی کوڕی قەیسی )یان لەگەڵ بوو.

معاویە وتی : ئادەی .. لێم نزیك ببنەوە .

پەردەیان لە نێوانندا دادانەوە و بە شێوەیەك گوێی لێیان بوو.

ئەمجا پرسیی :

ئەی باوکی دەریا، منت چۆن دێتە بەرچاو؟

ئەویش وتی :

قژیژ .سمێڵ تاشراو! نینۆك نەکراو . بن باخەڵ بۆگەن . (سیواك) بەکارهێنان بۆ خۆی : (٧٢) سوودی هەیە . خۆ شتنی رۆژانی هەینییش پاك بوونەوەیە .

ئەمجا معاویە لە ئەحنەف کوڕی قەیسی پرسی :

ئەی .. لە خۆت چۆت تێگەیشتوویت؟!

ئەویش وتی :

کە هەنگاو دەنێم زۆر بە هێواشی .کە پێ هەڵدێنم بە چاویش چاودێری دەکەم .

ئەمجا لێی پرسی یەوە :

ئەی ئەگەر دات بە لای کەسێکدا .. لە رەمەکی خەلکەکە بوو؟

ئەمیش وتی :

سەری شەرم دادەنەوێنم و سڵاوی لێ دەکەم و قسە زۆر ناکەم و هەر شتێك پەیوەندی بە منەوە نەبوو قسەی تێدا ناکەم .

معاویە پرسیی :

ئەی ئەگەر لووتت تەقی بە لووتی ئەوانەدا کە وەك خۆتن ؟

ئەویش وتی :

گەر قسەیان کرد . گوێیان لێ دەگرم . گەر لاقرتێ یان پێ کردم .. بێدەنگ دەبم .

معاویە پرسی یەوە :

ئەی .. ئەگەر لەگەڵ سەرۆکەکەتدا روو بەڕوو بوویتەوە؟

ئەویش وتی :

سڵاوی لێ دەکەم . بێ دەست بادان ! گوێ دەگرم بۆ وەڵامیان! گەر لە خۆیان نزیك کردمەوە.. ئەوا لێیان دەچمە پێش !! گەر پێیان خۆش نەبوو لێیان دوور دەکەومەوە.

ئەمجا معاویە وتی :
بە راستی وەڵامەکانت باش بوون . ئێستا چی دەخوازیت؟
ئەویش وتی :
خوازیارم .. لە هەڵس وکەوتتدا لەگەڵ هاوڵاتیان .. هەمیشە خوات لە بیر بێت . با هەڵس و کەوتت یەك جۆر بێت و بە یەك چاو سەیریان بکەیت ..! ئەمجا هەستا و کۆڕەکەی جێ هێشت ...
دوایی ( مەسوون )ی خێزانی معاویە وتی :
گەر عێراقی نەبووایە .. بەوەندە رازی نەدەبوو..!
ئەمجا ( نزهەالزمان ) وتی :
ئەمە مشتێك بوو لە خەرمانێك ( ئەدەب ) .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٦٣**

شەهرەزاد وتی :
ئـەی پاشای بەختیار..(نزهەالزمان دەستی پێکردەوە و وتی :
لە سەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی خـەتاب دا . ( موعـەقیب ) خەزێنـەداری (بیت المال) بوو .
ئەو پیاوە وتی :
رۆژێکیان کوڕی ( خەلیفە عومەر ) هاتە لام و منیش دەستم بـرد ( درهـەم )ێکم لە ( بیت المال ) واتە ( خەزێنەی دەوڵەت )دایـە و بـەرەو مـاڵ بوومـەوە . کاتێ لـە ماڵەوە لێی دانیشت بووم . هێندەم زانی خەلیفە عومەر یەکێکی بە شوێنم دا نارد..! منیش زۆر ترسام . کە گەیشتم روانیم درهەمەکەی بە دەستەوە بوو.
پێی وتم :
( موعەقیب ) هەی ( بەڵا ) لێت بدات .. ئەوە خۆت بە شت دەزانیت !؟
منیش وتم : خۆم بە چی دەزانم ؟
وتـــی :
ئـا بـەم ( درهـەم )ەی بەخـشیوتە بـە کوڕەکـەم ..! دوژمنایـەتی لەگـەڵ موسڵمانان دەکەیت !
دوای کەمێ بێدەنگی ( نزهەالزمان ) دەستی پێ کردەوەو وتی :
خەلیفە عومەر بەم شێوەیە بۆ ( ابوالموصل الاشعری) نووسی بوو :
حەقی خەڵکەکە بدە و هەر چی یەکیان لێ مایەوە.. بۆم بنێـرە! کە خەلیفە عوسمان

هات ئەویش بە هەمان شێوە بۆی نووسی . ئەویش ، ئەو فەرمانەی جێ بەجێ کرد .
ئەمجارە ( زیاد )ی لە تەکدا بوو . کە داهاتەکەی لەبەردەم خەلیفە عوسماندا دانا. کوڕی خەلیفە هات و درهەمێکی لێ هەلگرت . ( زیاد )ی کوڕی ئەمیش گریا :
خەلیفە عوسمان پرسیی : ئەوە بۆچی دەگری؟
ئەویش وتی :
کاتی خۆی ئەم داهاتەم بۆ خەلیفە عومەر برد. بە هەمان شێوە کوڕەکەی ( درهەم)ێکی لێ هەلگرت .. خەلیفەش لێی تووڕە بوو . درهەمەکەی لێ سەندەوە و لە جێی خۆی دایناوە . کەچی کوڕەکەی تۆ.. درهەمێکی لێ برد و نەخۆت و نەدەورو بەرەکەت لێ یان نەسەندەوە !!
خەلیفە (عوسمان)یش وتی : جارێکی دی .. لە جۆری خەلیفە عومەر نابێتەوە..!
دوای کەمێك بێدەنگی وتی یەوە :
(لە زەیدی کوڕی ئەسلەم) دەگێڕنەوە ، کە باوکی بۆی گێڕاوەتەوە: شەوێك لەگەڵ (خەلیفە عومەر) دا چووینە دەرەوە و چووینە سەر ئاگرێکی کراوە .
پێی وتم :
( ئەسلەم ) با.. بڕۆینە لای ئەو ئاگرە کراوەیە . کە گەیشتین ..بینیمان ژنێك ، مەنجەلێکی لەسەر ئاگرەکە داناوە و چەند منداڵێکی برسیشی لە دەورە .
عومەر پێی وت :
سڵاو لە خاوەن رووناکی و پێی باش نەبوو بڵێت خاوەن ئاگر!
ئەمجا پرسیی : خەریکی چین ؟
ژنە وتی : ئەوە .. سەرما و تاریکی زۆری بۆ هێناوین!
ئەویش وتی :
ئەی ئەم منداڵانە بۆ نرکە و بۆڵەیان دێت ؟
ژنەیش وتی : لە برساندا وا دەکەن .
ئەمجا پرسیی : ئەی ئەم مەنجەڵە چی یە؟
ژنە وتی : بەو مەنجەڵە بێدەنگیان دەکەم ! خوا لەو دنیا موحاسەبەی (عومەر) بکات لەسەر ئەم منداڵانەم .
ئەویش وتی : جا..( عومەر) کوا ئاگای لە حاڵی ئەمانەیە؟
ژنەش پرسیی :
ئەی چۆن کاروباری ئەو خەڵکانە دەگرێتە دەست و ئاگایشی لێیان نییە !؟
بە پەلە گەڕاینەوە و خۆمان کرد بە گەنجینەی داهاتدا. کۆڵێکمان ئامادە کرد ، لە ئاردو رۆن .

بیده به کۆڵمدا..!
خەلیفە (عومەر) وتی : تۆ بیدە بە کۆڵی منداو خۆم هەڵی دەگرم .
منیش وتم : نەء .. تۆ بیدە بە کۆڵی منداو خۆم هەڵی دەگرم .
خەلیفەیش وتی :
باشە لەو دنیا تۆ شان دەدەیتە بەر گوناهی ، ئەو ژن و منداڵانە .. یان ..من ؟
( ئەسلەم ) وتی :
ناچار دام بە کۆڵیدا. هەر بە لۆقە کردن گەڕاینەوە لای ژنەکە . خەلیفە( عومەر) کۆڵەکەی دانا و بە دەستی خۆی ئاردی بۆ دەرهێناو ژنە کردی یە قابلەمەکەوە . دوو لونێ ڕۆنیشی بۆ دەرهێنا و ژنە تێی کرد . خەلیفە (عومەر) ریشێکی جوانی هەبوو. لە کاتی فوو کردنیدا لە ئاگری ژێر مەنجەڵەکە ..
دووکەڵ بە ناو ریشی دا بڵاوەی دەکرد .
خەلیفە بە ژنەکەی وت :
تۆ بۆیان تێ بکە و منیش بۆیان سارد دەکەمەوە و دەرخواردی منداڵەکانی دەدەم .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٦٤**

شەهرەزاد وتی :
بەم جۆرە مانەوە تاکو منداڵەکانیان تێر کرد و کۆڵەکەی بۆ بەجێ هێشتن .
ئەمجا رووی کردە "ئەسلەم"و وتی :
ئەسلەم .. ئاخر ئەوە برسێتی بوو کە منداڵەکانی گریان بوو . بەڵام من ویستم هۆی ڕووناکی یەکە بزانم ؟
خەڵکەکە بێدەنگ بوون .
ئەویش وتی یەوە :
دەڵێن جارێکیان خەلیفە (عومەر) بەلای کۆیلەیەکی جوتیاردا تێپەڕی . ویستی مەڕێکی لێ بکڕێت .
جوتیارەکە پێی وت بوو :
هی خۆم نی یە!
خەلیفەش وت بووی :
منیش دەمویست .. وا بڵێیت .
بۆیە کۆیلەکەی لە خاوەنەکەی کڕی بووەوە و ئازادی کرد بوو.
کۆیلەکەیش رووی کرد بووە ئاسمان و وت بووی :
خوایە .. وا لە کۆیلەیەتی یە چکۆلەکەی .. ئەم دنیا ئازادت کردم ! هەر خۆیشت ..

ئەیگوێزیمەوە بە گۆڕەکەی .. ئەو دنیا ئازادم بکە..!

دەڵێن ، خەلیفە (عومەر) شوورە ساغەکەی بەخشیوەتەوە ، بەسەر خزمەتکارەکانیدا و خۆیشیان شوورە بۆڕکاوە .. کلۆکلۆکەیان خواردووەتەوە!! لە قوماشی نەرم و ناسک و جوان جوبەرگی بۆ خزمەتکارانی کردووە و خۆیشی بەرگی زۆر هەرزانی لەبەرکردووە! پەرێدەوە ماڵ هاوڵاتیانی داوە ..!

جارێکیان لە سەروو ئەو (٤٠٠٠) دینارەوە ، کە دابوویەوە بە پیاوێك .. هەزار دیناری تری بۆ خست بووە سەر. کەلێیشیان پرسی بوو.. ئەی بۆ کورەکەی خۆیشت پارەکە زیاد دەکەیت و بە شێوەی ئەو پیاوە ئەناسە دەکەیت ؟

ئەویش وتبووی .. ئەمیان کوڕی خۆمە .

ئەمجا نزهە الزمان لە سەری ڕۆیشت :

( حەسەن ) وتوویەتی :

خەلیفە عومەر سامانێکی زۆری بۆ هاتبوو.

(حەپسە )ی ژنی هاتە لای و وتی :

حەقی خزمایەتیم بدەرێ ! لەو سامانەی بۆت هاتووە .

ئەویش وتبووی :

(حەپسە).. خوا حەقی تۆی بە سەر مندا سەپاندووە . نەکو بە سەر سامانی موسڵمانان . ئەوە بزانە کە گەر لەم سامانە بەشت نەدەم . تەنیا باوکتم لێ زیز دەبێت . بەڵام هەموو موسڵمانانم لێ ڕازی دەبێت .

ناچار حەپسەی ژنی بە دەستی چۆڵ و بێ پارە ، چوو بووە دەرەوە..!

کوڕی (عومەر) وتبووی :

زۆر پاڕامەوەو نزام کرد کە لە خەونم دا. باوکم ببینم ! ساڵێکیان هاتە خەونم و سەیر دەکەم ئارەقەی نێو چاوانی دەسڕێت ..!!

منیش لێم لە خەونەکەمدا لێم پرسی : چۆنیت ...!؟

ئەویش پێی وتم :

ئەگەر بەزەیی خوا نەبوایە .. باوکتیان ماندوو دەکرد و تیا دەچووو..!

( نزهەالزمان ) وتی :

ئەی پاشای بەختیار گوێ بگرە لە هەواڵی( شوێن کەوتووان ـ التابعین )ی پیاو چاکان .

(حەسەنی بەسری) وتوویەتی :

( ڕۆح ) لە جەستە دەرناچێت ... تاکو ئەو کەسە بۆ (٣ ) شت بە داخەوە نەبێت :

١- بۆ ئەو پارەو سامانەی کە کۆی کردووەتەوە و فریا نەکەوتووە چێژیان لێ وەربگرێت .

٢- نەگەیشتن بە هەموو ئاواتەکانی....!

٣- تێر نەخواردنی . ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە دڵی نەهاتووە !
( سوفیان ) پرسی بووی :
دەگونجێت کەسێکی دەوڵەمەند خۆی بگرێتەوە لە چێژەکانی ژیان .. واتە ( خۆ گرەوە
ـ زاهد ) بێت!؟ کە تووشی کێشەیەکی گەورە بوو ئارام بێت ! هەرچی یەکی پێ درا..
سوپاس گوزار بێت !
دەگێڕنـــەوە .. کـە (عبداللـەی کـوڕی شـداد) لـە سـەرەمەرگدابوو و کـەوت بـووە
گیانەڵا...موحەمەدی کوڕی بانگ کرد بووە لای خۆی و بەم شێوەیە ئامۆژگاری کرد بوو :
کوڕم .. وا( گیان کێش ).. لێم هاتووەتە پێش !! تۆیش بە ئاشکراو بـە نهێنی ..لە خوا
بترسە ! پێویستە کە سوپاس گوزاری نیعمەتەکانی خوا بیت.. لەخوا ترسان باشترین
توێشووی ئەو دنیایە ! وتویانـــە :
سامان بەختیاری مسۆگەر ناکات      خوا ناسی بۆ تۆی دەستەبەردەکات
باشترین توێشوو تەقوایە.. تەقوا      بەرگی ئارامیت کە لەبەردەکات
شەهرەزادهەستی کرد شەو دەرنگ بووە. . بێدەنگ بوو.

## شەوی ٦٥

شەهرەزاد گێڕایەوە:
( نزهەالزمان) دەستی پێ کردەوە و وتی :
با پاشا.. گوێ لەم نوکتەیەی بەشی دووەمی ( دەروازەی یەکەم ) بگرێت .
پێیان وت : ئەو نوکتەیە چی یە؟
ئەویش وتی :
کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە (خەلیفە).خزم و ناسیاوانی دەست بە دیاریەوە
هاتنە پیرۆز بایی .. دیاری یەکانیانی خستە ناو ( بیت المال ـ خەزێنەی دەوڵەت)ەوە.
( بـەنی ئومەیـە )کـان ترسـیان لـێ نیـشت . چـوون بـۆ ( فاتیـمەی کچی مـروان )یان
گێڕایـــەوە . ( فاتیمە)ش هەواڵی بۆ نارد کـە دەبێـت هـەر بـت بینـم . ( عومـەری کوڕی
عبدالعزیز )یش شەو گەیشت بووە لای . لە وشترەکەی دابەزی بوو .
کە لە ژوورەوە دانیشت بوون پرسی بووی :
پوورە گیان.. بڵێ چیت دەوێت؟
( فاتیمە )یش وتبووی : حەز دەکەم .. تۆ دەست پێ بکەیت.. !
( عومەری کوڕی عبدالعزیز )یش وتبووی:
خـوای گـەورە موحەمـەدی (د.خ)  کـردە پێغەمبـەرو بـووە هـۆی بـەزەیی و سـوود بۆ
هەندێك لە هۆزەکان و خەم و ناخۆشیش بۆ هەندەکەی تریان..!! ئەو کەمەی هی خۆی بوو

دەستی بە سەرا گرت .

ئەوی مایەوە .. وەکو رووبارێکی لێ کرد و تینوانی پاراو کرد .

ئەمجا ( ئەبو بەکر) بووە جێگری و ئەویش بە هەمان شێوە . رووبارەکەی بە خەڵکەکە بەخشی یەوە و خوای لەخۆی رازی کرد .

حەزرەتی (عومەر) چووە شوێنی . کاری وای کردو جۆرێك خۆی ماندوو کرد . کە بە کەسی تر، نەدەکرا . کە ( عوسمان )بووە خەلیفە لەو رووبارەوە .. روبارێکی دی هەڵگرت . بەڵام کە (معاویە) بوو بە خەلیفە چەندین رووباری تری لەو رووبارەوە هەڵگرت . ئەویش ( یەزید ) و (کوڕانی مروان) وەکو ( عبدالملك ) و ( ولید ) و ( سولەیمان ) و هێندەیان جۆگە لێ هەڵگرت .. تاکو رووبارەکەیان وشك کرد .

ئێستا ئەو کارە خراپە ..گەیشتووەتە لای من ! منیش ویستم : رووبارەکە ببووژێنمەوە ! تاکو وەکو جاران ئاوی پێدا بڕواتەوە !!

( فاتیمە ) وتی :

بۆ ئەم مەبەستە بوو، ویستم قسەت لەگەڵ بکەم . بەڵام کە ئەمە بیرو لێکدانەوەکەت بێت .. هیچ ناڵێم ..!!

دواتر ( فاتمە ) چووە ناو خزمانی ( بەنی ئومەیە ) و پێی وتن :

مارەیی بە شوو دانی من لە ئەو پیاوە وەربگرنەوە و پیرۆزتان بێت چونکە ئەمە کاری خۆ کردتانە !

وتراوە کە ئەم (عومەری کوڕی عبدالعزیز) لەسەرە مەرگدا بوو . منداڵەکانی لێی کۆ بووبوونەوە .

(موسلیمەی کوڕی عبدالملك) پێی وتبوو : ئەی میری موسڵمانان . تۆیەك کە پەروەردەکەری ئەم منداڵانەی چۆن دڵت هێنای بە هەژاری بەجێ یان بێڵیت !؟ کەس رێگرت نەبوو گەر بە پارەی (بیت المال ـ خەزێنەی دەوڵەت ) دەوڵەمەندت بکردنایە ! ئەوە باشتر نەبوو. لەئەمەی ئێستا؟ ئەوەتا بۆ خەلیفەی دوای خۆتی بەجێ دێڵیت !؟

( عومەر) وتبووی :

منداڵانی من یەکێك لەم (٢) جۆرە دەردەچن : یا لە خوا ترس دەبن .. کە خوا.. لە ژیانیاندا هەموو کارئاسانیەکیان بۆ دەکات و پێویستیان بە سامانی باوکیان نابێت . یان (ملهور) و لە (خوا نەترس) . بۆ ئەم جۆرەیان .. تا لە ژیاندا بووم ، پشتگیریم نەکردن ! ئێستاش نایکەم .

ئەمجا وتبووی :

ئەی (موسلیمە) من و باوکت بە دیار کەسێکی ( بەنی ئومەیە )وە بووین . کە لە گۆڕستان ناشتیان . شەوێ خەونم پێوە بینی : نهێنی یەکی پێ وتم .. زۆر ترسام ! پەیمانم

لەگەڵ خوای خۆم بەست کە ئەگەر بوومە خەلیفە ! من وەکو ئەو نەکەم . ئیدی منیش بە درێژایی تەمەنم پەیمانەکەم نەشکاند . تاکو بەڵکو خوا بم بەخشێت . دواتر ئەو (موسەیلەمە)یە گێڕایەوە.. (عومەری کوڕی عبدالعزیز) وەفاتی کردو منیش لە تەك خەڵکەکەدا ئامادەی ناشتنی بووم . بۆ شەوێ بە بەرگێکی سپی یەوە هاتە خەونم لە نێو رەز و باخێکی رازاوەدا بوو .کە جۆگەیەکی پێدا دەڕۆیشت .

بەرەو رووم هات و پێی وتم :

( موسلیمە )گیان ، با.. موسڵمانان وەکو من بژین تاکو لە ئەم شوێنەیان بەر بکەوێت .

یەکێك لە ( بیرێ )کان گێڕایەوە وتبووی :

لە سەردەمی خەلافەتی (عومەری کوڕی عبدالعزیز)دا ، مەڕم دەدۆشی . لە شوانێك نزیك بوومەوە و چەند گورگێکم بینی . لەبەر ئەوە زووتر گورگم نەدی بوو.. وامزانی ئەو گورگانە سەگن !!

بۆیە لە شوانەکەم پرسی :

ئەم سەگانەت بۆ چی یە؟

ئەویش وتی : ئەوانە سەگ نین ... گورگن !!

منیش وتم :

شتی ئاوا.. چۆن دەبێت !؟ گورگ لە نێو مەڕدا بێت و هیچیان لێ نەخوات !؟

ئەویش وتی :

ئەگەر بیرکردنەوە پاك بوو .. جەستەیش پاك و بێگەرد دەبێ ..!!

(عومەری کوڕی عبدالعزیز) لەسەر سەکۆیەکی گڵین وتاری دەداو سوپاسگوزاریی خوای کرد . ئەمجا (٣) ئامۆژگاریی وت :

( خەڵکینە.. نهێنیتان پاك رابگرن . تاکو کارە ئاشکراکانتان بۆ برایانتان خاوێن بێت . بەرچاو تێری ژیانتان بن . ئەوە بزانن : هەر لە تەمەنی باوکە ( ئادەم )ەوە تاکو ئێستا . یەك کەس بە زیندوویی نەماوەتەوە و ژیانی بەجێ هێشتووە ! ( عبدالملك ) لە پێش منەوە مردووە . دواتر (عومەر)یش و ئەوانی دوای ئەویش دەمرن .

( موسلیمە ) پێی وت : ئەی (عومەر) با..پشتی یەك ، بخەینە ژێر شانت !!

( عومەر ) وتی :

دەترسم ، لە بەرامبەریدا گوناهێکم بۆ بنووسرێت..!

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بوورایەوە .

( فاتیمە ) هاواری کرد :

( مریەم ).. ( موزاحیم ).. فلان و فیسار.. وەرن سەیری ئەم پیاوە بکەن .

ئەمجا ئاوی پرژاندە دەم وچاوی (عومەر)دا تاکو بە ئاگا هاتەوە.

که حەزرەتی عومەر ( فاتمە )ی بینی دەگریا وتی : ئەوە بۆچی دەگریت ؟!
ئەویش وەڵامی دایەوە :
ئەی ( میری موسڵمانان ) گیانەڵای تۆم لە بەردەستم دا بینی ! بێئاگا بوویت و ئەم دنیات جێ هێشت و گەڕایتەوە لای خوا .. بۆیە گریام . ئەمجا ویستی هەستێت نەیتوانی و کەوتەوە .
( فاتیمە) وتی : ئیتر ناتوانین بتبوێنین ..!
شەهرەزاد دەستی کردەوە بە گێڕانەوەی ..

**شەوی ٦٦**

شەهرەزاد دەستی کردەوە بە گێڕانەوەی :
( نزهەالزمان ) درێژەی بەقسەکانیداو وتی :
( بەشی دووەم ) لە ( دەرگای یەکەم) بۆ (٤ ) فازی یەکە و شا ( شرکان ) _ بێ ئەوەی بیناسێتەوە و بزانێت ، کە براکی خۆیەتی !_ ڕێکەوت وابوو ، ( عومەری کوڕی عبدالعزیز) بۆ خەڵکی ( موسڵ )ی نووسی :
شایەتی دەدەم لە ( شهرالحرام)دا و ڕۆژی (حەجی گەورە) دا.. لە ستەم و دوژمنایەتیتان خۆم بە دوور دەگرم . گەر پەلاماریان دان بە فەرمانی من نی یە . نە هەواڵیشم لە ئێوەوە هەیە.. نە خوازیاری بەخشینیشم . ئەوەش بزانن هەرگیز ڕێ نادەم بە زوڵم کردن . لە بەرامبەر زوڵم لێکراواندا بەرپرسم ! هەر کەسێك کاری بە (سوننەت ) و (شەریعەت) و ( قورئان ) نەکرد : مەچنە ژێر ڕکێفی یەوە ! تا ئەو دەمەی دەگەڕێتەوە سەر ڕێی ڕاست ! حەز ناکەم مردنم لە لا ئاسان بکرێت...
ڕاستگۆیان وتوویانە :
لەکاتی خەلافەتی (عومەری کوڕی عبدالعزیز )دا چووینە سەردانی و ( ١٢ ) درهەممان پێ بینی! فەرمانیدا ئەو (١٢) درهەمە بخرێتە ( خەزێنەی دەوڵەت ـ بیت المال )ەوە .
منیش پێم وت :
ئەی ..( میری موسڵمانان ) تۆ منداڵەکانی خۆت ڕووت و برسی دەکەمیت .. جا.. با شتێکت بەوان و هەژارانی ماڵەکەت بدایە ..!
خەلیفەیش وتی : سەرت بێنە پێشەوە..
که سەرم بردە پێشەوە .. پێی وتم :
( کە دەڵێیت .. بەخێوکەری منداڵەکانت و هەژارانی ماڵت ببە . ئەوە ڕاست نی یە ، چونکە خوا بەخێوکەری منداڵەکانم و هەژارانی ماڵمە . ئەوان ئەمانەیان لێ دەردەچێت ، یا لە خواترس دەبن ، کە خوا خۆی پشت و پەنایان دەبێت. یان ، ملهوڕێکی لە خوا عاسی ..

که من له ژیانمدا پشت و پەنای کەسی ملهور نەبووم ..!)
ئەمجا ئاوڕی یە شوێن منداڵەکانی کە (١٢) کوڕ بوون . هاتنە لای و سەیری هەموویانی کرد و فرمێسك کەوتە گۆشەی چاوانی .
پێی وتن :
باوکتان لە دوو ڕێیاندایە . یا..ئەوەتا ئێوە دەوڵەمەند بکات و خۆی ئاگری دۆزەخ ، مسۆگەر بکات.. یان ئەم هەژاریەکەتان پەسەند بێت و هەڵی بژێرن و باوکتان : بەهەشت مسۆگەر بکات . باوکتان چوونە بەهەشتی پێخۆشە ..تاکو ئێوە دەوڵەمەند بکات . هەستن و لە سایەی خوادا بن ..
خالد کوڕی سەفوان وتوویەتی :
( یوسفی کوڕی عومەر) بردمی بۆ لای (هیشامی کوڕی عەبدالملك) و منی پێ ناساند . لە دەشتێکدا ڕەشماڵیان هەڵدا بوو . دەست و پێوەندەکانی خۆی بە دەورەوە بوو و کۆڕیان بەست .. منیش لەسەر فەرشەکەی دانیشتبووم سەیری ئەوم دەکرد..
هەر کە سەیری منی کرد پێم وت :
خوا.. نیعمەتەکانی بە سەرتا بڕژێنیت ( ئەی میری موسڵمانان ) . ئەوەی ئەم پلە و پایەیەی پێت بەخشی .. ژیریشت پێ ببەخشێ . ساتە خۆشی یەکانت ئازاری تێکەل نەبێت . هیچ ئامۆژگاریەکم بە چاکتر نەزانی لەو ئامۆژگاریانەی پاشایانی پێ کراوە .
( خەلیفە هیشام ) کە شانی دادابوو، فتح بووەوە و وتی :
دەی .. کوڕی سەفوان . چێت پێ یە هەڵی بڕێژە ..
منیش وتم :
میری موسڵمانان ساڵێك پێش ئەو ساڵەی خەلافەتیەکەی تۆ پاشایەك هەر لەم شوێنەدا ڕووی کردە دانیشتوان و پرسیی :
لەمەوپێش کەسی ترتان وەکو من دیوە!؟ کەس بە وێنەی من بەخشندە بووە!؟ هیچ کەسێك بە هێندەی من ... زانایان و ڕاستگۆیانی لە دەورووبەر بووە !؟
ئەوانیش وتیان : ئەی پاشا .. تۆ پرسیارێکی گرانت کرد .
یەکێکیان وتی : ڕێم دەدەی .. وەڵامت بدەمەوە؟
پاشایش ڕێی دا .
ئەویش پرسیی : تۆ پێت وایە..ئەمەی باسی دەکەیت تا سەرە!؟ یان ئەمیش کۆتا..دەبێت!؟
پاشایش وتی : ئەمیش بەرەو نەمان دەڕوات ..!
ئەمجا کابرا وتی :
کەواتە بۆچی بۆ شتێکی کورت وکەم ..هێندە زۆرو بۆر دەپرسیت!؟

ئەویش پرسیی : کە چار نی یە..چی بکەین باشە؟
ئەویش وتی :
باش ئەوەیە لەخوا بترسین و تا دەمرین خوا پەرستی بکەین . بەرەبەیان چاوەڕێم بکە.
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو

**شەوی ٦٧**

شەهرەزاد گێڕایــەوە :
نزهە الزمان درێژەی بە قسەکانی دا و وتـــی :
( خالدی کوڕی سەفوان ) وتی :
پیاوەکە بەرەبەیان چووە ژوور بینیی پاشا هێندەی ئامۆژگاریەکە بە هەند وەرگرتبوو . تاجەکەیشی لەسەرکرد بوو و خۆی ئامادەی سەفەر کرد بوو . (هیشامی کوڕی عبدالملك) هێندەگریا تاکو فرمێسك بە ریشیدا هاتە خوارەوە .
ئەمجا فەرمانیدا جلوبەرگەکەی لەبەر داکەند و لەکۆشکدا مایەوە . دواتر خزمەتکارانی کۆشك چوون بۆ لای خالدی کوڕی سەفوان وپێیان وت :
چۆن رێگات بەخۆت دا،خەلیفە ئاوا لێ بکەیت؟ چێژی ژیانت لەبیر بردووەتەوەو ژیانت تاریك کرد!؟
( نزهەالزمان ) لە ( شرکان )ی پرسی :
ئەم دەروازەیەی بۆم گێڕایتەوە . چەند ئامۆژگاری تیا بوو؟ من لەم کوڕەی تۆدا، پێیان رانەگەم هەموو : پەند و ئامۆژگاریەکانت .. هەروا بە ئاسانی بۆ بگێڕمەوە . چونکە رۆژانیکی دوور و درێژی دەوێت .
قازی یەکان وتیان :
ئەی پاشا، ئەم کەنیزەکە : سەرسوڕهێنەری سەردەمی خۆیەتی! لە وێنەی نی یە و لە هیچ سەدەیەکدا، لەم جۆرەمان نەبیستووە..! ئەمجا نزای باشیان بۆ پاشا کرد و کۆڕیان چۆڵ کرد .
( شرکان ) رووی کردە خزمەتکارەکانی وفەرمانیدا :
سفرە و خواردن برازێننەوە!
فەرمانی بە ژنانی وەزیرانیش دا کە چۆڵی مەکەن و لەسەر خوانی ئەو بن .. دواتر سفرە راخرا... گۆشتی سورەوەکراوی ( قەل ) و ( مریشك )ی لەسەر دانرا. سەرەڕای میوانان .. گۆرانی بێژان و سەماکەران ئامادە کرابوون .کەنیزەکانی مۆسیقا زانانی کۆشکیش لەگەڵیاندا ئاهەنگیان گێڕا.
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

## شەوی ٦٨

شەهرەزاد وتی :

کە تاریك داهات . هەر لە قەڵاوە، تاکو بەردەرگای کۆشك ، بەڕاست و چەپدا مۆم داگیرسا.. میران و وەزیران ئاهەنگیان جێ هێشت و چوونە بەردەم (شرکان) . پیرۆزباییان لێکرد . کە ماڵ چۆڵ بوو.

( شرکان) چـووە گەرماوەوە و خـۆی شت . کەنیزەکان و گۆرانی بێژان و ژنـان دەستی ( نزهەالزمان )یان گرت .. تا بیبەن بیڕازێننەوە .

سەرنجیاندا، هێندە شۆخ و شەنگ بوو، پێویستی بە ڕازاندنەوەی فرە نەبوو! ئەمجا شرکان (٧) خەڵاتی پێشکەش بە بووکەخان کرد.

کە ڕۆژ بووەوە (شرکان) لە سەر تەختی شاهانە دانیشت . پیاوانی دەوڵەت و دۆستانی زاوا هاتنە پیرۆزبایی . ( شرکان ) نووسەری دەرباری بانگ کرد نامەیەکی بۆ بنووسێت و ڕەوانـەی لای خەلیفـە ( عومـەری کـوڕی نعمـان )ی بـاوکی بکـات . تیایـدا باسـی کـڕینی کەنیزەکەکە بکات و بنووسێت : کە زۆر زانایـە و هونەرمەنـدەو لـە هـەموو زانستەکاندا شـارەزایە . مـارەی کـردووەو ئێـستا سـکی لێـی پـڕە . هـەر دەبێـت سـەردانتان بکـات و ( چووالمکان )ی برای و ( نزهە الزمان )ی خوشکی ببینن .

سڵاوی نارد بۆ خوشك و براکانی و بۆ ( دندان )ی وەزیر . بۆ هـەموو میران و سەرانی دەوڵەت . ئەمجا بە مۆری شاهانەی خۆی مۆری کرد و ڕەوانەیان کرد .

نامەکە مانگێکی پێچوو. وەڵامی نامەکە هاتەوە . دایانـە دەستی شا و خوێندیـەوە ، کە دوای (بسم الله) نووسرابوو:

( لە کەسێکی دوو منداڵ ون بـووەوە . لـە خەلیفـەی ( عومـەری کـوڕی نعـان)ەوە.. بۆ ( شرکان )ی کوڕی .. ئەوە بزانە دوای ڕۆیشتنی تۆ دنیام لێ بوو بە چەرمی چۆلەکە ! ئارامم لەبەر هەڵگیرا.. نەم توانی ئەم نهێنی یە ، پەنهان بکـەم . ئـەویش بـە هـۆی چوونە ڕاو و شـکارەوە بـوو . مانگێـك مـاڵم جـێ هێـشت . کـە گەڕامـەوە ، بـۆم دەرکـەوت ، کـە بـراو خوشکەکەت هەندێ پارەیان بردووە و لەگەڵ حاجیاندا.. بە دزیی منەوە چوون بۆ حەج . منیش پەژارەیەکی زۆرم خوارد و ناچار چاوەڕێی حاجیانم کرد. بەڵکو ئەوانیان لەگەڵدا بن . کە هاتنەوە پرسیارم کرد نەیان بینی بوون . ئیتر بێ ئومێد بووم و ڕەشم پۆشی ! بادەی خەمم نۆشی .

ئەمەم نووسی :

خەیاڵیان ساتێ لە دڵ دەر ناچێ . لە سینە ومێشکما..گرتوویانە: جێ!

هیوای بینینی ئەوان نەیکوشتووم دەنا بوو بوومە خۆڵی ژێری پێ

دەزانم چاوپۆشی ناکرێت لەم کارەساتە و شوورەیی هێنەرە ! بەڵام هیچم بۆ ناکرێت!!

( شرکان ) خەمێکی زۆری بۆ باوکی خوارد . بەڵام پێی خۆش بوو، خوشك و براکەی ون بوون..! نامەکەی هەڵگرت و بردی بۆ لای ( نزهەالزمان ) و بێ ئەوەی بزانێت کە خوشکی خۆیەتی .

نزهەالزمان نـۆ مانگ و نۆ رۆژەی تەواو بوو . خـوا کچێکی دایە . نـاردی بە شوێن ( شرکان )دا.

کە هات پێی وت : ئەمە کچی خۆتە و خۆت ناوی بنێ .

ئەویش وتی : وا باوە ، کە دەبێت منداڵ حەوتەی بچێت ئەمجا ناو بنرێت .

بە سەر کچەکەیدا نووشتایەوە و ماچی کرد . کە روانی (ملە گۆ)یەکی لە ملدایـە ، لەو (٢)گۆیە بوو، شازادە ( ئیبریزە ) لە وڵاتی ( رۆم )ەوە هێنابووی . کە سەیری ملەگۆکەی ملی کچەکەی کرد . ژیریی لەسەردا نەما. چاوانی بە گێژەوە چوون . تووڕە بوو چونکە جوان ملەگۆیەکەی ناسی یەوە .

سەیرێکی نزهەالزمان ی کرد و پرسیی : ئەم (ملەگۆ)یەت لە کوێ بوو ئەی کەنیزەك ؟

ئەویش وتی :

من خاتوونی تۆ و هەموو دانیشتوانی کۆشکم ، شەرم ناکەیت پێم دەڵێیت : کەنیزەك !!؟ لە کاتێکدا من کچە پاشام . ئێستا هەموو شتەکان کەوتوونـە روو.. من ( نزهـەالزمان )ی کچی ( شاعومەری کوڕی نوعمان )م .

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بووە.. بێدەنگ بوو.*

**شەوی ٦٩**

## یەکتر ناسینەوەی (شرکان) و ( نزهەالزمان )

شەهرەزاد وتی :

کە (شرکان) بەمەی زانی ، جەستەی کەوتە لەرزین و سەری داخست و دواتر بووراییەوە...! کە بە ئاگا هاتەوە زۆر سەری لەم کارە سووڕما..!! بەڵام نەی هێشت بزانێت کە( برایەتی ) ...

پرسیی : خانم تۆ کچی شا عومەری کوڕی نعمانیت !؟

ئەویش وتی : بەڵێ .

ئەمجا وتی :

ئێستا باسی دابڕانی خۆت و کەنیزەکەکەتم بۆ بگێڕەوە .

ئەمجا نزهەالزمان.. لە نووکەوە تا کۆتایی بۆی گێڕایەوە .

پێ ی وت :

کە براکەی لـە شـاری (قودس) جێ هێشتووە . چۆن دەشتەکی یەك هەڵی گرتووە و

فرۆشتوویەتی بەو بازرگانە !؟
( شرکان) بۆی روون بووەوە کە : ئەمە خوشکی خۆیەتی . بەڵام لە باوکی یەوە .
لە دڵی خۆیدا وتی :
جا..چۆن دەبێت خوشکی خۆم مارە بکەم!؟ چارەمەر ئەوەیە ئەم ژنەم کە خوشکی خۆم دەرچووە – لە کۆیلەیەکی خۆمی مارە بکەمەوە ..!
گەر شتێك دەرکەوت ئەوا دەڵێم . تەڵاقم داوە و دواتر لە یەکێك لە کۆیلەکانی خۆم مارە کردووەتەوە .
بە داخ و خەفەتێکی زۆرەوە سەری بڵند کردەوەو وتی :
( نزهەالزمان) تۆ خوشکی راستەقینەی منیت..!!
پەنا بە خوا لەم گوناهەی کەبێ ئاگایانە تێی کەوتین . منیش ( شرکانی شا عومەری کوڕی نعمانم! خوشکە کە ئەمەی بیست کەوتە لە خۆدان و قژ رنینەوە و بووراییەوە .
کە بە ئاگاهاتەوە وتی :
لاحول ولاقوە الابالله .. گوناهێکی گەورەمان کردووە.. چارەمان چیە؟ ئێستا من چی بە دایك و باوکم بڵێم !؟
( شرکان )یش وتی :
پێم باشە لە پیاوێکی خۆمت مارە بکەمەوە ..منداڵەکەم لای ئەو بەخێو بکە . بە شێوەیەك کەس نەزانێت تۆ خوشکی منیت .. قەدەری خوا وابووەو بە دەست خۆمان نەبووە . ئەمەش تەنیا چارەمانە !
سەری ماچ کرد و کەوتە لاوانەوەی ( نزهەالزمان ) .
دواتر لێی پرسی : کچەکەت ناو دەنێیت چی ؟
ئەویش وتی : قضی فکان
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٧٠**

شەهرەزاد وتی :
خوشکەکەی لە دەرگاوانی خۆی مارە کردو لەگەڵ قچی فکان ی کچیدا ناردیەوە ماڵی دەرگاوان ..
کەنیزەکەکانیش کەوتنە بەخێو کردنی ئەو کچە ساوایە . ئەمیان ئەمە حاڵی بوو.
( ضوء ا لمکان )یش هەر لە لای توونچی یەکە بوو .. لە شاری دیمەشق .
رۆژێکیان شرکان نامەیەکی بۆ هات لە لایەن باوکیەوە کە دوای "بسم الله الرحمن الرحیم" تیانووسرابوو: کوڕم لە تاسەی منداڵەکانم دا ، خووم بە خەم داوە .. خەو لە چاوانم تۆراوە . کە ئەم نامەیەت پێگەیشت . داهاتی ساڵانەی شاری خۆت بنێرەو لەگەڵیدا ، ئەو

کەنیزەکەی کە مارەت کردووە و وەسفی ژیری و شارەزاییت لە نامەکەدا بۆ کردبووم بۆم بنێرە . زۆر حەز دەکەم بیبینم و قسەم بۆ بکات . منیش لە ولاتی رۆمەوە پیرەژنێکی هەر زۆر چاك و زیرەکم بۆ هاتووە ..کە (٥) کەنیزەکی لەگەڵدایــە ..
هەموویان شارەزای ئەدەب و فەلسەفە و زانستن . بەراستی زمان لە وەسفیاندا لالە..!
کە ویستم پیرەژنەو (٥) کەنیزەکەکە بکڕم . خاوەنی داوای داهاتی شاری دیمەشقی ... لێم کردووە !
جا... بە پەلە داهاتی ئەمساڵی دیمەشق بنێرە.. با بیان کرم ..!
تۆیش کەنیزەکەکەی خۆت لەگەڵ داهاتەکەدا بنێرە . با.. پێشبڕکێیان پێ بکەم . حەز دەکەم بۆ خۆم بن . چونکە هیچ پاشایەکی تر.. لەم جۆرە کەسانەیان نییە ! بۆیەش بە هەرزانم زانی و کڕیمن . رەنگە هەرکەنیزەکێکیان بایی داهاتی دیمەشق بێت . پەلە بکە لە ناردنی داهاتی دیمەشقدا ، تاکو بیدەمە پیرەژن و ئەویش بڕوات (٥) کەنیزەکەکەم بۆ بهێنێت و ببنە هی خۆم .. ژنە کەنیزەکەیشت بنێرە..با لەگەڵ پیرەژندا روو بەڕووی بکەمەوە . ئەگەرکەنیزەکەکەی لای تۆ لە مانەی لای منی بردەوە. ئەوا هەموویانت بە دیاری دەدەمێ . داهاتی بەغدایشت بۆ دەنێرم .
کە شرکان ئەمەی خوێندەوە ناردیە شوێنی دەرگاوانەکەی و وتی :
ژنەکەتم بدەرەوە .
کە خوشکەکەی بۆ گەڕایەوە ، نامەکەی باوکی پیشان دا و پرسیی :
تۆ دەڵێیت چی !؟
خوشکەکەی وتی :
بڕیار بە دەست تۆیە . بەڵام منیش بیری نیشتمانی خۆم و کەس و کارم دەکەم . تۆ .. دەرگاوانی مێردیشم لەگەڵم بنێرە . با منیش باسی فڕاندنی خۆمی بۆ بکەم ، چۆن ئەو دەشتەکییە بردمی و فرۆشتمیەوە بە تۆ . تۆیش دوای ئازاد کردنم مارەت بڕیم لە دەرگاوانەکەت .
شرکانی برایشی وتی : چۆنت پێ باشە وا بکە .
شرکان فەچی فکان ی دایە دەست دایەن و خزمەتکاران ، تاکو بۆ بە خێو بکەن . ئەمجا داهاتی ساڵانەی شاری دیمەشقی ئامادە کرد و بارو بارخانەی لەگەڵ نزهەالزمان دا رەوانەی بەغدا کرد .
(٢) کەژاوە ، ئامادە کران . یەکێکیان بۆ کەنیزەکەکە و ئەویتر بۆ دەرگاوانی مێردی بە جیا . گۆیەکەشی لە دایکی سەند و کردیە ملی کچۆلەکەی ، دوای ئەوەی زنجیری زێڕی بۆ کرد .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو

## چیرۆکی سەفەری ضوء المكان و توونچی بۆ بەغداد

شەهرەزاد وتی:

هەر ئەو شەوە کاروان کەوتە ڕێ. لەولایشەوە زەوئولمەکان و توونچی لە تارمەکەوە سەیری خوارەوەیان دەکرد. کاروانی وشتر و هێستریان بینی. فانووس و چرایان بینی. زەوئولمەکان پرسیاری

ئەو کاروانەی کرد.

پێیان وت :

ئەوە داهاتی دیمەشقە بۆ شا عومەری کوڕی نعمان خاوەن بەغدای دەبەن .

ئەمجا پرسیی : سەر قافلەچی کێیە؟

ئەوانیش وتیان :

گەورە دەرگاوانی مێردی کەنیزەکە زاناکەیە .

ئەمەی بیست و دایك و باوك و وڵاتی خۆی بیر کەوتەوە و بەگریانەوە بە توونچی وت : توانای مانەوەم لێرە نەماوەو لەگەڵ ئەم کاروانە وردە وردە دەکەومە ڕێ تا دەگەمەوە وڵاتی خۆم .

توونچی وتی :

من چاوم بەرایی نەدەهات بە تەنیا ڕەوانەی قودست بکەم و بۆ دیمەشق چۆن بێخەم بەم لە چوونت بەرەو بەغدا؟ بۆیە تاکو بەغدایش لەگەڵت دێم . توونچی شتومەکی کۆکردەوە و گوێرێژی بۆ ئامادە کرد . هۆری پڕ لە خواردن کرد و خستییە سەر پشتی کەرەکە .

چاوەڕوان بوون تا دەرگاوان سواری هێسترەکەی بوو ، خزمەتکاران بە دەوریدا کۆ بوونەوە .

ئیدی ضوءالمكان سوار بوو و وتی :

تۆش لە پاشکۆمەوە سوار بە .

ئەویش وتی : لە پەزێرایییتدا دەبم ، بەڵام سوار نابم !

ئەمجا وتی : کە ماندوو بووم ، سوار دەبم .

( ضوءالمكان )یش وتی :

با .. بگەمەوە نیشتمانی خۆم .. ئەوسا بۆت دەردەکەوێت چۆن پاداشتت دەدەمەوە؟

کەوتنە ڕێ تاکو ڕۆژ بووەوە . ئیدی کاتی حەوانەوەی کاروانی یەکان و دەرگاوان هات . فەرمانی حەوانەوەی دا . دوای ئاودانی وشترەکان و حەوانەوە دیسان فەرمانی بار کردن و ڕۆیشتنی دا . ( ٥ ) ڕۆژ بەڕێوە بوون . گەیشتنە شاری (حەما) . لەوێش بۆ ( ٣ ) ڕۆژ لایان دا و حەوانەوە . دیسان کەوتنەوە ڕێ و گەیشتە شاری ( دیاربەکر ) .کە شنەبای (بەغداد) لێی دان . ( ضوءالمكان ) خوشکەکەی بیر کەوتەوە . کەوتەوە گریان و ناڵان ... ئەمەی هاتە

سەر زمان :

| | |
|---|---|
| ئارامم گرت و هەر چاوەڕێ بووم | تاسەی هەواڵ و هی خەبەرێ بووم |
| ماوەی یەك بینین کەوا ئەستەم بوو | خۆزگە لێك بوونیش عومری کەم دەبوو |
| وەرن تەماشای لەش ولارم کەن | زەرد و لاوازی و گیان بە بارم کەن . |

توونچی وتی :
واز لەم گریانە بێنە... چونکە لە دەواری دەرگاوانەوە نزیکین !
( ضوءالمكان )یش وتی : پێویستە ، شیعر بڵێم : تاکو گڕی سینەم دامرکێنمەوە .
توونچی وتی :
تووخوا..کوڕی خۆم . واز لە خەم و پەژارە بێنە. وا دەگەڕێیتەوە وڵاتی خۆت . ئەوەتا منیشت لەگەڵم .
ئەویش وتی : بەخوا .. بە دەست خۆم نی یە!
بە لای شاری بەغدادا لای کردەوە.. بینی مانگەشەوە . لەولایشەوە ( نزهەالزمان) خەوی لێ نەدەکەوت ! بیری براکەی دەکرد و دەگریا. کاتێکی زانی هەمان دەنگ ئەم شیعرەی وت :

| | |
|---|---|
| بەرقی ( یەمەن)ی بریسکایەوە | تاسەی دووریی تۆی بیر هێنایەوە |
| ئەی هاوڕێکەم بۆ نەخۆشیم | ( مەی )یت بۆ من هێنایەوە |
| ئەی بریسکەی بە بروسکە | جارانمان : بێنە کایەوە |
| گلەییم هەرگیز لێ مەکە | بووم بە تووش ئەم بەڵایەوە |
| کە ئاوا خۆشەویستەکەم | ڕۆیشت و سەری نایەوە |
| تەمەن بەرەو کەندەڵان و | پشتیشم نا بە بایەوە |
| شەرابی خەمی پێدام و | ڕێژنەی فرمێسك بە دوایەوە |
| هاوڕێ کارێکت پێکردووم | خۆمم پێ نەگیرایەوە |
| زەمانە ورەی بەردابووم | بە تۆ بوو دڵ بووژایەوە |
| خۆشی خۆشی کە گونجاوم | بێخەم فرێمی دایەوە |
| من کە هەژار و داماوم | کەسم نایە... ژێر سایەوە |
| ئێستاش لەخەمدا: تاکم و | دەرگای خۆشیم نەکرایەوە |
| کاتێ ژینی ئێمە تاڵ بوو: | زۆڵەکان هاتنە کایەوە |

شەهرەزاد هەستی کرد شەو وەتەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٧٢**

شەهرەزاد گێڕایەوە :
کە (ضوءالمكان) لە شیعرەکەی بووە . هاوارێکی کرد و بوورایەوە . ( نزهەالزمان )یش ئەو شەوە خەوی لێ نەکەوت . چونکە براکەی بیرکەوتبووەوە . کە گوێی لەو شیعرەش بوو،

دڵی ئارام بووه وحەوایەوە .

خزمەتکارێکی بانگ کردو پێی وت :

برۆ .. ئەوەم بۆ بێنە کە شیعرەکەی خوێندەوە .

ئەویش وتی :

نە گوێم لە شیعر بووە و نە بۆم دەدۆزرێتەوە ..کێ وتوویەتی!؟ ئێستا هەموو نووستوون .

( نزهە الزمان )یش وتی :

هەر کەسێك بە خەبەر بوو.. ئەوە ئەو بووە .

خزمەتکار چووە دەرەوە. دوای گەڕان توونچیی بینی کە بەخەبەر بوو. ضوء المکان یش بوورا بووەوە . کە توونچی یەکە خزمەتکاری بە سەر سەریەوە بینی لێی ترسا.

خزمەتکار پرسیی :

ئەو شیعرەی کە خاتوونەکەم گوێی لێ بوو.. تۆ خوێندبووتەوە؟

توونچی وتی : نە بەخوا...

خزمەتکار پرسی یەوە :

ئەی کێ خوێندبوویەوە پیشانم بدە؟ چونکە تۆ نەنووست بوویت ..!

توونچی خەمی ( چووالمکان )ی بوو و لە دڵی خۆیدا وتی :

دەترسم شتێکی بەسەر بێنن !؟

بۆیە وتی : نـــــازانم !

خزمەتکار وتی :

بەو خوایە ... درۆ دەکەیت . چونکە تەنیا تۆ نەنووست بوویت .

توونچی وتی :

بەو خوایە ، بە راستمە . ئەوەی شیعرەکەی خوێندەوە ، رێبوارێك بوو . منیش نارەحەت کرد ! خوا تۆڵەی لێ بکاتەوە .

خزمەتکارەش وتی :

گەر دەزانیت کێ یە..پیشانم بدە با بیبەم بۆ خاتوونەکەم . ئەگەریش نا ئەوە خۆت بیگرەو بۆمان بێنە .

توونچیش وتی : بە چاوان .

ئەمجا گەڕایەوە لای خاتوونەکەی و پێی وت :

دەڵێن .. رەوتەنی بووە و رۆیشتووە .

ئیدی خاتوون بێدەنگ بوو.

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

ئەمشەویش شەهرەزاد لێی دانیشت و دەستی بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی کردەوە :

( چووالمکان ) کە بە ئاگا هاتەوە ، سەیری کرد مانگ بە ئاسمانەوەیە و شنەبای بەیانە .
دیسان سۆزی جوولاّ و قورگی پاك کردەوە و ویستی شیعرێك بڵێت .

توونچی هاواری لێ هەستا :

ئەوە چی دەکەیت ؟

( چوو المکان ) وتی :

دەمەوێ بە خوێندنەوەی شیعر.. دڵنەوایی خۆم بکەم .

توونچیش وتی :

تۆ دەزانیت لەسەر شیعر خەریك بوو : چیمان بەسەر بێت ! بە هەزار حاڵ و ناڵی
عەلی تاکو : خزمەتکاری دەرگاوانم رازی کردووە .. وازمان لێ بێنێت !

( چوو المکان)یش پرسیی :

ئادەی .. پێم بڵێ چی بووە؟

ئەویش وتی :

هەر کە تۆ بێ هۆش کەوتبوویت . بە تووڵێکی دار هەنارەوە ، خزمەتکارێك : هاتە
سەرم و دوای ئەوەی بە دارەکەوە بەسەر ئەو خەوتوانەدا گەڕابوو .

هات و لێی پرسیم :

کێ ئەو شیعرانەی خوێندووەتەوە؟

چونکە هەر من بەخەبەر بووم ، لە منی پرسی :

منیش وتم : رێبوارێ بوو .. بەم ناوەدا رۆیشت .

ئەمجا فەرمانی پێ دام :

ئەگەر ئەمجارە تووشی بوویتەوە ، بۆمان بێنە .

کە ( چووالمکان)یش ئەمەی بیست بە دەم گریانەوە وتی :

کەس ناتوانێت رێم لێ بگرێت . من شیعری خۆم دەخوێنمەوە .. چی دەبێت با ببێت .

توونچیش وتی :

تۆ .. لە خۆڕا.. خۆت بە کوشت دەدەیت !

ئەویش وتی : هەر شیعر دەخوێنمەوە! ..دەی .

توونچی وتی :

کەوابوو.. لەیەکتر جیا دەبینەوە . من دەمویست بە دایك و باوکت شادت بکەمەوە .
ئەوە ساڵ و نیوێکە تۆ لای منیت و تۆم پاراستووە ! ئاخر ئەو خەڵکە ماندوون و پێویستە
بنوون .

( ضوءالمكان )یش وتی :  له قسەی خۆم پەشیمان نیم ..چی دەکەیت .. بیکە !
ئەمجا بەم شێوەیە کەوتەوە خۆ لاواندنەوە :

برۆ هەواریان: بانگیان بکە..بانگ    بەڵکو ئەمە خوا ئەویش بێتە دەنگ
( بزوتك )ێ .. خێرا دا بگیرسێنە    چونکە ئەو دنیای بۆتە شەوەزەنگ
تاسەی ئەو هێندە عەجایب نییە    دووریی بۆ ئێمە: جەفەنگە..جەفەنگ
هۆ بەهەشتەکەی دوورە دەست بەخوا    بۆ تۆیە کەوا دڵم تەنگە .. تەنگ

ئەمەیشی وت :

بە دڵی خۆمان سوورِا زەمانە    کۆی کردینەوە ئەو نیشتمانە
ئەوشوێنەی ( ضوءالمكان)ی لێ بوو    جێگەی خۆشی یە و( نزهەی زەمان )ە

کە شیعرەکەی تەواو کرد (٣) جاران ناڵاندی و بێ هۆش کەوت . توونچیش جاجمێکی بە سەردا دا.
کە ( نزهەالزمان ) ئەم دێرِەی دوایی بیست . باوك و دایك و براکەی بیر کەوتەوە . بەڵام کە بەیتی دووەمی بیست و ناوی خۆی و براکەی تیا بوو .
بە دەم گریانەوە بانگی کردە خزمەتکارەکەی :
( بەڵا) لێت بدات .. ئەوەی جاری یەکەم شیعرەکانی وت .. وا هەر خۆی ئێستا لە نزیکمانەوە شیعردەڵێت! بەو خوایە هەر ئێستا بۆم نەهێنیت بە دەرگاوان دەڵێم تێرت تێ هەڵبدات و دەرت بکات .
دەستی بۆدرێژ کردو وتی :
ها.. ئەم (١٠٠) دینارەی بدەرێ . بە روویەکی خۆشەوە..بی هێنە...ئەگەر هەر نەهات .. توورەکەکە (١٠٠٠) دیناری تیایە و هەمووی بدەرێ . ئەگەر هەر نەهات .. ئەوا بزانە ناوی چی یە و خەڵکی کوێ یە؟ چ کارمیە؟ . خێراکە.. زوو بگەرِێوە .
ئەمجا هەرِەشەی لێ کرد :   نەکەی بە دەستی خاڵی بگەرِێیتەوە .
ئەویش بە (تووڵە دارهەنار)ەکەی دەستیەوە ، کەوتە گیانی نووستوانی نێو دەوارەکان و ئەوانەی دەرەوە . کە هەموو نووستبوون . تا گەیشتە لای توونچی .
لەبەر ئەوەی هەر ئەو بە خەبەر بوو .
پرسیی :  تۆ بووی .. ئەو شیعرانەت خوێندەوە؟
ئەویش وتی :  نە بە خوا ..گەورەی هۆز.. من نەبووم .
خزمەتکار توورِە بوو وتی :
لە دەستم دەرناچی . دەبێ هەر پێم بڵێیت : کێ یە؟ چونکە منیش ناوێرم بە دەستی بەتاڵ بگەرِێمەوە..
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

## شەوی ٧٤

شەهرەزاد وتی :

توونچی زۆر لە ( ضوء المكان )یش ترساو بە کوڵ گریاو بە خزمەتکارەی وت :
بەو خوایە.. نەخۆم بووم و نە ئەو کەسەم بینیوە ! بەڵام کابرایەکی رەوتەنیم بینی .
من تووش مەکە ، چونکە لە قودسەوە هاتووم .
کابرا فەرمانی دایە کە هەر ئێستا لەگەڵی بچێتە لای خاتوونەکەی وخۆی بۆی بگێڕێتەوە . چونکە
تەنیا .. تۆ دەبینم کە بە خەبەر بیت !
ئەویش وتی :
تۆ برۆ.. خەمت نەبێت ئەمجارە هەرکەسێکم بینی شیعری خوێندەوە..بۆت دەهێنم !
ئیتر زۆری لێ پاڕایەوەو سەری ماچ کرد و دووری خستەوە . لەبەر ئەوەی خۆیشی نەی دەوێرا بە دەستی بەتاڵ بگەڕێتەوە ، جارێکی دی گەڕایەوە و خۆی لە پەنا درەختێکدا شاردەوە ..

( توونچی )یش ،( ضوء المكان )ی بەخەبەر هێنایەوە و پێی وت :
هەستە ، تاکو چی روویداوە بۆت بگێڕمەوە !
توونچی بەزمی خزمەتکارەکەی بۆ گێڕایەوە .
ئەویش وتی :
لەبەرئەوەی لەنیشتمانەکەمەوە ، نزیکم خەمی هیچم نی یە !
توونچی پرسیی :
لەبەرچی وا شەیتان چووەتە کەللەتەوە ؟ ئاوا .. لە کەس ناترسیت!؟
کەچی من لە تۆ و لە خۆیشم دەترسم !! بۆخاتری خوا ..ئیدی شیعر مەخوێنەوە تا دەگەیتەوە وڵاتی خۆت . ئاخر.. ژنی دەرگاوان وا دیارە سەری بە شیعرەکەت .. دەئێشێ ..!
رەنگە نەخۆش بوو بێت . یان خەوی زڕابێت . بۆیە بۆ دووەم جار ناردی یەوە بەشوێنت دا.
( ضوءالمكان)یش هەر وەکو ئەوەی هیچی نەبیست بێت دەستی بە خۆ لاواندنەوە کردەوە:

هەرکەس هەڵدەستێ بە جۆرێ — گلەیی دەکاو لێمان دەتۆرێ
بەهانەی چی یە؟ بۆمان دەگەڕێ — گەر سەری نەخورێ لە شەڕ و شۆڕێ
ئاژاوە گێڕان هەر کە پرسییان : — وتم بۆ خاکە : کە دێمە گۆڕێ
وتیان : کامەیان خۆشترینیانە ؟ — وتم : ئەو کەسەی کە دڵ نەگۆڕێ
وتیان کە هەرگیز پێی مەزن نەبووی — وتم : خۆ پێشی نەبووم سەرشۆڕێ
وتم : هەر نابێت کە لێی دا بڕێم — مەگەر ئەودەمەی دەم خەنە گۆڕێ
دڵم بە کەسێك نادەم : ببینم — هەوڵ بدا .. ئەشکی عەشقم داچۆڕێ

خزمەتكار كە خۆی لێیان شاردبووەوە .گەیشتە سەریان..كە توونچی خزمەتكارەكەی بینی هەڵات و لە دوورەوە چاودێری ( ضوءالمكان)ی كرد .

خزمەتكارەكەی وتی : السلام علیكم .

ئەمیش وتی : سڵاو لە ئێوەش ..

ئەمجا خزمەتكار وتی :

گەورەم .. ئەمە جاری سێ یەمە بێمە لاتان . خاتوونەكەم ، داوای بینینی ئێوە دەكات .

ئەویش وتی :

ئەمە كێ یە ، دەیەوێت بم بینێت !؟ ئەفرەت لە خۆی و مێردەكەی .

ئەمجا كەوتە جنێو دان بە خزمەتكارەكەیش .. ئەویش ئامۆژگاری كرابوو، كە دەبێت بە زمانی شیرین لەگەڵیدا رەفتار بكات . تا بە قسەی بكات . كە ئەهات (١٠٠) دیناری بداتێ . بۆیە خزمەتكار بە نەرمی لەگەڵیدا جووڵایەوەو پارەكەی پێ بەخشی .

ئەمجا وتی :

گەورەم فەرموو... تا بچینە لای خاتوونەكەم . هەندێك پرسیارت لێ دەكات..دواتر دێیتە دەرەوە !

خەڵاتێكی باشیشت دەكات .

ئەویش شوێنی كەوت و ( توونچی ) بە دوایانەوە!

توونچی لە دڵی خۆیدادەیوت :

داخی گرانم بۆ گەنجی یەكەی ! سبەینێ دەیكوژن ..! تۆ بڵێی ..هێندە ئەمك بە حەرام بێت : بڵێت ..توونچی یەكە : شیعرەكەی خوێندووتەوە !؟

خزمەتكار چووە لای خاتوونەكەی و وتی :

خانم ..ئەوەی داوات دەكرد ، ئامادەم كردووە! گەنجێكی شۆخ و شەنگە و لە بەگزادە دەچێت !! كە ( نزهەالزەمان) ئەمەی بیست ، كەوتە دڵە كوتە وتی :

هەندێ لەو شیعرانەم بۆ بخوێنێتەوە . باگوێم لێ بێت دواتر ناوی دەپرسم و دەزانم خەڵكی كوێ یە؟

خزمەتكار لە پەردەوە هاتەدەر و وتی :

هەندێ شیعر بڵێ .. خانمەكەم لەو دیو پەردەوە گوێی گرتووە..دواتر ناوی خۆت و وڵاتەكەت بڵێ .

( ضوءالمكان )یش وتی :

بە چاوان . بەڵام بەسەرهاتەكەم سەرەتاو كۆتایی نی یە ! تاكو باس بكرێت . خۆیشم وەكو سەرخۆش وام .. ئاگام لە خۆم نی یە ..تاكو بیگێڕمەوە ..!

شەهرەزاد هەستی كرد شەو درەنگ بوو . بێدەنگ بوو.

## شەوی ٧٥

بەسەرهاتی پێک شاد بوونەوەی ضوء المکان و نزهةالزمان

شەهرەزاد وتی :

کە ( نزهةالزمان ) ئەمەی بیست ، دایە پرمەی گریان و بەخزمەتکارەکەی وت :

لێی پرسە ئاخۆ .. لە دایك و باوکی خۆشەویستی دابڕاوە؟

خزمەتکار ئەوەی لێ پرسی و ئەویش لەوەڵامدا وتی :

بەڵێ ..! لەو خۆشەویستانە و بە تایبەتی خوشکەکەم دابڕاوم !

( نزهةالزمان ) بێ دەنگ بوو دواتر وتی :

خوا بکات ..پێك شاد ببنەوە..

کەوابوو چەند شیعرێك لە پەرۆشی و سۆزی کەس وکار و نشتمانەکەت بخوێنەوە .

ئەویش بەدەم هەناسە هەڵکێشانەوە .. بەم جۆرەی لاوانەوە :

دەڵێی( هیندۆس )ی پیاداچووە:دۆڵ      وا گرتوویەتی:بۆنی ( میسك ) و خۆڵ

سڵاو لە دڵدار، لەو رمز و باخەی      تێیدا:عاشقان خەمیان کردە کۆڵ

وەرە لە دڵی من پرسیار بکە ..      تا سۆزی دەرخات : بەبێ گرێ و گۆڵ

خوا هەوری رەشی بە چەخماخەوە      ناردەگیان :( نوزهەی زەمان)ی کڵۆڵ

( نزهةالزمان )ئەمەی بیست . خۆی پێ نەگیراو دامێنی پەردەکەی هەڵدایەوە! تاکو ئەو لاوە ببینێ و وردتر سەرنجی بدا .

ئەمجا هاواری کرد :

( ضوءالمکان )ی برام !! ئەوە تــۆی !!

کە ئەویش خوشکەکەی بینی . ناسی یەوەو هاواری کرد :

( نزهةالزمان )ی خوشکم ..!! خوشکە گیان .. باوانەکەم !!

هەردووکیان باوەشیان بە یەکدا کردو بە سەریەکدا بوورانەوە . کە خزمەتکارەکە ئەمەی بینی ، سەری سوورما..! چوو، جاجمێکی هێناو دای بەسەریاندا .

چاوەڕێی کردن.. تابە ئاگا هاتنەوە . جارێکی دی باوەشیان بە یەکدا کرد و سوپاسی خوایان کرد .

( نزهة الزمان ) .. ئەمەی هاتە سەر زمان :

زەمانە : باکی لە کوشتن نییە      هەر بۆیە حەقی لێبووردن نییە!!

کە برام پشت و یارمەتی دەر بێ      ترسم ، لە خۆم و لە مردن نییە

کە ( ضوءالمکان ) ئەمەی بیست .. خوشکەکەی بە سنگەوە گرت و ئەم شعرەی وت :

بۆ دڵی تەنگ و پەژارە یەکین      تۆ ورەت بەرزە و ئێمەش بێ چەکین

تۆ لە هەڕەشەی مێمڵ[٦] دەترسی      منیش یەکپارچە ، دەبمە گڕ وقین

لەدەرگای دەوارەکەدا سەعاتێك دانیشتن ئەمجا( نزهەالزمان ) وتی :

وەرە با.. بچینە ناو کەژاوەی دەوارەکەوە . چیت بە سەرهاتووە بۆم بگێڕەوە .. منیش بە سەرهاتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە .

( ضوءالمکان )یش وتی :

یەکەمجار تۆ بەسەرهاتی خۆت بگێڕەوە .

خوشکەکەی هەر لەو کاتەوە لە ( خان ـ ئوتێل )ەکەوە چووە دەرەوە و دواتر دەشتەکی فڕاندی . ئەمجا بازرگان لێی کڕی یەوە، دواتر بازرگانیش بردی بۆ لای ( شرکان )ی برای و پێی فرۆشتەوە ..! چۆن شرکان هەر کە کڕی یەوە.. ئازادی کرد . دواتر مارەی کرد . باوکی هەواڵەکەی بیستەوە . ناردی یە شوێنی و پێی وت :

سوپاس بۆ خوا.. بە یەکی شاد کردینەوە . چۆن پێکەوە لە ماڵ دەرچووین.. هەروایش پێکەوە دەگەڕێینەوە ماڵ . بۆ ئەوەی ئەم دەرگاوانە من بگەیەنێتە ماڵی باوکم : منی لێ مارە کرد ... ئەمە هەواڵی من ... ئەی بەسەرهاتی تۆ چۆن بووە؟

ئەویش بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە . کە چۆن نەخۆش کەوت و ( توونچی ) بردی یەوە ماڵی خۆی و پارەیەکی زۆری تێدا خەرج کرد . ئەمجا شوێنی کەوت تا ئێرە .

ئەمجا وتی :

خوشکێ .. ( توونچی ) کارێکی وای لەگەڵ کردووم .. برا لەگەڵ برای ناکات ! لەدەمی خۆی دەگرتەوە .. دەیدا بە من .. خۆی بە پێ دەڕۆیشت و منی بە سواری دەبرد .

( نزهەالزمان ) خزمەتکارەکەی بانگ کرد و پێی وت :

ها.. ئەوە مژدانەکەت .. چونکە لە سەر دەستی تۆدا بە براکەم گەیشتمەوە . توورەکە پارەکە ، هەمووی بۆ خۆت دە..بڕۆ ، ئاغات بانگ بکە .

ئەویش بە شادی یەوە ، ڕۆیشت و هێنای . کە چووە ژوورەکەی ( نزهەالزمان) سەیری کرد براکەی لایەتی ..! بەخێر هاتنی کرد و پرسیاری لێکرد . بەسەرهاتی خۆی بۆ ئەویش گێڕایەوە .

نزهەالزمان ڕووی لە دەرگاوان کرد و وتی :

ئەوەش بزانە..کەنیزەکەت مارە نەکردووە کچی (شا عمری کوڕی نعمان)ت مارە کردووە . ئەمەیش ( ضوءالمکان )ی برامە .

کە دەرگاوان ئەو دیمەنەی بینی . بیری یەکلایی بووەوە ، کە زاوای شا (عومەری کوڕی

---

(٦) ـ مێمڵ : دوژمن ڕەقیب

نوعمانه ) .

له دڵی خۆیدا وتی :

لەمەو دوا چـاوەڕێی ئـەوە دەبم پـاشا منیش بکاتە میری هەرێمێك لە وڵاتـــدا .

( ضوءالمکان)ی ماچ کرد و سوپاسی خوای کرد کە سەلامەت بووە و بە خوشکەکەی شاد بووەتەوە . فەرمانیشی دا.. کە دەوارێکی تایبەتیان بۆ هەڵبدەن و ئەسپێکی شایستەیشی پێشکەش بکەن .

خوشکەکەی هەڵیدایە :

نا..نا.. من حەز دەکەم ، لە دەواری خۆمدا بێت و با..تێر لە یەك بخۆین . دەزانی دەمێکە ئەم برایەی خۆم نەدیووە !؟ ئێستاش لە وڵاتی خۆمانەوە نزیکین .

دەرگاوان وتـــی :

فەرمان .... فەرمانی خۆتانە .

هەندێ شیرینی و(٣) بوخچە جلوبەرگی بۆ ( ضوءالمکان) ناردو بەرەو تەختەڕەوانەکە بووەوە .

خوشکەکەی پێی وت :

خزمەتکارەکە بانگ بکە ، بینێرە با..(توونچی)یەکە ، بهێنێت و ئەسپێکیشی بداتێ . با سفرەیشی بۆ برازێننەوە . پێیشی بڵێن : با لێمان دوور نەکەوێتەوە .

خزمەتکارەکە وتی : بە چاوان .

پاسەوانانی لە تەك خۆیدا برد و بە شوێنیدا گەڕان تاکو دۆزیانەوە . کە سەیر دەکەن : قامچی لە کەرەکەی ژێری دەدات . بۆ ئەوەی غار بکات و لەترساندا.. دوور بکەوێتەوە..!! بۆ دوور کەوتنەوەی لە ( ضوءالمکان )یش دەگریا .

لەبەرخۆیشیەوە دەیوت :

ئـای .. چـەندم ئامۆژگـاری کـرد !؟ هـەر بـە قـسەی نـەکردم ؟ ئـاخۆ.. ئێـستا چـی بەسەرهاتبێت ؟

لە پڕ پاسەوانان چوار دەوریان گرت...!

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٧٦**

شەهرەزاد وتی :

کە توونچی..خزمەتکارەی بینی و ئەو هەموو شمشێر بەدەستە چوار دەوریان گرتووە . ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و وتی :

دیاره .. به چاکەکانی زانیوم . بۆیه منیشی کردۆته هاوبەشی تاوانەکەی..!!)
خزمەتکارێك ، شیراندی به سەریدا :
کێ بوو ، بەو شیعرانه..دەیلاوانـدەوه ..درۆزن !؟ چۆن وێـرات بڵێی: مـن ئاگام لەو شیعرانه نی یه و هاورێکەشم بوو ، دەیخوێندەوه!؟ لەبەر ئەوه..تاکو شاری بەغداد دەبێت لەگەڵمان بیت . چیمان له هاورێکەت کرد.. وایش لەتۆ دەکرێت!!
که توونچی ئەمەی بیست ترسەکەی زۆرتر بوو .
هاواری کرد : ئەمه.. ئەو رۆژمیه که لێی دەترسام..!
لەبەر خۆیەوه ئەم شیعرەی وت :
خۆم به خۆمم کرد تیر بارانم کەن ویڵ و ئاوارەی ناو شارانم کەن(٧)
خزمەتکار به پاسەوانانی وت :
لەسەرپشتی کەرەکەی بهێنه خوارەوه ! له ژێرەوەش رایسپاردن ، که نابێت موویەك لەسەری بێتەوه..! دەبێت رێزی بگرن .
توونچی ئەو هەموو خەڵکەی بەدەوری خۆیەوه بینی رووی کرده خزمەتکاره و وتی :
ئەی سەرۆك .. نه مـن بـرای ئـەوم و نـه خزمیـشمه!! مـن کابرایـەکی توونچیم . کاتی خۆی ئەوم له سەرسەلوێنك و به نەخۆشی دۆزیوەتەوه .
لەگـەڵ خۆیـان بردیـان و ئـەویش هـەزاران جـۆر بـیری لـێ کـردەوه! لـەو لایـشەوه هـەر خزمـەتکار بوو : جار و بار پێیان دەوت :
ئەوه رۆحی خۆت لێ زیاد بوو.. ئاوا بـه شیعر خوێندنـەوه ، خـۆت و ئـەو لاوەت تووش کرد!؟
به دزیشەوه پێی پێ دەکەنین . هەر که گەیشتەلای دەوارەکه .. سفرەیان بۆ رازانـدەوه و خواردنیان بۆ دانا . خزمەتکار و توونچی پێکەوه نانیـان خـوارد . سـەرۆك داوای شـەربەتی کـرد . دوای خۆیـشی دەرخـواردی توونـچیی دا . بـەڵام ئەمانـه ترسـی (توونـچی )یـان نەرەوانـدەوه . سـەرۆك پاسـەوانان پـێ یـەکی لای (ضـوءالمکان) بـوو، پـێ یەکـەی تـری لای (توونـچی) بـوو. خوشـك و بـرایش ، دەردە دڵیـان بـۆ یـەك دەکـرد . کـاروان بـه رێـوە بـوو . نزیکەی سێ رۆژیان مـابوو بگەنـه وڵاتـی خۆیـان . ئێـواره دەرگـاوان کاروانی وەستان تـاکو کەمێك بحەوێنەوه . رۆژ بووەوه، کەوتنەوه بارکردن و خۆ پێچانەوه .
ئەمان لەمەدابوون سەیریان کرد تەپ و تۆز بڵند بووەوه و دنیا تاریك بوو . دەرگاوان که سەرقافڵەچی بوو .. بانگی کرد : بار مەکەن و بووەستن !!
خۆی و پیاوانی سوار بوون و کەوتنه غاردان ، بەره و تەپ و تۆزەکه . که نزیك بووەوه سەری سوورما ! سوپایەکی فره ! ئـاڵاو بەیداخ و کەرەنا لێدان ! که سوپـاکه ئەمانیان بینی

---

(١)ـ فۆلکلۆری کوردی یــــه ........................................ وەرگێڕی کوردی

(٥٠٠) شمشێر بەدەست هاتن و چوار دەوری ئەمانیان دا..! بە شێوەیەك هەر سوارێكی ، دەرگاوان (٥ ) سوارەی ئەو سوپایەی بە دەورەوە بوو .
دەرگاوان پرسیی : هەواڵ چی یە؟ ئەمانە..لە كوێوە هاتوون؟
ئەوانیش لێیان پرسی : تۆ كێیت؟ لە كوێوە هاتوویت؟ بۆ كوێ دەچیت؟
ئەویش وتی :
من خەزنەداری شا( شركان )ی كوڕی شا (عومەری نعمان )م . (داهات )ی ساڵانەی شاری (دیمەشق )م پێ یە و دەیگەیەنمە بەغدا.
شەهرەزاد هەستی كرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٧٧**

بەسەرهاتی (دندان)ی وەزیر و مردنی شا عومەر
شەهرەزاد وتی :
كە ئەمەیان بیست.. بە دەستەسڕ دەم و چاویان داپۆشی و بەگریانەوە وتیان :
شا(عومەری كوڕی نعمان) ژەهرخواردوو كراو مرد! تۆیش فەرموو بێخەم بەو بچۆ بۆ لای دندانی سەرۆك وەزیران ...
خەزنەدار زۆر گریاو وتـــی :
ڕەنج بە خەسار خۆمان.. بۆ ئەم سەفەرەی كردمان .
بە دەم گریانەوە تێكەڵی سوپا گەورەكە بوون . فەرمانیان لە سەرۆك وەزیران وەرگرت بۆ بار خستن و دەوار هەڵدان و حەوانەوە . دەوارێكیان بۆ ( وەزیر) هەڵدا . ئەویش (سەكۆ)یەكی لە ناوەڕاستیدا ڕازاندەوە . لەسەر ( سەكۆ )كە دانیشت و هەواڵەكەیان پێدا . جارێكی دی بە بیستنی ناوی شا (عومەری نعمان) دەستی كردەوە بە گریان . دانیشتوانیش لە سەر جێ نشینی تەختی پاشایەتی ڕێك نەدەكەوتن و شەڕی ناوخۆ لە گەشەدا بوو . ئەوەی بووە هۆی بێدەنگ بوونەوەی ڕەمەكی خەڵكەكە وتاری ( ٤) قازی یەكە بوو .
دانیشتوانی وڵات و چوار قازی و پیاوماقوڵان ، لەسەرئەوە ڕێك كەوتبوون كە خۆیان بگەیەننە (شركان) و بی هێننەوە شاری (بەغداد) تاكو ببێتە جێ نشینی باوكی .
هەندێكیان داوای كوڕەكەی تریان دەكرد . كە ( ضوءالمكان ) بوو ، بەڵام كەس هەواڵیانی نەدەزانی . خەزنەدار ئەمەی بیست بڕوای بە چیرۆكی ژنەكەی كرد . ئەویش خەفەتێكی گەورە دایگرت . لە لایەكی ترەوە دڵی بەوە خۆش بو كە ( ضوءالمكان )یان لەگەڵە و دەبێتە پاشای بەغدا .
خەزنەدار رووی كردە (دندان) و وتی :

بەسەرهاتی ئێوە فرە سەیرو سەرسوڕهێنەرە!! بەڵام خوا ماندوو بوونی ئەو سەفەرەی لەسەر شان سووك كردن . چونكە( ضوء‌المكان) و( نزهه‌الزمان ) لەگەڵ كاروانەكەی ئێمەن !
كە دندانی سەرۆك وەزیر ئەمەی بیست زۆر دڵی خۆش بوو..
رووی كردە (خەزێنەدار) و وتی :
چیرۆكی ئەو دووانەم بۆ بگێڕەوە ، كە ئاوا لێمان دابڕان!
ئەویش چیرۆكی ( نزهه‌الزمان )ی بۆ گێڕایەوە و تێی گەیاند كە ئێستا ژنیەتی ! هەر لە نووكەوە ، تا كۆتایی بەسەرهاتی ( ضوء‌المكان )یشی بۆ گێڕایەوە . سەرۆك وەزیران ناردی یە شوێنی وەزیرانی شاری بەغداد و كۆبوونەوەی پێ كردن .
بەسەرهاتی ( ضوء‌المكان ) و خوشكەكەی بۆ گێڕانەوە..! ئەوانیش زۆر خوشحال بوون بە گەڕانەوەی و سەریان لە قەزا و قەدەری خوا سووڕما..! خەزنەداریان بە خێر هێنا .
سەرۆك وەزیران و خەزنەدار لە دیوەخان كۆڕیان بەست .. میران و پیاوماقوڵان و ناسراوانی دەوڵەت ئامادە بووبوون . گوڵاویان بەسەردا پرژێنراو كەوتنە لێكۆڵینەوە و بیرورا گۆڕینەوە . سەربازان ..بە ئاڵای جەنگەوە لە ریزی رێك و پێكدا وەستابوون .
دواتركۆڕەكە كۆتابوو سوپاكە بەرەو سەربازگەكەیان بوونەوە .
*شەهرەزاد هەستی كرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

**شەوی ٧٨**

## بەسەرهاتی دەسەڵات وەرگرتنی ضوء المكان

شەهرەزاد وتی :
خەزنەدار چووە لای دندانی گەورە وەزیر و پێی وت :
وام پێ باشە .. لە پێش ئێوەوە بچمە لای و جێگای سوڵتان ئامادە بكەم و تێی بگەیەنم ، كە تۆیان لە جیاتی شركان هەڵبژاردووە . بۆ جێ نشینی خەلیفایەتی .
دندانیش وتی :
قسەكەت لە جێی خۆیەتی .
خەزنەدار هەستاو دندانی گەورە وەزیر لەبەری هەستا . وەزیرەكان بەدوایدا . دندان فەرمووی لێ كردن و پێشیان كەوت . تاكو ئەمانیش دوا بە دوای ئەو بڕۆن .
دندان وتی :
قسەی باشمان لای سوڵتان بۆ بكە . بەڵكو پلەو پایەمان نەهێنێتە خوارەوەو لامان نەبات .
ئەویش فەرمانیدا..كە دەواری لە كەناری شاری بەغداد بۆ هەڵبدەن . خۆیشی یەكەم كەس بوو سوار بوو بۆ سەفەر كردن .

رۆژە رێ یەکی مابوو بگەنە بەغداد . ئەمجا فەرمان درا بە لادان و دەوار لێدان و چاك کردنی شوێنی سوڵتان ( ضوءالمکان )کوڕی شا( عومەری کوڕی نوعمان ) .
ئەمجا بە خزمەتکارانی بەر دەواری نزهەالزمان و ( ضوءالمکان )ی برای وت :
بە خاتوون بڵێن کە خەزنەدار ، دەیەوێت بێتە ژوورەوە .
لە ژوورەوەیش ، تێی گەیاندن کە باوکیان مردووە .
وەزیران و سەرکردەیانی سوپا و پیاوماقوڵانی شار ( ضوءالمکان )یان بە جێ نشینی خەلیفە ، هەڵبژاردووە .
ئەوانیش بۆ باوکیان زۆر گریان . کە پرسی یان ئاخۆ .. باوکیان مردووە یان کوشتوویانە!؟
خەزنەدار لەوەڵامدا وتی :
وەڵامی ئەو پرسیارە لای دندانی گەورە وەزیرە .. سبەینێ ئەوان دێن و تۆ هێنەدت لە سەرە ، فەرمانەکەی ئەوان جێ بەجێ بکەیت . چونکە ئەوانە هەموویان لەسەر، بە سوڵتان کردنی تۆ رێك کەوتوون . گەر بە قسەیان نەکەیت ، کەسێکی دی هەڵدەبژێرن و تۆیش بێخەم نابیت . لەو کەسەی تر، کە دەبێتە سوڵتان . رەنگە ئاژاوەیەکتان بۆ بنێتەوە و تیا بچێت و خەلافەتتان لە دەست دەربێنن .
ماوەیەکی زۆر ضوءالمکان سەری داخست و بۆی دەرکەوت کە قسەکانی خەزنەدار دروستن وتی :
باشە .. پەسەندی دەکەم .
لە (خەزنەدار)ی پرسی :
مامە ... ئەی لەگەڵ شرکان چی بکەم باشە !؟
(خەزنەدار) وتی :
کوڕم .. تۆ سوڵتانی بەغداد دەبیت ..( شرکان )یش سوڵتانی (دیمشق)ە . بڕوات بە خۆت هەبێت . ضوءالمکان قسەکانی ئەوی بە دڵ بوو. شمشێری شاهانەی لە خۆی بەست . ئەسپی زین کراوی بۆ رەخساند و کەوتە رێ و دەست و پێوەندانی بە دواوە. تا گەیشتە شوێنی بۆ دیاری کراوی خۆی و (خەزنەدار) لە پەزێراییدا وەستا . پیاوانی بە شمشێری رووتەوە لە دەرگای دەواردا وەستان . سەرکردە سەربازیەکان داوای چوونە ژوورەوەیان کرد . بۆ پیرۆزبایی سوڵتان .
چووالمکان یش رێگەی دان هەر جارەو(١٠) سەرکردە بێتە ژوورەوە .کە یەکەمین کۆمەڵی (١٠) کەس چوونە ژوور ، هەیبەتی سوڵتانیان بینی دەستەو نەزەر بوون . ئەویش بە روویەکی خۆشەوە .. پێشوازی کردن و پەیمانی چاکی پێدان .

کۆمەڵێکی (١٠) کەسی تر چوونە ژوور . بە هەمان شێوە بەڕێی کردن . تەنیا ( دندان ) مابوو بچێتە ژوور.

چووالمکان لەبەری هەستاو پێشوازی تایبەتی کرد و وتی :

سەرچاوانم.. بابە گەورە تۆ راوێژکاری منی بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانم . ئەمجا فەرمانیدا لە میوانخانەی سەرا سفرە و خوان رازایەوەو میوانەکان دەستیان بەخواردن کرد .

ضوءالمکان بە دندانی گەورە وەزیری وت :

فەرمان بدە بە سوپا بــا بــۆ مــاوەی (١٠) رۆژ لێــرە بمێننــەوە . بۆ ئــەوەی بەسەرهات و چۆنیەتی کوشتنی باوکمم بۆ بگێڕنەوە .

ئەویش مۆڵەتیدا، بە سوپاو بڵاوەیان لێ کرد . فەرمانیشی دا..تاکو سێ رۆژ پێشوازی لە کەس ناکات . هەمووان نزای خێریان بۆ سوڵتان کرد .

شەو چووە لای خوشکی و پرسیی :

ئاخۆ..... دەتەوێت بزانیت باوکمان چۆن کوژراوە ، یان ..نا؟

ئەویش وتی : نازانم چۆن بووە؟

پەردەیان لێدا لە نێوان نزهەلزمان و براکەی و دندانی گەورە وەزیـردا . فەرمانیـدا بە دندانیش تاکو بەسەرهاتەکەیان بۆ بگێڕێتەوە .

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.*

**شەوی ٧٩**

*شەهرەزاد* وتی :

دندانی گەورە وەزیر وتی :

پاشا گیان .. کە باوکت لە راو و شکار گەڕایەوە . پرسیاری ئێوەی کرد، دیار نەبوون . یەکسەر تێگەیشت کە چوون بۆ حەج . خەمێکی زۆری بۆ خـواردن و زۆریـش تـووڕە بوو . (٦) مانگی رەبەق ، هەواڵی ئێوەی دەپرسی .

دوای سـاڵێك رۆژێکیـان لای دانیـشت بـووین . پیرەژنێکی لـەخواترس بـە خـۆی و (٥) کـەنیزەکی جـوان و قەشـەنگ و باڵابـەرز و شـۆخ و شـەنگەوە هـات . کـە دڵـێ سـەد دڵ حەیرانیان دەبوو . سەرەڕای جوانیان ، هەموویان شارەزایی زانستەکان و مێژووی پاشایان و ئەدیبان و پیاوە ناسراوەکان بوون . قورئان خوێن و شارەزای ( شەریعەت ) بوون .

پیرەژن داوای چوونە لای باوکتی کرد. هاتە ژوور وکڕنووشی بـۆ پاشا بـرد. منیش لە شانی پاشاوە دانیشت بووم . پیرەژن لە باوکت نزیك بووەوە و باوکیشت سەرنجیدا بینی ژنی خەڵوەت و خواپەرستی یە! لای خۆیەوە داینا .

پیرەژنە دەستی پێ کرد :

پاشا گیان (٥) کەنیزەکم بۆ هێناویت . لەپەزێراییت دان و تاقیان بکەوە .

ئەویش سەرنجیدان و پێی وتن :
هەر یەکەتان شتێکم لە مێژووی دێرین بۆ بگێڕێتەوە .
یەکێکیان هاتە پێشەوە و وتی :
پاشا.. ئەوە بزانە پێویستە مرۆڤ خۆهەڵقورتێن نەبێت و کردەوەکانی چاك بن . خۆ ..لە گوناهە گەورەکان بپارێزێت و فەرمانەکانی خوا ، جێ بەجێ بکات . بناغەی بە ئەدەبی هەر کەسێك خوو و رەوشت بێت . پێویستە مرۆڤ بۆ ئەوە بخوات تاکو بژێت .. نەکو بژێت تاکو بخوات ..! ( ژیان )یش بۆ پەرستنی خوا تەرخان بکات .. پێویستە رەوشتت باش بکەیت . لە ( قورئان ) و ( سونەت) لا نەدەیت . ترسناکترین کەس تینوو ترینیانە..بۆ تەگبیر. تینووترین کەس بۆ تەگبیر پاشایانە..!! چونکە رەمەکی خەڵکەکە بێ تەگبیر، بێ گوێدانە ئەنجامی کردەوەکانیان کار دەکەن . گوێ نادەنە ئەنجامی رەفتارەکانیان . لە پێناوی خوادا سامانی خۆت ببەخشە . بزانە کە دوژمنت ناسی . خۆتی لێ دەپارێزیت . رەوشت دەبێتە پێوەری هاوڕێ .. بەڵام پێویستە تاقی بکەیتەوە ئەمجا : بیکەیتە هاوڕێی خۆت . نەزان دەهێنێت تەنانەت دایك و باوکیشی لە دەستی را بکەن .
درۆزن ، هەرگیز نابێتە هاوڕێ . چونکە هاوڕێ یەتی لە راستگۆی یەوە هاتووە . بزانە ... گەر شوێن شەرع بکەویت : سوودی لێ دەبینیت .. گەر لەو کەسانەت کردە هاوڕێ ئەگەر مامەڵەی خراپیشت لەگەڵ بکەن : پشتیان تێ مەکە ! چونکە ئەوانە دڵیان وەکو شووشە وایە . کە دڵیان شکا بە ئاسانی چاك نابێتەوە ..! رەحمەت لەوەی ئەم شیعرەی وتووە :

دڵی کەس مە یەشێنە    شکا چاك نابێتەوە
وەکو شووشەیەك بشکێ    ئیدی یەك ناگرێتەوە

ژیـــران .. وتویانە :
هاوڕێ ئەو کەسەیە دەتگرێنێت ! باشترین کاریش ئەوەیە جوانترین بەرهەمی ببێت . باشترین پیاهەڵدانیش : ئەوانەن کە لەزاری کەڵە پیاوانەوە دادوەرن ..
وتـــراوە .. نابێت بەندە سوپاسگوزاری خـــوای خۆی نەبێت . بە تایبەتی بۆ ئەو دوو نیعمەتەی لەش ساغی و ژیری یە ..
وتـــراوە .. کەسێك کەسێتی خۆی مەبەست بوو.. دەبێت چاو نە پۆشێت لە زێدەڕەویی حەزەکانی .
گەر کەسێك کێشە بچووکەکان گەورە بکات . خوایش کێشەی گەورەی بۆ دروست دەکات . هەر کەس شوێن ئارەزووەکانی خۆی بکەوێت ..ئەوا مافەکانی دەدۆڕێنێت..! گوێیش لە قسەی هەڵبەستراو بگریت ئەوا هـــاوڕێکانت دەدۆڕێنیت..! هەر کەسێك زوو هـــەڵچوو .. رق ئەستوور بوو گوناهبارە..! ( ئەوی ترسا... نەخەلەسا..!!)[8]

---

(٨) ـ پەندێکی باوی کوردانە .

وەرگێڕی کوردی

ئێستا هەندێك لە ڕێ و ڕەسمی قازی یانت بۆ باس دەکەم . نابێت حوکم بە سەر کەسێکدا بدرێت بە بێ بەڵگەی پێویست . بۆئەوەی (زۆردار) تەماعی ( زۆرداری) زۆرتر نەکات .. هەژارانیش دەست نەشۆن لە دادی کۆمەڵایەتی .. پێویستە بە یەك چاو سەیریان بکرێت . (ناشتەوایی) دروستە لە نێو موسڵمانانندا بە مەرجێك (حەرام ) ( حەڵاڵ ) نەکرێت و (حەڵاڵ )یش (حەرام ) نەکرێت .

گەر گومانت لە شتێك بوو ژیرانە بیری لێ بکەوە . تاکوّ.. بگەڕێیتەوە ، سەر ڕاستەڕێ. ڕاستی دروستە .. گەڕانەوە بۆ ڕاستی یەکان چاکترە لە سەرومڕ بوون لەسەر کارە ناڕەواکان .

ناسراوترین پەند و ئامۆژگاری ئەوەیە کە لایەنی ڕاستی وەلاوە نەنرێت . لە کاتی بە دۆست کردنەوەی دوژمنەکاندا، کێشەکانت بدە دەست خوا . با بۆچوونەکان بە بەڵگەوە بن . گەر بەڵگەت دەست نەکەوت سوێندیان بدە چونکە ئەمە فەرمانی خوایە . با شایەت هەبێت لە کاتی بڕیاردانی هەردوو لای خاوەن کێشە .. دەبێت : قازی و دادوەر لە کاتی بوونی ئازار و نەخۆشیدا فەرمانڕەوایی نەکەن . دەبێت نیەتت لە نێوان خۆت و بەرامبەردا، پاك بکەیتەوە .خوا ئاگاداری دەروونی مرۆڤەکانە .

( زوهری ) وتویەتی :

*سێ ڕەوشت کە لە قازی و دادوەردا بوو : پێویستە دەست لە کار بکێشێنەوە . کاتێك : کە ڕێزییان لە تاوانبار گرت . یان خۆشییان لە پێداوتن هات . یان لە سەندنەوەی پلە وپایەیان ترسان .*

عومەری کوڕی عبدالعزیز قازی یەکی لەکار خست .

کە قازی یەکە پرسیی : لەبەرچی ؟

پێ ی وت :

بۆیان گێڕاوەمەتەوە، کە قسەکانت لە پلە و پایەت گەورەترن .

دەڵێــن .. ئەسکەندەر بە قازی یەکی خۆی وتووە :

ئەو پلە و پایەیەکم بە تۆ داوە کە ( ڕەوان) و ( شەرەف ) و( ویژدان )ی منی تیایە : بیان پارێزە . بە چێشت لێنەرەکەی خۆیشی وتووە :

تۆ لەشی منت داگیر کرد . لەبەر ئەوە بەزەییت بە خۆتدا بێتەوە .

بە نووسەرەکەی دیوەخانی خۆیش وتووە :

تۆ..کار بە ژیریی من دەکەیت .. بیپارێزە .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٨٠**

شەهرزاد وتی :

ئـــەی شا شەهرەیار .. سەنگیـــــن و سەلار ...

دندانی سەرۆك وەزیران لە سەر گێرانەوەی بە سەرهاتە رۆیشت وتـــی :

کەنیزەکی یەکەم شوێنەکەی خۆی جێ هێشت و کەنیزەکی دووەم هاتە شوێنی.( ٧ )

جاران کڕنووشی بۆ باوکت بردو دەستی پێ کرد :

( لوقمان ) بە کوڕەکەی وت :

سێ کەس هەن ..لە سێ شوێنی خۆیاندا نەبێت ، ناناسرێن . کەسی ئارام لەکاتی تووڕەییدا . ئازاش لە نێو شەڕدا . برایش لە کاتی پێویست بوونتدا پێی .

وتـــــراوە ...

زاڵمان پەشیمانن ! با خەڵکیش هەر پێیاندا هەڵبلێن ! زوڵم لێکراوان دروستن ، با هەموو خەڵکیش لێیان بخوێنن .

خوا فەرموویەتی :

*وا مەزانن .. هەموو کردەوەکانتـان چاکە و خۆتـان کردووتانـە ! خـوا .. پشتی پێ دەبەستێ !! سزای کاری خراپتان دەدرێت .*

پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی :

کارەکان لەسەر نییەت دامەزراون . هەرکەسە ..خۆی ونیازی خۆی ..

دیسان فەرمویەتی (د.خ) :

لە لەشدا پارووپەك هەیە ، گەر چاك بوو، هەموو لەشت چاك دەبێت . گەر پاروەکە خراپ بـوو... هـەموو جەسـتەت خـراپ دەبێـت . ئـەو پـارووەیش دڵ سەرچـاوەیەتی . سەرسوڕهێنەرترین بەشی لەش (دڵ )ە .

کە دڵ هەڵچوو و هەڵپەی تەماعی کرد جەستە دەمرێت !! ئەگەر هەستی بە پەرۆشی کرد.. ئاخ و داخ دەیکوژێت . گەر تووڕە بـوون و هەڵچوونی زۆر بـوو. زوو خـراپ دەبێـت ! ئەگەر سامانێکی فرەیشی بوو لە فەرمایشتەکانی خوا دەردەچێت . گەر تووشی نەبوونی بوو : پەژارە دەیکوژێت . ( هیچ شتێك بە هێندەی خوا پەرستی بۆ دڵ ودەروون باش نی یە .)

قەیس وتوویەتی :

| | |
|---|---|
| کەسێکم ناوێ کە سادە نەبێ | خەڵك لادەر بێ و خۆی لە جادە بێ |
| سامان و رەوشت کینە دەهێنن | خۆ..خواردنەوەش بە فەسادە بێ |
| کاری ژێر بە ژێر زۆر نادروستە | راست رەو بە دوایی دڵت شادە بێ |

ئەمجا کەنیزەکەکە وتی :

( هشامی کوڕی بەشەر) وتوویەتی :

به (عومەری کوڕی عوبید)م وت ( خۆ گرتنەوە ـ زوهد ) چی یە؟

ئەویش وتی :

پێغەمبەر (د.خ ) بەم شێوەیە باسی کردووە : ( خۆگرەوە ـ زاهد) ئەو کەسەیە بەڵاکانی خوای بیر نەچێتەوە . ئەوەی بۆی دەمێنێتەوە ، پێی باشتر نەبێت .. لەوەی بۆ دوارۆژی دەمێنێتەوە..! ئەوی ( رۆژی دوایی ) بە هەند وەرنەگرێت .. دەبێت خۆی بە مردووان بچوێنێت !

دەڵێن .. ( ئەبازەر ) وتوویەتی :

( هەژاری )م ، لە دروست بوونی جەستە پێ باشترە !

هەندێ لە گوێگرانی لێیان پرسیوە :

رەحمەتی خوات لێ بێت ئەمە چ قسەیەکە !؟

ئەویش لە وەڵامدا وتوویەتی :

من دەڵێم هەرکەس پەنای بۆ بەشی خوا برد ، ئەوا بەو بەشە رازی یە .

بڕواداران وتوویانە :

بەیانیەکیان پێش نوێژیی بۆ کردین لە نوێژەکەدا دوای (بسم اللهالرحمن الرحيم )..( يا ايهاالمدثر )ی خوێند تا گەیشتە ( فاذا نقر في الناقور) . لێرەدا کەوت و گیانی دەرچوو .

دەڵێن ( پابت البنانی ) هێندە گریابوو . خەریك بوو چاوانی لە دەست بدات . یەکێکیان هێنا کە چارەسەری بکات . ئەویش پێی وتبوو چارەسەری دەکەم ، بە مەرجێ ئامۆژگاریەکانم پەیڕەو بکات .

( پابت )پرسی بووی : ئامۆژگاریەکەت چی یە؟

ئەویش وتبووی :

دەبێت ئیدی نەگریت ..!

( پابت )یش پرسی بووی :

جا... چاو بۆ گریان نەبێت ، بۆچی باشە..!!؟

پیاوێك بە (موحەمەدی عەبدوڵلە)ی وتبوو : ئامۆژگاریم بکە .

ئەویش پێ ی وتبوو :

ئامۆژگاریم ئەوەیە کە لەم دنیا ساماندارێکی خۆگرەوە بیت ! بەڵام لەو دنیا کۆیلەیەکی بە تەماعی خوا بیت .

ئەویش پرسی بووی : بۆ ئەو کارە چی بکەم باشە!؟

موحەمەدی عەبدوالله پێی وتبوو :

( خۆگرەوە ـ زاهد ) بە . هەردوو دنیا بۆ خۆت .. دەستەبەر بکە .

( غوپی کوڕی عەبدوالله) وتویەتی :

لە نێو ( بەنو ئیسرائیل )یەکان دا . دووبرا هەبوون و یەکێکیان لەوی تری پرسی بووە : ترسناکترین کردەوە چی بووە کە کردبێتت ؟

ئەویش وتوویەتی :

بە لای ( کولانە )یەکدا تێ پەڕیم .. جووچکێکم لێ دەرهێنا کە بیبەم بۆ خۆم .. دواتر هەڵم دایەوە ناو جووچکەکانی ( کولانە )کە و ئەم وێرا بێ دزم .

دیسان پرسی یەوە :

ئەی ترسناک ترین کاری تۆ..؟

ئەویش لە وەڵامدا وتبووی :

کاری مەترسیداری من تەنیا ئەوەیە خەمی ئەوەمە کە هەڵدەستم بۆ نوێژکردن ( ئەوە نیەتم بێت ، کە پاداشت بدرێمەوە..!) .

باوکیان گوێی لە ئاخاوتناکەیان بوو و نزای کرد بوو و وتبووی :

خوایە ئەگەرئەم (٢)کوڕەم بەراستیپانە . زوو گیانیان بکێشە تاکو تووشی هەڵە و گوناح نەبن .

ژیران کە ئەمەیان بیستووە .. وتوویانە : ئەو دووانە ، باشترین منداڵ بوون .

( عەبدکوڕی جوبێر) وتویەتی :

بوومە هاوڕێی ( فضالە ی کوڕی عوبێد) وپێم وت : ئامۆژگاریەکم بکە ..

ئەویش وتی :

خۆت لە (٢) سیفەت بپارێزە . هاوتا دروست کردن بۆ خواو ئەوی تریان ئازاری کەس مەدە .

ئەمجا ئەم شیعرەی وت :

| | |
|---|---|
| تۆ هەر چۆنێك بیت ئەو پەسندەیە | لە خوا بێخەم بە : کە بەخشندەیە |
| نە هاوتا بۆخوا، نە کوفر بکە | خوا چەندی پێ دایت هەر ئەوەندەیە |

چەند جوان وتراوە :

| | |
|---|---|
| گەر توێشووی ( زوهد )ت لەم دنیا نەبوو | لەو دنیا خەڵکی پێ دەوڵەمەند بوون |
| لۆمەی خۆت دەکەیت، وەك وانت نەکرد | ئەنجامیش ئاوا ، وا زەرەرمەند بوون |

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

### شەوی ٨١

شەهرەزاد وتی :

کەنیزەکی سێ یەم هاتە پێش و وتی :

دەربارەی ( خۆگرتنەوە ــ زوهد ) بەسەرهات زۆرە . هەندێك لەوانەی بیرم ماون

دەگێڕمەوە ...
هەندێ لە خواناسان وتوویانە :
باوەش بۆ مردن دەگرمەوە . با بێوەییشی تیا مسۆگەر نەبێت . ئەوەندەش دەزانم مردن مرۆڤ لە کار دەخات . بۆیە تکا دەکەم کاری چاکتان با فرە بێت و لە کاری خراپ کەم بکەنەوە .
کە (عەتای سەلما) لە خوێندنەوەی وەسیەتنامەکە بووەوە راست بووەوە و زۆر بە کوڵ گریا . کە لێیان پرسی بۆچی دەگریت؟
ئەویش لە وەڵامدا وتی :
لەبەردەمی خوادا راست بوومەوە و بەرەو کارێکی ( مەزن ) دەچم .
( عەلی کوڕی زین العابدین کوڕی حسین) کە هەڵ دەستا بۆ نوێژ کردن ، لەترسی خودا گیانی دەلەرزی و کە هۆی ئەو لەرزینەیان لێ پرسی ؟
ئەویش پرسیی :
بۆچی نازانن بۆ لای کێ هەڵدەستم و روو لە کێ دەکەم !؟
دەڵێن : سفیان الپوری وتویەتی :
تەنانەت سەیری رووی زاڵم کردنیش : گوناهە..!
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

## شەوی ٨٢

شەهرەزاد وتی :
کەنیزەکی سێ یەم هاتەوە جێی خۆی و کەنیزەکی چوارەم چووە پێشەوەو وتی :
ئێستا منیش هەندێك لە هەواڵی پیاو چاکانتان بۆ دەگێڕمەوە :
زانایان وتویانە :
کارە چاکەکان : کارە خراپەکان دەسڕنەوە .
( ئیبراهیم ) وتویەتی :
لە( بەشەری حافی) پاڕامەوە کە نهێنی هەندێك لە راستی یەکانم پێ پیشان بدات .
ئەویش لە وەڵامدا وتوویەتی :
کوڕی خۆم .. ئەو زانستەی داوای دەکەیت . نابێت هەمووکەسێك بیزانێت ! تەنیا ٥٪ ی خەڵکەکە دەبێت بیزانێت . چونکە وەکو زەکاتی درهەم وایە .
( ئیبراهیم کوڕی ئەدهەم ) وتی :
قسەکەیم زۆرلا شیرین و جوان بوو. لە کاتێکدا نوێژم دەکرد (بەشەر)یش نوێژی دەکرد . ئیدی تا بانگی دا منیش لە دوایەوە نوێژم کرد .

پیاوێکی شرۆڵە هەستا و وتی :

خەڵکینە .. خۆتان لە راستیی زیانبەخش بپارێزن . گرنگ نی یە ئەگەر درۆی بە سوودیش بکەن .

ناچاریی دەستتت دەبەستێتەوە . لەخۆڕا هەندێك لە قسەکان پووچ دەبنەوە .

دەڵێن خوشکی ( بەشەری حافی ) دەچێتە لای ( احمد کوری حەنبل) و پێی دەڵێت :

ئەی پێشەوای ئایین .. ئێمە کۆمەڵێکین شەوانە خوری دەڕێسین و رۆژیش پارەکەی خەرج دەکەین و پێی دەژین . بە تایبەتی ئەو شەوانەی پیاوانی چرا بە دەستی دەوڵەتی ( بەغداد)یش بە لای ماڵەکانماندا تێ دەپەڕن . ئێمەش لە سەربانەکانمان و لەبەر رووناکی چراکانی ئەوان خوریەکان دەڕێسین . ئاخۆ.. ئەم کارە حەرامە یان حەڵاڵ ؟

ئەویش پێی دەڵێت : تۆ کێیت ؟

ژنەش دەڵێت :

من خوشکی ( بەشەری حافی)م .

ئەمجا پێی دەڵێت :

ئەی .. خزمانی ( بەشەر) من ئێستاش (خۆگرتنەوە) لە گوناح ..لە ئێوەوە فێر دەبم!!

هەندێك لە ( ژیران ) وتویانە :

گەر خوا ویستی خێر بەکەسێك بکات.. دەرگای کارکردنی بۆ دەخاتە سەر پشت . (مالکی کوری دینار) هەر جارێك بە بازاڕدا بگەڕایە و حەزی لە شتێك بوایە .

بە خۆی دەوت : *ئەی .. نەفس ئارام بە .. بە قسەت ناکەم .*

هەر ئەو وتوویەتی :

بێوەی بوونی ( نەفس ) لە سەرپێچی کردنیایەتی.. تووش بوونیش .. بە شوێن کەوتنێتی .

( مەنسوری کوری عەمار) وتوویەتی :

حەجێکم کردووە ، چوومە کوفە و شەو شەوێکی تاریك بوو. گوێم لە هاوارێك بوو دەیوت :

خوایە .. بەگەورەیی خۆت ئەو (ملهوڕ)یەم ، بە مەبەستی سەرپێچی کردنی تۆ نەبووەو بێ ئاگا نیم لێت . لە چارەم نووسرابوو.. خوایە ، لە زێدەڕۆییم خۆش ببە . بێ ئاگایانە لە فەرمایشتەکانت دەرچوو بووم .

کە لە نزاکە بووەوە ئەم ئایەتەی وت :

( یا ایهاالزین امنوا قو انفسکم و اهلیکم نارا وقودها الناس والحجاره) . گوێم لە تەپەی کەوتنی کەسێك بوو . من رۆیشتم بە رێی خۆمەوە.. بۆ رۆژی دواتر چوومە دەرەوە . مردوویەکم بینی . پیرەژنێك بە دوایەوە بوو. کە پرسیارم کرد..

پیرەژنە وتی :

ئەم مردووە پیاوێکە ... دوێنێ کوڕەکەم لە سەر بەرماڵ بوو . کە ئەو بە بەر دەرگاماندا ڕۆیشت . ئایەتێکی خوێندەوە لەو کاتەدا ئەم پیاوە زراوی تەقی و مرد .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٨٣**

شەهرەزاد وتی :

کەنیزەکی چوارەم هاتە دواوە و کەنیزەکی پێنجەم چووە شوێنی و وتی :

ئێستا ئەوەی لە بیرم ماوە بۆتان دەگێڕمەوە .

(موسلیمەی کوڕی دینار) لە پاك کردنەوەی ویژداندا..وتوویەتی :

گوناهی گەورە و بچوك دەسڕڕێتەوە : ئەگەر بەندە لە سەری سوور بوو . ئیدی دڵیشی دەکرێتەوە .

دیسان وتوویەتی :

هەر نیعمەتێك گەر بە هۆیەوە.. لە خوا نزیك نەبیتەوە : دەبێتە (بەڵا) بۆت . نیعمەتێکی کەمی دنیا لە نیعمەتێکی فرەی ئەو دنیات بێ بەش دەکات ..!

لە (ئەبوحازم )یان پرسی : بێخەم ترین کەس کێ یە!؟

ئەویش وتی :

کەسێکە کە تەمەنی لە خوا پەرستیدا بەسەر بردبێت .

ئەمجا پرسییان :

ئەی هێژترین کەس کێ یە؟

ئەویش وتبووی :

ئەو کەسەیە .. کە ئەو دنیای بەم دنیا..گۆڕی بێتەوە .

دەگێڕنــــەوە.. حەزرەتی (موسا) سڵاوی خوای لێ بێت کە گەیشتە ڕووباری شار دووکچە شوان

هاتن . ئەویش ئاژەڵەکانی بۆ ئاودان . ئەوە بووکە گەڕانەوە بۆ ( شوعەیبی ) باوکیان گێڕایەوە .

باوکیشیان پێی وتن :

ڕەنگە ئەوەی ئاژەڵەکانی بۆ ئاو داون برسی بووبێت . کچێکیانی نارده لای تاکو بانگی بکاتەوە .

کە کچە گەیشتە لای ڕووی داپۆشی و وتی :

باوکم ناردوومی بە شوێن تۆدا تاکو بت بینێ و پاداشتت بداتەوە .

( موسا ) ئەمەی بە باش نەزانی و ویستی نەچێت و پێی وت :

تۆ دوای من بکەوە لە رۆیشتندا کچە شوێنی کەوت ، تا گەیشتنە لای "شوعەیب".

سڵاوی خوای لێ بێت . نانی ئێوارە ئامادە کرابوو.

شوعەیب بە موسای وت :

ئەی موسا دەمەوێت کرێی ئاودانی ئاژەڵەکانت بدەمێ .

موسایش وتی :

ئێمە ( اهل البیت)ین . کارێك بۆ پاداشتی ئەو دنیامان کرد بێت ، نایگۆڕینەوە، بە هەموو گەنجینەی سەر زەوی ئەم دنیایە .

( شوعەیب)یش وتی :

ئەی لاو تۆ میوانی منیت . رێزنان لە میوان پیشەمانە ..! باو و باپیرانم میوانیان تێر کردووە .

دانیشت و نانی ئێوارەی لەگەڵ خواردن . ( موسا)ی بۆ ماوەی (١٠) ساڵ بە کرێ گرت .

کرێ یەکەشی بۆ ئەو (١٠) ساڵە مارە کردنی کچێکیانی بوو لێی . ( موسا)یش زۆر دڵسۆزانە کاری بۆ کرد .

پیاوێك کە دەمێك بوو هاوڕێکانی نەدیبوو، بە یەکێکیانی وت :

بیرت دەکەم . چونکە دەمێکە تۆم نەدیوە .

ئەویش لە وەڵامدا وتبووی :

کوڕی ( شهاب) وای سەرقاڵ کردم تۆی لە بیربردمەوە ! دەیناسیت !؟

ئەویش وتی :

بەڵێ ... ئەو (٣٠) ساڵە دراوسێمانە؛ بەڵام قسەم لەگەڵی نی یە .

ئەویش وتی :

ئەوە ، خوات بیرچۆتەوە . بۆیە ئەو دراوسێ یەت بیرچووەتەوە . گەرخوات خۆش بویستایە... دراوسێکەیشت خۆش دەویست . ئەی تۆ نەت بیستووە دراوسێ مافی بە سەر دراسێوە هە یە هەر وەکو مافی خزمایەتی !؟

(حزیفە) وتویەتی :

لەگەڵ ( ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم ) چوینە مەکە . ( شقیق )ی بەرخییش .. هەر ئەو ساڵە حەجی کرد . لە تەواف کردندا یەکتریمان بینی .

ئیبراهیم لە شەقیقی پرسی : بەرو بوومی وڵاتتان چی یە !؟

شەقیق وتبووی :

گەر خوا ( رۆزیی ) بدات دەیخۆین ..گەر نەیدا .. ئەوا ئارام دەبین !

ئەویش وتی :

سەگەکانی ( بەلخە )یش هەر وا دەکەن ! بەلام ئێمە کە ( ڕۆزیی )مان بوو. بەخشندەیی لێ دەکەین . کە ( ڕۆزیی )شمان نەما.. سوپاسی خوا دەکەین .
( شەقیق ) چووە بەردەم ( ئیبراهیم ) لێی دانیشت و پێی وت :
لە ئێستاوە تۆ مامۆستای منیت !
( موحەممەدی کوڕی عیمران) وتویەتی :
پیاوێك لە (حاتەم )ی پرسی :
چۆن گەیشتیتە ئەو بڕوایەی کە پشت بە خوا ببەستیت؟
ئەویش وتویەتی : بە هۆی دوو شتەوە :
یەکەمیان : کەس ( ڕۆزیی ) منی پێ ناخورێت ... ئەمەش ئاسوودەم دەکات .
دووەمیان : بە ئاگاداریی خوا خۆی دروست بووم .. بۆیە شەرمی لێدەکەم .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

## شەوی ٨٤

شەهرەزاد وتی :
پێنجەم هاتە دواوە و پیرەژن ، لە باوکت چووە پێش و (٩)جار کڕنووشی بۆ بردو وتی :
ئەی پاشا.. خۆ.. ئەو هەمووەت بیست دەربارەی ( خۆگرتنەوە ـ زهد) . منیش کەمێك لەبارەی مێژووی کۆنەوە بۆ دەگێڕمەوە .
دەلێــن .. ئیمامی شافعی شەوی کردووە بە سێ بەشەوە . بەشی یەکەم : بۆ فێربوونی زانست .
( دووەم )ی بۆ نووستن . ( سێ یەم )ی بۆ قورئان خوێندن داناوە . ئیمام ( ابوحنیفە ) لە نیوە شەو بە دواوە هەڵدەستایەوە بۆ خواپەرستن .
ڕۆژێکیــان پیاوێك بە هاوڕێکەی وت :
ئەو ( ابوحنیفە )یە ، شەو تاکو بەیانی خوا پەرستی دەکات .
ئەویش کە ئەمەی بیست وتی :
پێم شەرمە ئاوام پێ دەڵێن . لەو کاتە بە دواوە هەموو شەوەکە خوا پەرستی دەکرد .
( ربیع ) وتوویەتی :
ئیمامی شافعی هەموومانگی ڕەمەزانێك (٧٠) جار قورئانی خەتم کردووە . ئەمە هەر لە نوێژدا .
هەر ئەو ( شافعی )یە فەرموویەتی :
(١٠) ساڵی ڕەبەقە .. خۆم تێر نەکردووە لە نانی جۆ . چونکە تێربوون دڵ ڕەق دەکات و کەسێتی دێنێتە خوارەوە و مرۆڤ خەواڵوو دەکات و قورسی دەکات بۆ هەستانەوە بۆ

خواپەرستی .

دەڵێــن : (عبدالله محمد السکری ) وتوویەتی :

لەگەڵ ( عومەر)دا قسەم دەکرد.. وتی :

لە موحەممەد ئەدریس قسە خۆش و زمان پاراوترم نەدی بووا جارێکیان من و حارس ( لبیب السفار) چووینە دەرەوە . ئەوکات (حارس ) فەقێی (حوجرە ) بوو و دەنگیشی خۆش بوو .

ئەم (٢) ئایەتـەی بـە دەنگەوە خوێنـدەوە : هـذا یـوم لاینطقـون ولا یـؤذن لهـم فیعتـذرون سەیر دەکەم ئیمامی شافعی رەنگی تێکچوو..! گیانی کەوتە لەرزین و بوورایەوە .

کە بە ئاگا هاتەوە وتی :

پەنا بە خوا لە پلە و پایەی درۆزنان و بەرهەڵست کارانی بێ ئاگا ! خوایە..دڵی زانایـان بۆ تۆ ئەوی دەبن . خوایـە بـە بەخـشندەیی خـۆت لـە گوناهـەکانم خـۆش ببـە . بمخـە ژێـر سایەی بەزەیی خۆت . لە کەم و کورتیم .. بە لێبوردەیی خۆت ، خۆش ببە . دواتر هەستام و جێم هێشتن .

لە خواناسێك دەگێڕنەوە وتویەتی :

کـە چـوومە بەغـداد شـافعی لـەوێ نیـشتەجێ بـوو. لەسـەر رووبارێـك دەسـتنوێژم هەڵدەگرت .

کەسێك بە لامدا تێپەڕی و وتی :

کوڕە دەستنوێژەکەت ، چاك هەڵبگرە . با...لە هەردوو دنیا خوا چاکت بۆ بکات . کە ئاوڕم دایـەوە.. پیـاوێکم بـینی چـەند کەسـێکی بـە دواوە بـوو . منـیش پەلـەم کـرد ، لـە دەستنوێژ هەڵگرتنەکە و شوێنیان کەوتم . کە پێیان گەیشتمەوە .

لای کردەوە و لێی پرسیم : چ پێویستی یەکت پێمان هەیە ؟

منیش لە وەڵامدا وتم :

بەڵێ لە ئەوەم فێر بکە ..کە خوا فێری کردوویت ؟

ئەمجا ئەویش وتی :

ئەوە بزانە.. هەر کەسێك راستگۆ بێت ، رزگار دەبێت . کە ئایینی خۆی راگرت ، لە بەڵا بەدوور دەبێت . هەر کەس ( خۆی گرتەوە ـ زهد ) لەم دنیا و لـەو دنیـا ئاسـوودە دەبێـت . لەم ئامۆژگارییانە پترت دەوێت بیڵێم ؟

منیش وتم : بەڵێ

ئەویش وتی :

( خۆگرەوە ـ زهد) بکە لەم دنیا.. لەو دنیا بە ئارەزوو بە..لە هەموو کارەکانتدا راستگۆ بە ، خوا رزگارت دەکات .

که ئەوان ڕۆیشت ، منیش پرسیم : ئەوە کێ یە ؟
پێیان وتم : ئەو پیاوە ئیمامی ( شافعی ) بوو.
هەروەها وتوویەتی :
هەمیشە حەزم کردووە خەڵکی فێر بکەم . بە مەرجێك ، ئەوی فێر دەبن خۆم نەکەن بە خاوەنی .
دیسان وتوویەتی :
گفتوگۆم لەگەڵ هەر کەسێك کرد بێت . حەزم کردووە، خوا سەرکەوتووی بکات و یارمەتی دەری بێت لە دەرکەوتنی ڕاستی یەکاندا . حەزم کردووە ڕاستی یەکان دەربکەون . ئیدی من وتبێتم ، یان بەرانبەرەکەم .
بە ( ئەبوحەنیفە )یان وتووە :
( ئەبو جەعفەری مەنسور) تۆی کردووە بە قازی (١٠٠٠) درهەمی مانگانە بۆ بڕیتەوە .. ڕازی نەبوویت ! ئەو ڕۆژەی دەبوو پارەکەت بۆ بێنن .. تۆ نوێژی بەیانیت دەکرد . نێرراوی (میری موسڵمانان) .. پارەکەی پێ دایت و تۆ هیچت لەگەڵ نەگوت ..! کە نێرراوەکە پێی وتیت : ( ئەم پارەیە ..حەڵاڵە ) تۆیش وتبووت : ئەوە .. بزانە کە پێم حەڵاڵە ، بەڵام پێم خۆش نی یە خۆشەویستی ( زۆرداران ) بچێتە دڵمەوە..!
( نوێنەر )ەکەش ئامۆژگاریی کرد کە ڕوو بە ڕوویان بوویتەوە خۆتیان لێ بپارێزە!
( ئەبوحەنیفە)ش وتی : جا.. چۆن یەکێك بچێتە دەریاوە تەڕ نابێت!؟
( شافعی ) فەرموویەتی :

ئەی ( نەفس ) وەرە گوێم لێ ڕاگرە     خۆت خۆشتر بوێت گەلێ چاکترە
تەماعی زۆر و مل دان بە حەزت :     گەر نەشت کوژێت : خۆ..حەیا بەرە!

لە و ئامۆژگاریانەی (سفیان الپوری) بۆ ( عەلی کوڕی حەسەنی سەلی) :
ئامان سەد ئامان درۆزن مەبە .. هەر ڕاستگۆ بە . نە درۆ بکە و نە ناپاکی و ماستاو ساردکردنەوە . چونکە خوا..کردەوە چاکەکانتان .. بە ئەو سیفاتە خراپانەی کە پێم وتیت : پووچەڵ دەکاتەوە . لە کەسێکەوە ( ئایین ) وەر مەگرە کە سۆزی بۆ ئایینەکە نەبێت . هاوڕێی کەسێك بە ( خۆگرەوە ـ زاهد) بێت لە دنیا.
زۆر بیر لە (تەوبە ) و لە ( مردن ) بکەرەوە . داوای ( بێوەیی ) بکە لە دنیادا . هەمیشە هەر کەسێ پێویستیی بە ئامۆژگاری بوو ، ئامۆژگاری بکە . هەرگیز ناپاکی لە ( موسڵمانان ) مەکە . چونکە هەر کەسێك ناپاکی لە موسڵمانان بکات : وەکو ئەوە وایە کە ناپاکیی... لە خوا و پێغەمبەرەکەی ( د.خ ) کرد بێت . خۆت لە چەلەحانێ و دوژمنایەتی دوور بخەرەوە . لەوە دوور بکەوەوە ..کە لێی دەترسیت..!
فەرمان بە چاکە بدە و دوورکەوتنەوە لەخراپە . بەم کارە دەبێتە خۆشەویستی خوا.

شاراوەکانی نیو دەروونت پاك بکەوە . خوایش کارە بە دەرەوە بووکانت چاك دەکات . لێبوردە بە .. بەرامبەر ئەوانەی داوای بەخشینت لێ دەکەن . کینە لە هیچ موسڵمانێك مەکێشە و جۆرێك لە خوا بترسە . هەر وەکو ئەوەی مرد بیت . لەوانە نزیك ببەرەوە ، کە لێت دابڕاون .

چارەنووسی خۆت بزانە .. کە بۆ لایەکە لەم دووانە: یان ( بەهەشت )ێکی بەرین .. یان ( دۆزەخ )ێکی ئاگرین . ئەمجا پیرەژنە ، چووەوە لای کەنیزەکان و لێی دانیشت . کە خوا لێ خۆشبووی باوکت .. ئەمانەی لێ بیستن . بۆی دەرکەوت کە ئەمانە باشترین کەنیزەکانی دنیان . ئەوە.. جوانی و شۆخ و شەنگیشیان لەولاوە بوەستێت . زۆر دڵی پێیان خۆش بوو. ڕێزێکی زۆری پیرەژنەکەی گرت . کۆشکەکەی شازادە ( ئیبریزە )ی کچی پاشای ( ڕۆم )ی بۆ ئەرخان کردن و هەموو پێداویستی یەکی ماڵی بۆ ناردن . ماوەی (١٠) ڕۆژ پیرەژن و کەنیزەکەکانی تێیدا مانەوە .

هەرجارێك باوکت دەچووە سەردانیان . پیرەژنەی لە ( خەڵوەت )دا دەبینی . بە شەو نوێژەوە خەریك بوو . ئیتر ئەو پیرەژنەی زۆر لا پیرۆز بوو .

جارێکیان بە منی وت :

ئەی وەزیر.. ئەم پیرەژنە هێندە خواناسە، کە شەرمی لێ دەکەم .

ڕۆژی یازدەیەم ، چووە لای پیرەژنە تاکو نرخی کەنیزەکەکان بدات .

پیرەژنە پێی وت :

پاشام .. نرخی ئەم کەنیزەکانە زۆر لە سەروو ئەو نرخانەوەیە .کە ڕەمەکی خەڵکی کە هەیانە . نە زێڕ و نە زیوم لێت دەوێت . نە زۆر و نە کەم .

باوکت سەری سووڕما بوو و پرسی بووی : ئەی نرخیان چۆنە؟

پیرەژنە وتی :

نرخەکەیان (١) مانگ بە ڕۆژوو بوونتە ..! دەبێت لە ئەو مانگەدا شەو نوێژیش بکەیت ..! ئەو کارەش تەنیا بۆ خوا دەیکەیت . گەر ئەم کارەت بۆ کرا، ئەوا کەنیزەکەکان دەبنە سامانی خۆت و چی یان لێ دەکەیت بیکە .

پاشا زۆر سەری لە (خۆگرتنەوە ـ زهد)ی ئەم پیرەژنە سووڕما !

خواناسییەکەی هێندەی دی پیرەژنەی لا مەزن کردو وتی :

بە هۆی ئەم پیرەژنەوە خوا... خێر و بەرەکەتێکی فرەی پێ بەخشیوین . ئەمجا ڕێك کەوتن ، کە پاشا یەك مانگ بەڕۆژوو بێت .

پیرەژنەش وتی : منیش نزای چاکت بۆ دەکەم...

هەر لەوێدا پیرەژن فەرمانیدا : بڕۆن ( گۆزە )یەك ئاوم بۆ بێنن .

کە گۆزە ئاوەکەیان بۆ هێنا.. دەستی کرد بە شت خوێندنەوە بەسەریدا . نزیکەی

سەعاتێك خەریك بوو. ئێمەش هیچی لێ تێ نەدەگەیشتین . ئەمجا پارەچە قوماشێکی بەسەر گۆزەکەدا، دا و دایە دەست باوکت و پێی وت :

دوای (١٠) رۆژی یەکەم . بەم ئاوە رۆژووەکەت بشکێنە . ئەم ئاوە خۆشەویستی دنیا لە دڵت دەردەکات و پڕی دەکات لە رووناکی بڕوا بوون . سبەینێ منیش دەچمەوە لای پیاوانی ( غەیب ) بیریان دەکەم . دوای (١٠) رۆژی یەکەم دێمەوە بۆ لات .

باوکت گۆزەکەی لێ وەرگرت و فەرمانیدا . ژوورێکی لە کۆشکدا بۆ ئامادە بکەن .. تا خواپەرستی تیا بکات . رۆژی دواتر، پاشا بە ڕۆژوو بوو. پیرەژنەش لێیدا و رۆیشت . پاشا (١٠) رۆژی یەکەمی گرت ، رۆژی یازدەیەم : سەری گۆزەکەی لاداو لە ئاوەکەی خواردەوە . هەستی کرد دڵی خۆش بوو .

پیرەژنەش لەگەڵ خۆیدا شیرینی لەکاغەزێکی سەوزدا هێنابوو و چووە لای باوکت و سڵاوی لێکرد .

باوکیشت لە بەری هەستا و وتی : بەخێر هاتی ئەی ژنی خواناس .

پیرەژنەش وتی :

پیاوانی (غەیب) سڵاوت لێ دەکەن . چونکە تێم گەیاندوون کە تۆیش بە رۆژوو دەبیت . زۆریان پێ خۆش بوو . ئەم شیرینییەشیان بۆ ناردوویت .کە لەودنیاوە ، هێناویانە و ئێوارە رۆژووەکەتی پێ بشکێنە . باوکت کە ئەوەی لێ بیست ، فرەی پێ خۆش بوو.

بە روویەکی خۆشەوە وتی :

سوپاس بۆخوا، کەوا چوومە ریزی پیاوانی ( غەیب )ەوە . سوپاسی پیرەژنەی کرد و رێزێکی زۆری کەنیزەکەکانی ئەوی گرت .

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.*

**شەوی ٨٥**

شەهرەزاد ئەمشەویش لە شوێنی خۆی بەرامبەر شا شەهرەیار دانیشتەوەو وتی :

دندانی گەورە وەزیر درێژەی بە قسەکانی دا و وتـــی :

(٢٠) رۆژی رەبەق ، بەرۆژوو بوو .

پیرەژن هاتەوە بۆ لای و پێی وت :

پاشا گیان .. ئەوە بزانە ، بە پیاوانی( غەیب )م وتووە چ خۆش ویستن و رێزێك لە نێوان من و تۆدا هەیە . پێیشم وتوون کە کەنیزەکەکانم بە دیاری داوە بە تۆ و ئەوانیش پێیان خۆش بوو .

کە ئاوا ئەو کیژانە کەوتنە لای پیاوێکی خواناسی وەکو تۆ. ئێستاش ( پیاوانی غەیب ) داوایان لێ کردووم کە کەنیزەکەکان ببەمە لایان تاکو بەرەکەت و پیرۆزییان بە سەردا برژێنن . رەنگە ، تا گەنجینەیەکی سەرزەوی لەگەڵ خۆیان نەهێننەوە.. نەگەڕێنەوە لای

بەرێزتان . بۆ ئەوەی کە لە رۆژووەکەت بوویتەوە ، خەریک نەبیت بە کڕینی پۆشاک و پێداویستی پەوە بۆیان . ئەم کەنیزەکانە بە سامانی خۆیان شت بۆ خۆیان بکڕن ..!

کە باوکت ئەم قسەیەی بیست ، بە پیرەژنەی وت ،

گەر خەمی دڵشکاندنی تۆم نەبووایە رازی نەدەبووم ، بەو گەنجینەیەی دەی هێننەوە . ئاخۆ ..کەی لەگەڵ خۆت دەیانبەیت ؟

پیرەژنە وتی :

(٢٧)ەمین شەوی رۆژووەکەی تۆ دەیان بەم . سەری مانگ دەیان هێنمەوە . تا دێمەوە تۆیش لێ دەبیتەوە و پەیمانەکەت بەجێ دێنیت . بەو خوایە هەر کەنیزەکێکیان ، نرخەکەی لە نرخی مەملەکەتەکەت زۆرترە ..!

ئەویش پێی وت : ئەزانم .. خوشکەی خواناس .

پیرەژنە وتی :

خۆشەویستێکی خۆیشت با لەگەڵ کەنیزەکەکانی مندا بێت تاکو ئەویش بەرەکەتی .. ( پیاوانی غەیب )ی بەسەردا بڕژێت .

باوکیشت وتی :

کەنیزەکێکی ( رۆم )یم هەیە ناوی ( سەفیە )یە . کوڕ وکچێکم لێی هەیە . بەڵام چەند ساڵێکە : کوڕ و کچەکەم ون بوون . خۆزگە سەفیەت ببردایە .. تاکو ئەو بەرەکەتەیان بەسەردا بڕژایە !

پیرەژنەش وتی :

زۆر باشە ، تۆ( ٢٧) رۆژە .... رۆژەوانەتیەکەت تەواو بکە .

رۆژان رۆیشت و باوکت (٢٧) رۆژەکە بەرۆژوو بوو .

پیرەژن هاتەوە و وتی :

نیازمە بڕۆم بۆ لای ( پیاوانی غەیب ) .

باوکیشت خێرا ناردییە شوێن (سەفیە)و دایەدەستی پیرەژن ئەویش خستیە ناوکەنیزەکەکانیەوە .

پیرەژن چووە ژووری نوستنەکەی خۆی و جامێکی سەر بە مۆری هێناو دایە دەست باوکت و وتی :

رۆژی سێ یەم ، بچۆ گەرماو وخۆت بشۆ..کە هاتیتە دەرەوە ، بچۆوە شوێنی ( خەڵوەت )ەکەت و سەری ئەم (جام )ە هەڵ بدەرەوەو ئاوەکەی بیخۆرەوە . دواتر بە سەریدا بنوو. ئیدی بە ئاواتی خۆت دەگەیت .

پاشا بەم قسەیە زۆر دڵی خۆش بوو و دەستی پیرەژنەی ماچ کرد . پیرەژنەش لێی داو رۆییشت .

باوکت لێی پرسی : کەی دەگەڕێیتەوە ؟ من دەزانم بیرت کە دەکەم .

پیرەژنە و (٥) کەنیزەکەکە و (سەفیە)ی ژنی پاشا چوونە دەرەوە . دوای( ٣) ڕۆژ باوکت دوای خۆشتن چووەوە خەڵوەتگەکەی خۆی .. دەرگای لەسەر خۆی داخست و فەرمانیدا : کەس سەردانی نەکات . دواتر سەری (جام)ەکەی هەڵدابووەوە و ئەوەی ناوی خوارد بووەوە و لێی نووست بوو .

ئێمەش تاکو ئێوارە ، چاوەڕێمان کرد . باوکت هەر نەهاتەوە دەرەوە ! وتمان ڕەنگە ماندووی گەرماوەکە بێت .

دووەم ڕۆژیش چاوەڕێمان کرد . هەر نەهاتە دەرەوە . دیسان وتمان : ڕەنگە ماندووی، بەرۆژوو بوونەکەی و گەرماو کردنەکەی بوو بێت. بۆیە دیار نەبوو. دواتر چووینە بەر دەرگای خەڵوەتگەکە و بانگمان کرد . بەڵام وەڵامی نەبوو..!!

کەوتینە گومانەوەو دەرگاکەمان شکاند ، چووینە ژوورەوە، سەیرمان کرد گۆشتی لەشی دارزیوە..!

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

## شەوی ٨٦

شەهرەزاد وتی :

دیسانەوە ( دندان )ی وەزیر درێژەی بە گێڕانەکەی دا و وتی :

ئەوە بەلامانەوە زۆر کارێکی سەرسووڕهێنەر بوو..! جامەکەمان هێنا و سەیری بنەکەیمان کرد .

کاغەزێکی تێدا لوول کرابوو. کە کردمانەوە ، تێیدا نووسرابوو :

تاسەی پیاو خراپان ناکرێت . ئەمە سزای ئەو کەسانەیە : کچانی پاشایان ئەتك دەکەن . با هەر کەسێك ئەم نامەیە دەخوێنێتەوە بزانێت کە ( شرکان ) هاتووەتە وڵاتمانەوە . هەر ئەویش شازادە ( ئیبریزە )ی لە ئێمە هەڵگێڕایەوە و بەوەیشەوە نەوەستا و هەڵیشی گرت ..! لەگەڵ کۆیلەیەکی ڕەشدا ناردی و لە ڕێگە کۆیلەکە کوشتی چونکە ئێمە بە کوژراوی دۆزیمانەوە . ئەمەش کاری پاشایان نی یە!! سزای ئەو جۆرە کارانەش ئەمەیە کە دەیبینن ! کەسی تر بە کوشتنی سوڵتان تاوانبار مەکەن . کەس نەی کوشتووە لە پیرەژنە فێڵاوی زیاتر! ئەوا سەفیە خاتوونی ژنی شایشم گەڕاندەوە بۆ ( ئەفرەیدون ) شای ( قوستەنتەنیە )ی باوکی ! ئەوەیش بزانن کە ڕۆژێکیش دێت وڵاتەکەتان داگیر بکەین .

ئێمەیش کە ئەم نامەیەمان خوێندەوە . بۆمان دەرکەوت پیرەژن ئێمەی فریو داوە! ئیتر کەوتینە هاوار و لەخۆدان وگریانیش دادی نەدەداین . هێزی سوپا کەوتنە دووبەرەکی لەسەر ئەوەی کێ بخەنە شوێنی پاشای باوکت ؟ هەندێکیان داوای تۆیان دەکرد ببیتە جێ

نشینی باوکت . هەندێکی تریان دەیان ویست شرکانی برات ببێتە پاشا لە شوێنی باوکت .
(١) مانگی رەبەق ئەمە حاڵمان بوو.
ئەمجا کۆبوونەوەیەکمان کردو ویستمان بچین ( شرکان) بێنینەوە بۆ بەغداد و بیکەینە جێ نشینی باوکت . ئەوە بوو بەرێ کەوتین و تۆمان دۆزی یەوە.. ئەمە بوو.. بەسەرهاتی کوژرانی باوکت .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

شەوی ٨٧

شەهرەزاد وتی :

( دندان )ی گەورە وەزیر لەقسەکانی بووەوە و چووالمکان دەستیکردە گریان . ( نزهەالزمان)یش بەدوایدا .

خەزنەداریش بە ( ضوءالمکان )ی وت :

پاشا گیان ..گریان دادمان نادات . دەبێت تۆ ورە بە خۆت بدەیت . مەملەکەتەکەت ، تۆکمە و بە توانا بکەیت . هەر کەسێك ئەوەی وەکو تۆی لە دوا بەجێ مابێت : نامرێت .

ئیدی پاشا گریانەکەی لە بیر خۆی بردەوە و فەرمانیدا.. جێگەی دانیشتنەکەی بۆ بەرنە دالانەکە ، ئەمجا هێزی سەربازی مەملەکەتی بەسەر کردەوە . دندانی گەورە وەزیرو سەرکردە وگەورە پیاوانی دەوڵەتیش لەگەڵیاندا .

ضوءالمکان لە دندانی پرسی :

ئێستا بوودجە و خەزێنەی باوکم پێ بڵێ !

حساباتی دەوڵەت و بودجەی ساڵانەی خستە بەردەم و ئەویش خەڵاتی میر و سەرداران و دەرەجەدارانی دەوڵەتی کرد .

خەڵاتی گەورە وەزیریشی کرد و وتی : تۆ ... لە پلەی خۆتدا دەمێنیتەوە.

ئەویش کرنووشی بۆ پاشای نوێ برد .

جووالمکان بەخەزنەداری وت :

ئادەی داهاتەکەی دیمەشقم بۆ بێنە .

ئەویش سندوقە زێڕ و زیوو، دیاریە ئەنتیکەکانی خستە بەردەم پاشا.. هەر هەمووی کردە خەڵاتی گەورە سەربازان و دەرجەداران و بە شێوەیەك هیچ پاشایەگی وا بەخشندە و دەست بڵاویان نەبینی بوو !

ئەمجا بەرەو دەروازەکانیان بوونەوە ، بۆ سبەینێ کە خۆر هەڵات . فەرمانیدا بکەونە رێ ( ٢) رۆژ بەرێوە بوون و گەیشتنە شاری بەغدا. سەیریان کرد شار رازاوەتەوە . ئەمجا جووالمکان ی پاشای نوێ ، چووە کۆشکی باوکیەوە ، لەسەر کورسییەکەی دانیشت . دندانی

وەزیر و خەزێنەداری دیمەشق و میر و ئەفسەرەکان ، لە لای راست وچەپی یەوە بوون .

نووسەری دەرباری بانگ کرد و فەرمانیدا کە نامەیەك بۆ شرکانی برای بنووسێت . چی رویداوە ، ئاگاداری لێ بکاتەوە . بنووسێت هەر کە ئەم نامەیەت پێ گەیشت ، سوپاکەت کۆبکەرەوە و بیهێنە بۆ بەغدا تاکو پێکەوە بچینە شەڕی ( نەسارا)کانەوە .

بە دەستی خۆی نامەکەی نوشتانەوە و دایە دەست دندان و وتی :

تۆ نەبێت ، نایدەمە دەست کەسی تر! لەگەڵیدا نەرم و نیان بە! ئەمجا پێی بڵێ گەر مەملەکەتەکەی باوکیشت دەوێت ، ئەوا پاشایەتیەکەشی دەدەمێ و خۆم دەبمە : جێگری ئەو و دەچمە شوێنی ئەو، واتە لە دیمەشق .

دندانی وەزیر نامەکەی وەرگرت و رۆیشت و خۆی بۆ سەفەر ئامادە کرد . فەرمانیشیدا کۆشکێك بۆ توونچی برازێننەوە .

رۆژێکیـــان ضوءالمکان چووە راو و شکار. کە گەڕایەوە شار، سەرنجیدا میران و ئەفسەر و سەرداران چەندین دیاریان بۆ داناوە . ئەویش سەری لەو دیاریانە سوڕما..!! بە تایبەتی کەنیزەکێکی تیابوو. زۆر ناسك و نازدار بوو! زۆری حەز لێ کرد بۆیە لە خۆی مارە بڕی.

دوای ماوەیەك دندانی گەورە وەزیر گەڕایەوەو هەواڵی شرکانی برای بۆ هێنایەوە .کە بەم زووانە دێت بۆ بەغداد و دەبێت بچێتە پێشوازیی .

دواتر گەیشت و پاشا و وەزیران و ئەفسەران و دەرەجەداران چوونە پێشوازیی شرکان . دەواریان لە کەناری شار بۆ هەڵدان بۆ حەوانەوە .

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بووە... بێدەنگ بوو.*

## شەوی ٨٨

### ئامادەبوونی هەردوو سوپای شرکان ضوء المکان

شەهرەزاد وتی :

بۆ بەیانی ( شرکان) لەگەڵ پێشەنگ و سەرکردەکان کۆ بووەوە و سوپاکەی رێك خستەوە . بەیداخی شەڕ شەکایەوە . ضوءالمکان یش چووە پێشوازی سوڵتان ( شرکان ) و ویستی وەك رێز لێنان بۆی . لە ئەسپەکەی دابەزێت ..

بەڵام شرکان سوێندی دا. کە پیادە نەبێت و پێش ئەو دابەزی . هەردووکیان باوەشیان بە یەکدا کردو بەسەر یەکدا گریان .

سوار بوونەوە ئەوان لە پێش سوپا و جەنگاوەران بە دوایاندا بەرێکەوتن . تا.. گەیشتنەوە شاری ( بەغداد) ئەو شەوە ( شرکان ) و( چووالمکان )ی برای پێکەوە لە کۆشك مانەوە . بۆ بەیانی چووە نێو سوپاوە و فەرمانیدا شەیپووری جەنگ لێ بدەن . چاوەڕێی هاتنی سوپاکانی دەوڵەتانی تریش بوون بۆ کۆمەك کردنیان . لە هەر لایەکەوە سوپا دەهات

بۆ بەشداربوون .. پاشا و میری برای ، خەڵاتیان دەکردن و پەیمانی ، پاداشتی باشیان پێ دەدان . مانگێك خەریکی ڕێکخستنی ئەو سوپامەزنە بوون .

شرکان بە براکەی وت :

براکەم ... بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە .

ئەویش لە نووکەوە بە سەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە . کە ئەو توونچیە، چەندە پەزێرایی کردووە.

براکەی پرسیی : ئەی.. پاداشتت نەداوەتەوە !؟

ئەویش وتی :

نە بەخوا.. بەڵام ، لەم ( غەزا )یە گەڕامەوە دەم پەرژێتە سەر ئەویش .. بۆی دەرکەوت قسەکانی نزهەالزمان ی خوشکی هەموو ڕاست بوو. گوێی خۆی لە بەسەرهاتیان خەواند ..! بە خەزنەداری زاوایدا سڵاوی بۆ خوشکەکەی نارد .

نزهە الزمانیش وەڵامی سڵاوەکەی ناردەوەو نزای خێری بۆ کرد و پرسیاری قضی فکانی کچیشی کرد .. خوشکەکەی تێی گەیاند کە زۆر باش و تەندروستە . شرکان یش سوپاسی خوای کرد و کەوتە پرسیاری سەفەرەکەیان کردن .

ئەویش وتی :

براکەم .. کە هەموو سوپاکان کۆبوونەوە و ئامادە بوون ، سەفەر دەکەین .

ئەمجا فەرمان درا : پێداویستی جەنگاوەران لە چەك و خۆراك وکەل وپەلی پێویست ئامادە بکرێن .

نووسەران و بەڕێوەبەرێتیە سوپای یەکان بدرێتە دەست ژنەکەی . لە (٣)ی مانگدا ، چەکدارانی خێڵە عەرەبە دەشتەکی یەکان پەیوەندیان بەو سوپا مەزنەکەوە کرد . کۆمەڵ .. کۆمەل سوپا کەوتەڕێ . سەرۆك هۆزی ( دەیلەم ) ناوی ( ڕۆستەم ) بوو . سەرۆکی سوپای ( تورك )یش : ( بەهرام ) .

( ضوء المکان) کەوتبووە ناوەڕاستی سوپاوە و براکەی لای دەستە ڕاستیەوە بوو . ( زاوا )کەی کەوتبووە لای دەستە چەپیەوە . مانگێك ئەم سوپایە بەڕێوە بوو. چونکە ژمارەی جەنگاوەر و سەربازان هێندە زۆر بوون. ناچار بون هەفتەی (٣) ڕۆژ لا بدەن و بحەوێنەوە .

ئا بەو شێوەیە بەڕێوە بوون ، تا گەیشتنە وڵاتی ( ڕۆم ). ئیدی دانیشتوانی شارو شارۆچکە و دێکان ڕەویان کرد بەرەو ( قوستەنتەنیە ) . کە شا ( حەردوب ) ئەمەی بیست . چووە لای( پیرەژن )ە فێڵاوی . لەبەر ئەوەی خۆی ئەم فێڵەی کردبوو. هەر ئەو پیرەژنەیش بوو چووە ( بەغداد) و شا ( عومەری کوڕی نعمان )ی کوشت بوو . دواتر ( سەفیە) و (کەنیزەکەکان )ی هێنایەوە .

ڕووی کردە پیرەژنەو وتی :

ئێستا ئەم سوپایە روو بکاتە شاری (قوستەنتەنیە) . پێم وایە ... خۆمان لە بەریدا راناگرین ؟!

ئەویش پێی وت : برۆ سوپاکەت رێك بخە .

ئەمانیش ئامادەی جەنگ بوون و پیرەژنە فێلاوی پێشەنگ بوو. گەیشتنەشاری ( قوستەنتەنیە) .

شا ( حەردووب )ی کوڕی پیرەژنە فێلاوی ، بۆ (ئەفرەیدون) شای گێڕایەوە کە پیرەژنە فێلاوی دایکی چ پەنێکی داوە!؟ چۆن پاشای موسڵمانانی کوشتووە و( سەفیە )ی هێناوەتەوە.

پیرەژنە فێلاوی وتی :

سوپای ( موسڵمانان ) هاتوونەتە سەرمان وئێمەش داوا دەکەین ، سوپامان یەك بخەین و لە بەرامبەریاندا بجەنگین..!

شا ( ئەفرەیدون ) زۆری پێخۆش بوو . ( سەفیە )ی رزگارکردووە و شا ( عومەر)ی کوشتووە .

ئەمانیش (٢) مانگ خەریك بوون بە ئامادە کردنی سوپایانەوە . لەدوایدا سوپای ( نەسارا) ئامادە کرا. لە هەموو لایەکەوە ( فەرەنگی )یەکان هاتن ( فرەسیس )ی ( نەمسا) ، ( دوبرە )، (جورنە ) ( بندقیە ) و( جنوبز ) هێندە زۆر بوون . سەر زەوی نەیدەگرتن . شا ( ئەفرەیدون ) فەرمانی دەرکرد سوپا لە ( قوستەنتەنیە ) بچێتە دەرەوە . سوپاکە(٥) رۆژ بەرێوە بوو . تاکو گەیشتنە دۆڵێکی فراوان .

کە لە دەریای ( خوێ یاوك )ەوە نزیك بوو.. سێ رۆژ لەوێدا هەڵیاندا و حەوانەوە .

رۆژی چوارەم ویستیان باربکەن و برۆن . هەواڵیان بۆ هات .. وا سوپای ئیسلام گەیشتە سەریان .

بۆیە سێ رۆژی ترمانەوە و رۆژی چوارەم سەیریان کرد بەری ئاسمان بە تەپ و تۆز گیرا. دوای سەعاتێك تەپ و تۆزەکە رەوی یەوە . بینیان کە بە چ شێوەیەك ئەو هەموو رم و ئاڵایانە چووبوو بە ئاسماندا..!

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

**شەوی ٨٩**

## جەنگی نێوان سوپای ئیسلام و نەسارا

شەهرزاد وتی :

ئەی شاشەهرەیار ... پاشای بەختیار.. سوپا وەکو، دەریا شەپۆلی دەدا . هەر وەکو (٢) شەپۆلی دەریا پێکدا بدەن . یەکەم پەلاماردان لەشکری شامی (دندان)ی سەرۆك وەزیران کە (٣٠٠٠٠٠) جەنگاوەر بوون .

سەرکردەکانی تورك و فارس ( رۆستەم) و (بەهرام )بوو. جەنگاوەرەکانی ئەم دوانە (٢٠٠٠٠) سەرباز بوو. دوا بە دوای ئەوان لەشکری ( بحرالميت) بوو . کە هەموو ( زرێپۆش) بوون و دەتوت مانگی هەڵاتووی نێو تەم و مژن ..

سوپای ( نەسارا ) هاواریان دەکرد :

حەزرەتی ( عیسا ) و( مریەم) و( خاچ ) . چوار دەوری لەشکرەکەی ( دندان )ی گەورە وەزیریان دا . ئەمەش بە پرس ورای پیرەژنە فێڵاوی بوو . چونکە شا زووتر لێی پرسی بوو: تەگبیر چی یە؟ پیرەژن تۆ هۆکاری ئەم جەنگەیت .

پیرەژنەش وتبووی :

پاشای گەورە، ئەوە بزانە ، ئێستا من پیلانێك دادەنێم .کە شەیتانیش رێی پێ نەبات..!
ئەو پیلانەشی ئەوەیە ( ٥٠٠٠٠) جەنگاوەر بە پاپۆڕ و بە دەریادا دەڕوات . تا دەگەنە شاخی تەماوی و لەوێ چاوەڕێ دەکەن ، تاکو ئاڵای سوپای ئیسلام دەردەکەوێت . ئەمجا لەدەریاوە پشتیان لێ بگرن . ئێمەش بەردەمیان لێ دەگرین و ناهێڵین : یەکێکیان لێ دەربچێت !

( ئەفرەیدون ) شا پیلانەکەی پەسەند کرد. کە سوپای ئیسلام بەو دۆڵەدا رەت بوو، هێندەیان زانی شمشێرەکان پێکدادران . سوپای ( بەغداد) و(خۆراسان) (١٢٠٠٠٠) جەنگاوەری فارس بوون .

ضوءالمكان فەرماندەیان بوو. سوپای ( نەسارا) لە نێو دەریاوە ئەو سوپایەیان بینی . شوێنیان کەوتن ( ضوءالمكان ) فەرمانیدا بگەڕێنەوە بۆیان و ئەم لە ئیسلام دەرچووانە بکوژن .

( شرکان )یش روو بە ڕووی کۆمەڵێکی تریان بووەوە . کە ئەوانیش (١٢٠٠٠٠) جەنگاوەر بوون. سوپای نەسارا (١٦٠٠) جەنگاوەر بوون . سوپای موسڵمانانیش تێکەڵ بە یەکتری بوون و ژمارەیان زۆر زۆرتر بوو .. زیاتر بڕوایان بە خۆیان پەیدا کرد .

هاواریان کرد : خوا پەیمانی سەرکەوتنی بە ئێمە و شکاندنی ئەوانی داوە .

ناڵە و زرمەی شمشێر و رم بڵند بووەوە . شرکان دڕی بە هەزاران دا و شەڕێکی کرد ، منداڵ لە سەرسووڕمانیدا سەری سپی دەکرد . لەهەر کۆمەڵێکی دەدا کپی دەکرد .

هاواری دەکرد : الله اكبر.

تاکو بەرەو کەناری دەریای کشاندنەوە . لێیان کوشتن و بە سەر یەکیدا شکاندنەوە . سەرکەوتن بۆ سوپای موسڵمانان بوو . ئا.. لەو پێکدادانەدا نزیکەی (٤٥٠٠٠) جەنگاوەری ( نەسارا) کوژرا . (٢٥٠٠) جەنگاوەری موسڵمانانیش شەهید بوو. ئەو شەوە ( شرکان )ی شێری ئایین ( ضوءالمكان )ی برای خەویان لێ نەکەوت . تاکو بەیانی بەنێو بریندارەکاندا گەڕان ومژدەیان بە ( لەشکری ئیسلام )دا بڵاو کردەوە . کە سەرکەوتوون و دوژمنانیان شکاندووە .

لەولایشەوە شا( ئەفرەیدون )ی پاشای ( قوستەنتەنیە) و پاشای ( رۆم ) و دایکە پیرەژنە فێلاویەکەی جەنگاوەرانیان کۆکردەوە و قسەیان بەم شێوەیە بۆ کردن :

ئێمە .. بە زۆری خۆمادەمان نــازی .. بۆیە جەنگمان بۆ نەکرا .

پیرەژنە سەر تاسنین وتی :

بۆ ئەم سەرکەوتنە پێویستمان بە یەکگرتنە . ئـەوەی رێـی (مەسیح) بگرێ . دەچێتە سەر راستە رێ . ئەگەر ( شرکان )یان نەبایە . دەبوو سوپایان تێک شکایە .

شائەفرەیدون وتی :

سبەینێ کە هەردوو سوپا بەرامبەر یەك بۆ شەڕ وەستان .. شۆرە سواری پاڵەوان ( لوقا )ی کوڕی ( شەملوت ) بۆ (شرکان) . دەنێرمە مەیدان .. تا جۆرێك پشتی بشکێنێ .گیانی لە لەش دەربێنێ . یەك یەك بییان بەزێنێ ... تا دواییان پێ دێنێ .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٩٠**

شەهرەزاد وتی :

بۆ سبەینێ بەیانی.. سوپای (نەسارا) ریـز بـوون . سوارەکان رمـەکانیان بڵند کردەوە! سەرانی دەوڵەت لای پاشا کۆبوونەوە . پاشایش خـەڵاتی کـردن وێنـەی خاچی بـە رووياندا کێشا.

( لوقای کوڕی شەملوت ) پاڵەوان کـە نازنـاوی ( شمشێری مەسیح )ی لێنـرا بـوو ئامادە کرا. ئەم پاڵەوانە لـە هـەموو وڵاتـی ( رۆم )دا لـە وێنـەی نـەبوو. چ لـە زۆرانبازیـدا.یان لە (رمبازی ) دا.. یان لە ( شەرەشیر )دا. زۆریش ناشیرین بوو. دەتووت خەڵووزە . وەکو شێر چەلەنگ .گوژمی وەك پڵنگ .

شا پێی وت :

لە تۆم دەوێت بەرەنگاری ( شرکان )ی کوڕی شا( عومەری کوڕی نعمان) ببیتـەوە . ئەو شەڕەنگێزەمان.. بۆ رسوا بکەیت و لە ناوی بەریت .

ئەسپێکیان بۆ ( لوقا) هێنا رەنگ زێڕین . زینێکی قەڵپووز زێڕینی لەسەر پشت بوو . رمێکی بە دەستەوە بوو. کە (٣) سەرە نێزەی پێوە بوو . دەتووت سەری شەیتانە ! سوار بوو و چووە گۆڕەپان ئەسپ سوارێکی لەتەکدا بوو.

کە بە زوبانی عەرەبی دەینەڕاند :

ئەی .. ئـەوەی موحەمـەد .. تـەنیا و تـەنیا داوای ( شمـشێری ئیسلام ) دەکەین . واتە (شرکان) پاشای دیمەشق و شام .

کاتێکیـان زانــی حیلـەی ئەسـپ و ئەعرەتـەی شـۆرە سـوارێك پەیـدا بـوو . دری بە جەنگاوەران دا . خەڵکی شەڕی ( حونەین )یان بیر دەهاتـەوە . جـەنگاوەران بـە ترسەوە..

ناوڕیان لێ دایەوە . بۆیان دەرکەوت ، کە ئەوە ( شرکان )ی کوڕی شا( عومەری کوڕی نعمان)ە .

جووە گۆڕەپانی شەڕ و لەولایشەوە موسڵمانان زانیان کە ئەوە یەکێکە لە پاڵەوانە ناودارەکانی وڵاتی ( رۆم ) و سوێندی خواردووە .. سەر زەوی لە موسڵمانان پاك بکاتەوە. ئەگەرنا خۆی بە دۆڕاو دەزانێت! تەنانەت مندالانی ناوسکی دایکانیش لێی دەترسان ..! تورك و دەیلەم و کوردان . لێی دەترسان . شرکانی شۆڕە سوار وەکو شێری تووڕە.. بۆی هاتە گۆڕەپان.. رمێکی لێ راتەکان دەتوت رەشمارە بە دەستی یەوە و کەوتە نەعرەتە لێدان.

( لوقا )ی پاڵەوان .. هێندە فریا کەوت کە رمەکەی ئاراستەی سەرسنگی (شرکان) کرد . شرکانیش چاپووکانە ، رمەکەی لە هەوادا گرتەوە کە هێندە بەگوژم بوو پێوەی لوول بوو . جەنگاوەرە موسڵمانەکان ترسی ئەوەیان بوو پێکرابێت .

بەڵام هەستایەوەو رمەکەی ( لوقا )ی ئاڕاستەی خۆی کردەوە .

( لوقا )یش ویستی لاسایی شرکان بکاتەوە و رمە ئاڕاستە کراوەکە بگرێتەوە . رمەکە لە کەللەی جەقی... بە پشت دا کەوت و دەم ودەست گیانی دەرچوو.

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

شەوی ۹۱

شەهرەزاد وتی :

کە رۆمەکان بینیان (لوقای کوڕی شەملوت ) کوژراو کەوتە سەر زەوی . کەوتنە شین و واوەیلا! پەنایان بردە بەر بەتریرکەکانی کلێسە . جارێکی دی رم هاوێژانیان کۆکردەوە و جارێکی دی هێرشیان هێنا . (۲ ) سوپا بەیەکیاندا دایەوە . هێندەیان شەڕ کرد . دەست و دەچەکیان ماندوو بوو . چەندین سەر و سنگ کەوتنە ژێر پاشووی ئەسپەکانەوە . تاکو تاریك داهات ، جەنگ سەرو مڕ بوو . گۆڕەپان لە بریندار و مردوو پڕ بوو.

شرکان لەگەڵ ضوءالمکان و خەزنەدار و دندان کۆ بووە و پێی وتن :

سوپاس بۆ ئەو خوایە ...کە دەرگای تێدا چوونی ، بۆ کافران .. خستە سەر پشت..!

( ضوءالمکان)یش وتی :

بۆ.. سوپاسی خوا نەکەین؟ کە ئاوا.. رێگای بۆ عەرەب خۆش کرد . لەمەودوا ئەوە دوای ئەوە، ئەم زاڵ بوونەت بە سەر ( لوقا )ی پاڵەواندا ، بۆ یەکتر دەگێڕنەوە.

شرکان یش وتی :

ئەی خەزنەداری باڵا.. پێشەنگی پۆڵا.. ( دندان )ی گەورە وەزیر و (۲۰۰۰۰ ) سوارە ، ببە بۆ.. کەناری دەریا. ( ۷) فرسەخ رێیە و پەلە بکەن . تاکو زوو بگەنە کەناری دەریا . کارێك

بکەن دوو ( فرسەخ )تان لەنێواندا ببێت . لەگەڵیاندا سەنگەر لەزەوی دا لێبدەن . خۆتان تێیدا بشارنەوە هێرش نەکەن .. تاکو گوێتان لە دەنگی پێیان دەبێت و لە پاپۆڕەکانیان دادەبەزن .چاوەڕێ بکەن . کە ئاڵاتان بینی لێی نووسرابوو: ( لا اله الا الله محمد رسول الله ) تێکەڵاویان ببن و هاوار بکەن : ( الله اکبر) .

ئەمجا لێیان بدەن . کارێك بکەن نەهێڵن بگەنەوە ، پاپۆڕەکانیان .

ئەوانیش وتیان : بە سەرچاوان .

خەزنەدار دندانی وەزیر و (٢٠٠٠٠ ) جەنگاوەری لەگەڵ خۆی برد . بۆ سبەینێ دا، ئەو چەکدارانە بەو دەشت و دەرەدا بڵاو بوونەوەو بەرەو کەناری دەریا بوونەوە . پێکداپژان و شەڕ رووی دا. چەرخی کوشتار خولا. هەر کەللە سەر بوو لە جەستە جوێ دەبووەوە . چاوان بوون ئەبڵەق دەبوون . زراوان دەتەقین . مەچەکان دەپچڕان . کەللە سەران دەپەڕان . ئەسپەکان لە خوێندا دەگەوزان . جەنگاوەرانی موسڵمان ... سڵاواتیان لێ دەدا .

سوپای ( ڕۆم )یش هاواری حەزرەتی ( موسا)یان دەکرد . سوپای موسڵمانان : بەرەو دوا کشانەوە .

( ئەفرەیدون ) شا وای زانی .. سوپای ئیسلام شکاوە . فەرمانی بە سوپاکەی دا : ئەی بەندەکانی ( مەسیح ) کەوتنە سەر ڕێگای ڕاست . ئەی خزمەتکارانی (جەسالیق) ..خوا پێی بەخشین: تەوفیق ! ئەوەتا سوپای ئیسلام دەکشێنەوەو هەڵدێن . ڕێیان مەدەن . لێیان بدەن و بیان کوژن . ئەگەرنا.. ئەو ( مەسیح )ەی ..کە بە ( مەلۆتکەیی ) قسەی کردووە ، لێتان خۆش نابێت ..! وا سوپایان تێك شکا..!

شا ( ئەفرەیدون )ی ( قوستەنتەنیە ) نەیزانی .. ئەوە فێڵی جەنگی سوپای ئیسلامەو پێی وابوو... سەرکەوتوون . بۆیە سوپای ئیسلام لەبەر دەمیاندا ، دەکشێنەوە . مژدەی سەرکەوتنی دا بە پاشای ( ڕۆم )..! سوێندیشی خوارد بە( موعجیزە )کانی ( مریەم )ی نەسارا کە جەنگاوەرێك لە موسڵمانان نەهێڵێت لە شارا . بیان کوژێ و هەڵیانبواسێت بە دارا.. دەبێت خوێنی ( لوقا) پاڵەوانیان لێ بسەندێتەوە .

هاواری دەکرد:

کوڕینە ئەمە تۆڵەی خوێنی (ئیبریزە)یە .

ضوءالمکان هاواری کرد :

*ئەی بەندەیانی خوا... بەو شمشێرە تیژە ... یان بەو نێزە .: بیانکوژن .*

سەرکردەیەك فەرمانیداو هاواری کرد :

بکوژن دوژمنانی ئیسلام ئەی عاشقانی پێغەمبەری ڕێبەرو ئیمام! بەهەشت لە سایەی شمشێر دایە .

( شرکان ) دەستوبرد هێرشی بە لەشکرەکەی کرد . دەرووی هەڵاتنی لێیان گرت . بەڵام

: سەری سوورما..! لە سوارێ ..کە : خوێن لە شمشێری دەبارێ..! کە بازووی هەڵدەسووران ..
دەیان کەللەی دەپەڕان ! (٢) شمشێر بە دەستەوە .. دوژمنی دەبەستەوە..!
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ٩٢**

شەهرەزاد وتی :

کە شرکان گەیشتە ئەو شۆڕە سوارە هاواری کرد :

تووقورئان تۆکێی!؟ کە بەم هەڵمەتانەی لەمەیدان دەیکەیت. خوات لە خۆت رازی کرد!؟

شۆڕە سوارەکە لە وەڵامدا وتی :

خۆ.. تۆ : دوێنێ پەیمانت لێ وەرگرتم ! ئای چەندە زوو.. بیرت چووەوە !!؟

ئەمجا کڵاوخوودەکەی لە سەر داماڵی و دەرکەوت کە ( ضوء المكان)ە..!

( شرکان ) زۆری پێخۆش بوو. لە کاتێکدا لەبەر قورسیی جەنگەکە.. لێی دەترسا .
چونکە هێشتا تەمەنی ئەو جەنگەی نەبوو . هەروەها دەبوو حوکمڕانی مەملەکەت بگرێتە دەست !

بۆیە پێی وت :

پاشا گیان .. یاری بە گیانی خۆت مەکە ! لەمەودوا با.. ئەسپەکەت . بە تەنیشت ئەسپەکەی منەوە بێت . چونکە خەمی تۆمە . برا.. نەکو بە تیرێکی وێڵەوە ببیت .

( ضوء المكان )یش وتی :

منیش حەز دەکەم بە هێندەی تۆ ئازا بم ..! بۆیە درێغی ناکەم لەم جەنگەدا . سوپای ئیسلام لە چوار لاوە ، سوپای دوژمنی گەمارۆ دا . رووداوەکان ئاوەژوو بوونەوە . شا ( ئەفرەیدون ) دەستی بە دەستدا دەداو خەمی شکاندنی سوپای ( رۆم )ی بوو . بەشکاوی بەرەو دەریا و پاپۆڕەکانیان ـ کە لە ژێر رکێفی ( دندان )ی گەورە وەزیردا بوون ـ هەڵاتن . ئەوانیش لێیان راست بوونەوەو کەوتنە شمشێر وەشاندن . بۆ دووەم جار سوپای ( نەسارا )یان شکاندەوە . لەولایشەوە میر ( بەهرام ) خاوەنی وڵاتی شام کە سەرکردایەتیی (٢٠٠٠٠) جەنگاوەری دەکرد و لێی دان .

سوپای ئیسلام (١٠٠٠٠٠) بەترێرکی سوپای نەسارایان کوشت و پاپۆڕەکانیان تێکشکاندن . زۆریشیان خۆیان هەڵدایە دەریاوە . موسڵمانان دەستکەوتێکی زۆریان دەست کەوت . لەوانە : (٥٠٠٠٠ ) ئەسپ بوو . سوپای ( ئەفرەیدون ) بە شکاوی گەڕانەوە . لەشکری رۆم پێش گەڕانەوەی هەواڵی سەرکەوتنی پێ گەیشت بوو.

پیرەژنە فێڵاوی وتبووی :

من کوڕی خۆم زۆر باش دەناسم . هەمیشە جەنگی بردووەتەوە و هەرگیز لەشکرەکەی نەشکاوە .

فەرمانی دابوو شاریان رازاندبووەوە . خەڵکی بە هەڵپەڕین و شەراب نۆشی..دەریان دەبڕی خۆشی ..!

کاتێکیان زانی قەلەڕەشی پەژارە.. هاتەوە سەر ئەوشارە . کە چوونە پێشوازیی سوپاکەی شا ئەفرەیدون . باس هەر باسی تێشکانی سوپای رۆم و سەرکەوتنی سوپای ( ئیسلام ) بوو. کوژران و دۆڕانی ( لوقا )ی پاڵەوانیان دەگێڕایەوە ! شا ( ئەفرەیدون ) سەری دنیای لێهاتەوە یەك . ئەو شکاندنەی بۆ راست نەدەبووەوە. شایی بوو بە شین و تەعزییە و هاوار و گریان .

شای رۆم گەیشتەوە لای شا( ئەفرەیدون ) و پێی وت :

چاوەڕێ مەکە لەجەنگاوەرانی سوپای خۆمان .کەسی تر بگەڕێتەوە . چونکە هەموویان تیاچوون .

شا( ئەفرەیدون ) ئەمەی بیست . هێندەی خەم خوارد بوورایەوە .

کە بە ئاگا هاتەوە وتی :

رەنگە حەزرەتی(مەسیح ) رقی لێمان بێت . ئەگەرنا..بۆچی سوپای ئیسلام.ئاوای بە سەر هێناین!؟ گەورە بەترێکەکان ... زۆر بە پەژارەوە پێشوازی ( ئەفرەیدون ) شایان کرد.

کە گەیشت وتی :

باوەی پیرۆز .. زۆر خراپ شکاوین !

باوە ( بەترێرك )یش وتی :

گوێ مەدەرێ . لەوە دەچێت لە حەزرەتی ( مەسیح ) هەڵگەڕابنەوە ! بۆیە خوایش سزای داون ئێمەش لەسەرمانە نزاتان بۆ بکەین خوا بتان پارێزێت .

پیرەژنە فێڵاوی هات و وتی :

پاشام ... سوپای ئیسلام زۆرن ! بە فێل نەبێت ، دەستمان پێیان ناگات . ئێستاش دەمەوێت : بە فێڵ خۆم بگەیەنمە لای سەرکردەکەیان . چۆن باوکیم کوشت.. ئاوا خۆیشی بکوژم !! کارێکیان پێ دەکەین ، یەك سەربازیان نەگەڕێتەوە وڵاتی خۆی . داوا لە (نەسارا)ی خەڵکی ( شام)یش دەکەم ، کە یارمەتیمان بدەن .

ئەمجا پاشا وتی :

هەر کاتێك ویستت ئامادەین .

فەرمان درا (١٠٠) سەربازی بۆ ئامادە بکرێت .

شا پێی وتن : ئاخۆ ... نازانن سوپای ئیسلام چیی بە سەر (نەسارا) هێناوە؟

وتیان : بەڵێ .

شا وتی :

کەواتە بزانن ئەم پیرەژنە بۆ مردن ئامادەیە ، دەیەوێت بە یەك جۆر بەرگەوە بتان بات . ئاخۆ.. ئێوەش خۆتان دەکەنە قوربانی حەزرەتی ( مەسیح )!؟ منیش هەر یەکە و قنتارێك زێڕتان خەڵات دەکەم . هەر کەسێکتان بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە . زێڕەکەی حەڵاڵ بێت . ئەوەشی بکوژرێت لەو دنیا حەزرەتی مەسیح پاداشتی دەداتەوە .

ئەوانیش وتیان :

ئەی پاشا.. وا ئێمەش خۆمان کردە قوربانیی (مەسیح) و تۆ.

پیرەژنە فێڵاوی هەندێ دەرمانی هێناو کوڵانی .. رەشایی تیا نەهێشت و دایپۆشی تا ساردبووەوە .

خستی یە سەر دەستەسرێکی گەورە و بەستی بە سەری یەوە.

تەسبێحێکی بەدەستەوە گرت و خۆی کرد بە دیوەخانی پاشای خۆیاندا .. دوای ئەوەی نە پاشا و نەدانیشتوان نەیان ناسی یەوە..! ئەمجا بە پێکەنینەوە پەچەکەی لادا و هەموویان دەستخۆشیی ئەو فێڵەیان لێ کرد .

کوڕەکەی بە دڵخۆشییەوە پێی وت : خوا تۆ بهێڵێت بۆ نە ساراکان .

ئەویش لەگەڵ بازرگانەکان بەرەو سوپای بغداد رۆیشت .

*شەهرەزاد هەستی کرد شەوورەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

## شەوی ٩٣

شەهرەزاد وتی :

پیرەژنە فێڵاوی خۆی کرد بە قەشەیەکی سیحرباز .. پشتی چاوانی سوور کرد و پشتی خۆی کوڕ کرد . سەفەری حەجی کردبوو.. شارەزای ئایینی ئیسلام بوو . ئەمانەشی بۆ ئەوەبوو تاکو شارەزای ئایین بێت . ئاگای لە قورئان بێت.. زۆر بەلا بوو.. دەستی لە هەموو کارێك والا بوو . زۆربەی تەمەنی لای ( حەردوب ) پاشای کوڕی ، کە پاشای وڵاتی رۆم بوو بە سەر برد بوو.

( حەردوب ) شا .. چووە لای ئەفرەیدون شا و پێی وت :

ئەی پاشای هەمووان .. ئێمە پێویستمان بە نزا و پاڕانەوەی بەترێرکی مەزن نییە! بە قسەی پیرەژنە فێڵاوی دایکم دەکەین . چاوڕێی دەبین بزانین چیمان بۆ دەکات ؟ ئەوان بە هۆی هێز و توانایانەوە زاڵ بوون بە سەرماندا . کە شا ئەفرەیدون ئەمەی بیست زۆر ترسا. بۆیە فەرمانی دەرکرد بۆ هەموو هەرێمەکانی مەملەکەت : پێویستە هەموو نەسرانیەکان بەشداری بکەن ، لە جەنگی سوپای ئیسلامدا. چونکە موسڵمانان هاتوونەتە ناو خاکی مەملەکەتمانەوە. پەلە بکەن فریا بکەون خێرا بکەن. لەو لایشەوە پیرەژنە فێڵاوی

کۆمەڵەکەی خۆی بردە دەرەوەی شار و بەرگی بازرگانانی موسڵمانانیان پێ پۆشی . (٥٠)
باری هێستریش کوتاڵی ئەتڵەسی ئەنتاکی و دێباجی پاشایی و جۆرەکانی تری پێ بوو .
فەرمانی پاشاییش پێبوو نووسرابوو:

ئەم بازرگانە لە دانیشتوانی وڵاتی شامە و هاتوونە مەملەکەتی ئێوە . نابێت کەس دەست بێنێتە رێیان . لە ( دە : یەك)یش بەخشراون . چونکە بە کاری ئەمانە وڵات ئاوەدان دەبێتەوە . پیرەژنە فێڵاوی بە خەڵکی دەورو بەری وتبوو: بۆ لە ناو بردنی موسڵمانان هەمووومان کار دەکەین !

ئەوانیش وتبوویان : تۆ فەرمان بدە و ئێمە جێبەجێی دەکەین .

نێو چاوانی خۆی بە دەرمان هەنوو بوو. بە جۆرێك بریسکەی دەدایەوە . فێڵاوی بەلە باریکەیەك بوو . چاوانی بە قووڵا چووبوون . رۆیشت تاکو گەیشتە سەربازگەی ئیسلام . زنجیری پێیەکانی کە زووتر بە پێیەوە بوو لێی کردەوە . جێی زنجیرەکە لە قاچەکانیدا دەرکەوتبوو و پیرەژنە شوێنەکەی چەورکردبوو.

فەرمانی دا و وتی :

ئادەی لێم بدەن ..! بمخەنە ، سندوقێکەوەو هەڵم بگرن و بڵێن : لااله الا الله .

ئەوانیش وتیان : چۆن دەبێت لێت بدەین .. تۆ خاتوونی ئێمەیت ..؟

ئەویش وتی :

لۆمەی کەس ناکەم ، خۆم داواتان لێ دەکەم ! پێویست بوون حەرام : حەڵاڵ دەکات ! خۆم و هەندێك سامان بخەنە سندووقێکەوەو باری هێسترێکم بکەن و بچنە نێو سوپای ئیسلامەوە.

هەر کەسێکی سوپاکە ، دەستیان هێنایە رێتان هێستر و بارەکەی بدەنێ !

پەنا ببەنە بەر ( ضوءالمکان )ی پاشایان و بڵێن :

فەرمانی پاشای ( رۆم )مان پێیەو باجی ( دە : یەك)یش نادەین . ئاخۆ .. ئێوە چۆن بارە کوتاڵەکانمان دەگرن ؟

ئەمجا پرسی بوویان :

ئاخر... لە وڵاتی رۆم چ سودێکتان کردووە؟ ئەمجا بڵێن : ئێمە لەوڵاتی رۆم خواناسێکمان لە ژێر زەمین دا رزگار کردووە کە (١٥) ساڵە لەوێ زیندان بووە !

هەر چەند کاتی خۆی پاڕاوەتەوە بێ سوود بووە . ئێمەش بارە کوتاڵەکانمان فرۆشتووە و ئەومان پێ کڕیوە ! لەگەڵ خۆمان هێناومانەوە .

ئەو شەوە هەر نەنووستین . تاکو بەیانی هەر باسی سەفەرەکەمان کرد . کە رۆژ بووەوە . سەیرمان کرد وێنەیەك بە دیوارەکەمانەوە بوو. کە لەو وێنەیە. نزیك بووینەوە .

وێنەکە جووڵاو کەوتە قسە و وتی :

ئیسلامینه ..ئاخۆ..تێتداندایه بیەوێت ، له خوا نزیك بێتەوه؟
ئێمەیش وتمان : جا .. ئەوه چۆن دەکرێت ؟
وێنەکه وتی :
خوا منی بۆیه هێناوەته قسه ، تاکو ئیمانتان بەهێز بێت و لەوڵاتی نەسرانیان بچنه دەرەوه بەرەو سوپای ئیسلام . چونکه له نێوانیاندا شرکانی شمشێری خواو پاڵەوانی زەمانەی لێیه ! گرتنی قوستەنتەنیه له سەردەستی ئەو پاشایەدا دەبێت !
هەر ئەویش ، نەسرانیان تەفر و توونا دەکات (٣ ) رۆژه رێ یه دەرۆن .. دەگەنه کڵێسەیەك ناوی مەتروحەنایه . شاخێکی بڵندی لێیه: نیەتتان پاك بکەنەوه و رووی تێ بکەن . ئەشکەوتەکه خواناسێکی تیایه کەخەڵکی ( بیت المقدس)ه و ناوی ( عبدالله )یه یەکێکه له وەلی یەکانی خواو کەراماتی هەیه. چەند قەشەیەك به فێڵ گرتوویانەو لەژێر زەمینێکدا بۆ ساڵانێکی زۆر بەندیان کردووه. هەرکەسێك رزگاری بکات ، خوا له خۆی رازی دەکات . چونکه کارەکەی به جیهاد بۆ دەنووسرێت .
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.*

**شەوی ٩٤**

شەهرەزاد وتی :
که پیرەژن ئەم تەگبیر و پیلانەی بۆ کۆمەڵەکەی رێکخست . وتی :
ئەگەر ( شرکان )ی سەرکردە گوێی لێ گرتن ، پێی بڵێن : (که ئەو قسەیەمان له ئەو وێنەی سەردیواره بیست ، بۆمان دەرکەوت ..که ئەمه وەلی خوایه و یەکێکه له خۆشەویستانی خوا .( ٣ ) رۆژ بەرێوه بووین . ئەمجا گەیشتینه کڵێسەکەو چووینه ژوورەوه.)
رۆژێك خەریکی فرۆشتنی کاڵاکانمان بووین . که شەو هات و چووینه ئەشکەوتی کێوه بڵندەکەوه گوێمان له (قورئان) خوێندن بوو . ئەمجا ئەم شیعره :

ئۆقرەم هەڵگیرا له سینەی تەنگا — تاسام له دەریای نێو دڵی مەنگا
خوا پەنام نەدات کوژراوم ..کوژراو — بوومه ئەو کۆترەی باڵێکی شکا
هێندە رێزت گرت له خزمەکانت — له خۆشیاندا .. رەونەقت تکا
رێگایەك نییه بۆ پێك گەیشتن — شەرێش منی دا به خەمی مەرگا
له کڵێسەدا .. گیرم خواردووه — هەواڵ بنێره و سڵاوت بگا..!

پیرەژن وتی :
که گەیشتینه سەربازگەی ئیسلام . پیلانەکەمتان بۆ دەردەکەوێت ! که چۆن له ناویان دەبەم ؟ (نەسران)یان دەستیان ماچ کرد . دوای ئەوەی هەندێکیان لێدا: خستی یانه

سندووقەکەوە . ئەوان پێیان وابوو ، دەبێت قسەکانی جێ بەجێ بکرێت..! بەرەو سەربازگەی موسڵمانەکان ڕۆیشتن .

لەولایشەوە کە بینیان چۆن خوا : سەری خستن و دەستکەوتیان : لەو پاپۆڕ و ئەو هەموو کەل و پەلانە زۆر بوو . شەوانە بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە .

( ضوءالمكان) بە براکەی وت :

خوا بە هۆی دادپەروەری خۆمانەوە و بە قسەی یەکتر کردنمانەوە بوو سەری خستووین ! ( شرکان ) فەرمانەکانم و ئەرکەکانی خوا بە جێ بێنە . چونکە بەنیازم (١٠) پاشا..لە خوێنی باوکمدا بکوژم !

هەروەها ( ٥٠٠٠٠ )یش لە ( ڕۆم )ەکان . ( قوستەنتەنیە )ش داگیر بکەم .

( شرکان )یش وتی :

بە قوربانت بم . ئامادەم : تاماوم ..جیهادت بۆ بکەم . بەڵام کاکە گیان..لە (دیمەشق) کچێکم هەیە . ناوی ( قضی فكان )ە و زۆرم خۆش دەوێت ..!

( ضوءالمكان ) وتی :

منیش کەنیزەکێکم هەیە ، سکی پڕەو لەسەر منداڵ بوونە . وەرە پەیمانم بدەرێ کە ئەگەر خواکوڕی پێم بەخشی ، بیکە بە زاوای خۆت..!

شرکانیش وتی : بــــە چاوان .

دەستی خستە نێو دەستی براکەی و وتی :

ئەوا.. پەیمان بێت ، ئەگەر کوڕتان بوو..کچەکەی خۆمت پێ دەبەخشم .

ئیتر زۆری پێخۆش بوو. کەوتنە باسی سەرکەوتنیان لەو جەنگە گەورەیەدا . (دندان )ی گەورە وەزیر پیرۆزبایی لە هەردوو براکە کردو لەو سەرکەوتنەیانداو وتی :

کە ئێمە لە پێناوی خوادا شەڕمان کرد... خوایش سەری خستین و دوژمنان دۆڕان .وەرن با.. شوێنیان بکەوین و کۆڵیان لێ نەدەین . بەڵکو: خوایش ئاواتمان بێنێتە دی وهەر هەموویان بکوژین . ئێوە بە ئەو پاپۆڕانە.. بە دەریادا لەشکر بەرن . ئێمەش بە زەویدا.

ئەم شیعرەیشی وت :

| | |
|---|---|
| باشترین کارێك دوژمن کوشتنە | بەسەر ئەسپەوە هەر خوێن ڕشتنە |
| با لە یارەوە نامەیشت بۆ بێ | مەیدان هی شەڕ و مەرگ و مردنە |

( دندان ) وتی :

پەنا بە خوا... لەو سەرکەوتنە: چەند ئازیزە ! یان شاد بوون . بە خاتوو ( ئیبریزە ) .

(ضوءالمكان) فەرمانی بە سوپای ئیسلام دا . بەرەو شاری ( قوستەنتەنیە ) بڕۆن . دوای شەش ڕۆژەرێ و بە ماندوێتی و تینوێتی گەیشتنە مێرگێکی پان . کە سەیرانگایەك بوو بۆ خۆی . پڕ بوو لە ئاسك و مراوی و پڵنگ و باڵندە و گورگ و ڕێوی . سەیری ئەوکانی و

تافگەیان کرد ..

ئەو هەموو میوە جوان وشیرینە
سەیری ئەو رەز و باخە جوانانە
بۆ هەر لایەکی ، لا دەکەیتەوە
رووبار وەك لێوی کیژی گوڵبەدەم
دڵۆپەی شەونم بە لق و پۆوە

شێوەی بەهەشتی سەر رووی زەمینە
دەڵێی فەرشێکی سەوزی رەنگینە
کانی و تافگەیە و زەوی بەرینە
لق و بەری دار ، چەندە نەخشینە !
وەك زێڕ و زیوە و تاجە گوڵینە !

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

شەوی ۹۵

شەهرەزاد وتی :

کە چووالمکان ئەو مێرگ و رەز و گوڵ وگوڵزار و بولبولی هوزارەی بینی بە شرکان ی برای وت :

لە هەموو شاری (دیمەشق )دا شوێنی ئاوا خۆش نی یە..! (۳) رۆژ لا دەدەین باخۆمان و سویاکەمان بحەوێنینەوە.. گوڕ و تینیشمان بەرامبەر دوژمنان پێدا بێتەوە .

کاتێکیان زانی غەڵبە غەڵب لە دوورەوە دەهاتە گوێ ! کە ( ضوءالمکان) پرسی .

وتیان :

کاروانی بازرگانانی وڵاتی (شام )ن . ئەوانیش بۆ حەوانەوە لایان دابوو. رەنگە گەر تووشی لەشکرێك ببوونایە رووتیان بکردنایەتەوە . لە وڵاتی ( رۆم )یشەوە هاتوون .

دوای ماوەیەك هاتنە پێشەوە. دەستیان کردە هاوار وکڕووزانەوەو پەنا.. بردنە بەرپاشا .

کە ( ضوءالمکان) بیستی یەوە فەرمانیدا.. بیان هێنن !

کە هێنایانن وتیان :

ئێمە لە وڵاتی ( نەسرانیان ) بووین و رووتیان نەکردینەوە..! چۆن دەبێت کە برا موسڵمانەکانمان.. لە وڵاتی خۆماندا رووتمان بکەنەوە؟ ئیدی هەر چیەکمان پێ بوو لێیان سەندین !

فەرمانی پاشایەتی وڵاتی ( رۆم )یان .. پیشان دا .

( شرکان ) کە خوێندیەوە وتی :

بێخەم بن .. هەرچەندە شت وەکی بازرگانیتان بۆ وڵاتی ( رۆم ) بردووە . سامان و پارەکانتان بۆ دەگێڕمەوە .

ئەوانیش وتیان :

قوربان قەدەری خوا ، ئێمەی گەیاندە ئەوێ ! دەستکەوتێکمان بوو.. کە تا ئێستا دەست

کەس نەکەوتووە... تەنانەت لە( غەزا)کانی خۆتاندا دەستتان نەکەوتووە !

( شرکان ) پرسیی : ئەو شتە چی یە دەستتان کەوتووە!؟

ئەوانیش وتیان :

دەبێت ، هەر بە خۆت بڵێین و بەس ! چونکە ئەگەر خەڵکی گوێیان لێ بوو، ئیدی هەواڵەکە بڵاو دەبێتەوە . دواتر.. دەگاتەوە، وڵاتی رۆم و دوور نییە بمانکوژن!! خۆیشیان سندوقەکەیان لە شوێنێك شاردبووەوە ، پیرەژنە سەر ئاسنینەی تێدا بوو. ناچار شرکان و ضوءالمکان بردیاننە ژوورێکی چۆڵ و بەسەرهاتی خواناسەکەیان ، وەکو خۆی بۆ گێڕانەوە و دەگریان .

بۆیە هەردوو براکەیش لەگەڵیاندا گریان . پیرەژنە قەشەی فێڵاوی چۆنی رێگا بۆ دانابوون وایان کرد.

ضوء المکان پرسیی : ئاخۆ... ئەو خواناسەتان رزگار کردووە لە کڵێسەکە : یان.. نا !!؟

ئەوانیش وتیان :

رزگارمان کردو لە ترسی خۆمان زێوانی کڵێسەمان کوشت .. ئەمجا پەلەمان کرد لە چوونە دەرەوە لە وڵاتی رۆم . هەندێ لە خواناسان ، هەواڵیان داپێمان کە کڵێسەکە ، هەندێ گوڵدان و پیاڵە و پەرداخی زێڕینی بە نرخی تیایە . دواتر سندوقەکەیان هێنایە بەردەم و پیرەژنە سەر ئاسنینەی فێلاویان هێنایە دەرەوە . هەمووگیانی شین هەڵگەڕابوو. پێوەنی لە پێ کرابوو.. کە ( ضوءالمکان) و دەورو بەرەکەی سەیری پیرەژنەیان کرد . وایانزانی پیاوێکی خواناسە. نێو چاوانی دەبریسکایەوە . بە ئەو مەرهەمەی زووتر بۆ ئەو مەبەستە لێی دابوو .

هێندەی ترمتمانەیان پێدا: کە پیاوێکی خاسە و خواناسە . (شرکان) و براکەی دەستیان بەگریان کرد .

پیرەژن وتی :

مەگرین ..من رازیم بە سزای خوا.. رەنگە تاقی کردبێتمەوە! هەرکەس ئارام نەبێت ، لە تووش بوونی بە بەڵاوە ، ئەوا: ناچێتە بەهەشت ! پێم خۆشە گەڕامەوە وڵاتی خۆم .. نەك لەبەر ئەوەی لە مردن رزگارم بوو . بەڵکو لەبەر ئەوەی ببمە خۆڵی ژێر پێی موجاهیدە موسڵمانەکان! شەهیدان نامرن و زیندوون . ئەوەتا وتراوە :

لەگەرمەی جەنگدا وەك کێوی توور بووی    بۆگفتوگۆی خوا: تۆ چەندە سوور بووی

ساحیران پەتی خۆیان فڕێ دا..    عەسات فڕێ دا و لە خەمی دوور بووی

لە شەڕدا هەندێ ئایەتت کە خوێند    دەرکەوت کە چەندە ئازا و جەسوور بووی

کە پیرەژنی فێڵباز لە شیعرەکە بووەوە . فرمێسکی تیمساحانەی لە چاوان : داوەران ..! نێو چاوانیشی دەبریسکایەوە . ( شرکان ) دەستی ماچ کرد . دواتر سفرەیان بۆ رازاندەوە .

ئەویش خواردنەکەی نەخوارد و وتی :

(١٥) ساڵە ڕۆژووم نە شکاندووە . ئێستاش نان ناخۆم . خوا لە ژێر دەستی ( ڕۆم )ە کافرەکان ڕزگاری کردووم ..! پەلەم نی یە و ئێوارە ڕۆژووەکەم دەشکێنم .

بۆ ئێوارە ، ( شرکان ) و ( چووالمکان) هاتنە لای و خواردنیان بۆ هێنا و پێیان وت :

خواناس .. فەرموو نان بخۆ.

پیرەژنەش وتی :

ئێستا کاتی، پەرستنی مەلیکی دەیانە و کاتی نان خواردن نی یە .

سێ شەو و سێ ڕۆژ ئەمە حاڵی بوو. هەمیشە لە (خەڵوەت)دا بوو . خەریکی نوێژ کردن بوو . کە ( ضوءالمکان ) بەم شێوەی دەی بینی . هێندەی دی لای خۆشەویست بوو..!

بۆیە بە ( شرکان )ی برای وت :

با.. لەو دەشتەدا، دەوارێکی بۆ هەڵبدەین و خزمەتکاری بۆ دابنێین ، پەزێرایی بکات .

ڕۆژی چوارەم داوای خواردنی کرد . ئیدی سفرەیان بۆ ڕازاندەوە..لەو هەموو خواردنە..نانێك و کەمێ خوێی خوارد بوو .

نیەتی ڕۆژووی هێنایەوە وشەو هەستایەوە، بۆ شەو نوێژ.

( شرکان ) بە ( ضوءالمکان )ی برای وت :

ئەم پیاوە، خۆی لە خۆشی یەکانی ئەم دنیا گرتووەتەوە . ئەگەر لەبەر( فرج)ی جیهاد نەبووایە ، لەگەڵیدا تا مردم خواپەرستیم دەکرد . وا دەچمە دەوارەکەیەوە و هەندێك قسەی لەگەڵ دەکەم .

( ضوءالمکان )یش وتی :

منیش وەك تۆ حەزم لەخواپەرستیە بەڵام دەبێت سبەینێ سوپا بخەینە ڕێ بەرەو ( قوستەنتەنیە ) . لەبەر ئەوە کاتی ئەوەمان نی یە .

( دندان )ی گەورە وەزیریش وتی :

منیش حەز دەکەم لەگەڵیدا دابنیشم . تاکو داوای لێ بکەم ، بۆم بپاڕێتەوە، کە لە و(جیهاد)دا شەهید ببم . یان .. خۆم لە دنیا بگرمەوە .

شەو خۆیان کرد بە دەواری ( پیرەژنە ) سەر ئاسنینەی فێڵاویدا. سەیریان کرد، لەسەر بەرماڵە و نوێژ دەکات . ئەمانیش دەستیان کردە گریان و پیرە ژنەش .. خۆی تێیان نە دەگەیاند و هەر خەریکی نوێژکردنی خۆی بوو و تاکو نیوەشەو ئەمە حاڵی بوو .

دواتر سڵاوی نوێژی دایەوە و بەخێرهاتنی کردن و پرسیی : چۆنە .. هاتوون ؟

ئەوانیش وتیان :

ئەی پیاوە خوا ناسەکە .. ئەی گوێت لە گریانی ئێمە نەبوو؟

ئەویش وتی : هەر کەس لە بەرامبەر خوادا بووەستێت : ئاگای لەم دنیا نامێنێت !

ئەوانیش وتیان :

حەزدەکەین هۆی دیل و بەند بوونت بۆمان بگێڕیتەوەو نزامان بۆ بکە .. چونکە لە مولکی قوستەنتەنیە بە نرخ تریت بۆ ئێمە .

ئەویش وتی :

بەو خوایە ..گەر سەرۆکی سوپای ئیسلام نەبوونایە... هەرگیز بۆم نەدەگێڕانەوە . چونکە سکالای خۆم تەنیا لای یەزدان دەکەم . ئێستاش هۆی بە دیل گیرانەکەمتان بۆ دەگێڕمەوە .

ئەوە بزانن کە لەگەڵ هەندێك لە خۆشەویستانمدا لە ( قودس ) بووم . هەرگیز خۆم لەوان بە گەورەتر نەدەزانی . چونکە ئەم سیفەتە و خۆ گرتنەوە لە خۆشیەکانی ژیان خوا پێی بەخشیوم . وا ڕێکەوت شەوێکیان ڕووم کردە دەریا و بە پێ بە سەریدا ڕۆیشتم ..!

سەرم لە خۆم سووڕما! بە خۆم وت :

کێی تر دەتوانێت وەکو من بە سەر دەریادا بڕوات..!؟ لەو کاتەوە ، خوا..تلانمیەوە بە حەز کردن لە سەفەر و تۆڵەی ئەو لەخۆبایی بوونەی لێ کردمەوە! هەر بۆیەش سەفەرم کرد بۆ وڵاتی ( ڕۆم )..! یەك ساڵ بە نێویدا سووڕامەوە . شوێنێکی پیرۆز نەماوە، خوا پەرستیم تیا نەکردبێت..!!

کە گەیشتمە ئەو ئەشکەوتە دوای ئەوەی بە شاخەکەیدا سەرکەوتم . لەوێ (کڵێسە)یەکی تیابوو ، لەگەڵ (قەشە )یەکدا کە ناوی مەتروحەنایە : بووم بە هاوڕێ .

دەستەکانی ماچ کردم و کڕنووشی بۆ بردم و وتی :

لەوەتەی ، هاتوویتە وڵاتمانەوە ، تۆم بینیوە ! حەز بە بینینی وڵاتە ( ئیسلام )یەکان دەکەم .

دەستی گرتم و بردمی یە (کڵێسە)کەوە . لەوێیشەوە بۆ ژوورێکی تاریك . منی فریو داو هێندەم زانی دەرگای لەسەر داخستم !

(٤٠) شەو لەوێدا مامەوە . بێ خواردن و خواردنەوە . وای نیاز بوو: وردە وردە لە برسانا بمرم . وا ڕێکەوت ڕۆژێکیان ( بەترێرك )ێك هاتە (کڵێسە)کەوە . کە ناوی (دقیانوس) بوو . (١٠) خزمەتکاری لەگەڵداو کچێکیش کە ناوی (تماپیل) بوو و لەجوانیدا وێنەی کەم بوو. هەر کە هاتنە ناو کڵێسەوە، قەشە ( مەتروحەنا ) هەواڵی منی پێ وتن .

ئەویش وتی : بیهێنە دەرەوە .

قەشە مەترووحەنایش وتی :

ئێستا ئەوەندەی گۆشت پێوە نەماوە کە باڵندەیەك تێر بکات . ئەویش دەرگای ژوورە تاریکەکەی لەسەر کردمەوە . منیان بینی وەکو (میحراب )ەکەیان قنج وقیت وەستاوم و نوێژ دەکەم . (زکر) و نزا و پاڕانەوە دەکەم .

( مەتروحمنا ) وتی :

ئەمە .. ساحرێکی گەورەیە !

هەموویان خۆیان کرد بە ژووردا! (دقیانوس) و هاورێکانی زۆریان لێدام و مردنی خۆم بە ئاوات خواست !

منیش لە دڵی خۆمدا وتم :

*( ئەمە سزای ئەو کەسانەیە کە : بە خۆیان دەنازن .خۆیان بە نیعمەتەکانی خواوە هەڵدەکێشن .)* .

ئەی ( نەفس ) نازانیت ، خوا غەزەب لەو کەسە دەگریت کە خۆی بە زل دەزانێت ؟ دەیخاتە دۆزەخەوە .

دەست و قاچیان بە زنجیر بەستم و خستمیانەوە ، شوێنەکەی خۆم . کە ژێر زەمینێك بوو، لەو خانووە تاریکەدا . هەر(٣) رۆژ و یەك کولێرەی (جۆ) و گۆزەیەك ئاویان دەدامێ . مانگێ یان دوو مانگ جارێك و (بەترێرك) سەرێکی دەدایین .

( تاپیل ) کچی گەورەی بوو. چونکە کە هێنایان و یەکەم جاربینیم ( ٩) ساڵان بوو . (١٥) ساڵیش بەند کرابووم . کەوابوو ، تەمەنی گەیشتبووە (٢٤) ساڵان . نە لە وڵاتی ( رۆم ) و نە لە وڵاتی خۆماندا، جوان و شۆخی وا نەبوو.

باوکی لەوە ترسابوو . کە پاشا بە زۆرلێی بسەنێت ! خۆی بەخشی بوو بە حەزرەتی (مەسیح) .

بۆیە بە بەرگی پیاوانەوە، لەگەڵ باوکی بە سواری دەهاتە دەرەوە . کەس نەیدەزانی کە کیژۆڵەیە..!

باوکیشی هەرچی سامان و پارەی هەبوو لەو کڵێسەیەدا، شاردبوویەوە . وا باوبوو : هەرکەسێك پارەی هەڵبگرتایە ، دەی بردە ئەو کڵێسەیە . بۆیە : هەموو جۆرێکی زێڕ و زیوی تیابوو..! لەگەڵ چەندین شتومەکی نەختینە .. کە لە زێڕو زیو دروست کرابوون . پێم وایە.. بۆ موسڵمانان رەوایە بیبەن و لە رێی خوادا خەرجی بکەن . بە تایبەتی بدرێتە..موجاهیدەکان .

کە ئەو بازرگانانە ، گەیشتنە ( قوستەنتەنیە ) بارەکانیان فرۆشت . خوا ئەو (کەرامەت )ەی منی پیشان دان . ئەویش بە هاتنە قسەی وێنەی سەر ئەو دیوارە . ئیدی ئەوانیش هاتنە ئەو ئەشکەوتەی شاخ و هاتنە ئەو (کڵێسە )یەی کە منیان لە ژێر زەمینەکەیدا بەند کرد بوو . ( قەشە )یەکیان بە ریشەکەی خۆی بەکێش کرد و کوشتیان ... دوای ئەوەی شوێنی منیان لە ژێر زەمینەکەدا پیشان دان منیان رزگار کرد . ئیتر منیان لەگەڵ خۆیان هێنا و زۆر بە پەلە و خێرا ... لە ترسی تۆڵە سەندنەوەی رۆمەکان ، لە وڵاتی ( رۆم ) چوونە دەرەوە !

شەوی دواتر ( تماثیل ) هەر وەکو جاران .. دێت بۆ کڵێسەکە . بە دوایدا باوکی و پیاوانی دێن بۆ پاراستنی کیژەکە . گەر دەتانەوێت ئەم راستیانە ببینن: لەگەڵ خۆتان با بچین ! تاکو دەست بگرین بەسەر ئەو هەموو زێڕ و زیوەی ناو کڵێسەکەدا . بمبەن.. با کچەکەی وگەنجینەی دقیانوستان بدەمە دەست ! بە راستی ئەو سامانە ، هەر شایانی شا ( ضوءالمكان ) و میر شرکانە!

کە ئەمەیان بیست تەنیا دندانی وەزیر نەبێت . زۆریان پێخۆش بوو ! چونکە ئەویان بڕوای پێ نەکرد و گومانی لێی هەبوو و ئەمەیش بە روویەوە دیار بوو . بەڵام لەبەر خاتری پاشا.. هیچی بۆ نەوترا .

پیرەژنە سەر ئاسنینەی فێڵباز وتی :

دەترسم قەشە لە مێرگەکەدا سوپای ئیسلام ببینێ و نەوێرێت بێتە ناو کڵێسەکەوە . سوڵتان فەرمانیدا بە سوپا بەرەو ( قوستەنتەنیە ) بڕۆن .

( ضوءالمكان) وتی :

مەبەستم ئەوەیە (١٠٠) سوارە بەرین و چەندین هێستر . تا بچینە ئەو شاخە و لە کڵێسەکەدا هەرچی زێڕ و زیو هەیە باریان بکەین و بیان هێنین .

بە خەزنەدار و سەرکردەکانی ( تورك ) و( دەیلەم )یشی وت :

بەیانی بەرەو ( قوستەنتەنیە ) ببنەوە . ( خەزنەدار) تۆیش ببە بە جێگرم وکارەکە هەڵسوڕێنە . ( رۆستەم ) تۆیش جێگری ( شرکان )ی بەرام بە . مەهێڵن کەس بزانێت . دوای سێ رۆژ ئێمەیش دەگەینە لاتان .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

## شەوی ٩٦

شەهرەزاد وتی :

ضوءالمكان و براکەی و دندان و (١٠٠) سوارەیان هەڵبژارد و چەندین هێستر بۆ هێنانەوەی زێڕ و زیو و پاشماوە دێرینەکان . کە رۆژ بووەوە ( خەزنەدار )ی بانگ کرد و فەرمانیداو سوپای ( ئیسلام ) کەوتە رێ .

وایان دەزانی شرکان و پاشای برایان لەگەڵدایە و نەیاندەزانی ئەوان بۆ کڵێسەکە چوون . ئەمان بەم حاڵە و شرکان و برای و دندانی وەزیر ئەو رۆژە لەوێ مانەوە . لە ژێرەوە پیرەژنە فێڵاوی تەگبیری بۆ پیاوەکانی کرد . کە چی بکەن و رەوانەی کردن .

کە دنیا تاریك بوو ( پیرەژنە ) هەستا و بە ( ضوءالمكان) و هاورێکانی وت :

دەی .. هەندێ لە سوارەکان بێنن و شوێنم بکەون ، بەرەو شاخەکە . (٥) سوارەیان هێشتەوە و ئەوانیتر شوێن پیرەژنە فێڵاوی کەوتن .

( ضوء المكان )یش لەدڵی خۆیدا وتی :

پەنا بە خوا .. ئەم خواناسە چەند بڕوای بە خۆیەتی .. شتی وام نەدیوە..!!

لەولایشەوە پیرەژن بە کۆتری نامەبەردا . نامەیەکی نارد بۆ ( شا ئەفرەیدون )ی ( رۆم ) و پێی وت کە ( ١٠٠٠٠ ) سوارەی جەنگاوەری بە توانا بنێرێتە ئەو دیوی شاخەکە . با.. کەس نەیان بینێت . وا منیش لێرەوە پاشای موسڵمانانتان بۆ دێنم ! ئەوان و دندانی گەورە وەزیرانم فریو داوە لەگەڵ ( ١٠٠ ) سوارەی جەنگاوەریانداو دەیان هێنمە لاتان ! ( مەتروحەنا )ی ( قەشە )یش دەکوژین ! وا نەکەم فێڵەکەم بۆ جێ بەجێ ناکرێت ! ئێوەش کارێك بکەن.. ( *فوو لە ئاگرکەرەیەکی موسڵمانان نەگەرێتەوە وڵاتی خۆی* .) .

کۆتری نامەبەر گەڕایەوە وڵاتی ( رۆم ) . بردیان بۆ لای شا ( ئەفرەیدون ) و ئەویش فەرمانی بۆ سوپا دەرکرد بەرەو شاخەکە بە خۆیان و ئەسپ وهێسترەوە ، بڕۆن و لە قەڵایەکدا خۆیان بشارنەوە .

ئەمان ئەمە حاڵیان بوو و لەولایشەوە شا (ضوءالمكان) و ( شرکان)ی برای و ( دندان )ی گەورە وەزیر و جەنگاوەرانیان کە گەیشتنە کڵێسەکە ، چوونە ژوورەوە . ( مەتروحەنا )ی قەشە بەرەو روویان هات . ( زاهید )ەکە ، فەرمانیدا بیکوژن . بە شمشێر ئەنجن ئەنجنی بکەن..!! ئەمجا بردنی یە سەرخەزنەکە . لە سندووق و گونیەدا هەموو پاشماوە دێرینەکان و زێڕ و زیویان پێچایەوە و باریان کرد .

لە ترسی موسڵمانان نە ( تماپیل) و نە باوکی نەهاتن . ( ضوءالمكان )یش تاکو (٣) رۆژ چاوەڕێی کرد .

( شرکان ) وتی :

بەو خوایە ... بیر و هۆشم هەروا بەلای سوپای ئیسلامەوە . نازانم حاڵیان چۆنە !؟

براکەیشی وتی :

ئێمە ئەم سامانە زۆرەمان دەست کەوتووە . بڕوا ناکەم لە ترسی ئەو تێکشاندنەی سوپاکەیان نە (تماپیل ) و نەکەسی تر بێنە ئێرە . وا باشە .. بە هێندە رازی بین و روو بکەینە ( قوستەنتەنیە) .

بەلاپاڵی شاخەکەدا هاتنە خوارەوە . هەرچی پیرەژنە سەر ئاسنینەی فێڵاویش بوو لە ترسی دەرکەوتنی فێڵەکەی نەی وێرا هیچ بڵێت .

رۆیشتن تاکوگەیشتنە دەروازەی گەل . پیرەژنە (١٠٠٠٠) سوارەی جەنگاوەری لە کەمیندا ، بۆ ئامادە کرد بوون. هەر ئەوەندەیان زانی چواردەوریان گرتن و رووی رمەکانیان تێکردن . کە ( ضوءالمكان ) و( شرکان) و ( دندان )ی گەورە وەزیر سەیری ئەو هەموو سەربازانەیان کرد .

لە یەکتریان پرسی : ئاخۆ.. کێ هەواڵی ئێمەی پێداون !!؟

( شرکان ) وتی : ئێستا کاتی ئەم پرسیارە نی یە .کاتی شمشێر وەشاندن و تیربارانە و ورەتان بەرز بێت . بڕواتان تۆکمە .

ئەم شوێنە (٢) دەربەندی بۆ هەڵ هاتن تێدا هەیە . هەر دووکیان ... تەنگە بەرن ! ئەگەر نەکەوتینایە کەمینیانەوە (١٠٠٠٠٠) سەربازیش بوونایە .. لەناوم دەبردن ! بەڵام بڵێم چی!؟

( ضوءالمكان )یش وتی :

گەر دەمزانی وامان بە سەر دێت (٥٠٠٠٠ ) سوارەم لەگەڵ خۆم دەهێنا !

دنْدانی گەورە وەزیریش وتی :

ئەگەر (١٠٠٠٠٠) سەربازیشمان لەگەڵ بوایە . لەم شوێنە تەنگەبەرەدا : هیچمان بۆ نەدەکرا !

بەڵام.. خوا هەر دەبێتە پشت و پەنامان ! من دەزانم چەند تەنگەچیکەڵانە و بێ تەحەمولە !! ئاگاداری ڕێگاکانیشم ! چونکە کاتی خۆی لەگەل لەشکری ( ئیسلام ) لەم وڵاتەدا، لەناو سوپای شا( عومەری کوڕی نعمان )دا بووم . ئەو کاتەی گەمارۆی شاری قوستەنتەنیەمان دابوو. کانی و ئاوی تیایە لە بەفر ساردترە .

هەستن ، با بەرێ بکەوین و توولە ڕێگاکان بگرین . پێش ئەوەی سوپای تریش بگەنە سەرمان : خۆمان دەرباز بکەین . ئەوان بچنە سەر چیاو لەوێوە تاشە بەردی گەورە گەورەمان بە سەردا تلۆر بکەنەوە ، ئەوا هەمووومان پارچە پارچە دەبین .

پیرەژنە فێڵبازی (خۆ گرەوە)یش وتی :

ئەم ترس و لەرزە چی یە..!؟ ئەی ئێمە گیانمان نەبەخشیوە بە خوا و (جیهاد) ناکەین؟ من (١٥) ساڵ لێرە بەند کراوم . (جیهاد) بکەن لە ڕێی خوادا . هەرکەس بکوژرێت ، بەهەشت دەبێتە جێ ی . نەش کوژرێت شەرەفمەند دەبێت . بە بەشدار بوون لەم شەڕەدا.

کە ئەمەیان لە زاهدەکە - ئەو پیرەژنەی کە خۆی کردبووە پیاو _ بیست : ترسیان لەدڵ دەرچوو و ورەیان بەرز بووەوە . خۆیان گرت ..تا ..لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کرایە سەر . شمشێریان خستە سەر ملیان .

سوپای ئیسلام شەڕێکی دلێرانەیان کرد . چووالمکان : پێنج پێنج و دە..دە سەری دەپەڕاندن . هێندەیان لە ( نەسارا ) کوشت کە لە ژماردن نەدەهات..!!

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

## شەوی ٩٧

شەهرەزاد وتی :

پیرەژنی فێڵباز، ئیشارەتی بۆ سوپای ( ڕۆم ) دەکرد . کە بێنە بەرامبەر (شرکان ) تا.. بەڵکو بتوانن بیکوژن . بەڵام خۆیان دەکوژران و نەیان دەتوانی (شرکان) بکوژن . کۆمەل

دوای کۆمەڵ لە سەر تەگبیری ( پیرەژن ) روویان لە (شرکان) دەکرد و تێ دەشکان و دەکوژران .

لە ( شرکان )یشدا وابوو.. کە بە هۆی بەرەکەتی ( زاهد )ەکەوەیە ! ئەو رۆژە تاکو ئێوارە جەنگان. شەوەکەی .. توولە رێ یەکیان گرت و هێندەمیان تاوێرە بەرد بەسەردا خل کرایەوە کە بەنارەحەتی رزگاریان بوو . ماندووی جەنگی رۆژیش بوون و (٤٥ ) جەنگاوەریان لێ شەهید بوو. دواتر کۆ بوونەوە و زۆر گەڕان بە دوای ( زاهد )دا: واتە ( پیرەژنە فێڵباز ) . بەڵام دیار نەما بوو.

ئەوانیش پێ یان ناخۆش بوو و وتیان : رەنگە .. شەهید کرابێت !

شرکان وتی :

من لە کاتی شەڕەکەدا.. دەم بینی ، دوژمنی رەحم دەکرد و جەنگاوەرانی خۆمانی هان دەدا و دوعای بە سەرماندا دەخوێند . ئەوان لەم قسانەدا بوون : کە ( پیرەژنە فێڵباز) پەیدا بوو . کەللە سەری گەورە قەشەی بە دەستەوە بوو.کە یەکێك لە تورکەکانی سوپای ئیسلام بە تیر کوشتبووی . پیرەژنە هاتە پێشەوە و کەللە سەرەی فڕێ دایە بەردەم ( شرکان ) و ( ضوءالمکان ) و ( دندان )ی گەورە وەزیر . ( شرکان ) لە خۆشی ئەوەی کە ( زاهد )ەکە ، زیندووە و لەم جەنگەدا سەلامەت بووە هەستایە سەر پێ و وتی :

سوپاس بۆ خوا ، کە سەلامەتیت ! ئەی (زاهد)ی خواناس .

پیرەژنە فێڵبازیش وتی :

کوڕەکەم .. من نزام کرد کە لەم ( جیهاد )ەدا شەهید بم . من خۆم فڕێ دەدایە ناو جەنگاوەرانی ( رۆم )ەوە . بەڵام ئەوان لێم دەترسان . کە ئێوەم بینی پاشەکشەتان کرد . غیرەت گرتمی و هەڵم کوتایە سەر قەشەکەیان و کوشتم و سەریم پەڕاند . ئەمە (١٠٠٠) جەنگاوەری لە ژێر دەستدا بوو و سەرۆکیان بوو . ئیدی یەکێکیان نەیوێرا، لەگەڵمدا بجەنگێت ! بۆیە (کەللە سەر)ەکەیشم هێناوە تاکو ورەتان بەرز بکەمەوە و شمشێرتان بۆ خوا بخەنە گەڕ. تاکو بەردەرگای قوستەنتەنیەش لەگەڵتان دێم . هەر لە رۆمەکان (٢٠٠٠٠) جەنگاوەرتان دێنم کە یارمەتیتان بدەن . تا ئەم پیاو خراپە رۆمانە لەناو بەرن !

شرکان پرسیی :

چۆن دەتوانیت بۆیان بچیت ؟ لە کاتێکدا دۆڵەکە پڕە لە جەنگاوەرانی سوپای ( رۆم )؟

پیرەژنە سەر ئاسنینەیش وتی : خوا..کوێریان دەکات لە ئاستم و نام بینن...! هەر کەسێکیش لەوان من ببینێت . خوا ترس دەخاتە دڵیەوە و شەڕم لەگەڵ ناکات . گەر وێرایشیان هاتن و منیان کوشت . ئەوا: لە ڕێگای خوادا تیاچووم .

شرکان وتی :

راست دەکەیت . ئەی (زاهد)ی خواناس . ئەگەر هەر ئێوارە بڕۆیت ، بۆ ئێمە باشترە.

پیرەژنە فێڵبازیش وتی :

زۆر چاکە ، هەر ئێوارە تێی دەتەقێنم . تۆیش ئەگەر دێیت.. وەرە ، خەمت نەبێت کەس نامان بینێت ! حەز دەکەیت براکەیشت بێنە . ئیدی کەسی تر نابەین . چونکە پیاوی خوا و دڵی خوا : لە (٢) کەس زیاتری بۆ غەیب ناکرێت !

( شرکان ) وتی :

من ناتوانم ، هاوڕێکانم بەجێ بهێڵم . بەڵام ئەگەر براکەم بێت ، ئەوە نارەزووی خۆیەتی.. ئەو شمشێری خوایە و قەڵغانی موسڵمانان ! ئەگەر دندانیش هات : بیبەن ، بەڵکو (١٠٠٠٠) جەنگاوەریش بێنن و ببنە پاڵپشتمان .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

## شەوی ٩٨

شەهرەزاد وتی :

ئەی شا شەهرەیار ... سەرگەورەو سەردار .

پیرەژن وتی :

مۆڵەتم بدەن .. تاکو بچم سەرێك لە دوژمنان بدەم : بزانم .. ئاخۆ ... بەئاگان !!؟

ئەوانیش وتیان : لەگەڵ تۆدا نەبێت .. ناچین بۆ جەنگ ..!!

ئەویش وتی : کەواتە ، رێم بدەن : با... هەواڵیان بزانم .

( شرکان )یش وتی :

دە .. برۆ و زوو وەرەوە .. چاوەڕوانی تۆین .

( شرکان ) بە براکەی وت :

گەر ئەم (زاهد)ە خواناسە نەبوایە ، کەس ئەو ( قەشە )یەی بۆ نەدەکوژرا . چونکە زۆر ئازا و پاڵەون بوو.

لە پڕێکدا پیرەژنە فێڵاوی خۆی کردەوە بە ناویانداو پەیمانی پێدان کە سەر دەکەون بە سەریاندا. ئەوانیش سوپاسیان کردو نەیان دەزانی ، ئەمە ( فێڵ )ە .

لێی پرسین : کوا ، چووالەکان لە کوێ یە؟

ئەویش وتی : ئەمەتام .. لێرەم .

ئەمجا وتی :

خۆت و وەزیرەکەت شوێنم بکەون .. بچین بۆ ( قوستەنتەنیە ) .

پیرەژنە فێڵاوی ( پیلان )ی لای ( رۆم )ەکان بۆ دانابوون . ئەوانیش وتبوویان : دڵمان چاك نابێتەوە لە تاو کوشتنی قەشەکەمان . تا.. پاشای موسڵمانان نەکوژینەوە.

ئەوەیش پێ وتن :

که گەر پاشای موسڵمانان بگرین ، یەکسەر دەیدەینە دەستی شا ئەفرەیدون .

ئەمجا پێش ( ضوءالمکان ) و ( دندان )ی گەورە وەزیر کەوت و بە دەم ڕێوە پێی وتن :

وەرن پشت بە خوا.. با بڕۆین .

لەسەر تەگبیرەکەی ( پیرەژنە فێڵباز) ڕۆیشتن .. تا گەیشتنە دەربەندەکە و ناوەڕاستی سوپای ڕۆم . سوپاکە دەستی نەهێنایە ڕێگایان ..کە( ضوءالمکان ) و( دندان )ی گەورە وەزیر بینیان سوپای ڕۆم هیچ ناکەن و بگرە یارمەتیان دەدەن .

دندانیش وتی :

بەڕاستی ئەمە نیشانەی هەبوونی کەرامەتی ئەم زاهدەیە! دیارە .. ئەمە وەلی خوایە !

( ضوءالمکان )یش وتی :

نەخێر..دوژمنانمان خۆیان کوێرن ! ئەگەرنا بۆچی ئێمە ئەوان دەبینین؟ کەچی ئەوان ئێمە نا بینن !؟

لە کاتێکدا ئەوان باسی کەراماتی ( زاهد )ەکەیان دەکرد . سەربازانی ڕۆم پەلاماریانـدان و بە دیل گیران !

ئەمجا لێیان پرسین : کێی ترتان لەگەڵدایە؟

ئەوانیش وتیان :

ئێمە کەسی تر نابینین ..!

ضوءالمکان یش وتی :

کەواتە ... ئەمە غەزەبی خوایە ! بەسەرمان هات .

کەلەپچەیان کردە دەستیان . سەیریان کرد ( زاهد )ەکە ون بوو !

ئەمجا بە خۆیان وت :

لەمە زیاتریش دەهێنین..!

ئەمە حاڵی گەورە وەزیرەکەی بوو. لەولایشەوە شرکان ئەو شەوە لە شوێنی خۆی مایەوە کە ڕۆژ بووە ، فەرمانیدا سوپا کەوتە ڕێ . تا بچن ڕوو بە ڕووی سوپای ڕۆم ببنـەوە .. دوای ئەوەی قسەی بۆ کـردن و ورەی بـەرز کردنـەوە . بـەڕێوە بـوون تـاکو گەیشتنە بەرامبـەر سوپای دوژمن .

ڕۆمـەکان هـەواڵی گـرتنی ضـوءالمکان و دنـدانی سـەرۆك وەزیرانیـان دا بـە سـوپا و هاواریشیان کرد:

پاشا و سەرۆك وەزیرتان گیراوە .

گەر نیازتان بێت کەوا بجەنگن .. لە ناوتان دەبەین ! بۆتان هەیە نەگەڕێنەوە و لە وڵاتی ئێمە بمێننەوە ! هیچ خراپەیەکتان لەگەڵ ناکەین ، ئەمەش دوا بڕیارە .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو ورەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

## شەوی ٩٩

شەهرەزاد وتی :

کە ( شرکان ) ئەمەی بیست زۆر ترساو لە خۆی پرسیی :

ئاخۆ چۆن گیرابن !؟ بلێی لە فەرمانی ( زاهدە )کە هەڵگەڕابنەوە؟

سوپای ئیسلام لێیان راپەڕین و خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتن . لەو رۆژەدا، شمشێر و قەڵغان تێك ئاڵانەوە . بە ئاسانی ئازاو ترسنۆك لێك جیادەکرانەوە ! هەر وەك گەلەگورگ سوپای رۆم پەلاماری سوپای ئیسلامی دا، شرکان و یاوەرانیشی شەڕێکی وێرایان کرد . ئەو دۆڵە بە لاشەی کوژراوان داپۆشرا. لافاوی خوێن هەستا . کە تاریك داهات سوپاکان لێك جیا بوونەوە . بۆ شوێنی خۆیان چوونەوە . سوپای ئیسلام شکست خواردن و ماندوو بوونیان پێوە دیار بوو . بەشێکی کەمیان گەڕابووەوە .

ئەو رۆژە (٣٥) جەنگاوەریان لێ شەهید ببوو. لە رۆمەکانیش بە هەزاران کوژرا بوون .

رۆژی دواتر شرکان لە پاشماوەی سوپاکەی پرسی :

ئاخۆ: چی بکەین!؟

ئەوانیش وتیان : خۆمان دەدەینە دەست خوا و دەجەنگین .

شرکانیش پێی وتن :

بە قسەی من دەکەن .. با چەند شمشێر بە دەستێك لە دەمی دەربەندەکەدا، بوەستن : بەرگری لە هاتنە ناوەوەی سوپای ( رۆم ) بکەن .. بەڵکو زاهدەکە (١٠٠٠٠) جەنگاوەرەکانمان بۆ بێنێت و بگەنە سەرمان و فریامان بکەون . سوپای ( رۆم )یش نەیان بینن ! تا دەگەنە لامان .

سوپای ئیسلام پیلانی شرکانی جێ بەجێ کرد . هەر لە بەیانیەوە تاکو تاریکی شەو ، لە دەرگای دەربەندەکەدا، هێرشی رۆمەکانیان شکاند . شەوەکەی کۆبوونەوە . شرکان جەنگاوەرانی ژمارە کردو بۆی دەرکەوت کەوا ( ٢٥) کەسیان مابوونەوە .

رۆمەکانیش لە خۆیان دەپرسی :

ئەمە چ جەنگێکە؟ بێزار بووین و کۆتایی نەهات !

هەندێکیان وتیان :

بۆچی بەم شەوە هێرش نەکەینە سەریان؟ خۆ.. رەنگە هەر (٢٥) جەنگاوەرێکیان مابێتەوە! ئەگەر هەر بۆمان نەشکان . چوار دەوریان ئاگر دەدەین ! ئیدی خۆیان دەدەن بەدەستەوە و بە ( دیل ) دەیان گرین . خۆیشیان نەدا.. بە دەستەوە . ئەوا دەبن بە سووتەمەنیی ئاگرەکە و عیبرەت بۆ مێژوو.

دار و پەردوویەکی زۆریان گەیاندە دەمی دەربەندەکە و گڕیان تێبەردا . شا( شرکان) و جەنگاوەرانی...

ناچار خۆیان دا بە دەستەوە .
گەورە قەشە هات و پێ ی وتن :
دەبێت ..بدرێنەوە بە شا( ئەفرەیدون ) . چارەنووستان لای ئەوە .
ئێمەن و سبەی دەتان گەیەنینە ( قوستەنتەنیە ) و دەتان دەین بە دەست شاوە . ئەمشەو میوانی
دەکات ، با بیکات . چیتان لێ
جەنگاوەرانیش وتیان : قسەکەت .. پەسەندە .
قۆڵبەستیان کردن و چاودێریان بە سەریانەوە دانا . ئەو شەوە دەستیان کردە
خواردنەوە و ئاهەنگ گێڕان . شرکان و چووالمکان ی برای و پاڵەوانانی ( ئیسلام ) دیل
بوون .
شرکان لە براکەی پرسی : چۆن ، خۆمان رزگار بکەین ؟
براکەیشی وتی :
چوزانم .. ئەوەتا.. وەکو بولبولی نێو قەفەزمان لێ هاتووە .
( شرکان ) زۆر تووڕە بوو بوو. تەکانی دایە خۆی تا.. قۆڵە بەستراوەکانی کرانە وە
.کلیلەکانی تری لە سەرۆکی چاودێرەکە دزی و هەموویانی کردەوە . ئەمجا دەستی هەموو
جەنگاوەرانیان کردەوە .
شرکان بە براکەی و وەزیری وت :
ئێستا سێ لەو پاسەوانانە ، دەکوژم و بەرگەکانیان دەهێنم .. تا لەبەریان بکەین بە
ناویاندا دەرۆین.. بێ ئەوەی بمان ناسنەوە .
( ضوءالمکان )یش وتی :
من ئەو کارە بە باش نازانم .. چونکە هەر بە ئاگا هاتن و پێیان زانین : دەمانکوژن .
باشترین کار ئەوەیە لێرە دەربچین و خۆمان بکەین بە دەربەندەکەدا. بێدەنگ لە ناو
تاریکی شەودا خۆیان نقوم کرد . کە لە دەربەندەکە چوونە دەرەوە . هێندەی نەبرد چەند
ئەسپێکیان بینی بەسترا بووەوە . خاوەنەکانیان لێی نووست بوون .
شرکان وتی :
با ... هەریەکەمان سواری ئەسپێك ببین و بیبەین .
ئەوان (٢٥) کەس بوون . مەگەر خوا خۆی بزانێت . چۆن خەواندوونی ، ئەو سوپای
رۆمەی بێ ئاگا کردووە لە دنیا . شمشێر و تیر و کەوانەکانیشیان بردن و سوار بوون و بۆی
دەرچوون . ( رۆم )ەکان پێیان وابوو... کە کەس ناتوانێ دەست و پێیان بکاتەوە . ئەمانیش
گەیشتنەوە سوپاکەی خۆیان . سەیریان کرد هەموو بە تاسەوە چاوەڕوانیانن .
سەرۆك رووی کردە سوپاکەی وتی :
بێخەم بن خوا پەنامانە ... بیرۆکەکەیم هەیە .

ئەوانیش پرسیان : چی بکەین ؟

ئەویش پێی وتن :

بەرەو شاخ دەکشێین . بە ئەو دیویدا شۆڕ دەبینەوەو هاوار دەکەین : وا..سوپای ئیسلام چواردەوری گرتوون و خۆتان بدەن بە دەستەوە . ئیتر هەموو بە یەك دەنگ هاواردەکەین : الله اکبر .

ئەوانیش لەبەر سەرخۆشی و مەی خواردنەوە و ماندوو بوون و بێخەوی .. سەریان لێ تێك دەچێت و بەو شەوە تاریکە بەر دەبنە گیانی یەکتری و ئێمەش تێیان بەردەبین و لێیان دەکوژین .. تاکو بەرەبەیان ئەمە ئیشمان دەبێت .

( ضوءالمکان ) وتی :

ئەوە وا نابێت .. چونکە ئەگەر هاوار بکەین : (الله اکبر) دەمان ناسنەوە و شوێنمان دەکەون ، تاکمان لێ دەرناچێت !

شرکانیش وتی :

جا..با شوێنمان بکەون . ترسمان لە خۆمان نی یە .. زۆر حەز دەکەم ، بە قسەم بکەن ، چونکە خێری خۆمانی تیایە! بە قسەیان کرد و چوونە سەر شاخەکەو هاواریان کرد : ( الله اکبر) .

شاخ و دۆڵ و دارو بەرد ، لەگەڵیاندا.. خوایان (مەزن) گازندە کرد . کە رۆمەکان ئەمەیان بیست .

بەرگی جەنگیان پۆشی و یەکتریان بانگ کرد : سوپای ئیسلام هاتنە سەرمان..!

کەوتنە گیانی یەکتری و زۆریان لە خۆیان کوشت .کە دنیا روناك بووەوە . چوونە شوێنی دیلەکان .. بینیان کەسی لێ نەماوە ! سەرکردەکان بۆیان دەرکەوت . کە ئەو ترسە دیلەکان دروستیان کردووە .

فەرمانیان دا شوێنیان بکەون و نەهێڵن تاکیان لێ دەربچێت ! دوای کەمێك غارکردن بە سوپای ئیسلامدا گەیشتنەوە و چواردەوریان گرتن .

ضوءالمکان ئەمەی بینی ترسی لێ نیشت و بە براکەی وت :

ئەوەی لێی دەترسام روویدا.. ئیدی لە جەنگ کردن زیاتر هیچی ترمان بۆ ناکرێت.

شرکان بێدەنگ بوو .

ئەویش بە دامێنی شاخەکەدا هاتە خوارو هاواری کرد :

( الله اکبر ) .

جەنگاوەران بە دوایدا هاواریان دەکرد . گیان دەبەخشین بە یەزدان . دوژمنان لەو دوورەوە کە گوێیان لە ( الله اکبر) بوو. زۆر ترسان ..!

سەیری شوێنی دەنگەکەیان کرد . سوپایەکی زۆری ئیسلامیان بینی بە غار دەهاتن کە

ئەمانیش ئەو سوپایەیان بینی بۆ پشتگیریان هاتوون .. هێندەی تر ورەیان پەیدا کرد .
سوپاکەی رۆمیش ئەوانەیان بینی ورەیان رووخاو هەریەکەو بە لایەکدا هەڵاتن !
جەنگاوەرانی موسڵمانان شوێنیان کەوتن ! کەللەی زۆریان پەڕاندن . تاکو دنیا تاریک بوو.
راویان نان .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٠٠**

ئەمەرزاد وتی :

خۆرهەڵات . تا تاریکی شەو لا ببات .کە سەیریان کرد. ئەوە ( بەهرام )ی پێشەنگی ( دەیلەم )ە .

ئەوەش : پێشەنگ ( رۆستەم )ی لەشکری تورکانەو (٢٠٠٠٠) جەنگاوەری موسڵمانیان هێناوە . سەرکردەکانی ئەو سوپایە ( ضوءالمكان )یان بینی . دابەزین و سڵاویان لێ کرد .

ئەمجا شا پێی وتن :

مژدە بێت .. کە سوپای دوژمنتان شکاند .. بەهەشتی ئەو دنیاتان مسۆگەر کرد..!

هۆی هاتنی ئەو سوپایەی ئیسلام ئەوە بوو . ( رۆم )ەکان بیست بوویان سوپای ئیسلام هاتووە.. ئاڵاکانیان بە شەکاوەیی لە دوورەوە بینیوە . لە ترسانا وەکو کوللە هەڵاتوون و گۆرەپانیان چۆڵ کردووە و خۆیان لە ژێر زەمین و قەڵاکاندا ، خزاندووە . بە تایبەتی کە گوێیان لە( الله اكبر ) و( قورئان ) خوێندنیان بووە . ئیدی سوپای ئیسلام بە سەرکردایەتیی ( بەهرام ) و( رۆستەم ) لەو هەموو خۆ توند کردنەی سوپای رۆمەکان ترساون ! بۆیە پیلانیان داناوە کە نەجەنگن . چونکە سوپای رۆم زۆر زۆرترن و ئەمانیش نەچووالمكان شاو نە شرکانی برای و نە دندانی گەورە وەزیری لێ یە . دەترسان کە ئەوانەیان لەگەڵ نین : بشکێن و هەر هەموو جەنگاوەران بکوژرێن . جا.. باشتر وایە بگەرێنەوە بۆ شاخ و کڵێسەی قەشە ( مەتروحەنا) . سوپای پاشاو یاوەرانی بدۆزنەوە . لەگەڵ خۆیان بیان هێنن بۆ ئەم جەنگە گەورەیە . ئەوانیش بیرۆکەکەیان پەسەند کرد و (٢٠٠٠٠ ) جەنگاوەری بە توانایان هەڵبژاردو بەرەو کڵێسەکە بوونەوە . بەو شێوەیە کەوتنە فریای پاشا.

لەو لایشەوە ( پیرەژنە فێڵباز) کە چووالمكان و شرکان و دندانی وەزیری خستە کەمینی رۆمەکانەوە و بە گرتنی دان .

سواری ئەسپێك بوو بە رۆمەکانی وت :

دەمەوێت بچمەوە ناو سوپای موسڵمانان . فێڵیش لەوان بکەم و بڵێم .. سوپای ئیسلام لە چیا شکاون ! چونکە ئەمە بزانن .. ورەیان دەروخێت و یەکێتی یان هەڵدەوەشێتەوە .

دەست هەڵدەگرن لەو پەلامارەی قوستەنتەنیە . لەوێوە دەچمە لای شا( ئەفرمیدون ) پاشای قوستەنتەنیە . شا حەردوبی پاشای رۆمی کورم و ئەم هەواڵەیان دەدەمێ . ئیتر ئەوانیش سوپاکانیان رووبە ڕووی سوپای ئیسلام دەکەنەوە و لەناویان دەبەن .. ئەسپەکەی دایە چوارناڵەو ئەو شەوە بەڕێوە بوون .

بەیانی یەکەی سوپای بەهرام و رۆستەمی بینی.. بۆیە خۆی کرد بە دارستانەکەدا ئەسپەکەی بەستەوەو خۆی هاتە دەرەوە .

هەر دەهات و دەچوو دەیوت :

رەنگە سوپای ئیسلام لە قوستەنتەنیەوە بە شکاوی گەڕابێتەوە !

کە سەرنجی ئاڵاکانیانی دا، زانی سوپای ئیسلامن .

پیرەژنە بە راکردن بەرەو روویان چوو و هەر وەکو (شەیتان) ، هاواری کرد :

خێرا بکەن ، جیهاد بکەن .

کە ( بەهرام ) پیرەژنەی بینی ، بەرەو رووی چوو وکڕنووشی بۆ برد و پێی وت :

ئەی وەلی خوا چیت پێ یە !؟

( پیرەژنە فێڵباز)یش وتی :

هیچم لێ مەپرسە..! سوپای ئیسلام ، دوای دەست گرتن بەسەر سامانی کڵێسەی مەتروحەنادا ویستیان دەست بە سەر ( قوستەنتەنیە )دا بگرن . لەوێدا سوپایەکی تۆکمە و زۆر ئازا روو بە ڕوویان بووەوە .

پیرەژنە فێڵباز، بێخەمانە کەوتەوە قسە کردن :

بۆیە زۆربەیان تیا چوون . تەنیا (٢٥) جەنگاوەریان رزگاری بوو بوو..!

( بەهرام ) پرسیی :

ئەی وەلی خوا... تۆ کەی جێت هێشتن؟

ئەویش وتی :

هەر ئەمشەو .

بەهرام وتی :

( *پەنا بە خوا..کە ئاوا.. رێگاکانی بۆ تۆ کورت کردووەتەوە ! دیارە تۆ: دەیشفرێت !* )

بەهرام سواری ئەسپەکەی بووەوە بە سەرسووڕمان و گومانەوە وتی :

لا حول و لا قوە الا باللە . چاك ماندوو بوونەکەمان بە فیڕۆ چوو. ئەو کاتەی سوڵتانەکانمان بە دیل گیران ئێمە سنگمان فراوان نەبوو.کەوتنە ناو ئەو زەویە پان و بەرینانە و بە راست وچەپدا گەڕان .

دواتر گەیشتنە دەربەندەکە . ئەوە بوو: شا ضوءالمکان و میر شرکانیان دۆزی یەوە .

ئیدی ئەو سوپا مەزنە گەمارۆی سوپای رۆمیان داو هاواریان کرد : ( اللە اکبر) .

بەجۆرێك شاخ و کێوەکان دەنگیان دەدایەوە . کە ڕۆژ بووەوە یەکتریان ناسی یەوە و کڕنووشیان بۆ شا چووالمکان و شرکان برد . شرکان بەسەرهاتی دەربەندو کڵێسەکەی بۆ گێڕانەوە .

سەریان زۆر سووڕما! ئەم مقۆ مقۆیەیان کرد :

با.. بە پەلە روو بکەینە قوستەنتەنیە ، چونکە هاوڕێکانمان لە وێدان ودڵمان لایانە .

ضوءالمکان ورەی بەرزکردنەوە و پەنایان بە خوا برد و پەلەیان کرد ، بۆ قوستەنتەنیە .

ئەم شیعرەیشی بۆ وتن :

| | |
|---|---|
| خوایە هەمیشە سوپاس گوزارم | کە هەموو کاتێ دەێیتە هاوارم |
| بە نامۆ بوونم کاتێ مامەوە | پشتت گرتم و بوویتە دەستبارم |
| سامان و پارەی زۆرت پێ بەخشیم | بێ خەمت کردم لەوەی هەژارم |
| کەوتوومە سایەی تەختی شانشین | سەر نەوی دەکەم وا منەتبارم |
| زاهیدێکی پیر خاوەن کەرامەت | بووە (دەلیل) و هەم ئامۆژگارم |
| ئێمە بۆ تۆڵەی خۆمان بوو هاتین | بەجارێ دنیا زانی بە کارم |

کە ضوءالمکان لە شیعرەکە بووەوە . شرکانی برای پیرۆزبایی سەلامەت بوونی لێ کرد و بەرەو سوپای ئیسلام بوونەوە . لەو لایشەوە پیرەژنە سەر ئاسنینە دوای بینینی ( بەهرام ) و( ڕۆستەم )ی سەرکردە خۆی گەیاندەوە دارستانەکە ، ئەسپە بەستراوەکەی کردەوە وسوار بوو. کەوتە غاری چوار ناڵە... بەرەو سوپای ئیسلام . ئەو سوپایەی گەمارۆی قوستەنتەنیەی دابوو .کە ( خەزنەدار )ی بینی لە ئەسپەکەی دابەزی و بەرەو رووی چوو.

ئەویش چوو بە پیری یەوە و بەخێری هێناو وتی :

خۆش هاتی .. خواناسی ( زاهد ) و هەواڵی ڕووداوەکانی پرسی .

پیرەژنە سەرئاسنینە کەوتە درۆ و قسە هەڵبەستن و وتی : خەمی ( بەهرام ) و ( ڕۆستەم )ی سەرکردە مەخۆ.. چونکە لە ڕێگا پێیان گەیشتم و ڕەوانەی لای پاشام کردن . (٢٠٠٠٠) جەنگاوەریان لەگەڵ بوو . دوژمنان ژمارەیان زۆر زۆرتر بوو . بۆ ئەوە هاتووم .. تا هەندێك لە سەربازەکانی خۆت ڕەوانەی نێو سوپای ئیسلام بکەیت .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

### شەوی ١٠١

شەهرەزاد وتی :

ئەی شا شەهرەیار .. ئەی پاشای بەختیار ..

کە خەزنەدار و موسڵمانەکان بیستیان ، ورەیان دابەزی و پیرەژنە سەرئاسنینە وتی :

پشت بەخوا ببەستن و ئارام بن . ئێوەش ئۆمەتی موحەممەدن (د.خ) بەهەشت بۆ شەهیدانە . دەبێت هەموومان هەر بمرین ! بەڵام مردن لە (جهاد)دا .. باشترە .
کە ( خەزنەدار ) ئەم قسەیەی لە پیرەژنە فێڵاوی بیست . بانگی ( ترکاش )ی برای ( بەهرام )ی کرد و ( ١٠٠٠٠) جەنگاوەری خستە ژێر دەستی . رۆیشتن و شەو و رۆژێک بەرێوە بوون . کە ( شرکان ) ئەو تەپ و تۆزەی لە دوورەوە بینی زۆر ترسا .
بە سەرکردەکانی دەورووبەری وت :
ئەوان دیارن سوپای ( رۆم )ن و بۆ جەنگی ئێمە هاتوون .چی بکەین؟ قەدەری خوایە..!
بە ( ضوءالمکان )ی برایشی وت :
مەترسە ..خۆم بە قوربانت دەکەم . خۆ..گەرخوا بکات و سوپای خۆمان بێت . ئەوا: بەرەکەتی خوایە! زۆریش حەز دەکەم ..پێش ئەوەی شەهید ببم ، پیرەی (زاهد)و وەلی خواناس جارێکی تر ببینمەوە !
کە ئەوان نزیکتر بوونەوە و ئەمانیش وردتر سەیریان کرد . بەیداخی ئیسلامیان هەڵکردووە .
( شرکان ) هاواری کرد :
سوپای ئیسلام چۆنن ؟
وتیان :
زۆر باشین ، ئێمە بۆ یارمەتی ئێوە هاتوین . سەرکردەکەیان لە ئەسپەکەی دابەزی و کرنووشی بۆ ( شرکان ) برد و پرسیی :
قوربان .. ئاخۆ.. سوڵتان و دندانی وەزیر و رۆستەم و بارامی برام چۆنن !؟
ئەویش وتی :
سەلامەتن .. بەڵام ئێوە چۆن هەواڵی ئێمەتان پێ گەیشت؟
ئەویش وتی :
( زاهد )ەکە.. وتیشی بەهرام و رۆستەمم بۆ یارمەتی ئێوە ناردووە .
بە ئێمەشی وت :
دوژمن گەمارۆی ئێوەی داوە . ئەوان زۆر لە ئێوە زۆرترن کەچی .. من پێچەوانەکەی دەبینم و ئەوەتا.. ئێوە سەرکەوتوون .
ئەویش لێی پرسین : چۆن ( زاهد )ەکە گەیشتە لای ئێوە؟
ئەوانیش وتیان :
بە پێ هات و لە شەو و رۆژێکدا (١٠) رۆژەرێی ئەسپ سوارێکی بڕیوە!!
( شرکان ) وتی :
کەواتە ، گومانی تیا نی یە . کە ئەو ( زاهدە ) وەلی خوایە ! کوا لە کوێ یە؟

ئەوانیش وتیان :

جێمان هێشتووە ! تاکو هانی سوپا بدات و ورەیان بەرز بکاتەوە بۆ جەنگ .

شرکان زۆر دڵی بەو کارە خۆش بوو . سوپاسی خوای کرد . کە ( زاهد )ەکە ، سەلامەتە و رەحمەتیان نارد بۆ شەهیدان .

لە پرێکدا تەپ و تۆز بەرز بووەوە . ستوونێك لە دووکەڵی رەش بەرەو لای ئەمان هات و هێندەیان زانی ، ئەوە ( زاهد )ەکەیە و دە ناڵێنێت و هاوار دەکات :

بە فریای سوپای ئیسلام بکەون . سوپای ( رۆم ) پەلاماریان داون ! برۆن بە هانایانەوە ..دوژمنان بشکێنن و بیان کەن بە عیبرەت ..! ئەوان غەزەبیان باران بە سەر موسڵمانان دا.

وەختە بوو شرکان دڵی بتەقێت و لە ئەسپەکەی دابەزی . دەستی ( زاهد )ەکە و ( ضوءالمکان )ی ماچ کرد . هەر هەموو سەرکردەکانیش بە دوای دا . تەنیا ( دندان )ی گەورە وەزیر نەبێت ..

لەئەسپەکەی دانەبەزی و وتی :

ئەم ( زاهد )ە ناچێتە دڵمەوە و خۆشم لێی نایەت ! چونکە هەر چی یەکم لە وەلی و زاهدان بینیوە وەکو پیاو چاك خۆیان پیشان داوە ..کەچی پیس و پیاو خراپ دەرچوون . تکایە ئەم پیرە پشتگوێ بکەن و فریای سوپای ئیسلام بکەون .. ئای زەمانە.. چەندین جار لێرەدا لەگەڵ ( شاعومەری کوڕی نوعمان) جەنگیوم ! یاخوا ئەم ( زاهد )ە بەر نەفرەتی خوا بکەوێت .

( شرکان ) وتی :

ئەم گومانە پیسە لە دڵی خۆت دەر بکە . نابینیت : ئەم زاهدە چۆن موسڵمانان هان دەدات بۆ جیهاد!؟ لە شیر و تیر ناترسێت!؟ غەیبەت کردن خراپە . گۆشتی ( پیاو چاکان ) ناخورێت..! گەر خوا خۆشی نەویستایە.. ئەو رێگا دوورەی بۆ کورت نەدەکرایەوە..!

ئەمجا هێسترێکی پێ بەخشی ، کە سواری بێت و پێی وت :

ئەی وەلی خوا. سوار بە .

ئەویش سوار نەبوو. نەیدەزانی ئەم شیعرە دەهێنێت :

بۆ بەرژەوەندی کەوتە نوێژ کردن دواتریش کەوتە دەم درێژ کردن

پیرەژن بەناو جەنگاوەران و سوارانیدا رەت بوو. بە جۆرێك چاوی دەگێرا . کە لە پیاوکوژ دەچوو . بە دەنگی بەرز تەسبێحاتی دەکرد . بۆ ئەوەی خەڵکی بیبیستن . رۆیشتن تاگەیشتنە سەربازگەی سوپای ئیسلام . سەیریان کرد سوپاکەی شرکان لە شکاندن و هەڵاتن دایە . لەشکری خەزنەداریش کەوتووەتە ، بەر زەبری سوپای ( رۆم ) . هەر ئەویش ترکاشی سەرکردەی لە سوپای ئیسلام دوور خست بووەوە . بەرە و ( قوستەنتەنیە )ی بەرێ خست بوو . کە گەیشتە بەر دیواری قەڵای شاری (قوستەنتەنیە) پیرەژنەی گەورە قەشەی ( رۆم )

هاواری کرد :
ئەی ئەوانەی ..سەر دیواری قەلاّی شار . ئادەی پەت  شۆڕ بکەنەوە با ئەم نامەیەی لێ ببەستم .. دوایی هەلّی بکێشنەوە نامەکە بیگەنێنە شا ( ئەفرەیدون ) و کوڕەکەم ، تاکو کاری پێ بکەن .کە نامەکەیان هەلّکێشایەوە تیا نووسرابوو:
( لە پیرەژنە فێلاّوی )یەوە.. بۆ شا ( ئەفرەیدون ) .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

**شەوی ۱۰۲۰**

شەهرەزاد وتی :
پیرەژنە فێلاّوی درێژەی پێ دابوو و نووسی بووی :
پیلانێکم بۆ داناون کە بە هۆیەوە سوپای ئیسلام تیادەچێت ..! بێخەم بن . خۆیان و پاشاکەیان وەزیرەکەیانم بە ( دیل ) گرتووە . ئەمجا بەرەو سەربازگەکەیان چووم و هەوالّەکەم پێگەیاندن . بەشێکم لە سوپای ئیسلام کە (۱۲۰۰۰) سەربازن و سەرکردەکەیان ناوی (ترکان)ە . لەقەلاّی ( قوستەنتەنیە ) دوورم خستووەتەوە .
داواتان لێ دەکەم جەنگاوەرەکانتان بەرەو روویان بکەنەوە . پەلاماری دەوارەکانیان بدەن و بیانکوژن شا( ئەفرەیدون ) زۆر دلّخۆش بوو . نامەکەی نارد بۆ پاشای ( رۆم ) کە کوڕی پیرەژنە فێلّباز بوو .
کە نامەکەیان بۆ پاشا خوێندەوە زۆر دلّخۆش بوو و وتی :
بڕوانن پیلانەکانی دایکم چەند سەرکەوتوانەیە ؟ دایکم پێویستی بەهێزی شمشێر نییە.
شا ( ئەفرەیدون )یش وتی :
خوا.... دایکمان لێ نەسەنێت .
فەرمانی بە سەرکردەکاندا بەرەو شار بڕۆن .
هەوالّەکە بە قوستەنتەنیەدا بلاّو بووەوە . نەسرانیانیش خۆیان ئامادە کرد .
کە ( خەزنەدار )ی سوپای ئیسلام ئەمەی بیستەوە وتی :
ئەوا سوپای رۆم هاتنە سەرمان ..دیارە زانیویانە . سەرکردەکانمان لێرە نین! زۆربەی جەنگاوەرانمان بەرەولاّی  چووالمکان چوون .  ئەی سوپایانی موسلّمانان ، گەر رابکەن و هەلّ بێن .. تیا دەچن!! ئەگەریش ئارام بن ، سەر دەکەون . گەر سەعاتێك ئارام بگرن ئازایەتیە . هەر تەنگژەیەکمان هاتە پێش خوا خۆی دەرگامان بۆدەکاتەوە و بەزەیی پێتاندا بێتەوە .
ئەمجا بووە پێکدادان ، شیر و قەلّغان لێدان . تاکو تاریك داهات . بە درێژایی شەو سوپای ئیسلام گەمارۆ درابوو . (خەزنەدار) سواری ئەسپەکەی بوو . کەوتە نزاو پاڕانەوە لە یەزدان .. کە سوپاکەی زالّ بکات . شەڕی پیادەیی و دەستەو یەخە ، دەستی پێ کرد . لەو

جەنگەدا .. کەللە وەکو بریشکە دەباری . لە پێشدا هەندێك لە دەوارەکانی ئیسلام داگیر کران . سوپای ئیسلام کەوتە بیر کردنەوە ، لە هەڵاتن. هێندەیان زانی سوپای (شرکان) بە بەیداخی ئیسلامەوە پەیدا بوون و کەوتنە گیانی دوژمنان . دواتر لەشکری شا چووالمکان لێیان راست بوونەوە و کەوتنە گیانی سوپای رۆمەکان .

هەر دوای هێرشی ئەو دوو لەشکرەی ئیسلام ، لەشکری دندانی گەورە وەزیریش ، پەیدا بوو و لێیان هاتنە دەست .

کە شرکان ، خەزنەداری بینی پێی وت :

سوپاس بۆ .. خۆڕاگریەکەت .

دواتر هەردوو لەشکری ( دیلەم ) و ( رۆستەم)یش . هێرشیان کردە سەر سوپای ( نەسرانیان ) .

کە رۆمەکان ، سەیری ئەو هەموو ئاڵاو بەیداخانەی موسڵمانانیان کرد . ژێریان لە سەردا نەما . سوپای شا( ئەفرەیدون ) .. لەلایەکەوە و سوپای ( رۆم ) لە لایەکی ترەوە ، هێرشیان هێنا . شۆڕە سوارێکی ئازای بەناوبانگیان هەبوو، ناوی ( لاویا )بوو . هاتە گۆڕەپان .. بانگی کرد بۆ زۆران . سوپای ئیسلامیش بەرامبەریان ریز بوون .

شرکان روە و چووالمکان چوو و وتی :

بێگومان داوای پاڵەوان دەکەن بۆ زۆرانبازی . منیش دەمەوێت سەربازی بڕوا پتەو بنێرم..چونکە ژێری نیوەی ژیانە...!

ضوءالمکان وتی :

دەتەوێ چی بکەین ... ئەی خاوەن : بیر و رای پەسەند؟

ئەویش وتی :

دەمەوێت لە ناوەڕاستی سوپای خۆماندا دندانی وەزیر بکەوێتە لای چەپی سوپا .. تۆیش لای راست . ( بەهرام )ی سەرکردەش لای راست . سەرکردە ( رۆستەم )یش لای چەپ . ئاڵاو بەیداخەکانی ئیسلامیش بە سەر سەرتانەوە بێت . چونکە تۆ پشت و پەنایت . ئێمەش بە قوربانی تۆ دەبین . ضوءالمکان سوپاسی کرد.. بوو بە غەڵبە غەڵب و هێندەیان زانی شۆڕە سوارێك لە ریزی سوپای رۆمەکان هاتە مەیدان کە زینی ئەسپەکەی بە قوماشی ئاوریشمی سپی داپۆشرابوو. فەرشێکی کشمیری لەسەر راخرابوو . سوارێکی پیری جوان و خاوەن نگین . ( زرێپۆش )ی لەبەردابوو. سەرشانەکانی بە خووریی سپی داپۆشرابوو . کەوتە غار و لۆقەلە کردن بە گۆڕە پانەکەدا .

لە سوپای ئیسلام نزیك بووەوە وتی :

من بۆ لای ئێوە نێرراوم . نێرراویش گەیاندنی لە سەرە . بمپارێزن تا سپاردەکەتان پێ رادەگەینم .

شرکانیش وتی :

بێخەم بە .. شمشێرت لێ بڵند ناکرێتەوە .

پیرە دابەزی و چووە بەرامبەر( سوڵتان) و کڕنووشی برد و وتی :

لەلایەن شا( ئەفرەیدون )ەوە نێرراوم . شا دەڵێت : با ئێمە شەڕی تەن بە تەن بکەین . نەهێڵین ئەو هەموو جەنگاوەرانە بکوژرێن . ئەگەر، ئەو منی کوشت . ئەوە سوپای رۆم خۆی بە دەستەوە دەدات .

ئەگەر منیش ئەوم کوشت ، ئەوا... سوپای ئیسلام بەرگری بۆ ناکرێت و دەشکێت .

شرکان وتی : برۆ..پێی بڵێ : دوای (٢) رۆژی تر خۆم بۆ ئەو شەڕی دوو قۆڵی یە ئامادە دەبم . چونکە ئێستا ئێمە ماندووین .

قەشە بە دڵخۆشیەوە گەڕایەوە لای شا ئەفرەیدون و شای رۆمیان و وەڵامەکەی پێدان .

شایش زۆر دڵی خۆش بوو و لە دڵی خۆیدا وتی :

گومانی نی یە ، ( شرکان ) پاڵەوانان ترینیانە و شمشێربازیانە ، گەر بیکوژم ئەوا ، ورەی موسڵمانان دادەروخێت . پیرەژنە سەرئاسنینە فێڵاویش .کاتی خۆی بۆی نووسی بوو: کە شرکان گەورە شمشێربازی ئیسلامە و شۆڕەسواریانە . هۆشیاریی بە شا ئەفرەیدون دابوو کە لە ( شرکان ) بترسێت ! شا ئەفرەیدونیش سوارچاکێکی ناسراو بوو. هەموو جۆرەکانی جەنگی دەزانی! لەوانە: شەڕە رم و قۆچەقانی و سێ پەلە! کە بیستی شرکان داوای زۆرانبازی کردووە ، هێندە لە خۆی رازی بوو، پێی خۆش بوو . بڕیاری دا بۆی دابەزێت . ئەو شەوە جەنگاوەرانی رۆم بە ئاهەنگ وخواردنەوە بردیانە سەر.

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

**شەوی ١٠٣**

## زۆرانبازیی شرکان و شا ئەفرەیدون

شەهرەزاد وتی :

کە رۆژ بووەوە ، شۆڕە سواران نەعرەتەیان لێدا وەکو هەوران . هێندەیان زانی شۆڕە سوارێك هاتە گۆڕەپان ، چوار پەلی ئەسپەکەی سپی و سوارێك لە سەرپشتی بوو. زرێپۆشی ، ئاوێنەی سنگ پۆش .

کڵاو خوودەکەی لەسەر لادا و وتی :

هەر کەسێ بمناسێت : ناپرسێت ! من شا ئەفرەیدونم .. پیرۆزم بە پیرەژنە فێڵاوی. هێشتا لە قسەکە نەبوو. بووەوە شۆڕە سواری موسڵمانان : شرکان بە خۆی وئەسپەکەیەوە ، کە بایی (١٠٠٠) دینار بوو. سەر زینێکی چنراو بە زێڕ و زیو . شمشێرێکی ( هندی ) بە

دەستەوە بوو. لە نێوان سوارانەوە هاتە دەر.

هێندەیان زانی ئەفرەیدون هاواری کرد :

لە کوێیت هەی نەفرەتی ؟ پێت وایە منیش وەکو سوارەکانی ترم !؟ کە خۆی لەبەر تۆدا نەگرێت !

پەلاماری یەکیان دا وەکو (٢) کێو . یان دوو دەریا بە یەکدا بدەن . یەکتریان دەهێنا و دەبرد . ئەم دوو سوپایەش هەر سەیریان دەکرد . هەندێکیان گرەوی ئەومیان کردبوو کە (شرکان) دەیباتەوە . ئیدی هێندە یەکیان هێنا و برد و شمشێریان وەشاند . تەماشاچییانیان بێزار کرد .

ئەفرەیدون هاواری کرد و وتی :

بە دینی (مەسیح ) تۆ پاڵەوانی بە توانای .. بەڵام غەداری ، تەبیعەتت پیاوانەیە . بەڵام کردارت سوپاسگوزارانە نی یە . کەسان و خزمانت دەڵێن : تۆ لە کۆیلەیانیت . ئەو ئەسپە هی تۆ نی یە: بۆیان گۆڕیویت .. برۆ بیگۆڕە ، منیش ماندووی ئەم زۆرانەم . هیچ مەگۆڕە ، لە شتومەکی جەنگینەکەت. . تاکو لە نێو سوارانی ئیسلامدا ، ناوبانگ دەربکەیت .

( شرکان ) زۆر لە هاورێکانی توورە بوو. بە تایبەتی کە پێیان وتبوو .. لە بنەماڵەی کۆیلەیانە . بۆیە لای کردەوە بە لای لەشکرەکەیدا و ویستی بڵێ ئەسپەکەی بۆ نەگۆڕن . لەوکاتەدا، سەرە نێزەکەی کوتایە ( شرکان ) . کە سەیری دواوەی خۆی کرد کەسی لێ نەبوو. زانیی کە ( ئەفرەیدون ) فێڵی لێ کردووە . کە لای کردەوە بە لایدا سەرەنێزەکە چوو بە لا ڕوومەتی دا .

بەر قوڵپووزی زینەکەی کەوت و بۆ سەر سنگی . خەریك بوو بکەوێت . سوارەکان بەرەو ڕووی چوون و فڕاندیانەوە .. ناو خۆیان ! ئەمجا سوپای شا ئەفرەیدون .. پەلاماری سوپای ئیسلامی دا . یەکەم کەس کە گەیشتە (شرکان)ی بریندار. دندانی سەرۆك وەزیران بوو ! ( بەهرام )ی میری ( تورك ) و میری ( دەیلەم) بە دوای ئەودا، گەیشتنە سەری . بردیانە لای (ضوءالمكان)ی برای . خزمەتکاران کەوتنە پەزێرایی . کە جەنگی دوو سوپا دەستی پێکرد . هەر کەللە سەر بوو دەپەڕی . شمشێر بوو سنگی دەدڕی . سوپای ( ڕۆم )یان بەرەو دەوارەکانیان بوونەوە . میرانیان کڕنوشیان بۆ شا (ئەفرەیدون) برد . دەستخۆشیی زاڵ بونیان بەسەر ( شرکان )دا لێ کرد .

ئیدی گەڕایەوە بۆ شاری (قوستەنتەنیە) و لەسەر کورسیی پاشایەتی دانیشتەوە .

شا ( حەردوب ) پێشوازی کرد و وتی :

خوا پەنات بدات ، نزاکانی پیرەژنە فێڵاوی پەسەندی لای خوا بووە . ئەوەش بزانە .. سوپای ئیسلام بە نەمانی ( شرکان ) تەفر و توونا دەبن .

ئەفرەیدون شا وتی :

سبەینێ کۆتایی جەنگە .. چونکە ضوءالمکان بانگ دەکەم بۆ زۆرانبازی .. ئەویش دەکوژم .. ئەمجا سوپای ئیسلام : دەشکێن و هەڵدێن .

ئەمە حاڵی سوپای رۆمیان بوو. لەولایشەوە سوپای ئیسلام هەموویان خەریکی شرکان بوون . کە ضوءالمکان خۆیشی خەریکی براکەی بوو . بە تایبەتی کە بینی زۆر بێ توانایە و برینی مەترسیدارە. دندانی وەزیر و میر( رۆستەم ) و ( بەهرام )ی بانگ کرد و راوێژی پێ کردن . دوای کۆبوونەوەکەیان پزیشکیان هێنایە سەر شرکان و خۆیشیان دەگریان . ئەو شەوە بە دیاریەوە بوون . شەو درەنگانێ ، ( زاهد ) بە گریانەوە خۆی کرد بە لایاندا . چووالمکان دەستی گرت و بە دەم قورئان خوێندنەوە دەستی پیرەژنە فێڵاوی بە سەر سنگە برینداره‌کەی شرکاندا هێنا. بەرەبەیان شرکان چاوی کردەوە .

بە زمانی لێوانی تەڕ کردنەوەو کەوتە قسە کردن .

شا ضوءالمکان زۆر خۆشحال بوو و وتی :

بە پیرۆزییەکەی ( زاهد)... خوا شیفای بۆ هێنا.

شرکان وتی :

سوپاس بۆ خوا، بە هێندە کۆتایی هات و ئێستا سەلامەتم . ئەو فێڵی لێ کردم و من خێرا نەبوومایە شمشێرەکەی لە پشتمەوە دەردەچوو .

ئەمجا رووی کردە دەورو بەری و وتی :

ئەی جەنگاوەرانی ئیسلام .. چۆنن ؟

ضوءالمکان وتی :

هەموویان بۆ تۆ دەگریان !

ئەویش وتی : من زۆر باشم ! ئەی (زاهد)ەکە : لە کوێ یە ؟

ئەویش وتی :

ئەی .. ئەوە نی یە .. کوڕەکەم : بە ژوور سەرتەوەم !؟ ئارام بیت .. خوا..پاداشتت دەداتەوە .

شرکانیش وتی : نزای خێرم بۆ بکە .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٠٤**

## بەسەرهاتی کوژرانی شا حەردوب بە دەستی ضوء المکان

شەهرەزاد وتی :

رۆژی دواتر سوپای ئیسلام چووەوە گۆڕەپان. بانگی شەڕی هەڵداو رۆمەکان کەوتنە شمشێر وەشاندن. جەنگاوەرانی ئیسلامیش کەوتنە شمشێربازی . قەڵغان و شمشێر لێدان . شا (ئەفرەیدون) و چووالمکان ویستیان دەستە و یەخە .. بکەونە زۆران . بۆیە هاتنە

گۆڕەپان .
دندانی گەورە وەزیر و میر( بەهرام ) بە چووالمکان یان وت :
بە قوربانت بین .
ئەویش پێی وتن :
بەحەقی ( بیت الحرام ) و ( کەعبە ) و ( مەقام) .. دەرناچم لەو گۆڕەپانە .. تاکو نەکوژم ئەو پیاوە گەندانە..
کە چووە گۆڕەپان، کەوتە جەنگ و هەڵسووڕان . بووەوە مایەی سەرسوڕمان ! لای شۆڕەسواران . بەلای چەپدا ، شمشێری رادا دوو سەرکردەی لوول دا ..! بە راستیشدا کە خۆی بادا ... دوو سەرکردە ، کەوتن بە لادا.
ئەمجا وتی :
کوا شا ( ئەفرەیدون)..؟ تاکو.. لاشەی بنێرم بۆ : دەباغانە و بی گوروون .
ئەویش ویستی بڕواتە گۆڕەپان .. بەڵام شا ( حەردوب ) واهاتە زمان :
*هەرچەند دڵیشم لەئازایەتیت : بێخەمە ! بەڵام دوێنێ تۆ جەنگایت و ئەمڕۆ من سەرەمە ...*
ئیدی خۆی چووە پێش . شمشێری رووت بە دەستەوە . سەرنجی خەڵکی دەفۆستەوە! لە گۆڕەپاندا ، هێندە بە جەرگە پەلەی بۆ دەکرد: چەشنی پێشمەرگە
روخساری جۆرێ رەش داگەڕا بوو دەتوت : خەڵوزە یا شەوە زەنگە
حیلەی ئەسپەکەی وا کاریگەر بوو دەتوت بروسکە! یا دەنگی زەنگە
ئاگری قوورەت : لە ( با ) خێرا تر کاتێك پێی دەدا: ئا لەو ئاوزەنگە
دەستە و یەخەی یەك بوون . چووالمکان ، هاواری کردو شاڵاوی بۆ شا( حەردوب ) برد . شمشێری لێ هەڵبڕی . هەر لەوێدا سەری پەڕی ! کە سوپای رۆم ئەمەیان بینی . هەموویان هێرشیان هێنا .
ئەویش کەوتە شمشێر وەشاندن .. کوشتن و خوێن ڕژاندن . جەنگاوەران کەوتنە هاواری ( الله اکبر). ئاگریشی گرت : شوێنی شەڕ.
( دندان )ی گەورە وەزیر هاواری کرد :
موسڵمانینە : تۆڵەی خوێنی ( شاعومەر) بکەنەوە . تۆڵەی شا ( شرکان ) بکەنەوە . کڵاوخوودەی لەسەر لادا ..
دیسان هاواری کردە :
زیاتر لە (٢٠٠٠٠) جەنگاوەری تورکەکان : پەلامار بدەن .
سوپای رۆم لەبەردەمیاندا.. هەڵاتن! سوپای ئیسلام شوێنیان کەوتن . زیاتر لە (٥٠٠٠٠) جەنگاوەریان لێ کوشتن .

سوپا شکاوەکەش . بە پەلە خۆیان کردەوە بە قەڵای شاردا و لە شڵەژاوی خۆیاندا . هەندێکیان بوون بە ژێر دەست و پێوە و مردن . دەروازەکانی شار داخران . سوپای ئیسلام بە سەرکەوتوویی گەڕانەوە سەربازگەکانیان .

( چووالمکان ) چووە سەردانی شرکان و کە زانی تەندروستی باشە . سوپاسی خوای کرد . پێ خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی .کە بەرەو چاك بوونەوە، دەچێت .

شرکانیش وتی :

بەرەکەتی ئەو ( زاهد )ە ، بە سەر هەمووماندا رژاوە و هەر بە هۆی نزای ئەویشەوە بوو زاڵ بووین چونکە بە درێژایی رۆژ بۆ ئێمە پاڕاوەتەوە . ( اللە اکبر)ی ئێوەیش ورەی منی بەرز کردەوە . ئێستاش باسی شەڕەکەم بۆ بکە .

ئەویش شەڕی خۆی و شا (حەردوب)ی بۆ گێڕایەوە و چۆن کوشتویەتی . ئەمیش سوپاسی خوای کرد. کە (زاهد) : هەواڵی کوژرانی شا (حەردوب)ی کوڕی بیست . رەنگی زەرد هەڵگەڕا. چاوانی بە فرمێسك بوون . بە موسڵمانەکانیشی دەوت ئەمەگریانی خۆشی سەرکەوتنی ئێوەیە .

لە دڵی خۆیشی دا وتی :

تا.. جەرگی ( ضوءالمکان ) نەبڕم : بە کوشتنی شرکانی برای . دڵم ئاو ناخواتەوە .بەوەی کە ئاوا... پاشای خاچ پەرستان و شای نەسرانیانی کوشت .

( ضوءالمکان ) و( دندان ) و ( خەزنەدار ) لای ( شرکان ) دانیشتبوون . تیماریان کرد و برینەکەیان بۆ چەور کرد . ئیتر هەواڵیان بڵاو کردەوە ، کە چاك بووەتەوە و سبەینێ دادەبەزێتە گۆڕەپانی جەنگەوە .

شرکانیش چووە ناو جەنگاوەرانەوە و پێی وتن :

( بە راستی شەڕێکی ، ئازایانەتان کرد . بڕۆنەوە نێو دەوارەکانتان و بحەوێنەوەو شەو زوو بنوون .

ئەوانیش بڵاوەیان لێ کردو هەر یەکە و چووەوە دەواری خۆی . چەند کەسێکی کەم لەگەڵ (زاهد) لای شرکان مانەوە . دواتر ئەوانیش هەرلەو دەوارەی شرکاندا لێی نوسوتن .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٠٥**

بەسەرهاتی کوشتنی شرکان بە دەستی زاهد

شەهرەزاد وتی :

پیرەژنە فێڵبازەکە سەیری کرد ، شرکان لە خەوێکی قووڵ دایە . وەکو مار راست بووەوە . خەنجەرێکی ژەهراوی هەڵکێشا . کە ئەگەر لەسەر بەردی دانایە دەیتوانەوە . چووە ژوور سەری شرکان و سەری لە لەشی جیا کردەوەو گەڕایەوە سەر خزمەتکاران و ئەوانیش

کوشت .

چووە سەردانی دەواری ( دندان ) سەیری کرد قورئان دەخوێنێت ! کە خۆی کرد بە دەوارەکەیداکرد.

( دندان ) ئەوی بینی ! بۆیە بانگی کرد بەخێر بێیت ! ئەی (زاهد)ی خواناس .

ئەویش ترسی لێ نیشت بوو و وتی :

گوێم لە دەنگی وەلی یەك بوو. منیش هاتم قسەی لەگەڵ بکەم..!

ئەمجا بێدەنگ بۆی دەرچوو...!

دندان لە دڵی خۆیدا وتی :

مەرج بێت .. ئەمشەو شوێن ئەم (زاهد)ە بکەوم : بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت..!

پیرەژنە سەر ئاسنینە کە زانی کەسێك بە دواوەیەتی لە دڵی خۆیدا وتی :

بەخوا .. نەی خەڵەتێنم ، پێم دەزانێت .

هەڵگەڕایەوە و بانگی کرد :

ئەی گەورە وەزیـری بـەڕێز.. بـۆ لای ئـەو ( وەلی )یـە دەچـم . ئەگـەر تـۆم لەگەڵدا ببینێت لۆمەم دەکات !

دندان کەمێ تەریق بووەوە ، بەرەو دەوارەکەی خۆی گەڕایەوە و پاڵ کەوت . خەوی زڕا . دیسان بەو شەوە ، چووە دەرەوە . لە دڵی خۆیدا بڕیاریدا . بچێتە لای شرکان و تا بەیانی پێکەوە بن ..! خۆی کرد بە دەوارەکـەی شـرکاندا. سـەیری کـرد خـوێن لەبـەری ڕۆیـشتووەو هەموو خزمەتکارەکانیشی کوژراون !

ئیدی بە هەموو توانای خۆی هاواری کرد :

جەنگاوەرانی لێ کۆبووەوە . کە ( ضوءالمكان ) بەمەی زانی . کەوتە هـاوار و گریـان ..! خەزنەدار پەیدا بوو. ئەویش کەوتە گریان و شین و واوەیلا. دواتر ( بەهرام ) و ( ڕۆسـتەم )ی سەرکردە هاتن . ئەوانیش کە بینیان سەری شرکان لە لەشی جیاکراوەتەوە ، خۆیان بۆ نەگیرا . دەستیان بەگریان کرد .

ضوءالمكان رووی کردە دندان و پرسیی :

نازانن کێ براکەمی کوشتووە!؟ ئاخۆ (زاهد)ی وەلی لە کوێ یە!؟ ئەو لەخوا ترسە کوا؟

وەزیر وتی :

بەو خوایە .. ئەو ( زاهد )ە بێ دینە .. بووە هۆی ئەم گریان و ناڵینە!!

خەڵکەکە لە یـەزدان پاڕانـەوە ، کـە ئـەو ( زاهـد )ەیـان بـەر دەسـت بکـەوێت ! شـرکان شۆردرا.. لە سەر چیا نێژرا . چوونە کەناری شار چاوەڕوانیان کرد.. کە دەرگاکان بکرێنەوە . کەچی کەسێکیان لەسەر دیوارەکان نەبینی . زۆریان پێ سەیر بوو!

( ضوءالمكان ) وتی :

ئەگەر تاکو.. ساڵێکی دی دەروازەکان نەکرانەوە : من ناڕۆم و چاوەڕان دەبم . تاکو تۆڵەی خوێنی براکەم ئەکەمەوە ..

فەرمانیدا .. هەموو ئەو زێڕ و زیو و ئەختینەیەی لە کڵێسەی ( مەتروحەنا ) هێنا بوویان . بەشیان کرد بە سەر جەنگاوەرانی سوپای ئیسلامدا. ئەتەرانیان بانگ کرد، لەگەڵ جەنگاوەران ڕێکەوتن زێڕ و زیوەکانیان ناردەوە ماڵەکانیان . هەموویان هەواڵیان بە ماڵیان دابوو کە گەمارۆی ( قوستەنتەنیە )یان داوە . بڕیاریان داوە یا... شارەکە کاول بکەن ! یا.. جێی ئەهێڵن.. تا دەمرن !

ئەگەریش ساڵێکمان پێ چووە..! ناگەڕێینەوە تاکو داگیری ئەکەین .

ئەمجا فەرمانیدا نامەیەك بۆ ( نزهەالزمان )ی خوشکی بنووسرێت . هەواڵی بداتێ کە چیمان بەسەر هاتووە . با ئاگای لە منداڵەکەم بێت . چونکە کە هاتم بۆ جەنگ ژنەکەم مانگی خۆی بوو..!

ئێستاش منداڵەکەی بووە گەر کوڕیشی بوو بێت ئەوا زوو هەواڵەکەم بۆ بنێرنەوە . بڕێك پارەی دایە ئەتەرەکە و ئەوان ڕۆیشتن . فەرمانیدا بە دندانی گەورە وەزیر .کە فەرمان دەر بکات . سەربازەکان نزیکتر ببنەوە لە دیواری بڵندی چواردەوری شاری ( قوستەنتەنیە ) .

کە نزیك بوونەوە جەنگاوەرانیان نەبینی بە سەر دیوارەکانەوە . سەریان سووڕما. سوڵتان زۆر بەخەمی (شرکان)ی برای بوو. زۆر سەراسیمەی ( زاهد )ی ناپاکی کار بوو. (٢) ڕۆژ لەو لەو شوێنەدا مانەوە . کەسیان لە دوژمنان نەبینی . لەم لایشەوە پیرەژنە سەر ئاسنینە فێڵاوییە چووە بن دیواری قەڵاکە و هاواری لێ کردن کە گوریسی بۆ شۆڕ بکەنەوە و بچێتە سەبەتەکەیەوە . پاسەوانەکانی سەر دیواری قەڵاکە ،کە لێیان کۆڵی یەوە؛ ناسیانەوە .. کە دایکی شا ( حەردوب )ە و سەریان خست .

هەر کە گەیشتە لای شا ( ئەفرەیدون ) پرسیی :

ئەوە ڕاستە موسڵمانان دەڵێن .. گوایە شا (حەردوب)ی کوڕی منیان کوشتووە؟

ئەویش وتی : بەداخەوە .. ڕاست دەکەن .

گەوتە گریان و لە خۆدان . کارێکی کرد شا ئەفرەیدون و کەسانی دەورو بەری هەموویان گریان . پیرەژنە فێڵاوی مژدەی پێدان : کە شرکانی کوژەری کوڕەکەی و (٢٠) پیاوی کوشتووە . شا ئەفرەیدون زۆری پێخۆش بوو، دەست خۆشی لێکردو هەر دوو دەستی ماچ کرد .

پیرەژنە وتی :

من بە تۆڵەی شای زەمانە قایل نیم .. خەریکی دانانی پیلانێکم بۆ کوشتنی (ضوءالمکان) و ( دندان )یش . هەرگیز بەوە ڕازی نیم . کوڕە کوژراوەکەم بە شرکان

بەراورد بکرێت .
بەشا( ئە فرەیدون )یشی وت :
شانەفرەیدون ، من دەمەوێت : تەعزیە دابنێم بۆ کوڕەکەم .
پاشاش وتی :
چۆنت پێ باشە وا بکە! هەرچی یەکیشی تێ بچێت گوێ مەدەرێ ! چونکە سوپای ئیسلام.. یەك ساڵ گەمارۆمان بدەن .. هیچیان پێ ناکرێت .
پیرەژنە فێڵباز کاغەز و ئووچی هێناو نامەیەکی نووسی :
لە پیرەژنە فێڵبازەوە بۆ موسڵمانە بەرێزەکان . ئەوە بزانن هاتینە وڵاتتانەوە.. فێڵمان لێ کردن ! شا ( عومەری کوڕی نوعمان)مان کوشت ! تووشی شەڕی لاپاڵی چیامان کردن . زۆرتان لێ کوژرا .
( شرکان )مان کوشت و چەندین خزمەتکار . گەر زەمانە ڕەخسانی بۆمان : ئەوا شا ( ضوءالمکان ) و ( دندان )ی گەورە وەزیریش دەکوژین !! هەر منیش بووم ، بە ناوی (زاهد) و وەلی خواوە . ئێوەم خەڵەتاند هەموو: فێڵێکتان لەگەڵدا بەکار دێنم .. ئەگەر دەتانەوێت هیچتان بەسەر نەیەت . ئەوا.. بێدەنگ ئێرە بەجێ بێڵن !! چونکە چەندین ساڵ بمێننەوە بێسوود دەبێت .
کە ئەمەی نووسی ( ٣ ) ڕۆژ تەعزیەی گێڕا بۆ شا(حەردوب) .دوایی قەشەیەکی بانگ کرد و پێی وت :
( ئەم نامەیە ، بکەن بە سەری تیرێکەوە . لە سەردیوارە بڵندەکەوە. ئاراستەی سوپای ئیسلامی بکەن ) .
خۆی کرد بە کڵێسەدا و کەوتە لە خۆدان و گریان بۆ کوڕەکەی .
بە جێگری کوڕەکەیشی وت :
دەبێت سەرکردەکانی ئیسلام بکوژم .
لەولایشەوە موسڵمانان سێ ڕۆژ تەعزیەیان داناو دلگران بوون . ڕۆژی چوارەم ، لە سەر دیوارە بەرزەکەی شار. قەشەیەکیان بینی ، کە تیرێکی بە نامەکەوە ، ئاراستەی سوپاکەیان کرد . چوون هێنایان و خەلیفە فەرمانیدا کە دندانی گەورە وەزیر نامەکە بخوێنێتەوە . کە ناوەرۆکی نامەکەی بیست چاوانی پڕ فرمێسك بوون و تووڕە بوو ناڵاندی و وتی :
بەخوا ، هەر نەدەچوو بەدڵمدا .
لەبەر خۆیەوە پرسیی :
ئەو پیرەژنە سەر ئاسنینە چۆن توانی بۆ دووەم جار: فێڵمان لێ بکات !؟ مەرجە لێرە نەڕۆم ، تاکو وەکو بولبول ، نەیخەمە قەفەزەوە . هەر بە پرچەکانی خۆی هەڵی دەواسم بە دەرگای ئەم قەڵایەدا. دیسان براکەی بیرکەوتەوە و دەستی کردەوە بە گریان .. پاشا پەیمانی

به سوپای ئیسلام دا..كه هەر كاتێك توانیان دەرگاكانی شاری ( قوستەنتەنیە) بشكێنن..
هەموو سامانی ئەو شارە بەیەكسانی بە
سەر جەنگاوەران دا بەش دەكات .
ڕۆژێكیـــان ..( دندان )ی گەورە وەزیر كە بینی شا چووالمكان زۆر لاواز و خەمۆكی بووە.
چووە لای و پێی وت :
براكەت ، ئەجەلی هاتبوو. ئەم خەم خواردنەت بێ سوودە . بڕوانە .. ئەم شیعرانە :
ئەوەی خوا نەیكات: بە فێڵیش نابێ هەرچییەكی ویست هەردەبێ وابێ
قەزای خوا چۆن بوو! پێش ودوای نییە مەگەر ناحاڵی.. پێی لە خەما بێ!
واز لە گریان و خەم خواردن بێنە ورەی خۆت بڵند بگرە. ژیری و شمشێر بە كار بێنە !
ئەویش وتی :
ئەی وەزیر.. خەمی باوك و براكەمە . خەمی دوورە وڵاتیمە و دڵم لای هاوڵاتیانمە .
وەزیر و دەورو بەریش دەستیان كردە گریان . ماوەیـەكی زۆر گـەمارۆی ( قوستـەنتەنیە )یان دا. ئەمان لەم قسانەدا بوون كە چەند سەركردەیەكی سوپا لە (بەغـداد)ەوە هاتبوون .
هەواڵی لەدایك بوونی كوڕێكیان هێنا . ناویش نراوە نزهەالزمان ، خوشكی پاشا كە (كان ما كان ) بـوو.. لەبـەر ئـەوەی شتی عـەجایبیان لـەو منداڵـە دەگێڕایـەوە ، بۆیـە پێیـان وابوو.. كەسێكی گرنگ دەبێت لە دوارۆژدا . مـەلاكانیان ئاگادار كردبـووەوە، كە نـزا بكـەن بۆ ئەو منداڵە . بە (ضوءالمكان)یان وت بارانێكی باش باریوە و .. خەڵكی هەموو ئاسوودەن .
( توونچی )ی هاوڕێیشت لە خۆشیدایە .. بەڵام نازانێت چیت بە سەر هاتووە .
ئەمجا پاشا وتی : ئێستا كە خوا ( كان ماكان )ی پێ بەخشیم : پشتم بە هێز بووە .
بە ( دندان )یشی وت :
نیازمە ئیتر خەم و خەفەت نەخۆم و خەتمە بۆ ( شركان ) بكەم .. خێری بۆ بكەم .
وەزیریش وتی : هەر ئەوە چاكە بۆی .
لە سەرگۆڕەكەی ( شركان ) دەوار بۆ جـەنگاوەرانی قورئـان خـوێن هەڵـدرا . ئەو شەوە هەندێكیان قورئانیان لەسەر خوێند و هەندێكیشیان زكریان كرد .
شەهرەزاد هەستی كرد شەو دەرەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٠٦**

لاوانەوەی (ضوءالمكان) بۆ (شركان)
چووالمكان چووە سەر گۆڕی شركانی برای ...كەوتە ناڵە و فرمێسك ڕشتن و لاواندنەوە...
بردیان بە دیدەی ئەشكی سوورەوە وەك سۆزی ( مووسا) بەلای ( توور)ەوە
لەدڵدا جۆرێك یادت چەسپیوە وێنەت بە ڕەنگ و ڕووی نەگۆڕەوە
هەر نابێ و نەبووە: ئاوا ئەستێرە بخرێتە تەنگی و قووڵیی گۆڕەوە

که (ضوءالمکان) له شیعرەکە بووەوە . دەستی کردە گریان . خەڵکەکەش گریـان . خۆی دا بە سەر کێلی گۆڕەکەدا.. ئەمەشیدا بە گوێی گۆڕەکەدا :

ئەوەی فانی یە پشتم لێ کرد و ئەوەی نافەوتێ :پێم گرتووە خوو
ئەوە دوای ئەوە لەم سەرزەمینە ماوەیەك ژیا و دواتریش مردوو
بە بێسێ ودوو دنیات بەجێ هێشت رازی بوویت بەوەی:کە بۆت هاتە روو
بۆ تیربارانی دوژمن قەڵغان بووی پاڵەوانێ بووی بە هێز و بازوو
ئەم دنیا هیچە کە فریودەر بوو ئاواتی خەڵکیش رەوا و سەروەر بوو
خوا بە بەهەشتی بەرینت شادکات بەو رەز و باخەی: ئاوی لەبەر بوو
وا بە تاسەوە:منت بەجێ هێشت کۆچت :بۆ هەمووان خەفەت هێنەر بوو

دندان لە شیعرەکەی بووەوە... هاوڕێیەکی شرکان هاتە دەنگ و وتی :

بەوەی بەخشندە وا چووە گۆڕی گەردون..چاکەکەی لە ئێمە بڕی
من پیاوەتی تۆم پەنهان کردبوو ئەشکی چاوانم شیعری دەربڕی

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

**شەوی ١٠٧**

شەهرەزاد وتی :

ئـــەی شا شەهرەیار .. گەورەی وەفـــادار .. هاوڕێیەکەی شرکان لە شیعرەکە بـووەوە . ( چووالمکان ) دایە پرمەی گریان .. وەزیـران و ئەفسەران بـە دوایـدا. سوڵتانیش بـەرەو لای وەزیر چوو وکەوتنەوە راوێژی جەنگ . ئەو مشتومڕە .. چەندین رۆژی پێچوو .

ضوءالمکان خەفەتباری کوژرانی براکەشی بوو وتی :

حەزم .. لە مێژوو و بەسەرهاتی پاشایانی کۆنە .. بەڵکو پەژارەم بیر بچێتەوە و هێنـدە نەگریم .

( دندان )ی گەورە وەزیر وتی :

ئەگـەر .. خـەم و پـەژارەت بـە بەسـەرهاتی پاشـایان و چـیرۆك و سـەربووردەی ئـەوان نەبێت.. لە بیر ناچێتەوە.. ئەوە زۆر ئاسانە ! چونکە ، کاتی خۆی کاری من لای بـاوکی خـوا لێخۆش بووت هەر گێڕانەوەی ئەو مێژوو و بەسەرهاتانە بـوو و شـیعرم بـۆ دەخوێنـدەوە و چیرۆکم بۆ دەگێڕایەوە .

هەر ئەمشەو چـیرۆکێکت بـۆ دەگێڕمـەوە .. کـە دڵ بکاتـەوە . سوڵتان هێنـدەی تـر لای شیرین بوو . بۆیە ئاواتی هەرچی زووتر هاتنی شەو بوو، بۆ گوێ گرتن ، لە دندان .

بۆ شەوێ فەرمانیدا.. فانۆس مۆمەکان داگیرسێنن و دابنێن . خواردن وخواردنەوە ئامادە بکەن . نـاردی بـە شـوێنی ( دنـدان )ی گـەورە وەزیـردا.. پیاویـشی نـاردە دوای :

سەرکردە بەهرام و ڕۆستەم و ترکاش و خەزنەدار دا .

دوای حەوانەوە، پاشا ڕووی کردە ( دندان )ی گەورە وەزیرو وتی :

وا شەو هات..دنیا تاریکەوکش ومات ! فەرموو تۆیش سەرەی قسەت هات.. بۆ چیرۆك وحەکایات .

## چیرۆکی سلێمان شا

دندانی گەورە وەزیر دەستی پێ کرد:

ئـــەی پاشای بەختیار.. خـــاوەنی بڕیار..

لەودیو کێوەکانی ( ئەسفەهان )ەوە شارێك هەبوو بە ناوی سەوزەوە . پاشایەك بەڕێوەی دەبرد ناوی : سولەیمان شابوو. کە دادپەروەری ئەو لە هەرێمان و وڵاتاندا..دەنگی دابووەوە ! لە هەموو لایەکی دنیاوە ، ڕوویان تێ دەکرد . سولەیمان شا بێوە پیاو بوو. نە ( ژن )ی هەبوو، نە ( مندال ) .

ڕۆژێکیـــان .. کە ئارامی لێ بڕابوو.. ناردی بە شوێنی وەزیرا.. کە هات ، پێی وت :

ئەی وەزیر.. بە تۆی دەکەم پرس و تەگبیر.. ئـەوەتا ، کەسانی دەورو بـەر.. وەزیـران و میران و سەرداران و فەرمانبەر . سەرباز و دەرەجەداران و ئەفسەر... لێم کەوتوونەتە : تانە و تەشەر..! کە بێ ژن و مندالم .. بە ڕاستی زۆر بێحالم !

وەزیر کە بینی پاشا زۆر بێحاڵ بوو.. ژیانی لە لا تاڵ بوو وتی :

هاها..چۆن دەستکاری کاری خوا دەکەم !؟ لە دۆزەخیدا خۆم ڕسوا دەکـەم !؟ گەر پێت خۆش بێ کەنیزەکێ ... ئارەزووی تۆ دەپێکێ !

پاشا لە وەڵامدا وتی :

گەر پاشا کەنیزەك بێنـێ .. ناوبانگی دەدۆڕێنێ ! نـە ڕەچـەلەك دیار دەبێ ! نەخێزان ناواردەبێ .

دەترسـم ( زۆڵ ) وەبـەر بێنـێ .. وڵاتم بـە شـەڕ بێنـێ ..! وەك زەوی خوێیـاوك بـێ ..چی بچێنم وشك بێ ! یا لێم هەڵگەڕێتـەوە .. زوو..زوو لـێم ڕاست بێتـەوە..! منـیش دەمەوێ : فەرمانی چاکەی پێدەم .. لە خراپەش دوور بێتەوە . نەك هـەر بـەگوێی مـن نـەکا.. لێشم ڕاست بیێتەوە..! کەنیزەکم ناوێ .. کچە شایەکم بۆ بدۆزەوە . با.. ڕەچەڵەکی ناسراو بێت . جوانیەکەشی بەرچاو بێ . خانەدان بێت.. خانەدان .. موسڵمان بێت .. مۆسڵمان ..!!

وەزیر وتی :

خوا.. بە ئاواتی خۆتی گەیاندیت .چونکە بیستوومە شا (زەهر)ی خـاوەنی زەوی سپی : کـچێکی زۆر جـوانی هەیـە . بـەوەیش وەسـف ناکرێـت کـە: سـەرو زمـانی هەیـە! . گوا... سروشتیش لە شێوەیەك دوانی هەیە !؟

جا..وا باشـە ، پیـاوێکی زانـا و بـە سـەلیقە و بەسـەر و زمـان بنێرینـە خوازبێنی . چونکە

کچەکە لە جوانیدا، کەم وێنەیە !

پاشایش دڵی کرایەوە .. ئاورێکی دایەوە. ئاوا وەڵامی دایەوە :

ئەی وەزیر .. بێ لە تۆ کەس شك نابەم ژیـر..! برۆکاروبـاری ماڵت ریـك بخـە، خۆت ئامادە بکە.. ئەو خوازبێنی یەم بۆ بکە . لە ماڵی کچە نەگەڕێیتەوە.. تا مـژدەی رازی بـوون دێنیتەوە .

وەزیریش وتی : بە چاوان .

وەزیر چووەوە ماڵ . ئامادەی کرد دیاریی زێڕی چەند مسقاڵ. دیـاری بـچووك و کـێش ئاسان .. بەڵام وەکو نرخ گران . بە چـەند ئەسـپی رەسـەنەوە .. (١٠٠) کۆیـلـەی رەبەنـەوە.. (١٠٠) کەنیزەکی شۆخ و شـەنگەوە . ئاڵایـان بـە ژوور سـەرەوە . بـەرەو مـاڵی کـچە ، کەوتنـە گەردان ، کە دوای چـەند رۆژێ پاشـایش دێتـە سـەردان . ئیـدی وەزیـر و کـاروان .. کەوتنـە بڕینی چۆڵ و بیابان . تا ئەو شوێنەی کە رۆژە رێیەکیان مابوو بگەنە جێ و لایان دا .

وەزیرکۆمەڵە کەسێکی ئامادە کرد ، بەرەو لای( زەهر ) شا. رێکەوت وا بـوو. ( زەهرشـا) چوو بووە دەرەوەی شار. بۆ گەشت و گوزار . کە لە دەروازەی شار ئەوانی بـینی . زانیـی کـە کۆمەڵە کەسێکی نامۆن بە شارەکە. بۆیە فەرمانیدا بیان هێنن . کە پاشا لە کابرای پرسیی . زانی ، نوێنەری ( سولەیمان ) شایە . خاوەنی زەوی یە سەوزەکانە . بە خێـری هێنـاو رێـزی لێ گرت و فەرمانیدا بکەونەوە رێ بەرەو شار .

دواتر لێی پرسین : لەکوێ هەڵیان داوە ؟

ئەویش وتی : ئەم بەیانی یە لەسەر فلانە جۆگە ئـاو، جـێم هێـشتن . سبـەینێ دەگەنـە شار. خوا..پایەدارت بکات .

ئیدی ( زەهر) شا فەرمانیدا بە وەزیر و پاسەوان و خزمەتکاران و پیـاوانی دەوڵـەت . بـچنە پێشوازیی وەزیری سولەیمان شا و بە خێریان بێنن . لەو لایشەوە ، لە نیـوە شـەوەوە وەزیـر کەوتبووە رێ بەرەو شار.

بۆ بـەیانی ، کـە دەشـت ودەر. سەرپۆشـی زێـڕێنی تیـشکی خـۆری پۆشـا . پیـاو مـاقووڵانی دەوڵەت ، میران و وەزیرانی مەملەکەت ، پێیان گەیشتن . ئیدی بە کۆمەڵ چوونەوە ناو شار لەوێوە بۆ کۆشك .

بە (٧) دالان دا تێپەڕین . سەرکەوتن ، تاکو بەرهەیوانێك . سەکۆیەکی لە مەڕمەڕ دروست کراوی تیابوو . کە چوار پێچکە لە شفرەی فیل راگیری کردبوو. راخەرێکی سەوزی بە سەردا درابوو. کە بە زەخرەفەی زێڕین . نەخشی کرابوو . چەندین تاڵی نەخشاو بـە گـوێ زێڕینی لەسەردا بۆ شۆڕ بوو بووەوە . ( زەهر) شا لە سەری دانیشتبوو.

کە وەزیر گەیشتە لای . نوشتایەوە و کردی سلاو .

بە لۆمەکاران:بڵێن کۆڵ بدەن چوون مەیلت لەدڵ ناتوانن دەرکەن

دڵ لە خۆم تۆرا: وا بەلای تۆوە
دڵەی سەرەڕۆ ڤەیناکا: برۆ
هیچ شتێك ئاوا دڵشادم ناکا
ئەگەر تەمەنێك سەیری باڵای کەی
گەردەستی نزای چاکەت باڵاگرد
پاشای بەخشەندە:ئەمن پێم وایە

گەنجیی نەویستم: کردمی بە پەن!
تۆجێگات خۆش بێ:ئێمەش بۆ ئەڵوەن
بە هێندی ئەوەی:بە ( شا)دا هەڵەن
ئەنجام: براوەی شادی و دەوڵەمەن
هەمووان بەشدارن:لەوانەی کە هەن
هەڵەن هەژاران :پەنات بۆ نەبەن..!

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو

## شەوی ١٠٨

شەهرەزاد وتی :

وەزیـر لـەو رێ و رەسمـە بـووەوە و زەهرشـا، هێنایـە نزیـك خـۆی و رێـزی گـرت . تاکو درەنگانێکی شەو دانیشتن . سبەینێ ، سفرە و بەرچای رێکخراو میوانان تێر و پڕیان خوارد و هەر یەکە و چوو بە لای کاری خۆیەوە . تەنیا خزمەتکاران و دانشتوانی کۆشك مانـەوە . وەزیری میوان هەلی چۆڵی دەورو بەری شای قۆستەوە و هەستا و کرنووشی بۆ برد و وتی :

ئـەی پاشـا گـەورە.. گـەورەی ئـەم دەورە . داوامـان هەیـە دڵمـان نەشـکێنی .. نوێنـەری (پاشا)م هاتوومە خوازبێنی ! شاسولەیمان خوازیاری خزمایەتی بەرێزتانە و داوای کچەکەت دەکات بۆ خۆی . کە زەهرشا ئەمەی بیست ، هەستایە سەرپێ . دەسـتی رێـزی بـە سنگەوە گرت و دانیشتوان لەو رێزە فرەیە ، سەراسیمە بوون .

هەر بە پێوە ( زەهرشا ) وتی :

ئـەی گـەورە وەزیـر دانـاو بـە تـەگبیر . ئێمـەش هـاوڵاتی سولەیمان شاین . شانازی بە خزمایەتی ئەوەوە دەکەین . کچەکەیشم ، بە یەکێك لـە کەنیزەکـەکانی خـۆی دابـنێ . (شا) جێی متمانەی ئێمەیە . ناردی یە شوێنی ، قازی و شایەت . شا سولەیمان وەزیری کرد بووە وەکیلی خۆی لەم ژن مارەکردنەدا . ئەمجا خۆی مارە برینەکەی لەوێدا جێ بە جێ کرد و ئاهەنگ کرا. وەزیریش هەموو دیاری یەکانی سولەیمان شای پێشکەش بە ( زەهر) شا کرد .

پاشایش فەرمانیدا : مەملەکەت شادی بکەن .. ئاهەنـگ بگێرن .

بۆ ماوەی دوو مانگ زەماوەند لە شاردا گێرڕاو خواردن و شیرینی بەخشرایەوە . دڵخۆش بوون . لە دەورو بەری شار دەوار لێدرا. سابات و کەپر چاك کرا . سەماکەرانی کەنیزەکی رۆم ئامادە کرا . کیژانی تورکان بۆ پـەزێرایی دانـران . بـووك بـە زێـڕ و زیـو و نەختینەی گران بەها ئامادە کرا . جیازیی (٢٠) بـاری وشـتر دوای خـرا. کاروانی وشتر و هێستر بەڕێ کرا... کاروان رووی لە وڵاتی سولەیمان شا کرد . زەهـر شـا، تـاکو دووری (٣) فرسـەخ بەڕێی کردن . ئەمجا بە دڵی خۆش و ئاسوودەوە بۆ شاری خۆی گەڕاوە . وەزیـر کچی شای برد و

ڕۆیشتن ، ئەو شاخ بۆ ئەو دۆڵ ، دارستانی چڕ، دەشتی چۆڵ و هۆڵ ، ڕێگایان بڕی . تا ئەو شوێنەی‌کە(٣) ڕۆژە ڕێیان مابوو بگەنەوە مەملەکەتی خۆیان . وەزیر تەتەری ناردەوە کە هەواڵ گەیشتنی بووك ، بە پاشا بگەیەنن . کە تەتەر هەواڵەکەی دایە پاشا. پاشا زۆر شادبوو، مژدانەی زۆری دایە . فەرمانی دایە ، جەنگاوەرانی تایبەت بە خۆی کە لەشکر ڕێك بخەن . بەرەو کاروانی بووکە بڕۆن . زۆر بەڕێزەوە بیهێنن . ئەمجا جاڕیان دا لە شاردا، کە دەبێت . نە پیرەمێردێ ، نە پیرەژنێ لە ماڵدا نەمێنێ . با بچێتە پێشوازیی بووکی پاشای شارەکەیان . بۆیە هەموو خەڵکی ڕێکەوتن ، کە ئاهەنگی بووکە تا شەو سەرومڕ بێت و بەرەو کۆشکی پاشای دەبەن . پیاوماقوڵان و سەرانی دەوڵەت بڕیاریان دا.کە خەڵکە کە بچنە کەناری ڕێگاو بانەکان بۆ بینینی بووك. خۆی و کاروانی جیازی و کەنیزەك و دەست و پێوەنەکانی . هەر کە بووکە گەیشت . سەربازەکان چوار دەوریان گرت . کەژاوەش بەڕێوە بوو. تاکو گەیشتنە نزیك کۆشکی شا. ڕمی جەنگاوەران دەلەرانەوە . ئاڵاکان بە ئاسمانەوە . بۆنی مسك و عەتری خۆش ، خەڵکی کردبوو سەرخۆش . دەنگی تەپڵ و کەڕەنا... یاخود دەهۆڵ و زوڕنا . شەو بووك بە نیو ڕیز بەندی ئەمبەر و ئەو بەری کەنیزەکە ڕازاوەکاندا ڕۆیشت کە دەتوت مانگە لە نێو ئەستێرەکاندا. یان مرواریی نێوان زیوو . بردیانە ژووری خۆی . کە چرپای تیا ڕازابووەوە .

شاییەکیان بۆ گێڕا، دانیشتوانی شار دەیان وت :

مەملەکەت ئاهەنگی وای بە خۆوە نەدیووە !

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو

**شەوی ١٠٩**

## چیرۆکی خاران تاجی شاهان

شەهرەزاد وتی :

دوای ساڵێك شا ژن ، کوڕێکی بوو. کە پاشا ئەم هەواڵەی بیست زۆر دڵی خۆش بوو . مژدانەیەکی باشی دایە هەواڵ هێنەکە . نێو چاوانی ساوای ماچ کرد .

دەتوت ئەو شیعرە بۆ ئەو وتراوە :

خوا بە جۆرێکی ئەم کوڕەی داوە — شێرە و ئەستێرە : هێزی پێداوە

چارەی ئەبەردی و ئازایەتی یە — کۆڕی گیانبازان : ئاسکیان هێناوە

سەرپشتی شێری مەخەن کە نزمە — سواری ئەسپی کەن کە جێگای پیاوە

زۆر زوو لە شیری بیڕنەوە — بە خوێنی دوژمن ئەو گۆش کراوە

مامانەکان کوڕەیان برد و ناوکیان بڕی و کلیان لە چاوان کرد . ناویان نا .. ( تاجی شاهان ) . ساڵان هات و ساڵان چوو . منداڵ تەمەنی بە (٧) ساڵان بوو .. ئەمجا سولەیمان شا،

زانایان و ماموستایانی بۆ گرت ، تا چەندین ساڵ ، وانەیان پێ وتەوە . خۆش نووسی و ئەدەب و زانستیان فێر کرد . تاکو کردیانە ڕۆشنبیرێکی بە توانا. ئەمجا ماموستای سوار چاکی و رمبازیی بۆ گرت ، لە گۆڕەپاندا فێری سوار چاکی و شەڕەشیر و رمبازی کرد . تەمەنی گەیشتە (١٤) ساڵان . گەورەتر بوو. کە گەیشتە (١٨) ساڵان . خاڵی سەر ڕوومەتی دەت وت : خاڵی عەنبەرە لە سەر لێوی سووری .

| | |
|---|---|
| ئێستا یوسفیش جێی گیرایەوە | لە شوێنی: لاوێك دانرایەوە |
| بۆ ساتێ وەرە ، بکە تەماشای | ژیان بە جوانیی ئەو رازایەوە |
| بە چاوان شتی وا کوا بینراوە؟ | سروشت بوو ئاوا خستی یە کایەوە |
| خاڵە سەوزەکەی گۆنای پەمەیی | لە سای دیدەی رەش دەبریسکایەوە |
| سەیرە خاڵەکەی لێوانی سووری | گڕی نەگرت و نە توایەوە..! |

تاجی شای خاران . دۆست و برادەرانی هەبوو . کە خوازیاری ، وەفاتی باوکی بوون . تا ئەم کوڕەی ببێتە جێنشینی باوکی و ئەوانیش ببنە میری دەربـاری جێنیـشین . تـاجی شای خاران خووی دایە، راو و شکار . سلێمان شای باوکی زۆر بە خەم بوو لەو ئارەزووەی . ترسی ئەوەی بـوو نـەبادا دڕنـدەی کێوان کوڕەکەی لـە ناوبـەرن . بـەڵام کوڕەکـە ئامۆژگاریەکەی وەرنەدەگرت .

وا ڕێکەوت رۆژێکیان بە خزمەتکارانی وت :ئالیکی (١٠) رۆژ بۆ ئەسپەکەی ئامادە بکەن.

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو

## شەوی ١١٠

*شەهرەزاد* وتی :

ئـەی شا شەهرەیـار .... پادشای بـەختیار !

خۆی و هاوڕێیانی چوونە دەشت .. بۆ راو و شکار و گەشت . (٤) رۆژ بەرێوە بوون .. تا گەیشتنە پێ دەشت . چەند تەپۆڵکەی بەرز.. زەوی ئاڵ و واڵا و سەوز . رەز و باخ و گوڵ و گەڵا.. ئاویان تێدا هەڵ دەقوڵا . ( تاجی شاهان ) فەرمانیدا : تەپکە و تەڵە بنێنـەوە . ( داو ) و( تۆڕ ) دابنێن..! خۆشتان بچنە حەشارگە دواتر، پەلامار درا.. چەندین ( نێچیر) بە تیر و کەوان کوژرا.

ئەو باڵندە و دڕندانەی کەوتنە تەپکەوە گیران . ( تاجی شاهان ) بەسەر راوچیانیدا دابەشی کرد .

هەندێ لە دڕەندەکانی بۆ سلێمان شای باوکی بە دیاری نـاردەوە . ئـەو شـەوە لـەوێ مانـەوە .کە رۆژ بووەوە . روانیان کاروانێك بـەرەو روویـان هـاتن . کۆیلـە و خزمـەتکار و منـداڵان و کەنیزەکیان پێ بوو .

( تاجی شاهان ) چەند کەسێکی نارد پرسیاریان لێ بکەن .
نوێنەران چوون و پرسی یان : چی دەکەن لێرە ؟ لە کوێوە هاتوون؟
ئەوانیش وتیان :
ئێمە بازرگانین و ڕێمان دوورە . لەم ڕەز و باخ و ئاوە لامان داوە . چونکە ئێرە وڵاتی سولەیمان شایە . وڵاتێکی ئارام و ئاسایشە . شتومەکی بە نرخمان پێ یە و بۆ ( تاجی شاهان )مان هێناوە . گەڕانەوە لای شاو قسەکانیان بۆ گێڕاوە .
شا وتــی : کەوابوو ، با بچین شتەکانیان ببینم .
سوار بوو ، خزمەتکارو دەست و پێوەند ، شوێنی کەوتن .. بازرگانان لە بەری هەستان و بۆی پاڕانەوە ..کە خوا دەست بگرێت بە باڵیانەوە . دەوارێکیـان بۆ هەڵدان بە نەخش و نیگار رازا بووەوە . زەخرەفەی زێڕینی تیا نەخشابوو. مرواری تێ کرابوو . ( تاجی شاهان ) دانیشت و، خزمەتکاران و کوێلەکان ، لەبەر دەرگای دەوار ریز بوون . شا فەرمانیدا بازرگانان کاڵاکانیان بێنن .
دوای تەماشا کـردن هـەر چی یـەکی بـە دڵ بـوو جیـای کـردەوەو نرخەکـەی پێـدان. باروبنەیان پێچایەوەو تاجی شاهان سوار بـوو و دەسـت وپێوەنـدان بـە دوایـەوە . لـە کـاتی ڕۆیشتندا، ئاوڕێکی لە کاروانـە کـە دایـەوە . لاوێکی بینی شـۆخ و شـەنگ ... بـەرگی پـاك و ڕەنگاو ڕەنگ . ڕووی ئاسکی بە ئاوەنگ..جوان هەر وەکو مانگ . بەڵام پێوەی دیار بـوو. کـە هێندە بە خەمەوە گریابوو. زەرد هەڵگەرابوو .
بە خەفەتەوە.. ئەم شیعرەی دەوتەوە :

ئەم دابڕانە جەرگی برە بۆم  خوێ یەو دەکرێتە جگەری بە سۆم
هەر لەو ڕۆژەوەی دڵم کەوتە لای  پێ دڵم بۆیە... جێ ناگرم بە خۆم

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

شەوی ١١١

شەهرەزاد وتی :
کە لاوەکە. شیعرەکەی خوێندەوە دەستی کردە گریان و بوورایەوە .
تاجی شاهانیش ، بەسەر سووڕمانەوە سەیری دەکات . لاوە بەئاگا هاتەوە ڕوانی شازادە ، بە سەرسەریەوەیە . بۆیە خێرا هەستاو کڕنووشی بۆ برد .
تاجی شاهان پرسیی :
بۆچی کاڵاکەی خۆتت . پیشان نەدام ؟
ئەویش وتی :
گەورەم کاڵاکەی من شتی وای تیا نییە بۆ پاشایان بشێت !!

پاشایش وتی :

ئەخێر دەبێت کاڵاکانت ببینم . بە سەر هاتی خۆیشتم بۆ بگێریتەوە . گەر زوڵمت لێ کراوە تۆڵەت بسەنم . گەر قەرزاریت با قەرزەکەت بۆ بدەمەوە . چونکە دڵم پێت دەسووتێت .

تاجی شاهان فەرمانیدا دوو کورسیی دار ئەبەنووسییان بۆ دانا . فەرشێکی نایابیان بۆ راخست .کە بە ئاوریشم چنرابوو. تاڵی زێری تێ هەلکێشرابوو.دانیشت و فەرمانی بە لاوەکەدا کاڵاکەی خۆی هێنا .

لاوەکە وتی :

گەورەم ئەم کاڵایانەم ، بە تایبەت بۆ تۆ نەهێناوە .

هەندێ هەرزەکاری بانگ کردو فەرمانی پێدان کاڵاکان بهێنن. کە لاوەکە کاڵاکەی خۆی بینی دەستی کردەوە بە گریان . یەکە یەکە پارچەکانی پیشان دا. لە نێوانیاندا پارچە قوماشێکی (ئەتلەس)ی تێدا بوو ، کە بە زێڕ چنرابوو . بایی (٢٠٠) دینار بوو . پارچەیەك قوماشی لەدەست کەوتە خوارەوە . لاوەکە، زوو هەڵی گرتەوە و خستیە ژێر ڕانی . تاجی شاهان کە ئەمەی بینی سەری سووڕما..!

بۆیە لە لاوەکەی پرسی : ئەو پارچەیەی ژێر رانت چی یە!؟

لاوەکە وتی :

گەورەم هەرلەسەرەتاوە کە وەکو بازرگانەکانی ترکاڵاکەم نەخستە بەردمت . لە بەرئەم پارچەیە بوو.

تاجی شاهانیش وتی : دەبێت هەر بی بینم .

پاشا تووڕە بوو . لاوەش کە چاری نەما هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی :

گەورەم بەسەر هاتەکەی سەیرە! پارچەکەی یەکاڵا کردەوەو ولە بەردەمیدا: رای خست.

تاجی شاهان ئاسکێکی بینی تیدا نەخش کرابوو. زێڕ و زیویشی تێکەڵ کرابوو. لە بەرامبەری ئاسکێکی تر وێنە کێشرابوو .

ئەمیان بەتان و پۆی زیو چنرابوو. بەڵام بازنەیەکی ئاڵتونی لە ملدا بوو. کە تیکەڵ بە(زبەرجەد) کرابوو..

تاجی شاهان سەری سووڕما..! وتی : بەسەر هاتەکەت بگێڕەوە .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

**شەوی ١١٢**

چیرۆکی عەزیز و عەزیزە

شەهرەزاد گێرایەوە :

گەورەم کوڕە تاقانەی باوکی گەورە بازرگان بووم . کچە مامێکیشم لە ماڵەوە ، لەگەڵمان

پەروەردە دەکرا . مامەم .. واتە باوکی کچەی ئامۆزام . لەگەڵ باوکم ڕێك کەوتبوون .کە ئێمە گەورە بووین لە یەکتریمان مارە ببرن و ببینە ژن و مێرد . مامەم مرد و باوکم ئەو کچەی هێنایە لای خۆی .

ڕۆژێکیان باوکم بە دایکمی وت :

ئەمساڵ ( عەزیزە )ی برازام ، لە ( عەزیز )ی کوڕم مارە دەبڕم . بە هەردووکیان کەوتنە ئامادە کردنی پێداویستیەکانی تەدارەك و ئاهەنگی زەماوەند . پاش نێوەڕۆی هەینی یان دانا کە مەلا و شایەت بێنن و ڕێو ڕەسمی مارە بڕین بە جێ بێنن .

باوکم رووی لە دراوسێ و هاوڕێ بازرگانەکان کرد و بانگ هێشتی خۆیان و خێزانیانی کرد . هۆڵ شۆردرا. ماڵ ڕازێنرایەوە دیوارەکان ، نەخشێنران . فەرش و قالێ داخران . شەربەت و شیرینی ئامادە کرا و دەبوو دوای نوێژی هەینی میوانان بێن ..

ئیدی هەر ئەوە مابوو کە ڕێ و ڕەسمی مارە بڕین جێ بە جێ بکرێت . دایکم منی ناردە گەرماو و جوانترین جلوبەرگی نوێی بۆ ئامادە کردم . لە گەڕانەوەدا ، هێندە بۆنی خۆشم لێدرابوو ڕێبوارانم سەرسام دەکرد . ویستم خۆم بکەم بە مزگەوتدا . بەلاّم هاوڕێ یەکم بیرکەوتەوە . حەزم دەکرد، لە مارەبڕینەکەمدا ئامادە بێت .

لە دڵی خۆیشمدا وتم :

دەی خۆم بەو هاوڕێ یەوە سەرقاڵ دەکەم ، تا کاتی بانگ دێت .

خۆم بە کۆلاّنێکدا کرد . کە پێشتر نەم دی بوو.. چونکە خۆم شت بوو. بەرگەکانیشم نۆی بوو. ئارەقێکی زۆرم کرد بووەوە. لەو سەری کۆڵانەکە دانیشتم و ویستم ،بحەوێمەوە. لە بەر ئەوەی کە دەستە سڕەکەم لە ژێر خۆمدا ڕاخست و ویستم ئارەقەی نێو چاوانم بسڕمەوە .

هێندەم زانی ، دەستە سڕێکی سپی کەوتە کۆشمەوە . منیش سەرم بەرز کردەوە . تا بزانم ، ئەم دەستە سڕە لە کوێوە خراوەتە خوارەوە!؟ سەرنجم بە چاوانی خاوەنی ئەم ئاسکەوە گیرسایەوە . کە لە پەنجەرەکەیانەوە سەری دەرهێنابوو. هێشتا شتی وا جوانم نەدیبوو. ئەویش سەیرێکی کردم و پەنجەی خستە دەمی . ئەمجا دوو پەنجەی پێکەوە نوساندن و خستی یە سەر سنگی . سەری کردەوە بە ژووردا و تاکی پەنجەرەکەی داخست . سەراسیمەی کردم..! نە لە قسە و نە لە ئاماژەکەی تێ گەیشتم .

جارێکی دی سەیری تاکی پەنجەرەکەم کردەوە بەلاّم داخرابوو. تاکو ڕۆژئاوا لە جێی خۆمدا چاوەڕوان بووم . بەلاّم نە کەسێکم بینی، نە هیچم بیست . بەرێدا دەرۆیشتم و دەسرۆکەکەیم کردەوە. بۆنێکی هێندە خۆشی لێ دەهات . ، وەکو لە بەهەشتدابم وابوو. قەدەکەی تری دەستەسڕەکەم ، بەدەم ڕێوە کردەوە . کاغەزێك کەوتە خوارەوە، کە کردمەوە . جۆرە بونێکی لێ دەهات .

ئەم شیعرەی بۆ دەبوو:

دوودێڕی نووسی، زۆر بە شەرمەوە — بە بۆنی گۆنا و لێو و کوڵمەوە

چاوان ئەبڵەقی، قەد و باڵای بوون — یەکسەر گیانیشم کەوتە دڵمەوە

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ١١٣**

شەهرەزاد وتی :

کوڕەکە وتی :

ئەو شیعرەم بە دەستە سرەکەوە بینی . هێندەی دی تاسە یم کرد . کاغەز و دەستە سرەکەم هینایەوە ماڵ ، بێ ئەوەی بزانم کە ئەو دەستە سرە زیانم پێ دەبەخشێت . شەو درەنگانێ گەیشتمەوە ماڵ . کە دەڕوانم ئامۆزاکەم دانیشتووە ودەگری . کە منی بینی چاوانی سڕی و هات بە پیرمەوە ولێی پرسیم کە بۆ چی وا دواکەوتووم . ئاخر هەموان هاتبوون ، هەر لە وەزیران و میران و سەرکردەکانی سوپاوە تاکو پیاوماقوڵان و خزمان و ناسیاوان . قازی و شایەتان : نانیان خوارد و زۆر چاوەڕێی تۆیان کرد . تاکو ڕێورەسمی مارە برین جێ بە جێ بکەن . دواتر بڵاوەیان لێ کرد .

ئەمجا پێ وتم :

باوکت هێندە تووڕە بوو. سوێندی خوارد لە داخی ئەو هەموو خەرجی یەی کە کردبووی :تاکو ساڵێکی تر ئەم مارەبڕینە دووبارە نەکاتەوە .

ئەمجا ئامۆزای دەزگیرانم پرسیی :

باشە .. تۆ چیت بە سەرهات . کە ئاوا..دوا کەوتیت و ئەمەت بە سەر هێناین ؟

منیش وتم : ئامۆزا هەر مەپرسە.. چیم بە سەر هات!؟

ئەمجا منیش دەستە سڕەکەم پیشان داو لە نووکەوە بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕاوە . ئەویش دەستە سرو نامەکەی لێ وەرگرتم و خوێندی یەوە . فرمێسك بە چاوانیدا، هاتە خوارەوە . من لە تاو خاوەن نامەکە، هەر گوێیشم نەدا: بە گریانی ئامۆزاکەم . ئیدی دەستم دایە خواردنەوە و رابواردن ..!

ئێوارەیەکیان کە گەڕامەوە .. سەرنجمدا کچە ئامۆزام دەستێکی بە دیواری ژوورەکەوەیە و دەستەکەی تری لەسەر سنگی داناوە و ئاوا... خۆی دەلاوێنێتەوە :

کیژەی دەشتەکی دڵ لە هەوارە — حیجازیش بۆ ئەو خەمە و پەژارە

تاسەی دووری یەکەی ماڵە باوانی — سووری کرد چاوی ئەو چاو خومارە

من خۆشم دەوێ و ئەو وا دەزانێ — عاشقی نیم و چـارم ناچارە...!

کە منی بینی چاوانی بەسەر دەستەکەی سڕی و بە پێکەنینەوە بەرەو رووم هات و

بەخێر هاتنی کردم .
منیش شەقێکم تێ هەڵدا . کچە لەبەر هەیوانەکەدا، بە دەمدا کەوت . نێو چاوانی دای بە لێواری بەرهەیوانەکەداو قڵیشاو دەم و چاوی خۆیناوی بوو . ئاموزا، بێدەنگ بوو . هەستایەوەو دەم و چاوی شت و بە رهەیوانەکەی لەخوێنەکە پاك کردەوە . دواتر نێو چاوانی بە پارچە قوماشێك بەست .

بە زەردە خەنەیەکەوە بەرەو رووم هات و وتی :

بەو خوایە ، ئاموزا، مەبەستم لەو شیعرە، گاڵتە پێ کردنت نەبوو . سەرم ئازاری دەدام . خۆم هەر دەم ویست : خۆین لە سەرم بگرم . ئێستاش کە ئەو خۆینەم لێ دەرچوو سەر ئێشکەم نەماوەو حەوامەوە !

کەوتە دڵدانەوەم . سفرەی رازاندەوە : خواردنی بۆ دانام . بەڵام شەقێکم لە خواردنەکەش هەڵداو رشتمە سەر سفرەکە !

بە خۆیشم وت : عاشقان شێتن .کوا نەفسیان دەچێتە سەر خواردن؟

ئەویش وتی : بەو خوایە ئامۆزا گیان ، ئەمانە نیشانەی خۆش ویستنە .

قاپەکانی کۆکردەوە و سفرەکەی پاك کردەوە و هەڵی گرتن . دواتر کەوتە دڵدانەوەم و پێکەنین بە رووومدا . کە رۆژ بووەوە . چوومەوە بۆ خواردنەوەو رابواردنەکەی جارانم . ئێوارە کە گەڕامەوە ماڵ". دەڕوانم ئامۆزا رووی کردووەتە دیوارەکە و دەستی بە چاوانەوەیە و دەگری . بەڵام دیار بوو هێندە منی خۆش دەویست نەیدەهێشت من پێی بزانم و دەیزانی کە لە چ پەرۆشی یەکی خوشەویستی دام .
سەری بەست بوو و چاوێکی بە گریان سوور هەڵگەرابوو . چونکە من بوومە هۆی شکاندنی نێو چاوانی .
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.*

## شەوی ١١٤

شەهرەزاد وتی :
کە ئامۆزا بە دەم گریانەوە منی بینی . بەرەو رووم هات و لەبەر هەنسك دان هیچی بۆ نەدەوترا ، هەروەها نەیدەوێرا، دەردە دڵی خۆیشیم بۆ بکات . کەوتە دڵدانەوەم و نەرم و نیانی بۆم . هەر چەند کاتی نان خواردنیش بوو . بەڵام نەیوێرا ، سفرە رابخات . بۆیە کەوتە گۆڕینی جلو بەرگی بەرم و ئەم شیعرەی لە بەرخۆیەوە وت :

چەرخی زە مانە دەسووڕێتەوە     دڵی بە خەمم هەر ناکرێتەوە
خوایە بەزەییت پێما بێتەوە     خەم و پەژارەم برەوێتەوە

رۆژی سێ یەم چوومە لای کچە دەلالێك، تاکو مارە کردنیم بۆ رێك بخات .کە ویستم

جێی بهێڵم .
قۆڵی گرتم و وتی :
بوەستە ! ئەم پارچە دەسرەی بۆ لە یەك کردەمەوە . سەیرم کرد وێنەی ئاسکی تیایە..!!
زۆرم ئەو وێنەیە بە لاوە جوان بوو..!
کە پێشکەشی کردم وتی :
ئەم چنینە کاری دەستی خوشکەکەمە..!
پرسیم : خوشکەکەت ناوی چی یە؟
ئەویش وتی :
ناوی ( نورالهدای )یە . ئەم دەسرۆکەیە هەڵبگرە بۆ خۆت .
ئەمجا خواحافیزیم لێ کردو کە گڕامەوە سەیر دەکەم ئامۆزاکەم سنگی خۆی دەکوتێت و دەگری ئەم شیعرەی چڕی :

با هەڵی کات بای شەماڵێ     خەم و پەژارەم راماڵێ
شنەی بەیان فێنکی یەو     بەختی رەشی تێ دەئاڵێ
حەرام بێ لێم چێژی دنیا     گەر ئامۆزا... بۆم نەناڵێ
ئەوە گڕی عەشقی تۆیە     دڵێ کردتۆتە .. زووخاڵێ

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

## شەوی ۱۱٥

شەهرەزاد وتی :
لاوە وتـــی : کەمتی بینی فرمێسکەکانی سری وبەرەو رووم هات و بۆم پێکەنی و وتی :
ئامۆزا گیان ، تۆ بە دڵی خۆشەوە خوا بە منی بەخشویت . من بە پەژارەی تۆوە دەژیم . لەگەڵ ئەوشدا خوایە .. لێی مەگرە! منیش هەر بیرم بەلای ئەو پارچەیەوە بوو کە وێنەی ئاسکەکەی تیابوو . هەرخێرا هەڵم دا بەردەمی ئامۆزا. ئەویش کردیەوە .
دوای سەیر کردنی وتی :
ئەمە پێشکەشی من بکە . من رازی بووم .
هەستاو جلوبەرگی بەرمی گۆڕی و وتی :
خۆا ، لەخراپەی دوژمنانت بپارێزێت .
دواتر کەوتە لاواندنەوە :

لاوازە و دڵم بە ئازار بووە     بەروومدا فرمێسك سەرە وخوار بووە
هەرچەندە یارم دابراویش بێ     بە گردەی جوانی دڵ بەختیار بووە

دەستم کردەوە بە جنێۆدان . ئەویش دەستی کـردەوە بـە گریـان . چاوانی سڕی و لێم

نزیك بووه وه و دەستی ماچ کردم . منیش لێی دوور کەوتمەوە .
ئەمجا پێی وتم :
ئامۆزا خوا عافوت بکات .
دەستی بە گریان کردەوە و منیش دڵم بۆی سووتا. ڕۆژێکی دی کە گەڕامەوە . سەیرم کرد، کچە ئامۆزا ڕاکشاوە و دایکم بە ژوور سەری یەوە دەگری .
دواتر پێی وتم :
خوا..( بەلا)ت لێ بدا بۆچ کوڕە مامێکی ئەم کچەیت..! چۆن کچە ئامۆزات نەخۆشە ولێی ناپرسیتەوە!؟
کە کچە ئەمەی بیست ، ڕاست بووە و بە ڕوویەکی خۆشەوە بەخێر هاتنەوەی کردم . منیش جێم هێشت بێ ئەوەی گوێی پێ بدەم . چەند ڕۆژێك نەهاتمەوە . دواتر بیرم کردن و گەڕامەوە ماڵ . گوێم لە شین و شەپۆڕ و گریان بوو .
کە دایکم منی بینی وتی :
( بەلا ) ... لێت بدات . چونکە خوێنی ئەم کچە مامەت لە ملی تۆیە !
ئیتر باوکیشم هات . شتیان و تەرمەکەمان برد و ناشتمان ودواتر خەتمەمان بۆ کرد . (٢) ڕۆژ هاتوچۆی گۆرستانمان کرد . تەعزیەکەی تەواو بوو، بەلام من زۆر بۆی بە خەم بووم .
دایکم هات و پێی وتم :
وەرە پێم بڵێ، ئەو کچە بە چی مرد!؟ خۆ.. من هەر چەند دەم دواند ئەو هیچی نەدرکاند..! چۆن بویت لەگەڵیدا کە ئاوا... مرد!؟
منیش وتم : هیچم لێ نەکردبوو.
ئەویش وتی :
خوا تۆڵەی ئەو کچەت لێ دەکاتەوە . چونکە هەتا مرد لە تۆ ڕازی نەبوو .کچە مامت کە لە گیانەڵادا بە ژوور سەری یەوە بووم .
چاوی هەڵبڕی و وتی :
ئامۆژن .. ئەم دوو ڕستەیە بە کوڕەکەت بڵێ : ( *وەفا شیرینە .. غەدر قێزمونە* .)
منیش فرە بەزەییم پێیدا دێتەوە . دیاری یەکی بۆ داناویت و سوێندی داوم . کاتێك بتدەمێ کە بۆی بگریت . هەر کاتێ ، بۆی گریایت دەتدەمێ..!
منیش وتم : دیاری یەکەم پیشان بدە .
بەڵام ئەو ڕازی نەبوو. منیش لەبەر هەرزەیی خۆم . هێندە گوێم نەدا بە مردنی کچە مامەکەم . ڕۆژێکیان بەرێکەوت ، ئەو کچەم بینی ، کە بووە هۆی مارە نەکردنی ئامۆزاکەم . هەواڵی ئامۆزاکەمی پرسی .

منیش وتم : مرد و خەتمەیشمان بۆ کرد . ئەمە شەوی پێنجەمە کە مردووە .
کە ئەمەی بیست . بانگی هەڵداو دەستی کردە گریان و وتی :
ئەی ئەمگوت کە دەیکوژیت..! گەر پێش مردنی بە منت بووتایە . خەڵاتم دەکرد، بۆ ئەو کردەوەیەی بەرامبەر من نواندی . خەمی ئەوەمە دوای ، مردنی رسوا ببیت..!
منیش وتم : پێش ئەوەی بمرێت گەردنی ئازاد کردووم . بەر لە مردنی چیی بە دایکم وتبوو بۆ کچەکەم گێڕایەوە .
کچەیش پێی وتم :
ئەمجارە کە دایکت بینی یەوە ، لێی بپرسە : ئەو شتەی لایەتی چی یە؟
منیش وتم :
ئاسانە، چونکە دایکمی راسپارد بوو کە ئەم دوو رستەیەم پێ بڵێت : وتبووی : تو خوا، بە کوڕەکەت بڵێ ئەگەر جارێکی دی چووەوە ، شوێنەکەی جارانی . با ئەم (٢) رستەیە بکاتە هەڵەفەیەك و بیکاتە گوێی :
( *وەفــا شیرینە ... غەدر قێزەونە* ) .
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

**شەوی ١١٦**

شەهرەزاد وتی :
کە کیژە ئەمەی بیست وتی :
خوا لە گوناهی خۆش بێت چونکە تۆی لەچنگی من رزگارکرد. خۆم بۆ زیان لێ دانت مەڵاس دابوو .
منیش کە سەرم لەم قسەیەی سوورما بوو، پرسیم :
کە ئێستا ، یەکمان خۆشی دەوێت... ئەی ئەوسا نیازی چیت هەبوو؟
ئەویش وتی :
تۆ هێشتا باریت و بۆنی شیری خاو لە دەمت دێت ..! ژنان مەکریان زۆرە و فێڵاوین ..! تۆیش حەزت لە جوانی یەکەم کردبوو . بەڵام ئەو کچە ئامۆزایەت . تۆی دەپاراست و نەیدەهێشت . بکەویتە داوی فێڵمانەوە . ئیستاش، ئامۆژگاریت دەکەم . کچانی وەکو منت ، هەرگیز خۆش نەوێت و لێیان دوور بکەوەرەوە . چونکە ئیستا ئەو کچە ئامۆزایەی کە زۆر دڵسۆز بو بۆت نەماوە تاکو یارمەتیت بدات . وریا بـە .. با ئەو جۆرە ژنانە رسوات نەکەن .
دیسان وتی :
خۆزگە پێش مردنی بم توانیایە بم بینیایەوە . پاداشتی چاکەکانیم بدایەتەوە . خوا

لێی خۆش بێت .
ئەگەر ئەو نهێنیی نەپاراستایە. هەرگیز بە من نەدەگەیشتیت!! بۆیە حەز دەکەم شتێکم بۆ بکەیت .
منیش پرسیم : ئەو شتە چی یە؟
وتـــی : بمگەیەنیتـە سـەرگۆڕەکەی . حــەزیش دەکـەم: چـەند دێـڕە شـیعرێکیش لەسەرکێلی گۆڕەکەی بنووسم .
ئەمجا وتی : لەوێیش ، هەندێ لە ژیانیم بۆ بگێڕەوە .
منیش پێم وت :
باشە ئەم (٢) رستەیەم بۆ شی بکەرەوە :
( *وفـا شیرینە .. غەدر قێزەونـــە !* )
بەڵام ئەو گوێی خۆی لەم قسەیەم ، کەڕ کرد .
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

شەوی ١١٧

شەهرەزاد دەستی بە گێڕانەوە کرد و وتـــی :
ئـــەی شا شەهرەیار .. خـــاوەنی بڕیار ..
لاوە وتی :
رۆژی دواتر چوومەوە بۆ لای کچەکە و ئەویش دەستی دایە توورەکەیەك پارەو پێی وتم هەستە.. بـابڕۆین گۆڕەکـەیم پیـشان بـدە. باهـەڵی ببەسـتین و گومـەزێکی بـە سـەرەوە دروست بکەین . چەند شیعرێك لەسـەرکێلەکەی بنووسـیین . هەرچی یـەکیش لـەم پارەیـە مایەوە بۆی دەکەین بە خێر .
منیش پێشی کەوتم ئـەو لـەدواوەو جارجارە دەسـتی بـە توورەکەکـەدا دەکرد و خێـری دەبەخشی یەوە .
هەموو جارێك لە بەرخۆیەوە دەیوت :
ئەم خێرە بۆگیانی( عەزیزە ) ، کە تا مرد نهێنیی پاراست .
گەیشتینە گۆڕستان و توورەکە پارەکە هیچی تیانەمابوو.
خۆیدا بەسەر گۆڕەکەداو زۆری لاوانەوە .. قەڵەم و چەکوشێکی ناسکی جوانی دەرهێناو کەوتە هەڵکۆڵینی پیتی شیعرەکان .. زۆر جوانکارانە .. دەی نووسی...
گۆڕێکم بینی لە نێوان ئـاخا[9]     چوار لای لە خونچە ولە گوڵە باخا

[9] – ئاخا : خاکدا

له زێ یەوانم کە پرسی:کێ یە؟ وتی : کەسێکە گشت بۆی بە داخە !

نزام کرد:کەوا خودابی بەخشێ لە بەهەشت( پەری )جێگەی بۆ ڕاخا

عاشق:داماوە! تا لە گۆڕیشدا خۆڵی سەریشی وەك قیرو زاخە..!

بلوایە دەورم بە باخ دەکردی و فرمێسکی چاوم :دەکرد بە ناخا

ئیدی دەستی بە گریان کردەوە. دواتر کە جاروبارێك سەرم دەدا. زۆری ڕێز لێ دەگرتم. منیش سەرم کردە سەر خواردنەوە و جلوبەرگ و بەراستی خەمی ئامۆزاکەمم وەلاوە نا.

ڕۆژێکیان پێکێك شەرابم خواردەوە و چوومە دەرەوە، بێ ئەوەی بزانم زەمانە چی بۆ من سازداوە . بە کۆڵانێکدا دەڕۆیشتم ( نەقیب )یان پێ دەوت . پیرەژنێکم بینی ، مۆمێکی داگیرساو بە دەستێکی یەوە بوو . نامەیەکی لوول کراویش بەدەستەکەی تری یەوە .

کە گوێم لێ گرت ... ئەم شیعرەی دەوت :

سەر چاو: بە خێرت دێنم جوانی : زمان شیرینم

خـــاوەنی سڵاو و ڕێز .. هێز و تەوانا و تینم

هەر کە منی بینی وتی :

کوڕەکەم گەر دەتوانیت : ئەم نامەیەم بۆ بخوێنەوە .

نامەکەی دایە دەستم ومنیش بۆم خوێندەوە نووسرابوو:

( لەکەسـێکی دووره دەسـت ، بـۆ ئیـوەی ..خۆشەویـست ! ) . کـە ئەمـەی بیـست زۆر خۆشحاڵ بوو.

پێ ی وتم :

خوا ، دەرووت لێ بکاتەوە کە ئاوا.. دڵی منت خۆش کرد .

نامەکەم دایەوە دەستی . لێی داو ڕۆیشت .

کەچی دوای کەمێك هاتەوە سەرە ڕێم و وتی :

بە قوربانی سەرت بم . بەڵکو، تا ئەو دەرگای ماڵەی ئەوبەر ڕێگاکە لەگەڵم بێیت .بەڵکو ئەم نامەیەیان لەم دیو دەرگاکەوە بۆ بخوێنیتەوە ، چونکە بڕوایان بە من نەکرد .

منیش پرسیم : بەسەرهاتی ئەم نامەیە چی یە؟

پێی وتم :

ئەمـە نامـەی کوڕێکمـە ، (١٠) سـاڵە نـەم دیـوە! بـۆ بازرگـانی چووە بـۆ وڵاتـان وئێمـەش دەستمان لێ شت بوو . وامان زانی بوو نەماوە . خوشکێکی هەیە ، شەو و ڕۆژ بۆی دەگری . تا ئەوەبوو. ئەم نامەیەی گەیشتە دەستمان .

منیش وتم : ئەوەتا سەلامەتە و، ماوە .

پیرەژنەیش وتی :

ئاخر .. کوڕم : ئەمەی تۆم بەکچەکەم وت ، کەچی بڕوای پێ نەکردم و پێی وتم :

برۆ ئەوەم بۆ بێنە : کە نامەکەی بۆ خوێنیتەوە . پیاوی چاك بەو لەگەڵم وەرە و دڵی ئەویش خۆش بکە . پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی :

هەرکەس دڵتەنگان دڵخۆش نەکات .. خوا(١٠٠)جار دڵتەنگیی دەکاتەوە . منیش پەنام بۆ تۆ هێناوە . ناچار منیش شوێنی کەوتم .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگە بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ١١٨**

شەهرەزاد ئەم شەویش وەکو شەوانی پێشوو ، بەرامبەر شا شەهرەیار دانیشت و وتی : پیرەژن پێشم کەوت و من بە دوایدا. تا گەیشتینە ، بەر دەروازەی خانویەکی خۆش . دوو گۆیکەی مسی پێوە بوو . پیرەژن لە پشت دەرگاکەوە راوەستاو بە زمانیکی عەجەم ، بانگی کرد . هێندەم زانی کیژۆڵەیەکی پێ بە پاوانەی زێڕ بە خۆبادان هات ... هەر مەچەکە و (٢) بازنگی زێڕی تێدابوو ، کە بە مرواری دادەخران . ملوانکەیەکی ، زێڕینی گرانبەهای لە ملدا بوو وگوێ بە گوارەی مرواری سەر پۆشێکی بە سەردا دابوو. بە ( نقێم )ی گرانبەها نەخشابوو .

ئەمجا پرسیی :

دایە .. ئەمە نامەکەی بۆ خوێنیتەوە؟

ئەویش وتی : بەڵــێ ... کچە شیرینەکەم .

لە درزی دەرگاکەوە، دەستی بە نامەکەوە درێژ کرد کە بمداتێ تا بۆی بخوێنمەوە . هیندەم خۆش بوو، نامەکەم لێ وەرگرت . کاتێکم زانی پیرە ژنە ، لەدواوە سەری نا بە پشتمەوە و پاڵی پێوەنام .

کە چاوم کردەوە . لە دالانێکدام . پیرە ژنە، هەر زۆر خێرا خۆی بە ژووردا کردو دەرگاکەی لە ناوەوە کلۆم دا . کیژۆڵەکەیش بە روویەکی خۆشەوە بەرەو پیرم هات .

پیرە ژنە پێشم کەوت و کیژە بە دوامەوە . بە سەر (٧) دالاندا رەت بووین و منی بردە هۆڵێکی گەورە .کە(٤) هەیوانی بە چوار دەورەوە بوو، سەیرت بکردایە ، هێندە رازاوە بوو خەیاڵت دەڕۆیشت..! هەمووی بەردی مەرمەڕ بوو. پەراوێزی فەرشە راخراوەکانی ئاوریشم بوون . (٢) سەکۆی تێدا بوو. بە خشتی زەرد دروست کرابوون . سەری نەخشی زێری سوور بوو و بە نقێمی زێڕ و مرواری نەخشا بوو .

کەژاوەیەك بوون بۆ خۆیان .

پێی وتم :

کامیانت پێ باشە : ژیان یان مردن!؟

منیش وتم : بێگومان .. ژیــان .

ئەمجا وتی: کەواتە مارەم بکە و بمهێنە!
منیش وتم :
هیچ پێم خۆش نییە ، هی وەکو تۆ مارە بکەم .
ئەویش وتـــی :
گەر من مارە بکەیت لە (دەلیلە)ی دۆستت رزگار دەبیت . ئـەو دەلیلەیـەی کـە شەوانە دەچیتە لای ! و ئێستاخوا ئەوی تووشی بەلآ کردووە. بەو خوایە : لـەو ژنـە مـەکربازتر نی یە! پێش تۆ زۆری کوشتووە..! پێم سەیرە، چۆن تۆ لە دەستی ئەو قوتار بوویت !؟
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ۱۱۹**

شەهرەزاد دەستی بە گێانـــەوەی سەربووردەکە کردەوە :
ئـــامۆزا وتی :
کە ئەمانەی پێ وتم سەرم سوڕما!
منیش وتم :
خانم ..ئەو ژنە چۆن دەناسیت ؟
ئەویش وتی :
زەمانـــە .. چـۆن بـــەلآو قۆرتـــەکانی دەناسـێتەوە : منـــیش ئـــاوا، دەیناســـم . بەراســتی، دەمەوێت: بە سەرهاتی خۆتم لەگەڵ ئەو ژنەدا بۆبگێڕیتەوە ، تاکو تێ بگەم و بزانم چۆن رزگـارت بـووە لـە دەسـتی!؟ منـیش ... لەگـەڵ (عـەزیزە)ی کـچە ئامۆزامـدا، چیم بـە سـەر هاتبوو ، بۆم گێڕایەوە.
کە بیستی ئامۆزاکەم مردووە دوو دەستی پێکدادان و وتی :
خوا لێی خۆش بێت .. ئــــامۆزاکەت مرد و هەر ئـەویش بووەتـــە هۆی سەلامەتیی تۆ لە دەست ( دلیلە )ی مەکرباز . ئەو نەبوایە تۆ تیاچوو بوویت . هەر چەند سنگم پڕە لە قسە ، بەلآم ناتوانم هیچ بڵێم..! زۆر دەترسم لە ناوت برێت .
منیش وتم :
ئەرێ بە خوا.. ئەوە بەسەر هاتەکەم بوو ، کە بۆم گێڕایتەوە .
ئەویش وتی :
ئیدی چاوەڕێی ئەوە مەبە ( عەزیزە )یەکی ترت . دەست بکەوێتەوە!
منیش وتم :
پێش ئەوەی بمرێت . ئامۆژگاری کردبووم ئەم (۲) رستەیەی پێ بڵێم :
*وەفـــا شیرینە . غەدر قێزەونـــــە !*

كە ئەمەی بیست وتی :

دە .. بەو خوایە ئەو دوو رستەیە ، تۆی لە دەستی ئەو رزگار کردووە ! ئێستا دڵم بێ خەم بوو. ئەوە وا دەگەیەنێت کە ئیتر زیانت پێ ناگەیەنێت . کچە ئامۆزاکەت تا زیندوو بووە : نەی هێشتووە ، لە ناوت بەرێت . کەمردووشە بەو دوو رستەیە تۆی پاراستووە . دیارە تۆیش زۆر غەشیم و ساویلکەیت!

هیچ نازانیت لە مەکری ژنان و پیرەژنە فێڵبازەکان .

منیش وتم :

نە بەخوا ، هیچی لێ نازانم .

ئەمجا کیژەکە وتی :

بێخەم بە ..کە ویستم تۆ مارەم بکەیت دەمویست بە گوێرەی شەرع و سونەتی پێغەمبەر(د.خ) ببمە ژنت . ئیستاش دەوڵەمەندم و ( *نانی گەرمم لە خوانە .. ئاویش لە مەرکانە ..*)

چەپلەیەکی لێدا و فەرمانیدا : با بێن !

کاتێکم زانی قازی یەك و (٤) شایەت هاتن .

کچە هەر لەوێدا بە قازیی وت :

پێشەکی و پاشەکی مارەییم هەموو وەرگرتووە . لە سەروو ئەمانەشەوە بۆم بنووسن : (١٠٠٠٠) درهەمی ئەم مێردم قەرزارم .

ویستم برۆم ، کەچی وتی :

وەی.. وەی ! بۆچی پێت وایە، هاتنە دەرەوەش وەکو چوونە گەرماوەوەیە !؟ بە خوا پێم وایە .. وا دەزانی منیش خاتوو دەلیلەی دەستبڕم ! هەرگیز وا بیر نەکەیتەوە . تەنیا تۆ مێردی منیت و بە گوێرەی شەرع و سوننەت . گەر: سەر خۆشیت ، وەرەوە هۆش خۆت . ئەم دەرگایەش، ساڵی رۆژێك دەکرێتەوە. حەز دەکەیت برۆ سەیری دەرگاکە بکە .

منیش چووم سەیریکی دەروازەی دەرەوەم کرد و گەڕامەوە و وتم :

داخراوە و کڵۆم دراوە و بزمار ڕێژ کراوە .

ئەمجا وتی :

عەزیز گیان لە ئارد و برنج و رۆن و میوە و پەلەوەر و مەڕ هێندەمان هەیە، بەشی چەند ساڵێك دەکات . لە بەر ئەوە ئەو دەروازەیە ، ساڵانە دەکرێتەوە .

منیش وتم : لاحول و لاقوة الا باللة العلي العظيم ..

کیژەیش وتی :

چ زیانێکی بۆ تۆ هەیە ، گەر هەموو زەخیرەیەکمان هەبێت؟

ساڵێك من بە شوێنی یەوە بووم و هاتمە ئەو ماڵەوە . دواتر ویستم برۆمە دەرەوە .

ژنەکەم کە پێی زانیم وتی :
پەلە مەکە دوای بانگی ئێوارە چۆن هاتیە ژوور ئاوا. برۆ دەرەوە .
کە ئێوارە هات . ویستم بچمە دەرەوە. دەترسام !
ئەمجا هات و پێی وتم :
بەو خوایە.. تا سۆیندم بۆ نەخۆیت کە هەر ئەم شەو دێیتەوە : ناهێڵم برۆیت . منیش پەیمانم دایە .
ئەویش بە قورئان و شمشێر و بە تەڵاق سۆیندی دام کە بگەڕێمەوە. چوومە دەرەوە، لاواز و بێ تاقەت لەو ژیانە ناخۆشە ، چوومەوە رەز و باخەکەو ببینم وەکو جاران کراوە بوو.
بۆیە توورە بووم و وتم :
ساڵێکە ئێرەم جێ هێشتووە، کە ئێستاش گەراومەتەوە. دەرگا ئاواڵایە !
لە دڵی خۆمدا وتم : ئاخۆ..کیژەکە وەکو خۆی مابێت ، یان نا!؟ پێویستە ، بچمە ژوورەوە ، پێش ئەوەی سەر لە دایکم بدەم .
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.*

**شەوی ١٢٠**

شەهرەزاد دەستی کردەوە بە گێڕاندنەوەو وتی :
عەزیز وتی :
خۆم کرد بە رەزەکەداو کیژەکە هاواری کرد : هیندەم زانی (١٠) کۆیلە هاتن و پەلاماریان دام و دامیان بە زەویدا .
خۆیشی بە چەقۆیەکی تیژەوە هەڵی کوتایە سەرم و وتی :
هەر ئێستا سەرت دەبڕم و دەت کوژم . ئەمەش کەمترین سزایە ، لە بەرامبەر ئەو تاوانەتدا کە بەرامبەر ئامۆزاکەت کردووتە .
کاتێ سەیری خۆم کرد . لە ژێر دەستی کۆمەڵێك کۆیلە دام و کیژە بە چەقۆیەکی تیژەوە بە سەر سەرمەوەیە ، ئەو دنیام بە چاوی خۆم بینی . بۆیە لە کیژە پاڕامەوە . کەچی هیندەی دی توونید بوو،
فەرمانیدا، هەردوو دەستم ببەستن . ئەوانیش بەقسەیان کرد . فەلاقەیان کردم . هێندەیان لێدام لە هۆشی خۆم چووم .
کە بە ئاگا هاتم بە خۆم وت :
سەر برینەکەم لەم لێدانە پێ باشترە .
لەو کاتەدا قسەی ئامۆزاکەمم بیر کەوتەوە ، کە دەی وت :
*خوا ، پەنات بدات لە خراپەی .*

دەستم کردە هاوارو پاڕانەوە ، تاکو دەنگم نووسا.
ئەویش کەوتە تیژکردنەوەی چەقۆکە و بەکۆیلەکانی وت :
سەریم بۆ بگرن . منیش خواو راسان دوو رستەکەی ئامۆزامم بەدەمدا هات و وتم :
وەفـــا شیرینە ، غەدر قێزەوەنـــــە .
هێندەم زانی وەستا و قیژاندی :
خوا لێت ببوورێت عەزیزە ، تا کو زیندوو بویت بـە فریـای ئامۆزاکـەت کـەوتیت ، بـە مردوویش هەر فریای کەوتیت !
ئەمجا پێی وتم :
وا بە هۆی ئەو دوو رستەیەوە ئەمجارەش رزگارت بوو. هەستە بچۆوە بو لای ژنەکەت .
خوا لە ئامۆزکەت خۆش ببێت ... رزگاری کردیت . دەی برۆ سەرو قژت رێك بخەوە .
شەقێکی تێ هەڵـدام و هـەڵێ سـاندمەوە . ئیـدی منـیش بـە ماندوویـەتی ، وورده وورده گەیشتمەوە ماڵ .
کە دەروانم دایکم شین و شەپۆڕێتی و لە بەرخۆیەوە دەڵێت :
خۆزگە دەمزانی کوڕە شیرینەکەم ئێستا تۆ لە کوێیت ؟
منیش بەگریانەوە خۆمدا بە سەریدا . کە سەیری کردم زۆر بیحاڵ و زەرد هەڵ گەڕام .
ئامۆزاکەمی بیرکەوتەوە و ئەو هەموو خۆشەویستی و چاکەیەی بەرامبەرم !
پێی وتم :
کوڕەکەم ، باوکیشت مرد! تۆ هە ئاگایشت لێمان نییە !
منیش لە پەژارەیدا بوورامەوە . کە بە ئاگا هاتمەوەو سەیری شوێنی ئامۆزاکەمم کـرد . هێندەی دی گریام .
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.*

شەوی ١٢١

شەهرەزاد دەستی بەگێڕانەوە کردەوە و وتی :
دوای ئەوەی دایکی لاوەکە پێی وت : ئەوە (١٠) رۆژێکە باوکت مردووە .
کوڕە زۆر گریاو وتی :
ئێستا بۆ ئامۆزاکەم نەبێت بۆ کەسی تر ناگریم . چونکە ئەو منی زۆر خۆش دەویست و منیش ئەوم پشت گوێ خستبوو .
دایکیشم پرسیی :
کە چیم بە سەر هاتووە ؟

چیم بەسەر هاتبوو. بۆم گێرایەوە .ئەویش بۆم گریاوهەستا چوو، خواردنی هێناو پێکەوە خواردمان .

ئەمجا وتی : لە خوا بە زیاد بێت کە سەری نەبڕیویت!

دواتر کەوتە تیمار کردنم . تاکو چاك بوومەوە .

رۆژێکیان دایکم وتی :

ئیستا کاتی ئەومیە سپاردەی ئامۆزاکەتت پێشکەش بکەم و حەلاڵی خۆتە . چونکە سوێندی داوم ، کە بۆی گریایت بتدەمێ . ئیستا ئەو مەرجەت بە جێ گەیاند .

سندووقێکی هێناو ئەم پارچە قوماشەی دەرهێنا. کە وێنەی ئاسکی تیا نەخش کراوە و کاتی خۆی خۆم پێشکەشم کرد بوو.

نامەیەکی لێ کەوتە خوارەوە کە تیا نوسرابوو:

ئەوە بزانە ئامۆزا گیان . من گەردنم ئازاد کردیت . لەخوا دەپاڕێمەوە، لە فێڵ و بەلاو خراپەی (دەلیلە) بتپارێزێ ! سوپاس بۆ خوا کە مەرگم پێش مەرگت کەوت . ئەم پارچە چنراوەی کە وێنەی ئاسکی تیایە بپارێزە . چونکە ، کە تۆم لێ وون بوایە ، ئەم ئاسکە ، دڵنەوام بوو.

هەروەها نوسرابوو :

بۆ خاتری خوا.. تا دەتوانیت خۆت بە دوور بگرە لە خاوەنی ئەم ئاسکە . هەرگیز مارەی نەکەیت . بزانە کە هەموو ساڵێك خاوەنەکەی ئاسکێك دەنێرێتە دەرەوە . تاکو ناوبانگی بگاتە دەرەوەی وڵات . هەموو جارێك ، ئەم ئاسکە پیشانی خەڵکی دەدات و دەڵێت : خوشکێکم هەیە : وێنەی ئەم ئاسکە دەکێشێت و دەی چینێت . کە چی درۆیش دەکات . چونکە دەزانم بە هۆی ئەم ئاسکەوە دوورە وڵات دەبیت . کاتێك منت بیر دەکەوێتەوە .. سوودی نییە و قەدرم نازانیت..!

ئەو ئاسکەش . کچێك وێنەکەی دەچنێت کە خەڵکی دوورگەی کافوورە .

کە ئەمەم خوێندەوە دەستم کردە گریان . ئیتر دایکیشم بۆ من گریا. هەر سەیری ئەو وێنەیەم دەکرد و دەگریام . ساڵێکی رەبەقم بەو خەمەوە بردە سەر. دواتر هاوڕێ بازرگانەکانم باروبنەیان ئامادە کرد و کاروانیان رێکخست . دایکم کە بەمەی زانی ئامۆژگاری کردم ، کە منیش لەگەڵیان بڕۆم و بازرگانیان لەگەڵ بکەم . رەنگە بە هۆی ئەم سەفەرەوە، خەمم سووك ببێت .

پێی وتم :

کوڕەکەم ، بڕۆ .. ساڵێك یان دوان یان (٣) ساڵیشت پێ بچێت . ئەوە خەمەکانت بیر دەچێتەوە . ئاڵ و گۆڕێك لە ژیانتا دەبێت .. ئیدی زۆری هانە هانەدام . تا ئەوە بوو. شتومەکی فرۆشتن و کوتاڵم ، ئامادە کرد و لەگەڵیان کەوتمە رێ .

به درێژی سەفەرەکەم ، دڵتەنگ و چاو بە فرمێسك بووم . لە هەر شوێنێك لامان بدایە ئەم پارچە چنراوەم بلاو دەکردەوەو سەیری وێنەی ئاسکەکەم دەکرد و دەگریام . چونکە ئەو کچە ئامۆزایەم ، زۆر
زۆر منی خۆش دەویست و منیش ئەوم پشتگوێ خستبوو . تاکو بە داخی منەوە سەری نایەوە . ئەو چاکەی لەگەڵدا دەکردم و منیش خراپە .

ئەوەی خەمەکەمی زۆرترکرد. ئەوەبوو، گەیشتینە، دوورگەکانی کافوور.. قەڵای بلوور. کە (٧) دوورگە بوون ، پاشاکەیان ناوی ( شەهرەمان ) بوو وکچێکی هەبوو ناوی ( دونیا) بوو . بیستم ،کە ئەو کچە... ئەو ئاسکانەی وێنە دەکێشاو دەیچنین و وتیشیان :

ئەو ئاسکەش کە بە تۆیە، هەر ئەو چنیویەتی . دیسان تاسەی ئامۆزا هێندەی دی چاو بە فرمیسکی کردم و خستمیە بیرکردنەوەی ئەوە : کە ئاخۆ... جارێکی دی دەگەمەوە وڵاتی خۆم . تاکو لای دایکمدا بمرم !؟ دەستم لە دنیا شتبوو.. فرمێسکم دەباران لە چاوان .. بەم جۆرە خۆم لاوان :

پرسیم،گەی خەمم دەڕەوێتەوە؟ وتیان: ئەمەیشت بیر دەچێتەوە

ئیدی لەمەودوا پێت سەیرنەبێ تەمەن ڕێ بدا و بگەڕێیتەوە

دوای دابڕانی هەر خوا دەزانێ قەرزی ئەشکم کرد. تا نەبڕێتەوە

لۆمەکار وتی : ئارام بیت زاڵیت ! وتم : ( ئارام )یش دەتووێتەوە!

ئەمە چیرۆکی من بوو : پاشا گیان . ئاخۆ... چیروکی لەمە سەیرو سەمەرەترت بیستووە !؟

تاجی شاهان کە ئەمەی بیست . پەرۆشیی خاتوو دنیاش چووە هەستی یەوە.

شەهرەزاد هەستی کردشەو ڕەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٣٢**

شەهرەزاد دەستی کردەوە بە گێڕانەوەو وتی :

تاجی شاهان وتی :

بە ڕاستی بە سەرهاتی وا.. سەر سووڕهێن هەر نییە! حەزم لە پرسیارێکە.

عەزیزیش وتی : فەرموو بپرسە !

ئەویش پرسیی : ئەو کیژە چۆن بوو، کە ئەو ئاسکانەی وێنە دەکێشاو دەی چینین؟

عەزیز وتی :

قوربان ، فێڵم لێ کرد تاکو بینیم . بیستبووم ، ئەو شازادەیە ڕەزو باخێکی گەورەی هەیە . ئیتر منیش چوومە ئەو ڕەز و باخە . کە دارو درەختێکی زۆری تیابوو. کابرای باخەوانم بینی، کە پیاوێکی پیر بوو .

منیش پرسیم : مامە ئەم ڕەزو باخە هی کێ یە؟

ئەویش وتـی :
خاوەنی ئەم شوێنە شازادە ( دونیا )یە . کۆشکەکەی لە نێو ئەم رەز و باخەیە .. هەر کاتێك بیەوێت لە دەرگای نهێنی پشتەوە دێتە ناوی . تێر و پڕ بۆن و بەرامەی ، ئەم گوڵ و گوڵزارە هەڵدەمژێت .
منیش لێی پاڕامەوە :
پیـاوی چاك بـە رێـم بـدە هێنـدە لـەم رەزو باخـەدا بمێنمـەوە. تـا بـە بەردەممدا رەت دەبێت.. با ببینم ..!
پیرە مێرد رازی بوو. منیش بڕێك پارەم دایە ، تا خواردنمان بۆ بکڕێت . پێی خۆش بوو. لە دەرگاوە بردمیە ژوور .
هەر رۆیشتین تا گەیشتینە شوێنێکی خۆش و هەندێ میوەی بۆ دانام و وتی :
بۆ خۆت لێرە دابنیشە تاکو دێمەوە .
نیزیکەی سەعاتێکی پێچوو. کە هاتەوە بەرخێکی برژاوی لە بازاڕ کڕی بوو و هێنایەوە. تێر و پڕمان لێ خوارد . هێندەم زانی دەرگاکە کرایەوە .
پیرە وتی : خێرا خۆت بشارەوە .
کۆیلەیەکی خەساوی رەش لە دەرگاوە سەری دەرهێنا و پرسیی :
کەسی نامۆی لێ یە؟
باخەوان وتی : نــــەء .
ئەمجا فەرمانیدا : دەروازەی باخەکە دابخە .
خاتوو (دنیا) لە دەرگا نهێنیەکەوە ، هاتە ژوورەکەمان . وەکو ئەوەی مانگ لە هەوردا بێتە دەر. نزیکەی سەعاتێك لە ناوەدا هات و چوو. کە گەڕایەوە منیش لە رەز و باخەکە هاتمـە دەرو بـۆم دەرکـەوت ئـەو شـازادەیە و مـنیش بازرگانێـك. ئیـدی هاوڕێکانم کاروانی شتومەکیان ئامادە کرد و منیش لە تەکیاندا، تا گەیشتینە ئێرە . ئەوە بوو لە گەڵ بەرێزتدا کۆبووینەوە . تۆیش داوات کرد، چیرۆك و بە سـەرهاتی خۆمـت بـۆ بگێڕمـەوە . ئەمەش بە سەرهاتی من بوو.
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.*

**شەوی ١٢٣**

چیرۆکی تاجی شاهان و خاتوو دونیا
شەهرەزاد کەوتەوە گێڕانەوەی چیرۆکەکەو وتی :
کە تاجی شاهان شا ئەمەی بیست خاتوو دنیا بوو بە خولیای سەری و سەرلێشێوە بوو. دواتر هەستاو سواری ئەسپەکەی بوو . عەزیزیشی لەگەڵ خۆی برد و گەڕایەوە شارەکەی .

باوکی خانوویەکی بەخشی بە عەزیز و هەموو پێداویستیەکانی بۆدابین کرد. ئەمجا جێی هێشت و بەرەو کۆشکی خۆی بووەوە . دوای ماوەیەك ، پاشاکوڕەکەی بینی .

لێی پرسی :

ئەریَ ئەوە چیتە.. وا لاواز و زەرد هەلگەڕاویت کوڕم؟

ئەویش بەسەرهاتی عەزیز و خاتوو دنیای شازادەی بۆ گێرایەوە.

باوکی پێی وت :

کوڕی شیرینم ، سەریَ لە کۆشکەکەی دایکت بدە ، کە(٥٠٠) کەنیزەکی تیایە . هەموویان نایاب و شۆخ و شەنگن . یەکێکیان هەلبژێرە . یان لەم ولآتانەی دەوروبەر شازادەیەك هەلبژێرە ، تا بۆت داوا بکەم . ئاخر ولآتی شازادە دنیا زۆر دوورە کوڕم !! دوای ئەوە نایشیان ناسین .

تاجی شاهان وتی :

بە خوا هەر خاتوو دنیام دەوێت . عاشقی ئەو جوانی و چنین و دەست ڕەنگینی یەی بووم . بۆم داوا نەکەیت ، لەو بیابان و چۆلانە دا سەری خۆم دەنێمەوە دواتر خۆم دەکوژم .

پاشای باوکی وتی :

کەواتە ، پەلەم لیَ مەکە کوڕەکەم . با، بنێرمە داوا کردنی. چی بکەم منیش دایکتم لە دوورە ولآتانەوە مارە کردووە. گەر پاشای باوکی پەسەندی بوو. سوپاسی دەکەین. گەرنا... ئەوا سوپایەکی دەکەمە سەر کە سەرێکی لە مەملەکەتی ئەوان بێت و سەرەکەی تری لە مەملەکەتی خۆمان!! ولآتەکەیان کاول دەکەین .

دوای ماوەیەك ناردی بە شوێن (عەزیز) و لێی پرسی : کاکە تۆ شارەزای ئەو مەملەکەتەیت!؟ حەزدەکەم لەگەلَ وەزیری خۆمدا بتنێرم ..

عەزیزیش وتی :

بە سەر چاوان ... ئەی پاشای زەمان .

ناردی بە شوێن سەرۆك وەزیرانی و بەئەویشی وت :

تەگبیرێکی وا بکە کە داوای ئەو شازادەیە بۆ کوڕەکەم بکەیت و ( عەزیز )ت لەگەلَ دەنێرم و دەچنە دوورگەکانی کافوور . تاجی شاهان تاسەی ئەو کیژەی کرد وخۆی نەگرت . ئەم شیعرەی وت :

| | |
|---|---|
| ئەو شەوانەی خەمم لیَ دادەباریَ | بە ڕوومەتدا دروست دەبیَ ڕووباریَ |
| لەو کاتەدا کە ئەستێران دەژمێرم | بەچاوانا ، فرمێسکم دێتەخواریَ |
| وەکو نامۆ بە تەنیا و چۆلە دەورم | گرژ دەبمەوەو خەمم بە هێندەی شاریَ |

ئەم شیعرەی تەواو کردو بوورایەوە. بەرەبەیان بە ئاگا هاتەوە .

هێندەی پێنە چوو خزمەتکارێك هات و پێی وت ، کە باوکی بانگی دەکات . ئەمیش

شوێنی کەوت . باوکی سەرنجێکی تری داو بینیی رەنگی گۆڕاوە.

رووی کردە کورەکەی و وتی :

خوا یار بێت... بە یەکتان دەگەیەنم .

ئەمجا فەرمانی بە وەزیردا... کە جوانترین کۆمەڵە دیاری ئامادە بکات . لە خەرجی و پارە درێخی نەکات و عەزیزیش لەگەڵ خۆی بەرێت .

دوای ئەوەی وەزیر پێداویستی رێگا و دیاریەکانی ئامادە کرد. کەوتەڕێ . چەند شەو و رۆژ بە رێوە بوون... تاکو گەیشتنە دوورگەکانی کافوور و فرسەخێکی مابوو بۆ ناو شار لایاندا . وەزیر تەتەری ناردە لای پاشای شار و پێی راگەیاندن میوانیان هاتووە . پاشا... بەرێ و رەسمی ئەو زەمانە ، وەزیران و پیاو ماقوڵانی دەوڵەتی ناردە پێشوازیان .

ئەوانیش خۆیان گەندە سەرە رێیان و پەزێراییان کردن و بە خێریان هێنان .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

شەوی ١٢٤

شەهرەزاد دەستی پێکردەوە وتی :

ئـــەی پاشای بەختیار ... خـــاوەنی بڕیار ...

سێ رۆژ حەوانەوە ، رۆژی چوارەم وەزیر کڕنووشی بۆ پاشا برد و هۆی میوانداریەکەی پێ وت . پاشا سەراسیمە بوو، لە وەڵامدانەوە . چونکە دەیزانی کچەکەی نە حەزی لە پیاوە و نــە شـــوو! ماوەیـــەکی زۆر ســـەری داخـــست و بێـــدەنگ بـــوو. ئـــەمجا بـــانگی یـــەکێ لـــە خزمەتکارەکانی کرد و فەرمانی پێدا کە بچێت ئەم داواکاریەی وەزیری میوان بە کچەکەی رابگەیەنێت خزمەتکار رۆیشت .

دوای سەعاتێك گەڕایەوە و وتی :

گەورەم داوا کردنەکەم بۆ خاتوو (دنیا) باس کرد. زۆر تووڕە بوو، پەلاماری دارێکی داو خەریك بوو سەرم بشکێنێ و لە دەستی هەڵاتم . شیراندی بە سەرما کە ئەگەر باوکیشم بم دا بەشوو مێردەکەم دەکوژم ..!

باوکی بە وەزیر و عەزیزی وت :

ئـەوە بـە گـوێی خۆتـان وەڵامەکـەتان بیـست .کـە گەڕانـەوە ، سڵاوی مـن بـە پاشـاتان بگەیـەنن و بڵێن: کچەی نـە حـەزی لـە پیـاوە و نـە لـە شـوو . وتووشیەتی گـەر بـە زۆری زۆرداریش بمدەن بە شوو ، ئەوا ئەکەمجار مێردەکەم دەکوژم : ئەمجا خۆم .

دوای گەڕانەوەی کاروانەکەو بیستنی وەڵامەکە ، پاشا خەمی تاجی شاهانی کوڕی لێ هات و وتی :

گەر لەشکریان بکەمە سەرو وڵاتەکەیان داگیر بکەم ، ئەم کچە خۆی دەکوژێت !

تاجی شاهان به پاشای باوکی وت :

ڕێم بده با خۆم بچم بزانم هەر چۆنێك بێت به فرو فێڵ نایخەڵەتێنم .

باوکیشی پرسیی :

چۆن چۆنی دەچیت بۆ لای؟

ئەویش وتی : خۆم دەکەم به بازرگان .

باوکی وتی :

ئەگەر هەر سووریت له سەری ، وەزیر و عەزیزیش لەگەڵ خۆت ببە!

تاجی شاهانیش شەو چووە ماڵی عەزیز و سەد هەزار دیناری پێدا تاکو بیکاتە دەستمایە و لای مایەوە .. ئەم شیعرەیشی بۆ هێنایەوە :

دوای دابڕان وکڕووزەی شەوان دەستمان دەگاتە دامێنی ئەوان

ئەو کچی شەوەو بێئاگایە له شەونخونیم و پرخەی خۆش خەوان

که لەم شیعرە بووەوە، دەستی کردەوە به گریان . عەزیزیش لای خۆیەوە ئامۆزاکەی خۆی بیر کەوتەوە .

بۆیە تاکو بەیانی نەنووست و گریا . بەیانی تاجی شاهان بەرگی سەفەری پۆشی و چووە سەردانی دایکی . دەستەکانی ماچ کرد . دایکیشی نزای سەلامەتی بۆ کرد و (٥٠٠٠٠٠) دیناریشی پێ بەخشی . دواتر بەرەو لای باوکی بووەو خواحافیزیی لەویش کرد .

باوکیشی پێی وت :

که دەواری له دەرەوەی شار بۆ هەڵداون . چوونە دەر شەو لەوێ بمێننەوە ، بۆ حەوانەوەو دەستی برد (٥٠٠٠٠٠) دیناری تریشی پێ بەخشی . ئیدی گەشتەکەیان دەست پێ کرد و گەیشتنە دەرەوەی شارو شەو له دەوارەکەدا مانەوە .

شەوێ به عەزیزی وت :

که به ڕاستی چاك هۆگری بووه و بێ ئەو هەڵناکات .

عەزیزیش وتی :

من حەز دەکەم لەبەر دەست و پێی تۆدا بمرم . تەنیا خەمیشم پیرە ژنەکەی دایکمە .

تاجی شاهانیش وتی :

که به مەبەستی خۆمان گەیشتین . کارەکان ئاسان دەبن . وەزیر بۆ ئارام بوون هانی دەدا و عەزیزیش ناوە ناوە شیعری بۆ دەخوێندەوە .

(٢) مانگی ڕێك بەرپێوە بوون . گەشتەکە تاجی شاهانی پرزە بڕاو کردو له وەزیری خوڕی : وەزیر.. گەشتەکەمان زۆری پێ چوو. پێم بڵێ چەندمان ماوه بگەینە ئەو شارە؟

عەزیزیش وەڵامی دایەوە : زۆرمان نەماوە .

کەوتنە بڕینی چۆڵ و بیابان ، (عەزیز) بە ڕێگاوە ، کاتی حەوانەوە ، چیرۆك و

سەرگوزەشتەی بۆ دەگێڕانەوە . دوو مانگی تریش بە ڕێوە بوون .
بەیانییەکیان بە دەم ڕێوە تاجی شاهان لە عەزیزی پرسی :
ئەو ناوچە سپی یە چی یە لە دوورەوە دیارە ؟
عەزیزیش لە وەڵامیدا وتی :
گەورەم : ئەوە قەڵای سپی یە ، ئەو شارەیە کە بۆی دەچین .
تاجی شاهان زۆر دڵخۆش بوو. ڕۆیشتن تا خۆیان کرد بە شاردا . تاجی شاهان بە بەرگی بازرگانی نایابەوە چووە ( خان ـ ئوتێل)ێك کە ناوی ( ماڵی دووکەڵ ) بوو .
( تاجی شاهان ) لە ( عەزیز )ی پرسی :
ئێرە شوێنی بازرگانانە !؟
ئەویش وتی : بەڵێ .. کاتی خۆی منیش هەر لێرە لام دابوو .
هەر لەوێ وشتر و ئەسپەکانیان تاقەت کرد و بارە کوتاڵەکانیان، خستە گەنجینەوە . چوار ڕۆژ لەوێ مانەوە بۆ حەوانەوە . دواتر خانوویەکیان بۆ بەکرێ گرت . وەزیر و عەزیز کەوتنە تەگبیرکردنی فێڵێك بۆ ( تاجی شاهان) . ( تاجی شاهان )یش وای بە باش زانی خەریکی بازرگانی بێت .
ڕۆژێکیان .. وەزیر هاتە لای ( تاجی شاهان ) و( عەزیز ) و پێ ی وتن :
ئەگەر بەم شێوەیە ڕۆژ بگوزەرێنین : هیچ بە هیچ ناکەین و بە مەبەست ناگەین .
تاجی شاهان وتی :
تۆ پیاوێکی بۆ خوا گونجاویت و ڕێمان پیشان بدە .
وەزیریش وتی :
لە قەیسەریی کوتاڵ فرۆشان دوکانێك بکرە و با عەزیز بەردەستیت بکات . ئیتر خەڵکێکی زۆردێنە لات .
تاجی شاهانیش وتی : بەڕاستی ئەمە .. بیرۆکەیەکی چاکە .
ڕۆژی دواتر بەرگی بازرگانی لەبەرکرد و پیاوەکانی دوای خۆی خست و (١٠٠٠) دیناری دایە کە دوکانێك لەگوزەری بازرگانان بکڕێ و ئامادەی بکات . کە گەیشتە ناو قەیسەری . بازرگانەکان و دوکانداران لە شۆخ و شەنگیی ئەو لاوە سەراسیمە بوون ..!
لایان وابوو دەرگای باخی بەهەشت کراوە بووە و ئەم لاوەی لێ هاتووەتە دەر.
هەندێکی تریان وتیان : ئەم لاوە زادەی فریشتەکانە ..!
چوونە دوکانی سەرۆکی بازرگانان . ئەویش خۆی و میوانەکانی لەبەر( وەزیر) و ( تاجی شاهان) هەستان و بە خێریان .
خانە خوێکان لە دڵی خۆیاندا وتیان : دیارە ئەم دووانە کوڕی ئەم پیاوە بە تەمەنن .
وەزیر پرسیی : کامتان سەرۆکی بازگانانە ؟

لەوکاتەدا گەورە بازرگان بەرەو لای ئەوان هات بۆ بەخێرهێنانیان . وەزیر سەرنجیدا ، پیاوێکی بە تەمەن خاوەن کەسێتی و کۆیلە و خزمەتکار بوو .
ئیدی بە خێری هێنان و پرسیی :
چۆن دەتوانم یارمەتیتان بدەم ؟
وەزیریش وتی :
بەڵێ من ئەم دوو لاوەم هێناوە و زۆر وڵاتم گێڕاون . لە هەر شارێك لامان دابێت ،ساڵێك تێیدا ماوینەتەوە . تاکو شارەزای دانیشتوان و هەڵسوکەوتیان ببین . ئێستاش داوات لێ دەکەین کە دوکانێك لە شوێنێکی باشی ئەم قەیسەری یەدا بۆ ئێمە بکرێت . تاکو بازرگانیی تیا بکەین و لە کڕیارەکانەوە فێری رەوشتی جوان ببین .
سەرۆکی بازرگانانیش وتی : بە چاوان .
سەیرێکی هەردوو لاوەکەی کە لەگەڵیدابوو کرد و ئیدی کەوتە پەزێراییان .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

شەوی ١٢٥

ئەمشەویش شەهرەزاد لەشوێنی شەوانەی و لە دیوەخان دانیشتەوەو دەستی بە گێڕانەوە کرد:
گەورە بازرگان لە ناوەڕاستی قەیسەریەکەدا.. دوکانێکی بۆ کڕین . کە لەوەی گەورەتر تیا نەبوو . رەفەکانی لە تەختەی ساجی نەخشاو بوو . دوکانەکەی پێ جوان کرابوو .
کلیلەکانی دایە وەزیر و پێی وت :
فەرموو گەورەم ، خوا بیکاتە خێر و پیرۆزیی بۆ دوو کوڕەکەت .
کلیلەکانیان وەرگرت و بەرەو (خان ـــ ئوتێل) بوونەوە . لە بەر ئەوەی بارو بارخانەیەکی فرەیان پێ بوو. بۆیە هەرزەکارەکانی راسپارد کە کەلوپەلە بازرگانیەکانیان بۆ بگوێزنەوە دوکانەکە .
ئەوشەوە لەوێ مانەوە. بۆ بەیانی، وەزیر هەردووکیانی بردە گەرماوەوە . دواتر بەرگی بازرگانانی پاك وخاوێنی لەبەر کردن و بۆنیان لە خۆیان دا.. دەتوت ئەم شیعرە بەسەر ئەواندا هەڵبراوە :

هێندە ناسك بوون بە سروەی بایە      دەتوت ڕوومەتیان ڕووناکیی تیایە
دەبوو مسك فرۆش باری خاڵی بوو      هانای بۆ باڵای ئەوان بێنایە..!

سەرۆکی بازرگانان ، بیستی چوونەتە گەرماو . چاوەڕێی کردن . ئەوانیش لێوانیان سوور هەڵگەڕابوو و چاوە رەشەکانیان دەبریسکایەوە.

هەرکە هاتنە دەر و بەرەو قەیسەری بوونەوە ، پێی وتن : پیرۆزتان بێت .
( تاجی شاهان ) بە زوبانێکی شیرین وەڵامی دایەوە :
سوپاست دەکەین ، خۆزگە لەگەڵماندا بوویتایە هەردووکیان دەستی سەرۆکی بازرگانیان ماچ کرد و بەرەو دوکانە نوێیەکە بوونەوە .
گەورە بازرگان لە پێشەوە دەڕۆیشت ، ئەمانیش وەکو ڕێز لێنانێك بۆی ، بە دوایدا . سوێندیان دا، کە جارێکی دی دەبێت : ببێتە هاوڕێیان لەگەرماودا. دواتر گەورە بازرگان و وەزیریان کرد بە گەرماودا. ئەوانیش خۆیان شت .
گەورە بازرگان وتی : خوا لە چاوی پیس بتانپارێزێت .
هەر چەند گەورە وەزیر تەقەلای لەگەڵیان دا ، تا ببنە میوانی . ئەمان پەسەندیان نەکرد . چونکە ماندووی گەرماو بوون . هەرلایەك بەرەوماڵی خۆی بوومەوە .
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.*

**شەوی ١٢٦**

شەهرەزاد وتی :
ئـــەی پـاشای بەختیار .... خـــاوەنی بــڕیار .
بەیانی هات و دەست نوێژیان شت و نوێژیان کرد . خۆرهەڵات و ئەمانیش نانی بەیانیان خوارد و خۆرو بـان گـەرم بـوو.. بـەرەو قەیـسەری و دوکانەکـەیان بوونـەوە . تا ئەو دەمە خزمەتکارەکانی دوکانیان بۆ کردبووەوە . فەرشیان تیا ڕاخستبوو. ئەو تۆپە قوماشانەی نرخیان (١٠٠) دینار بوو، لە ڕەفەیەکدا بوون . نرخەکانی تریش، بە هەمان شێوە .
تاجی شاهان لەسەر کورسی یەك و ( عـەزیز )یـش لـە سـەر کورسیەکی دی دانیشت . ( وەزیر )یش لە ناوەڕاستی دوکانەکەدا لەسەر کورسی یەك دانیـشت . چـەند هـەرزەکارێکیش لەبەر دەستیاندا بوو.
خەڵکی شار بیستبوویان کە چەند بازرگانێك کوتاڵی باشیان هێنـاوە . هـاتن بۆ کڕین و قەرەباڵغیان دروست کرد . هەندێکیان کوتـاڵ فرۆشت . ناوبـانگی شـۆخ و شـەنگیی ( تاجی شاهان) بە شاردا بڵاو بـووەوە . چـەند ڕۆژێـك ڕۆیـشت . هـەر ڕۆژە و دوکانیـان قـەرەباڵغتر دەبـوو. وەزیـر ئامۆژگـاریی (تـاجی شـاهان)ی کـرد کـە نـەهێڵێت کـەس بیناسـێتەوە و بـە ( عـەزیز )یـشی ڕاگەیانـد ، کـە ئاگـای لـە (تـاجی شـاهان) بێـت . چـونکە لەمـەودوا.. لە ماڵ دەمێنێتەوە و هەندێ ئیشی هەیە کە بە سوودی ئەمان دەگەڕێتەوە .
( تاجی شاهان) و ( عەزیز )یش ئاواتیان ئەوە بـوو کـە خـوا بکـات یـەکێك لای شازادە ( دنیا)وە بێتە دوکانەکەیان . ڕۆژانێکیان بە دڵەڕاوکێی بینینی شازادە و زانینی هەواڵی یەوە بەڕێ کرد .

رۆژێکیـان .. ( تاجی شاهان ) لـه دوکانـدا دانیـشتبوو، کـه پیرەژنێـك هاتـه دوکان و (٢) کەنیزەکی بە دواوە بوو.

سەیری (تاجی شاهان)و ئەو باڵاو قۆزی وجوانیەی کردو وتی :

پەنا بە خوا.. لەو جوانی یە !

لەبەر خۆشیەوە وتی : ئەمە کەی مرۆڤە .. ئەمە فریشتەیە! فریشتە!!

لێی نزیك بووەوە و سڵاوی لێ کرد .

( تاجی شاهان) بە ئاماژەیەکی ( عەزیز ) ، لەبەری هەستاو بە رێـزەوە وەڵامـی دایـەوە ، لای خۆیەوە داینا. باوشێنێکی دایە دەستی، تا ..خۆی پێ فێنك بکاتەوە.

پیرەژن رووی تێ کرد :

کوڕەکەم ، لاوە شۆخەکە ، بێ چاوێنی بێت : ئێرە شوێنی خۆتە !؟

( تاجی شاهان )یش وەڵامی دایەوە :

خاتوونەکەم بەو خوایە .. ئەمە یەکەمجارە، بێمە ئەم شارە . کە لێرەش دەمێنمەوە، بۆ سەیرو خۆشی یە .

پیرەژنەیش وتی :

رێـزدار، ئێـوەی شـۆخ و جـوانن . دەبێـت قومـاش وکوتـاڵی جوانیـشتان هـەبێت .کـوا هەندێکم پیشان بدە .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٢٧**

شەهرەزاد گێڕایەوەو وتی :

( تاجی شاهان ) ئەمەی بیست ، دڵی داخورپا ! ( عەزیز )یش چاوێکی لێ داگرت ..

( تاجی شاهان ) وتی :

ئێمە قوماش وکوتاڵی زۆر و باشمان هەیە . هەندێکیان بۆ شاهانن ! پێم بڵێ : تۆ بۆ کێی دەکڕیت؟

پیرەژنەیش وتی :

کوڕەکەم .. کوتاڵم بۆ شازادە ( دنیا )ی کچی شا ( شەهرەمانە ) .

کە زانی بۆ شازادە ( دنیا)یە لەخۆشی یاندا خەریك بوو شێت ببێت..!

رووی کردە (عەزیز) و وتی : فلاَن بووخچەی کوتاڵی بخەرە بەردەست ..

( عەزیز ) هێنای و خستی یە بەردەستیان .

تاجی شاهانیش وتی :

هەڵبژێرن .. بە دڵی خۆتان ، ئەمانەی بەردەستتان لە هیچ شوێنێکی دی نین ..!
پیرەژنە پارچەیەکی هەڵبژارد کە بایی (١٠٠٠) دینار بوو و پرسیی :
ئەمە بایی چەندە !؟
تاجی شاهان وتی :
جا.. ئەمە چی یە؟ تا من نرخەکەیت پێ بڵێم ! سوپاس بۆ خوا کە بە هۆی ئەمەوە، تۆم ناسی .
پیرەژن وتی :
لە پەنای خوادا بیت . پیرۆزیی ( برب الفلق)ت بە سەردا برژێت و خوا ئەو جوانی یەت بپارێزێت .
ئەمجا پیرەژنە لێی پرسی : کوڕم ناوت چی یە ؟
ئەمیش وتی : تاجی شاهان .
پیرەژن وتی :
سەیرە .. تۆ بەرگی بازرگانێت پۆشیوە و ناوەکەت شازادانەیە ..!
عەزیزیش هەڵیدایە :
ئەو ناوە ، لەبەر خۆشەویستیی بووە لای دایك و باوکی و خزمان و ناسیاوانیدا .
پیرەژنەیش وتی :
راست دەکەیت . خوا لە چاوی پیس بتان پارێزێت .
دیاریەکەی برد و رۆیشت . لەکاتێکدا کە سەری لە جوانی و قۆزی یەکەی سوورِما بوو! کە گەیشتە لای شازادە ( دنیا ) وتی :
خاتوونەکەم .. قوماشێکی جوانم بۆ هێناویتەوە .
ئەویش وتی : کوا؟
پیرەژنەش وتی :
ئەوەتا ...ئەم دیو ئەو دیوی بکە و سەیری بکە .
ئەویش کە بینی زۆری پێ جوان بوو وتی :
دادە ... ئەم قوماشە هێندە جوانە ، لە قوماشی ئەم شارەی خۆمان ناچێت !؟
پیرەژنەیش وتی :
فرۆشیارەکەی ، لە قوماشەکە جوانترە..!! ئەمە بازرگانێك دەیفرۆشێت.. تەنیا بۆ گەڕان و بینینی وڵاتان هاتووە . شتومەکەکانیشی ناوازە و نایابن و زۆر بەنرخن ..!
شازادە دنیا دەستی کردە پێکەنین بە قسەکەی پیرەژن و پێی وت :
خوا رسوات بکات پیرەژنە بێ مێشکەی نەگبەتە .. تۆ خەرەفاویت ؟
ئەمجا وتی : ئادەی .. با ... سەرنجێکی تری بدەم .

که دایه دهستی و ئەویش سەیرێکی وردتری کرد . بۆی دەرکەوت ، کە گرانبەهایە . لای جوان بوو، چونکە بەدرێژایی تەمەنی قوماشی وا جوانی نەدیبوو!!

دیسان وتی :

بەو خوایە ، ئەمە قوماشێکی جوان و نایابە..!

پیرەژنە هەڵیدایە و وتی :

خاتوونەکەم ، خاوەنی ببینیت . تێ دەگەیت ،کە لەم دنیایەدا لەو قۆزتر نی یە .

شازادە دنیا پرسیی :

ئەی تۆ لێت پرسی ، کە ئاخۆ .. هیچ کارێکی لەم شارەدا نی یە کە بۆی جێ بەجێ بکەین ؟ کە جارێکی دی چوویتەوە بۆ لای . پێی بڵێ :

بە خێرهاتننت دەکەین بۆ شارەکەمان . هەر چی یەکت پێویست بوو ، بە چاوان بۆت جێ بە جێ دەکەین .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

### شەوی ١٢٨

شەهرەزاد دەستی بەگێڕانەوە کرد و وتـــی :

پیرەژن هەر زوو گەڕایەوە بۆ دوکانەکەی ( تاجی شاهان ) . ئەویش کە پیرەژنـەی بینی لە خۆشیاندا ، خەریك بوو بفڕێت ! لەبەری هەستاو داینا. ئەویش راسپێری یەکەی شازادە (دنیا)ی پێ وت .

لەدڵی خۆیشیدا وتی :

بە خوا.. وا دیارە بە ئاواتی خۆم گەیشتووم !؟

رووی کردە پیرەژنە و وتی :

گەر نامەیەك بۆ خاتوو ( دنیاخان ) بنووسم .. وەڵامەکەیم بۆ دێنیتەوە؟

پیرەژنە وتی : بە چـــاوان .

ئەمجا بە عەزیزی وت :

ئادەی ... کاغەز و پێنووسە مسینەکەم بۆ بێنە .

کە شتەکانی بۆ هێنا.. پێنووسی بە دەستەوە گرت.. بە شوو پێ کردنی داوای کرد . نامەکەی لوول کرد و پێچایەوە و دایە دەستی پیرەژن .

ئەمجا وتـــی :

ئەمە بگەیەنە دەست : خاتوو (دنیا) .

(١٠٠٠) دیناریشی پێداو وتی :

ئەمەش بۆ خۆت .. تکایە لێم وەربگرە .

که پیرەژنە گەیشتەوە ماڵ شازادە (دنیا) پرسیی :
داخوازیی چی بوو؟ تاکو بۆی جێ بەجێ بکەین ؟
پیرەژنەیش وتی :
ئەم نامەیەی بۆ ناردوویت ، نازانم چی تیا نووسراوە !
کە نامەکەی لێ وەرگرت و خوێندی یەوەو وتی :
من لە کوێ و ئەو لە کوێ ؟ وا ..نامەم بۆ دەنێرێت !
کەوتە لە خۆدان و دەم و چاو رنینەوە و وتی :
ئای چیم بەسەر هات !؟وەرە ئاوام لێ بێت بازاڕی یەك بنێرێتە خوازبێنیم! ئۆی.. ئۆی!
بە تووڕەیی یەوە وتی :
لە ترسی خوا نەبووایە ، هەر ئێستا بەسەر دەرگای دوکانەکەی خۆیدا، هەڵم دەواسی !
پیرەژنەیش وتی :
ئەمە... ئەم نامەیە ، چی تیا نووسراوە ، کە ئاوا..تێکی دایت و تووڕەی کردیت !؟
ئاخۆ .. زۆرداریی نواندووە؟ یان داوای نرخی قوماشەکەی دەکات!؟
خاتوو ( دنیا)یش وەڵامی دایەوە :
وەی .. لەتۆش ! ئەو پیاوە داوام لێدەکات : شووی پێ بکەم ! ئەمەش پەنی تۆ ! ئەگینا ئەو شەیتانە لە کوێ من دەناسێت !؟
پیرەژنەش وتی :
خاتوونەکەم هێندە خۆت بڵند کردووە ، کەس ناتبینێت !! باڵندەش ناتگاتێ . تۆ شازادە و باوکت شایە . بەوە سووك نابیت .. لێم ببوورە خۆ من نەمزانیوە چی تیا نووسراوە . تۆش نامەیەکی بۆ بنووسە . لە وەڵامیدا هەڕەشەی لێ بکە با.. جارێکی دی نەی بزرکێنێت . ئەگینا.. دەیکوژین !
ئەویش وتی :
دەترسم وەڵام دانەوەکەم هێندەی دی منی لە لا شیرین بکات !!
پیرەژنیش وتی :
نەخێر ... هەر هەڕەشەو گوڕەشەی لێ بکەیت ، پاشگەز دەبێتەوە .
خاتوو ( دنیا)یش وتی : کەوا بوو بۆم بێنە کاغەز و پێنووسی مسی ...
دەستی پێکرد و نووسی :

ئەو داواکاریەت ، ببڕەوە.. بەسە     کورت و موختەسەر لە خۆت بترسە
بە خالقی خەڵك ، زەوی و ئاسمان     بەوەی کە گیانی ئێمەی بە دەسە
گەرجارێکی تر، داوام کەیتەوە     وا سزات دەدەم : کە هەر مەپرسە !!

نامەکەی نوشتاندەوە و دایە پیرەژن و وتی :

ئەم نامەیەی بدەرێ و پێشی بڵێ : ئیتر با بەس بێت .
پیرەژن نامەکەی بردو ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان.بۆ سبەینێ دا بەرەو دوکانی تاجی شاهان بووەوە بینی چاوەڕێی دەکات. کە پیرەژنەی بینی بەرەو پیریی چوو و بە خێری هێنا .
پیرەژنە نامەکەی دایە دەست و وتی :
لە پێشدا خاتوو (دنیا) زۆر تووڕە بوو . بەسەریدا هاتم و هێورم کردەوە . وام لێکرد کە پێ بکەنێت ئەم نامەیەی بۆ نووسیت .
( تاجی شاهان ) زۆر سوپاسی کرد . بە عەزیزیشی وت (١٠٠٠) دیناری دی بداتێ .
کەنامەکەی خوێندەوە کەوتە گریان و هەنسك دان . پیرەژنە کە ئەمەی بینی دڵی بۆی سووتاو بەزەیی پێدا هاتەوە .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

شەوی ١٢٩
شەهرەزاد وتی :
ئــەی پاشای بەختیار ... خاوەنی بــڕیار .
پیرەژن وتی :
کوڕەکەم ، ئەی ئەم نامەیەیان چیی تیا نووسرابوو.. وا تۆی گریان!؟
( تاجی شاهان )یش وتــی :
خاتوون .. هەڕەشەم لێدەکات و دەرم دەکات . لەکاتێکدا، گەر شووم پێ نەکات ، مردنم باشترە . وەڵامی ئەم نامە یە ببەوە بۆی .. چی دەکات با بیکات .
پیرەژنە وتی :
نا .. سوێند بێت بەو جوانیەت .. پشتت دەگرم .. تا بە ئاواتی خۆت دەگەیت .
( تاجی شاهان ) لەوەڵامدا وتی :
منیش حەقت نافەوتێنم .. پاداشتی چاکەت دەدەمەوە . دەزانم هەموو کێشەیەك بە لای تۆوە ئاسانە .
داوای کاغەزی کردو بۆی نووسی یەوە :
هەڕەشەی کوشتن بۆ من بنێرە          مردم ، ئاسوودەم خێرا کە ، خێرە
( تاجی شاهان ) هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا وزۆر بـە کوڵ گریـا. پیرەژنـەش لەگەڵیـدا دەستی کردە گریان . نامەکەی هەڵ گرت و وتی :
بێخەم بە .. هەر دەبێت بە ئاواتی خۆتت بگەیەنم .
بەرەو ماڵ بووەوە . کە گەیشتە لای خاتوو (دنیا) سەیری کرد. ڕەنگ و ڕووی لە داخی

نامەی بازرگانەکە تێك چووە .
دەستی برد و نامەکەی دایە و کچەیش هێندەی تر تووڕە بوو و بە پیرەژنی وت ؛
ئەم وت ... هێندەی تر شیرین دەبم لەلای ..!
پیرەژنەیش وتی : جا ... سەگی وا چی یە ، چاوت تێ ببڕێت ..!؟
شازادە ( دنیا)یش وتی :
ئەمجارە کە چوویتەوە لای ئەو بازرگانە ، پێی بڵێ جارێکی دی نامە بنێرێت ، لە ملی دەدەم !
پیرەژنە وتی :
ئەو قسەیەی بۆ بنووسە ، سبەینێ بۆی دەبەم تاکو پتر بترسێ .
کاغەزی هێنا و ئەم شیعرەی نووسی :

| | |
|---|---|
| هەی ( گێل ) لە ئاستی رووداوەکانا | خۆ تۆ پێشەنگ نیت : لەگەڵ زەمانا |
| رەنگە پێت وابێت پێش ( تیر ) دەکەوی | کاتێ : دەر دەچیت لە نێو کەوانا |
| دانا بە و ترسی گورزی منت بێ ! | رۆژی رەش زۆرە لە نێو ژیانـــا |

نامەکەی چوار قەد کردو دایە دەست پیرەژن . ئەویش خێرا بەرەو دوکانی (تاجی شاهان) بووەوە .
کە تاجی شاهان ئەوی لە دوورەوە بینی لەبەری هەستاو وتی :
خوا.. بەرەکەتی تۆمان پێ ببەخشێ .
پیرەژنەش وتی : وەڵامی نامەکەتم هێناوەتەوە .
ئەویش لێی وەرگرت وخوێندی یەوە ، دەستی کردە گریان و وتی :
حەز دەکەم ، یەکێك بمکوژێت ! نەنە گیان ! تاکو رزگارم بێت .
کاغەز و پێنووسی هێنا و بۆی نووسی یەوە .
دایەوە دەست پیرەژن و پێی وت :
زۆرم ماندوو کردوویت بێ ئەوەی سوودی بۆ تۆ هەبێت .
بە ( عەزیز )یشی وت : کە (١٠٠٠) دیناری بداتێ .
بە پیرەژنیشی وت : ئەم نامەیە یا پێکمان دەگەیەنێت ، یان لێك جیا دەبینەوە .
پیرەژنەش وتی :
کورەکەم ، پڕ بە دڵ حەز دەکەم بە ئاواتی خۆت بگەیت . (٩٠) ساڵم تەمەنە . هەمیشە خەریکی فرت و فێڵ بووم . تۆ کوڕێکی قۆز و شۆخ و شەنگیت . ئەویش دەڵێی رۆژە ! ئەگەر نەتوانم پێکتان بگەیەنم ، ئەوا تەمەنم بە خۆڕا بەسەر بردووە ! ئاخر... چۆن ناتوانم ئەم کارە بکەم !؟
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

شەهرەزاد وەکو شەوانی پێشوو، لە بەرامبەر پاشای هاوسەریدا دانیشتەوەو درێژەی دایە:

ئـە پاشای بەختیار ... خـاوەنی بـڕیار .

پیرەژن خواحافیزی لێ کرد و ڕۆیشت . کە گەیشتە لای خاتوو دنیا، نامەکەی لە نێو قژی سەریدا شارد بووەوە .

کە لە لای شازادە دنیا دانیشت بوو. سەری خوراند و وتی :

ماوەیەکە قژم ئاڵۆزاوە و نەچوومە گەرماو. لەو کاتەدا نامەکە کەوتە خوارەوە !

خاتوو دنیا نامەکەی بینی پرسیی : ئەو کاغەزە چی یە !؟

پیرەژن وتی :

ئەوە ، ڕەنگە ئەو کاتەی لای بازرگانەکە دانیشتبووم ، ئەم نامەیە، بە بەرگەکانمەوە، نووسابن !خۆیشم لێی بێئاگام بێنە ، با بۆی ببەمەوە نەکو حساباتی دوکانەکەیی تێدا بێت!

شازادە ( دنیا)ش وتی : ئەی بۆ ... ئەمەش فێڵێك نەبێت لە فێڵەکانت !؟

بەو خوایە گەر پەروەردەی دەستی خۆت نەدەبووم ، هەر ئەمشەو لە ناوم دەبردیت ! سەیرکە . چۆن خوا.. تووشی ئەم بازرگانەوەی کردووم ؟ هەرچی یەکم بەسەر هات ، لە ژوور سەری تۆدا بوو! خۆ . من خەمی ئەوەشمە پێم بزانرێت ..! ئاخر ئەم بازرگانە .. نە لە ئاستی مندایە و نە کەس دەیناسێت..!

پیرەژنەیش وتی :

کەس ناتوانێت بە خراپ باست بکات . چونکە لە دەسەڵاتی خۆت و باوکە پاشاکەت دەترسن ! لەبەر ئەوە بێخەم بە .. وەڵامیشی بدەرەوە .

شازادە ( دنیا ) وتی :

دادە گیان.. ئەم شەیتانە چۆن دەوێرێت نامەی لەم جۆرەم بۆ بنووسێت!؟ چۆن لە زۆرداریی پاشای باوکم ناترسێت ؟ سەرم لێی سووڕماوە..! گەر فەرمانیش بدەم بیکوژن کارێکی ڕاست و دروست نییە..! گەر وازیشی لێ بێنم ، زیاتر و زۆرتر دەوێرێت .

پیرەژن وتی : نامەیەکی بۆ بنووسە.... بەڵکو بێزاری ببکەێت .

ناچار داوای کرد کاغەز و دەستی دایە پێنووسی ... ئەم شیعرانەی بۆ نووسی :

گێلی یەکەی خۆتە : کە هەڵی ناوی — تێ ناگەی : کە من وەلاوەم ناوی

دەنووکی دالان دەکەی خوێناوی

گەر جارێکی دی: نامە بنێریت — هەرهێندەت زانی: لە گۆڕ نراوی

بڵێی ( لەل ) مەرگ بۆتە میوانت — شینت بۆ دەکەن کەوا نەماوی!

ریشی خزمانت لە خۆڵ دەدەی و

خاتوو دنیا نوشتانیەوە و دایە دەست پیرەژن . ئەویش ڕۆیشتەوە بۆ لای ( تاجی شاهان)

و دایە دەستی . تاجی شاهانیش خوێندی یەوەو تێگەیشت : دڵ رەقە و بۆ ئەو نابێت..!
بۆیە سکاڵای خۆی بردە لای وەزیر... تا بەڵکو بۆی بکات تەگبیر .
وەزیر پێی وت :
کەوابوو.. تەنیا ئەوە ماوە کە نامەیەکی بۆ بنووسیت و دوعاو نزای لێ بکەیت ..!
ئەویش وتی : ئادەی ( عەزیز ) نامەیەکی بۆ بنووسە و نزای خراپی تێدابێ !
ئەویش نووسیی :

خوایە بۆ خاتر: پێنج ئیمامەکە خەمی (عەشق)ی بۆ ئا لەم نامە کە
تووشی کردم و زۆریش: دڵڕەق بوو ( زاڵم)ە و( بێباك ) زۆر بێ ئەمەکە
لە گێژاوێك دام .. بێ سەرو بەرە کەس نییە بەویش بڵێ : وا مەکە

عەزیز نامەکەی نووشتاندەوەو دای بە تاجی شاهان . کە خوێندی یەوە زۆر بە دڵی بوو.
ئەویش دایە دەست پیرەژن . پیرەژنەیش لەگەڵ خۆی بردی و گەڕایەوە بۆ لای شازادە (دنیا) .
شازادە خوێندی یەوە و زۆر توند بوو و وتی :
ئەم تووش بوونەی من لە ژێر سەری تۆدا بوو ، ئەی پیرەژنە سەر ئاسنینە .
بانگی کەنیزەکەکانی کرد و وتی : ئادەی ... بە تاکە نەعل لێی بدەن .
کەنیزەکەکانی گۆشکیش کەوتنە لێدانی پیرەژنە و کۆڵیان لێ نەدا ، تاکو بوورایەوە .
دواتر پێی وتن :
لە سەر سك رای بکێشن و فرێی بدەنە دەرەوە .. پیرەژنە شەو کە بە ئاگا هاتەوەو بێدەنگ بەرەو ماڵی خۆیان بووەوە . هەر دەڕۆیشت و دادەنیشت . تا گەیشتەوە ماڵ .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٣١**

شەهرەزاد ئەمشەویش دەستی پێ کردەوەو وتـــی :
پیرەژن ، بۆ سبەینێ خۆی گەیاندە لای (تاجی شاهان) و بە سەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە . ئەویش زۆری پێ ناخۆش بوو و پێی وت :
زۆرم پێ ناخۆشە ، بەڵام قەدەری خوایە .
پیرەژنەیش وتی :
بێخەم بە .. کۆڵ نادەم تا ئەو زۆردارەت لێ مارە دەکەم .
( تاجی شاهان )یش پرسیی : باشە ، بۆ هێندە رقی لە پیاوە!؟
ئەویش وتی :
کاتی خۆی خەونێکی دیوە و ئەو خەونە بووەتە هۆی بێزاریی لە پیاو..!

بە سەر سوورمانەوە پرسی یەوە : ئەو خەونە چۆن بوو؟!
پیرەژنە دەستی بە گێڕانەوە کردو وتـــی :

ئەوێکیان .. لە خەونیـدا راوچی یەك داوی ناوەتـەوە و گـەنمێکی زۆری بـە سەریدا رشتووە . پۆلێك کۆتر دێتە سەر داوەکە . وا شازادە (دنیا)ش سەیریان دەکات . دوای کەمێك ، کۆترە نێرەیەك پێی دەبێت بـە هەڵەفەی داوەکەوەو دەکەوێـتە پەلە فاژە . کۆترەکان هەموویان هەڵدەفڕن .

شازادە سەیر دەکات : کۆترە مێ یەك دەگەڕێتەوە سەر داوەکەو دەست دەکات بە دەنووك وشاندن . دوای تەقەلایەکی فرە. کۆترە نێرەکە رزگار دەکات و هەردووکیان لە شەقەی باڵ دەدەن و دەفڕن ..!!

هێندەی پێ ناچێت : پۆلە کۆترەکە .. دیسان دێنەوە سەر داوەکە ..! دەست دەکەنـەوە بە گـەنم خـواردن . بـە هـەمان شـێوە کۆترێـك .. دەبێـت بـە هەڵەفەیـەکی داوەکـەوە . کۆترەکـانی دی لـە شـەقەی بـاڵ دەدەنـەوەو دەفـڕن . شـازادە ، کـە وردتـر سـەرنجی کۆترە گیراوەکە دەدات .. بۆی دەردەکەوێت کە ئەوە ئەو کۆترە مێ یەیە : کە جاری پێشوو ( مێرد )ەکەی رزگار کرد . کەچی کۆترە نێرەکەی مێردی ناگەڕایەوە سەری تاکو رزگاری بکات !

شازادە ( دنیا) دەبینێت راوچی دێت و کۆترەکە لە داوەکە دەکاتەوە و هەر لەوێدا سەری دەبڕێت . تووشی شۆك دەبێت ..!

لە دڵی خۆیدا دەڵێت :

هەموو پیاوان وەکو ئەم کۆترە نێرەن. بێسوودو بێ وەفان و سوودیان بۆ ژنەکانیان نیە!

تاجی شاهانیش وتی :

داپیرە ... دەمەوێت ، ئەگەر سەریشم داناوە .. ئەم شازادەیە ببینم !

پیرەژن وتی :

ئەوە بزانـە .. لـە دامـێنی کۆشـکەکەیەوە ، رەز و بـاخێکی تایبـەت بـە خـۆی هەیـە..! مانگی جارێك دەچێتە ناوی و پیاسە دەکات . (١٠) رۆژێکی دی سەرەی چوونەوە باخی دێت . کە ئەو کاتە هـات ، دێـم و پێـت دەڵـێم بـەڵکو ببیـنی . ئـێ.. بـەڵکو کـە جوانی و قۆزی یەکەتی بینی پەسەندت بکات .

وریا بە .. زوو رەز و باخەکە جێ نەهێڵیت !

ئەویش وتی :

زۆر چـــاکە .

خۆی و عەزیز دوکانەکـەیان داخـست و لەگـەڵ داپـیرەدا بـەرەو کۆشکی شازادە ( دنیا) بوونەوە تاکو شوێنەکەیان پیشان بدات .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

شەهرەزاد وەکو شەوانی پێشوو دەست بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە دەکاتەوە :

ئـەی شای بلیمەت .... زانا و بە حیکمەت .

تاجی شاهان بە دەم ڕێوە بە عەزیزی وت :

( عەزیز ) گیان .. لە دوکانەکەدا، بە ئاواتی خۆم گەیشتم و ئیدی پێویستم پێی نی یە . بۆیە پێشکەش بە تۆ بێت. چونکە لەگەڵ مندا وڵاتی خۆتت بە جێ هێشت و ئاوارە بوویت.

یەکەمجارچوونەوە بۆ لای ( وەزیر) و کەوتنە گفتوگۆ و تێیان گەیاند و پێیان وت :

کە( تاجی شاهان) نیازی چی هەیە و پرسیشیان پێکرد، کە چی بکەن باشە؟

وەزیریش پێی وتن :

جلوبەرگی نایاب لەبەر بکەن و با بچین بۆ ئەو باخە . ئەوانیش خۆیان رازاندەوە و ڕۆیشتن و سێ کۆیلەیان شوێن خۆیان خست . کە گەیشتن روانیان پڕە لە دارو درەخت وکانیاو و رووبار. باخەوانەکەیان بینی لە دەرگای باخەکەدا دانیشتبوو. سڵاویان لێ کردو ئەویش وەڵامی دایەوە .

وەزیر دەستی برد (١٠٠) دیناری دایە کابرای باخەوان و پێی وت :

ئەم لاوانە لەگەڵ مـنن . ئەیانەوێ بەم باخەدا بگەڕێین . خۆیشت بڕۆ هەندێ خواردنمان بۆ بێنە.

باخەوانەیش وتی :

بڕۆن بە دڵی خۆتان بگەڕێن . وا بزانن باخی خۆتانە و چاوەڕێم بکەن تاکو دێمەوە .

چوونە ژوورەوە و دوای گەڕان و پیاسە کردن دانیشتن . هێندەیان زانی باخەوان بەرخێکی برژاو و چەند نانی جوانی هێناو لەبەر دەمیاندا دایناو دەستیان بە خواردن کرد.

دوای دەست شتن وەزیر لە باخەوانی پرسی :

ئاخۆ.. ئەم باخە هی خۆیەتی یان بە کرێ گیراوە ..!؟

باخەوان وتی :

ئەم باخە شازادە (دنیا) خاوەنی یەتی .

وەزیر پرسیی : مانگی چەندت دەداتێ ؟

ئەویش وتی : مانگی بە (١) دینار کار دەکەم .

وەزیر بە ملاولای باخەکەدا ڕووانی و کۆشکێکی کۆنی بینی و وتی :

کە دەیەوێت کارێکی خێر لێرە بکات .

باخەوان پرسیی : خێری چی ؟

ئەویش دەستی برد (٣٠٠) دیناری تری دایە و وتیشی شتێکی باش لێرە دەکەین . لێیان داو گەڕانەوە بۆ ماڵی خۆیان . ڕۆژی دواتر ( بۆیەچی ) و ( نەقاڕ ) و ( زێڕنگەری) ئامادە

کردو فەرمانی پێدان : ئەو کۆشکە سپی بکەنەوە و زەخرەفەی جوان و نەخش ونیگاری جوانی تیا بکێشن .

ئەمجا فەرمانی پێدان :

کە لەسەر راستە دیواری سەر دەرگاکە وێنەی ( راوچی)یەك دروست بکەن کە داوی نابێتەوە و پۆلە کۆترێك بەسەری یەوە بن و یەکێکیان بە دەنووك خەریکی داوەکە بێت .

کە نیگارکێش لایەکی وێنەکەی تەواو کرد .

وەزیر پێی وت :

لایەکەی تری هەر ئەو کۆترە بێت ، بەڵام ئەمجارە چەقۆی راوچی لەسەر ( مل )ی بێت . لەولاتر وێنەی کۆترە نێرەیەك بکێشە کە( باز)ێك دەنووکی لەسنگی چەقاند بێت و نینۆکەکانی لە گۆشتەکەیدا بێت . کە وێنەکان تەواو بوو ، نیگارکێش و نەقارو بۆیەچیان کرێی خۆیان وەرگرت و رۆیشتن .

( وەزیر) و (تاجی شاهان) و ( عەزیز ) و (٣)کۆیلە بە دوایانەوە . دوای خواحافیزی لە باخەوان. بەرەو ماڵ بوونەوە .

کە رۆژی چوونە باخی شازادە دنیا نزیك بووەوە . شازادە ناردیە شوێن پیرەژن .کە هێنایان سەری ماچ کرد و ئاشتی کردەوە .

دواتر پێی وت :

دەمەوێت بچمە سەیری رەز و باخ .. هەڵمژم بۆنی گوڵەباخ ..لەدڵا دەرکەم پەستی و بێزار بوون... ببوژێتەوە خان خانەی دەماخ .

پیرەژنەیش وتی :

بە چاوان . بەڵام بە خوا دەبێت سەرێك لەماڵەوە بدەم و خۆم بگۆڕم .

بە پەلە خۆی گەیاندە ( تاجی شاهان ) و پێی وت :

خێراکە.. وا شازادە چاوەڕێمە : تاکو پێکەوە بچینە سەیری باخ . ئەزانی چی دەکەیت؟! دەبێت پارە بدەیتە باخەوانەکە و لەنێو دارەکاندا خۆت بشاریتەوە تاکو شازادە ( دنیا ) دێت . ئەو کاتە ئاماژەت بۆ دەکەم .

پیرەژن چووەوە بۆ لای شازادە دنیا. تاجی شاهانیش جلوبەرگێکی گرانی وای کردە بەر بایی ( ٥) هەزار دینار بوو! بە زێڕ و زیو نەخشابوو . لەگەڵ وەزیر بەرەو باخەکە رۆیشتن .

باخەوان ئەمانی بینی ناسینیەوە و لەبەریان هەستاو دەرگای باخی بۆ کردنەوەو وتی :

فەرموون بە دڵی خۆتان پیاسەی تیدا بکەن .

چونکە بیری چوو بووەوە کە هەر ئەمڕۆ شازادە دێتە باخەکەوە . نزیکەی سەعاتێك لە ژوورەوە بوون ، هێندەیان زانی : بوو بەدەنگە دەنگ و کۆمەڵێك کەنیزەك و کۆیلە لەدەرگا نهێنی یەکەی کۆشکەوە هاتن .

باخەوان رای کرد بۆ لای وەزیر و پێی وت :
چی بکەین ؟ ئەوە شازادە (دنیا)یە..هاتووە !؟
( وەزیر)یش وتی :
بێخەم بە .. هەر ئێستا لە چەند شوێنێکدا خۆمان دەشارینەوە .
باخەوان ئامۆژگاری کردن خۆیان بشارنەوەو خۆیشی لێیدا و رۆیشت . ( شازادە) و ( پیرەژن )یش هاتنە باخەکەوە .
پیرەژن پێی وت :
خاتوون..ئەم کەنیزەك و کۆیلانەت بۆچی یە؟ با بگەرێنەوە کۆشك و لێمان تێك نەدەن.
شازادە (دنیا) وتی : بە خوا راست دەکەیت .
هەموویانی ناردەوە کۆشك . کەوتە دەمەتەقێ لەگەڵ خاتوو دنیا بە جۆرێك ( تاجی شاهان ) بە ئاگابوو و کەوتە سەیر کردنی شازادە .
بە دەم قسە کردنەوە شازادە (دنیا)ی بردە لای ئەو رووەی کۆشك کە بە وێنە و نیگارە نۆێیەکە رازا بووە .
کە شازادە( دنیا) ئەو وێنانەی بینی وتی :
داپیرە ، سەیر کە سوبحان الله ئەم وێنانە هەر ئەوانەن من بە خەو بینیومن ..!
بەڵام .. ئەها خۆ.. ئەوە ( کۆتر )ە نێرەکەی ( مێرد )ی گەڕاوەتەوە ، بۆ یارمەتی دانی ( کۆتر )ە ( مێ )ی ژنی..! بەڵام لەرێگا ئەم ( باز )ە پەلاماری داوە و کوشتوویەتی. بۆیە نەگەڕاوەتەوە سەری..!
( پیرەژن ) بە قسەوە خلافاندی تاگەیاندی یە بەر پەنجەرەیەك بە سەر باخەکەیدا دەڕوانی . ئیدی ئاماژەی دا بە ( تاجی شاهان ) کە خۆی پیشان بدات . وا رێکەوت شازادە بە لای پەنجەرەکەدا لای کردەوە .
هەر کە شازادە دنیا ، ئەولاوە قۆزەی بینی پرسیی :
داپیرە ..ئەو لاوە قۆزە کێ یە !؟
پیرەژنەیش وتی :
نازانم ! بەڵام ئەو لاوە ئاسایی نی یە..! بزانە کوڕە پاشایە.. چی !؟ چونکە جوانترین و گرانترین بەرگی پۆشیوە .
شازادە دنیایش وتی : داپیرە بەخوا کوڕێکی جوانە !!
پیرەژنیش وتی : راست دەکەیت خاتوونەکەم ..
بە دزییشەوە ئاماژەی دایە.( تاجی شاهان ) بچێتەوە ماڵی خۆی .
وەزیریش وتی :
گەر ( پیرەژن ) بە باشی نەزانێت : پێت ناڵێت بڕۆرەوە .

لەولایشەوە شازادە ( دنیا) یەخەی پیرەژنی گرت و پێی وت :
ئەو کورە قـۆزەم بۆ داوا بکە !
پیرەژنیش وتی :
بە خوا : تۆیش سەیریت ..! ئەی تۆ نالێیت ، پیاوان بێ وەفان ؟
بەڵام بەخوا ئەو کورە بۆ تۆ نەبێت ، بۆ کەسی تر باش نی یە ..!
شازادە ( دنیا)یش وتی :
داپیرە فریام بکەوە ، ئەو کورەم بۆ داوا بکە..گەر ئەم کارەم بۆ نەکەیت لێت زیز دەبم .
خۆ.. ئەگەر ئەو کارەم بۆ بکەیت ئەوا (١٠٠٠) دینارت دەدەمێ . لەگەڵ ملوانکەیەکی زێڕ کە بایی (١٠٠٠) دینار بێت .
( پیرەژن ) وتی :
تۆ بڕۆوە ماڵی خۆت . منیش سەر دەنێمەوە ، هەوڵ دەدەم : پێکتان بگەیەنم .
خاتوو دنیا چووەوە کۆشك . پیرەژنەش بەرەو مـاڵی ( تـاجی شـاهان ) بـووەوە . ئـەویش هەر کە پیرەژنی بینی . بەرزە پێ لەبەری هەستاو لای خۆیەوە داینا.
( پیرەژنە )ش پێی وت : فێڵەکە .. سەری گرت ..!
چی بیستبوو ، بۆی گێڕایـەوە . ئـەمیش پیاوانـە (١٠٠٠) دینـاری مژدانـە پێ بەخشی . لەگەڵ ملوانکەیـەکی زێـڕ کـە ئـەویش بـایی (١٠٠٠) دینـار دەبوو. پیرەژنـە چووەوە بۆ لای شازادە (دنیا) .
کە گەیشت لێی پرسی :
ها... دەنگ و باس چی یە ؟
پیرەژنەش لە وەڵامدا وتی :
شوێنەکەیم دۆزیوەتەوە .
شـازادە (دنیـا) لـە خۆشـیاندا وەختـە بـوو بـاڵ بگرێـت . دەسـتی بـرد (١٠٠٠) دینـار و ملوانکەیـەکی زێـڕی (١٠٠٠) دیناریـشی پـێ بەخـشی و کردیـشی یـە ملـی . دواتـر پـیرەژن ڕۆیشتەوە ماڵی خۆیان .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

## شەوی ١٣٣

شەهرەزاد دەستی بە گێڕانەوە کردەوە و وتی :
پیرەژن (تاجی شاهانی) بردە بەر هەیوانەکەی شازادە (دنیا) . هەریەکەم جار کە شازادە دنیای بینی وتی :
نە بازرگانم و نەهیچ . منیش شازادەم و کوڕی سولەیمان شام . ئەوکەسەی کە وەزیری

تایبەتی نارده لای باوکت ، کە داوای تۆم بۆ بکات . بەڵام باوکت رازی نەبوو .
ئیتر چیی بەسەر هاتبوو ، لە پێناوی ئەمدا هەمووی بۆ گێڕایەوە .
ئەمجا وتی :
ئێستاش دەمەوێت .. کە گەڕامەوە بە باوکم بڵێم بنێرێتە خوازبێنیت . ( شازادە )کە ئەمەی بیست زۆر دڵخۆش بوو .. قەزا و قەدەری خوا وابوو ، ئەو رۆژە سندووقێکی پڕ لە زێڕیان هێنابوو بە دیاری بۆ شا ( شەهرەمان ) . ئەویش کە سەرنجی دابوو زۆر نایابە و هیچ کام لە پاشایانی سەر زەوی زێڕی وا بە نرخیان نییە . بانگی گەورە خزمەتکاری کرد بوو و فەرمانی دابوو کە ئەی کافوور .. ئەم
سندووقە زێڕ و مرواری یە بدە دەست شازادە (دنیا) .
ئەویش هێنای بۆ شازادە دنیا. لە هاتنە ژوورەوەیدا ، ئەو لاوەی بینی لەگەڵیدا وتووێژی دەکرد .
هەر زوو گەڕایەوە لای پاشای باوکی . ئەویش کە لێی پرسی ئاخۆ، سندووقەکەی پێشکەش کردووە؟
گەورە خزمەتکار سندووقەکەی دایەوە پاشا و وتی :
ئەوە سندووقەکە و ناتوانم شتت لێ بشارمەوە .کچەکەت لە ماڵی خۆیدا لەگەڵ لاوێك قسەی دەکرد!
دەم و دەست پاشا فەرمانیدا.. بیان هێنن ! جەنگاوەرانی پاشا هەردووکیان هێنایە بەردەمی .
ئەویش لێی پرسین : ئەمە چ کارێکە کردووتانە !؟
داوای قامچی یەکی کرد . دای هێنایەوە بۆ ( تاجی شاهان ) بەڵام شازادە ( دنیا ) خۆی دایە بەر قامچی یەکە !
بە باوکی وت : من بکوژە لە پێش ئەودا !
هەندێ سەرزەنشتی کرد و فەرمانیدا بیبەنەوە ژوورەکەی خۆی .
رووی کردە ( تاجی شاهان ) و پرسیی :
نەگبەت ، تۆ کێیت ؟ کوڕی کێیت ؟ چۆن توانیوتە قسە لەگەڵ کچی من بکەیت !؟
ئەویش وتی :
ئەوە بزانە : کە کوڕی ئەو پاشایەم کە بە پێی خۆی هاتە لات .کە پاشا ئەمەی بیست ویستی کوشتنی دوا بخات ، بۆیە بەندی کرد تاکو راستی قسەکەی بۆ دەر بکەوێت .
(تاجی شاهان) مانگێك لە بەندیخانەدا مایەوە . لەولایشەوە کە ون بوونی (تاجی شاهان) مانگێکی پێچوو دەستیان لێ شت و وایان دانا کە نەماوە.
( عەزیز ) بە ( وەزیر )ی وت : بابەگیان چی بکەین باشە !؟

وەزیر وتی :

کوڕەکەم ئەمە کێشەیەکی فرەلایەنە. بۆیە نابێت بێ ئەو بگەڕێینەوە،چونکە گلەییمان لێ دەکرێت .

خۆیان ئامادە کرد بەرەو زەوی یە سەوزەکان و (٢ )کۆڵەکە و تەختی (شا سولەیمان) ڕۆیشتن .. دەشت و دۆڵیان بڕی تا گەیشتنەوە وڵاتی خۆیان. هەواڵەکەیان گەیاندە شا سولەیمان کە تاجی شاهان گەیشتووەتە ناو کۆشکی شا! ئیدی هەواڵی نازانین . پاشایش دنیای ژێرەو ژوور کرد بۆ چارەنووسی کوڕەکەی .

فەرمانی دەرکرد : ئـادەی... جیهادە !

سوپای خۆی کۆکردەوە و لە دەرەوەی شار دەواریـان هەڵدا... چونکە شا خۆشەویستی هاوڵاتیـانی بـوو هـەر هاوڵاتیـان بـوو... چـەکیان وەردەگـرت و خۆیـان نـاونووس دەکرد بۆ جەنگ . ئەو سوپا مەزنە، کەوتە ڕێ بـەرەو ئـەو مەملەکەتـەی کە کوڕەکەی لێ گیرابوو. لەولایشەوە وەزیری تەگبیری بۆ پاشا کردبوو، کە زوو بکەن لە کوشتنی ئەم لاوە . چونکە وێراوێتی بگاتە کچە پاشاو قسەی لەگەڵ کردووە .

شا بە ( جەلاد ـ کوژەری ) وت : بڕۆ لە سەری ئەو ناپاکە .. بدە .

هەر لەبەر ئەوەی نەڵێن فەرمانێکی پەلەی دەرکردووە : پرسی بە وەزیرەکانی کرد . پاشا شیڕاندی بە سەریدا :

تاکەی خۆت دوا دەخەیت .. لەجێ بەجێ کردنی ئەو فەرمانە..!؟

گەر جارێکی دی پرس بکەیت . لە ملت دەدەم . (جەلاد ـ کوژەر) دەستی شمشێرەکەی بڵند کرد کە بدا لە ملی تاجی شاهان . خەڵکی لەو دەنگە دەنگ و تەپ و تۆزەی دەورو بەری شارسڵەمینەوە .

شا فەرمانیدا..

لە ملدانەکە رابگرن..! بزانن ئاخۆ.. بۆ خەڵکەکە دوکان و بازاڕ دادەخەن !؟

تەتەر هات و هەواڵی دا..

کە ئەی پاشا .. سوپایەکی زۆر چوار دەوری شاریان داوە. هێندە زۆرن دەڵێی شەپۆلی دەریان ..! زەوی لە ژێر پێیاندا دەلەرێتـەوە . پاشا سـەری سووڕما! ترسی لـە دەست دانی دەوڵەتەکەی لێهات .

لە وەزیری پرسی :

ئاخۆ سوپاکەمان چوونەتە بەرامبەریان بۆ جەنگین ؟

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

*شەهرەزاد* دەستی بە گێڕانەوە کردەوەو وتی :

نوێنەری شا گەیشتە لای و( وەزیر)یش لە تەکیاندا بوو . دوای سڵاو کردن ، پاشا وەڵامی دانەوە و ڕێزی گرتن و پرسی هاتنی ئەم سوپا مەزنەی کرد .

وەزیر هاتە پێش و وتی :

ئەوە بزانن سوپای ئەم پاشایە ، وەکو پاشایانی پێشوو..یان پاشایانی دواتر نی یە .

پاشا پرسیی : ئەم پاشایەتان کێ یە؟

وەزیر وتی :

ئەم پاشایە دادپەروەرو وڵاتەکەی ئاسایشە . ئەوانەی دێنە وڵاتی بە پاشای توانا و لێهاتوو، ناوی دێنن . ئەمە (سولێمان) شایە... خاوەنی زەوی سەوز و دوو کۆڵەکە و چیای ئەسفەهان . زۆری حەز بە دادی کۆمەڵایەتی و ویژدان پاکی یە .. ڕقی لە زۆرداری و دڵڕەقی یە . کوڕی ئەم شایە لە سەر زەویی تۆیە ... پەڕەی دڵی شا لای ئێوەیە و بە سەلامەتی دەمانەوەێتەوە .. ئەگەر وابوو ، زۆر سوپاستان دەکات . ئەگەریش لای ئێوە تیاچوو بوو.. ئەوا مزگێنی کاول کردنی ئەم وڵاتەت پێ دەدەمین! وڵاتەکەت بە جۆرێك کاول دەکەین ، کە قەلەڕەشی تیا بخوێنێ . ئەمە ئەوە بوو کە پاشامان دەیویست پێت ڕابگەیەنێت . شا ( شەهرەمان ) ترسی کاول کردنی مەملەکەتەکەیی لێ نیشت .

قیژاندی بەسەر دەور و بەریدا وتی :

وەزیران و پیاوانی دەوڵەتم بۆ بانگ بکەن . فەرمانیشی دا.. بگەڕێن بۆ ئەو لاوە .

دوای کەمێك نوێنەرانی شا( سولەیمان ) بە وردی سەرنجی دەست بەستراوە بووراوەکەی ژێر دەستی جەلادیان دا ..

ناسییانەوە ، کە ئەوە ( تاجی شاهان )ە ..!

پەلاماریانداو دەستیان لە هەڵمەفەی پەت دەرهێنا و کرنووشیان بۆ برد . ( تاجی شاهان) چاوی کردەوە ، وەزیرەکەی باوکی ناسی یەوەو زۆری پێخۆش بوو .

( شەهرەمان ) شا سەری لەم لاوە سووڕما! کە ئەم سوپا مەزنە ، بە دوایدا هاتووە .

چووە لای شازادە و سەری ماچ کرد و وتی :

لێم ببورن و بەزەییتان بە پیریەکەمدا بێتەوە و وڵاتەکەم کاول مەکەن .

( تاجی شاهان )یش لە وەڵامدا وتی :

تۆ لە ڕێزەی باوکمدایت .. بەڵام تۆیش ئاگات لە شازادە (دنیا) بێت .

شەهرەمان شایش وتی :

بێخەم بە ..کە ئەمە ببیستێت : خۆشحاڵ دەبێت .

وەزیری سولەیمان شای لە خۆی نزیك کردەوە و پەیمانی دایە .. دیاری یەکی بە نرخی

پێشکەش بکات بەو مەرجەی ئەم دیمەنە بۆ ( سلێمان ) شا نەگێڕێتەوە .
فەرمانیشی دا .. ( تاجی شاهان ) ببەنە گەرماو و دواتر بە دڵی خۆی بی پۆشن . هەر زوویش بیهێننەوە . دواتر بە بەرگی نوێوە ، هێنایانەوە ناو کۆڕەکەیان .
( تاجی شاهان ) کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی بۆ ( وەزیر ) و (عەزیز) .
عەزیزیش وتی :
لەو کاتەوە .. کە چوویتە کۆشك و سەرای شازادەوە و دیار نەمایت . ئێمەش بە پەلە گەڕاینەوە ، لای ( سولەیمان ) شای باوکت و هەواڵەکەمان پێگەیاند . باوکیشت ئەو سوپا مەزنەی پێکەوە نا و هات بۆ رزگار کردنت . ئەوە بوو ، بووە هۆی دڵخۆشی ئێمە و تۆیش .
ئەویش وتی :
هەمیشە ئێوە مایەی خێر و خۆشین .
( شەهرەمان ) شایش چووە کۆشکی خۆی و هەواڵی شازادە ( دنیا)ی پرسی .. بینیی .. مستووی شمشێرەکەی لە زەوی ناوە و سنگی خستووەتە سەر نووکی شمشێرەکە و خۆی دەلاوێنێتەوە ودەڵێت :
( *دەبێت دوای خۆشەویستەکەم .. منیش خۆم بکوژم* .)
باوکی بەو شێوەیە کچەکەی بینی هاواری کرد :
نەکەی .. تووخوا : بەزەییت بە باوکتدا بێتەوە .
تێی گەیاند کە شازادە تاجی شاهان خوازبێنی ئەوی لێکردووە. شوو کردنەش بە دەست خۆیەتی .
شازادە دنیایش وتی :
ئەی من نەموت کە ئەمە شازادەیە ؟ بەو خوایە دەبێت پێی بڵێم : بە دارێکدا هەڵت بواسێت..!
پاشای باوکی بە پێکەنینەوە وتی :
کچم بەزەییت پێمدا بێتەوە ، تا خوا بەزەیی پێتدا بێتەوە .
ئەویش بە باوکی وت :
خێراکە .. برۆ ئەو لاوەم بۆ بێنە ..
باوکیشی بە پەلە چوو و (تاجی شاهان)ی هێنا. کچەکەی بەرەو رووی رای کرد و بە بەرچاوی باویکەوە باوەشی پێدا کرد .
دواتر وتی : زۆرم بیر کردیت !
رووی کردە باوکیشی و وتی :
تۆ کوڕی ئاوا.. شۆخ و شەنگت دیوە . شازادەش بێت..!؟
بە وەزیر و نوێنەرانی شا ( سولەیمان )یشی وت :

بڕۆنەوە بە شا رابگەیەنن ، کە کوڕەکەی سەلامەتە و زۆر دڵخۆشە بە هاتنتان .
ئەوانیش بە دڵی خۆشەوە گەڕانەوە ناو سوپاکەیان .
فەرمانیدا کە وا سەربازگەی کاتییان بۆ دابین بکەن..(١٠٠) ئەسپ و (١٠٠) هێستر و (١٠٠) کۆیلەی (١٠٠) پیاو و ( ١٠٠ )کەنیزەکیان ئامادە کرد و ناردیان و کردیانە دیاری بۆ شا ( سولەیمان) . (شەهرەمان) شا و وەزیرانی و سەرکردە و پیاوانی دەوڵەت چوونە کەناری شار بۆ بە خێرهێنانی شا ( سولەیمان ) .
ئەویش کە بە مەی زانی بەرەو روویان چوو. فرەی پێخۆش بوو کوڕەکەی سەلامەت و دڵخۆشە . زۆر رێزی گرت لە شا شەهرەمان و سفرە و خوانی بۆ رازاندنەوە .
نزیکەی کاتژمێرێك وتووێژیان کرد . هێندەیان زانی (تاجی شاهان) بە بەرگی شاهانەوە پەیدا بوو . کە باوکی بینی ..گەشایەوە و باوەشیان بە یەکدا کرد. دانیشتوان هەستان و لە نێوان دوو پاشادا دایان نا .
دواتر شا سولەیمان رووی کردە ( شەهرەمان ) شا و پێی وت :
دەمەوێت شازادە دنیا بۆ ئەم کوڕەم بخوازم لێتان .
شەهرەمان شایش وەڵامی دایەوە کە : جێی شانازیەتی و پەسەندە . دواتر شەهرەمان شا ناردی قازی و شایەت ئامادە بوون . هەر لەوێدا مارەبڕینەکەیان بە جێ گەیاند .
( تاجی شاهان ) رووی کردە باوکی و وتی :
ئێمە عەزیزمان زۆر ماندوو کردووە . گەر یارمەتیی ئەو نەبووایە . بە ئاواتی خۆم نەدەگەیشتم . ئێستاش دەخوازم کاروانێکی بازرگانیی لە کوتاڵ و شتومەك بە دیاری بۆ ئامادە بکەن و وڵاتی خۆی لێرەوە نزیکە و بە ڕێی بکەن .
( سولەیمان) شایش وتی : زۆر باشە کوڕم .
فەرمانیدا باری (١٠٠) وشتر لە کوتاڵ و جلوبەرگی بۆ ئامادە بکەن و بە ڕێی بکەن .
تاجی شاهانیش باوەشی بە عەزیزدا کرد و پێی وت :
ئەو دیاری یە لە من وەربگرە : ئەی باشترین هاوڕێ ..
ئەویش کڕنووشی بۆ ( تاجی شاهان ) و باوکی برد و وتی :
بەو خوایە .. لەبەر ئەو دایکە پیرەم نەبووایە..لەگەڵتان دەهاتم . بەڵام با هەمیشە هەواڵتان بزانم .
( عەزیز ) بەرێکەوت تا گەیشتە وڵاتی خۆی ..کە سەیری کرد دایکی گۆڕێکی لە حەوشەکەیاندا بۆ هەڵبەستووە و خۆی بە سەریدا داوە و خۆی دەلاوێنێتەوە :

لە رووداوانا ، گەلێ ئـارامم — تەنیا پەژارەت بوومەتە زامم
کێ بەرگەی دووری جەرگی دەگرێ؟ — بۆیەش لاوازە هەموو ئەندامم
بەدەم خوێندنی ئەم هۆنراوەوە — بە چاوما فرمێك هاتە خوارەوە

هەرچەندە سلاو لە گۆڕی دەکەم | لەو یارە دەنگیٚ من کە نابیەم
بەلاّم هەناسەی ساردت دیارە | نامۆی بەو هەوا و شوێن و دیارە
هەرچەند ئەو خۆڵە وا دڕزاندووی | بەلاّم لە لای من هێشتاکە زیندووی

لەم کاتەدا ، ( عەزیز) چووە بەرامبەری . دایك کە بینی لەخۆشیاندا بوورایەوە . ئەویش بڕیٚ ئاوی بە روویدا پڕژاند . کە بە ئاگا هاتەوە، باوەشی پێدا کردو بە خێری هێنایەوە .

لیٚی پرسی کە بۆچی ئاوا ون بووە؟ عەزیزیش چی بەسەر هاتبوو، بۆی گێڕایەوە و هەواڵیشی دایە کە ( تاجی شاهان ) : (١٠) باری وشتری پیٚ بەخشیوە ! دایکیشی زۆر دڵخۆش بوو، بەو هەواڵە .

لەولایشەوە تاجی شاهان ، بووکی لە لایەن شا شەهرەمانەوە بۆ رازایەوە . دیاری و بەخشیش و پێداویستی ڕێگای بۆ ئامادە کرد و تاکو سیٚ رۆژ لەگەڵیان رۆیشت . ئەمجا خواحافیزی لیٚ کردن و تاجی شاهان و سوپا مەزنەکەی باوکی بەرەو وڵاتی خۆیان بوونەوە و ئەمیش گەڕایەوە شاری خۆی .

لەولایشەوە چەند شەو و چەند رۆژ (سولەیمان) شا و سوپاکەی بەڕێوە بوون .

گەیشتنەوە وڵاتی خۆیان.دەنگو باسی گەیشتنیان بە شاردا بڵاو بووەوە و شاریان رازاندەوە . رۆژی دواتر شا سولەیمان چووەوە سەر کورسی حوکمڕانی .

ئەمجا فەرمانیدا:

بەندی یەکانیان ئازاد کرد . بۆ ماوەی مانگێك ئاهەنگی ژن هێنانی کوڕەکەی گێڕا . یانەی ئاهەنگەکان کرانەوە و سەماکەران ، گۆرانی بێژان کەوتنە سەما و گۆرانی وتن .

( تاجی شاهان ) ماڵی دایك و باوکی بە جیٚ هێشت و چووەوە کۆشکەکەی خۆی.. ئەو کۆشکەی شازادە دنیا چاوەڕێی دەکرد .

تەمەنێکی فرەیان بەخۆشی و شادی بردە سەر و دواتر خوا ئەوانیشی بردەوە بۆ خۆی .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

## شەوی ١٣٥

### چیرۆکی ضوءالمکان و گەمارۆدانی قوستەنتەنیە

شەهرەزاد وتی :

ئـەی شاشەهرەیار.. خـاوەنی بڕیار... ئەم شەو دەچینەوە : سەرو کاری ( دندان ) .

شەهرەیار شا سەری رازی بوونی بۆ لەقاند ..

شەهرەزادیش بزەیەك گرتی و وتی :

لەوکاتەدا ( ضوءالمکان ) بە ( دندان )ی گەورە وەزیری وت :

کەسانی وەکو ئێوە : دڵە تەنگەکان دەکەنەوەو هەمنشینی شاهان دەبن و تەگبیریان بۆ

دەكەن . گەمارۆی قوستەنتەنیە : چوار ساڵی رەبەقی خایاند . جەنگاوەران و ئەفسەران لە توانایاندا نەماو بیری كەس وكاری خۆیان دەكەن .

بۆیە ضوءالمكان سەركردە بەهرام و رۆستەم و توركاشی كۆ كردەوەو و پێی وتن :

ئەزانن ئەم هەموو ساڵە ماینەوەو بە ئاواتمان نەگەیشتین . خەم و پەژارە و ماندوو بوونمان زۆر بوو .

لە بری سەركەوتن . براكەشم لە دەست دا . ئەمە لە جێی ئەوەی تۆڵەی خوێنی شا( عومەری كوڕی نعمان) بكەینەوە . هەموو هۆكارەكەیشی ئەو (پیرەژنە) فێڵاوی یە بوو . هەر ئەو لە وڵاتی خۆیدا باوكمی كوشت..! خاتوو (سەفیە)ی ژنیشی لەگەڵ خۆی فڕاند . بەوەشەوە نەوەستا ، ( شركان )ی برای منیشی سەر بڕی . منیش سوێندم خوارد ، تا تۆڵەیان بسەندمەوە.. نازانم ئێوە دەڵێن چی ؟

ئەو سێ سەركردەیە سەریان داخست و وتیان :

ئەو وەڵامە بە ( دندان )ی گەورە وەزیر نەبێ نادرێتەوە .

ئەمجا ( دندان ) لێی هاتە پێشەوەو وتی :

مانەوەمان سوودی نی یە .. با..بگەڕێینەوە بۆ وڵاتی خۆمان . دوای چەند ساڵێكی دی : خۆمان ئامادەی جەنگێكی گەورەی وڵاتی رۆم دەكەین .

پاشایش وتی :

بیر و رایەكی پەسەندە .. سەربازەكان بیری خاو و خێزانیان دەكەن . خۆشم بیری ( كان ماكان )ی كوڕم و( قچی فكان ) برازام دەكەم .

جەنگاوەران بەم هەواڵەیان زانی دەستیان كردە پاڕانەوە بۆ ( دندان )ی وەزیر و ( سوڵتان ) . جارچی جاڕی دا .. جەنگاوەران خۆیان ئامادە بكەن . دوای سێ رۆژی تر سوپا بار دەكات و بەرەو وڵات دەگەڕێتەوە. ( دندان )ی وەزیر بووە پێشەنگی سوپا و ( پاشا) لە ناوەڕاستداو چەندین شەو و رۆژ بە رێگەوە بوون . تاگەیشتنەوە بەغداد. شار خرۆشاو بازاڕو دوكانان رازێنرانەوە . ئاهەنگ گێڕرا. دابڕاوان بە خێزانیان شاد بوونەوە و پاشا چووەوە كۆشك . میران و سەركردەكان گەڕانەوە ماڵی خۆیان ..

پاشاش : بە كوڕە (٧) ساڵانەكەی شاد بووەوە .

## چیرۆكی ضوءالمكان و توونچی یەكە

شەهرەزاد وتی :

پاشا لەگەڵ ( كان ماكان )ی كوڕی چوونە گەرماو. ئەمجا چووەوە سەر كورسی حوكمڕان . دندان و وەزیران و سەرانی دەوڵەت لێی كۆ بوونەوە . پاشا ناردی یە شوێن (توونچی)ی هاوڕێی . ئەویش هات و پاشای بەخێر هێنایەوە . پاشا ئامۆژگاری وەزیرانی

کردبوو کە ئاگایان لە ( توونچی ) بێت و داواکاریەکانی بۆ جێ بەجێ بکەن . کە سەیری کرد (توونچی) قەڵەو و خەپەتۆڵە بووە و بە هۆی خواردنی باشەوە ورگی پەیدا کردووە و ملی بە (٧) تەور نابڕڕێتەوە ..!

پاشا بە پێکەنینەوە دەستێکی بۆ بردو پێی وت :

چەند زوو منت بیر چووەوە !!

( توونچی ) وردتر سەرنجیدا و بیری کەوتەوە و هەستایە سەر پێ و وتی :

ئەی خۆشەویستەکەم ، کێ تۆی گەیاندە پاشایەتی !؟

وەزیر چووە لایەوە ئامۆژگاری کرد . ئەم پیاوە هاوڕێتە و ئێستاش پاشای زەمانە . ئەوە ئامۆژگاریت دەکەم گەر پرسیی ..خوازیاری چیت ؟ داوای شتی سەنگین بکە! چونکە زۆری تۆ خۆش دەوێیت !

( توونچی )یش وتی :

دەترسم داوای شتێکی لێ بکەم : لای گران بێت و بۆی نەکرێت !

وەزیریش وتی : خوازیاری : هەر چی یەك بیت .. بۆت جێ بەجێ دەکات .

( توونچی ) وتی :

کەواتە..داوای ئەوەی لێدەکەم کە لە دڵمایە..لە خوا دەپاڕێمەوە کە بۆم جێ بەجێ بکات.

وەزیر وتی :

بە دڵی خۆت .. ئەوەش بزانە گەر داوای هەرێمی ( دیمەشق )ی لێ بکەیت کە هی برا جوانەمەرگەکەی بوو.. پێشکەشت دەکات و دەتکاتە ( میر )ی ئەوێ .

توونچی هەستایە سەر پێ و شا ئاماژەی پێدا کە دابنیشێتەوە .

ئەویش دانەنیشت و وتی : چۆن دەبێت لە بەرانبەرتدا من دابنیشم !؟

پاشا وتی :

ئێستا کە من دەژیم و ماوم بە هۆی تۆوە بووە . لەبەر ئەوە : داوای هەر شتێك بکەیت پێشکەشت دەکەم . بەڵام یەکەمجار داوا لەخوا بکە ئەمجا داوا لە من بکە .

( توونچی )یش وتی : گەورەم دەترسم ..!

( پاشا ) وتی : هیچ مەترسە .

( توونچی ) وتی :

ئەترسم خوازیاری شتێك بم ، تۆ رێم نەدەیت .

سوڵتان پێکەنی و پرسیی :

ئەو شتە چی یە؟ ئەگەر نیوەی مەملەکەتەکەیشم داوا بکەیت دەتکەمە شەریکی خۆم .

توونچی دیسان وتی : دەترسم ..!

سوڵتان وتی : مەترسە .

توونچی وتی : دەترسم توانات بە سەریدا نەشکێت !
پاشا بە توورەییەوە وتی : تۆ هێندەت لەسەرە داوا بکەیت .
( توونچی ) وتی :
حەز دەکەم بە فەرمانێك بمکەیتە سەرۆکی توونچی یەکانی شاری ( قودس ) ..!
چەند جارێك وەزیر نقوورچی لێگرت ، کە بێ دەنگ بێت . توونچیش خێرا..خێرا دەیووتەوە .
کە زانی ، پاشا ئەمەی بە دڵ نی یە ، قسەی گۆڕی و وتی .... داوات لێ دەکەم .
پاشا وتی : خێراکە....بڵێ .
توونچی وتی :
دەمەوێت بمکەیتە بەڕێوەبەری خۆڵ ڕێژانی شاری ( قودس ) یا شاری ( دیمەشق ) .. !
دانیشتوانی کۆڕی پاشا خۆیان بۆ نەگیرا و دەستیان کردە پێکەنین . هێندە پێکەنین ، کە هەندێکیان بە پشت دا کەوت . وەزیریش لە داخدا کەوتە لێدانی .
( توونچی ) رووی تێکرد و پرسیی :
گوناهم چی یە وا لێم دەدەیت ؟ خۆت بە منت وت .. داوای شتی گەورە بکە؟
رووی کردە سوڵتان و وتی : ڕێم بدەن بگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم .
سوڵتان زانیی رادەبوێرێ ! ماوەیەك بێدەنگ بوو .
ئەمجا خۆی چووە بەردەمی و وتی :
براکەم ، داوای کاری مەزن بکە .. کارێك شیاوی شاهان بێت !
( توونچی )یش وتی :
کەوابوو..ئەی پاشای زەمانە ، لەخوا : خوازیارم : ئەمجا لە بەڕێزتان .کە بمکەنە جێگری خۆتان لە ( دیمەشق ) و لە شوێنی ( شرکان )ی ڕەحمەتی برات دام بنێیت .
پاشایش وتی : ئەوە.....خوا ئەو پلەیەی پێ بەخشیت !
چووەوە سەر کورسی پاشایەتی و فەرمانیشیدا.. کورسی یەکی میرانەی (دیمەشق)ی لە تەنیشت خۆیەوە ، بۆ دابنێن . دواتر لای خۆیەوە دایناو فەرمانی بۆ دەرکرد . پێداویستی سەفەری بۆ دابین بکەن و برێ دیاری و پارەی دایە .
رووی کردە وەزیر و وتی :
دەبێت تۆ لەگەڵ ئەم فەرمانی شاهانەدا بڕۆیت و ئەمەم بۆ جێگیر بکەیت .
لەوسەریشەوە ( کان ماکان )ی برازام بۆ بێنەوە .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو

**شەوی ١٣٦**

شەهرەزاد وتی :

ئـەی پاشای بـەختیار ... سـەرکردە و سـەردار ... وەزیـر دەستی ( توونـچی )ی گـرت و لەگەڵ خۆی بردی.. تاکو شتومەکی سەفەری بۆ ئامادە بکات . شایش فەرمانیدا، کە بڕێک خزمەتکارو کۆیلەی کۆشکی بدەنێ . با لەگەڵ خۆی بیبات .

رووی کردە وەزیرانی و وتی :

هەرکەس مـنی خـۆش دەوێـت : بـا..دیـاری بداتـە ئـەم تـازە (مـیر)ە (مجاهد)ی پـێ بەخـشی .کـە ئـەم رێورەسمـە لەگـەڵ ( دنـدان ) تـەواو بـوو. خۆیـشی ئازنـاوی .کاروان ئامادە کراو توونچی چووە لای شـا بـۆ خـواحـافیزی . پاشـایش باوەشـی پێـدا کـرد و ئامۆژگاری کرد: لەگەڵ هاوڵاتیانی (دیمەشق) دا باش بێت .

هەر لە ئێستاوە تا(٢) ساڵی ترخۆی و سوپای ئامادەی (جهاد) بکات . (٥٠٠٠) کۆیلەی لە دیاری یەکانی وەزیرو میرانی دەوڵەت کۆکردەوە و بەهرامی پێشەنگی دەیلەم و رۆستەمی پێشەنگی عـەجەم و تورکاشی پێشەنگی عارەبانی رەوانـە کـرد بـۆ بـەرێ کردنـی . دوو رۆژە رێ بە دواوەی بوون و گەڕانەوە بۆ ( بەغداد ) . (سوڵتان زبڵکان) ـ کە ئەم نازناوە ( سوڵتان چووالملکان ) بـە توونـچی بەخـشی بوو ـ چـەند شـەو و چـەند رۆژ بـە رێگـاوە بـوون . تـا گەیشتنە (دیمشق) .

پێش خۆیان : هەواڵەکە گەیشتبووە شاری (دیمەشق) کە پاشای گەورە سوڵتان ( زبلکان )ی کردووە بە (میر) و پلەی ( مجاهد )ی پێ بەخشیوە . شاریان بۆ پێشوازی میر ( زبلکان ) رازاندەوە و گەورە پیاوان چوون بە پیریەوە .

هەر گەیشتە ( دیمەشق ) و چووە سەرکورسی حوکمڕان . فەرمانیدا سامان و پارەی گەنجینە.. ببەخشنەوە بەسەر هەموو هاوڵاتیان و هەژاراندا. هەندێك پارەشی بە دیاری بەخشی بە( دندان )ی گەورە وەزیر .

بەڵام وەزیر وەری نەگرت و وتی :

کە کاتی خۆی هات ، دەبێت بڕە داهاتێکی دیاری کراو بنێرێتە (بەغداد) و پارەی جەنگ بدەیت .

میر ( زبڵکان) کەوتە ئامادە کردنی کچەی بـرازای سـەڵتان و لەگـەڵ وەزیـر بـەرێی کـردن و (١٠) کەنیزەکی خستە شوێن و ماوەیەك لەگەڵیان رۆیشت .

کە گەڕایەوە ، سەرکردە جەنگی یەکانی بانگ کرد و پێی وتن :

دەبێت لەشکری ( دیمەشق ) ئامادە بکەن و مەشقیان پێ بکەن . تا ئەو دەمـەی کـە سوڵتانی گەورە ، دەنێرێتە شوێن سوپاکە . لەولایشەوە ، کاروانی ( دنـدان )ی گـەورە وەزیـر چەند شەو و رۆژ بەرێوە بوو.. تا گەیشتنە کەناری شاری ( بەغداد ) .

تەتەری ناردە لای شا ( ضوءالمکان ) . ئەویش سوار بوو و لەگەڵ پیاوانی دەوڵەت چوونە پێشوازیان . (دندان) ویستی لە ئەسپەکەی دابەزێت و پێشوازیی پاشا بکات . بەڵام نەیهێشت

. خۆی هاتە تەنیشت وەزیر و ئەحواڵی (میر) زبلکانی لێ پرسی .
ئەویش پێی وت :
کە سەلامەتەو وتیشی کە (کان ماکان )ی (شرکان)ی برای بۆ هێناوەتەوە .
ضوءالمکان چووە ژووری (کان ماکان)ی برازای ، ئەو دەمە کیژێکی جوانکیلەی ( ٨ )ساڵانە بوو. زۆر دڵی پێی کرایەوە . لە هەمان کاتدا، خەمی براکەی لە دڵا نوێ بوومەوە . فەرمانیدا جلوبەرگی جوانی بە باڵا ببڕن و گوارە و بازن و ملوانکەی زیڕینی بۆ بکەن . بیبەنە لای ( قضی فکان )ی کوڕی خۆی. با پێکەوە گەشە بکەن و گەورە ببن . دوانەیەکی بە ناوبانگ لە وڵاتەکەدا. (قضی فکان) کیژێکی ژیکەڵەی خاوەن ژیری و بە ئاگا لە دوا ڕۆژ و زیرەك دەرچوو. (کان ماکان )یش کوڕێکی قۆز و بەکار... هەرگیز گوێی بە ئەنجامی ڕەفتارەکانی نەدەدا..!
پێکەوە دەچوونە دەرەوە بۆ سواری ئەسپ و ڕمبازێن و شەڕەشیر . تەمەنیان گەیشتە(١٢) ساڵان . ضوءالمکان ناردی بە شوێن وەزیر .
کە هات پێی وت :
بۆ ئەوەم بانگ کردوویت : بیرت بخەمەوە کە کاتی خۆی بڕیارێکمان دابوو .
( دندان )ی گەورە وەزیر پرسیی : ئەو بڕیارە : کامە بوو ، ئەی شای زەمانە !؟
پاشایش وتی :
دەمەوێت (کان ماکان ) بکەمە (جێ نشین )ی خۆم و بیبەمە مەیدانی جەنگەوە ..! تۆ دەڵێی چی؟
وەزیریش وتی : حەز دەکەم ئەوە بزانی ئەی پاشای بەختیار.. خاوەنی بڕیار .
ئەم کارەت بە لەبار نازانم ، لەبەر دوو هۆ.. یەکەمیان : زۆر منداڵە..! دووەم هۆیش ئەوەیە : لە دنیا وا بڵاوە کە هەر پاشایەك (جێ نشین)ی بۆ خۆی دیاری کردبایە . ئەوە هێندەی پێ ناچێت .. خۆی دەمرێت..!

چیرۆکی نەخۆش کەوتنی ضوءالمکان و مردنی
پاشا وتی :
ئاخر.. ئەوەش بزانە : کە گەورە خزنەدار دەکەینە جێگری (کان ماکان) بۆ کاروباری دەوڵەت . چونکە ئەو پیاوە ، خوشکی خۆم ژنێتی و زاوامە و یەکێکە لە ئەندامانی بنەماڵەکەمان و لە جێی براکەمە .
دندانی گەورە وەزیریش وتی :
کەوابوو چۆنت دەوێت وا بکە ... ئێمە پێ لە ملی فەرمانەکانی تۆین..!
دواتر شا ( ضوءالمکان ) هەموو وەزیران و گەورە پیاوانی دەوڵەتی کۆکردەوەو پێی وتن :

ئێوه دەزانن ( کان ماکان )ی کوڕم ، شۆڕه سوارێکی زەمانی خۆیەتی . چاپووك و شمشێروەشێن .
ئازاو بە جەرگە . ئەوا دەیکەم بە پاشای دەوڵەت . گەورە (خەزنەدار)یش مامەیەتی و کردمە جێگری .
گەورە ( خەزنەدار)یش وتی : گەورەم من لە تەوقی سەرمەوە ، تا بەری پێم لە چاکەی ئێوەدایە .
پاشایش وتی :
ئەی خەزنەدار..( کان ماکان )ی کوڕم و ( قضی فکان ) ئامۆزان بە ئاگاداری ئێوە-ئەوە.. ئەوانیشم لە یەکتر مارە بڕی .. ئێوە بە شایەت بن .
ضوءالمکان سامانێکی هێندە زۆری دایە کوڕەکەی ، کە زمان لاڵە لە ئاستی ژماردنیدا . چووە لای ( نزهەالزمان )ی خوشکی و ئەم هەواڵەی پێدا.
ئەویش زۆر خۆشحاڵ بوو و وتی :
خوا تۆیان بۆ بهێڵێت تا هەتایە . ئەوەش بزانە کە هەردووکیان منداڵی خۆمن .
پاشایش وتی :
من بەشی خۆم ژیاوم . بەڵام ئەوەی لە دڵمدا بوو . ئاسوودەیم بوو لە دوارۆژی کوڕەکەم . ئەوا کردم ، دەبێت تۆش چاوت لە دایکی یەوە بێت .
گەورە خەزنەداریشی راسپارد کە ئاگای لە کوڕەکەی بێت . دوای ئەم کارانە ، (ضوء المکان) کەوتە سەر جێگا و نەخۆش بوو ..گەورە (خەزنەدار)یش لە برێتی کوڕەکەی دەوڵەتی بەڕێوە دەبرد .
دوای ساڵێك رۆژێکیان بە ئامادە بوونی دندانی گەورە وەزیر رووی کردە ( کان ماکان ) و وتی :
کوڕەکەم ، مردن شەرمی لە کەس نییە . منیش تەمەنێکی زۆرم بەسەربردووه . بە زۆرینەی ئاواتەکانم گەیشتووم تەنیا ئاواتێك نەبێت .. کە ئەوەش لە تۆ دەخوازم .. جێ بەجێی بکەیت .
( کان ماکان )یش پرسیی : بابە گیان ... ئەو ئاواتە چی یە ؟
گەورە ( خەزنەدار) وتی :
کوڕەکەم ئەوە بزانە ..( دندان )ی گەورە وەزیریش وەکو باوکت وایە . ئەگەر من مردم گوێ لەو بگرە . ئاواتەکەم ئەوە بوو کە کاتی خۆی پیرەژنێکی فێڵاوی سەر ئاسنینە لێمان پەیدا بوو . بوو بە ، نەگبەتی بۆ خێزانەکەمان.. شا( عومەری کوڕی نعمان) کە باپیرەت بوو.. هەروەها ( شرکان )ی مامەی تۆی کوشتووه . ئێمە زۆر هەوڵمان دا بەڵام تۆڵەی ئەو خوێنانەمان بۆ نەکرایەوە . ئەگەر ..خوا هەلی بۆ رەخساندی ئەو تۆڵەیە بکەرەوە . بەڵام

ئامان سەد ئامان.. ئاگاداری ئەو( پیرەژنە ) سەر ئاسنینە فێڵاوی یە ببە با فریوت نەدات . بۆ ئەو کارەش بە قسەی ( دندان )ی گەورە وەزیر بکە . چونکە ئەم پیاوە کۆڵەکەی ماڵەکەمانە .

ضوءالمکان (٤) ساڵ لە جێگادا کەوت . گەورە (خەزنەدار)یش ، نەخۆشی زۆری بۆ هێنابوو . خەڵکەکە دەم بە نزابوون بۆی .

لەولایشەوە (کان ماکان) و( قضی فکان ) رۆژ دەبووەوە سواری ئەسپەکانیان دەبوون و دەچوونە رمبازێن و شەرەشیر و بە کارهێنانی قەڵغان و تیر هاوێشتن . ئێواران کە دەگەڕانەوە کان ما کان دەچووە لای دایکی و دەیبینی بە ژوور سەری باوکیەوەیەو خزمەتی دەکات و بۆی دەگری. ئەمیش شەوانە یارمەتیی دەدا.کچەکەیش دەچووە لای دایکی .

رۆژێکیان .. کە سەرئێشە زۆری بۆ ( چوو المکان ) هێنابوو.. بەمجۆرە خۆی لاواندەوە :

سەر دەمم رۆیشت وا پووکامەوە کەچی نەمردم : وا هەر مامەوە
بە هەرزەکاری تاقانە و قۆز بووم زۆر باڵادەست و پێشەنگی هۆز بووم
ئاخۆ پێش مردن کوڕم دەبینم ببێتە پاشا و هەم جێ نشینم ؟
دوژمن بشکێنێ ، تۆڵە بسێنێ بە شمشێر کۆتا بە دوژمن بێنێ
بە هەموو بارێ بەشم خوراوە مەگەر ئەو خوایەم بێ بە هاناوە

دوای گریانێکی فرە خەو بردی یەوە . لە خەویدا، دڵیان خۆش کرد و وتیان :

مژدە بێت .. (کان ماکان)ی کوڕت شای زەمانەیە .. هاوڵاتیان لە ژێر رکیفی دان و زۆریان خۆش دەوێت . هێز و توانایەکی سەربازیی مەزنی هەیە . کە بە ئاگا هاتەوە زۆردڵخۆش بوو بەو خەونە .

دوای چەند رۆژێکی کەم .. ئیزرائیل لە دەرگای دا و رۆحی کێشا .

ساڵان رۆیشت و ناوبانگی لە بیرخەڵکی چووەوە . دوای چەند ساڵ حوکمڕانی (کان ماکان) . بەغداییەکان لێی هەڵگەڕانەوە و لەسەر حوکم لایان برد . پاشاو دایکیان دوورخستنەوە و بە تەنیا مانەوە .

دایکی کە بینی ژیانی شپرزە بووە و هەژار کەوتوون، وتی :

چارەم نی یە دەبێت روو بکەمە قاپی گەورە ( خەزنەدار) . بە پەنای پەروەردگار. خۆی پێچایەوە و کەوتە رێ : تا گەیشتە ماڵی گەورە ( خەزنەدار) چووە ژوور. رووانی هێشتا لە جێگاکەیدایە .

چووە لای ( نزهەالزمان )ی ژنی و زۆر بە سەری دا گریا و پێی وت :

هەر کەسێك مرد . ئیتر بێ هاوڕێ و کەس و کار دەمێنێ ! خوا هیچ خراپەیەك بە سەر ئێوەش نەهێنێ . ساڵانێکی زۆرە : ئێوە دادپەروەرانە حوکمڕانی دەکەن . خۆ... بە چاوی خۆتان بینیتان کە ئێمەش لە چ ژیانێکی خۆشدا بووین . ناوبانگی ئێمەتان بە گوێی خۆتان

بیست بوو کە چەند دادپەروەربووین . ئێستا ژیانمان هەڵگەڕاوەتەوەو زەمانە غەدری لێ کردین . ئەوەتا روومان لە ئێوە کردووە .

خۆت دەزانیت کە مرد پیاوی خێزان. ژن و کچانیان دەبن سەرگەردان .. ئاوا خۆی لاوانەوە :

بە سە مردنی سەرسوڕهێن هەیە    بۆ مردن کوانێ عومر و شوێن هەیە

رۆژانی عومریش قۆناغ قۆناغە    رۆژانی خۆشی: خەفەت هێن هەیە

خۆشیی سەرومڕ هەتا سەر نییە    لە شوێنی بەلا، دیارە خوێن هەیە

کە ( نزهەالزمان ) ئەم شیعرەی بیست ... براکەی وکوڕەکەی بیرکەوتەوە .

باوەشی پیاکرد و وتی :

وا مەزانە خێرت پێ دەکەین.چونکە سامان و پارەی ئێمە هەمووی هی( چووالمكان) بووە . بۆیە ماڵ ماڵی خۆتە . هەر چیمان هەیە پێکەوە دەیخۆین .

جلوبەرگی نایابی بۆ خۆی و ( کان ماکان ) هێناو پۆشتەی کردنەوە . هەر بە تەنیشت کۆشکی خۆیانەوە .. خانوویەکی بۆ رازاندنەوە .

چەند خزمەتکار وکەنیزەکی بۆبردن . داوایشی کرد ( خەتمە) بۆ ( چوو المكان ) بکات .

شەهرەزاو هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٣٧**

## چیرۆکی (کان ماکان) و ( قضی فکان )

شەهرەزاد دانیشتەوەو دەستی بە گێڕانەوە کرد و وتـــی :

لەولایشەوە (کان ماکان ) و( قضی فکان )ی کچە ئامۆزای گەورە بوون . وەکو دوو لقی درەختی بەردار یان دوو مانگی چواردەیان لێ هات . تەمەنیان پازدە ساڵان بوو . قضی فکان کیژە جوانکیلەی بە ناوبانگ و تاك لە وڵاتدا . خوا، هەموو جوانیەکانی تیا کۆ کردبووەوە . (کان ماکان)یش تاکو بڵێی قۆز و شۆخ بوو. تازە مووی لێ روا بوو و ئازایەتی لە چاوانیدا دەبریسکایەوە .

کان ماکان وەکو جاران چووە لای ( نزهەالزمان)ی پووری و سڵاوی لێ کردو لێی پرسی :

پورێ ئەوە کەی مامەم ، پەیمانەکەی خۆی بەجێ دێنێ و ئامۆزاکەمم لێ مارە دەکات ؟

پووری وەڵامی دایەوە :

کوڕم پێویستە هەندێ هەواڵت بدەمێ : کە نەدەبوو پێت بڵێم .

( کان ماکان )یش وتی : بڵێ !

ئەویش وتی :

خەزنەداری باوکت : باوکی (قضی فکان)ی کچە ئامۆزایشتە ..! ئەگەر هەر پێ دادەگریت

: به دزی یەوە دەی دەمە دەستت بە مەرجێ : نەگەڕێیتەوە ناومان ..!
کان ماکان کە ئەمەی بیست زمانی بەسترا و بێدەنگ چووە دەرەوە و گەڕایەوە لای دایکی خۆی .
پووری چی پێ وتبوو: بۆی گێڕایەوەو وتی :
ئاخر .. ئەوە ئامۆزامە و حەقی خۆمە .. بۆ من بێت !
دایکیشی وتی :
بێدەنگ بە کوڕم . با ئەم هەواڵە نەگاتە گوێی ساسان شا . چونکە ئەگەر بیبیستێت ، بێ بەشت دەکات لەو ئامۆزایەت و لە ناوت دەبات . ئەگەر ئێوارەیەك .. ئەو نانمان بۆ نەنێرێت ؛ ئەوا لە برسانا دەمرین و بە سواڵ کردن رسوا دەبین ...!
( کان ماکان ) فرمێسك بە چاوانیدا هاتەخوارو بەگریانەوە وتی :
ئیدی کارێکم بەم پوورەم نەماوە . ئەم بنەماڵەیە بەجێ دێڵم و دەچمە : کەناری شار دادەنیشم . چار ناچار دایکی شوێنی کەوت و چوونە کەناری شار . بەڵام بە دزی یەوە دایکی رۆژانە دەچووەوە ماڵی ( ساسان ) شاو خواردن و پێداویستی ماڵی دەهێنایەوە . لە کەناری شاریش بوونە دراوسێی کۆمەڵە چڵیت و دەم رووتێك .
لەم لایشەوە ( قضی فکان ) چووە بن کلێشەی پووری یەوە ولێی پرسی :
پوورە دەنگوباسی کوڕەکەت چی یە؟
ئەویش وتی :
کچەکەم بەخوا ، دڵتەنگ و چاو بە گریانە .
( قضی فکان )یش وتی :
بە خوا پوورێ گوناهی خۆیەتی ..بێبەش بوو لە چاکەی باوکم و دوورکەوتەوە . خوا بکات رۆژێك بێت ( دابڕاوان ) پێك بگەنەوە .
*شەهرەزاد هەستی کردشەو دەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

**شەوی ١٣٨**

چیرۆکی سەفەرەکەی (کان ماکان)
شەهرەزاد رووی کردەوە پاشا و درەێژەی بە قسەکانی دا و وتی :
کە دایکی کان ماکان ئەمەی بیست . سوپاسی کرد کە چووەوە لای کوڕەکەی و بۆی گێڕایەوە . شەوان رۆیشتن و رۆژان هاتن . تا هەردووکیان تەمەنیان بووە (١٧) ساڵان . کوڕە بووە لاوێکی گەورە و بۆشناخ .
شەوێکیان کە خەو نەدەچووە چاوانی و لە دڵی خۆیدا وتی :

بۆ دەبێت بێدەنگ بم ، هەژاری نەبێت ..خەوشێکم نی یە !؟ نەسیبم لێرە نەماوە و نەهاورێم هەیە.. نەکەس و کار! شاخ و دەشت و دۆڵ دەگرمە بەر . جێی دێلم وڵات.. تاکو ناموێی لە ناوم دەبات .

ئەم چەند دێڕەی بە دەمدا هات :

با دڵەکوتێم هەر بەرەوبان بێت — نەکو رسواییم پێ ئاوێزان بێت
سەردەنێمەوە، خۆم رزگار دەکەم — حەزو ئارەزووم ، گۆڕمو شاردەکەم
بە سینەی ساف و بە خەندانەوە — بۆ زۆران دەچمە گۆڕەپانەوە
بە شوانی بەرغەل : دێمەوە لاتان — دەچمە لاوێکی ئازای وڵاتــان

بە پێی پەتی و بە سەری قوتی وکراسێکی نیو قۆڵەوە .کەوتە رێ و (٣) رۆژ بەرێوە بوو . خواردنی تەنیا یەك کولێرە بوو. بە تاریکی شەویش هەر دەرۆیشت . تا گەیشتە بەردەم یەکێ لە دەروازەکانی شاری بەغداد و چاوەرێی کرد.. بەیانی هەر دەروازە والابوو.. ئەو یەکەم کەس بوو، لە بەغداد چووە دەرەوە . شەوی بە سەردا هات و هەر رۆیشت . دایکیشی لەو لاوە هاواری لەبەر برا. ئەم لاو لا بۆ کورە گەڕا . کونە مشکی لێ بووە بە کۆشك و سەرا !!

رۆژی یەکەم و دووەم و سێ یەم چاوەڕێی بوو و هەر نەبوو. بوو بە (١٠) رۆژ . هەواڵی نەبوو .

بۆیە هاواری لێ هەستا و وتی :

کورەکەم ..دڵم لە دووریت تەقی. خۆم خەمم کەم نەبوو، ئەمەی تۆشی چووە سەر. خەو ناچێتە چاوم ئاخر.. روو بکەمە چ وڵاتێك بانگت بکەم ؟ ئاخۆ... لە کوێ هەوارت خستووە ؟

بەم هۆنراوەوە... خۆی لاواندەوە :

زانیم دابڕان : دەمان رزێنێ — شەختەی دووری تۆ هەڵمەوەرێنێ
خۆتان رۆیشتن منتان لێ جێما — هەنگاوی ناو ( لم ) وا دەم مرێنێ
شەوێ کوترێ گمەی بۆ کردم — وتم: قەت نەکات : خۆی بگرێنێ
ئەگەر هێندەی من خەمت بوایە — نە(میل) لە ( مل ) بووی. نەپێ بە خەنێ !
کەتاك دەمێنم دەورم چۆڵ دەبێ — پەژارەی دووریت زۆرم بۆ دێنێ

مانی گرت لە خواردن و خواردنەوە . گریان و فرمێسکی چاوانی پتر بوو .تا بە گرینۆك ناسرا .

خەڵکیش بۆی دەگریان و بە یەکتریان دەوت :

( ضوءالمکان ) لە کوێی تاکو (کان ماکان)ی کورت : بەم شێوەیە ببینی !؟

گلەییان لە زەمانە دەکرد و لە خۆیان دەپرسی :

ئاخۆ... (کان ماکان) چی کردبوو؟ ئاوا.. لە وڵاتەکەی دوور کەوتۆتەوە !؟ باوکی ئەو
برسی یەکانی تێر دەکرد . هەمیشە فەرمانی بە ئاسایش و دادوەری بوو . (دایک)یشی
فرمێسک لە چاوانی نەدەبڕا .
هەواڵی (کان ماکان )گەیشتەوە لای شا (ساسان) . پێیان ڕاگەیاند ئەوەی پاشامانە و لە شا
(عومەری کوڕی نعمان )ە . بیستوومانە کە تەرەی وڵاتان بووە .کە شا ئەمەی لێ بیستن
تووڕە بوو .
یەکێکیانی لە سێدارە دا و فەرمانیدا :
کە بگەڕێن بە شوێنی (کان ماکان ) دا.
ناردی بە شوێن ( تورکاش )دا .. فەرمانی پێدا کە (١٠٠) شۆڕە سوار. لەگەڵ خۆی ببات
و بگەڕێت بە شوێنیدا. ئەویش خۆی و (١٠٠) سوار. کون و کەلەبەری وڵاتیان پشکنی....
بێسوود بوو.
دوای (١٠) ڕۆژ هەواڵی دایە پاشا کە هیچیان دەستگیر نەبووە ، لە هەواڵی ( کان ماکان )
. ساسان شا زۆر دڵتەنگ بوو، بەو ڕەفتارە خراپەی دەربارەی کردبووی .
دایکی ( کان ماکان ) هێندە دەگریاو دەی لاوانەوە . کە جێی بە خــۆی نەدەگرت .
لەولایشەوە ( کـان ماکـان )کـە سـەری خـۆی هـەڵگرت (٣) ڕۆژ بـەڕێوە بـوو. لـە گژ وگیای
دەخوارد و لە ڕووبار و کانی یەکانی دەخواردەوە . لە سێبەری درەختـان دەحەوایـەوە . نە
سوارێك .. نە پیادەیەکی نەدی .
خۆشی نیشتمانەکەی و دایك و باوکی بیرکەوتەوە . چاری نەماو ڕێگاکەی گۆڕی و چووە
سەر ڕێگەیەکی دی . (٣) ڕۆژیش بەو ڕێ یەدا ڕۆیشت . دۆڵ و کێو و شاخی بینی .. ڕووەك
و ڕەز و باخی بینی . ئاوازی بولبولانی بیست ..گەشە و نەشەی لالەزارانی دی .
بە هەنسك دانەوە..کەوتە لاوانەوە :

وا سەرم هەڵگرت :بگەڕێمەوە     بەڵام نازانم کە : کەی دێمەوە؟
شتێ نەماوە، دل پەرۆشی بێ     ڕێگەم پێ بگرێ و سەر نەنێمەوە

دوای گریانێکی زۆر . دەسکە گیاکەی دەستی خواردو لەسەر ئاوێك کەوتە دەستنوێژ
شتن و نوێژکردن و بە قەزا گێڕانەوەی نوێژە بە سەر چووەکانی . بەدرێژیی ئەو ڕۆژە پاڵی
دایەوە تاکو ماندوویی دەربچێت . ئێوارە نووست و نیوەشەو، بە ئاگاهاتەوە .
گوێی لە کەسێك بوو.. ئەم شیعرەی دەوت :

خۆزگە بەهار و گوڵ دەهاتەوە     چونکە دەماخ و دڵ دەکاتەوە
مەی خۆر فرسەتە زەوی گوڵ ڕەنگە     بەسەردا : وا دێ شەپۆلی تافگە

کە ( کان ماکان ) ئەمەی بیست . کەوتە هەنسك دان . چونکە تاریك و ئەنگوستە چاو
بووکەسی نەبینی . بە دۆڵەکەدا شۆڕ بووەوە و بەکەناری ڕووبارەکەدا ڕۆیشت. دیسان گوێی

له شیعرێك بوو:

گەر دڵت پڕە و ناوێریت بگری
فرمێسك بڕژێنە ، نەبادا بمری !

گەر یاری خۆت بوو: پەیمانت دایە
تا دەمری دەبێ پەیمان راگری

دڵە تۆ بڵێی: پێی شاد بیتەوە؟
جاری تر..یارت لە ئامێز گری؟

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٣٩**

بەسەرهاتی کان ماکان و دەشتەکی یەکە

شەهرزاد دەستی بە گێڕانەوە کرد و وتی :

کە (کان ماکان ) ئەم شیعرانەی بۆ جاری دووەم بیست تێگەیشت . کە خاوەنەکەی عاشقێکە : وەکو خۆی خەمناك ! ئەم چۆن تووش بووە ، ئەویش هەروەها!

لە دڵی خۆیدا وتی :

بە راستی ئەمە ئەو کەسەیە من بۆی دەگەڕام و هەر زوو هۆگری یەکتر دەبین و بۆ ئەم تەنیاییەم باشە .

بۆیە هاواری کرد :

ئەی رەوتەنیی شەوانی ئەنگوستە چاو.. لێم نزیك وە بە ..بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە . رەنگە یارمەتی دەری ئەو بەڵایەت بم کە تووشت بووە .

خاوەن دەنگەکەیش پرسیی :

ئەی ئەوەی پەیمان دەدەی گوێ بە چیرۆکم بدەی .. مرۆڤی بە هەستیاری؟ یا جنۆکەی شاخداری ؟ بیست رۆژە دەڕۆم بەڕێوە.. لەم دەشت و ئا لەم کێوە.. نە سوارێ نە رێبوارێ ..کەسم نەدی بە پێوە!!

( کان ماکان ) کە ئەمەی بیست لە دڵی خۆیدا وتی :

لەوە دەچێت ئەمیش هەمان بەسەرهاتی منی هەبێت . چونکە منیش (٢٠) رۆژە کەسم نەدیوە .

وا باشە بێدەنگی لێ بکەم تاکو رۆژ دەبێتەوە .

ئەم لەم سێ ودووەی خۆیدا بوو کە دەنگەکە دیسان هاواری کردەوە :

ئەی دەنگ گەر جنۆکەیت : بڕۆ، بەڕێی خۆتەوە .گەر مرۆڤیشی ، لێرە بمێنەوە . تاکو رۆژ دەبێتەوە .

ئیتر ئەو شەوە هەر شیعریان بۆ یەك خوێندەوە و بە سەر یەکدا گریان !!

کە رۆژ بووەوە . لاوێك هاتە لای ( کان ماکان ) .. رووانی لاوێکی (٢٠)ساڵانە . جلێکی شڕی لەبەردایە و شمشێرێکی ژەنگاوی بە پشتوێنەوەیە .

لێی پرسی :

ئەی لاو ئەوە تۆ کێیت؟ خەڵکی کوێیت؟ لە کام تیر و هۆزی عەرەبە دەشتەکیەکانیت؟ کە ئاوا پاڵەوانیت و بەم شەوە زەویت بە کۆڵەوە گرتووە و ناترسیت !؟ ئەم کارەی تۆ کاری (شۆڕە سواران)ە! ئێستاش گیانی تۆ بە دەستی منە.. بەڵام دەتکەمە هاوڕێی خۆم ، دەبێت تۆیش پەزێراییم بکەیت .

(کان ماکان) کە ئەم بێ چاو و رویی یەی لێ بینی.. زانیی ئەمە چاوی بڕیوەتە شتومەکەکەی .

بە زومانێکی نەرم و نیان وتی :

ئەی پیاو چاکی عەرەب ، تۆ کەم تەمەنیم وەلاوە نێ . پێم بڵێ : بە دەم وتنەوەی ئەم هۆنراوانەوە ، چی دەکەی بەم بیابانەوە؟ بۆچی تۆ کێیت؟ کە ئاوا فەرمان دەدەی بە سەرمدا : پەزێراییت بکەم!؟

ئەویش وتی :

من ( سەباح )ی کوڕی ( رەماح )ی ( هەمام )م .. خەڵکی وڵاتی شامم ! کچە ئامۆزایەکم هەیە ناوی (نەجمە)یە . کاتی خۆی مامەم پەیمانی بە باوکم داوە کە لێم مارە بکات . دواتر باوکم مرد .. مامم منی بە خێو کرد . کە هەردووکمان گەورە بووین . لەیەکتریی دوور خستینەوە ! چونکە من هەژار بووم . سەرۆك هۆزەکانم کۆکردەوە و ناردم بۆ خوازبێنی بۆ لای مامم .... ئەویش ، بەلایەوە ناشیرین بوو.. دەست بنێ بە روویانەوە..! بۆیە رازی بوو.. بەڵام ئا بەم (مارەیی)یە : (٥٠) سەر ئەسپ (٥٠) وشتر بە (٥٠) باری گەنمەوە و (٥٠) باریش جۆ و (١٠) کۆیلە و (١٠) کەنیزەك .

بە جۆرێك باری شانی قورس کردم کە بۆم بار نەکرێت . بۆیە لە شار دەرچووم . تاکو بکەومە شوێن کاروانی یەکی بازرگانی و هەڵکوتمە سەریان ، هەموویان بکوژم و بارەکان بۆ مامەم بنێرم..!! ئەی .. باشە بەسەرهاتی تۆ چی یە !؟ نەگبەت !؟

(کان ماکان )یش وتی :

بەسەرهاتی منیش وەکو بەسەرهاتی تۆیە ! بەڵام کێشەکەی من زۆر ترسناك ترە.. لە کێشەکەی تۆ...! چونکە ئامۆزاکەی من کچە پاشایە .. نایدەن بە کەسێك ئەگەر شا و شازادە نەبێت .

سەباح وتی :

دیارە دەی بزرکێنیت !! ئەگەرنا ، شێوەی شازادەیی بە رووخسارتەوە دیار نییە و چڵێتیت !

(کان ماکان)یش وتی :

پیاوی باشی عەرەب .. ئەوەی چوو.. چوو.. ناوم (کان ماکان)ە و کوڕی ( ضوءالمکان )م .

ئەویش کوڕی شا (عومەری کوڕی نعمان )ە . خاوەنی (بەغداد) و زەوی (خۆراسان)ە . زەمانە شەقی تێ هەڵداین . ئەوە بوو: باوکم مرد و شا(ساسان) چووە شوێنی . منیش ئەم هێشت کەس بم بینێ و لە شار هاتمە دەرەوە .

ئەوە (٢٠) ڕۆژە بەڕێوەم . لە تۆ زیاترکەسی دیم نەدیوە . لەبەر ئەوە بەسەرهاتمان وەکو یەکە .

( سەباح ) هاواری کرد :

خۆشی لە خۆم ... کە ئاوا کوڕە شایەکم دەست کەوت ..! لە جلوبەرگی خوێڕیەکاندا. پێشم بکەوە دیارە پارەیەکی چاکت بە ناوچاوانەوەیە .. ئێستا بەرەو وڵاتی خۆتت دەکەمەوە و سەرانەیەکی باش لە مامەت لە تۆڵەی تۆدا: وەردەگرم !

( کان ماکان )یش وتی :

کاری وا مەکە چونکە بە پوولێکی قەڵب منیان ناوێت . چونکە من کەسێکی هەژارم . کەم و زۆر هیچم نییە . وەرە با لە عێراق دەربچین .. دەستی یەك بگرین و بڕۆین .

سەباح کە ئەمەی بیست توند بوو تێی خوڕی :

سەگە پیس.. ئەوە چەلەحانێم لەگەڵ دەکەی؟ پشتم تێ بکە دەی! با.. نەکەومە لێدانت.

کان ماکان وتی :

چۆن پشتت تێ بکەم بێ ویژدان !؟ خووخدەی عەرەب بەم شێوەیە نییە ! خۆ .. منت لە گۆڕەپانی جەنگدا تاقی نەکردۆتەوە ، کە ئاخۆ .. ئازام یان ترسنۆك !؟

سەباح بزەیەك هاتە سەر لێوانی و وتی :

چەند سەیرە. تۆی منداڵ! قسەکانت قەبەن! ئەمە قسەی پاڵەوانانە.چیت لەویژدان داوە؟

کان ماکان وتی :

ئەگەر دەتەوێت بمکەیتە کۆیلەی خۆت . فەرموو جلوبەرگت سووك بکە و شمشێر فڕێدە و وەرە مەیدانم .

هەر کەسێکمان زاڵ بووین ، دۆڕاو دەکەینە کۆیلە !!

سەباح بە پێکەنینەوە وتی : وا دیارە ملت لە شمشێر دەسوویت !

شمشێرەکەی فڕێدا و قەڵەمبازێکی دا و دای بە لای کان ماکان دا. چەند پەلامارێکی یەکتریان دا.

دەشتەکی زانیی کە کان ماکان بە توانایە . پێیەکانی زۆر توند کردلە زەوی ، زانی سەرکەوتوو نابێت .

لە دڵی خۆیدا وتی :

خۆزگە ، بۆی دانەبەزیمایە! بم وتایە .. شەڕە شمشێرت لەگەڵ دەکەم .. لەو کاتەدا کان ماکان هەردوو مەچەکی گرت و رایوەشاند .

دەشتەکی هاواری کرد : دەستم بەر بدە .
ئەویش گوێی بە قسەکانی نەداو بڵندی کردەوە ، ویستی فڕێی بداتە رووبارەکەوە .
سەباح هاواری کرد : ئەوە نیازی چیت هەیە؟
ئەویش وتی :
دەمـەوێت فڕێـت بدەمـە رووبارەکـەوە ، تـا بتباتـەوە بـۆ رووبـاری دیجلـە، تـا دیجلەش بتباتەوە بۆ رووباری "عیسا"ئەویش بتخاتە رووباری فوراتەوە . لەوێیشەوە بۆ وڵاتی خۆت تاکو خێڵەکەت : ویژدان و هاوڕێ یەتیەکەت ببینێ .
سەباح هاواری کرد :
ئەی پاڵەوان ... تۆ دووری لەتاوان ..! بم بەخشە بە باو و باپیرانت .
کان ماکان لەسەر سنگی لاچوو. ئازادی کرد ، سەباح سەیرێکی شمشێر و قەلغانەکەی خۆی کرد .
کان ماکان رووی تێکرد :
گەر لەسەر پشتی ئەسپێك بوویتایە .. ئەسپەت غار دایە..بەو شمشێرەت پەلاماری منت بدایە دەتوانی منت بکوشتایە ! ئێستاش نەچووە بچێ .. ئاواتەکەت دەکەم جێبەجێ . بێنە قەڵغانەکەم بـەرێ . تـۆش شمـشێرەکەت دەسـت بـەرێ . دەکەوینـە شـەڕو بێنەوبـەرێ ! یـان دەمکوژی یان دەتکوژم ..!
سەباح قەڵغانەکەی هەڵدایە بەردەمی کەوتە پەلاماری کان ماکان . ئەویش قەڵغانەکەی بە دەستە راستەوە گـرت و کەوتـە بـەرگری کـردن لـە خـۆی . سـەباحیش کەوتـە وشـاندنی شمشێر، تاکو دەستی ماندووبوو. کە کان ماکان بە ماندووبوونەکەی زانـی : پەلاماریـداو بـە زەویدا دا ..! شمشێرەکەی لێ سەند و هەردوو قاچی راکێشاو بەرەو رووبارەکە .
سەباح هاواری کرد:
ئەی پاڵەوانی بە توانا ..شێر لە مەیدانا... دەتەوێت چیم لێ بکەیت !؟
کان ماکان وتی :
ئەی کاتی خۆی نەمووت.. بەو رووبارەدا، دەتنێرمەوە بۆ ماڵی باوکت ، تا..هێندە خەمی تۆ نەخۆن !؟
سەباح دەستی کردە گریان و وتی :
ئەی پاڵەوانی مەچەك قەویلە ... مەمکوژە و لای خۆت بمکە بە کۆیلە .
بەم شیعرانەوە.. کەوتە پاڕانەوە :

| | |
|---|---|
| بێکەس و بێدەر، وای ئاوارە خـــۆم | مردووی بێنازی ئەم هەوارە خۆم |
| جۆرێ دەم نێژن ، کەس پێم نەزانێ | شەهیدی دەستی ئا ئەو یارە خۆم |

کان ماکان لێی پرسی :

پەیمانم دەدەیتێ ببیتە هاوڕێم و لەگەڵما بیت ، هەرچۆن بگەڕێم ؟ قسەم ناشکێنی و دەست بێنیتە ڕێم؟

سەباح خێرا وتی : بەڵێ .. پەیمان دەدەم .

کە هەستایەوە سەر پێ ، ویستی دەستی ماچ بکات . ئەم نەیهێشت و نانە بەرەکەی کردەوەو (٣) کولێرەی جۆی پێ بوو. لەبەردەم کان ماکاندا داینا. لەسەر لێواری ڕووبارەکە دانیشتن و نانیان پێکەوە خوارد . دەستنوێژیان هەڵگرت و نوێژەکانیان کرد . کەوتنە گێڕانەوەی بەسەرهاتیان بۆ یەکتری .

کان ماکان لێی پرسی : تۆ دەتەوێ بۆ کوێ بچیت !؟

سەباح وتی :

دەمەوێت بێ سەر ئێشە بچمەوە بۆ بەغدا .

کان ماکان ڕێگای بەرەو بەغدای پیشان دا و خواحافیزی لێ کرد .

ئەو ڕۆیشت و ئەمیش لەدڵی خۆیدا وتی :

بەڵام من نابێت ، مایە پووچ بگەڕێمەوە ! بەڵکو خوا دەرووپەکم لێ دەکاتەوە .

یەك ڕکات نوێژی شوکری کرد و لە کڕنووشدا نزای خوای کرد :

ئەی ئەو خوایەی باران دەبارێنیت لەسەربەردی ڕەق : ڕۆزیی بۆ کرم دێنیت ! خوایە ڕۆزیی منیش بدە .

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

## شەوی ١٤٠

### بەسەرهاتی کان ماکان و غەسانی سوارچاک

شەهرەزاد وتی :

*ئەی پاشای بەختیار .. خاوەنی بڕیار ..*

لە کاتێکدا کان ماکان سەیری ئەم لاولای خۆی دەکرد. سوارێکی لەدوورەوە بینی، کە بە گران خۆی بەسەر ئەسپەکەیەوە بۆ ڕادەگیرا ..! ئەمیش هەستایە سەر پێ و چاوەڕوانی بوو . درەنگانێ گەیشتە لای ئەم . هەر وەکو برینداریکی سەخت وابوو: چاوەڕێی گیان دەرچوون بکات .

کە گەیشت بە (کان ماکان)ی وت :

پیاوی چاك بە .. بمکە هاوڕێی خۆت و قومێ ئاوم بدەرێ . هەر چەندە دەزانم : ئاو خواردنەوەی خوێن لەبەر ڕۆیشتوو: زۆر خراپە . ئەگەر زیندوو بوومەوە پاداشتی ئەم چاکەیەت دەدەمەوە و گەر مردیشم ئەوا تۆ چاکەی خۆت کردووە .

ئەسپێکی لە ژێردا بوو، زمان لاڵ بوو لە ئاستی وەسف کردنیدا ..! چوارپەلی دەتوت :

مەرمەرە و لە زەوی چەقیوە !
کان ماکان ئەسپەکەی سەرنج دا ، لە دڵی خۆیدا وتی :
ئەمە ئەسپێك نییە ... بە ئاسانی دەست بکەوێت .
قومێ ئاوی دایەو چاوەڕێی کرد.. بحەوێتەوە .
دواتری لێی پرسی : کێ ئەمەی بە سەر هێنایت !؟
ئەویش وتی :
ڕاستیەکەیت پێ دەڵێم ! من دزی ئەسپی ڕەسەنم ، شەوانە دەچمە دزی . من غەسانم .. دزی ئەسپانم . ناوبانگی ئەم ئەسپەم ، بیستبوو . ئەمە ئەسپی شا ئەفرەیدونە ، پاشای وڵاتی ڕۆم .
ئەو پاشایە ئەم ئەسپەی ناو نابوو قەیتوولە : شێت . بۆ ئەم ئەسپە سەفەرم کرد بۆ قوستەنتەنیە! کەوتمە چاودێری کردنی ڕووانیم پیرەژنێك دەرکەوت : ناوی شەواهی : ( فێڵاوی) بوو . خەڵکی زۆریان ڕێز لێ دەنا.. دەستی دەڕۆیشت . بەسەر ئاسنینە و فێڵاوی ناوبانگی هەبوو. (١٠) کۆیلە چاودێریی ئەم ئەسپەیان دەکرد و هەمیشە لە دەور و بەری بوون .
پیرەژنە فێڵاوی .. بەرەو بەغدا و خۆراسان بەڕێکەوت . بۆ ئەوەی بچێتە لای ساسان شا.. بۆ ئاشت بوونەوە . منیش بە ئومێدی دزینی ، ئەسپەکە شوێنیان کەوتم . بەڵام کۆیلەکان هێندە بە ئاگا بوون لەو ئەسپە کە من نەمدەتوانی بیدزم . تا گەیشتنە ئەو وڵاتە . منیش خەمی ئەوەم لێهات کە بچنە بەغداوە و ئەو ئەسپەم لە دەست دەر بچێت . بۆیە لە پیلان کێشاندا بووم بۆ دزینی ئەسپەکە ..
کە تەپوتۆزێکی فرەم بینی بڵند بووەوە . سواران نزیك بوونەوە ڕوانیم (٥٠) شۆڕە سوارن . لەو ڕێگرانەن کە کاروانەکان ڕووت دەکەنەوە . سەرکردەکەیەکیان هەیە ، پاڵەوانە.. پاڵەوان ! بازۆڵە ئەستوور ناوشان پان ! ناوی ( کەهرداش )ە . دەڵێی شێرە یان هەڵۆ و باز و واشە . هەڵی کوتایە سەریان . هێندەی نەبرد (١٠)کۆیلەکەی قۆڵبەست کرد و پیرەژنەی دایە پێش و ئەسپەکەی لێ سەندن .
منیش لە دڵی خۆمدا وتم :
منیش ، مایە پووچ بووم .. وا بە خاوەنی هیچ نەبووم . بۆیە ئارامانە سەیری ڕووداوەکەم دەکرد .
گوێم لێبوو ... پیرەژن دەستی بە گریان کرد و وتی :
ئەی پاڵەوان .. شێری بێشەڵان بە نیازیت چی لەم پیرەژنە و (١٠) کۆیلەیە بکەیت! خۆ ئەوەتا.. دەستت بە سەر ئەسپەکەدا گرت !؟
ئیدی پیرەژنە فێڵاوی هێندە زمانی شیرین بوو لەگەڵ (کەهرداش) . تا ڕازی کرد پیرەژن

و كۆیلەكانی ئازاد كرد و ئەسپەكەی دایە پێش . ئەوا... منیش هەر بە دوای ئەسپەكەوەم .
دواتر هەڵم قۆستەوە و سواری ئەسپەكە بووم و هەڵاتم . ئەوانیش كەوتنە دووم . چەندین
جار نزیكم بوونەوە و تیربارانیان كردم .. هەر چەندە ئاوا بە سەختی پێكرام و برینـدار
بووم .. بەڵام خۆم بەسەر ئەسپەكەوە گرت و لەدەستیان رزگار بووم . ئەوە (٣) رۆژە ، نە
نان و نە ئاوم خواردووە ... هەر غار دەكەم .
تا .. ئەوە بوو یارمەتیت دام و تینوێتیی منت شكاند . بەڵام تۆ دەبینم رووت و رەجاڵیت؟
تۆ كێیت ؟ خەڵكی كوێیت؟ بەرەو كوێ دەڕۆیت ؟ لەوە دەچێت ، خانەدان بیت و لێت قەوما
بێت !!
ئەمیش وەڵامی دایەوە :
كان ماكان كوڕی شاچووالمكان ، كوڕی شا عومەری كوڕی نعمانم . باوكم مرد و هەتیو
كەوتم پیاو خراپێك بووە پاشا و جێی باوكمی گرتەوە .
دزەكە دڵی بۆی نەرم بوو ، وتی : تۆ لە بنەماڵەیەكی مەزنی ، خانەدان و نگین داری ..
لە پیاوە ناودارەكانی سەردەمی خۆتیت . وەرە پیاوی چاك بە لە پاشكۆمەوە ، سوار بەو
بمگەیەنەوە ، وڵاتی خۆم تاكو ماوم سوپاس گوزاردەبم . گەر مردیشم ئەوا خوا لەو دنیا
پاداشتت دەداتەوەو ئەم ئەسپەش بۆ تۆ بێت لە كەسێكی دیكە باشترە .
( كان ماكان )یش وتی :
تاكو بتوانم یارمەتیت دەدەم . تەنانەت ئەگەر تۆم بە كۆڵی خۆم هەڵگرتووە دریغیت
لێ ناكەم . خۆم بە پیاوێكی خێرومەند دەزانم و چاویشم نەبڕیوەتە ئەسپەكەت .
ئەگەر تەمەنیشم بخەمە پێناوت بە زۆری نازانم . دەی پشت بە خوا با.. بڕۆین .
ویستی بیخاتەوە سەرپشتی ئەسپەكەی .
شۆڕەسوار پێی وت : پەلەم لێ مەكە .
هەردوو دەستی كردەوە و چاوانی نوقاند و شایەتمانی هێنا و وتی :
خوای مەزن .. لێم خۆش ببە . هەر گەورە، لەگوناهە گەورەكان خۆش دەبێت .
ئەم هۆنراوەیەی وت :

وڵاتان گەڕام ، زوڵم و زۆرم كرد — لە بەدمەستیدا ژینم بەسەر برد
لە ئەستێرم دا بۆ ئەسپ دزین — چەند كەلاوەم دی ماڵ بوون داتەپین
دەردم گرانە و تاوانم گەورە — بەی دەستی كردووم زە مانە و دەورە
ئەم ئەسپە بۆ من بە خەمێ بووە — بە ئاوات مەرگی خۆمم خواستووە
بە ئەسپ دزین : ژینم بردە سەر — بۆ ئەویش مردم : ئاوایە ، قەدە ر
ئێستاش بەرهەمم هەژارێ بردی — ئای كە كێ بردی ؟عەجەب كێ كردی ؟

چاوانی لێك نا.. هەناسەیەكی قووڵی هەڵكێشا ومرد .

(کان ماکان) هەستا و گۆڕێکی بۆهەڵکەند و ناشتی . بە ئەسپەکەیش دڵی خۆش بوو!
بەخۆی وت :
کەس نی یە ، ئەسپی رەسەنی وای هەبێ .. تەنانەت (ساسان) شایش !
شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەرەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.

## شەوی ١٤١

سەر بووردەی جەنگی کان ماکان و ڕۆمەکان
شەهرەزاد وتی :
لەولایشەوە (ساسان) شا بیستییەوە کە ( دندان )ی گەورە وەزیر، لە ژێر رکێفی دەسەڵاتی ( ڕۆم ) دەرچووە و نیوەی سوپای وڵاتیشی لەگەڵدایە . سوێندیشیان خواردووە ..(کان ماکان) نەبێت : مل بە هیچ پاشایەکی دی نادەن !! سوپاکەیش پەیمانی بە (دندان) داوە بەرەو دوورگەکانی (هند) و(بەبەر) و وڵاتی (سۆدان) هاتوون . لەگەڵ سوپای وڵاتی دەریای ( زاخر)یش کۆبوونەتەوە .کە سوپایەکی زۆرمەزن بووا! ئەم وەزیرە : دەیەوێت ( بەغداد) بگرێت و هەر لایەك سەرپێچی بکات لە ناوی بەرێت .
سوێندیشی خواردووە شمشێر ناکاتەوە بە نێو کالان . تا( کان ماکان ) نەچێتەوە سەرتەختی پاشایەتی !
شا (ساسان) کە ئەمەی بیست نقوومی دەریای بیرکردنەوە بوو. پەژارە دایگرت . ناچارکەوتە بەخشینەوەی پارەی وڵات بەسەر( سەرکردە) و گەورە بەرپرسانی خۆیدا...
ئاواتیشی دەخواست (کان ماکان ) لەلای بوایە . تاکو بە سامانی زۆر و زمانی شیرین لە خۆی نزیك بکردایەتەوە .
( کان ماکان )یش کە ئەم هەواڵەی لە بازرگانان بیست . هەر بە غار بەو ئەسپە رەسەنە نایابەوە ، چووەوە شاری بەغداد . کە ساسان شا گەڕانەوەی (کان ماکان)ی بیست بە پەلە، پیاوماقوڵانی ئامادەی پێشوازیی ئەو کرد . هاوڵاتیانیش بە خێریان هێنا و خزمەتکاران و کۆیلە خەساوەکان هەواڵی گەڕانەوەی (کان ماکان)یان بە دایکی گەیاند . ئەویش بەرەو رووی کوڕەکەی چوو. هەر کە گەیشتە جێ .. نێوچاوانی ماچ کرد .
ئەویش پێی وت :
دایە گیان رێم بدە .. با بچمە خزمەتی ( مام )ەم . چونکە پیاوەتی زۆری لەگەڵ کردووم . خەڵکەکەیش سەراسیمە بوون بە بینینی ئەو ئەسپە رەسەنە و مقۆ مقۆی ئەومیان بوو کە کەس نییە .. ئەسپی وا چاکی هەبێت !
کان ماکان چووە کۆشکی شا (ساسان) ، ئەویش لەبەری هەستا . دەست و پێی ماچ کرد .
شایش سەری ماچ کرد و وتی :

باخوا بەخێر بێیت ، کوڕی خۆم ..! بڕوا بکە ئەو ماوەیەی لێرە نەبوویت : جێم بە خۆم نەدەگرت !
سوپاس بۆ خوا کە سەلامەتیت .
کە ئەسپە ( قەیتوول )ی بینی ، ناسیەوەو بیری کەوتەوە ، کە لە ساڵانی گەمارۆدانی ڕۆمداو هەر ئەو ساڵەی کە مامە (شرکان)ی تیا کوژرا تاکو پارساڵیش لە ژێر باوکیدا بووە !.
بۆیە وتی :
گەر باوکت لێرە بوایە (١٠٠٠) ئەسپی لە پارسەنگی ئەم ئەسپەدا دەدا . بە سوپاسەوە وا ئەم دیاری یەم لێ وەرگرتی و بەخشیمەوە بە خۆت . چونکە شایستەی تۆی شۆڕە سوارە ! تۆیەك کە لە وێنەت کەمە !!
فەرمانیشیدا... ئەسپەکەی بۆ تاقەت بکەن . یەکێ لە کۆشکە گەورەکانی بە دیاری بدەنێ . پارە و سامانێکی زۆری پێ بەخشی و ڕێزێکی فرەی گرت . چونکە زۆر لە هەڵگەڕانەوەکەی (دندان)ی گەورە وەزیر دەترسا . ( کان ماکان ) چووە کۆشك و دایکیشی هێنایە لای خۆی و ڕێزی گرت .
دایکیشی سوپاسی خوای کرد . دواتر باسی ( پیرەژن )ە فێڵاوی بۆ کرد ، کە چۆن مام و باپیرەی کوشتووە !
( کان ماکان )یش وتی :
کەواتە پێویستە ، تۆڵەی خوێنیان لێ بسەندمەوە ..
بەڵام : قچی فکان زۆری پێخۆش بوو بە گەڕانەوەی کان ماکان و کەوتە سکاڵا لە باوکی کە کاتی خۆی لە ئامۆزاکەی خۆی مارە نەبڕیوە .
کەنیزەکەکان کە گوێیان لەم سکاڵایە بوو. یەکێکیان چووە لای ( ساسان ) شا و ئەم سکاڵایەی کچەکەی بۆ گێڕایەوە . ئەویش تووڕە بوو شمشێری لێ هەڵکێشا و ویستی کچەکەی بکوژێت .
نزهەالزمان دایکی بە سەریدا هات و بە شا( ساسانی) وت :
بۆ خاتری خوا .. کاری وانەکەیت . چونکە دواتر ئەم هەواڵە لە نێو هاوڵاتیاندا بڵاو دەبێتەوە و ئابڕوومان دەتکێ . ئەوەش بزانە (کان ماکان)یش کوڕە پاشا بووە . لەگەڵ ئەم کچەدا پەروەردە بووە .
کارێك نەکەیت ئابڕوومان بتکێ . (دندان)ی وەزیر و لایەنگرانی، داوا دەکەن (کان ماکان) ببێتە پاشایان .
ئەویش وتی :
دەبێت ( کان ماکان ) تووشی بەڵایەك بکەم نە لەسەر زەویدا جێی بێتەوە و نە ئاسمان سێبەری بخاتە سەر . کە ئاوا.. ئێستاکە.. ڕێزی دەگرم لەبەر هاوڵاتیان و مەملەکەتەکەیە،

بۆ ئەوەی هاولاتیان نەبنە هەواداری کان ماکان، لەمەودوا دەی بینی .

لەولایشەوە کان ماکان رۆژی دووەمیش چووە لای دایکی پێی وت :

دایە گیان.. بە نیازم روو بکەمە رێگرتن و بازاڕی ئەسپ وکاسبی کڕین و فرۆشتنی کەنیزەك و کۆیلە . بۆ ئەوەی دەوڵەمەند ببم . ئەوسا.. داوای کچە ئامۆزام لە (مامە ساسان)م دەکەم .

دایکیشی پێی وت :

کوڕەکەم ماڵی کەس بە کەس حەڵاڵ نی یە .. ئاگات لە خۆت بێت .

کان ماکانیش وتی :

هەرگیز لە قسەی خۆم پاشگەز نابمەوە و مەگەر بە مردن .

خواحافیزیی لە دایکی کرد و دەم و چاوی هەڵ پێچا و سواری ( قەیتوول ) بوو . کەوتە غار بەرەو دەرەوەی شار . لەوێ (سەباحی کوڕی رەماح)ی هاوڕێی بینی . چووە نزیکی و سلاوی لێ کرد .

( سەباح ) پێی وت :

براکەم ئەم ئەسپ وجلوبەرگ و شمشێرەت لە کوێ بوو؟ خۆ من..ئەوەتەی هەم هەر ئەم شمشێر و قەڵغانەم هەیە !؟

( کان ماکان ) وتی :

راوچی بە هێندەی نییەتی خۆی نێچیر دێنێتەوە . دوای ئەوەی لە تۆ دابڕام . بە سەعاتێك بەختیاریی رووی تێکردم ، ئێستاش نییەتت ساف بکە و لەگەڵم وەرە و با .. ئەو بیابانە ببڕین .

ئەویش وتی : بەو خوایە تا من بمێنم ، هەر بە ئاغام بانگت دەکەم .

ئەسپەکەی بە دوای خۆیدا بە کێش کردو کالانی شمشێرەکەی بەپشتەوەو شمشێرەکەی بەسەر شانەوە . (کان ماکان )یش بە دوایدا.

چوار رۆژ بەڕێوە بوون . کە خواردنیان راو کردنی ئاسك و برژاندنی گۆشت بوو. خواردنەوەشیان لە کانیاوەکان بوو. رۆژی پێنجەم بە گردێکدا سەرکەوتن کە لە دۆڵەکەی بەردەمیدا تاڤگە و رووبار، مێرگ و وشتر و مانگا و مەڕ و ئەسپێکی زۆری لێ بوو.

( کان ماکان )ی دڵخۆش کردو بە ( سەباح )ی هاوڕێی وت :

دەی ، با دابەزینە ئەو دۆڵە ، بیبەین ئەو ئاژەڵە مۆڵە .. با پەلامار بدەین و بیکەین بە قریوە.. کە سەرکەوتوویش بووین .. بەشی بکەین : نیوە بە نیوە .

سەباح وەڵامی دایەوە :

ئاغام ..لەم دۆڵەدا خەڵکێکی زۆری لێ یە ، هەموو پاڵەوان و جەنگاوەرن .گەر پەلاماربدەین هەڵمان دەبڕن ... دەرباز نابین و سەرمان دەبڕن .

کان ماکان دایە قاقای پێکەنین و بۆی دەرکەوت ، سەباح زۆر ترسنۆکە . ئەوی جێ هێشت و بە گردەکەدا شۆڕ بووەوە. بەنیازی پەلامار دان.. کەوتە هاوار کردن و شیعر وتن :

نەوەی نعمان و کوڕی تەنگانەین دایم ئامادەی ئا ئەم جەنگانەین
هۆزێکین هەڵچووین کپ نابینەوە دوژمنی سەختی ئەو زۆردارانەین
دیدەی هەژارمان هێند نابینایە مردن نەبینە .. هێندە شێرانەین
پشتمان بە خوایە و نزای ئەو دەکەین بە ورەی خۆمان پشت بە و یەزدانەین

کەوتە ریز بەند کردنی وشترەکان و ئاژەڵانی دی و دایە پێش خۆی . کۆیلەکان بە شمشێر و رمی درێژ و تیر و کەوان ، نێزە و قەڵغان بۆی هاتن . بەڵام چونکە ئەم سوارچاک بوو، هەموویانی بەزان .

جەنگاوەرێکی تورکی لێی پەیدا بوو و بانگی کردە کان ماکان :

نەگبەت ، چۆن دەتوانیت ئەم ئاژەڵانە بدەیتە پێش!؟ ئەمانە هی پەنجا پاڵەوانە..کە هەمیشە یاخین لەو پاشایانە .. رێگریی تایبەت کاری ئەوانە .. نیشان شکێنن .. تیرانداز و شمشێر وەشێنن .. ئێستاش کە لێرە نین .. ئەوە سوێندیان خواردووە کە تاکو .. ئەسپەکەیان کە لێیان فرێنراوە؛ وە دەست نەهێنەوە ئێرە بەجێ نەهێڵن ! ئەگەر ئەو ئەسپە بگەیەنرێتە ئەو پەڕی دنیا دەی هێننەوە .

کان ماکان کە ئەمەی بیست هاواری کرد :

ئەی ترسنۆکینە ئەو ئەسپەی بۆی دەگەڕێن ئەم قەیتوولەیە کە لەژێرمایە . فەرموون لێم بسەندن !

چرپاندی بە گوێی قەیتوولدا و کەوتە شمشێر وەشاندن . یەکەمجار پەلاماری جەنگاوەرەکەی دا و کوشتی . دووەم کەس و سێیەم جەنگاوەری بۆ چوو شمشێری دا بە قەبرغەیدا و گورچیلەی خستە سەر زەوی .

کە ئەوانی تر ئەو پاڵەوانبازیەیان بینی زۆر ترسان .. ئەمجا شوێنیان کەوت و شیراندی بە سەریانا :

ترسنۆکانە ، ئەو ئاژەڵانەم بۆ کۆ بکەنەوەو بیدەن پێش با بیان بەم . ئەگەرنا بە خوێنی رژاوتان شمشێرەکەم زاخاو دەدەم .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بووە .. بێدەنگ بوو

## شەوی ١٤٢

چیرۆکی شەڕی ( کان ماکان ) و ( کەهرداش )

شەهرەزاد وتی :

ئەی پاشای سەروەر ... گەورەو بەختەوەر ...

تەپ و تۆز بەری ئاسمانی گرت . هێندەیان زانی (١٠٠) شۆڕە سوار پەیدا بوون .کە سەباح ئەمانەی بینی : بە پەلە خۆی دزی یەوە و بەرەو لوتکەی گردەکە هەڵکشا. دۆڵ لە هاوڕێی (کان ماکان) بوو چۆڵ . هێندەی زانی چوارلایان لێ گرت .. لێی کۆ بوونەوە درشت و ورد .

سوارێکیان هاواری کرد :

ئەوە ئەم ئاژەڵانە بەخێر.. بۆ کوێ دەبەیت ؟

ئەویش هاواری کرد :

*ئەوە لە چنگی ئێوەی دەردێنم ..! ئەمەی بەرامبەرت شێرە .. فەرموو پێم بوێرە ..!*

سوارچاکەکە وردتر سەرنجیدا بە پاڵەوان هاتە پێش چاوی . بەڵام جوان رووی وەك مانگی چواردە .

ئازایەتی لە چاوانیدا دەبریسکێتەوە . ئەم سوارچاکەش کە دەبوو بچێتە بەرامبەری پێشەنگ و سەرکردەیان بوو . ناوی کەهرداش بوو .

هاواری کرد :

*بەزەییم بە منداڵیەکەتدا دێتەوە . بۆیە بێدەنگ ئاژەڵەکان بەجێ بهێڵە و بە سەلامەت برۆ... ئەگەرنا.. یەك شاتاوڵت بۆ دێنم ... بە یەك شمشێر ناوچاوانت لە خۆڵەکە دەچەقێنم .*

( کان ماکان ) هێندەی دی رقی هەستا و هاواری کرد :

*قورت بە سەر سەگە خوێڕی .. بیوەشێنە شمشێری .. هێندەت زانی کەللەت پەڕی .*

کەوتە هێرش وکشانەوە . کە کەهرداش بینیی لەو سوارە .. ئەو هەڵپە و پەلامارە .. زانی ئەمە ئازا و شێر و پڵنگە . خۆی بۆ ناگیرێ لە بەرامبەر زەبری ئەو مەچەك وچنگە .

بە هاوڕێکانی وت :

یەکێك بچێتە پێشەوە بە شمشێری تیژەوە .. چونکە رەوا نی یە بەکۆمەڵ بچن بۆیەك جەنگاوەر..!

پاڵەوانێکی بە توانا و دەرکەوتوو.. بە سواری ئەسپێکی چوارپەل بازوو لێی چووە پێش زوو بە زوو! سوارێك بوو لە شێوەی زۆرکەم بینرا بوو.. دیار بوو ئەم شیعرە بۆئەو وترا بوو :

ئەسپێك ،کە جەنگی زۆری بینی بوو    پاشووی مێخ ئاسا، لەخاك چەقی بوو

وەك شنەی بەیان لە یاڵی دا بێ    مەستی سمکۆڵی ، سەر زەمینی بوو

شەڕی نێوان (کان ماکان ) و ( پاڵەوان )ەکە دەستی پێکرد . بە گوژم یەکتریان هێنا برد.. تا لە پڕێکدا کان ماکان بە شمشێر .. پاڵەوانی لەت کرد . پاڵەوانی دووەم ، سێ یەم .. چوارەمیشی بە مەرەدی ئەوانی دی برد . جەنگاوەرانی دەور وبەر.. ترسی (کان ماکان)یان کەوتە سەر . هەموویان پەلاماریان دا یەکسەر . شۆڕە سواریش قین لەدڵا.. خوێنی وەکو قاوە دەکوڵا.. بۆیە ، خێرا .. خێرا . لە پڕێکا . دوو دوو، سێ سێی دەپێکا . هیچ وازی لێ

پشتی یەوە دەرچوو .
بانگی کردە کۆیلەکان کە رانە مەڕ و بزن و ئاژەڵان . بدەنە پێش خۆیان . ( سەباح )ی هاوڕێی.. کە تا ئەو کاتە بە سەرگردەکەوە خۆی شارد بووەوە و سەرنجی ئەو شەڕەی دەدا ..
بە غار هاتەخوار و بە (کان ماکان)ی وت :
دەستت خۆش ئەی پاڵەوانی زەمانە.. ئەو شمشێر و تیر و کەوانە.. بە راستی هەر لە خۆت جوانە.
چووە سەر لاشەی (کەهرداش) و سەری لە لەشی جیا کردەوە .. ( کان ماکان ) پێکەنی .
( سەباح)یش کە کەللە سەرەکە بە سەرە نێزەکەیەوە بوو و وتی :
دەزانم .. لەم هەموو سامانە بێ بەشم ناکەیت !
( کان ماکان )یش وتی :
وام دەزانی پاڵەوانی جەنگی نێو گۆڕەپانی!! دەی شتێکت هەر دەدەمێ . لێخوڕە و پێش خۆتیان بدە.
چەندین شەو و رۆژ بەڕێوە بوون ، تاکو گەیشتنەوە شاری بەغداد . دانیشتوانی شار، بازرگانان و کاروانچیان، کە ئەو کەللە سەرەیان بینی بەو نێزە درێژەوە ناسیانەوە کە ئەوە کەللەی گەورە رێگرانە! زۆر دڵخۆش بوون . کە رێگا و بانی کاروانچیان لەو دزە پاك بووەتەوە ..
پرسیان : کە چۆن کوشتویانە؟
(کان ماکان) لە نووکەوە ... تا کۆتایی بۆی گێڕانەوە .
خەڵکەکەیش کەوتنە دەست خۆشی کردن ، لە ( کان ماکان ) . ئەویش فەرمانیدا.. ئەو هەموو ئەسپ و وشتر و ئاژەڵانە .. ببەخشرێتەوە . بەسەر دانیشتوانی شاری (بەغداد)دا . خۆی و (سەباح) و گەورە پیاوان بەرەو کۆشکی شا بوونەوەو خەڵکێکی فرە شوێنیان کەوتبوون .(سەباح)یش کەللە و نێزەکەی لەبەردەم کۆشکەکەدا بڵند کردبووەوە . بەوجۆرە (کان ماکان) لای دانیشتوانی شاری بەغداد خۆشەویست بوو . دوای حەوانەوە جێ و رێیەکی باشی بۆ سەباح دابین کرد . خۆیشی چووەوە بۆ لای دایکی زۆر بە خۆشی یەوە بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە .
کە هەواڵی گەڕانەوەی کان ماکان گەیشت بە شا(ساسان) . پیاوان و وەزیرانی نزیکی کۆکردەوە و کەوتە قسە کردن بۆیان بەم شێوەیە :
ئەمەوێ هەندێ نهێنی باس بکەم بۆتان .. ئاگادار بن ، کە ئەم (کان ماکان)ە : دەبێتە هۆی لەسەر تەخت لاچوونم . ئەو (کەهرداش)ی کوشتووە کە خاوەنی خێڵە کورد وتورکەکانە . ئێمەش... چاری ئەو خێڵانە ناکەین و تیا دەچین ! چونکە زۆرینەی سوپای ئێمە لەو دوو نەتەوەیەن .

لە هەمان کاتیشدا بە ناگان لەوەی کە (دندان)ی گەورە وەزیر چۆن بەشێکی زۆری لە سوپاکەمانی لێ هەڵگەڕاندووینەتەوە و ناپاکیی لێ کردووین. تەقەڵای ئەوە دەدا.. ( کان ماکان) بکاتە ( پاشا) و لە شوێنم دای بنێ . چونکە ئەم کورسی پاشایەتیە .. هی باوك و باپیرەی خۆی بوو . بۆیە گومانی تیا نییە بەرەنگارم دەبێتەوە .

دەورو بەرەکەشی وتیان :

قوربان ئەو کوڕە پەروەردەی دەستی خۆتە .. لەوە بێدەسەلات ترە کە بتوانێت لەسەر تەختی پاشایەتیت لابەرێت . ئێمەش خۆمان دەکەینە قوربانی تۆ و فەرمان بدە و جێ بەجێی دەکەین . بڵێ بیکوژن .. دەیکوژین ! بڵێ لە وڵاتی دوور بخەنەوە . دووری دەخەینەوە .

شا (ساسان) کە ئەمەی بیست پێی وتن :

باشترین کارێك ئەوەیە بیکوژین .. بۆ ئەمەش دەبێت پەیمانێك لەنێوان خۆماندا ببەستین .

ئەوانیش پەیمانەکەیان پەسەند کرد .

ئەمجا پێی وتن :

دندانی گەورە وەزیر کوژرانی کان ماکان ی بیست . ورە بەردەدا و سەربازانیش سوپاکەی جێ دەهێڵن .

قچی قکان ئەمەی بیست . بەپەلە پیرەژنێکی نارد بۆ لای (کان ماکان)ی ئامۆزای ، تا پیلانەکەی پێ بڵێت .

ئەویش سوپاس و ستایشی بۆ ئامۆزای ناردەوەو وتی :

ئامۆزا .. زەوی موڵکی خوایە .. هەموو کەس بۆی هەیە فەرمانڕەوایی تیا بکات .

پیرەژن گەڕایەوە .. قسەکانی ئەوی بۆ گێڕایەوەو پێیشی وت :

کە ئێستا لەناو بەغدایە . شا ساسان چاوەڕێ بوو، (کان ماکان).. بچێتە راو و شکار تاکو ئەمیش چەند کەسێك بنێرێت لە رێگا بیکوژن .

وا رێکەوت کە (کان ماکان) چووە دەرەوەی (بەغداد) . سەباحی هاوڕێشی کە هەمیشە بە دوایەوە بوو، ئەو رۆژە (١٠) ئاسکی راو کرد بوو. ئاسکێکیان زۆر سەیری ئەملاو ئەولای خۆی دەکرد .

کان ماکان بەزەیی پیاهاتەوە و ئازادی کرد .

( سەباح ) لێی پرسی :

باشە ... ئەوە بۆچی ئەو ئاسکەت بەرەڵا کرد ؟!

ئەویش وتی :

راوچی دەبێت ویژدانی هەبێت . هەر کە زانیی نێچیرەکەی منداڵی وردی هەیە ..

پێویسته ئازادی بکات ! لەبەر خاتری ئەو یەکێکی تریش بەر دەدەم ..!
سەباحیش وتی :
کەوابوو .. منیش ئازاد بکە و با بڕۆمەوە ناو کەس وکارم .
( کان ماکان )بە پێکەنینەوە مستووی شمشێرەکەی دا بە سەرسنگیدا. ئەویش لنگە وقووچ کەوت .

وەکو مار گینگڵەی خوارد . کاتێک ئەمان سوعبەتیان دەکرد و پێدەکەنین . لە دوورەوە تەپ و تۆز پەیدابوو . چەند شۆڕسوارێکی جەنگاوەریان بینی لە ناو تۆز و خۆڵەکەدا.
توومەز : کە شا ساسان زانی بووی کان ماکان چووەتە راو وشکار. (٢٠) جەنگاوەری خستبووە سەرکردەی ( دەیلەم ) و ناردبووی بۆکوشتنی . کە نزیک بوونەوە کەوتنە پەلاماردانی . ئەویش مەردانە : لێیان هاتە دەست و هەموویانی کوشت .
شا(ساسان) خۆشی شوێنیان کەوتبوو . دوور و نزیك ، سەرنجی دەدا .کە گەیشتە سەریان و بینیی هەموویان کوژراون بە پەلە و بە ترس و لەرزێکی زۆرەوە ، گەڕایەوە .
بەڵام کەس وکاری کوژراوەکان لێی بێدەنگ نەبوون و قۆڵبەستیان کرد . کان ماکان کە شوێنی شەڕەکەی جێهێشت بوو. لەگەڵ سەباحی دەشتەکی دا ..کەوتنە رێگاو گەیشتنە ماڵێك . یەکێکیان بینی بەسەربانەوە بوو .
کان ماکان سڵاوی لێکرد . ئەویش وەڵامی سڵاوەکەی داوەو هاتە خوارەوەو دوو قاپی هێنا و بەرەو روویان چوو . قاپێکیان شیر و ئەویتریان (تریت)ی رۆنی تیا بوو . خستی بە بەردەمی کان ماکان و فەرمووی لێکرد ، کە لەگەڵیدا بخوات و نمەکی ماڵیان بکات .
بەڵام (کان ماکان ) وتی : ناخۆم !
لاوەکەپرسیی : چی یە بۆ ناخۆیت ؟
ئەویش وتی : نەزرم کردووە و نابێت خۆم تامی بکەم !!
لاوەکە پرسی یەوە : جا... چی وای لێکردی نەزر بکەیت؟
ئەمیش وتی :
ئاخر... شا( ساسان ) غەدری لێکردووم وکورسی پاشایەتی باوك و باپیرەی لێ داگیر کردووم ! بۆیە نەزرم کردووە تاکو حەقی خۆم وەرنەگرمەوە : نمەکی کەس نەکەم ..!
لاوەکەش وتی :
مژدە بێت ، شا (ساسان) بەند کراوە ، رەنگە بە ئەم نزیکانەیش بمرێت !
( کان ماکان ) پرسیی : لە کام ماڵ بەند کراوە؟
لاوەکە وتی : لەو قەڵا بڵندە دایە .
سەری بڵند کردو کۆمەڵێك خەڵکی بینی لە کەسێکیان دەدا. ئەویش کەوتە ( تریت ) و ( شیر) خواردن .

هەندێ گۆشتی ناو تریتەکەی خستە کەشکۆڵەکەیەوە و شەو لە ماڵی لاوەی خانەخوێی لێی نووستن .

نیوەشەو، کە ئەوان پرخەی خەویان دەهات . چووە لای قەڵاکە ، روانی چەندین سەگی لێ بوو . هەر سەگێکیان بۆی دەمراند، پارچەیەك گۆشتی فڕێ دەدایە بەردەمی . ئیدی دەیخوارد و بێدەنگ دەبوو. چووە ژوورەوە . رۆیشت تا گەیشتە لای شا(ساسان)ی قۆڵبەست کراو وُ دەستی خستە سەر سەری .

شا هاواری کرد : تۆ کێیت؟

ئەمیش وتی :

( کان ماکان )م .. ئەو کەسەم پیلانت بۆ کوشتنم دانا.. باشە تۆ بە کورسی و پلەی پاشایەتی باوکم تێر نەبوویت ؟ پیلانی کوشتنیشم بۆ دادەڕێژی !؟

شا ( ساسان ) بە درۆ سوێندی دنیای خوارد ، کە ئەو قسەیە راست نی یە ..! کان ماکان لێی خۆش بوو و پێی وت : شوێنم بکەوە .

شا وتی :

ناتوانم یەك هەنگاو بە رێدا بڕۆم .

کان ماکان وتی :

کەوابوو.. دەبێت دوو ئەسپ پەیدا بکەین . سواری ئەسپێکیان دەبم و دەتخەمە پاشکۆم . شای خستە پاشکۆی و ئەسپەکەی دی راکێشا ، تا گەیشتنەوە لای ( سەباح) . نوێژی بەیانیان کردو کەوتنە رێ . دواتر لە رەز و باخێکدا لایاندا و لێی دانیشتن ، تاکو ماندوویەتیان دەربچێت .

کان ماکان وتی :

ئێستاش دڵت لە من پاك نەبووەتەوە و هەر رقت لێمە !؟

( ساسان ) شا وتی : نە بەخوا ...کوڕم .

بە رێکەوتنەوە بەرەو شاری بەغداد ..

سەباحی هاورێی وتی :

من پێش ئێوە ، خۆم دەگەمەوە بە بەغدادا ، تا.. ئەم مژدەیە بە هاوڵاتیان بدەم .

گەیشتەوە شار ، کەوتە مژدەدان . بە ژنان و پیاوان .. هاوڵاتیان بە دەهۆڵ و زوڕنا کردیانە شایی و هەڵپەرکێ و سەما.

باس بوو بە باسی (کان ماکان) . شۆڕەسواران ، جەنگاوەران ، شایەتیان دا..کە (کان ماکان) لە دنیادا بووەتە مەزنترین پاڵەوان و وتیان :

باشترین کار ئەوەیە..کان ماکان ، ببێتە سوڵتان و بخرێتە سەرکورسی پاشایەتی باو و باپیرانی .

شا( ساسان ) چووه لای ( نزهەالزمان ) و پێی وت :

هەموو باسی (کان ماکان) دەکەن و هێندە وەسفی دەکەن .. کە زمان لاڵ دەبێت لە ئاستیدا !

دوای کەمێك هەڵیدایە :

ئەو هاوڵاتیانە وەکو تووتی لاسایی یەکتر دەکەنەوە . ئەگەرنا.. ئەو پیاوە ، ئەوە نی یە! ئاخر.. چۆن هەتیوێکی بێ باوك و دایك دەکەنە پاشای خۆیان ؟ کە ئاوا.. سووك و رسوایە !؟ خۆم لەگەڵیدا بووم.. ئەو پیاوە نی یە کە وەسف بکرێت !

( نزهەالزمان ) پرسیی : ئێستا نیازی چیت هەیە !؟

( ساسان ) شا وتی :

دەمەوێت بیکوژم و ( دندان )ی گەورە وەزیریش ، ملی شۆڕ بکات و بێتەوە ژێر رکێفی خۆم . هیچی بۆ نەمێنێتەوە ، خزمەت کردنی من نەبێت .

( نزهەالزمان )یش پێی وت :

غەدر کردن لە نەناسانیش قێزەونە ، نەخوازەلا، لەخزمان..! بە قسەی من بکە : قچی فکان ی کچتی لێ مارە بکە ! باو و باپیران وتوویانە :

شەقی زەمانە کە تۆی گرتەوە ناشایستەیەك جێی تۆی بردەوە

تۆش وەکو خەڵکی چەپڵەی بۆ لێدە دوور بێ یا نزیك ، تۆڵەت کردەوە

رەوشتێ مەڵێ ، کە پێوەی دیار بێ بەوە لە چاکەی خۆتت شاردەوە

کە ئەم شیعرەی لە ( نزهەالزمان ) بیست . تووڕە بوو، لە ژوورەکە چووە دەرێ ، هاواری کرد:

گەر کوشتنت حەیای نەدەبردم .. هەر ئێستا سەرتم لە لەشت جیا دەکردەوە !

ئەویش شوێنی کەوت و وتی :

هەر خۆت تووڕە بکە .. من سوعبەتم لەگەڵ کردی !

سەری (ساسان)ی ماچ کرد و وتی :

تۆ راست دەکەیت .. ئامادەم پێکەوە پیلانی کوشتنی دابرێژین .

شا (ساسان) پێی خۆش بوو، وتی :

دە..کوا؟ خێراکە دڵم تەقی ! خۆ من هەر پیلانی بۆ دادەنێم و هەر سەرکەوتوو نابێت .

( نزهەالزمان ) وتی : کەنیزەکە باکوون ... هەر بە ناز و نووك .. دەیکات سەرەونگون !

بەڵام لە راستیدا، ئەو کەنیزەکە پیرەژنێکی سادە و دڵپاك و بێ فێڵ بوو . کاتی خۆی : (کان ماکان) و قچی فکان ی پەروەردە کردبوو و خۆشی دەویستن . ناردیە دووی (باکوون) . ئامادەی کرد و ئامۆژگاری کرد کە (کان ماکان) بکوژێت .

ئەویش وتی :

کەوابوو دەبێت ، (خەنجەر)ێکی ژەهراویم بۆ پەیدا بکەیت .. بۆ ئەوەی کە بە خەنجەر دام دووری ، جارێکی دی هەڵنەستێتەوە .

ناردی (خەنجەر)ی ژەهراویان بۆ هێنا . رۆیشت و خستی یە بن باڵی ... کە گەیشتەوە ماڵ .. (کان ماکان)ی بینی ، دانیشتووەو زۆربێ تاقەت و بێحاڵ ... لێی داوە دالغە و خەیاڵ .

دوای سڵاو پێی وت : بۆ دڵنەوایی و دڵدانەوەی تۆ هاتووم .

کان ماکان وتی : کەوابوو .. چیرۆك و بەسەرهاتێکم بۆ بگێڕەوە .. دڵم خۆش بکات .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو وەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٤٣**

*شەهرەزاد گێڕایەوەو وتی :*

کەنیزەکە ( باکوون ) خەنجەرەکەی لە ژێر جلەکانی بەریدا بوو .

دانیشت و دەستی پێکرد :

بیستوومە ، پیاوێك هەبووە هێندەی حەز لە رابواردن بووە .. ئەوەی هەیبووە ، لە سامان و دارایی خەرجی ئەو ئارەزووەی کردووە . هەژار بووە و دنیای لێ هاتووەتەوە یەك و سەری لێ تێك چووە . بە جۆرێك بە نێو بازاڕدا گەڕاوە ، بۆ لەتە نانێك بیخوات !

رۆژێکیان بزمارێك دەچێ بە پەنجەیەکی پێیدا و هاواری لێ هەڵدەستێ و خەڵکی لێ کۆدەبێتەوە دوای ئەوەی پەنجەی دەبەستن . دەیبەن و دەیکەن بە گەرماوێکدا . ئەویش ، لە سەر جورنەیەك دادەنیشێ و خۆی دەشوا و ئاو دەکات بەسەر خۆیدا . تا ماندوو دەبێت .

دەچێتە ژووری ساردی گەرماوەکە و حەوزێکی ئاوی ساردی تیادەبێت و لەسەر کەنارەکەی دادەنیشێت ، هەندێ حەشیشە قوت دەدا . سەری گێژی بەرز کردەوە و لەسەر مەڕ مەڕی زەوییەکە راکشا ، ناترێکی بینی کە پێویستیەکانی شتن و شێلانی پێ بوو. دوو کۆیلەش بە دەوری یەوە بوون .

ئەمیش لە دڵی خۆیدا وتی :

ئەمانە .. لێیان تێکچووە و بە هەڵە خزمەتی من دەکەن .

یەکێکیان خاولی و لفکەی و سابوونی پێ بوو ، ئەوی تریش تاسێکی هەڵگرتبوو . هەر دوو قاچی درێژ کرد و وا تێگەیشت ناترەکە ، داوای قاچ درێژ کردنی لێکردووە .

ناترکەوتە شتنی و پێی وت :

گەورەم ئەمرۆ بەختت یارە ، ئەستێرەت لە رووناکی دایە .

ئەمیش دەستی کردە پێکەنین و وتی :

پەنا بە خوا .. لەم حەشیشەیە ..!!

کە دانیشت ناترەکە قردێلەیەکی رەشی لە ناو قەدی بەست . دوو کۆیلەکەش بە دوایەوە بوون . شوێنی کەوتن تا گەیاندیانە تاقەکەی خۆی . کە دانیشت گوڵاویان بە سەردا پژاند .

میوەیان بۆ هێنا و شووتیان بۆ شکاند . دواتر لەسەر کورسی یەکی دار ئەبەنوس دایان نا .

دوو کۆیلەکە پشتیان شێلاو پێیان وت : پیرۆزت بێت .

دەرگایان لەسەر داخست و چوونە دەرەوە .

ئەویش دەستی کردەوە بە پێکەنین و لە دڵی خۆیدا وتی :

سەڵتەنەتە ..سەڵتەنەت ..!

لە گەرماو هاتە دەرەوە ، بە خەیاڵی خۆی کۆیلەیەکی منداڵ وکۆیلەیەکی خەساو، بەرەو رووی هاتن.. یەکێکیان (٣) خاولی دەرهێنا و یەکێکیانی بە ناوقەدی یەوە و ئەویتریانی بە شانەکانی و سێ یەمیانی بە سەری یەوە بەست .

خەساوەکەش قاپقاپی بۆ دانا ، تا بێکاتە سەر پێوە . کۆیلە و خەساوانی دی هاتن و چوونە ژێر باڵی و هێنایان . ئەمیش هەر پێدەکەنی . تاگەیشتنە بەرهەیوانی گەرماوەکە.. رووانی فەرشێك داخراوە کە مەگەر هەر لەکۆشکی شاهاندا هەبێت ..!

پێچایانەوە و گەرم داهات و نووست . سەیری کرد پیاوماقوڵان هاتنە دەوری و تاجی شاهەنەیان کردە سەری .

کەسێك پێی وت :

ئیدی هەستە لە خەو .. وا نیوەڕۆیە .

کە بە ئاگا هاتەوە، رووانیی لەسەر حەوزەکە دایان ناوە و پێی پێ دەکەنن . ئەمجا بۆی دەرکەوت ئەمانە خەیاڵی حەشیشەکە بووە و خەوی بینیووە...!

سەیرێکی ئەوەی ژوور سەری کرد کە بە ئاگای هێنابووەوە پێی وت :

با کەمێك دواتر بە ئاگات بهێنامایەوە لایەنی کەم : تاکو تاجەکەیشیان دەکردە سەرم..!

ئەوانیش وتیان :

نەچووە بچێت .. ئێستا تاجەکەیش دەکەینە سەرت ..!

کەوتنە شەپازلە لێدانی و شەق و زللە. ئەوەی کە بە خەیاڵ پاشا بوو.کە بە ئاگا هاتەوە رسوا بوو.

کان ماکان ئەمەی بیست هێندە پێکەنی : بە پشتدا کەوت .

ئەمجا وتی :

بەسەرهاتی وا سەیر و سەمەرەم هەرگیز نەبیستووە! چیتر دەزانیت ؟

ئەمجا پیرەژنە باکوون کەوتە گێڕانەوەی چیرۆك تاکو نیوەشەو .کان ماکان خەوی لێکەوت . باکوون لە ژوور سەری دانیشتبوو لەدڵی خۆیدا وتی :

کاتی ئەوە هاتووە.. بیکوژم .

هەستاو خەنجەرە ژەهراویەکەی دەرهێنا و دەستی بڵند کردەوە کە بیکوژێت . دایکی (کان ماکان) خۆی کرد بە ژووردا . ئەمیش لەبەری هەستا و بەخێری هێنا . بەڵام هێندە

ترسابوو : هەناسەبڕکێی بوو .. دایکی هەستی بە ( پیرەژنە باکوون )کرد تێکچووە و ( کان ماکان )ی هەستان . ئەویش چاوانی هەڵ گڵۆفت ، ڕووانی دایکی لە ژوور سەریەتی ..!
هۆی هاتنە ژوورەوەی دایکی ( کان ماکان )..( قضی فکان ) بوو. چونکە گوێی گرتبوو، لە کەین و بەینی کەنیزەکە ( باکوون )ی فێڵباز و دایکی .
بەپەلە چوو بوو بە دایکی کان ماکانی وتبوو :
فریای کوڕەکەت بکەوە . با.. ( باکوون )ی نەفرەتی نەیکوژێت .
لە نووکەوە ڕێکەوتنەکەی باکوون و دایکی خۆی بۆ گێڕابووەوە .
( کان ماکان ) خەبەری بووەوە بە دایکی وت :
لە کاتێکی گونجاودا هاتیت ..!
ڕوویشی کردە پیرەژنە ( باکوون ) و پرسیی :
بە قوربانت بم .. چیرۆکی لەوە خۆشتر نازانیت!؟
کەنیزەکەکە وتی :
جا..چیت بیستووە لە چیرۆکە خۆشەکانم !؟ .. بەڵام ئێستا کاتی ئەوە نی یە .
هەستا و خوا حافیزی لێ کردن . لە کاتێکدا کە بڕوای بە ڕزگار بوونی خۆی نەدەکرد ، دڵیشی خەبەری دابوو، کە هەبێ و نەبێ : دایکی کان ماکان بە پیلانەکەیانی زانیوە.
دایکی بە کوڕەکەی وت :
کوڕە شیرینەکەم .. ئەمشەو پیرۆزە . چونکە خوا ڕزگاری کردیت لە دەست ئەو پیرەژنە نەفرەت لێ کراوە .
ئەویش وتی : چۆن !؟ چۆن !؟
ئیدی دایکی لە نووکەوە ، بۆی گێڕایەوە .
کان ماکان بە دایکی وت :
دایە گیان .. مار، ئاگای لە خۆی بێت ، بە هەموو کەسێك ناکوژرێت .. بەڵام بۆ خۆ پارستن ، دەبێت لێرە بار بکەین و بڕۆین . ئیدی خوا هەر چی یەکی بوێت .. دەیکات .
کە ڕۆژ بووەوە (کان ماکان) و دایکی لە شار چوونە دەرەوە و چوونە لای (دندان)ی گەورە وەزیر .
لەولایشەوە ، نێوانی( نزهەالزمان)یش لەگەڵ شا (ساسان) تێکچوو بوو . بۆیە ئەویش لە شارچووە دەرەوەو یەکسەر بۆ لای دندانی گەورە وەزیر . کان ماکان و سەرکردە و پیاوماقوڵان کۆ بوونەوە . بە هەموویان بڕیاریان دا ، هێرش بکەنە سەر ( ڕۆم )ەکان . ئەو جەنگ و پەلاماردانە زۆری کێشاو پێویست ناکات لێرەدا بیگێڕینەوە . ئەنجامی ئەو جەنگە بە دیل گرتنی کان ماکان بوو ، لە لایەن شا ڕومزان ی شای وڵاتی( ڕۆم )ەوە . هەموویان لەخەمی ئەوەدا بوون کە شا ڕومزان بیان کوژێت .

نەفرەتی .. خۆت نازانیت کە دایکم لە چۆڵەوانیدا کوژرا و باوکیشم دەرمان خوارد گراوە و مردووە .
( گۆ )یەکیشت پێم داو وتت : ئەمە هی باوکتە!؟ بۆ.. دەبێت بروات پێ بکەم ؟!
( مامان )ەکەش وتی :
هەموو ئەوانەی کاتی خۆی پێم وتویت راستن . بەڵام بەسەرهاتی هەردووکمان سەیرە !!
من ناوم مەرجانەیە ! دایکی تۆ ناوی شازادە ئیبریزە بوو. زۆر جوان و ناسك و نازدار بوو.
خەڵکی : نازایەتی ئێمەیان بە نموونە دەهێناوە. باوکیشت ، شا (عمری کوڕی نعمان) خاوەنی (بەغداد) و (خوراسان) بوو . لەگەڵ ندندانی گەورە وەزیردا. ( شرکان )ی کوڕی ناردووەتە : جەنگ کە خۆیشت ئاگاداربوویت . دواتر دایکت (٥) رۆژ لە کۆشکی باوکتدا میوان بوو .
ژنێکمان لێ پەیدابوو بە پیرەژنە سەرناسنینە بفێڵاوی ناسرابوو. من و ریحانە و (٤٠) کەنیزەکی بردە دیوەخانی پاشای باوکت . باوکی هەواڵەکەی بیستەوە.. دەربارەی کچەکەی ، کە دایکتە . دایکیشت لەسەر دەستی شرکانی براتدا موسڵمان بوو.. ئێمەیشی موسڵمان کرد .
براینە بەردەم شا (عومەر) . ( ئیبریزە )ی دایکتی لێ هەڵبژاردین و مارەی کرد . دوای ماوەیەك دایکت سکی بە تۆ پڕ بوو . دایکت (٣) گۆی هەبوو و بە دیاری پێشکەشی شا(عومەر)ی باوکتی کرد. باوکیشت ( گۆ )یەکیانی دایە ( نزهەالزمان )ی کچی خۆی .
ئەوی تریشی دایە.( ضوءالمكان ).
سێ یەمیش بۆ شا شرکان بوو. ئیبریزە خاتوون ، ( گۆ )یەکەی بۆ هەڵگرتبووی .
کە کاتی منداڵ بوونی نزیك بووەوە بیری کەس و کاری خۆی کردو ئەم نهێنی یەی بۆ من گێڕایەوە .
ناردی بە شوێن کۆیلەیەکدا کە ناوی ( غەزبان ) بوو. ئەو نهێنی یەی بەویش وت و ئەویش هەردووکمانی بە دزی یەوە بەرەو ماڵی باپیرەت برد .
ڕێگامان گرتە بەر، کاتێك لە وڵاتی باپیرەت نزیك بووینەوە ، دایکت ژان گرتی .
شوێنەکەشی چۆڵەوانی بوو. کۆیلە ڕەشەکە تەماعی کردە دایکت . دایکیشت بە سەریدا قیژاندی . لە ئەنجامی ئەو قیژەیەدا تۆ لە دایك بوویت . لەو کاتەشدا تەپ و تۆز بڵند بووەوە . ( غەزبان )ی کۆیلە ، کە ئەو سوارانەی بینی زۆر تووڕە بوو، گەڕایەوە سەر دایکت و بە شمشێرێك کوشتی و هەڵات . کە تەپ و تۆز بڵاوەی کرد روانیم شا ( حەردوب )ی پاشای وڵاتی ( رۆم )ە . کە دایکتی بینی : واتا کچەکەی خۆی بەو شێوەیە کوژراوە ، زۆر بەلایەوە گران بوو .
لێی پرسیم :
هۆی کوشتنی چی بوو؟ بۆچی بە دزی یەوە ، لە شار دەرچووە و سەفەری کردووە ؟

منیش له نووکەوە بۆم گێڕایەوە . ئەم دوژمنایەتیەی نێوان وڵاتی رۆم و شاری بەغدا .. ئەم کارەساتە بوو!

ئیدی تەرمی دایکتمان هێنایەوە و لای خۆمان ناشتمان . تۆش ساوا بووی و بە منیان سپاردیت کە پەروەردەت بکەم و گەورەت بکەم . گۆیەکەی ئیبریزەی دایکتم کردە ملی تۆ ، کە گەورەش بوویت ، نەموێرا، ئەمەت بۆ بگێڕمەوە ، چونکە گەر بۆم بگێڕایتایەوە دوژمنایەتی نێوان ئەو دوو وڵاتە پەیدا دەبوو . باپیرەشت فەرمانی پێدام ، کە ئەم نهێنی یە نەدرکێنم . نەیدەویست تۆ بزانیت .. کە کوڕی شا ( عومەری کوڕی نعمان)یت . لەوکاتەوە مەملەکەتەکەت سەربەخۆ کردووە، دەمویست ئەم راستی یەت پێ بڵێم . بەڵام بۆم رێ نەدەکەوت و ئێستا بۆت دەگێڕمەوە. وا من راستیەکانم پێ وتیت تۆش خۆت و ویژدانت.

کە دیلەکان ئەمەیان بیست ( نزهەالزمان ) خۆی بۆ نەگیرا و هاواری کرد :

ئەم پاشایە ( رومزان ) شای برامە و کوڕی شا( عومەری نوعمانە ). کوڕی شازادە (ئیبریزە)ی کچی شا ( حەردوب )ی رۆمە . بڕوا بکەن : ئەمەش کەنیزەکە (مەرجانە)یە .. زۆر باش دەیناسمەوە .کە شا ( رومزان ) ئەمەیشی بیست . سەراسیمە بوو..! نەیدەزانی چی بڵێت !

نزهـەالزمان چـووە بەردەم شا ( رومزان ) . ئەویش خـوێنی بۆی جوڵا و پرسیاری کرد . نزهەالزمان یش بەسەرهاتەکەی لە نووکەوە بۆ گێڕایەوە. شا ( رومزان ) سەرنجی دا هەمان بەسەرهاتی مەرجانە بوو کە بۆی گێڕابووەوە .

گومانی نەما کە ئەمیش خەڵکی شاری بەغدادە و باوکیشی شا (عومەری کوڕی نوعمانە) . یەکسەر، دەست و قۆڵی کردەوە. نزهەالزمانیش دەستی( رومزان) شای ماچ کرد و دەستی کردە گریان . شایش لەگەڵیدا گریا. ( رەحم )ی بۆ کان ماکانی خوشکەزای جوڵا. شمشێرەکەی لە جەلادەکە وەرگرت ئەوانیش ترسان ، وایان زانی شا دەیان کوژێت . شا فەرمانیدا: یەکە یەکە چوونە بەردەمی . ئەویش خۆی دەیکردنەوە .

شا بە مەرجانەی وت :

دەی قسەکەت تەواو بکە ، با ئەمانیش بیبیستن .

( مەرجانە ) وتی :

پاشا گیان .. ئەم پیاوە پیرە ، ( دندان )ی گەورە وەزیرە . کە شایەت و بەڵگەی قسەکانمە .کەوتە گێڕانەوەی بە سەرهاتەکە بۆ میرانی رۆم و پیاوانی (بەغداد) . ئەوانیش قسەکانیان لا پەسەند بوو . سەیرێکی یەکە یەکەی دیلەکانی کرد . ئاوڕێکی لە (کان ماکان ) دایەوە ، ملوانکە و( گۆ )یەکەی بینی ، بە هەموو هێزی خۆی قیژاندی و دەستی برد بۆ لاملی (کان ماکان) و وتی :

ئەوە (گۆ)یەکەی تری ، ملی تۆیە ئەی ( رومزان) شا. ئێستا هێندەی تر راستی قسەکانم

دەرکەوت .

ئەم دیلەیان ( کان ماکان )ی برازاتە .

( مەرجانە ) رووی کردە کان ماکان و وتی :

ئەی شای زەمانە .. ئەو ( گۆ )یەی ملی خۆتم بدەرێ . داوای لە ( نزهەالزمان )یش کرد . ئەویش (گۆ)یەکەی ملی خۆی دایە . هەردوو (گۆ)یەکەی دایە دەست شا رومزان . ئەویش لەگەڵ ئەوەی ملی خۆی بەراوردی کردن و بۆی دەرکەوت : کە مامی شا (کان ماکان)ە . هاواریان کرد و کەوتنە یەکتری ماچ کردن . خەڵکی شار بەم دڵخۆشیەیان زانی و هاتنە کۆڵان . دایان لە دەهۆڵ و زورنا . شایی و هەڵپەرکێ و سەما . سوپای رۆم بەمەی زانی کەوتە ئاهەنگ گێران و لەشکری عیراقیش کە ئەم بەزم و رەزمەی بیست سوار بوون بەرەو وڵاتی رۆم . تاکو بزانن ئەو هەرا و زەنایە چی یە !؟

لە خۆیان دەپرسی : ئاخۆ .. ئەو ئاهەنگ گێرانە چی یە ؟ ئەمانیش بۆ سەر سنووری ( رۆم) هێرشی جەنگیان هێنابوو. بۆیە (قضی فکان) فەرمانی بە کوڕی (شرکان) دا . هەر ئێستا بەرەو سنوور بڕوات و بە سوپای (عێراق) و (شام) رابگەیەنێت کە پەیمانی رێکەوتن مۆر کراوە و جەنگ وەستاوە و بگەڕێنەوە دواوە . بۆیان دەرکەوتووە کە ( رومزان) شا مامی سوڵتان (کان ماکان)ە .

( قضی فکان ) بۆ خۆی چوو بۆ لای شا ( زوبلکان) . سڵاوی لێ کرد و ئاگاداری پێدا کە پەیمانی رێکەوتنیان مۆر کردووە . ( رومزان) شایش مامەی (کان ماکان)ە . ئەمەی بیست رووی گەشایەوە، پەژارەی لە دڵا نەما . سوار بوو و هەموو سەرانی دەوڵەت و گەورە پیاوانی لەگەڵ خۆی برد و خاتوو ( قضی فکان ) لە پێشیانەوە . رۆیشتن تا گەیشتنە کۆشك و سەرای رومزان شا . کە چوونە دیوەخان ، روانیان شا رومزان و کان ماکان دانیشتوون و باسی شا زوبلکانیان دەکرد . دواتر بە کۆمەڵ بڕیاریان دا ( دیمەشق )ی بدەنێ و پاشا بێت لە جێی خۆی . خۆیشیان دەچنەوە وڵاتی عێراق . (زوبڵکان)یش بەرپرسی : دیمشق و شام دەبێت . ئیدی فەرمانیان پێدا بگەڕێتەوە و سوپاکەی کۆ بکاتەوە و خۆیشیان سەعاتە رێیەك لەگەڵی رۆیشتن و دواتر خواحافیزیان لێ کرد . لە شەپیوریان دا و سوپای خۆیشیان کۆکردەوە و فەرمانیان دا . بە ڕێ بکەون بەرە و عێراق . ئیدی هەر دوو سوپاکە لێکدران و رێکەوتن کە نەسرەون تا تۆڵەی خۆیان لە پیرەژنە (شەواهی) ــ کە بە پیرەژنە سەرئاسنینەی فێڵاوی ناسرابوو ــ نەکەنەوە .

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.*

## شەوی ١٤٤

شەهرەزاد گێڕایەوە :

سوڵتان (کان ماکان) زۆر دڵخۆش شا رومزان و پیاوان و سەرانی دەوڵەت کەوتنە ڕێ .

بوو و نزای خێری بۆ (مەرجانە) کرد کە ئاوا بە یەکی شاد کردنەوە . ڕۆیشتن .. تا گەیشتنەوە نیشتمانی خۆیان . کە خەزنەداریش چوو بە پیری شا( رومزان)ەوە و کڕنووشی بۆ برد . خۆیان کرد بەکۆشکدا و (کان ماکان)ی لە لای خۆیەوە دانا .

کان ماکان بە شای مامی وت :

مامە گیان .. پاشایەتی ئەم وڵاتە هەر لە خۆت جوانە و پیرۆزت بێت .

ئەویش وتی : شتی وا نابێت ...

دندانی گەورە وەزیریش هەڵی دایەو وتی :

کەوابوو، بە قسەی من بکەن .. هەر ڕۆژە و یەکێکتان پاشا بن .

ئەوانیش بە پێکەنینەوە پەسەندیان کرد . دواتر فەرمان درا .. قوربانی کرا .. خێر بەخشرایەوە ، سفرە و خوان ڕاخرا بۆ هەژاران . ماوەیەکی زۆر ئاهەنگ گێڕرا . هەوڵاتیان ، شاد و بەختیار بوون .

ڕۆژێکیان .. دانیشتبوون تەپ وتۆزێکی فرەیان بینی . چەند بازرگانێک بە هەڵە داوان هاتن و وتیان :

ئەی شای زەمانە .. چۆن دەبێت لە وڵاتی ڕۆم دا ڕووت بکرێینەوە ، لە کاتێکدا وڵاتی ئێوە پڕە لە دادی کۆمەڵایەتی !؟

شا رومزان بانگی کردنە پێشەوەو هەواڵەکەی لێ پرسین .

یەکێکیان وتی :

من یەکێکم لە بازرگانان .. ماوەیەکی زۆرە لە دەرەوەی وڵات بووم و (٢٠) ساڵێکم پێچوو. نووسراوێکی فەرمانی پاشایەتیم پێ یە . لە دیمەشق بۆیان نووسیوم و مۆری شا (شرکان)ی خوا لێخۆش بووی پێوەیە . ئەویش بە هۆی ئەوەوە ، کاتی خۆی کەنیزەکێکم بە دیاری بۆ بردووە . کە لەو وڵاتە نزیك بوومەوە ، (١٠٠) باری وشترم پێ بوو ! لە نەختینەی ( هندی ) و هێناومە بۆ ( بەغداد ) کە مەملەکەتی ئێوەیە ، شوێنی دادپەروەری و ئاسایشی ئێوەیە .

لەناکاو هەندێك لە (عەرەبی دەشتەکی) و (کوردان)[١٠] پێکەوە ڕێیان پێ گرتین و کۆیلە و پیاوەکانیان کوشتین و تاڵانیان کردین . بازرگانەکە لە بەرامبەر پاشادا دەستی کرد بەگریان .

شا( رومزان ) و( کان ماکان ) شا بەزەییان پێیانداهاتەوە . شا فەرمانیدا (١٠٠) سوارەی جەنگاوەری ئازا ئامادە بکرێن و ببرێنە سەر ئەو چەتە و ڕێگرانە . کابرای بازرگان پێشیان کەوت تاکو شوێنی ڕێگرانیان پیشان بدات .

بە درێژایی ئەو ڕۆژە و شەوەکەشی بەڕێوە بوون . بەرەبەیان گەیشتنە دۆڵێکی سەوزی پڕ

---

(١٠) ــ پێ دەچێت : ئامانجێکی ڕامیاری لە پشت ئەم سوکاتیەوە بێت بە کورد و عەرەب .... وەرگێڕ.

دار و درەخت و کانی وجۆگە ئاو . ڕێگرەکانیـان دۆزیـەوە و سەیریان کرد، بارەکانی ئـەم بازرگانەیان لە نێو خۆیاندا بەش کردووەو هەندێکیان هەر لەوێ ماونەتەوە .
ئەو (١٠٠) سوارە گەمارۆیان دان . شا ڕومزان خۆی و( کان ماکان)ی برزای لە ماوەی سەعاتێکدا هەموویان کە (٣٠٠) عەرەبی دەشتەکی بوون . قۆڵبەست کران . شتومەك و بارەکانیـان لێ سەندن و ڕەوانـەی شاری بەغدایان کردنـەوە . کە گەڕانـەوە پێکـەوە ... گیراوەکانیان بانگ کردو داوایان لێکردن
کە سەرۆکی ڕێگرەکان ، دیاری بکەن . (ڕێگران) چەند کەسێکیان دەست نیشان کرد ، ئەوانە ڕەوانەی بەندیخانە کران و ئەوانی دی ئازاد کران ... دوای ئەوەی هەرچییەکیان پێ بوو، لێیان سەندن و دایانەوە، بازرگانە خاوەن (١٠٠) بارە وشتر . ئەویش کە بە شتومەکەکانیدا چووەوە . ڕووانـی چوارپەکی شتەکانی لە دەست داوە . دوو فەرمانی شاهانەی دەرهێنا. یەکێکیان بە دەست و خەتی (شرکان) شای ڕەحمەتی بوو. ئەوی دی هی (نزهەالزمان) بوو. ئەم بازرگانـە، لـە کاتی کچێنیدا، لـە دەشتەکی یـەکیکرێ بوو. بـە دیـاری پێشکەشی شا (شرکان)ی کردبوو . کە ئەو بەسەرهاتەیان بەسەرهات .
شا ( کان ماکان ) سەیری دەست و خەتەکانی کرد و دەست و خەتی (مام )ەی ناسیەوە. چیرۆکی پوورە ( نزهەالزمان )یشی بیستبوو. فەرمانی شاهانەی دووەمی برد و چووە لای ( نزهەالزمان ) و بەسەرهاتی بازرگانەکەی بۆ گێڕاوە . ئەویش کە فەرمانە شاهانەکەی بینی دەست و خەتی خۆی ناسی یەوە . بازرگانەی دەعوەت کردو ئاگاداری دایە ( ڕومـزان ) شای برای و شا (کان ماکان )ی برازای کە ئاگایان لێی بێت . ئەوانیش فەرمانیاندا چەندین کۆیلە و خزمـەتکاریان پـێ بەخـشی . تـاکو پـەزێرایی بازرگانەکـە بکـەن . نزهـەالزمان خۆیـشی (١٠٠٠٠٠) درهـەم و (٥٠) بـاری وشـتر کوتـاڵ و شـتی نەختینـەی خـەڵات کـرد و نـاردی بـە شوێنیدا . ئەویش هات و ڕێزێکی زۆری لێ گیرا . بازرگانەکەش کە زانیی کچی شا عومـەری کوڕی نعمانەو شا ( ڕومزان ) برایەتی و شا(کان ماکان) برا زایەتی . دەستی( نزهەالزمان )ی ماچ کرد .
ئەمجا پێی وت : بە ڕاستی هەرچی چاکەیەکم لەگەڵ کردبیت ، بە فێرۆ نەچووە .
دوای ئەوەی سێ ڕۆژ مایەوە ، خواحافیزی کرد و بەرەو وڵاتی شام بـووەوە . دواتـر هـەر سێ پاشاکە.. بانگی ( ڕێگرە ) گیراوەکانیان کرد .
لە وەڵامدا یەکێکیان دانی پیانا و وتی :
ئەوە بزانن سەرەتا من ( ڕێگر ) نەبووم و کارەکەم . فڕاندنی ( منداڵ ) و ( کچان ) بوو ، تاکو بیان فرۆشم .
شـەیتان فریـوی دام و لەگـەڵ ئـەم دوو ( ڕێگـر )ە ڕێکـەوتم ، کـە کۆمـەڵێك (عـەرەبی دەشتەکی) و(ملهوڕان) کۆبکەینەوە . دواتر دەستمان کردە جەردەیی و ڕێگری لە بازرگانان .

پێیان وت :

سەر سوڕهێنەرترین ، فڕاندنێك كە بەسەرت هاتبێت بۆمان بگێڕەوە .

ئەویش وتی :

جارێكیان كچێكم فڕاند . ویستم لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ بیابان و لەوێ ( وشتر)ی پێ بلەوەڕێنم .

ئەو كچە زۆر جوان و ناسك و نازدار بوو! زۆر هەوڵی دا : ئازادی بكەم . منیش لێی تووڕە بووم زۆر بە توندی لێم دا. دواتر بازرگانێكمان لێ پەیدا بوو .

ویستی لێم بكڕێت . چونكە كچەكە سەرەڕای جوانی یەكەی .. زمان پاراو و قسەزان و زیرەكیش بوو . بازرگانێك پارەیەكی باشی بەكەنیزەكەكەم داپێم داو پێم نەفرۆشت . شوێنمان كەوت و نرخەكەی كردە دوو هێندە ، هەر نەمدا..! هێندە نرخەكەی پتر كرد و گەیاندی یە (١٠٠٠٠٠) درهەم و پێم فرۆشت . خۆزگە پێم نەفرۆشتایە ، چونكە دواتر بیستمەوە ئەو بازرگانە جلوبەرگێكی نایابی لەبەر كردووە و پێشكەشی شای (دیمشق)ی كردووە .

پاشایش دوو هێندەی نرخەكەی پێداوە . ئەی پاشایان : من ئەو بەسەرهاتەم زۆر پێ سەیربوو..! دنیا لەبەر چاوی ( نزهە الزمان ) تاریك بوو .

هاواری برازاكەی و رومزانی برای كرد و وتی :

ئا.. ئەمە بوو كە منی لە ( بیت المقدس ) فڕاند و منی كردە كەنیزەكی خۆی ..! گومانم نی یە ، كە ئەمە بوو .

( نزهەالزمان ) چی بەسەر هاتبوو لەگەڵ ئەو ( ڕێگرە) گێڕایەوە .

وتیشی :

كە چۆن توند و تیژ بووە لەگەڵیدا وچەندە : برسی و تینوو و رسوای كرووە .

رووی كردە ڕێگرەكەو وتی : كەواتە خوێنی ئەم پیاوە .. بە من حەڵاڵە ...

پەلاماری شمشێری دا و هەڵی كوتایە سەری كە بیكوژێت .

ئەویش هاواری كرد :

ئەی پاشایان مەهێڵن بمكوژێت . با چیرۆكی سەرسووڕهێنەری ترتان بۆ بگێڕمەوە .

( كان ماكان )ی برازای بانگی كرد :

وازی لێ بێنە ، با چیرۆكی تر بگێڕێتەوە . دواتر چی لێ دەكەیت بیكە . ئەویش گەڕاوە دواوە پاشاكان وتیان : دەی .. بۆمان بگێڕەوە .

ئەویش وتی :

ئەگەر چیرۆكێكی سەیرتان بۆ بگێڕمەوە : لێم خۆش دەبن..!؟

ئەوانیش وتیان : بەڵێ .

دەشتەگی یەکە دەستی پێ کرد :

شەوێکیـان خەوم زڕابوو. خوا خوام بوو زوو، ڕۆژ بێتەوە. کە دنیا ڕوناك بوومەوە ، خۆم بەست.. شمشێرم لە کەمەر خست . سواری ئەسپەکەم بووم و ڕمەکەم بە دەستەوە گرت . دەرچووم بۆ ڕاو و شکار. کۆمەڵێکم لە ڕاوگەیەك بینی . لێیان پرسیم کە خەریکی چیم !؟

پێم وتن : هاتوومە .. ڕاو و شکار.

وتیان : ئێمەش لەگەڵت دێین .

یەکانگیر بووین ، زۆر گەڕاین . (نەعامە)یەکمان بینی و شوێنی کەوتین .. هە لێرە ..هە لەوێ ...بۆمان نەگیرا . هێندەمان زانی گەیشتینە ، بیابانێکی وشك و بێ ئاو. ئەسپەکانمان مانـدوو و تینـوو بـوو . بیرمـان کـردەوە ، بـەو ماندوویـەتی و شـەکەتی یـە : نـاتوانین بگەڕێینەوە . بۆیە دابەزین بۆ حەوانەوە . کە بە ملا ولادا ڕوانـیم . زۆر دوور دەوارێك دیارە . سوار بووم و رووم تێکرد. کە گەیشتمە ئەوێ بانگم کرد . لاوێك هاتـە دەرەوە و فەرمووی لێکردم . کە دابەزیم و چوومە ژوورەوە .

دەڕوانم ( کـەنیزەك )ێکیش لـە ژوورەوەیـە ، تـا بڵێـی : ناسـك و نـازدارە . دانیـشتم و تێریان کردم .

ئەمجا پرسیم : ئەم کەنیزەکە چیتە؟

لاوەکە وتی : خوشکمە .

منیش پڕ چەك بووم . شیڕاندم بەسەریدا و وتم :

گەر ئەو خوشکەتم نەدەیتێ : دەتان کوژم .

ئەویش خۆی تیك نەداو وتی :

ئێوە چەند کەسن ؟

منش وتم : زۆر..

وتی : تۆ وتت ئێمە پاڵەوان و شۆڕە سوارین !

منیش وتم : ڕاستە .

ئەمجا وتی :

گرنگ نییە . ئەگەر(١٠٠٠) کەسیش بن . یەکە ، یەکە بێنـە گۆڕەپـانی جەنگەوە بۆم . هەر کەسێکتان منتان کوشت خوشکەکەم : حەڵاڵی بێت ..!

منیش وتم :

باشە هەر ئێستا دەگەڕێمەوە ناویان و ئەم پەیمان و ڕێکەوتنەیان بۆ دەگێڕمەوە .

ئەوەشم بیر نەچێت . پێش ئەوەی تێرم بکات . لێی پرسیم ناوت چی یە؟

پێم وت :

من (حەمادی کوڕی ئەلفەزاوی )ێ فارسیم . بەوە ناسراوم توانای شەڕکردنم

بەرامبەر(١٠٠) پاڵەوانە ! ئێمە بۆ راو وشکار هاتین . شوێن نەعامەیەك کەوتین و بۆمان نەگیرا. تینوو و ماندوو بووین .
بۆیە لێرە گیرساینەوە . دوور بە دوور ئەم مێرگ وسەوزە گیایەم بینی . هاتمە لای ئەم دەوارەی ئێوە و ئەم خوشکەت چوو ئاوم بۆ بێنێ . زرنگەی پاوانەکەی و جوانی و شەرمنی یەکەی ، وای کرد حەزم لێکرد . ئێستاش تۆ هەواڵی منت پرسی و منیش بۆم گێڕایتەوە . فەرموو تۆیش بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە .
ئەو لاوەی کە هێشتا مووی لێ نەهاتبوو وتی :
ئەم کەنیزەکە خوشکمە .
منیش پێم وت : منیش خراپم نەوتووە ، کە داوام کرد ، لێم مارە بکەیت .
ئەویش وتی : منیش پێم وتیت :
تۆ شێری بیابانی ... ئازای ، پاڵەوانی ..!
کە گەڕامەوە بۆ هاوڕێکانم باس کرد و پێیشم وتن ئەو لاوە .. پاڵەوانێکی نەبەردە و زۆر ئازایە .. بە گاڵتە ، زۆرانبازی و رمبازێن ناکات ..! ئەوەش بزانن ..کە دەوارەکەی پڕ لە شتی نەختینەی بە نرخە و زێڕ و زیوێکی فرمیان هەیە . هەر پاڵەوانێك توانی ئەو لاوە ببەزێنێت ئەوا : خوشکەکەی بۆ ئەوکەسە دەبێت .
هاوڕێکانیشم وتیان : پەسەندمانە ..
شمشێریان کردە شان و رمیان گرتە دەست و سوار بوون و بەرەو لای دەوارەکە .کە گەیشتین ، لاوەکەمان بینی خۆی ئامادەی جەنگ کردووە . خوشکەکەی باوەشی بە ئەسپی براکەیدا کرد . زۆری لێ پاڕایەوە بە دەم لاواندەوە ئەم شیعرەی وت :

سکاڵای ترس و خەم و پەژارە — بۆ یەکێ دەبەم کە خۆی سەردارە
کە خۆیان داوای مەرگت لێ بکەن — تاوانبار نابیت ، ئاشکرا و دیارە
ئەسپت دەزانێت ، چەند پاڵەوانی — شیرت ناسراوە چەندە غەدارە
شەرەفی خوشکت کە دەپارێزیت — نزات پەسەندی پەروەردگارە
رێ مەدە کەسێ خوشکت داگیر کات — راکێشی بکا هەر وەك پەتیارە
لەو شارە نابم ، کە تۆی لێ نەبیت — هەڵدەخەم بۆ خۆم پەتی سێدارە

کە لاوەی برای ئەمەی بیست : گریا و بەمجۆرە وەڵامی دایەوە :

بڕوانە شەڕی سەرسوڕهێنەرم — دەم بینی چۆنی لە ناویان بەرم
وەك شێری مەیدان پەلامار دەدەم — کەلاکیان دەخەم لە دەورو بەرم
گەر بۆت نەجەنگم نزام ئەوەیە : — دەم داڵ بکەوێ چوارپەل و سەرم
لە پێناوتدا : جۆرێ دەجەنگم — بە کتێب بکرێ ، ناوبانگی شەڕم

ئەمجا وتی :

خوشكێ گەر كوژرام ، سوار بە و هەڵ بێ و خۆت رزگار بكە .
خوشكەكەشی وتی : خوا نەكات ، تەرمی تۆ ببینم .
سەری خوشكەكەی و نێوچاوانی ماچ كرد. ئەویش فرمێسكەكانی داوەرینە سەر زەوی .
خوا حافیزی لێ كرد .
رووی‌شی كردە ئێمە و پرسیی :
ئەی شۆڕە سواران .. ئێوە میوانن .. یان بۆ شەڕ كردن هاتوون ؟ گەر میوان نین
یەكێكتان بێتە بەرامبەرم .
سوارەیەكی پاڵەوان لێی چووە پێش .
لاوە لێی پرسیی:
ناوی خۆت و باوكت چی یە؟ چونكە من سوێندم خواردووە ، كەسێك نەكوژم ..كە ناوی
خۆی و باوكی.. وەكو ناوی خۆم و باوكم بێت. ئەو كەنیزەكەیشی هەروا بەئاسانی دەدەمێ .
پاڵەوانەكەی ئێمەش وتی : بیلالم ناوە .
لاوەكەش ئاوا وەڵامی دایەوە :

وا نەبوو ، وتت : ناوت ( بیلال )ە فریودانی من گەلێك مەحاڵە
گەر پیاویت ئێرە جێگەی خۆیەتی نەعرەتە لێدە ، با بڵێن : زاڵە
خۆ بگرە ، لەبەر ( شێر)ی مانگ ئاسام كە كێو دارما، مەیكە بە ناڵە

كەوتنە هەڵمەت بردن بۆ یەكتری . تا لاوەكە .. هەلی قۆستەوە و رمەكەی كرد بە سەر
سنگی پاڵەوانی ئێمەدا و لە پشتی یەوە دەرچوو..!
سوارەیەكی دی بۆی چوو ... لاوەكەیش پێی وت :

ئەی سەگە پیسی بۆگەنی خوێڕی پێت وایە ، پیاوی نازا نی گەڕی
شێر ئەو كەسەیە : گیانی ببەخشێ لە خۆ نەترسێ و نەیكات بێفەڕی

نەیدایە دەرفەت .. زوو بۆی برد هەڵمەت . ئەویشی كوشت !
هاواری كرد : كێ دێتە شەڕم.. بابێت .
لاوەكە ئەم شیعرەی بیست وتی :

وا هاتمە پێش دڵم : بە گرە وەرە پێش منیش حەزم لە شەڕە
گەورە پیاوانی عەرەب دەكوژێت ئێستاش ، تۆڵەیان لە من وەرگرە

كە لاوەكە ئەم شیعرەی بیست ، هاواری كرد :

وەرە پێشەوە، درۆزن .. شەیتان دەستت كردووە بە درۆ و بوختان
بێبەشت ناكەم لە نووكی رمم لە كۆڕی جەنگا و بە شمشێر لێدان

هەڵمەتی بۆ برد و هەر زوو رمەكەی كرد بە سنگیدا و لە پشتی یەوە دەرچوو.
هاواری كرد :

کێی تر دێتە پێشەوە؟ چوارەم پاڵەوان هاتە پێشەوە و ناوی ئەویشی پرسی :
پاڵەوانەکە وتی : ناوم هیلالە .
لاوەکە .. بەم شیعرە لاواندی یەوە :

هەڵەی لە دەریای منا مەلە کەیت
بە درۆ کردن ئاوا:پەلە کەیت
منیش ئەوکەسەم شیعرم دەبیستی
جۆرێك دەتکوژم ، هەناسە نەدەیت

شەهرەزاد هەستی کرد شەو دەنگ بوو .. بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٤٥**

شەهرەزاد دوای ئەوەی خۆی بۆ شا شەهرەیار رازاندەوە . بەرامبەری دانیشت و وتـی :
لاوە و شۆڕەسوار هەڵمەتیان بە سواری ئەسپەکانیانەوە بۆ یەکتر برد . بەڵام لاوەکە ، خێراتر بوو شۆڕەسواری خستە خوارەوە و مرد . ئیدی هەر پاڵەوان بـوو.. بـۆی دەچووە مەیدان و دەکوژرا! منیش کە هاورێکانم بینی .. یەکە .. یەکە کوژران .
لەدڵی خۆمدا وتم :
دەفەرموو، ئێستا بۆی دەچمە گۆڕەپان ، چاری ناکەم ..! لە ئاوزەنگی دەدەم و هەڵدێم ..
دەبمە گاڵتەجاری ( عەرەبە دەشتەکی یەکان ) ..!
ئـەویش نەی هێشت داڵغە لێدانەکەم دوایی پێ بێنم ، هەڵمەتی بۆ هێنـام و لە سەر زینی ئەسپەکەم خستمیە خوارەوە . شمشێرەکەی خستە سەر ملم . لە ترساندا لە هۆش خۆم چووم ! منیش وەکو منداڵ بە ( ئاوزەنگی ) ئەسپەکەی دا هەڵزنام . ئەویش هەر وەکو چۆلەکەیەك پشت ملی گرتم .
کە خوشکەکەی ئەمەی بینی زۆر خۆشحاڵ بوو . خۆی بڵند کرد، نێوچاوانی براکەی ماچ کرد .
پاڵەوانەیش منی دایە دەست خوشکەکەی و وتی :
خاتری بگرە.. ئەمەیان نمەکی ئێمەی کردووە .
کچەش ، لایەکی قەڵغانەکەمی گرت و وەکو سەگ بە کێشی کردم . کەس بە دەورمانـەوە نەما. لاوەکە لە پشتی ئەسپەکە هاتە خوارەوە . خوشکەکەی شمشێر و قەڵغان و رمەکەی لە براکەی گرت و بەرگی نوێی پاکی بۆ هێنا و بۆی گۆڕی . کورسی یەکی لە داری ساج دروست کراو بۆ هێناو ئەویش لەسەری دانیشت . خوشکەکەی نزای بۆ کردو وتـی :

خوا ئاگای لێت بێت، تۆ چەندە ئازای — لەپەلاماردا ، لە شێوەی بازای
وتـــم : بپرسە لە پاڵە وانان — جەنگت بە هەڵپە و لە قەڵەمبازای
بڵێ ناسراوم ، (سەعد)ە باپیرەم — کوڕی بە جەرگی ئەو پیاوە ژیرەم

ئەی ( ئەبوعماد ) شەڕی شێرت کرد      جەنگێکی گورج و زۆر بوێرت کرد

منیش سەراسیمە بووم . کە خۆیشم بە دیلی بینی : هێندەی دی خۆم لە لا سووك بوو.
کیژەکە خواردنی بۆ براکەی هێنا و فەرموویان لە منیش کرد و زۆرم پێی دڵخۆش بوو .
چونکە تێگەیشتم کە نامکوژن . دواتر، مەی و پیاڵە و شەرابی بۆ دانا . گەشە گرتی و سوور هەڵگەڕا . کاتێ مەست بوو

لێی پرسیم : حەماد تۆ من دەناسی یەوە؟ یان نە ء!؟

منیش وتم :

بەو نمەکەی ماڵت لە جاران گێل تر بووم ... نازانم !

منی کردە هاونشینی خۆی و پێکێکی دایە دەستم . نەخێر کردی بە (٢) پێك .. تاکو منیش مەست بووم . سوێندی دام کە هەرگیز ناپاکیی لەگەڵ نەکەم . منیش بە بار سوێندم بۆ خوارد .

دواتر فەرمانیدا بە خوشکەکەی . ئەویش (١٠) پارچە بەرگی پێ بەخشیم . کە لە ئاوریشم دروست کرابوون . ئەمەی بەریشم یەکێکە لەو بەرگانە .

وتیشی :

یەکێك لە وشترە هەر چاکەکانیشی : پێ ببەخشە . ئەویش وشترێکی بە بارەوە بۆ هێنام کە پڕ بوو لە شتومەکی نەختینەی گرانبەها . لەگەڵ هەندێك خواردەمەنیدا.

ئەمجا وتی : ئەسپە زەردیشی بۆ بێنە .

ئەوانەی هەموو پێ بەخشیم . دو شەویش لایان میوان بووم

دواتر پێی وتم :

کاکە حەماد دەمەوێت کەمێك بنووم . گەر ئەسپێك حیلانی مەترسە . ئەوە هۆزی( بنو یعلبە)ن دێن. تا لەگەڵ مندا بجەنگن ..!!

شمشێرەکەی بێ کێلان ، خستە ژوور سەری و خەوی لێکەوت . شەیتان چووە بن کلێشەمەوە کە بیکوژم ! دواتر.. پەلاماری شمشێرەکەی ژوور سەریم دا و زۆر بە توندی لە ملیم دا، کە سەریم لە لەشی جیا کردەوە . خوشکەکەی رووداوەکەی بینی ، خۆی فڕێ دایە سەر براکەی و یەخەی خۆی دادڕی و قیژاندی و بەم شێوەیە.. براکەی لاوانەوە :

هەواڵی خراپ بەرن بۆ خزمان      هیچ ناگرێ لەگەڵ قەدەری زەمان

تۆیان شەڵاڵی خوێنی خۆت کردو      وەسفی رووت لەلای مانگی ئاسمان

نە ئەسپت سوارەی تری لێ جوانە      نە ژن : هی وەك تۆ دێنێتە : ژیان

کە لەم لاوانەوەیە بووەوە ،بە منیشی وت :

نەفرەت لە باپیرانت ، بۆچی ناپاکیت لەگەڵ کرد؟ لە کاتێکدا ئەو بڕیاری دابوو بە بار و بارخانەوە و بە دەوڵەمەندی تۆ بنێرێتەوە بۆ وڵاتی خۆت دوای ئەوە منت لێ مارە بکات !؟

مستوی شمشێرەکەی لە زەوی چەقاند و خۆی دا بە سەر نووکی شمشێرەکەدا : تا لە پشتی یەوە دەرچوو. منیش تا توانیم گریام و کاتێك پەشیمان بوومەوە کە سوودی نەبوو . هەر چی بە نرخ گران و بەکێش سووك بوو، کۆمکردەوە و سواری ئەسپەکەم بووم و کەوتمە غار کردن . هێندە سەرم لێ شێوا بوو کە بیر و هۆشی ئەوەم نەبوو، ئەو خوشك و برایە بنێژم . یان لانی کەم سەیرێکی هاوڕێکانم بکەم .

کە ( نزهەالزمان ) ئەمەی بیست . دنیا لەبەرچاوی تاریك بوو. پەلاماری شمشێرەکەی دا و دای لە ملی حەماد و سەری لە لەشی جیا کردەوە .

کۆمەڵەکەش پرسیان : بۆچی... بە پەلە ئەم کابرایەت کوشت؟

ئەویش وتی :

سوپاس بۆ خوا کە هێندەی تەمەن پێ بەخشیم .. تۆڵەی خۆم بە دەستی خۆم بسەندم .

فەرمانیشیدا :

دوو لاقی رابکێشن و بیدەنە سەگە برسی یەکان : تا بیخۆن ...!

دوانەکەی تریان بانگ کرد و لە یەکێکیان پرسی :

تۆ ناوت چی یە؟

ئەویش وتی : غەزبان .

ئەویش بەسەرهاتی خۆی و ( ئیبریزە )ی کچی (حەردوب )ی بۆ گێڕانەوە . کە چۆن کوشتوویەتی و هەڵاتووە . هێشتا کۆیلەکە قسەکەی تەواو نەکرد بوو .کە شا( رومزان ) بە شمشێرەکەی سەری پەڕاند .

هاواری کرد :

سوپاس بۆ خوا کە .. تۆڵەی دایکە کوژراوەکەم کردەوە .

بە دەورو بەرەکەیشی وت :

کاتی خۆی کەنیزەکە ( مەرجانە ) هەمان بەسەرهاتی بۆ گێڕامەوەتەوە .

سێ یەمیان خستە قسە . ئەویش وشترەوانەکە بوو. کە کاتی خۆی خەڵکی ( دیمشق ) پارەیان بۆ ضوءالمکان ی نەخۆش کۆکردەوە تا بیبەن بۆ خەستەخانە . ئەویش کە گەیاندی یە ( دیمەشق ) .. لە ( سەرسەلوێنێك )ی گەرماوێك فڕێی دابوو . ( کان ماکان ) کە ئەمەی بیست ، پەلاماری شمشێری لێدا و سەری پەڕاند . سوپاسی خوای کرد کە : خوا هێندەی تەمەن پێداوە تاکو تۆڵەی باوکە نەخۆشەکەی بکاتەوە و وتیشی کاتی خۆی ئەم بەسەرهاتەم لە باوکم بیستووە .

پاشاکان لە نێوان خۆیاندا، کەوتنە وتو وێژ و وتیان :

ئێستا ، تەنیا پیرەژنە ( شەواهی ) ، کە بە( فێڵاوی ) ناوبانگی دەرکردووە . ماوە کە تۆڵەمان لێ نەکردبێتەوە . کە ئەو تەنیا هۆی ئەم هەموو بەڵایە بوو کە بەسەرمان

هاتووه..!!

له خۆیان پرسی : چۆن ، ئەو پیرەژنە فێڵاویەمان دەست بکەوێت؟

شا رومزان وتی : پێویستە ... دەستی خۆمانی بخەین !

بۆیە هەر زوو کاغەز و پێنووسی هێناو نامەیەکی بۆ پیرەژنە شەواهی نەنکی نارد .کە نازناوی پیرەژنە فێڵاوی بوو. تێیدا نووسی بوو:

کە سەرکەوتووە بەسەر سوڵتانی (دیمشق) دا . موصل و عیراقیشی داگیر کردووە و سوپای ئیسلامی تێك شکاندووە . پاشاکانیشی بە ( دیل ) گرتووە . هەروەها نووسی بووی :

پێویستە خۆت و شا (سەفیە)ی کچی شا ( ئەفرەیدون )ی پاشای قوستەنتەنیەیش لەگەڵ خۆت بهێنی . هێندەێکیش لەگەورە سەرکردەکانی ( نەسارا ) . وڵات ئاسایشە چونکە لەژێر دەستی خۆماندایە .

پیرەژنە فێڵاوی کە نامەکەی خوێندەوە بۆی دەرکەوت ، کە بەدەست و خەتی شا( رومزان ) خۆی نووسراوە ، زۆر دڵخۆش بوو. بە پەلە کەوتە کاروان رێك خستن . خۆی و (سەفیە)ی دایکی ( نزهە الزمان)ی ئامادەی سەفەر کرد و کەوتنە رێ . تاگەیشتنە (بەغداد) . تەتەر هەواڵی دا کە گەیشتن .

( رومزان ) شا وتی :

پێویستە ، بەرگی فەرەنگیان بپۆشین ، تاکو پیرەژنە فێڵاوی ، تێنەگات ، فێڵێکمان لێ بکات . ئەوانیش بە قسەیان کرد و جلوبەرگی فەرەنگیان لەبەر کرد .

کە ( قضی فکان )ی بە و جلانەوە، بینینی ، وتی :

بەوەی دەیپەرستن گەر نەم ناسینایە، دەمووت: ئێوە فەرەنگین!!

(١٠٠٠) سوارەی جەنگاوەریان لەگەڵ خۆیان برد و چوونە پێشوازی پیرەژنە فێڵاوی . کە لە یەکتر نزیك بوونەوە شا ( رومزان) لە ئەسپەکەی دابەزی و بەرەو ڕووی پیرەژنە فێڵاوی چوو. باوەشی پیا کرد .

هێندەی گوشیی خەریك بوو ، پەراسووەکانی بشکێنێت .

پیرەژنە وتی : ئەمە چی یە کوڕەکەم ؟

هێشتا پرسیارەکەی تەواو نەکردبوو. کە (کان ماکان) و( دندان )ی گەورە وەزیر بۆیان دابەزین .

نەعرەتەیان لێداو پەلاماریان دان . هەموویان گرتن و بەرەو شاری ( بەغداد )یان بردن . پیرەژنە فێڵاوی سەرئاسنینەیان قۆڵبەست کرد و گێڕایان ، بە نێو خەڵکیدا و جارچی جاری دا: ئەمە سزای ئەو کەسانەیە کە پاشایان و کوڕی پاشایان دەکوژن !

لەبەردەم یەکێك لە دەروازەکانی شاری بغدادا لە سێدارەیان دا. کان ماکان و رومزان شای مامی و نزهەالزمان ودندانی گەورە وەزیر سەراسیمە بوون لەم چیرۆکەی بەسەریان هاتووە

. بۆیە فەرمان درا کە: ئەم بەسەرهاتەش بۆ مێژوو بنووسرێتەوە .
تاکو بخوێندرێتەوە و پەند و ئامۆژگاری لێ وەر بگیرێت .
بەخۆشی و بەختیاری ژیان . تا.. تێکەدەری بەختیاری .. بەفەرمانی خوای باری : گیانی کێشان .
ئەمەش دوا هەوال بوو کە گەیشتبووە دەستمان لە بارەی شا (عمری کوڕی نعمان) و ( شرکان ) و ( ضوءالمکان )ی کوڕی و ( کان ماکان )ی کوڕەزای و ( نزهە ا لزمان )ی کچی و ( قچی فکان )ی کچەزای .
پاشا بە شەهرەزادی وت : حەز دەکەم.. هەندێ لە چیرۆکی باڵندەکانیشم بۆ بگێڕیتەوە.
( دنیازاد )ی خوشکیشی وتی :
هەرگیزهێندە پاشام بەدڵخۆشی یەوە نەدیوە ! یاخوا دوارۆژتان خۆش بێت .
*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو.. بێدەنگ بوو.*

## شەوی ١٤٦

چیرۆکی باڵندەیان و دڕندەیان لە بەرامبەر ئادەمیزادا
شەهرەزاد وتی:
دەگێڕنەوە.. ئەی پاشای بەختیار... گەورەی وەفادار...
لەسەردەمی زوو . ساڵانی ڕۆیشتوو... تاوسێك و هاوسەرەکەی سەری خۆیان هەڵدەگرن و لە نزیك دەریایەك بار و بنە دەخەن کە جەنگەڵ و دارستانێکی چڕ و جۆگە و ڕووبارێکی فرەی بوو. دڕندویەکی زۆریشی بوو.
تاوس و هاوسەرەکەی لە ترسانا شەوانە لەسەر لقی درەخت دەنوستن . تا دەهات ترسیان پتر دەبوو، بۆیە بیریان لە شوێنێکی ئارام و هێمن دەکردەوە . بۆیە هەر ماوەیەك و ڕوویان لە شوێنێك دەکرد . ئەوە بوو ڕێیان لە دوورگەیەك کەوت . ڕەز و باخێکی چڕ و جۆگە و ڕووبارێکی فرەی تیابوو. تێیدا نیشتەجێ بوون ، لە بەروبوومیان خوارد و ئاوی سازگاریان خواردەوە. ڕۆژێك بینیان مراوییە مێیەك ، کە ڕەنگ و ڕووی پەڕی بوو، بە هەڵە داوان بەرەو ڕوویان هات .. کە گەیشتە بن ئەو درەختەی تاوس و ژنەکەی بە سەرەوە بوو، ئارام بووەوە. تاوسە مێ، بێ گومان بوو لەوەی کە ئەم ( مراوی یە مێ )یە بەسەرهاتێکی سەیری هەیە. هۆی ترس وبیمەکەیی لێ پرسی .
مراوی وەڵامی دایەوە :
*پەژارە و ترسی من لە مرۆڤە. بۆ خاتری خوا...خۆتان لە ئادەمیزاد بپارێزن !*
تاوسە مێیش وتی :
تۆ کە گەیشتوویتە ئێرە ، ئیدی مەترسە .

( مراوی یە مێ ) وتی :

سوپاس بۆ خواو ئێستاش حەز بە نزیکیتان دەکەم .

تاوسە مێ لە درەختەکە هاتە خوارەوە و ئەملاولای مراویی مێی ماچ کرد و وتی :

خەمت نەبێت .. ئەم دوورگەیە : هێندە دوورە کە مرۆڤ ناگاتە لامان . ئاخر .. ئێمە لە ناوەراستی دەریادایین . مژدە بێت لە وشکانییەوە کەس ناگاتە لامان ! لە دەریاشەوە ئەوە هەر ناگات !

ئەمجا لێی پرسی :

باشە .. مرۆڤ چی بەسەر هێناویت !؟

( مراوی یە مێ ) وتی :

ئای... دادە تاوس ! بە درێژایی تەمەنم بە ئاسوودەیی لە دوورگەیەکدا دەژیام ! کارێکی خراپیشم نەدی بوو !

شەوێکیان لە خەومدا... مرۆڤێکم بینی و دەسمان کردە قسە کردن و پێی وتم :

خۆت بپارێزە لە ( ئادەمیزاد ) و بە قسە فریوت نەدات ! هەر چی یەکیشت، پیشان بدات ، بڕوای پێ مەکە. چونکە فێڵبازە و فێڵی زۆرە. مەکربازە و خەڵەتێنەرە !

شاعیرێك .. ئاوا بە مرۆڤیدا هەڵداوە :

زمان شیرین دڵنەوازە لە ژێرەوەیش فێڵبازە

ئەوەش بزانە.. نەهەنگیش دەخەڵەتێنێ .. لە دەریـــا دەری ! دێنێ تەقلە بە فیـــل لێدەدا! بە ساچمە زەن راوی پەلەوەر دەکات . نییە لە شەڕەنگێزیی ( ئادەمیزاد ) رزگاری ببێت . نە پەلەوەر، نەئاژەڵ !! وا ئەوەی لە بارەی مرۆڤەوە زانیم : پێم راگەیاندیت و ئێوەیش ئاگاتان لە خۆتان بێت...!

دادە تاوس کە لە خەو راپەڕیم .. خەم و پەژارە دای گرتم ! لەو ساتەوە دڵم تەنگە و لەخۆم دەترسم ورەم بەرداوە و توانام لەبەر بڕاوە و خواردن و خواردنەوەم لێ بێزراوە! بەدڵێکی گوشراوەوە ، هاتمە دەرێ...لە لاپاڵی شاخێکدا بەچکە شێرێکی زەردم بینی. ئەویش کە منی بینی زۆر دڵخۆش بوو . چونکە سەنگین بووم ، رەنگ و روومی پێ جوان بوو. بانگی کردم .

کە لێی نزیك بوومەوە پرسیی : تۆ چیت ؟ ناوت چی یە ؟

منیش وتم : مراویم و لە کۆمەڵەی باڵندەیانم .

منیش لێم پرسی :

هۆی مانەوەت تا ئێستا و لەم شوێنەدا چی یە؟

بەچکە شێر وتی :

لەبەر ئەوەی شێری باوکم ، چەند رۆژێك دەیەوێت بحەوێتەوە لە ( ئادەمیزاد ) بە ئاگای هێناوم . وا رێکەوت ئەمشەو خەونم بە مرۆڤەوە بینی .

دادە تاوس گیان : کە گوێ لە خەونەکەی دەگرم.. هەر ئەوەیە، کە منیش بینی بووم و بۆ تۆم گێڕایەوە !

ئیدی پێم وت :

من بۆیە پەنام بۆ هێناوی کە مرۆڤم بۆ لەناو بەریت و سووریش بیت لە سەر ئەم کارە ! کەچی تۆ منت فرەتر لە مرۆڤ ترساند ! ئاخۆ .. تۆ شای گیانلەبەران نیت !؟

دەستم کرد بە ئامۆژگاری کردنی بەچکە شێر و هانم دا کە ئادەمیزاد بکوژێت . هەر کە ئەمەم وت.... لە جێی خۆی راپەڕی وکلکی خستە سەرشان و کەوتە ڕۆیشتن و منیش بە دوایەوە . تا گەیشتینە دوو ڕێیانێك . سەیرمان کرد تەپ و تۆز بەرز بووە . کەرێکی رووتی بەرەڵلا دەرکەوت . دەمێ خۆی دەهێنایەوە یەك ، دەمێکی دی خۆی دەکێشایەوە .

کە بەچکە شێر تێی خوڕی ، کەرە ملی شۆڕ کرد و هاتە بەردەمی و لێی پرسی :

ئەی ئاژەڵی بێ مێشك .. تۆ لە چ ڕەگەزێکیت و لێرە چی دەکەیت !؟

کەرمیش لە وەڵامدا وتی :

ئەی کوڕە پاشا... من کەرم... لە دەست ئادەمیزاد هەڵاتووم و کەوتوومە ئێرە!

بەچکەشێر وتی :

دەترسیت کە بتکوژێت ؟

کەرەکە وتی :

نەخێر ئەی کوڕە پاشا... لەوە دەترسم فێڵم لێ بکات و سواری پشتم بێت ! چونکە شتێکی هەیە سەر پشتمی دەنێت ناوی ( کورتان )ە و قایشی پێوەیە ... بە ژێر سکمدا دەیبات و دەیبەستێتەوە. ژێر پاڵووی هەیە... دەیخاتە ژێرکلکم ، لغاوی هەیە دەممی پێ دادەخات. ڕەشمە دەکاتە سەرم و غارم پێ دەکات ! گەر هەڵتووتم بە نەفرەتم دەکات . بزمرم : جنێوم پێ دەدات ! کە پیریش دەبم و گوڕ و تینم نامێنێ . ( شەڵتە ) دەخاتە سەرپشتم و دەمداتە دەست ( ئاوکێش )ان و ئاوم پێ بەکێش دەکەن . بە ماندوویی و نابووتی و سەرشۆڕی دەمێنمەوە تا دەتۆپم .. لەسەر گردێك کەلاکەکەم فڕێ دەدەن بۆ ئەوەی سەگ بمخوات ! ئاخر... چی لەم ژیانە نالەبارترە؟

ئەمجا رووی کردە تاوس :

تاوس گیان : کە ئەمەم لە ( کەر )ەکە بیست ، مووچرکە بە لەشمدا هات .

بە بەچکە شێرم وت :

گەورەم... هەر چەند قسەکانی ئەم ( کەر )ە هێندەی تر منی ترساند ، بەڵام لۆمە ناکرێت ؟

بەچکە شێرە لە کەرەکەی پرسی :

ئەی ئێستا بۆ کوێ دەڕۆی ؟

کەرەکە وەڵامی دایەوە :

تاریك و روونی بەیان ... دوور بە دوور ( ئادەمیزاد )ێکم بینی.. بڕیارمدا : هەڵبێم !
هێندە ترساوم ... ئێستاش ئـاوەستم تا ئـەو دەمەی پەنایەکی ئـارامی وا دەدۆزمـەوە ،
کە دەستی ( ئادەمیزاد)ی نەگاتێ . لەو کاتەدا کەرەکە قسەی بۆ بەچکە شێر دەکرد و
دەیویست ، خواحافیزیی لێ بکات .. دوور بە دوور تەپ و تۆزێکمان بینی ، کەرەکە رووی
لە تەپ و تۆزەکە کرد و دەستی کردە زەڕین . دوای کەمێك تەپ و تۆز رەوی یەوەو
ئەسپێکی رەشمان تێدا بینی. نێوچاوان مارۆ... زۆر جوان و سێ پەل سپی و دەست و پێ
جوان . ئەسپەکە بە غاردان هات ، تا گەیشتە بەردەستی بەچکە شێر.
ئەمیش کە بینی رایگرت و لێی پرسی :
تۆ لە کام رەگەزیت؟ بۆچی لەم دەشتە پان و پۆڕەدا... هەڵت تیزاندووە ؟
ئەمیش لە وەڵامدا وتی :
ئـەی شای ئـاژەڵان .. من جوانـــووی بە رەگەز ئـەسپم ، هۆی غـاردانیشم ،
تـرسە لە ( ئادەمیزاد ) !
کتوپڕ بەچکە شێر وتی :
وا... مـەڵێ شـوورەییە !! تۆیـەکی تۆکمـە و درێـژ ... تۆیـەکی لـەش قەبـە وخێـرا لـە
رۆیشتندا.... من بەم لەشەی لە تۆ بچووکترەوە - بڕیارم داوە لەگەڵ ( ئادەمیزاد ) روو بە
روو ببمـەوە! لـە گۆشـتەکەی بخـۆم . تـرس و بیمـی ئـەم مـراوی یـەش برەوێنمـەوە و
بینێرمـەوە وڵاتـی خـۆی ! بـەڵام هـاتنی تـۆ و لـەم کاتـەدا مـنی راچڵەکاند و ناچارم بـە
بڕیارەکەمدا بچمەوە !! تۆیەك بەم تۆکمەییەوە : ئاوا لـە بەرامبـەر( ئـادەمیزاد )دا بـۆڕت
خواردبێت و لـەم توکمەییـەت نەترسێت! ئـاخر.. خـۆ تـۆ.. بـە لەقەیـەکی پاشووەکانت ،
ئادەمیزاد دەکوژێت و شەرابی مەرگی پێ دەنۆشیت !
ئەسپەکە پێکەنینی بە قسەکانی هات و وتی :
هـەیهوو... هـەیهوو... نـەخۆرانم بێـت بەسـەر ئـادەمیزادا زاڵ بـبم ! ئـەی کـوڕە شـای
ئاژەڵان.... بە پان و پۆڕی و قەبەییم فریو مەخۆ...ئادەمیزاد هێندە بە فڕو فێڵە شتێکی
دروست کردووە... ناوی (پێوەن )ە و دوو لاق و دوو دەستمی پێ دەبەستێتەوە بـە یەکـەوە
. لە مووی بزنی ڕێسراو ( بەن ) و لەو بەنەکە گوریس دروست دەکات .. هەر ئەو گوریسە
دەکاتە ملم و بـە سنگێکمەوە دەبەستێتەوە. ئیـدی سـەرم بـۆ شـۆڕ ناکرێتـەوە و نـاتوانم
راکشێم و پاڵ بکەوم ! گەر ویستی سواری پشتم بێت ، دوو ئاوزەنگی بەم دیو و ئـەو دیوی
قەبرغەمدا شۆڕ کردووەتەوە پێی تێ دەخـات و بـە ئاسانی هـەڵ دەقونێتـە سـەر پشـتم و
دوای ئەوەی شتێك دەخاتـە سـەر پـشتم پێـی دەوتـرێ ( زیـن ) بـە دوو قـایش کـە بـە ژێـر
باڵمـدا دەیبـات و پێکیانـەوە دەبەسـتێت . لغـاوی ئاسـنین دەکاتـە دەمـم و رەشمـەی لـێ
دەبەستێت. هەر ویستی سوارم ببێت ، ئەوا دەچێتە سەر زینەکە و رەشمەکە بە دەستی
یەوە دەگرێت و منی پێ لێ دەخورێت ، پێیەکانی کە لە ئاوزەنگیـەکانم دایـە لـە قەبرغـەم

توند دەكات ، تا خوێنی لێ دێنێ . ئەی پاشازادە هەر مەپرسە ، کە چ تاڵاوێك دەكات بە قورگمدا!؟ دواتر کە پیر دەبم و پشتم کوور دەبێت و گوری غاردانم کەم دەبێتەوە.. دەم فرۆشێت ، بە ئاشەوانێك و ئەویش بەرداشم پێ دەگێرێت، ئیدی لە بازنەیەكدا... دەخولێمەوە و دەخولێمەوە تاکو دادەكەوم و هێزم لەبەر دەبرێت ... ئیدی دەفرۆشرێم بە قەساب کە کلکم بۆگەنی کرد ، پێستم دەگرووێت و دەی فرۆشێت بە هێلەك و بێژنگ کەران .

بەچکە شێر پەژارە دایگرت و توند بوو و پرسیی :

دوایەمین جار ، کە ئادەمیزادت تێدا بینی کەی بوو؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی :

ئەم نیوەڕۆیە ، لێی جیا بوومەوە . لەو کاتەوەیش بە شوێنمەوەیە! ئەمان لەم قسانەدا بوون..کە تەپ و تۆز بڵند بووەوە... لە نێو تەپ و تۆزەكە وشترێكی شپرەزە دەرکەوت چوار ناڵەی دەکرد، تا گەیشتە لامان ، هێندە گەورە و تۆکمە بوو .. بەچکە شێر پێی وابوو ئادەمیزادە! ویستی پەلاماری بدات !

نەم هێشت و وتم :

ئەی کوڕە سوڵتان ئەمە وشترە و پێ دەچێت : ئەمیش لە ئادەمیزاد هەڵهاتبێت ! ئەی خوشکە تاوس . کە ئێمە خەریکی گفتوگۆ بووین ، وشترە سڵاوی لێ کردین .

بەچکە شێر وەڵامی دایەوە و پرسیی :

چی تۆی گەیاندە ئێرە؟

*شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.*

## شەوی ١٤٧

شەهرەزاد ئەمشەویش وەکو شەوانی پێشوو لەبەرامبەر پاشادا دانیشتەوەو وتی :

وشترەیش وەڵامی دایەوە : لە ئادەمیزاد هەڵهاتووم !

بەچکە شێر وتی :

ئا.. بەم گەورەیی و پان و پۆڕییەوە؟خۆ تۆ بە لەقەیەك دەیکوژیت! کەچی لێی دەترسی ؟

وشترەکە وتی :

شازادە.. حەز دەکەم بزانیت کە ئادەمیزاد فێڵاویە.. مردن نەبێت ، شتێك نییە چاری بکات ! ئەو پەتێك لە لووتم دەخات پێی دەڵێن : ( لووتەوانە) و هەڵەفەیەکی ئاسنین دەکاتە ملم و رەشمەم دەکات سەرەکەی تری دەداتە دەست بچوکترین منداڵی خۆی . ئەویش وە دووی خۆیم دەخات ، قورسترین بارم لێ دەنێت و درێژترین رێم پێ دەبرێت . شەو و رۆژ ئەمە حاڵمە! کە پیر بووم و تێکشکام ، هاوڕێیەتیم لە بیر دەکات و دەم

فرۆشێت بە قەسابەکان . ئەوانیش گۆشتم دەدەنە چێشت لێنەران و پێستم بۆ پێستەخۆشکەران! هەر مەپرسن .. حاڵم چۆنە بە دەست ئادەمیزادەوە !؟

بەچکە شێر بە سەرسامیەوە پرسیی :

دەمێکە ئادەمیزادت جێ هێشتووە ؟

وشترەکە وەڵامی دایەوە :

ڕۆژئاوا بوون بوو ... هەر چەند دەزانم بگەڕێتەوە و نەم بینێت ! بۆم دەگەڕێت و ڕاوم دەنێت.. توو خوا لێم بگەڕێ .. با..تاکو دەتوانم بەم چۆڵەوانیەدا ، غار دەم !!

بەچکە شێر وتی :

کەمێ هێمن ببەرەوە هەی وشتر... پەیمان بێت ، دەبێت بە چاوی خۆت ببینی ، کە چۆن دەیگرم ! دەبێت لە گۆشتەکەیشیت دەرخوارد بدەم .. ئێسک و پرووسکی تێک دەشکێنم و خوێنی دەخۆمەوە...

وشترەکە وتی :

ئەی کوڕە سوڵتان..گومانم لە توانای تۆیش هەیە لە بەرامبەر ئادەمیزادا! ئەو فێلبازەو فریودەر.

سێبەر قورس لە ناو خێلا ماڵی بێ       وڵات لە خێوی دەبێ خاڵی بێ

لە کاتی ئەم گفتوگۆیەدا... دیسان تەپ و تۆز لە دوورەوە بڵند بووەوە! دوای سەعاتێك ... کورتەباڵایەکی پیری پێست ناسك دەرکەوت . سەبەتەیەکی خستبووە سەرشانی شمەکی دارتاشیی تێدابوو...

(٨) پارچە تەختەی لە سەر سەرنابوو. چەند منداڵێکیش دەستیان گرتبوو . بەخێرایی هەنگاوی دەنا. هات .. هات .. تا گەیشتە بەچکە شێر.

دادە تاوس هەر کە ئەم دیمەنەم بینی ، لە ترسا کەوتم ! بەچکە شێر لێی نزیك بووەوە .

پیرە بۆی پێکەنی و بە زمانێکی پاراو وتی :

*ئەی پاشای بە ئاگا.. دەستت بە هەموو شت ئەگا. کارت بە بەرهەم بێ.. ئازایەتیت وێنە کەم بێ! ئەم سەر ئێشەیەم ببڕە... ئەم کێشەیەم لەخۆ بگرە..! لە تۆم پاڵپشت تر نەدۆزیەوە.*

کەوتە ناڵە و سکاڵاو گریان .

بەچکە شێر کە ئەمەی بیست و بینی وتی :

وا.. پەنام دایت ! ئەی زیندەوەر.. بێخەم ببە ، لەوەی لێی دەترسیت..! بڵێ : تۆ کێیت و کێ زوڵمی لێ کردووی ؟ ئەی ئەوەی.. تا ئێستا لە تۆ جوانتر و زمان پاراوترم نەدیووە !

دارتاشەکەیش وتی :

ئەی پادشای ئاژەڵان ، من دارتاشم و ئەوەی .. زوڵمی لێ کردووم.... ئادەمیزادە !! سبەی بەیانی هەر لێرەدا روو بە ڕووت دەبێتەوە . بەچکە شێر... ڕەنگی گۆڕا..

دەستەکانی لە زەوی راداو مراندی و گڕ لە چاوانی دەبووەوە..!

ئەمجا نەڕاندی :

بەو خوایە.. ئەمشەو شەونخوونی دەکێشم! ناگەڕێمەوە لای باوکم.. تادەگەمە مەبەستم !

بەلای دارتاشدا وەرگەڕا و وتی :

هەنگاوەکانت کورت دەبینم . لە رۆیشتندا لەگەڵم دەرناچیت ... ناشمەوێ دڵت بشکێنم . بەرەو کوێ دەڕۆیت ؟

دارتاشەکە وەڵامی دایەوە :

بۆ دیوەخانی شێری باوکت هاتووم . چونکە بیستبووی : ئادەمیزاد پێی ناوەتە سەر ئەم زەویە.. لە خۆی ترسابوو ، بۆیە تەترێکی ئاژەڵی ناردە لام ! تاکو خانوویەکی وای بۆ دروست بکەم...کە تێیدا بحەوێتەوە و هەم لە دوژمنیشی پارێزراو بێت و دەستی ئادەمیزادی نەگاتێ ! ئیدی منیش ئەم شمەك و چەند پارچە تەختەیەم هێناو هاتم بۆ لای... تاکو بە هانایەوە بچم .

بەچکە شێر ئیرەیی بە باوکی بردو وتی :

ئەو خانووە ، بەم پارچە تەختانە لە پێشدا بۆ من دروست بکە و دواتر بۆ باوکم .

دارتاشەکە وتی :

ئەی شای ئاژەڵان ، تا لە خانووی باوکت نەبمەوە ، ناتوانم هیچت بۆ دروست بکەم ! دواتر دێمە پەزێراییت و خانوویەکیش بۆ تۆ دروست دەکەم. تاکو لە دوژمنانت بپارێزێ !

بەچکە شێر وتی :

بە خوا ناهێڵم بڕۆیت ، تا بەو تەختانە خانوویەکم بۆ دروست نەکەیت !

بە گاڵتەوە هەڵمەتی بۆ دارتاشەکە برد.. ئەویش بوورایەوە وکەوت .

بەچکە شێر دایە قاقا پێکەنین و وتی :

نامەردت نەکەن .. چەندە لاوازیت !؟ لۆمە ناکرێیت : گەر لە ئادەمیزاد بترسیت !

دارتاشەکە هەر چەند تووڕە بوو، بەڵام دەری نەبڕی..

پەنای بردە بەر فێڵ و بە رووی شێردا پێکەنی و وتی :

هەر ئێستا خانووەکەت بۆ دروست دەکەم .

شمەك و پارچە تەختەکانی هێناو کەوتە دروست کردنی .. بە هێندەی بەچکە شێر و دەرگایەکی بۆ هێشتەوە. وەکو سندوق وا بوو . دەلاقەیەکی گەورەی تیا کردەوە . بزمارەکانی پیا داکوتی کە سەرە تیژەکەی لە ناوەوەی تەختەکە دەرچوو بوون .

پیرە بە بەچکە شێری وت :

*ئێستا لەم دەلاقەیەوە بچۆ ژوورەوە ، تا بە خۆتی بپێوم.....*

بەچکە شێر بە دڵخۆشی یەوە لە دەرگاکەوە چووە ژوور. بەڵام کەمێ پێی تەنگ بوو.

دارتاشەکە وتی :
لەسەر ئەژنۆ و ئانیشك خۆتی پیا بکە .
بەچکە شێر بە قسەی کرد بەڵام هێشتا هەر کلکی لە دەرەوەبوو..ویستی بە دوادا بێتەوە دەرێ .
دارتاشەکە وتی :
پەلە مەکە.. با بزانم جێی کلکت ناکەمەوە !
ئەویش بە قسەی کرد. دارتاش کلکی بەچکە شێری لوول کرد و فرێی دایە سندوقەوە.
پارچە تەختەی بە سەر دەرگاکەدا.. داکوتا و بزمار ڕێژی کرد.
بەچکە شێر لە ناوەوە هاواری کرد :
ئەی دارتاش.. ئەم خانووە تەنگەبەرە چی یە؟ بیکەرەوە با .. بێمە دەرەوە.
دارتاش لەوەڵامدا وتی:
*هەی هوو.... پەشیمانی دادت نادات ! جارێکی دی دەرەوە نابینیت ! تۆ... کەوتیتە داوەوە و دەرچوونت نییە.. ناشیرین !*
بەچکە شێر وتی : ئەمە چ قسەیەکە.. براکەم ؟
دارتاشەکە وەڵامی دایەوە :
ئەی سەگە دەشتەکی تۆکەوتوویتە ئەو داوەوە کە لێی دەترسایت! خۆت بۆ نەپارێزراو ئەمە قەدەرتە. گەورەم .. خوا راوەستاوت بکات ..
( مراوی یەمێ ) دەستی پێکردەوەو وتی :
خوشکە تاوس هەر ئەوەندەی لە بەچکە شێر ئەم قسانەی بیست ، بۆی دەرکەوت کە ئەمەی بە سەری هاتووە بە هۆی ئادەمیزادەوە بووەو چەندین جاریش باوکی ئاگاداری کردۆتەوە لە مەترسیەکانی مرۆڤ . منیش لە دڵم چەسپی بوو، کە خۆیەتی، بۆیە کەمێك خۆم لێیان بە دوور گرتبوو..! چاوەڕێی ئەوەم دەکرد بزانم چی بە سەر بەچکە شێر دێنێت !؟ ئای خوشکە تاوس .. بینیم چۆن مرۆڤەکە لە تەنیشت قەفەزەکەوە...... چاڵێکی لێدا و قەفەزی بە بەچکە شێرەوە خستە ناویەوە! چیلکە و چەوێڵی کردە سەری و گڕێ تێ بەردا! ئیتر منیش کە ئەمەم بینی، ترسەکەم گەورەتر بوو.... ئێستایش ئەوە دوو رۆژە بەڕێوەم !
کە تاوس ئەمەی لە مراویە مێ بیست... زۆر سەری سوڕماو وتی :
خوشکێ تۆ ئێستا لە دوورگەیەکدایت ! لە نێو دەریادا ، هێشتا مرۆڤ دەستی پێی نەگەیشتووە ئاسوودە بە ! شوێنێ بۆ خۆت هەڵبژێرە . خوایش کار ئاسانی بۆ تۆ و ئێمەش دەکات .
مراوی یە مێ وتی : دەترسم لە دەروازەم بدرێ ... شاراوەیش بم بمخاتە دەرێ !
ئەمیش وتی :

بمێنەوە ، تۆش وەکو ئێمە ، پاڵی لێ بدەرەوە.
لەسەر ئەم گفتوگۆیە رۆیشتن ... تا مراوی وتی :
خوشکێ تۆ.. بێ ئارامیی من دەزانیت .. تۆم لێرە نەدیبایە... نەدەمامەوە !
خانمی تاوس هەڵیدایە :
چی لە نێو چاوانمان نووسرابێت.. ئەوە دێتە رێمان . کەسیش ناتوانێ خۆی لە مردن رزگار بکات.
لەم وتووێژەدا بوون... گێژەڵووکە و تەپ و تۆزێك بەرپا بوو. مراوی یە مێ لە ترساندا قیراندی و خۆی فڕێ دایە .
دەریاوەو وتی :
*هەر چەند کەس بە قەزا و قەدەری خۆیدا ناگا.... بەڵام بەئاگا بە ، بەئاگا...!!*
کە تەپو تۆز رەوی یەوە : ئاسکێك دەرکەوت و ئەمانیش هێمن بوونەوە...
تاوس بە مراوی یە مێی وت :
ئەوەتا...خوشکێ ئەوەی منت لێ بە ئاگا هێنایەوە ( ئاسك ) بوو. وا بەرەو ئێمەش دێت . هەر وەکو چۆن تۆ لە رەگەزی باڵندەی ، ئەویش.. گیاخۆرە.. درندە نییە ! گوێ مەدەرێ و خەم مەخۆ با لاوازتر نەبیت !
هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو، کە ئاسکەکە گەیشتە لایان .
چووە بن سێبەری درەختەکە و سڵاوی کردو وتی :
ئەمرۆ گەیشتوومە ئێرە ، شوێنی وا.. بە پیت و بەرەکەت و لەبارم نەبینیوە ! حەزیشم بە هاورێیەتیتانە .
ئەمانیش پەسەندیان کرد و باوەشیان پێدا کردو بڕیاریان دا خواردن و خەوتنیان پێکەوە بێت . بەو شێوەیە مانەوە ، تا ئەو دەمەی پاپۆڕێکی رێ ون کەر بە لایاندا تێپەڕی و لە نزیکیانەوە لەنگەری خست . سەرنشینەکانی دابەزین و بەو ناوەدا بڵاو بوونەوە ، کە کۆ بوونەوەی ئاسك و تاوسو مراوی یەیان بینی بۆیان چوون . تاوسە و مراوی فڕینە سەر درەختەکە و لەوێیشەوە فڕین و بۆی دەرچوون .ئاسکەکەیش ، کەوتە راکردن و بۆی دەرچوو. ئەوانیش شوێن مراوی یە مێ کەوتن تاکو گرتیان .
مراویەکەیش بە دەستی مرۆڤەکانەوە قیڕاندی :
*خۆ پاراستن لە قەزاو قەدەر : بێهوودەیە !*
کە تاوس ئەم رووداوەی بینی بڕیاری دا دوورگەکە بەجێ بهێڵێت و وتی :
*وای : دەبینم بەڵا، لە پارێزی هەر یەکەماندایە ! ئەم کەشتی یە نەبوایە : لەیەك جیا نە دەبووینەوە، ئاخر ئەو مراوی یە لە هاورێ چاکەکان بوو.*
فڕی ، فڕی تاکو ئاسکەکەی دۆزیەوە و سڵاوی لێکرد و ئەحواڵی مراوی یەی لێ پرسی .
ئەویش لە وەڵامدا وتی : گرتیان و بردیان .

ئیتر منیش دوای مراوی دوورگەکەم لەبەر چاو کەوتووە.
بە دەم گریانەوە وتی :
**خوایە جەرگی ئەوە ببڕی     هاوڕێکەمی لێم دابڕی**
ئاسکەکە پەژارەیەکی فرە ، دایگرت .. زۆری لەگەڵ تاوس وت . تا.. رازی بوو، بار ئەکات و ئەڕوات . ئیدی پێکەوە مانەوە، ژیانێکی ئاسوودەیان دەگوزەران، بەڵام ، هەر پەژارەی دابڕانیان لە مراوییە مێ لە دڵا مابوو.
جارێکیان ئاسکەکە بە تاوسەکەی وت :
خوشکێ ئەوە بوو زانیمان سەرنیشینانی پاپۆڕەکە، هۆی دابڕانی ئێمە و مراوی بوو. هەمیشە هۆشت بە خۆت بێت ... بەئاگا بە .. خۆت لە فرو فێڵی ئادەمیزاد بپارێزە..!
تاوسیش وتی :
بێگومان ، واز هێنانی لە خواپەرستی و تەسبیحات ، ئەو بەڵایەی بەسەر هێنا.
ئاسکەکەیش وتی : خوا ... هەموو دەم جوان و جوانترت بکات !
ئەمیش دەستی کردە خواپەرستی و تەسبیحات و وازی لێ نەهێنا. لە بارەیەوە دەڵێن هەر : سبحان الملك الديان .. ذي الجبروت و السلطان ی لەبەر خۆیەوە دەوت و دەوتەوە .
شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو... بێدەنگ بوو.

**شەوی ١٤٨**

جەرزکی شوانەی خواپەرست
شەهرزاد وەکو شەوانی ڕۆیشتوو ، بەرامبەر شا شەهرەیار دانیشتەوەو وتی :
دەگێڕنەوە : جەند.. خوا پەرستێك ، لەو شاخانەدا خەریکی خواپەرستی بوون. هەر لەو شاخەدا دوو کۆتریش هەبوو. خواپەرستەکە، کارو ماندوو بوونی بۆ خۆی و ئەم جووتە کۆترە بوو. نزای بۆیان کرد و بەچکەیەکی زۆریان لێ کەوتەوە. بە هیچ لایەکی دیدا نەدەچوون! خواپەرستەش، لەبەر زکر و تەلیلەیان هۆگریان بوو بوو. تەسبیحاتەکەشیان : پەنا بەخوای دروستکاری دروستکراوان بوو و دابەشکاری ڕۆزیی ... دروستکاری ئاسمانان و ڕاخەری زەوی بوو..
کە خوا پەرستەکە مرد، کۆترەکان بەو شاخ و دۆڵەدا بڵاوەیان لێکرد. لە نێو شاخانەدا شوانێك بوو، بڕوادار و ژیر و پاك . ڕانە مەڕێکی بوو، دەی لەوەڕاند . سوودی لە شیر و خوریەکانی وەردەگرت . ئەو شاخەی ئەم شوانەی لێبوو ، لەوەڕگا و دارو درەختێکی زۆر و شیرێکی فرەی هەبوو. شوانە بێخەم بوو لە ڕانەکەی چونکە.. بە ڕانەکەی ئەمیان نەدەوێرا..!! ئەمیش خەریکی خواپەرستی و کارکردن بوو بۆیە... زۆر بەختیار و ئاسوودە

بوو. شوانە نەخۆش کەوت و چووە ئەشکەوتێکەوە ڕانە مەڕەکەیش ، ڕۆژانە دەچووە لەوەڕ و شەوانە دەهاتەوە بەردەم ئەشکەوتەکە.. یەزدان ویستی تاقی بکاتەوە.. ڕێگەی بە شەیتان دا لە شێوەی ژندا بچێتە ئەو ئەشکەوتەی شوانەکەی لێ بوو . کە شوانە ئەو ژنە جوانەی بینی : مووچڕکە بە گیانیدا هات .

لێی پرسی : ژنەکە ..چی تۆی هێنایە ئێرە ؟ خۆ... هیچ شتێک لە نێوانماندا نییە!

ژنە لە وەڵامدا وتی :

لای تۆم هەڵبژارد .. حەزم لێتە..! تۆ پێویستت بە خزمەتی ژن هەیە .. منیش لە قسەت دەرناچم !

شوانە وەڵامی دایەوە :

بڕۆ دەرەوە.. فریودەری غەدار ! پێویستم بە نزیک بوونەوەی تۆ نییە ! ئەوەی تۆی بوێ .. دواڕۆژی نابێت . ئەوەشی لە تۆ دوور بێت : دواڕۆژی مسۆگەرە ! تۆ فیتنەی سەرەتا و کۆتایی... هیچ لە خوا ون نابێت . واوەیلا بۆ ئەوەی هاوسەرێتی تۆ دەکات .

ژنەکەیش وتی :

ئەی بەرەڵای ناتەواو... لە ڕاستەڕێ ترازاو... سەیرم بکە..مرۆڤانی پێش تۆ..لە تۆ بە ئەزموون و وریاتر بوون . کەچی چێژی ژیانیان کرد، لە کاتێکدا تۆ... خۆتی لێ دەگریتەوە ! ئەو کارانەشیان کە لەگەڵ من دەیانکرد و تۆ بەکاری خراپیان دەزانیت .. لە دنیا و دینیان نەکردن ! چاکتر وایە پەشیمان بیتەوە !

شوانە وتی : ئەوانەی تۆ باسی دەکەیت : من ڕقم لێیانە... تۆ غەدار و فریو دەریت.. وەفات نییە! چەند ناشیرینیت ، لە جوانیتا حەشارداوە؟ چەند پیاو چاکت فریو داوە و کۆتاییان بە پەشیمانی و دۆڕاندن هاتووە؟ وازم لێ بێنە : ئەی ئەو کەسەی خۆت ڕازاندۆتەوە ... بۆ تێکدانی بەرامبەرت .

بە چمکی کەواکەی سەری خۆی داپۆشی و دەستی کردە : ویرد خوێندن . خوا.. کە پاکی شوانەی بینی.. شەیتانی لێ دوور خستەوە . لە دێ یەکی نزیک شوانەدا.. خواپەرستێک بوو. لە خەونیدا پێیان وت : لە نزیکتەوە .. ( پیاوچاک )ێک هەیە، بچۆ بیدۆزەوە و لای بمێنەوە و لە خزمەتیدا بە..! کە ڕۆژ بووەوە، شوانە کەوتە ڕێ. گەرما زۆری بۆ هێنا.. چووە سەر کانی و ئاوێ.. کە درەختێک سێبەری بۆ کردبوو. باڵندە و ئاژەڵ و درندەکان بەرەو : ئەو کانی و ئاوە.. بۆ ئاو خواردنەوە دەهاتن. کە شوانەیان دەبینی سڵیان دەکرد و دەگەڕانەوە.

بۆیە شوانە لەبەر خۆیەوە وتی :

*لاحول ولاقوە الا باللە... حەوانەکەم لێرەدا بۆتە مایەی زیان بۆ... باڵندە و ئاژەڵان .*

هەستا و سەرزنشتی خۆی کرد. ڕوو زەرد خۆم بۆ ئەو ڕۆژەی : کە یەزدان حەقی بزنی بێ شاخ بە سەر شاخدارەوە ناهێڵێت ! بە دەم گریانەوە وتی :

ئەرێ بە خوا ئەگەر خەڵکی زانیبا بۆ دروست بوو؟ بێ خەم لە خۆی نەدەما
مردنێکە و ژیاننەوە و لێ پرسین ! ترساندن و سزایش وا لە بەر دەما
چەند زیرەك بێ و بلیمەتی ئاوازە وەك اهل الكهف زیندەیی بێ خەبەر ما
دیسان دەستی کردەوە بە گریان . کە چۆن بۆتە هۆی ئاو نەخواردنەوەی ئاژەڵان و باڵندەیان ، درێژەی بە رۆیشتنەکەیدا. تا گەیشتە لای شوانە سڵاوی لێ کرد . باوەشی پیا کرد و گریا!
شوانە لێی پرسی : کەس نەهاتووەتە ئێرە... چی تۆی گەیاندە ئێرە ؟
خواپەرستیش وتی :
لە خەونمدا ئێرەیان پێ وتم و فەرمانیان پێ دام منیش کارەکەم جێبەجێ کرد .
شوانە ئەملاولای ماچ کرد، دڵی پێی کرایەوە ، پێکەوە لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە، بە بەروبوومی رانە مەڕەکە دەژیان و دەستیان لە ماڵ و منداڵ و دنیا شت . تاکو خوا : بردنیەوە بۆ خۆی .
شا( شەهرەیار ) بە ( شەهرەزاد )ی وت :
تۆ ماڵ و موڵك و سامانی دنیات لەبەر چاو خستم ، پەشیمانت کردمەوە لە کوشتنی ئەو هەموو ژنانەم ، ئەی هیچ دەزانیت : لەبارەی باڵندەکانەوە؟
ئەویش وتی : بەڵێ... گەورەم ..
شەهرەزاد هەستی کرد شەو وەرەنگ بوو.. بێدەنگ بوو

**شەوی ١٤٩**

## چیرۆکی باڵندەی ئاوی و کیسەڵ

شەهرەزاد وتی :
ئەی شاشەهرەیار.. خاوەنی بڕیار..
دەگێڕنــــەوە .. باڵندەیەکی نێو باڵندەکان ، لە ئاسماندا بەرزە فڕیی کرد. بە گوژم داهاتەوە بۆ تاشە بەردێکی نێو رووبار.
باڵندەکە هێشتا بەسەر بەردەکەوە بوو کە لە سەردا لاشەی مرۆڤێکی هەڵئاوساو ، ئاوەکە هێنای و بە بەردەکەوە گیرسایەوە. باڵندەکە بۆی دەرکەوت ئەو مرۆڤە بە رم کوژراوە و بە شمشێر لێدراوە و رمە چەقیوەکە هێشا بە جەستەیەوەیەتی .
بۆیە لەدڵی خۆیدا وتی :
رەنگە پیاو خراپ بوو بێت و خەڵکی لێ کۆبوبنەوەو خۆیان لەئازاری رزگار کرد بێت. باڵندەی ئاوی هێشتا سەراسیمە بوو کە بینیی چەند هەڵۆ و داڵ ئەملاو لایان لێ گرت : تا بیخۆن .

زۆر ترساو بە خۆی وت :

ئیدی ، لێرە جێگام نابێتەوە.

دای لە شەقەی باڵ و کەوتە گەڕان ، بە دوای شوێنێکدا تا تێیدا نیشتەجێ ببێ . تا
کێشەی ئەو لاشەیە کۆتا دەبێت ، دڕندە پەیدا دەبێت و هەڵۆ و داڵەکان راو دەنێت . لە
نێو رووبارێکدا، درەختێکی دۆزیەوە . لە سەری نیشتەوە و غەمبار بوو.

لە دڵی خۆیدا وتی :

تەماشا چۆن خەم بە شوێنمەوەیە؟ ئەو لاشەیەم لە دوورەوە بینی وتم : دەنگ مەکە
رۆزیی یە و خوا ناردوویەتی . بەڵام ئەم داڵ و هەڵۆیانە ئەم خۆشی یەیان لێ کردم
بەخەم . جا .. چۆن خوازیاری بێەوەیی بم لەم دنیایەدا؟ ئەوە نییە وتوویانە : دنیا
ماڵی بێماڵانە... ئەو گێلانەی پێ فریو دەخۆن کە ماڵ و منداڵ و خزم و هۆزیان هەیە .
فریو خواردووان خۆیان با دەدەن بە سەر زەویدا.. تا دەچنە ژێر زەوی . کەسانێك خۆڵ
دەکەنەوە بە سەریدا ، کە خۆشەویستی بوون . لە هەموو شتێ باشتر بۆ هەرزەکاران ، لە
کاتی خەم و مەینەتیەکانیدا هێمنی و لەسەرخۆ بوونە .. هەر چەند حەزم بە دووری
خزم ودۆستانیش نەبوو ، بەڵام وا جێگا و نیشتمانم گۆڕی .

لەم بیرکردنەوەیەدا بووکە نێرە کیسەڵێك بە مەلە هات و سڵاوی لێ کرد و وتی :

گەورەم چی تۆی ئاوارە کردووە؟

باڵندەی ئاوی وەڵامی دایەوە :

*هاتنی دوژمنان . چونکە هیچ خاوەن ئاوەزێك لەگەڵ دوژمنیدا هەڵناکات !*

شاعیران جوانیان وتوە :

تۆ رەزا قورسێك ئاوا لەکۆڵ کەی     دیارە کە دەبێت : ماڵی بۆ چۆڵ کەی

( کیسەڵ ) پێی وت :

گەر وا بێت وا لەبەر دەستتدام ، لێت جوێ نابمەوە ، لە پەزێراییتدا دەبم . چونکە
وتراوە : *هیچ نامۆ بوونێك ، بە هێندەی نامۆ بوون لە خزم و خوێشان ونیشتمان سەخت
نییە !*

هەروەها وتراوە :

دابڕان لە کەسانی چاك ، هیچ بەڵایەکی ناگاتێ ! چاکترین تەسەلای ژیرانیش خۆ
*ڕاهێنانە لەسەر نامۆ بوون و ئارام بوون لە بەرامبەر بەڵادا.* خۆزگە هاوڕێیەتی منت لا
پەسەند دەبوو ، تا منیش ببوومایە ، خزمەتکار و پاڵپشتت .

کە باڵندەی ئاوی گوێی لە قسەکانی کیسەڵەکە بوو پێی وت :

راست دەکەیت لەدابڕان بە خەم و بە ئازارترم نەبینیوە. چونکە دابڕان بۆخۆی
پەندی لێ وەر دەگیرێت و بیر بە هێز دەکات . پێویستە ژیران: خوو بدەنە هاوڕێکانیان ،
غەمیان بە بادەن ، ئارام و خۆڕاگر بن. چونکە ئەم دوانە سیفەتی چاکن بۆ شان دانە بەر

گورزەکانی زەمانە و ترس و بیم دەڕەوێنێتەوە.

کیسەڵەیش وتی : بێ ورە مەبە . چونکە ژیانت تاڵ دەکات و کەسێتیت دەکوژێت .

قسەیان بۆ یەکتر دەکرد، تا باڵندەی ئاوی بە کیسەڵی وت :

من ئێستاش لە بەڵا و رووداوی زەمانە دەترسم !

کیسەڵ باوەشی بە ملیدا کرد و ناوچەوانی ماچ کردو پێی وت :

باڵندەکان بەتۆوە پیرۆزن.پرس و رات پێدەکەن و خێرت لێ دەبینن! چۆن غەم و پەژارە پێت دەوێرن ؟

هێندە دڵی باڵندەی ئاویی دایەوە، تاکو هێور بووەوە دواتر، دای لەشەقەی باڵ بەرەو شوێنی لاشەی مرۆڤەکە بووەوە . بینی تەنیا چەند ئێسقانێك نەبێت ، نەباڵندە گۆشتخۆرەکانی لێماوە و نە شێرەکان ، دیسان گەڕایەوە لای کیسەڵەکە و پێی وت :

دوژمنەکان لەوێ نەماون .

ئەمیش وتی :

ئەزانی حەز دەکەم بگەڕێمەوە شوێن و جێی خۆم ، تاکو تاسەم لە دۆست و هاوڕێیانم بشکێت . ئاخر ژیران ناتوانن دوورە وڵات بژین !

ئیتر گەڕانەوە شوێنی خۆیان و شتێك نەمابوو لێی بترسن .

باڵندەی ئاوی ئەم دوو دێڕەی بە گۆرانیەوە وت :

رەنگە میوانێ کە هی ناوەخت بێ بۆ خانەخوێکەی: شانس و بەخت بێ

رۆژێ بێت کێشەت بەو چارە ببێ و کۆسپی سەرە رێت بە ئەو تەخت بێ

لە دوورگەکەدا مانەوە . لە کاتێکدا باڵندەکە ئاوی دەخواردەوە بەختەوەر و ئاسوودە بوو. قەزا و قەدەر بازێکی برسیی لێ پەیدا بوو و پەلاماریدا و ورگی دڕی و کوشتی . بە ئاگا بوون دادی نەدا، چونکە رۆژی تەواو بوو بوو. هۆی تیاچوونەکەیشی دیارە پشتگوێ خستنی زیکر و فیکری خوا بوو .

شا[illegible] وتی :

ئەی [illegible] ، بەم چیرۆکەت پەندو ئامۆژگاری زۆرت کردم. ئەی چیرۆکی دڕندەکانت لا نییە؟

شەهرەزاد وتی : بە چاوان .

شەهرەزاد هەستی کرد شەو درەنگ بوو ... بێدەنگ بوو.

## شەوی ١٥٠

## چیرۆکی گورگ و رێوی

شەهرەزاد وتی :

ئـــەی شاشەهرەیار ... رووخۆشی بەختیــار ...

دەگێڕنــەوە : گورگ و ڕێوییەك کونێکیان کردە کولانە و پێکەوە شەوانیان تیا بەسەر دەبرد . ماوەیەك پێکەوە مانەوە .

جارێکیان ڕێوییەکە ئامۆژگاریی گورگەی کرد، کە نەرم و نیان بێت و لە خراپە دوور بکەوێتەوە و پێی وت :

گەر لە سەر ئەم لوت بەرزیـەت بمێنیتـەوە ، رەنگە خوا مـرۆڤ بنێرێتـە گیانت . جا مرۆڤ فریـودەر و فێڵبـاز و خەڵەتێنـەرە . باڵنـدە بـە ئاسمانـەوە راو دەکات !! نەهەنگ لە دەریا دەردێنێت !! شاخ دەبڕێت ، لەم شوێنەوە بۆ ئەو شوێن دەڕوات . ئـەویش بـە هۆی فێڵ و فریودانەوە دەژی!! بۆیە پێویستە لە سەرت نیان و بـە ویـژدان بیت . شـەرەنگێزی واز لێ بێنە ، تاکو ژیانت خۆش ببێت .

گورگە ئامۆژگاریەکانی بە دڵ نەبوو و بە تووڕەیی یەوە وتی :

چیتە وا قسەی زل دەکەیت ؟

مشتەکۆڵەیەکی کێشا بەقەپۆزیـدا.. ڕێوی یـە ، بووراپـەوە . کاتێـك هۆشی هاتـەوە بـە پێکەنینەوە داوای لێ بووردنی کرد و ئەم شیعرەی بۆ خوێندەوە :

گەر راستگۆییم و قسەی روو بە ڕوو      لای تۆ خراپە و کەمێ بڕشت بوو

وا تۆبەم کرد و تۆش من ببەخشە      جاران لێ بووردەمیش زۆر بە رەوشت بوو

گورگەکە لە ڕێوییە خۆش بوو. ئیدی ڕێوی ئازار نەدا و پێی وت :

لە کاری خەڵکی خۆت هەڵقورتێنی      پەرچەکرداری باشە نابینی

ڕێوی یەیش وتی :

بەسەر چاو. ئیدی شتێ ناڵێم بە دڵت نەبێت .

زانایان وتویانە ... هیچ مەڵێ ، تاکو: رووت تێ نەکەن و لێت نەپرسن . قسە مەکە و ئەوەی مەبەستت نییە .. بیگۆڕە بۆ ئەوەی مەبەستتە . ئامۆژگاری پیاوخراپان مەکە ، با خراپەیان لێ وەر نەگریتەوە .

ڕێوی بە رووی گورگەدا پێکەنی و لەدڵی خۆیدا وتی :

*دەبێت تەقەلا بدەم ، ئەم گورگە لەناوبەرم..!*

خۆی لەبەر ئازاردانی گورگەکەدا گرت و بە خۆی وت :

وتراوە : لە راستی لادان .. دەبێتە مایەی زیان . ئەوەی نەزانە... هەمیشە پەشیمانە . ئەوەی دەترسێ قـەت ناخەلەسێ . ویـژدان سیفەتی پیـاوی گەورەیـە . بـە رەوشت بـوون باشترین پاشەکەوتە . دەبێت بگونجێم لەگەڵ ئەم ملهوڕەدا. رۆژێك دێ .. ملی بشکێت !

ڕێویەکە وتی :

خوا لە گوناهبار خۆش دەبێت و لێبووردەیە لە تاوانبـاران . منـیش بەندەیـەکی لاوازم لە بەرامبەر ئامۆژگاری کردنیدا : توند و تیژیم وەرگرتەوە . هـەر پێـشی نازانێـت : فیل

بەرگەی مشتەکۆڵەکەی نەدەگرت . سکاڵایش ناکەم ، چونکە پێی دڵشاد بووم .

زانایەك وتویـــەتی :

*لێدان لە رەوشت داران هەر چەند سەرەتا ناخۆشە بەڵام لە دواجاردا لە هەنگوینی پاڵاوتە شیرین ترە .*

گورگەیش وتی :

لە هەڵەکەت خۆش بووم . وەرە لای خۆم و دان بە کۆیلەیەتی خۆتدا بنێ . وا رق و تووڕەیی منت لە بەرامبەر بەرهەڵستکاریمدا بۆ دەرکەوت .

رێوی کڕنوشی بۆ برد و وتی : تەمەن درێژ بێت ، ئێستاش دوژمن شکێنیت ! ترسی رێوی لە گورگە سەرومڕ بوو.

رۆژێکیان رێوی رەزێکی بینی هەندێ لە دیوارەکەی داڕوخابوو و لەدڵی خۆیدا وتی :

ئەم داڕوخانە : شتێکی تیایە ! لە پەندی پێشیناندا بیستوومە گەر کەسێك چاڵێکی لە زەویدا بینی و خۆی لێ نەپاراست . ئەوە بەخۆی دەنازێت ، ئەگەری تووش بوونی دەرد و بەڵای هەیە ! وا بڵاوە ، کە خەڵکانێك وێنەی رێویان کردووە و چەند بۆڵ ترێیان بۆ داناوە . کە رێوی بۆ خواردنی چووە ، کەوتۆتە تەپکەکەوە و تیاچووە...!! وای دەبینم ئەم شوێنە داڕوخاوە ، فێڵێکی وەکو تەڵە و تەپکەکە بێت !

لە پەندی پێشیناندا هاتووە :

*ترس لە ئازایەتیەوەیە ! با بە وریاییەوە سەرنجی ئەم کەلەبەرە بدەم ، رەنگە فێڵەکەیم بۆ دەرکەوێت . تەماع فریوم نەدات و تووش ببم .*

لە کەلەبەری دیوارە پەرژینەکە ورد بووەوە، بەو ناوەدا گەڕا. بۆی دەرکەوت ئەمە چاڵێکە بەهێندەی بیرێك و بۆ ئەو دڕندەیە هەڵکەندراوە ، کە بە ئەم رەزی مێو و ترێ یە فێربووە و زیانی پێ گەیاندووە .

بۆیە بە خۆی وت :

*ئەوەی ویستت ، پێی گەیشتیت ! ئەوە تا زۆر تەنك و لاواز سەری ( تەپکە ) کە داپۆشراوە . سوپاس بۆ خوا کە زوو سڵم لێ کردەوە . خۆزگە ، گورگی دوژمنم تێی بکەوتایە خۆ..ژیانی لێ تاڵ کردووم . ئیتر بۆ خۆم بێ خەم دەمامەوە و ئاسوودە دەبووم .*

سەری بە دەم قاقای پێکەنینەوە بادا و ئەم گۆرانییەی وت :

خۆزگە دوعاکەم گیرا بوایە — خێرا ئەو گورگەی تێ بکەوتایە

تاڵاوی زۆری کرد بە گەرووما — گیری بیری کەی هاوار خوایە

لە ئازارەکەی رزگارمان بوایە و — خۆزگە ئەم شوێنە: بە گۆڕی بوایە

بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای گورگە و پێی وت :

خوا رێی بەرەو رەزی ترێیەکی بۆ ئاسان کردووی ، بێ ماندوو بوون بەختەوەری کردی . ئەو رۆژیەت عافیەت بێت .

گورگە بە ڕێوی یەکەی وت : بەڵگەت بۆ ئەمە چییە !؟

ڕێوی وتی :

کە گەیشتمە سەر ڕەزی مێوەکە..گورگ خاوەن ڕەزەکەی خواردبوو.خۆم چوومە ڕەزە تریّ یەکەوە. هەموو میوەکانم بینی.. ئای چەند شیرین و خۆش بوو! گورگە گومانی نەما و شوێنی کەوت، تا گەیشتنە کەلەبەری دیواری ڕەزەکە. گورگە تەماعی ڕەزەکە گرتی.

ڕێویش وەستاو کەوتە هەناسە برکێ و وتی :

بچۆ... ژوور، نە بە دیوارەکەیدا هەڵ دەزنێیت ! نە دەیرووخێنیت! خوایش خێرێکی گەورەی پێ کردووی .

گورگە هەنگاوی بەرەو ناو ڕەزەکە نا.. چووە سەر چاڵە سەر بەگەڵا داپۆشراوەکە و کەوتە خوارەوە. ڕێوی یەکە لە خۆشیدا خەریك بوو شاگەشکە ببێت و ئەم گۆرانیەی وت:

فەلەك کە بۆ من نەرم و نیان بوو بۆم لاوایەوە و چاو بە گریان بوو

ئارەزووی چیم کرد بە دڵی من بوو تەختی کرد هەرچی کۆسپی ژیان بوو

بە زیرەکی خۆم ڕزگارم بووە لەم هاوڕێ (کەر)ەی بۆ من زیان بوو

سەری بەسەر چاڵەکەدا شۆڕ کردەوە و بینی گورگە بۆ خۆی دەگری و پەشیمانی دەکێشێت . ئەمیش لەگەڵیدا دەستی کردە گریان .

گورگە سەری بڵند کردەوە و پرسیی : ئەوە بەزەییت بە مندا دێتەوە ، وا دەگریت ؟

ڕێویش وتی :

نەوەڵڵا.. تەنیا بۆ تەمەنی با بردووت دەگریم . بە داخەوە کە ڕۆژێك زووتر نەکەوتیتە ئەم چاڵەوە ! گەر پێش یەکتر ناسینمان بکەوتیایە ئەم چاڵەوە : من زووتر ئاسودە و بێخەم دەبووم . بەڵام خوا منی هێشتەوە ، تاکو چارەنووست بە چاوی خۆم ببینم !

گورگە وەکو ئەوەی سوعبەتی لەگەڵ بکات پێی وت :

برۆ..خراپەکار ئەم هەواڵە بگەیەنە بە دایکم ، بەڵکو فێڵێکم بۆ بدۆزێتەوە و ڕزگارم بکات .

ڕێوی یەکەیش وتی :

چاو چنۆکی تۆی فڕێ داوەتە چاڵێك کە بە بێوەی لێی دەرناچیت .

گێلە.. نەت بیستووە وتـــراوە :

زەمانە ، هاوڕێی ئەوانە نییە کە بیر لە ئەنجامی کارەکانیان ناکەنەوە و تووش دەبن !

گورگەیش بە ڕێویی وت :

مام ڕێوی .. خۆ.. تۆ وا خۆت دەردەخست کە منت خۆش دەوێت... لە هێز و توانام دەترسایت! هێندە داخ لە دڵ مەبە و چاو لە خراپەکانم بپۆشە . پاداشتی بەخشندەکانیش لای خوایە ! پێشینان وتویانە :

چاکەی خۆت بکەی بە ئاویا بدەی     رۆژێ دێ کەوا: بەسوودی بگەی
لە زەویدا تۆ چیت رووناند بێت     دوایی بەرهەمی ئەو جۆرە دەبەی

ڕێوی وتی :
ئەی گێل ترین درندەی سەرزەوی ، خۆ بە زل زانینەکەت و ملهوڕیەکەی خۆت بیر چووەتەوە..!! نە هاوڕێیەتیت دەزانی و نە لەم شیعرەوە فێر بوویت :

کە توانات هەبوو زۆرداری مەکە     بە دڵی بن دەست تۆ یاری مەکە
تۆ چاو لێك دەنێی مەزڵووم بە ئاگا     نزای لای خوایە.. بێ عاری مەکە

گورگەیش وتی :
مام ڕێوی .. ئەوەی بوو: بوو..بە شوێنیدا مەچۆ. بەخشین لە بەخشندەیانیش چاوەڕوان دەکرێت !
ئەوەتا شاعیرێك چەند جوان وتویەتی :

پەلەی چاکەت بێ : زوو بە ئاسانی     نەك لێ بکەوی و دواتر نەتوانی

گورگە بەو هەموو داماویەوە ، لە ڕێوی دەپاڕایەوە و دەیوت :
ڕەنگە.. پێت بکرێت ڕزگارم بکەیت !
ڕێوی وتی :
هەی نەزان ، کین لە دڵەی غەدارە ... ئەم بەڵایە .. بۆ تۆ سزایە !
دایە قاقای پێکەنین و ئەم دوو دێڕە شێعرەی وت :

ناکرێ بم خەڵەتێنی     چاکە: وازم لێ بێنی
خۆت بە سەرخۆتت هێناو     لەوە دەخۆی : دەی چێنی

گورگ دەستی بە گریان کرد و وتی :
هەرگیز بڕوا ناکەم لەم چاڵەدا بەجێم بهێڵێت !
ئەم دوو دێڕە شیعرەیشی بە دەم فرمێسك ڕشتنەوە وت :

ئەی ئەو کەسەی بە توانایە     تایبەتمەندیی هەژمارە نایە
گێشەم چارەسەر بوو بێت     پەناو دەستی تۆی تیایە

ڕێوی پێی وت :
ئەی دوژمنی گێل ، ئەوە چۆنە دەپاڕێیتەوە و ئاوا و سادەیت و ڕسوا و ئەڵقە لەگوێی؟ خۆ.. جاران لوت بەرز و بە خۆناز بوویت . دەتخوڕی و زۆردار بووی .. ئای.. چەند بە ترسەوە، هاوڕێیەتیم کردی . ماستاوێکی زۆرم بۆ کردی کە لەبەر چاکیەکەت نەبوو . ئەوەتا ئێستایش لە ترسدا دەلەرزیت ..!
دواتر ئەم شیعرەی بۆ وت :

ئەی ئەوەی پەنات هەر فڕو فێڵە     زەویی نییەتی خۆتە : بیکێڵە
بەری خراپەی خۆتە .. بچێژە     گورگانی هاوڕێی خۆت جێ بهێڵە

گورگەکەیش وتی :

ئەی ، هێمن و ئارام ، بە زمانی رکەبەر گفتوگۆ مەکە . بە چاوی ئەوان مەڕوانە .. بە وەفا بە بۆ دۆستایەتی و هەستە ، پەتێك پەیدا بکە و سەرێکی بە درەختێکەوە ببەستە و سەرەکەی تری بۆ چاڵەکە شۆڕ بکەرەوە ، با پیا هەڵبزنێم . بەڵکو خوا بکات : رزگارم ببێت ... کە هاتمە دەرەوە ، هەموو خواردنی گەنجینەکەمت پێشکەش دەکەم .

رێوی یەکە وتی :

زۆرت وت . لە قسەی بێ سوود : چاوەڕێی بە ئاوات گەیشتن مەبە . بە هیوای ئەوە مەبە بۆت بکەم . بیر لە کردەوە خراپەکانی خۆت بکەرەوە . هێشتا ماوتە ، دەبوو بەرد باران بکرێیت . ئاگادار بە ئەم دنیایە بێ وەفایە ، لەگەڵ کەسدا تاسەر نایە..!

گورگەکە وتی :

ئاخر.. ئەوەی چاك بێ ... پێویستە دڵی لە کینە پاك بێ . گەر لە مردن ، کەسێ بە تۆ دەربازە تۆش پێی ببەخشە ژینێکی تازە . یەکێك لە مردن گەر دەربهێنی وەك ئەوە وایە: هەمووان بژێنی . مەهێڵە بە بەر چاوتەوە بە خۆخواردنەوەوە بمرم . لە کاتێکدا کە دەتوانی رزگارم بکەیت . چاکە بکە.. چاکە !

رێویش وتی : رسوا... ئەم زمان درێژی و نیەت گلاوییەت : چیرۆکی ( هەڵۆ ) و ( پۆڕ )ەکەم بیر دێنێتەوە .

گورگەکە پرسیی : ئەو چیرۆکە چۆن بووە؟

رێوی وتی :

رۆژێك چوومە سەر کەپری مێوێك بۆ ترێ خواردن . هەڵۆیەکم بینی داهاتەوە بۆ پۆڕێك هەر کە گرتی .. لەدەستی بەربوو..!! خۆی کرد بە کون و کەلەبەرێکی ئەو دەورو و بەرەدا . هەڵۆکە بۆی گەڕا و نەیدۆزیەوە و بانگی کرد :

ئەی نەزان : خۆ.. من لەو دەشتە کە تۆم بینی ، وتم برسییەتی ، بەزەییم پێتدا هاتەوە ، تۆم بۆیە گرت ئەو دانەت بدەمێ . کەچی تۆ هەڵهاتیت . خۆت لەو خواردنە بێ بەش کرد . وەرە .. وەرە خواردنەکەت نۆشی گیان بکە . کە پۆڕەکە ، ئەمەی بیست بڕوای پێ کرد و هاتە دەرەوە . هەڵۆیش پەلاماریدا و نینۆکەکانی لێ گیر کرد.

پۆڕەکە وتی :

ئەرێ .. تۆ بە منت وت : برسیتە و دانت دەدەم ..! کەچی درۆت لەگەڵ کردم ..! خوا گۆشتەکەم لە گەدەتدا بکاتە ژەهرێکی کوشندە .

هەر کە هەڵۆکە پۆڕەکەی خوارد، پەڕەکانی وەرین و هێزی لەبەر بڕا و هەر لەو شوێنەدا مردار بووەوە.

رێوی وتی :

هەر کەسێ چاڵی بۆ خەڵکی هەڵکەن ... خۆی تێ دەکەوێ مەگەر بە دەگمەن .. تۆش

کاتی خۆی غەدرت لە من کرد.
گورگەیش وتی :
واز بهێنە لەم قسانە .. لە وتنی ئەم پەندانە .. منێك .. ئا ئەم حاڵەم بێ .. دەبێت چ کارت بە قەواڵەم بێ . ئێستاش هانام بۆ تۆ هێناوە... دەرم بێنە لەم داوە . ئا ئەمە .. دوژمنیش پێی بە خەمە . دیارە لای تۆیش ستەمە . دۆست و هاورێی تەنگانە.. کوا هی سفرە و سەرخوانە!؟ هاورێی بە ڕەحم و ئەرباب ..چاترە لە برای بەرە باب . گەر توانیت لەم چاڵە رزگارم بکەیت . ئەمەندەت شتی پێویست دەدەمێ چوونە ژوورەوەی رەز و باخ و شوێنێکت لێ عاسی نەبێت، کۆمەڵە فێڵێکیشت فێر دەکەم . پێی بچیتە سەر درەختە بەردارەکان و بەرەکانیان نۆش بکەیت .
ڕێوی بە پێکەنینەوە وتی :
ژیرەکان چەند جوان بە گێلەکانی وەکو تۆیان وتووە : زلی بێ هونەر.. راستە هاورێ دەبێت دڵسۆز بێت بۆ هاورێکەی . بەڵام تۆ ناپاکیت ! من رقم لێتە ، کەچی بە هاورێم دادەنێیت ! گەر ژیر بوویتایە : ئەم کێشەیەت بە سەر نەدەهات . دەڵێیت : فرو فێڵم فێر دەکەیت . تا پێی سوودمەند بم .. ئەی باشە.. بۆ فریای ئەم لێقەومانەی خۆت نەکەوتیت !؟ خۆت رزگار بکە.. خۆت ! یا خوا ، خوا نەکات رزگارت ببێت !
سەیرە !کە هێندە فێڵبازیت : جارێ خۆت رزگار بکە .. کەس فێر مەکە ! ئەمەی تۆ دەیڵێیت وەکو : ئەو نەخۆشەیە کە بەو نەخۆشەی بەرامبەری ــ کە هەمان نەخۆشی هەبووـ وت :
وەرە.. با :تیمارت بکەم . تاکو چاك ببیتەوە .
نەخۆشەکەی تریش پێی وت : تەقەلا بدە : خۆت چاك بکەیتەوە.
پشتی تێکرد و جێی هێشت . کەوابوو.. ئەی هێڕ.. سەری خۆت کز بکە و ئارام بە لەم تووش بوونەتدا.
گورگە.. . بۆی دەرکەوت ڕێوی یەکە بێ کەڵکە و خۆی لاواندەوە و وتی :
بێ ئاگا بووم لە حاڵ و باڵی خۆم .. گەر ئەمجارە، خوا رزگاری کردم... تۆبە دەکەم کە بیرای ، بیرِ خۆم بە زل نەزانم لە بەرامبەر ئەوانەی لە خۆم بێ هێزترن ! کەوڵی خوری دەپۆشم ، دەدەمە شاخ بۆ خوا پەرستی و هەمیشە ترسم لە سزای دەبێت .
لە ئاژەڵانی تر.. دوورە پەرێز دەبم و هەژاران و سەربازانی خوا تێر دەکەم .
دواتر دەستی کردە شین و شەپۆڕ . ڕێوی یەکە بەزەیی پێدا هاتەوە و دڵی نەرم بوو. راپەڕی و بە چیچکانەوە لەسەر لێواری چاڵەکە دانیشت و کلکی شۆڕ کردەوە . گورگەیش خۆی بۆ هەڵدا و کلکی گرت . بەڵام هەڵنەزنا، بۆ سەرکەوتنە سەرەوە، بەڵکو ڕێوییەی راکێشایە خوارەوە .
گورگەکە ، لە چاڵەکەداو پێی وت :

چۆن توانیت گاڵتەم پێ بکەیت ، تۆ لە ژێر بەزەیی و رقی مندا نەبوویت ؟ ئەوا تۆیش سزای خۆت وەردەگریت و شاعیرێك جوان وتویەتی :

فەلەك كە داینا لە سەركەسانێ     قورسایی ئەژنۆی : یخ دەبن هەرزوو

لا قرتێ كاران : كەمێ وشیار بن     هەر دێ لە ئێوەش : ببڕێ پشوو

ئەمجا وتی :

مردنەكەیشمان پێكەوە خۆشە ! تۆ زووتر دەكوژم تا... كوشتنی من نەبینیت !

ڕێوییەكە لە دڵی خۆیدا وتی :

ئاخ .. ئاخ ، چۆن لەگەڵ ئەم زۆردارەدا تێكەوتم! ئەمە پێویستی بە، فروفێڵ هەیە. ئاڵتوون و متو مووروی بۆ ڕۆژی خۆ جوان كردنە .

پێشینان وتویانە : هەلگرتنی ئەم فرمێسكانەم ، پێویستە بۆ تەنگانەم ... دەبێت ئا ئەم زۆرداره ... فریو دەم .. چار ناچارە...!

شاعیرێكیش جوانی وتوە :

هەر بە فێڵ بژی خۆ ئەم زەمانە     ژیان لای شێری ناو بێشەڵانە

سەرچاوەی فێڵت هەڵ بسوڕێنە     با رووت تێ بكات بەخت و زەمانە

هەلی بۆ رەخساو بقۆزەرەوە     گەرنا پەنای تۆ هەر بەنگ كێشانە

ئەمجا ڕێوییەكە بە گورگەی وت :

جا.. ئەوە پاداشتمە كە بە پەلە بمكوژی؟ ئەی پاڵەوان، درندەی ئاژەڵان. گەر ڕێگەم بدەی و كەمێ سەرنج بدەی لە ئەمەی بۆت دەگێڕمەوە قسە كۆنەكانم تێ دەگەیت . خۆ گەر زوو بمكوژیت. هیچت بە دەستەوە نامێنێت و هەر دووكمان لەم چاڵەدا.. دەمرین .

گورگەكە بە ڕێوییەكەی وت :

ئەی خەڵەتێنەری فێڵباز، ئەوە بۆچی داوای سەلامەتی ، خۆم و خۆتت دەكرد و دەتوت، پەلەم لێ مەكە؟ مەبەستەكەتم پێ بڵێ ..!

ڕێوی وتی :

مەبەستم ئەوە بوو كە چاوەڕێی پاداشت نەبووم ، چونكە گوێم لە دان نان بوو بە تاوانەكانی رابردووتدا. چۆن تۆبەت نەكردووە و كاری چاكەت نەكردووە ، گوێم لێت بوو ، پەیمانت دا گەر ئەمجارە رزگار بوویت ئازاری هاوڕێكانت نادەی وخواردنی ترێ و میوەكان لەبیر خۆت دەبەیتەوەو كەڵبەكانت بەكار ناهێنیت : نینۆكەكانت كورت دەكەیتەوە و قوربانی لە ڕێی خوادا دەكەیت . كەوڵی خوری دەپۆشیت...هەر چەند سوور بووم لە سەر تیاچوونت بەڵام ... بەزەییم پێتدا هاتەوە.. ئیتر گوێم لە تۆبە كردنت بوو، كلكم بۆ شۆڕ كردیتەوە تا رزگارت بكەم ، بەڵام تۆ منت راكێشایە خوارەوە و كەوتم ، كە خەریك بوو پێی بمرم ! ئێستاش گەر بە قسەم نەكەیت هەر دووكمان تیا دەچین! دواییش پێویستە تۆبەكەت جێ بەجێ بكەیت و منیش هاوڕێیەتیت دەكەم !

چیت بە قسە بکەم؟

گورگەیش وتی :

ڕێوی وتی : دەچمە سەرشانت و لەسەر پاشووت بووەستە و دەستەکانت بە دیواری چاڵەکەوە بگرە، ئەمجا خۆم هەڵ دەدەم تاکو بکەومەوە سەر زەوی دواتر شتێکت بۆ شۆڕ دەکەمەوە و دەرت دێنم .

گورگەکە وتی :

گورگەکە وتی : چونکە ژیران وتویانە: متمانە بە کینە لە دڵان ناکرێت، نابێت پێی بڕوات پێ ناکەم . لە خۆبایی بوونە متمانەی بدەیتێ . هەر کەس ڕەش و سپی لێك پشت ئەستوور بێت . لە خۆبایی بوونە متمانەی بدەیتێ . هەر کەس ڕەش و سپی لێك جیا نەکردەوە بەڵاکانی فرە دەبێت . شاعیرێك وتویەتی :

| | |
|---|---|
| گومان ڕوویەکی پیسی ژیانە | گەندترین ڕەوشت هەردەم گومانە |
| چاکە کردن و گومان بە باشە | جوانتری دەکات ئـا ئەم ژیـانە |
| گومانت نەبوو خاترجەم دەبیت | بە ئاگاش نەبوویت ، تووشی خەم دەبیت |
| ڕووی خۆشت دایە دوژمنت ، ئەو دەم | ئەگەری زۆری لە بەردەم : دەبیت |

ڕێوی وتی :

گومانی خراپ لە هەموو بارێکدا چاك نییە. نیەتی پاکیش، سیفەتی کەسی تەواوە. ئێستا ئێمە تێکەوتووین . دەبێت تۆ کارێك بکەیت ڕزگار بین کینە و دڵپیسی وەلاوە بنێ. گەر دڵت لە من پاك بووەوە، ئەوا دوو گریمان دێتە ئاراوە.... یان ئەوەتا، شتێکت بۆ شۆڕ دەکەمەوە و ڕزگار دەبیت، یان غەدرت لێ دەکەم و جێت دێڵم. کە ئەمەیان هەرگیز نابێت . چونکە نامەوێت لـە ئـەم بەڵایـەی تـۆ جارێکی دی بێتـەوە ڕێـم و سزای غەدرەکەم وەربگرمەوە . پەندی پێشینان هەیە دەڵێت : وەفا جوانە، غەدر ناشیرین . لە گەردانی زەمانە بە ئاگام و با.. پەلە بکەین لە ڕێگا چارەی ڕزگار بوون و کات بە فیڕۆ نەدەین .

گورگەکەیش وتی :

هەر چەندە، متمانەت پێ ناکرێت ، بەڵام ئەوکات لەدڵی خۆمدا وتم : بە خوا.. کە گوێم لە تۆبەکردن و گریانەکەم بوو، هەستم کرد، کاری تێ کردیت و ویستت هەڵەکەت ڕاست بکەیتەوە. وا بە قسەت دەکەم...گەر غەدریشم لێ بکەیت خوا لە ناوت بەرێت .

ڕێوییەی خستە سەر شان و بە لێواری چاڵەدا هەڵزنا..! ڕێوییەکەش قەڵەمبازێکی دایە سەر زەوی . ئیدی بوورایەوە..!

گورگەکە لە ناو چاڵەکەوە ، هاواری کرد:

ئەی هاوڕێی گیانی... پشتگوێم مەخە و ڕزگارم بکە ...!

ڕێوییەکە دایە قاقای پێکەنین و وتی :

فشەکەر ، گاڵتەکردن و پێت ڕابواردن منی خستە بەر دەستت . کە تۆبە گورگانەکەتم بیست، لەخۆشیدا دەستم کردە هەڵپەر و داپەڕ، بۆیە کلکم کەوتە بەر دەستت ... ئەوە بوو تۆیش ڕاتکێشامە خوارەوە.. دواتر خوا منی لە دەست تۆ ڕزگار کرد. بۆچی یارمەتیت

بدەم؟ تۆیەك سەر بە گرووپی شەیتانیت!؟ ئـەی هەر دوێنێ بوو لە خەوم دا..... لە شایی تۆدا هەڵدەپەڕیم .

کە پرسیارم لە شی کردنەوەکەی کرد پێیان وتم :

تووشی تـەنگ و چـەڵەمەیەك دەبیت . بـەڵام ڕزگار دەبیت!! بۆیـە دەمزانی ڕزگارم دەبێت.. ئەی هشەکەری نەزان ... من کە دوژمنتم ... چۆن ڕزگارت دەکەم ؟

زانایان وتویـــانە :

بە نەمانی خراپە کارێك ..کۆمەڵ ئاسوودەتر و زەوی پاکتر دەبێتـەوە ! گەر بمزانیایە شـانم بـۆ دەدرێتـە بـەر ئازارەکانـت بـە وەفا دەبـووم و غـەدرم لێ نـەدەکردی و ڕزگارم دەکردیت !

گورگە کە ئەمەی بیست لە پەشیمانیدا دەستی خۆی گەست ! دواتر بە زمانی شیرین و قسەی نەرم و نیان کەوتە پیاهەڵدانی ... بەڵام ئەمەیشیان هەر سوودی نەبوو...!

بە دەنگێکی نیان وتی ، ئێوەی ڕێوی تەنیا زمان شیرین و سوعبەت چی، ئێو ئاژەڵانن! ئەم قسەیەشت سوعبەتە بەڵام ، ئێستا کاتی سوعبەت نییە !

ڕێوی وتی : نەزان... سوعبەتیش سنوری خۆی هەیە . پێت وانەبێت ، خوا کە منی لە دەست تۆ ڕزگار کرد، جارێکی دی بکەوەمەوە بەردەستت !

گورگەکە وتی :

لێـت دەوەشـێتەوە ، بـیر لـە ڕزگـار کـردنم بکەیتـەوە، ئـەویش بـە هـۆی برایەتیـە کۆنەکەمانەوە! کە ڕزگاریشت کردم ، پێویستە منیش پاداشتی ئەو چاکەیەت بدەمەوە .

ڕێوی وتی :

زانایان وتویانە : دۆستایەتیی نەزان و داوێن پیس مەکە ، چونکە پێی ناشیرین دەبیت . دۆستایەتیی درۆزن مەکە ، چونکە چاکەت کرد ، دەی شارێتەوە و خراپـەت کـرد بڵاوی دەکاتەوە .

زانایان وتویانە :

هەموو شتێ ڕێ و شوێنی خۆی هەیـە.. مـردن نـەبێت .. هـەموو شتێك بـەرگیریی لێ دەکرێت قەدەر نەبێت ! بەڵام بۆ پاداشتەکەی بۆت داناوم .. هەر وەکو مارە هەڵهاتووەکەم لە مارەوانەکە دێتە بەرچاو...

کە بینی تۆقیوە لێی پرسی : ئەی مار ئەو چیتە؟

مارە ترساوەکەیش وتی :

لە مارەوان هـەڵاتووم . چـونکە بـە شـوێنمەوەیە... گـەر ڕزگارم بکـەیت لە دەستی و منت شاردەوە ، پاداشتت دەدەمەوە و چاك دەبم بۆت .

پیاوەش خستیە گیرفانیەوە ، مارەوان بەلایدا ڕەت بوو و ترسی نەما..

پیاوەکە وتی : ئەوە ڕزگارم کردیت لەوەی لێی دەترسایت .. کوا پاداشتەکەم ؟

مارەکە وتی : بۆ پاداشتەکەت .... دەتەوێ بە کوێتەوە بدەم !؟

ئیدی بە پیاوەکەیەوە دا و ئەویش دەم و دەست مرد !

ڕێوییەکە وتی : ئـەی نەزان .. پاداشتەکەی تۆ ئەم چیرۆکەی بیر خستمەوە... ئەی ئەمەت نەبیستووە؟

کەسی بە کینە : کەی دڵخۆش کەرە — بە بێ دەنگی ئەو قەت مەخۆ تەفرە

کازی جەستەی مار هەرچەندە جوان بێ — مخابن ناوی ئەو لەشە ژەهرە.. !

گورگەکە وتی :

ئەی زمان پاراو ڕەوان ، شێوە و ڕوو جوان... وەلاوەم مەنێ ... بیرت نەچێت کە خەڵك چەند لێم دەترسێت!؟ خۆ .. دەزانیت کە هێرش دەبەمە سەر پەرژینەکان و دارمێوەکان لە ڕەگ و ریشە دەریان دێنم! چیم لێ داوا بکەیت .. بۆت جێبەجێ دەکەم ... خاوەن چی بە کۆیلەی خۆی دەکات ، تۆیش بە منی بکە..!

ڕێویش وتی :

هەی بێمێشك و نـەزان ، سـەرم لـە کـەرێتی و بێ چاو و ڕوویت سور دەمێنێ! هەر ئەڵێی من کۆیلەی تۆم .. وا فەرمانم بە سەردا دەدەیت! خۆ نـەت کڕیوم! دەبینیت چۆن دێنە بەردەبارانت... دەشکێنن کەڵبە و ددانت ! ئەمجا چووە سـەر بـەرزیی یاڵێـك ، کە بە سەر ڕەزە مێوەکەیدا دەنڕوانی، کەوتـە هـاوار، هـاوار، تـاکو.. خـاوەن ڕەز و خـەڵکی ئـاوایی پێیان زانی و بۆی هـاتن ! کە چاڵی تەپکەکەی گورگەیان بـینی ... کەوتنە بـەردەبارانی گورگە و ڕێوییەکە بۆی دەرچوو. هێندە ڕەمیان کرد بە لاشەی گورگەدا، تـاکو مـرد. دواتر جێیان هێشت.

ڕێوی گەڕایـەوە سـەر تەپکەکـە و بـینی گورگـە گیـانی لـە دەسـت داوە... لـە خۆشیدا سەری بادا، بە گۆرانیەوە ئەم شیعرەی وت :

شەقی زەمانە جۆرێك خستیە چاڵ — لە ناوچوو گورگەی پیسی بەد فەساڵ

زۆرداریيەکەی خۆی هاتەوە ڕێگا — ئەو چاڵە قووڵەی بووە جێگا و ماڵ

کەوتە: نێو چاڵێ ئەمەندە قوڵ بوو — مەرگی بێ گومان ، ڕزگاریی مەحاڵ

ئیتر بۆ ڕێوی تەخت بـوو.. بـە ئاسوودەیی لـە نێو ڕەزی مێوەکەدا مایـەوە تـاکو..خوا بردیەوە بۆ خۆی و مرد.

ئەی پاشای بەختیار ... خاوەنی بڕیار .. ئەمە بوو چیرۆکی گورگەکە .

ناوەڕۆک